# پیرەمێرد

## و

## پێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان و بەرهەمەکانی



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

***

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی ڕاپەڕین، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١

# پیرەمێرد

# و

# پێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان و بەرهەمەکانی

کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی

**ئومێد ئاشنا**

بەرگی یەکەم



ناوی کتێب: پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان و بەرهەمەکانی
کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی: ئومێد ئاشنا
بەرگی: یەکەم
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٨٦
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
وێنەی بەرگ: هێلکاریی یووسف عەبدولقادر
نووسینی سەر بەرگ: خۆشنووس محەممەد زادە
پیت لێدان: ئەمیر داود - ئاراس ئەکرەم - رەهێڵ رەشید
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل- ئەمیر داود - رەهێڵ رەشید
سەرپەشتی: دلاوەر صادق ئەمین
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاورەحمان مەحمود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣١٤)یساڵی ٢٠٠١ی دراوەتێ

# پێشەکی

لێکۆڵینەوە و ساخکردنەوەی شیعرەکانی پیرەمێرد و ڕۆشنایی نوێ بۆ سەر ژیان و بەرهەمی، بەلای منەوە، بۆ مێژووی ئەدەبی کوردی کارێکی هێجگار پێویست بوو، کە ئەنجام بدرێت، ئەم کارە چونکە ئەرکێکی ئاسان نەبوو، خۆ تەرخانکردنی تەواوی دەویست. کۆکردنەوەی شیعرەکان و بەراوردکردنیان و ڕاستکردنەوەیان، هەنگاوی یەکەم بوو، بۆ چوونە ناو جیهانە فراوانەکەی شیعری پیرەمێردەوە. لە ماوەی پێنج ساڵ کارکردنی بەردەوامدا توانیم ئەم ئەرکە- ئەوەندەی توانای خۆم- بگەیەنمە ئەنجامێک.

کاری لێکۆڵینەوە و ساخکردنەوە و ڕێکخستنی شیعرەکان دوو ڕێگای گرتەبەر. یەکەمیان لە ڕۆشنایی شیعرەکانی پیرەمێرد خۆیەوە، دووەمیان لە ڕۆشنایی ئەو شیعرانەوە کە پیرەمێرد کردوونی بە کوردی، یاخود لە شێوەی گۆران- هەورامییەوە کردوونی بەشێوەی سلێمانی.

سەبارەت بەڕێگای یەکەم دەبوایە، سەرانسەری ژمارەکانی ڕۆژنامەی ژیان ١٩٢٦-١٩٣٨، وە ژین ١٩٣٨-١٩٥٠ تەماشا بکەمەوە. ڕۆژنامەکە زیاتر دەتوانرا پشتی پێ ببەسترێت، لەبەر ئەوەی کە پیرەمێرد خۆی سەرپەرشتی کردبوو، واتا هەزار و پانزە ژمارەی ژیان، ژین ١٩٢٦-١٩٥٠ لەژێر چاودێری خۆیدا دەرچووە. شیعرەکان لە ڕووی هەڵەی چاپ و شێوەی ڕێنووسەکەوە نەبێت، کە هەندێ ناتەواوی تیا بەدی دەکرا، ئیتر هەمووی ڕەوای پشت پێ بەستن بوو، جگە لەوەی کە زنجیرەی مێژوویی خۆیان، بەپێی ژمارەی یەک لە دوای یەکی ڕۆژنامەکە پاراستبوو. وەک دەبینن ئەم کتێبە تەنها ڕیزکردنی شیعر نییە هەتا ناوی بنێین دیوان، یاخود دیوانی پیرەمێرد. بەڵکو بەرهەمی مێشک و توانای ئەدەبی خۆمە، کە چەندەها لێکۆڵینەوە و وتار و نووسین و بەراوردکردن و ساخکردنەوەیە سەبارەت بەشیعری پیرەمێرد و ژیانی ئەدەبی و ڕۆژنامەنووسی و هەموو هەوڵ و تێکۆشانی لە ماوەی هەشتا و سێ ساڵ تەمەنیدا.

وتمان ڕێگەی یەکەم شیعرەکانی خۆی بوو، ڕێگەی دووەمیش کە ئێستا باسی ئەکەین ساخکردنەوە و بەراوردکردنی ئەو شیعرانە بوو کە پیرەمێرد:

١- وەری گێڕاون بۆ کوردی لە زمانی عەرەبی و تورکی و فارسییەوە.

٢- ئەو شیعرانەی لە شێوەی گۆران - هەروامی، زمانی کوردییەوە وەری گێڕاوەتە سەر شێوەی سلێمانی لە نووسین و ئاخاوتندا.

٣- ئەو شیعرانەی کە لە ڕۆژنامەکەدا و لە دیوانی (محەمەد ڕەسول هاوار)دا، بڵاوکراونەتەوە و ناوی شاعیرەکەیان لەسەر نییە، یاخود ناوی شاعیر نووسراوە و نیوە یا چەند بەیتێکی هی ئەو شاعیرەیە و ئەوی تری شیعری تێهەڵکێشی پیرەمێردە. بۆ ئەم مەبەستە دەبوایە دەقی





تەواوی، یەکەمی، شیعرەکانم لەبەردەستدا بوایە هەتا بمتوانیایە بەراوردیان بکەم. دوا هەوڵێکی زۆر و یارمەتی برایانەی، چەند مامۆستایەکی دڵسۆز توانیم لەو گیروگرفتە ڕزگار ببم. ئەو مامۆستایانەی کە هەرگیز هەوڵی مەردانە و دڵسۆزیانم لەبیر ناچێتەوە، بریتین لە:

١- مامۆستا (عومەر عەبدولڕەحیم)، سەرەڕای سەرقاڵی و ئەرکی نووسین و بەرهەمی خۆی، بەو تەمەنەوە کە یاخوا هەر لە زیادی و لەشساغیدا بێت، بەتێکڕای بەدەستنووسەکەدا چووەوە، گەلێ هەڵەی ڕاست کردەوە و سەرنج و تێبینی خۆی بۆ تۆمارکردین و سوودمان لێ وەرگرت.

٢- مامۆستا (عەبدولقادری دەباغی)، جگە لەوەی بەسەرانسەری دەستنووسەکەدا چووەوە، لە نووسین و لێکدانەوەی مانای شیعرە فارسییەکاندا یارمەتییەکی گەلێ گەورەی داین.

مامۆستا دەباغی کە یەکێکە لە ئەندامە کۆنەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و ماوەی چل و دوو ساڵە لەو ڕێگایەدا، لە پێناوی ژیان و مافی نەتەوەکەیدا خەبات دەکات و هەر لەو ڕێگایەدا ئاوارە لە شار و ماڵی خۆی دەژی، ئەدیبێکی شارەزا و خاوەنی گەلێ بەرهەمی بەرز و جوانە، کە تەنها ئەوەی من بەدەستنووس لەلای خۆی بینیومە بابەتی چەند کتێبێکە.

٣- مامۆستا (عوسمان هەورامی). لە ڕێنووس و مانا و مەبەستی شیعرە هەورامییەکاندا، بەو هەموو شارەزایی و قەڵەم ڕەنگینییەی خۆیەوە یارمەتی گەورەی پێ بەخشین. کە شایانی هەموو ڕێز و سوپاسێکە.

مامۆستا عوسمان سەرەڕای ئەوەی بەتێکڕای شیعرە هەورامییەکاندا چووەوە، دیوانە گەورە و بەنرخەکەی (بێسارانی)- کە سەرجەمی شیعرەکانی بێسارانی-یە، خستییە بەردەستمان و لە ڕاستکردنەوەی شیعرەکانی بێسارانی لای ئێمە، سوودمان لێ وەرگرت.

بەڕاستی ئەو کارەی مامۆستا عوسمان هەورامی شاکارێکە، وێنەی کەمە، هەتا خوێنەر ئەو دەستنووسە بەچاپکراوی نەبینێ، نازانێ کە کارەکەی مامۆستا عوسمان چەند پیرۆزە و، بێسارانییش چەندە شاعیرێکی گەورەیە. ئەگەر بێسارانی کە خاوەنی ئەو هەموو شیعرە ڕۆمانتیکی و ورد و جوانەیە کورد نەبوایە و لەناو ئەو شاخە دوورەدەستانەدا هەڵنەکەوتایە ئێستا چەندەها بڕوانامەی دکتۆرای لەسەر وەردەگیرا!.

من هەرگیز یارمەتی و بەتەنگەوەهاتن و هەستی بەرزی مرۆڤانەی مامۆستایان عومەر عەبدولڕەحیم و دەباغی و عوسمان هەورامیم، لەیاد ناچێت و ئەوان تەنها ئەمەیان بۆ من نەکردووە، بەڵکو دڵسۆزی و قەدرزانی خۆیان سەلماند بۆ ئەدەبیاتی نەتەوەکەیان.

لەو مامۆستا بەڕێزانەی، کە لە ڕاپەڕاندنی کاری ئەم کتێبەدا یارمەتیان داوم، بەڕێز (عەلی بەگ حسین بەگی جاف)ە. کە ماوەیەکی زۆر کەشکۆڵی مەحموود پاشای جافی، خستینە بەردەست هەتا سوودی لێ وەرگرین. ئەو کەشکۆڵەی ساڵەها لای پیرەمێرد بووە و بۆتە

سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆی لە نزیک بوونەوەیدا لەشاعیرەکانی هەورامان و زەنگەنە بەتایبەتی مەولەوی. هەروەها عەلی بەگی حسێن بەگی جاف لە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا گەلێ زانیاری نوێ و سوودبەخشی سەبارەت بەمەحموود پاشا و ئەدەبی کوردی بۆ تۆمار کردووین. لێرەدا پێویستە یارمەتی جۆربەجۆری ئەم برا ئەدیب و شاعیرانە لەیاد نەکەم سەبارەت بەم کتێبە پێشکەشیان کردووە، ئەم بەڕێزانەش بریتین لە:

– مامۆستای دڵسۆز و خزمەتگوزاری شوێنەوارناس (عەبدولڕەقیب یوسف)، کە پانزە ژمارەی گۆڤاری ژینی ئەستەمبوولی بۆ هێناین، ئەو گۆڤارەی گەلێ بەرهەمی ئەدەبی پیرەمێردی تیایە و لەم کتێبەدا باسکراوە. هەر لەلایەن مامۆستا عەبدولڕەقیبەوە کەشکۆڵێکی دەستنووسی (نەجمەددین مەلا)مان پێ گەیشت ئەویش گەلێ شیعری پیرەمێردی تێدابوو. ئەو کەشکۆڵەی نەجمەددین مەلا ساڵی ١٩٣٧– ١٩٣٨ی زایینی بۆ (محەمەد ئەمین حەمە صالح ئاغای قزلجی) نووسیوەتەوە و دەستنووسەکە ئێستا لای مامۆستا عەبدولڕەقیب یوسف پارێزراوە.

– مامۆستا (ئومێد کاکەڕەش) کە وێنەی دووەمی ئەو کەشکۆڵەی قزلجی بۆ ماوەی چەند ساڵێک لە لا داناین و سوودمان لێ وەرگرت.

هەروەها دەفتەرێکی دەستنووسی شیعری نیشان داین، لە کاتی خۆیدا وەک کەشکۆڵێک مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیم نووسیویەتیەوە. چەند شیعرێکی بڵاو نەکراوەی پیرەمێردی تیابوو سوودمان لێ وەرگرت.

– مامۆستا (هیدایەتی عەبدوڵڵا حەیران) کە شاعیرێکی لاوە و بەهەستی دڵسۆزانەی خۆی بەرگێک لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی (ژین)ی خستینە بەردەست بەتایبەتی ژمارە دەگمەنەکانی ساڵی ١٩٥٠وە گەلێ سوودمان لێ وەرگرت.

– برای هونەرمەند( کاک خالید ڕەسول) کە نامەیەکی پیرەمێرد و کۆمەڵێ دەستنووسی بۆ هێناین.

هەروەها زۆر سوپاسی فەرمانبەرانی کتێبخانەی گشتی سلێمانی و کتێبخانەی مۆزەخانە و ئەوقاف دەکەم کە یارمەتیان دام لە دۆزینەوە و ڕێ پێدانمدا بۆ تەماشاکردنی ڕۆژنامەکانی ژیان و ژین و گۆڤارە کوردییە کۆنەکان.

## چەند وشەیەک لە بارەی ئەم یاداشتانەی (پیرەمێرد)ەوە

ئەم یاداشتانە کە پیرەمێرد هەر لە بیرەوەرییەکانی منداڵی خۆیەوە، هەتا چەند ڕۆژێک پێش کۆچ کردنی نووسیویە تایبەت نەبوو لە دەفتەرێکی سەربەخۆدا نووسرابێت، بەڵکو پەڕەوازە و هەر بەشەی لە ژمارەیەک لە ژمارەکانی ڕۆژنامەکەیدا نووسیویە، وەک شیعرەکانی بڵاو بوون و بەهۆی ئەو سەرقاڵی و کارە زۆرەیەوە بۆی نەکرابوو کۆیان بکاتەوە و لێکیان بدات و بۆ خۆی ببێتە



یاداشت. من لە سەرەتای ئەم پرۆژەیەوە بیرم لەمە کردبووەوە کە بەپێی زنجیرەیەکی ڕێک لەبارەوە بەرەچاوکردنی مێژووی نووسینیان ڕێکیان بخەم و پێکیانەوە ببەستم هەتا بەو شێوە هونەرییە هەست بەپچڕ پچڕی و ناتەباییان نەکرێت، وابزانم ئەگەر تەواو لەمەدا مەبەستم نەهێنابێتە دی، ئەوا تاڕادەیەکی زۆر بەسەرهاتەکان نزیک یاخود ئاوێتەی یەکتر بووبن. ئەم یاداشتانە بایەخی ئەدەبی و مێژووییان هێجگار زۆرە، پیرەمێرد خۆی بەقەڵەمی خۆی باسی ژیان و بەرهەم و بیروباوەڕ و هەموو شتێکی خۆی دەکات، پێش ئەوەی کەس لەو لایەنەوە باسێک بکات. لەلایەکی تریشەوە چەند لاپەڕەیەکی زیندووی مێژوو و ئەدەب و زمان و ژیانی نەتەوەی کوردە.

## دنیام چۆن دی؟

*کاتێ هاتمە ئەم کۆنە جیهانەوە، دەورەی منداڵی لای هەموو ڕۆڵەیەک خۆشە، چونکە غەمی گوزەران نازانێ، بەو سەودای منداڵییەوە خۆشم ڕابواردووە، تا گەییمە دە ساڵی، بیرم کردەوە و چەندوچوونی زەمان تێ گەیشتم. گرانی وماڵوێرانی ساڵی ٩٦ بەسەرداهات، تاقانەش بووم دیسان باوکم ئەو هەموو پیاو و خزمەتکارەی بوو بەشەو کۆڵی نان و خواردەمەنی پێ هەڵدەگرتم، بەدزییەوە ئەچووینە بەر ئەو ماڵانەی کەوا نەیشیان بوو، ڕووشیان نەدەهات سواڵ بکەن. لە دەرگامان ئەدا دەرکیان ئەکردەوە، بەدزییەوە کۆڵەکەمان فڕێ ئەدا ئەو دیو دەرگاکەوە و ڕامان ئەکرد. ئینجا جەردەی هەمەوەند ڕێی کەرکووکی لێ بەستین و حکومەت هێندە کز و بێچارە مابووەوە، جوامێر هەمەوەند لەشکری کرد هاتە سەر سلێمانی ئەیگوت شەریف چەلەبی کوڕی سلێمان پاشا بووە، حوکمداری بەشمانە، لە هەر چوار لاوە دەوری شاری دا و عەسکەریش هیچ لەشارا نەمابوو ناچار پیاوماقوڵەکانی ئەو سایە کەوتنە خۆ. بەر لە هەموویان (قادر ئەفەندی گەورە) خۆی و ڕۆڵەی ئازای، گردی سەیوان و فەقێیانیان لێ گرتن. تائیفەی (عەزیزی مەسرەف)یش ئەوسایە زۆر بەدەسەڵات بوون لەڕێی هۆمەرەکوێر و گۆیژەوە تا پشتی کانی ئاسکانیان محافەزە کرد، ئیتر کوڕگەلی شەڕە گەڕەککەری ناوشار دەبۆی میرییان شکاند تفەنگی شەش خانەی تیابوو دابەشیان کرد. (خولەی ئەلی کەوکوژ) و دەستەی دەهۆڵژەن وەک بۆ سەر شایی بچن بەدەهۆڵ و زوڕناوە پێش ئەم خەڵکە کەوتن هەمەوەندیان شکاند بەڵام تابووری عەسکەر کە بۆ ئیمدادی سلێمانی ئەهات هەمەوەند تاسڵوجەیان لێ گرتن زۆریان لێ کوشتن، نەتیجەی ئەو غروور و جەردەیییە وای لێ کردن ئەو هەمەوەندە کە ڕۆم و عەجەم بەدەستیانەوە لە هاوارا بوو وە ئۆردوی مەلیک نیازخانیان شکاند ئێستا ناونیشانیان نەماوە.*

*لە منداڵییەوە کە ئەیانناردینە بەر خوێندن یەکەم ڕاسپێری باوک ئەوە بوو (گۆشتی بۆ تۆ، ئێسقانی بۆ من) وایان بردبووە مێشکی ئێمەوە کە جێگەداری مامۆستا بەئاگری جەهەننەم*

ناسووتێ.

له حوجرەی (مەلا حسینە گۆجە)دا دارفەلاقەیەک هەڵاوەسترابوو لەگەڵ مامۆستا ئەیگوت فەلاقە وایان پەلامار ئەدا وەکو قەڵای دمدم بگرن و قوتابیان لەسەر پشت ئەخست هەردوو لاقیان هەڵئەبڕی ئەیان خستە پەتی فەلاقەوە. مامۆستایش بەرەکەتدا دەستی ڕاستی نەبوو بەدەستی چەپ تا دەستی شل ئەبوو لێی ئەدا. مامۆستا لەگەڵ ئەهاتە قوتابخانەوە لە پێشدا بێ ئەوەی سووچێ لە قوتابیانا ببینێ بەهەموو زەبر و زەنگی خۆی بەڕیز یەکی قامچییەکی بەناو شانمانا ئەکێشا، بەخوا ئێمەش جارێکیان هەندێ سنجاقی دەرزیمان لەژێر کەوڵ و پۆستەکەی هەڵچەقاند نووکەکەی بەدەرەوە بوو ئینجا کە هات لەسەر کەوڵ و پۆستەکەی دانیشێ بەکەش و فشێکەوە خۆی ئەکوتا بەجێگاکەدا لەگەڵ خۆی دا بەزەویا و دەرزی تێ هەڵچەقی هاواری کرد و ئێمە ڕامان کرد.

خۆم و خزم و کەس و کارم کەمتر ئەم شارەیان بەقیسمەت بووە، مامی گەورەم (سەعید حەمزە ئاغا) لە پیلانی حەلەبدا مردووە. مامە (حسینم) کەوتە لای باطوم و گورجستان. هەردوو مامم، (حەسەن) کەوتۆتە هەڵەبجە و (فەتاح) لە حلە. کوڕەکانم لە تورکیان. بنچینەمان بەختیارییە، سەردار ئەسعەدم لە تەورێز دیبوو لە زیندانی تارانا مرد.

ئێواران لە سلێمانی کە ئاسمان سپی ئەبوو، نیشانەی بەفر بوو. ئێمەی منداڵ ئەکەوتینە خۆشی خۆشی کە بەفر ئەبارێ. پورە (پەریزاد)، سۆینەکەی ئەشت، کەشکەکەی ئەهێنا. ئەو و (سەلەکە) و (گوڵنازی ئەحمەد مجەور) و (گوڵ ئەندام) کەشکیان ئەسووەوە تا مەنجەڵە زنجیردارەکەی (سمایل چێشتکەر) پڕ ئەبوو. هەر ساتە نە ساتێ سەرێکمان ئەکێشایە دەرەوە، ئەمانکردە قریوە ئۆخەی تا پشتێنەیە، کەچی هێشتا قولەپێش نەبوو بوو. (فاتم)ی خوشکم جامی بەفر و دۆشاوەکەی هەمیشە لە تەنیشتەوە بوو. (ئەڵڵا موراد)ی ڕەنجبەریش (میرزام قەڵای خاور)ـەکەی ئەچڕی. ئینجا دەمی بەیان هێشتا چۆلەکە جریوەی تێ نەکەوتبوو ئێمە بەجریوە جریو ڕاست ئەبووینەوە، (پورە پیرۆز) یەکەیەکە چاوی ئەڕشتین. نازانم ئەوسایە (کل) ئەوەندە باو بوو ئێستا بۆچ باوی نەماوە؟!. دایکیشم کاشی و گڵێنە و یەغنیکێش و سەحەنییە پەڕەکەداری لە دۆ و کەشک پڕ کردبوو بۆ خۆمان و بۆ ماڵان دۆ و کەشک ئەخورا. یۆڵداشەکانم بانگیان ئەکردم، کاڵەیەکی بچووکی شەمامەبەند و جووتێ پووزەوانەی خانم خاسی بۆ چنیبووم لە پێم ئەکرد و تفەنگێکی دوو لوولەی لە خۆم درێژترمان بوو ئەمنایە سەرشان و بەدزی دایکمەوە لە ژووری خوارەوە پڕ گیرفانم باسووق و سجووق و نان باسووق و پاقلاوای باسق ئەکرد. یەڵڵا بۆ ئەو دەشتانە ئەگەر لە دەشتا ڕەشایی نەمایە (کەو) ڕووی ئەکردە ناو شار، ئەوە هەرای بگربگری کەو بوو. ئەگەر کەو نەهاتایە جووڕە و ڕیشۆڵە و کڵاوکوڕە و قاژە ڕەشکە. جا کە کەو سەری





ئەکرد بە بەفرا و خۆی دەشاردەوە وای ئەزانی کەس نایبینێ؟!

لەگەڵ خۆمان ئەدا بەسەریا و ئەمانگرت وەمان ئەزانی تەختی مەبعوسی ئێستامان دەست کەوتووە. ئیتر بێ خەم و بێ ئەندێشە هەوای ئەو دەشتە بەفرینە و ئەو عومرە ئێستا بەهیچ دەست ناکەوێتەوە! ئەو گوزەرانە کەوێ بوو فڕی و نایەتەوە!.

نازانم چە دەردێک بوو بەمنەوە نووسابوو هەر لە منداڵییەوە دڵم دابوە شیعر و گۆرانی. دەنگی خۆشم لەبەر شیعری خۆش، دەویست. هەتا (مەولەوی)م نەناسیبوو (نالی)م لەلا پێغەمبەری شیعری کوردی بوو. پێش ئەوەی بچمە ئەستەموڵ کەشکۆڵێکم نووسیبووەوە بەکاغەزی زەرد و شین و سوور و مۆر هەرچی شاعیرێ کە بیستبووم چەند غەزەلێکی نایابی ئەوم نووسیبووەوە، خەڵکوخوا ئەیانبرد لەبەری بنووسنەوە تاقەتیان نەدەبوو هەر لاپەڕەیەکی شیعری خۆشی تیا بوایە ئەیان پچڕی و دەریان ئەهێنا. تا دوایی سوێندم خوارد بەکەسی نەدەم، بەوەیش وازیان لێ نەهێنام، ناچار لەژووری ئەو خوارەوە چاڵە گەنمێکی ساڵی گرانیمان بوو خستمە چاڵەکەوە و بەسەریا ڕۆیم بۆ ئەستەموڵ، خوا ئەیزانێ لەو چاڵەدا وەک قامیشە نەیەکەی کە مەولانای ڕۆمی (مەسنەوی) لەسەر داناوە چەند بۆ خۆی شەرحی جودایی داوە تا نەماوە.

جا بەهۆی ئەوەوە کە شاعیرەکانم لەوێدا کۆ کردبۆوە گەلێ ئەشعار و ئاساری ئەو ناودارانەم لەبیر مابوو لە سینەمدا نەقشیان بەستبوو، لە ئەستەموڵ لە غەزەتەی (ژین)دا برای (ژیان)ی ئێستا بەزنجیرە هەندێکیم دەنووسی و ڕەنجیشم لەگەڵ ئەدان هەتا دیسان بەشیعر وەرم ئەگێڕانە سەر تورکی.

لە بیرمە (معلم ناجی) مەرحوم لە قیسمی ئەدەبیاتی (ترجمانی حقیقت)دا سەرپەرشتی ئەکرد. لە سلێمانییەوە پەنجا ساڵ لەمەوپێش (١٨٨٣)ی میلادی... مەنزومەیەکم نووسیبوو، دەرەجەی غەزەتەی کردبوو لەژێریشیا نووسیبووی (زکای ناتراشیدە) فکرێکی شێوەی نادروست. هەرکا دەوام بکەی ئاخری هەر ئەبیتە شاعیرێکی باش. ئەو لاواندنەوەیە بووە تازیانەی شەوق. هەرچەند نەبووم بەشاعیر بەڵام ئەو شەوق و خودپەسەندییە فێری نووسینی کردم، ڕۆژی پەککەوتەیی لە غەزەتەی ئەستەموڵ بۆ مەقالەیەک سێ لیرەی زەردیان ئەدامێ!.

من لە تافی جوانیدا جۆشی دەروونم وەک تافی قەڵبەزەی سافی شووشەی مەی یا وەک تاڤگەی زەڵم و بەڵخە و ئاشەبەرزە، (کەف)ی ئەچەند. ڕێم کەوتە بیارە بۆ خزمەت شێخ عومەر، نەزەری ئەو، ئەو جۆش و خرۆشەی دێوانەییەی بۆ خستمە ناڵەی نەی نەتیجەی قەڵەمەوە. ڕۆییم ساڵەها دوور کەوتمەوە، بەڵام هەر نزیک بووم دوور و نزیکی یەکسانە بۆ گیان. منداڵ بووم، لە بیرمە جارێ مەولەوی هاتە ماڵی ئێمە قاپووتێکی کورکی سەوزی لەبەردا بوو منیان خستە باوەشیەوە و دەمی ماچ کردم، لەدەمی دەم ماچ کردندا چاوم بەچاوی کەوت بروسکەیەکی

پڕ خـەندەی لێ ئەبووەوە، ئەو چاوانە کـە لەدواییـدا کـوێر بووبوو چەند جـوان و پڕ مـەعنا و جازیبەدار بوو. کە پێگەیشتم کەوتمە ناوەوە شەیدای شیعر و ئاوازی خۆشی بووم خوا لێی خۆش بێ (عەزیز ئامینە) گۆیندەیەکی بێ هەمتا بوو شیعری مەولەوی ئەمەندە جوان ئەخوێندەوە گفتەی لە ئاوازی خۆشتر و ئاوازی لە گفتەی. بەهۆی گۆرانی عەزیزەوە خووم دایە مەولەوی، هەتا لێی ورد ئەبوومەوە بەرۆحتر بوو، تا گەییبە پایەیەک لە ڕۆم و عەجەم و عەرەبدا بەمەعنا لەو بڵندتر و بەمەعنا ترم نەدی، هەندێ خەیاڵی هەیە ئەمەندە وردە سەد ساڵ پاش خۆی تێی دەگەن.

مەولەوی کە شۆڕش و جونبوشی مەیی و مەعشوق و زوڵف و ئەبرۆی دە هەزار جار بیستراوی گۆڕیوە بەرۆح و مەعنا و ناڵە و سۆز و خستوویەتە فەردەکانی خۆیەوە. بەڵێ ئەمیش زۆرجار خەیاڵبازی کردووە بەڵام موبالەغاتی وای نەهێناوەتە کارەوە. وردەکارییەکی وای هەیە کە ڕۆح ئەلاوێنێتەوە، ئەڵێ:

وەختێ چەم نەچەم شێوەش دیار بێ
جەلام فەسلێ وەسڵ بەزم ئەغیار بێ

یاخود:

باڵەخانەی چەم دێوانەکەی تۆ
پا نەناوی گڵ ئاستانەکەی تۆ
تکەش عاجز کەرد خەیاڵت تێشدا
ئازیز بۆ جارێ پا بنیە پێشدا

ئەمانە هەر لە خۆی دێ، سا چی بکەم ئەم ڕۆح و مەعنایە کە لە فەردی مەولەویدا هەیە ئاخ بەزمانی فەرەنسی ئەبوو. ئەتزانی ئەوروپایی چە ستایشێکیان ئەکرد. بەڵام بەزبانێکە کە هەورامیش تێی ناگەن. هەر ئەوەندەم پێ کرا ئەو نوورەم لە (کۆی ئاتەشگا) و (قوللەی قەڕاڵە) کردەوە و هێنامە دەشتی شارەزوو و لەوێوە گەیاندمە دەشتی بتوێن و هەولێر و تا قەشقەم برد، ئای بۆ کوڕێک لەوێی تێپەڕێنێ!.

ئەدەبیات و ئەدیبانی کورد کە بەدوو باڵی سیحری حەڵاڵ لە ئاسمانی جەلالدا دەورە ئەکەن یەکەمیان مەولەوی و دووەمیان (نالی)یە. بەرۆح و سنعەت زەوق و شەوق ئەخەنە دڵەوە. نالی لە عالەمی سنعەت و جناسدا زۆر بالایە، ئەگەر بەر ئەم زەمانە بکەوتایە و بمایە کە ئێستا شیعر هاتۆتە سەر ئوسلووبی سەلیسی و ڕۆح و مەعنا، وێنەی نەئەبوو. هەندێ شاعیری ناودار شیعری ئاوداریان وتووە بەڵام ئەوانە تەنها لە قەریحە و تەبیعەتەوە پێ گەییون. نالی لە عیلمەوەیە ئەگەر بێت و نموونەی شیعری جوان و بەتەبیعەتی بنووسین ئەبێ هەموو دیوانەکەی بخەینە ئەم لاپەڕەیەوە.



ئەدەبیات تەنها وەنەبێ بۆ زەوقی ڕۆح و سنعەت و بەدیع بێ، وا ڕێ ئەکەوێ شیعرێک مەوجودیەتی قەدیمەی قەومێک ئەخاتە یاد و لەساحەی تەئریخدا زیندوویان ئەکاتەوە.

ئەگەر شیعر بە (غایە) وەسیلە، نا عەد بکرێت و ئەگەر شیعر عیبارەت بێ لە سنعەتێکی بەرزی بەدیعی و ئەگەر لە شیعردا ئیبداع شەرتێکی ئەعزەم بێت بێ گومان نالی گەورەترین شاعیری کوردە، بەڵێ موحتەمەلە نەزەر بەزیهنیەتی حازر ئەشعاری نالی تینوویەتی حسیان نەشکێنێ وە موحتەمەلە نەزەر بەتەلەقی عەسری حازر لە شیعرەکانیدا حسیاتی ورد و بەرزی کەمتر تیا بێت و کەمتر هەیە جانێکی بەدیعی ببەخشێت، فەقەت لازمە لەبیرماندا بێت نالی لە زەمانێکدا ژیاوە کە شەرائیتی کەمالی شیعر عیبارەت بووە لە جیناس، ئیستیعارە و لەف و نەشر، جەمی ئەضداد و سائرە. وەلحەق لەمانەدا قەڵەمی نالی لەهی شاعیرەکانی تر زیاتر موەفەق بووە.

عەلاوەی ئەمانە ساحێبی ئوسلوبێکی طەننانە، شیعرەکانی خۆش ئاهەنگ و ڕەوانە وە لە ئەکسەری مەنزومەکانیا فکری ورد، تەشبیهاتی خۆکرد و خەیاڵی بڵندی بەتەرزێکی ڕەنگین و ئاودار ئەدا کردووە. لە نەزەر نالیدا شیعر ئەسڵ و غایەیە. قەت بەوەسیلەی بەکارنەهێناوە، حەیات، عیشق، حەتتا حسیاتی باوکی لەلای ئەو عیبارەتن لە شیعر. بۆ ئەو گوارەیەک، گوڵێک، مۆدنەیەک، پانی بەرزێک موتەساویەن باعیسی ئیلهام و جۆششی حیسیاتی بووە.

وەکو ئەڵێن شیعر یا ئەبێ پیاو بگریەنێ یا ئەبێ هەڵیپەڕێنێ. سا هەرچۆنێ بێ من ڕاستەوڕاست ئەگریم و ئاوی فرمێسکی سوور بەسەر ڕیشی سپیما دێتە خوارەوە.

ئێستا خەیاڵ لەغووە، مادیات هاتۆتە پێشەوە، ئەمانەیش لەگەڵ دەستووری حەقایقی مادە و شیعری (ناتوریل - تەبیعی)دا ڕێک ناکەوێ. شیعر خەیاڵ ئەکا بەفکر، فکر ئەکا بەفیعل و کردەوە. ئەم چەندانە هەموو غەزەتەکانی جیهان لە عومر و زهنی برنادشۆ ئەدوێن و لەو پیریەدا ئەو زهنە کە ئەتوانێ وەک جاران بنووسێ بەشتێکی عەجائبی ئەزانن. بەڵێ، ڕاستە پیاو بەئەکسەریەت لە حەفتا تێپەڕی هەرچی لە سروشتا خوا بەوی داوە ئەکەوێتە سستی، لەپێشەوە بینایی و وریایی یاداشت و تاب و توانی نامێنێ و خۆشی بێ و ترشی بێ قەدی ئەچەمێتەوە، ئەو نەوعانە کە لە عومری نوێدا ئەتوانن ببیەن و ببینن و وەک جاران بنووسن زۆر بەنایاب هەڵدەکەون، بۆ هەندێ سیفاتی ئەو لە خۆما گەڕام چونکو منیش تەنها هەنگاوێک لە دوای ئەوەوەم بەڵام ئەو لە شوێن و شارێکی وا دایە کە هەموو دنیا ئەیناسێ، من لە دێیەکدام کەم کەسی ئەوروپایی ناوی ئەزانن!! من لافی ئەوە لێ نادەم کە بڵێم برنادشۆی کوردم، بەڵام هەندێ وەزعیەتی من هەیە لەو عەجائبترە. زۆر خولقمان لەیەک ئەکا و زۆر تەبیعەتیشمان عەکسییە.

ئەمەی ئێستا ئەو ئەتوانێ بنووسێ من لەو عەجائبترم. خۆ مەقسەدم ئەمە نییە بڵێم داناتر یا

عالمترم، بەڵام ئەمڕۆ بەنیسبەت ئەوەوە من لە کوێرە دێیەکدا هەڵکەوتووم و ئەزانم بنووسم، بەخۆم و قەڵەمە شکاوێکەوە بیست و سێ ساڵە غەزەتەیەک دەردێنم نزیکە هەزار هەفتە تەواو بکا. غەزەتەکەم لە حەوت ڕەنگ مەعلووماتی تیایە: عیلمی، فقهی، ئەدەبی، تەئریخی، فەلسەفی، فوکاهی و مزاحی و ئیجتماعی. خۆ نزیک بیست هەزار شیعر و پەندی پێشینانی تیایە. ئەوە کتێب و کتێبخانەم نییە، هەرچی ئەنووسم لە توورەکەی مام برینداری عەتار، یەعنی حوجەیراتی دەماغیەی خۆمی دەردێنم، ئەوەی بەمنداڵی لای مەلا حسێنە گۆجە خوێندوومە، لە ئیسماعیل نامەوە بگرە هەتا بەیتی مشک و پشیلە ئەوەی خۆم بەحیکایەت خوێندوومەتەوە وەک ئەچۆو شیر و، یوسف زلێخا، ئەسکەندرنامە و زۆر شیعری کۆن.

هەرچی لە وڵاتی ئێمەدا باوە لەبەرمە و دەست و چاو و وجودم ئەمەندە لە کارایە شتی زۆر گران بەدەست هەڵئەگرم و بەشە خەتی زۆر ورد ئەخوێنمەوە. پشتیشم ڕاستە، ئەمانە لە هاوساڵی خۆما و پیرەکانی ترا شک نابەم.

بێینە سەر خواردن، من لەو باشترم، خۆشتر ڕائەبوێرم، چونکو خۆی دائم، هەموو ڕۆژێ کەباب ئەخۆم، ئەو گیاخۆرە. قەت عەرەقم نەخواردۆتەوە، ئەو ناتوانێ لەگەڵ گەرمادا بژی، بەزستانان پەنجەرەی هۆدەی داناخا، من بەچلەی هاوین لەژێرخانێکدا ئەنووم بیست ساڵە پەنجەرەکەی ژوور سەرم نەکردۆتەوە. ئەمە سرێکی دینی و ئیدمانێکی ڕیازییە، ئاگری جەهەننەمە!!. ئەگینە بەچلەی زستان بەو جلانەی هاوین لەبەرمایە لە بەفر و سەرمادا ئەگەڕێم، ئەتوانم لە سەربانیش بنووم. ئەمانە ڕاستن، درۆیان تیا نییە، لەبابەت خواردنیشەوە بەدەست خۆمە، توانیومە لەزەرفی هەموو بیست دەقیقەدا جارێکی تر نان بخۆم و توانیویشمە دوو ڕۆژ بەهەوەس هیچ نەخۆم. تا ئەمساڵیش لە حەیاتی خۆما ڕەمەزانان نەخۆش نەبووم. هەرچی بووبم بەڕۆژوو بووم. ئەویش لە بیست و چوار سەعات جارێک ئێواران نانم خواردووە!!. ئەمە من و ئەمە برنادشۆ. کە ئەو لە شوێنێکی وا دایە ئەیگرن بەسەر سەرەوە، من لە شوێنێکام ئەڵێن بڕووخێ!!. تووڕەش نابم، ئیدیعای ئەوەش ئەکەم ئەو پەندی پێشینانە من لە هەموو ژمارەیەکی غەزەتەکەما ئەینووسم تائێستا نەبێژراوە، نە ئەبێژرێ و نە ئەبینرێ!!. خوا لێی خۆشبێ (غاندی) جارێک قینی هەڵسا وتی هیچ ناخۆم تا دەمرم، من لە غەزەتەکەما نووسیم ئەوی ئەو نایەوێ من بۆی ئەخۆم!!. ئازایە با نەداتەوە سەر خواردنی من، ئاخری ئەو هاتەوە، بزانین برنادشۆکەی پەکی نووسین و بینینی ئەکەوێ و کاممان بەگوڕتر ئەبین و کاممان زووتر ئەمرین!!.

لە هەموو ئێل و قەبیلە و قەوم و عەشیرەتێکدا پیاوی پیری جیهاندیدە و کارئازمودە گوێ لە ئامۆژگاریی گیراوە و بەڕا و تەدبیری ئەو بەرێدا ڕۆیون، ئێستا منیش خوا ئەم بەشی پیری و دڵسۆزی هۆزەی پێ ڕەوا بینیوم و بەعومرێکی هەشتا ساڵییەوە هیچ نەبێ چواریەکی عەسرێک



غەزەتەیەکم بۆ کوردەواری ژیاندوە و بەهەموو خۆشیەکی قەومەکەمەوە هەڵپەڕیوم و بەهەمو نەگبەتیەکیەوە گریاوم، بەناڵەی کزەی جەرگەوە، بەشیعری شیوەنی خوێن بەبەرگەوە زۆرم گریاندووە و ئاگری نەورۆز چەند جار سووتاندوومی نەبەزیوم. تا لە هەموو کوردستاندا گڕی ئاگری نەورۆزم بەتەنیا و بەڕۆڵەی (زانستی) هەڵگیرساندووە.

من ئەگەر لە شوێن پارە بگەڕامایە پارەم بۆ خۆم ئەویست، بەسەر خەڵکا دابەشم نەئەکرد و خۆم پێنج ساڵە جلە کۆنی خەڵاتی زاتێکم نەدەپۆشی!!. من لەوانەم کە پارەی ئابوونەیشم لەوان نەویستوە ئا بۆ ڕۆژێکی وا کە سەر بۆ کەس دانەنوێنم!! لە شوێنم ئەگەڕێن بەڵام کاتێک بۆم ئەگرین کە تێپەڕیوم!!.

دەردی یەک نەویستی، تای تەماعکاری، دڵڕەشی، خوانەناسی برای لە برا کردووە بەدوشمن!. پیاوی کردوە بەژن، گەورەی کردوە بەنەنگە!. وائەزانین خۆشگوزەرانی و کامەرانی و زەوقی زیندەگانی بەپارە کۆکردنەوەیە، سەعادەت بەپارە و ئیقباڵ و سەروەت و شان و شۆرەت نییە!. ڕۆژێ، دڵێکی بێ خەم، ڕۆحێکی بێ تەم و لەشێکی بێ ئەلەم هەزار ساڵ عومری بار قورسی حسابی پارە و کەشاکەشی قرپ و جرپی موڵک و ماڵ و دەستوپێوەندی بەئاژاوە و گلەییەکی پڕ خەیاڵ دێنێ!!.

وتوویانە ئیقبال باوکی حیرس و حەسەدە، دەوڵەت دوشمنی موحیبەتە، شەئن و شوهرەت کوتەکی سکون و ڕاحەتە، سەعادەت بەڕۆحێکی ڕەونەقدار و شەفەقەتکار، بەدەها و زەکایەکی لەگەڵ هەموو کەسدا یار و بەزەییەکی بۆ نیشتمان غەمبار و عەشقێکی خودا داوی پڕ ئەنوار و، ئەگەر ئەمانە نەبێ سەر ئازادێکی بێ هاوسەر.

ئێمە بۆیە نەهاتووینەتە ئەم دنیایەوە لەژێر تەئسیر و نفوزی پارەدا بژین و لە خەڵک بپچڕین و وەرگرین، بۆیە هاتووینەتە ئەم جیهانە بنەقشین و ببەخشین!. هەموو ڕۆحێک قانوونێکە، ئەبێ ئەو قانوونە لە خۆماندا بهێنینە دی، شوێن قانوونی ڕۆحێکی تر نەکەوین!.

ڕۆڵەکانم، هەموو پیرەمێرد ئەناسن، کە کوردە و ئامۆژگاری کوڕیشی بەکوردییە و بۆ ئەوەیش نییە خۆی پێ بەرێتە پێشەوە یا شتێکی پێ بپچڕێ!. بەڕاستی ئەم پیرەمێردە هیوای بەرودوای بەلاوانی کوردە، تەنانەت لە ئەستەموڵ هاتووە لە شەمەندەفەرا مەنزوومەیەکی نووسیوە ئەڵێ، ئومێدم وایە ئەم دەستەی کوڕانە مەشعەلێ هەڵکەن، ئێوە لە پێش هەموو شتێکدا، هەرچی ئەکەن، بەچرای خوێندەواری بەرێدا بڕۆن، تا ڕێ گوم نەکەن عیلم و فەن میللەتێک سەر دەخا، لە هەموو کارێکدا ئەبێ دوو قۆڵتان ببێ، غایە و دەستوور، مەرام و خەتی حەرەکەت، کوڕانمان ئەبێ لەڕێی نیشتماندا نەبەزن بیشیان کوژن!!.

زۆرجار هەندێ کەس هەر لە ئێستاوە لە عەزابی گۆڕ ئەترسن، بەڵام لای من ئەوە هیچە،

وەختێ ئەبێ لە ژیاندا ئینسان لە عەزابی گوناه خۆشتر عەزاب ئەبینێ!. زۆرجار بەچاوی خۆی لەژیاندا جەهەننەمی یەئس و ئەلەم ئەبینێ، ئۆه ژین، چەند خۆشەویستی، چەند شیرینی، ئۆه ژین، چەند تاڵ و بەدی، چەند قورس و ناخۆشی.

بەڵێ، ژین وەکو زمان لە هەردووکیانە، هەم عەزاب هێنەرە هەم سەعادەت بەخشە. هەم نەفرەت ئالوود، هەم دڵڕوبایە، هەم هەنگوین و هەم زەهرە!.

ئەمڕۆ کە ڕۆژی پێنج شەممە و (٢٦)ی کانوونی دووەمی ١٩٥٠ی میلادییە ڕاستەوڕاست تەئریخی بیست و پێنج ساڵ لەمەو پاشی تەئسیسی غەزەتەکەمانە!. چواریەکی عەسری سەد ساڵە، بەخوا زۆرە، لە عێراقدا ڕێی عەسرێک غەزەتەچیەتی. ئەویش کێ ژیاندوویە؟! پیرەمێردێکی هەشتا و پێنج ساڵە! منی شەست ساڵ لە غەزەتەی کۆنتر!.

تەنیا شەخسێکم کە لە ڕووی غەزەتەکەیەوە چەند دەردی سەری دیوە، خانووە شڕەکەی ناوەتە بارمتە، ئێستاش ڕەهنی ئەموالی (قاصرین)ە. ئەمە شەرەف و فەخرێکی کەم نییە!.

سەقافەی (صحافە) خوا لەشارێکی کوردستاندا داویە بەقەومی کورد و پیرەمێردێکی وا!!. من گلەیی لە قەومەکەم ناکەم کە تائێستا بەهیچ ڕەنگێ یاریدەیان نەداوم و لە هەموو خاکی عێراقدا یەک دوو ئابوونەی کڕیاری خۆماڵی هەیە کە پارە ئەدەن!!.

خوا قەناعەتی داومێ، کە دەوڵەتێکە بەهیچ نافەوتێ، وردە وردە خەریکم لەگەڵ (نەفس)دا بجەنگێم، جارێ لە جل و بەرگ و سەر ڕاخەر و نوێن و هەوای فێنکی هاوین و ماستاو ئەمانە خۆم گرتۆتەوە و شیرینی ناخۆم چونکو نەخۆشی شەکر دزینم هەیە (شەکرە)!. خۆ ئەگەر خوا دەرەجەی ڕەزام پێ ببەخشێ ئەو تەواوە. بەڵام بەخوا لە دنیادا ئەمە خەیاڵی خاوە، باوەجود ئەمە بۆ من هونەر نییە چونکو هەندێ قەلەندەر وتوویانە (خۆم و گونم و فاتیلەی ژنم) خۆ من ئەو دوانەیشم نەماوە!!. با، شەش حەوت منداڵی ورد و ژنێکی تەڕپیرم ببوایە، ئەوسا، وا بوومایە!!.

لەبیرمە لە دەورەی خولیای شەبابدا کەوتمە ئەستەموڵ، یەکەمجار لە (أطه) دراوسێی ڕجائی زادە (ئەکرەم بەگ) و (عوشاقی زادە) و (خالید ضیا) و (حسێن ڕەحمی) بووم، (ڕەزا تۆفیق)یشیان پێ ناسیم. کەوتمە بەهەشتی (سەروەتی فنون)ەوە.

کە ئێواران لە ئەستەمولەوە بەپاپۆڕ ئەگەڕامەوە بۆ لانەی سەعادەتی خۆم کە جزیرەی (أطه)بوو، وە سەروەتی فنوونم لە گۆگرتەی ئەو پاپۆڕی سەر دەریای مەڕمەڕیەدا ئەخوێندەوە تەئسیری ئەو شیعر و ئەدەبیاتە لە (سندبادی بەحری) زیاتر ئەیخستمە دەریای خولیاوە و کە لە (غرامەفوندا) گوێم لە نەغمەی بەستەی خۆم ئەگرت کە بۆ (مهر النسا)م وتبوو، ڕۆحم ئەچووە سەر تەختی سلێمانی سلێمانی، وام ئەزانی فریشتەی ئاسمان، پەری سەر کێوی قاف گوێ لە





دەنگی شیعری من ئەگرن، هەندێ جار شەوی مانگەشەو کە ئەچوومە کەناری دەریا و تریفەی مانگ ئەیدا لەو ئاوە و جریوەی ناز و غەمزەی ئەو کچە ڕۆمە دولبەرانە و ئەفسوونی ئەو ئەفسوونگەرانەم ئەبیست، لە هیچە ئەکەوتمە خولیای شیعرەوە. وام ئەزانی گوڵ بۆیە ئارایشتی خۆی ئەدا من شیعری پیا هەڵدەم بولبول بۆیە بەدەوریا ئەسووڕێتەوە شیعری منی بەسەردا بخوێنێتەوە!. نەسیمی شەوان نەشیدەی عەشقی من ئەبا بۆ کچان و لەلای ئەوانەوە بۆنی عەتر دێنێ بۆ من!.

بەڵێ، لەوێ، بەڕوتبە و نیشان و (ئەعزایەتی مەجلیسی عالی)یەوە لە (أطه) کە مەڵبەندی (پرنسەکانی) کۆنی ڕۆم بوو، لە قەسرێکی مومتازدا دائەنیشتم، کە شەو ئەنووستم لە خەوما لە (گورگەدەر) لە باخەکەی شێخ ئەحمەدی بازلیخا هەنارم ئەدزی!.

ئێمە کە ئێستا لەناوخۆماندا دوژمنی ئازادی یەکتر بین، هێشتا تەربیەی ئیجتماعیمان لەژێر کەمەندی خزمەتکاری پارەی پارەداراندا بێ و دووبەرەکی و بەنەبوونی یەکتری خۆشحاڵبوون لەناوماندا بێ چۆن فکری ئازادی لەو دەماخەدا ئەگونجێ!؟. داخی ئەوە ئەمکوژێ ئەم خاکە نەخوێندەواری لە خوێندەوار شاعیرترە، گەدای لە پاشای جەوانمەردترە!!.

ئەم یەک دوو ڕۆژە (فائق بێکەس)م دی، وتی ئەوە تۆ بۆ چ هەندێ شیعری شێوەی شاعیرانی پێشوو ناڵێی؟! شیعری خەیاڵی و غەرامی و مەیی و مەعشوق نەبێ ناخۆشە، تۆ هەر لەسەر هەڵپەڕکێ ئەڕۆی، شیعری وشک و بێ درۆ ئیتر بەسە!.

وتم، فائق من بەڕاستمە، شاعیر نیم و ئێستا ئەوروپایی هەرچی شاعیریان هەیە لە خولیا و موبالەغەت لایان داوە و مادی و حەقیقی دەنووسن، ئێستا من لەهەندێ شیعری پڕ ئیغلاق و طمطراقی کۆنی خۆم شەرمندەم. خۆ هەندێ تەشبیە هەیە کە جاران زۆر پەسەند بوو ئێستاکە لێی ورد ئەبینەوە تەریق ئەبینەوە!. پیاو مەحبوبەی لا ئەبێ بەدەڵەدێوێ تابتوانی ڕاکەی لێی، مەسەلەن وتوویانە:

ئەبرۆی کەمەندی ڕۆستەم و گیسو کەمەندی زاڵ
مژگان سنان گیو زنج جاه بیژن است

دە وەرە کەمەندی ڕۆستەم کە تیری لە ئۆردوی ئێران پێ دەخستە جەرگەی توران و ئەو کەمانە و کەمەندی زاڵ کە سەد و پەنجا گەزی شایە و سەرە ڕمی گیو و چاڵی بیژن گردبوونەوە لە ئافرەتێکدا پیاو چۆن لێی ناترسێ؟! لەوە نازکتر زوڵفیان داناوە بەڕەشمار و برژانگ بەتیر، قەد بەداری سەروشمشاد. ئەمانە هەموو دڕندە و کوشندە چە تەئسیرێک ئەکاتە سەر ڕۆح!؟. بیستوومە، لە دانایان و تێگەیشتوانی هەموو تیرەیەک وتوویانە، ئەشێ پیاو خۆی بناسێ، ئەگەر نەناسێ ئەتاسێ!. من لە کاتێکدا خۆم ناسی کە هەناسەم لە کەساسیە! هاناوم نەماوە، کەڵکی

خۆمم پێوە نەماوە، تا لەم پیشە ڕەنجەڕۆیییە لابدەم، بەتەجرەبەی بیست و پێنج ساڵدا دەرکەوت و ئینکار ناکرێ. کە هاتمەوە ئەم خاکە، مەوقیعی حکومەتی عوسمانیم لەوانە بەرزتر بوو کە بوونە وەزیر، هیچ نەبێ من (متصرف)ێک بووم، کە (طە هاشمی) هات بانگی کردینەوە عیراق، من لە (متصرف)یەوە بەڕاکردن هاتمەوە، ئەوسایە لە کوردایەتیدا سەری گوێی خۆم ئەئەنگاوت لە ئەستەموڵدا غەزەتەی (کورد)م دەرئەهێنا. لە غەزەتەی هەرە گەورەی (تان)ی فرانسەدا شیعری کوردیم ئەنووسی، لە هەموو مجلە و غەزەتەی ئێراندا ئاوازی کوردیم بەرز ئەکردەوە و لە هەموو گەردشی کۆمیتەچی کوردستاندا ئەمنەڕاند، باکی پەت و سێدارەم نەبوو!. کە گەییمەوە ئێرە لە ڕێوە خزمەتی خوێندەواری و ڕۆژنامەکاریم لە هەموو خزمەتێ بەپێشتر زانی، لە هەموو عەلایق و خولیایەک وازم هانی، بیست و پێنج ساڵە غەزەتەی میللەتێک دەردێنم، گوناهە بڵێین (ژیان) و (ژین) گەنجینەی گەوهەری کورد نین، خۆ هیچ نەبێ وەک (کامەران بەدرخان) لە موئتەمەرێکی عالەمیدا هاواری کرد وتی، کورد سەقافەی هەیە صحافەی هەیە، ئەمە ناوێک و مەوجوودیەتێکە.

وەرن تێفکرن، ڕەنجەڕۆیی من ببینن، خانووم لە ڕەهنی پارەی کاغەز و حروفاتی مەتبەعەدایە و بەرگیشم کۆنە پۆشیی خێرەومەندانە!. لەناو جەرگیشم بڕوانن بووە بەخومخانە!.

ئەمەندە ساڵە من ئیسپاتم کرد کە ئەم ڕۆژنامەیە بۆ پارە و مەنفەعەت دەرنایەنم، لەسەر ئەوەدا یەک نوسخەی لێ نافرۆشم!!. هەموویم کردوە بە(کوللکسیون) و بەرەبەرە ئابوونەکانیش کەم دەکەمەوە. چونکو ڕۆژنامەی قەومێک ساڵی بەچارەکە دینارێک بێ کە تەنها کاغەزەکە بفرۆشنەوە بەحەڵواچی و بەقاڵ چارەکە دینارێک ئەکا!!. باوەڕ بکەن زۆری وا هەیە هێشتا فلسێکی بۆ نەناردووین لەگەڵ ئەوەیشدا بەپیاوخراپمان ئەزانێ!.

ئێستا بابێینەوە سەر عالەمی شیعر و ئەدەبیات، لە ساڵی (١٣٢٩)ی ڕۆمی (١٩١٣)ی میلادیدا، لە ئەستەموڵ غەزەتەی کوردی دەردەچوو من لە (چۆلەمێرگ)ەوە مەقالەیەکم بۆ ناردبوون و تەکلیفم لە جەمعیەتی کورد کردبوو کە لە هەر دیارێکی کوردستانەوە زبانزانێک بانگ بکەنە پایتەخت و زبانێک بۆ عموومی کورد هەڵبژێرن و بیکەن بەفەرهەنگ و دەستوور. هەتا مصارفاتی لەچاپدانیشم گرتبوە ئەستۆی خۆم، کەس گوێی نەدایە، ئێستا هەر کەسە بەهەوەسی خۆی شێوەیەک دێنێتە کارەوە، وایان شێواندوە.

بەم بەستەزبانی و بێ ژیانیەوە چە لافێک لێ بدەین؟ بۆچ کوردستان تەنها ئەم هۆمەرە کوێرەیە؟! بۆچ کوردستانی گەورە لە زبانمان نەگا؟! زبانی کوردی بەڕەنگێ شێواوە، من کوردم کەچی لە ڕۆخی (وان) و (حەکاری) تەرجەمانم بۆ کوردی ئەوێ ڕادەگرت. لەم بن دەستەوە هەورامی لە زبانی جاف ناگا!. ئەو هەموو موحیتی کوردستانە کە من باوەڕم وایە تا زبانیان



یەک نەکەوێ یەک ناکەون ئەمەندە هونەرمەندی زبانزان و قواعد شناسی تیاهەڵکەوت ئەهمیەتیەکیان بەزمان نەدا!. (عەبدوڵڵا جەودەت) کە لەپاش مەشرووتیەت لە ئەورووپاوە هاتەوە لە ئەستەموڵ بوو، زۆرتر لە هەموو کەس من لە خزمەتیا بووم، خۆم و نەژادی کوڕم بە(نظم) و (نثر) لە مجەلەکەیدا خزمەتمان هەیە. نەژادی کوڕم لە جزیرەی (هەگبەلی أطە) هاتۆتە دنیاوە خۆم قایمقامی ئەوێ بووم، بۆ ئەو موناسەبەیە (ئەمین زەکی بەگ) قەسیدەیەکی نووسیبوو (خالید ضیا) و (ئەکرەم بەگی ڕەجائی زادە) زۆریان پەسەند کرد، بەڵام من زۆری لەگەڵ خەریک بووم کە لەگەڵ شیعر خەریک نەبێ، قوەی تەحریری هەڵئەقرچێ، چاک بوو شوکور ئەمین زەکی بەگ وازی لەو پیشە درۆزنەی ئەو سەردەمە هێنا و دەستی دایە عیلم و فەن کەوا ئێستە بەو عیلمەوەیە ئەو هەموو خزمەتەی پێ ئەکرێ.

لە ئەستەموڵ کە جەمعیەتی کورد تەشکیلی کردبوو، لەگەڵ (ئیتحادچییەکانی تورک) بەربەرەکانیان بوو، ئیتحادچییەکان خەڵکیان ئەترساند. فیدائیان هەبوو، (ئەحمەد صەمیم) و (حەسەن فەهمی) کە وەک من غەزەتەچی بوون کوشتنیان، (عەزیز یامولکی) و نەژادی کوڕی منیش خۆیان بەفیدایی جەمعیەتی کورد قەید کردبوو. ئینجا هەر لەبارەی زمانی کوردییەوە، بزانن، من لە پێش تورکیەدا کە (لاتینی) قبووڵ بکەن و بەاصراری (عەبدوڵڵا جەودەت)ی کوردی (دیار بەکر) حرووفی لاتینیم کڕی و مەسرەفێکی قورسم کرد و زۆرجار لە (ژین)دا بە(الف با ء)ەکەی و شیعری کوردیم پێ نووسی. چونکو زبانەکەمان پڕ بوو لە عەرەبی و هێشتا نەبووبوە کوردی پەتی، بۆم نەکرا!. ئێستا هەندێک هەڵساون زبان و ئیملاکەیان کردووین بەپەند و جاڕسیان کردووین. جوملەی عەرەبی بەئیملای کوردی ئەنووسن، زۆر کەلیمەی وا هەیە، ئیملاکەی بگۆڕێ ئەبێ بەکفر و جنێو!. لەبەرئەوە تا زبانەکەمان ئەکەوێتە شێوەیەکی مەعقول کەلیماتی عەرەبی بەعەینی ئیملای عەرەبی قبوڵ بکرێ.

ئەم سلێمانییە تا زەمانی منیش منداڵەکانی چوار زبانیان بەدروستی و ڕێکوپێکی ئەزانی، تەحصیلمان بەدەستووری کۆنی حاکمانی (بەبە) فارسی بوو، تابیعیەتمان تورکی بوو، خۆمان کورد بووین، هەموو تجارەت و گوزەرانمان لەگەڵ بەغدا بوو. ئینجا فارسی و تورکی و کوردی و عەرەبی زۆر تەبیعی بوو، هەندێکیشمان فرانسزیمان ئەخوێند. ئاسار و ئەشعاری زۆر لە کوڕانی سلێمانی لە غەزەتەی ئەستەموڵدایە. زۆر ساحێب مجلە و غەزەتە خاوەندیان کورد بوون. زبانی کوردی بۆ هەموو جۆرە نووسینێک لە زۆریان ڕەوانترە و بەماوەترە، ئەتوانین سەربەخۆ هیچ وشەیەکی بێگانەی تیا نەبێ چی ئارەزوو بکەین بیڵێین.

لەم دواییەدا لە ئەستەموڵ دەورەی ئەدەبیاتی تورکی کە شاعیری وەک (عەبدولحەق حامد، تۆفیق فیکرەت، فائق عالی، ئیسماعیل سەفا، ئەکرەم، سلێمان نەزیف، خالید ضیا و

ئیسماعیل حەقی بابان، نەعیم بەگ، حوسێن جاهد) و هەزاران ئەدیب کە (سەروەتی فنون)یان لە ئەدەبیاتدا کردبووە خاوەن سەروەت و ڕۆحێکیان پێ دابوو منیش لەدوایانەوە گوڵەچن بووم. شاعیری مەشهووری تورک (عەبدولحەق حامد) کە شاعیرێکی ئاسمانی بوو، کە لە ئەستەموڵ لە دەوری ئەخیری پاش ئینقلاب هەموو ئێواران لە خزمەتیا ئەبووم، لە زۆر مصاحەبەدا بۆی مەعلووم بوو بوو کە من هەندێ لە ئەدەبیاتی فورس شارەزام، ڕۆژێکیان غەزەلێکی فارسی خۆمم بۆ خوێندەوە، فەرمووی ئەهلی سلێمانی لە کوێوە فێری ئەم فارسییە ڕەوانە شیرازییە بوون؟! وتم، لە قەدیمەوە تەحصیلی ئێمە فارسییە، زۆرتر بەشیعری حافظ و سەعدی ڕاهاتووین و حەتتا ئیعتقادێکی وامان بە(حافظ) هەیە کە کارێکی عاقیب مەجهولمان ببێ کتێبی خواجە حافظ ئەگرینەوە.

جاران کە شاعیران بهاتنایە شتێکی نایاب بنووسن سەربەست و ڕەوان بەزەمزەمەیی لە (بحر الطویل)دا ئەیاننووسی. تورک لەم دواییەدا ناویان نابوو (نظم سەربست، شعری منثور، شیعری پەخشان) ئینجا لەم کوردستانەدا لە پێشدا ئەمە باوبوو. لەپێشەوە (غولام شاخانی، والی سنە)، لەناویانا تاک بوو، (کەریم خان)ی حاکمی بانەیش لەوانەبوو کە لە (بحر الطویل)دا ئەیاننووسی.

لەم دواییەدا ئەدیبە ناودارەکانی تورک وەک خالید ضیا و مەمدوح وەفی، خاوەندی ئەیلول، شیعری منثوریان ئەنووسی. زۆر دەربەستی وەزن و قافیە نەبوون، لەم ڕۆژانەدا بەندێکی پەخشانی خۆمم بەرچاو کەوت کە لەوەختی کۆندا لای عەبدولحەق حامدی شاعیری مەزنی تورک دەمودەست بەتورکی نظم کرابوو بەتەرزێک کە گوایە لە کەس وەرنەگیراوە و نەبیستراوە، عەبدولحەقیش زۆری پەسەندکردووە، ئینجا دوای چەند ساڵێک لێرە کردمەوە بەکوردی سا، هەر چۆنێ بێ ئەو بەندی پەخشانە (شیعری منثور)ە کۆنە ڕۆحمی تازە کردەوە، کە لەسەرەتاوە وەهایە «خۆزگە فەن ئەمەندە باوی بسەندایە بەکامێرا وێنەی تۆم لە سپێنەی چاوما بەفۆتۆگراف بکێشایە، ببوایە بەنەقشی دیدەم. ئەوسا نە سوورمەی تور و نە ڕووناکی نوورم نەدەویست...هتد» ئینجا لە پێش برنادشۆدا شاعیرێکی فەرانسە (لامارتین) قەسیدەیەکی بۆ حەزرەتی محەممەد (د.خ) بەفرەنسزی وتبوو، مەرحوومی جەننەت مەکان (ئیبراهیم حەیدەری - شێخ الأسلام) لەسەر ئەو تەرجەمەیەی (داود)ی کوڕی بۆی کردبوو ئەو بەتورکی نەزم و تەرتیبی کرد، منیش لە غەزەتەی ئەستەموڵی خۆمدا کە ناوی (کورد) بوو نەشرم کرد.

هەروەها نالی غەزەلێکی هەیە:

لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان
بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان

لەساڵی ١٣١٩ی ڕۆمیدا ١٩٠٣ی میلادی لەسەر تەرجەمەی (داود) و نەزمی ئیبراهیم



ئەفەندی حەیدەری ناردم بۆ غەزەتەی (تان)ی پایتەختی فەرانسە - پاریس.

نووسین بەهرەیە، زۆر ئیحتیاجی بەتەحصیل نییە، من لە تەحصیلدارەکانی پایتەختی ئەستەموڵم و بیست و پێنج ساڵە غەزەتەچیم هەندێ (محرر)ی بێ دپلوم ئەبینم گەلێ لە من باشتر ئەنووسن.

ئیدمان و مەهارەت چاکترە، هەرچی بێ سەربەستی مەتبوعات موافقترە!.

با بێینەوە سەر من و ئەم نەتەوە و خاکە، من لە ئەوەڵ تەشکیلی (جەمعیەتی کورد لە ئەستەمۆڵ)ەوە لە ١٣٢٤ی ڕۆمی ١٩٠٨ی میلادییەوە هەتا ئێستا لە هەموو جەمعیاتی کوردا سەڵاحیەتدار بووم و بەشدار بووم. نەوەی بەدرخانی لەپێش (نەفی)دا لەگەڵ مراد بەگ و حەسەن بەگ و مدحت بەگ لە (شەهرامات)ی ئەستەموڵدا بەیەکەوە بووین. زۆرتریش لە خزمەت ئەمین عالی بەدرخاندا شەترەنجمان ئەکرد. بەو بۆنەیەوە لەگەڵ ئەفرادی عائلەی ئەواندا فەرق و تەفاوتێکمان نەبوو، دوای ئەوەی لە مەنفا هاتنەوە لە جەمعیەتی کوردا (کۆمەڵەی کورد)دا دیسان بەیەکەوە بووین. کاتێ ئەمین عالی بەدرخان چوو بۆ میسر و کۆنگرەیەکیان تەشکیل کرد، تازە من هاتبوومەوە بەغدا. ڕۆژێ دکتۆر (پاپازیان)ی مرخصی ئەرمەنی کە بەهۆی جەمعیەتی (خۆیبوون)ەوە ئەمناسی، لە قەهوەخانە ئەرمەنییەک کە لەسەر کۆڵانی حەسەن پاشا بوو منی بانگ کردە گۆشەیەک وەکارتێکی (ئەمین عالی بەگ)ی دامێ کە داوای کردبووم بچم بۆ (میسر)، چووم خەریکی پەساپۆرت بووم، کوڕێکی خەڵکی خۆمان لە دائرەی (تەحقیقاتی جنائیە و جوازسفر) بوو لە دوکانی شاکر مجرم یەکتریمان ناسیبوو هات بەپیرمەوە و داینام منیش پێم وت فلانی ئەمەوێ بچم بۆ میسر، کورد و ئەرمەنی کۆبوونەتەوە، تەرتیباتی حکومەتێک ئەکەن، وتی خوا بۆت ڕێک بخا بچی زۆرمان پێخۆشە. منیش بێ قۆرت و پەنهانی وتم ئەچم بۆ ئەوێ. کارتەکەم نیشان دا، ظاهراً بەشاشەتێکی نواند، تومەز چووبوو خەبەری بەڕەئیسی تەحقیقاتی جنائی دابوو و پەساپۆرتەکەیان لێ وەرگرتم. هەرچەند دادم کرد فایدەی نەبوو، مراجەعەتم بەوەزیری داخلیە کرد کە (ناجی شوکت) بوو، نووسی بۆ دائرەی جوازسفر پەساپۆرتەکەم بدەنەوە، نەیاندامەوە. ئەم (مارف جیاوک)ە کە ئێستە لێرە حاکمە پرتوستویەکی بۆ نووسیم چوومە لای کاتبی عەدل بۆم تەبلیغ بکا قبووڵی نەکرد. مارف بەگ وتی ڕەشید جوجە هەیە لە خانی (کبە) ئەو معاونی کاتب عدلە و زۆر بەغیرەتە و ناترسێ، بچۆرە لای ئەو بۆت تەبلیغ ئەکا، کە چووم بێ پەروا بۆی تەبلیغ کردم، خولاسە پەساپۆرتەکەیان دامەوە، بەڵام درەنگ بوو، وەعدی حازر بوونی کۆنگرە چوار ڕۆژی مابوو، بەمەئیوسی هاتمە قەهوەخانەی ئەرمەنییەکان، مات و مەلوول دانیشتبووم، پاپازیان هات وتی: ئێستا خەبەرم وەرگرت کە پەساپۆرتەکەیان داویتەوە، ناڕۆی؟!، وتم چۆن بڕۆم، ناگەم. وتی من ئەتگەیەنم تۆ ئەتوانی تا نیوسەعاتی تر

ئامادە بی؟، وتم من خۆم و باستۆنێک، ئەم دەقیقەیە ئامادەم، وتی نیو سەعاتی تر ئەڕۆی. خۆی ڕۆیی، نیو سەعاتی پێ چوو ئوتۆمبێلێک هاتەبەر چایخانەکە، ناوی خوام هێنا سوار بووم، پەڕینەوە ئەوبەر.

لە ئۆتۆمبێلچیم پرسی ناوت چییە؟! وتی: (ئارشاق) وتم: موبارەکە. ئیتر لێی خوڕی، چونکە ڕۆژ درەنگ بوو، گەیشتینە دلێم سەعات دوو و نیوی عارەبی بوو، بردینیانە گومرگ هیچمان پێ نەبوو. بەڵام دائرەی شرطە وتیان ئەمر دراوە لەسەعات دە بەولاوە هیچ ئۆتۆمبێلێک نەڕوا. هەرچەندە وتمان ئێمە تعهد ئەکەین مەسئولیەتی ئێوە نەبێ دادی نەدا. (حەمە سەعید قەزاز) لەوێ مودیری تەحریرات بوو هێنامە ڕجا فائیدەی نەبوو. ئارشاق وتی: تۆ بەپێیان بڕۆ یان لەو لای شارەوە مەخفەرێکی شرطە هەیە لەوێ تێپەڕە باخێکی لێیە نەدیوە. لەوێ بوەستە من دێم تۆ لەوێ سواربە ئیتر کەس نامانگاتێ. نوطێکی دە ڕووپێیم لە حەمە سەعید سەند، تومەز پارەیشیان دابوو بەئۆتۆمبێلچیەکە کە لەسەر قطاری شەمەندەفەری (حەیفا) بمداتێ. من وەک بۆ گەڕانی قەراغ شار بچم وردە وردە لە مەخفەری شرطە تێپەڕیم لای باخەکە ڕاوەستام ڕوانیم تەپ و تۆز پەیدا بوو، ئارشاق هات، ئەمما هات!. هەرچەندە لەمەخفەرەوە قفیان لێکرد نەوەستا، بەفڕکانێک منی وەرگرت، یاڵڵا بۆ (رطبە). جا ئەو ڕێی تەهلەکەیە کە هەموو ئۆتۆمبێلچیەک ڕێ دەرناکا. تومەز ئەرشاق شارەزابوو، لێی خوڕی. جا ئەمە دوور و درێژە. کە گەیشتینە سەر شەمەندەفەر کوڕێک لەسەر محطە ڕاوەستابوو، ئارشاقی ناسی، منی بانگ کرد، وتی شەمەندەفەر ئەڕوا زووکە. بەپەلەپەل سوار بووم. کوڕێکی تر لەوێ پەلی گرتم جێگای نیشان دام و دانیام بلیت و خواردەمەنی حازر، کوڕەیش تورکیەکی باشی ئەزانی ناوی (ئارتین) بوو. ئەم باسە زۆری ئەوێ و ئەوەندە بەسە!.

هەر سەبارەت بەکورد و ئەو کۆنگرانەی بۆ دەستخستنی مەوجودیەتێک بۆی بەستراوە کۆبوونەوە گەورەکەی کەنار زەڵم و هەوڵی مەردانەی مەحموود پاشام دێتەوە بیر.ساڵی ١٣٠٣ی ڕۆمی ١٨٨٧ی میلادی تا ئەیلولی ١٣٠٥ی ڕۆمی ١٨٨٩ی میلادی، لە هەڵەبجە لەسەر وەزیفەی ئەرازی (سنیە) بووم، زۆرتر موحەبەتی مەحموود پاشام بوو.

ئەگەرچی وەسمان پاشا قائمقام بوو، مەحموود پاشایان کردبوو بە(متصرف)ی ئورفە، نیازی نەبوو بچێ، تا شەوێکی (٢٥)ی ڕەمەزانی ١٣٠٦، لە کەناری زەڵم مەحموود پاشام ئیقناع کرد بچێ بۆ ئەستەموڵ. هەر ئەو شەوە دوای پارشێو سواربوو ڕۆیی و دوایی لە ئەستەموڵ ڕای کرد، بەبەری باکۆدا هاتەوە و دنیای تەجرەبە کرد لە ١٥ی شوالی ١٣٠٩ و یەکی مایسی ١٣٠٨ چوەوە. ئەمجا بەعەفوو و ئیعادەی ڕوتبە و نیشانەوە لە دووی جماد الأول-ی ١٣١٢دا هاتەوە.

لەم هەموو تەجرەبە و چاوپێکەوتنە نەگبەت و سەعادەتەدا هاتبوو بەخەیاڵیا کە حکومەتی



عوسمانی حوکمی نەماوە ئەو حکومەتێکی کوردی تەشکیل بکا. بەو خەیاڵەوە هەرچی ناودار سەرکۆماری کوردستانی ئەملایە کۆی کردنەوە و لە کەناری زەڵم کۆنگرەیەک بەسترا و قەراریان دا کە هیچ مانعێک نییە کوردستان حکومەت بێ.

زۆرتر ئومێدی بەمن بوو قانوونی ئیدارە و تەشکیلی حکوومەتە تازەپێگەیشتووەکانی بۆکۆ بکەمەوە و بیکەن بەدەستووری ئیدارە. منیش لە هەموو تەرتیباتێکدا ئوسووڵی (فەدراسیون)ی (برنس بسمارک)م پەسەندکردبوو کە تەشکیلاتی ئەساسییە.

جاف عەینی ئەو قانوونە بوو، تا دوایی ڕۆژ بانگی کردم فەرمووی بێنە بزانم چیت هێناوەتە قەڵەم؟ منیش شێتانە بەزبانما هات وتم پاشا بەخۆڕایی خۆم ماندوو ناکەم! زۆر تووڕە بوو، ناهەقیش نەبوو. دوایی عەرزم کرد پاشا تەشکیلی حکومەت سەهلە و قانوون نامەکەیشی حازرە، بەڵام لێکی بدەرەوە کێ ئەبێ بەرەئیسی حکومەت؟!. محەممەد پاشای باوکی تۆ؟ کە یەکە دانای عەهد و پەسەندی شای ئێران و شکۆهی لە پشت بوو، خەزوورەکانی کوڕەکانی تووڕەیان کرد متصرفی جێ هێشت!! سلێمانی لە ئیبتدای تەشکیلیەوە هەرچی ئەبوو بەحوکمدار برا بچووکەکەی دەری ئەپەڕاند. ڕاوەستە تا هۆشی برایەتی و یەکیەتی دێتە کەللەوە ئەوسا سەهلە. هەناسەیەکی هەڵکێشا و وازی هێنا!

لە ئەستەموڵ جەمعیەتی کورد کۆبوونەوە و هەژدە هەزار مەئموور و کاسب و حەماڵ و پاشایان حازر بوون، هاتنە سەر ئەوەی یەکێ بکەن بەڕەئیس، بوون بە حەوت فیرقە. دەستەیەک شێخ قادری شێخ عبیداللهّ و دەستەیەک شەریف پاشای سەفیری پاریس و ئەم حەوت لەشکرە گەورەیە لە مزگەوتی (ایا صوفیە)دا یەکتریان دایە بەر خەنجەر!!. کەس گەورەیی کەسی قبوڵ نەکرد خالید بەگی ڕەئیسی سەورەی ئەرزڕۆم قەراری دابوو کە لە حکومەتی عوسمانی جوێ نەبێتەوە، شەهزادەیەک والی عموومی کوردستان بێ. ئەوە باش بوو، بەڵام قیامی شێخ سەعید هەموو ڕەنجێکی بە با داین!. هەموو نامدارەکان لە قەنارەدران! خولاسە تا خۆمان نەبین بەپیاو و یەک نەکەوین کەس نامانکا بەپیاو.

لەبیرمانە کە بەغدا هەندێ پیاوی وەک (عەبدولمحسن و جعفر و یاسین)و ئەمانەی تیا هەڵکەوت کە سەرپێچی ئینتداب بکەن، ئێمە ڕاست بووینەوە وتمان بەغدامان ناوێ! کردمانە هەرا و چەند جگەرگۆشەیەکی بێچوە شێرمان هەڵفریواند بەخەنجەرەوە هەڵیان کوتایە سەر مەترالیوزی عەسکەر و شەشی ڕەشی ئەیلوول بەکوشتیاندان، زۆری پێ نەچوو ئەو دەستە دەستی بەستن و ناردنیە بەندیخانەی کەرکووک!!. لەپێشدا پیرەمێرد بەشداری نەکرد، وتیان خائنی وەتەنە!! ڕای کرد چووە کەرکووک، لە دواییشدا هەر ئەو بۆیان گریا و هەوڵی بەرەڵڵا بوونی بۆ دان.

جاری دووەم کە تورکیا بەشداری حەربی عموومی نەکرد و ویستیان ئیعلانی حەربی لەگەڵ

ئەڵمان پێ بکەن بۆ ئەمەی کوردەکانی شمالیان لێ بورووژێنن!. دیسان زاتێکی بوزرگواریان نارد و بەخەیاڵ کوردستانێکیان دروست کرد! و لەسەرو خواری حدودی کوردەکانا دوو لیوای کوردەواریان هێنایە کایەوە تا ئیش تەواو بوو، تورکیە ئیعلانی حەربی لەگەڵ ئەڵمان کرد هەر ئەو سەعاتە ئەو بزورگکارە کە بۆ ئەو ئیشەیان ناردبوو هەڵیان گرت و لە کاریان خست!!.

شەیتان برەوی لە من زیاترە، تەئسیری سیاسەتی خارجی ناهێڵێ!! خۆ من هەموو کەس ئەمناسێ کە تا ئێستا هیچ ئەمەلێکی شەخسیم نەبووە و نایش بێ، ئەم داد و فغانەم تەنها بۆ یەکیەتیە. من خوا بەکوردی سروشتی داوم لۆمەم مەکەن، وا نەورۆزیشمان نزیکە ئەگەر مام ئەمساڵیش دەهۆڵژەنی و سەرچۆپی کێشتان بۆ ئەکەم. کە مردیشم توخوا کورگەلی (زانستی) کۆن، ڕۆڵەکانی خۆم لە گردی یارە ئاگری نەورۆز لە ژوور سەرم هەڵگیرسێنن.. ئەو ئاگرە ڕووناکی ڕێی ئایندەی کوردە، بەخوا من ئاگرپەرست نیم و خوا پەرستم.

ناڵەی پیری پیران. بخوێننەوە، ئاگرێ کە خۆم بیکەمەوە و بتوانم بیکوژێنمەوە، کێ باوەڕ ئەکا بیپەرستم؟!. ئەوروپایی سەری ساڵیان (فاڵ) بەقومار ئەکەن کەشانسی ئەو ساڵەیان تاقیکەنەوە من بەنووری خوایی، بەگڕی ئاگر ڕێی ئایندەی قەومەکەم ڕووناک ئەکەمەوە، عادەتێکی باوک و باپیرمە، پەیڕەوی ئەوان ئەکەم. ئەم نەورۆزە ئەو تازە ڕۆژەیە کە خوا هەست و نیستی تیا ئافەریدە کردوە و ئەمرۆ بەچاوی خۆمان ئەبینین کە هەرچی لە زەمیندایە دار و گوڵ و گڵ، جانەوەر و گیانلەبەر ئەژیەتەوە و ئەبووژێتەوە. سەرەتای تازەیی لێ دەرئەکەوێ.

منداڵ بووم، لای مەلا حوسێنە گۆجە ئەمخوێند، کە ئەگەیشتینە دەمی بەهار مامۆستا ئەیگوت بچن نەورۆزانە بێنن، ئێمەش بەسەر دایکمانا ئەگریاین، سا دایک و باوکمان هەرچیان لە دەست بهاتایە، هەرچیان لەبار بوایە یا (چەرخی)یا (قڕانی حەمەشایی) یا (نەبات) ئەیاندایێ، ئەمان هێنا ئەویش بەشی خۆی لێ هەڵدەگرت.

یەکێ (قەمەریەکی) ئەدایێ، ئەچووین لە مزگەوتی شێخ ئەوڕەحمانی شێخ ئەبوبەکر، (شێخ ئەوزای (تولەتۆیی) خەتی خۆش بوو، نەورۆزنامەی بۆ ئەنووسینەوە.

ئەم ئاگرکردنەوەی نەورۆزە کە لەپێشدا لەناو ئێمەدا باو بووە، ئێمە تاب و توانا و مەوجودیەتێکی وامان نەمابوو کە هەموو ساڵێ ئاگری نەورۆزی نیشانەی ساڵی تازە بکەینەوە. ئەو ڕۆژە بەجەژن بزانین و سەیرانی تیا بکەین، کاتێ من لە ئەستەموڵ هاتمەوە بەخۆشی خۆشییەوە بیستم ناوونیشانێکمان بۆ پەیدا بووە و زبانمان بووە بەکوردی و مەئمورمان لە خۆمانە، ئەوەم بەجەژن زانی و هاتەوە یادم کە ئێمە هەموو ساڵێ جەژنێکی نەورۆزمان بووە و نەورۆزنامەیان بۆ ئەنووسینەوە بەو یادی گیانی باو و باپیرەوە هەڵسام ڕۆڵەی زانستیم پێش خۆم خست و لە گردی یارە شەو ئاگرم هەڵگیرساند و ڕۆژ سەیرانم کرد، هەندێک وتبوویان حاجی



تۆفیق نەورۆز بەپارەی ئینگلیز ئەکات و بۆ ئەوانی ئەکات، ئەمە لە کفری ئاتەش پەرست کفرترە. ئینگلیز چە دەخلێکی بە نەورۆزەوە هەیە، یاخود من کەی لە خوانی موچەی ئینگلیز نیعمەت خۆر بووم؟! هەموو ساڵێک هەرچیم دەست ئەکەوت ئەمکرد بەسەیرانی نەورۆز کە تا ئێستا کەس ئەوەی نەکردووە. ئەمە ناو و شۆرەتێکی کوردەواری بوو، بەهیچ وازم نەهێنا، تا پار هەندێ بێ نامووس و زۆڵ هەڵسان وتیان حاجی تۆفیق نەورۆز بۆ ئینگلیز ئەکا، ئێمە نایەڵین ئەو بیکا و خۆمان ئەیکەین، پارەیەکی زۆریان کۆکردەوە، نیوەیان خوارد و پەکی سەیرانی منیشیان خست.

لام وایە ئەوانەی من بەتەرەفداری ئینگلیز ئەزانن لەم دواییەدا تێم گەیشتوون کە من ئینگلیزم بۆ خۆم خۆش ناوێ و هەرچی مەنفەعەتی شەخسی و تخصیصات و تەنانەت پارەی ئابوونەیشم لەوان نەویستوە و نایشمەوێ. تەنها بۆ ئەمە کە لە ڕەوشت و ئەخلاقی ئەوان دەرسێکی ئیدارە وەرگرین و پەیڕەوی ئادابی ئەوان بکەین. هیچ نەبێ لەناو خۆمانا یەکیەتی و هاوبەشیەکی وامان هەبێ کە لە پیاو بچین. تەنانەت دۆستێکی گیانیم لێرە قونسوڵی ئێران بوو نەمهێشت بێتە سەیرانی نەورۆز نەک بڵێن ئەمە بەهەوای ئێرانەوەیە.

کاتێکیش چوومە ئەستەموول لە سەرای پادشاهیدا ڕۆژی نوێی مارت هەموو (وکەلا) و (وزەرا) ئەهاتنە (مابەین) تەبریکیان ئەکرد.

نیشان بەو نیشان شیرینی نەورۆزیان ئەخوارد و شەوی نەورۆزیش لە هەموو منارەکاندا قەندیلیان دائەگیرساند.

## من و تەرەفداری ئافرەت

ئەوانەی عالەمی مەدەنیەتی ئەوروپایان دیوە لێیان ئەپرسم کە ڕێیان کەوتبێتە هەر کیشوەر و شارێکی لە هەموو توجارەتگاهو ڕەنجشگاهێکدا ئافرەتیان زۆرتر لە کارا دیوە. یا ژنان لەم بازاڕی جهانەدا کە سەراپای ئەندامیان جلوەی نووری لێ ئەبارێ وەک غونچەی گوڵەباخی بەهەشتن. دیارە ئەوانیش وەک بەشەر هەوا و هەوەسێکی زیندەگی و کامەرانیان هەیە، چە ڕەوایە ئەوانە بخەنە چوار دیوارێکی بەندیخانەی ڕۆح و حەیاتەوە و گرۆهێکی ڕیش بۆزی سەر و سورەت پڕ لە تۆزیان بەسەرا زاڵ بکەن. ئەبێ ئەو نەوەیە کە نا بەدڵ لەوانە پەیدا ئەبێ چە هیوایەکیان پێ بێ. لە هەموو تەحلیل و بەراوردی حیکمەتدا دەرکەوتوە کە حسیاتی ورد و نازک و شعووری بەزەیی و دڵسۆزی ژنان لە پیاوان بالاترە. بەو بەدەنە لەتیفە و ڕۆحە نازکەوە بۆ پەروەرشی منداڵ و خزمەتی نەخۆش و غەمی گوزەران زۆر جار ڕۆحی خۆیان ئەخەنە تەهلەکەوە. هەندێکیان بەنەختێ خوێندەواری بوونە ئاتەش پارەی شیعر و ئەدەب. هەندێ شیعری ژنان هەیە کەس ناتوانێ ئینکار بکا کە لە شیعری پیاوان بالاترە بەڵام ڕوویان نەهاتووە تا ئێستا بیانخەنە

مەیدانەوە.

سالّەهای سالّە ئێمە ئەلّێین ئەگەر جنسی لەتیف لە دەرەجەی پیاواندا بناسرێن و خوێندن و کۆششیان ببێ، لە پیاو دواناکەون. زۆر ژنی وا هەیە کە لە پیاوەتی و ڕەویەی بزرگی و دەستگیری بێ چارەکان و ئیدارەی میوان و دیواخان و فکری ئیجتماعی و سیاسی و ئیداریدا پیاوان و پیاوانیان هێشوویان لەپشتەوە ناکەن. من هەمیشە هیواداری تەبەقەی کچان و ژنانی خوێندەوارم بەتەربیەی عیلم و فەن ئەولادی وا پێبگەیەنن کە خزمەتی قەوم و نیشتمان بکەن و قەومەکەی خۆیان سەرخەن. کەچ نەزەران هێشتا ژنانمان بەکوتەکی بەر خەرەک و دایەنی بەربێشکە ئەزانن. تورکیە حەقی مەبعووسی و دکتوری و ئەوقاتی دانێ، ئێمە تازە خەریکین بەنووکە شەق لەگەلّیان ببزوێینەوە!!. لە کۆندا لەم وڵاتەی ئێمەدا خوێندنی کچ زۆر زۆر لای (مەلا ئامینە) تا (یاسن) بوو، ئەویش بۆ ئەوەبوو کە لە مالّەوە نەیەتە دەرەوە و بەقورئان خوێندن ڕایبوێرێ. نەیان دەهێشت کچ فێری نووسین بێ نەک کاغەزی عەشقبازی کوڕان بخوێنێتەوە و جوابی بنووسێتەوە. یەکە ئارایشتی ئەو وەختە چاوڕشتنی (کل) بوو. کچان ئەگەر چاویان بڕشتایە پێیان ئەگوتن:

چاوی ڕشتــــوە بەکلە بەنێ
مــێــردی ئەوێ تێــوەی ژەنێ

خۆ ئەگەر بەسابوونی دێمەشۆرە دەم و چاوی بشتایە ئەیانگوت:

دەم و چاو ئەشوا بەدێمە شۆرە
وا دەردەکەوێ عــاشــقی زۆرە

جا بەم پێودانە ئافرەتانمان بەچیرۆکەی چەرخ و فەلەکی پیرێژن و دێگونەچاری و تسی گورگی ناو هەمانە دەماغی پەروەردە ئەبوو. کوڕانیشمان زۆرتر بەتەربیەی ئەو نەوعە دایکانە پەروەردە ئەبوون و چووبوون بەناخی زەمیندا و کەوتبوونە سەر بەرانی ڕەش. تا خوا کردی مەکتەبی کچان لە سلێمانی کرایەوە لەپێشدا ویقوواژیان کرد، کچانی خۆیان نەنارد. تا ئێمە دەستەی کچانی خۆمان نارد ئەوانیش ناچار مان!! بەرەبەرە کچانی مەکتەب پەرەیان سەند. بەهیممەت و جەسارەتی مودیرەی مەکتەب کچانمان برد بۆ ساحەی موسابەقەی (فوتبۆل) هەموو بەبەرگی سپی لاهووتی و مەلەکوتیەوە بەدەوری ساحەدا چەرخێکیان دا و نەشیدەیەکیان خوێندەوە. زەمین و ئاسمان هاتە جونبوش. ئەو سەفوەت و لەتافەتە و ئەو سەربەستی و حەماسەتە بەدلّێکی پاک کوڕ و کچی کرد بەخوشک و برا. یەکێ لە فەردی ئەو نەشیدەیە ئەمە بووە:

تا سـەویەی کـچـانمان بەرز نەبێ لە ئیـدراکـا
ئەولادی چاک پێناگــا و وەتەن تەرەقی ناکــا





حەیاتی ژنان ئەمەندە ئینقلاباتی ڕەنگاوڕەنگی تیایە هیچ کەس بۆی ناچێتەوە سەریەک. لە پێشدا شرکەتی حەیات و تەساوی حقوقی ئادەم و حەوا ئنجا ئەسارەت و ئنجا بەفرۆشتن، کە ئێستاش ئەفرۆشرێن ئنجا فڕاندن. ئنجا (تعددی زەوجاتی) بنو عباس، و پاشاهانی تورک دوای ئەوە دەورەی (دەرەبەگی) ئەوەلّ شەوی کچێنی موتلّەق هی دەرەبەگێ بوو. تەنانەت لە هەورامانی ئێمەیشدا شتێک بوو وا!!. لە چیندا سەردەمێک ژن مندالّی ئەبوو پیاو بەزەیستانی لە جێدا ئەکەوت. بەرامبەر بەمانە ژن گەیشتبوە پایەی خوداوەندی ئالهە و زۆر قەڕالیچە و حکمدارانی بەناویان بوو. ئەمانە هەموو بەئیجاباتی زەمین و زەمان گۆڕراوە.

بۆ سەلامەتی ئیزدواج زۆر پێویستە شووکردن و ژن هێنان ئەبێ سەربەست بێ، هەقی ئینتخاب بەهەردوو لا بدرێ. هەر شوو کردن و ژن هێنانێک نابەدلّی تیا بێ ئەو نابەدلّییە ئەبێ بەخۆرە ئەتەنێتەوە. دوایی لە لایەکەوە خۆی دەردەخا و خانووی سەعادەت ئەڕووخێنێ. تا ئێستا ژن هێنان هەر بەئارەزووی کوڕان بووە، لەمەدا دەماخ و عزەتی نەفسی کچان شکاوە و دلّی بەو مالّ و مێردە خۆش نەبووە کە بەئەسارەت هاتوە.

زەمانێک دێت کە کچان لە نەتیجەی خوێندن و سەعی و عەمەلدا داماوی بەخێوکردنی مێرد نابێ و ئەوسا ئەوانیش گالّتە بەهەرزەکاران ئەکەن و شوو ناکەن، ئەمە ئەبێ بەڕەخنەیەک لە تەزایدی نفوس. کەواتە لەپێش ئەمەدا هەقی شووکردن بدەن بەکچان.

بۆ چ ئەو باوکانەی بەزۆرە ملی دلّی کچ ئەشکێنن شاربەدەریان نەکەین. دوانیان بەردەباران بکرێ عار ئەنێن.

دەردێکی تریشمان هەیە، تەلّاق، کەمێردیکی بەدخوو هەر لە خۆیەوە تەلّاق ئەخوا، ئافرەتێک کە ڕەنجی داوە مالّی پێکەوە ناوە. مندالّی بەخێو کردوە بەجارێ هێلانەی لێ ئەشێوێ. تەنها هێلانەی ئەو ئافرەتە ناشێوێ. بناغەی هەلّکردی میللەت و دیواری یەکدگیری جەمعیەت ئەڕووخێ. ئەمەش بەستراوە بەنیکاحەوە، ئەگەر ژن لە هەلّبژاردنی هاوسەری خۆیدا سەربەست بێ و تەساوی حقوق لەناودابێ پیاو بەخۆڕایی ناتوانێ ژن دەرکا!. تەلّاق وای لێهاتووە هەندێ هەروا لەخۆیانەوە سێ بەسێ تەلّاق فڕێ ئەدەن، یا بەدرۆ لە پاکانەیەکا تەلّاق ئەخوا. لە مەزهەبی حەنەفیدا ژن ئەبێ تەلّاق قبوولّ کا، کەچی لەناو ئێمەدا وەک جل بگۆڕین وایە!!.

ئەم جاری دوایییە کە چوومەوە تورکیا، لە ئەزمیرەوە سواری پاپۆڕ بووم هاوین بوو لە بانی پاپۆڕەکە جێیان بۆ ڕاخستبووم، لە تەنیشتمەوە کوڕێکی جوان ڕاکشابوو! دەستەلەیەکی سووری ئەزمیریی لە ژوور سەری دانابوو، ئاوی تیابوو، پێم گوت: برادەر ئەفەرمووی قومێ ئاو بخۆمەوە؟ پێکەنی، وتی: فەرموو. توومەز کە بەیانی ڕوانیم ئەمە کچە!!.

پێکەنینەکەی بۆ ئەوە بوو من شەو بەکچم نەزانیبوو!. چەند سالّ پێش ئەمە کە من چوومە

تورکیا (ضابطە) هەر ئافرەتێکی بدیایە کە چارشێو و پەچەی کورتە ئەیگرت. جا سەیری کەن زەمان چی بەچی کردوە؟!.

# ئەوانەی ناسیمن

## ١- حەمدی بەگی صاحبقران

ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ کە لەسەر دەفتەوی شوعەرادا (حەمدی) بوو، بەجارێ لێمان گوم بوو. ئەشێ بۆ برا و کوڕ و کەس و کاری ماتەمێکی بەئێش بێ بەڵام هیچیان بەقەدەر (ژیان) پێیان گران نییە! چونکو پایەی بڵندی شاعیری ئەو بەکەس پڕنابێتەوە. هەیکەلی بوزرگان نامداران شێوەیەکی خاوەندیان ئەنوێنن. ئاخ، هەیکەلی شاعر بەخامۆشی ئەو ڕۆحە دەرناخا، مەگەر دیوانەکەی بکەوێتە کایەوە و هونەری بکەوێتە ناوەوە.

شاعیریی ئەحمەد بەگ، خوداداد بوو، بەخوێندن نەبوو. ئەمە لای تیپی دانشوەران پەسەندترە، لەناو نامدارانی ئەدەبی تورکدا (ئەکرەم بەگ)ی ڕەجائی زادە کە ئوستادی ئەعزەمی (علم البیان) و (بدیع و معانی ) و خاوەندی تەعلیمی ئەدیبانە، زۆر هەوڵی شاعیریی داوە بەسنعەت و کولفەتیشی زۆرە!. لە هیچ وەختێکدا ناگاتە (ئیساعیل سەفا) کە شاعیری (مادەرزاد)ی پێ ئەڵێن. ئەو ڕەوانی و نەرمی زەمزەمە و سەفای شیعری (سەفا) بەعیلم و سیفەت پێکنایە. خوداوەندی شاعیرانی تورک (عەبدولحەق حامد) ئێستاش قواعید و سنعەتی جناس و لەفزی نازانێ، پەروازی لە ئاسمان و شیعرەکانیی وا لە ژوور مەعناوە.

ئەحمەد بەگ، هەندێ شیعری خۆیت لێ بپرسیایە ئەمەندە بەمەعنا بوو و خۆی مەعناکەی نەدەزانی و نەشیئەزانی کە ئیلهامێکی ڕۆحە!.

من بەش بەحاڵی خۆم، ئێستا کە ئەحمەد بەگ پەروازی شاعیرانەی کردوە (مردنەکەیشی شاعیرانەیە) ، پێی لێ ئەنێم، شاعیری وەک (ئەحمەد بەگ)مان لە دوای مەولەوی کەم بووە (مەحوی) کە بەدیوانەکەی هیچ مەحویی لە بارا نییە زۆر کولفەتی پڕ مەعنایی کێشاوە و پەیڕەوی (بێدل)ە، تۆ لە هەندێ مەعنای وردی لادە، لە ئاهەنگ و زەمزەمە و بڵندیدا، حەمدی خۆش شێوەترە!. من خۆم شاعیر نیم، بەڵام خوا زەوقێکی داومێ شیعر بناسم و بەرۆح ئاشنای شاعیران بووم. لەگەڵ ئەحمەد بەگدا ئاشنایی پەنهانیمان زۆر بوو!!. ئەو سوارچاک بوو منیش بەڕاستی وڵاخی چاکی ڕەسەن و جسنم ئەناسی، ئەو شاعیر بوو، منیش لە ئاهەنگی شیعر دەگەیشتم، جا لەبەر ئەوە بۆ من دەردێکی گرانترە!.





## ٢- مەحموود پاشای جاف

زۆرجار لە خزمەت مەحموود پاشادا بووم، کەشکۆڵەکەیشیم لەلا یە کە بەئاخ و داخەوە تەئریخی مەرگی براکانی تیا نووسیوە، خۆم کوڵەباڵی کورکم لەبەر مەحموود پاشادا دیوە کە بۆ ڕاو لەبەری ئەکرد پێڵاویش خۆ دیارە کەوش بوو.

ئێمە باسی حەیاتی ئەدەبی مەحموود پاشا ئەکەین، زۆر کەس هەن کە ئەم سەرلەوحەیە ئەبینن هەڵدەستنەوە!، مەحموود پاشا و حەیاتی ئەدەبی؟!، چونکو تا ئێستا کە وتبێتیان جاف کوردێکی خێمەنشین، سەحرانەوەرد خێڵە و خوار و خێڵە و ژوور سوار ماینی ڕەسەن و تفەنگ و فیشەک و تیپی سوارە و ئاژەڵی زۆری ڕەوگ و ڕانی هاتۆتە خاترەوە. هەرچەند لەم دواییەدا یەک دوو کەسێکی شاعیر لە نەوەی بەگزادە پەیدابوون، ئەوانە لەناو جافدا پەروەردە نەبوون، کوڕە قائمقام بوون، لە مەرکەزی قەزادا.

بەڵام مەحموود پاشا بەهەموو مەعنایەکەوە سەرداری عەشرەتێ بوو سوارچاک و سیلاح شۆر و جەنگ ئاوەر و هەمیشە لەگەڵ کاروباری عەشائردا خەریک بوو. بەخەیاڵی کەسدا نەدەهات مەحموود پاشا ئەم خزمەتە گەورەیەی کردبێ، تا وەفاتی کەسێ نەیزانیبێ لە سلسلەی هەموو حوکمدارانی (بەبە) و نامدارانی ئەم خاکەوە تا ئەمڕۆ کەسێ نەبووە بەقەد مەحموود پاشا عومری خۆی لە خۆشی و تاڵی و دەربەدەری و فیراری ئەستەمولدا، لە کۆکردنەوەی ئەشعار و ئەدەبیاتی کوردیدا خەرج کردبێ. لەو تەئریخەوە دەستی قەڵەمی گرتوە تا وەفاتی بەخەتی خۆی هەرچی ئاساری کوردی هەیە نووسیویەتەوە ئەوەندەیش بەسەلیقە و دیقەت نووسیویە لەو هەموو ئاسارە بگەڕێ غەڵەتێکی تیا نییە، خەتێکی گوندە و خۆشخوێن. نازانم لەم هەموو کاری حکومەتی و عەشائری و دەوڵەت و حساباتی خۆیدا چۆن پەرژاویەتە سەر ئەمانە. دیوانی (سالم)ی لێرە نووسیوەتەوە. لە ئەستەموڵ لای (ئەحمەد کامل)ی نازری گومرگ کە کوڕی (وەسمان موردار) بوو نوسخەیەکی تری دەستکەوتوە. دیسان بەخەتی خۆی ناتەواویەکەی نووسیوە. سێ ساڵ من بەشوێن نوسخەیەکی مەولەویدا گەڕام دەستم نەکەوت کەچی هەرچی مەولەوی وتوویە ئەو قەیدی کردوە، حەتتا ئەوی بەخەتی خۆی بۆ ئەوی نووسیوە عەینەن چەسپانوویە بەکەشکۆڵەکەیەوە. ئێستا زۆر دوور نەچین دیوانی سالم، کوردی، نالی، مەولەوی، بەتەواوی ئاساری خانای قوبادی، ئەحمەد بەگی کۆماسی، بێسارانی، فخر العلما، مەلا ولدخان، وەلی دێوانە، حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە، حەسەن کەنۆش، جنوونی، زەڵمی، صرعی، ڕەنجووری، والی غولام شاخان، میرزا یوسف، میرزا یاقو، شەفیع، نەجەف، مەولانا خالید، خانگایی، مەلەلکە، کلاشی، قەمەر عەلی، عەبدولخالقی پاوە، داخی، زەنووری، مەلا صالحی تەڕەماری، شێخ مستەفای شەهاب، میرزا مووسا، والحاصل ئەمانە هەمووی خۆی نووسیونیەوە، بەڵام درێغ و

واوەیلا ئەمڕۆ وەجاخ کوێرە ئەو هەمـوو سـەروەتی بێ سامـان و مـوڵکی ڕووی جیـهـانەی بەجێ هێشت یەکێکیان تەنها بۆ ئەوەی ئەم ڕەنجەی بەباد نەڕوا چاپیان نەکرد.

کەشکۆڵەکەی بۆتە (خرمیز)، هەرچی هەستاوە شتێکی لێ نووسیوە حەتتا حسابی گاڵ و جۆ و گەنم و مەن و تەغاریشی تیایە.

کتێبی ئەوتۆی بووە فرۆشراوە بەشەش سەد ڕوپیە و لە قەشقەی بەغداوە تا حدودی عەجەم مـوڵکی بەجێ هێشـتـوە. باوە ئەوانە بۆ ئێـوە، با پارەی کـتـێـبـێکتـان بدایە ڕۆحی ئەوتان شاد بکردایە، ئەمە بەکەم ناژمێرێ. زاتێکی وەک مەحموود پاشا عومرێک سەرف بکات خزمەتی ئەدەبیـاتی قـەومەکـەی خـۆی بکا و ڕەنج بەخەسار بێ، لای خوێندەواران و قەدر شـوناسان ئەم خزمەتەی ئەو کردوویە لە هەموو ئاساری بابان و بابە ئەردەڵان پێشترە، ئەمما...!!.

مـەحـمـوود پاشا بەخۆڕایی ئەوەندەی مـەولەوی خـۆش نەویسـتـووە، زەوقی ڕۆحی لێ چنگ کەوتووە، منیش هەقمە بەحورمەتەوە ئەمەندە پەرستش و ستایشی هەردووکیان بکەم. مەولەوی بۆ ئەو دیوانەی کە هێناومەتە سەر شێوەی خۆمان، مەحموود پاشایش بۆ ئەوەی کە جگە لە دیوان هەمـوو کاغەزەکانی دەسـتـخـەتی مەولەوی چەسپاندوە بەکەشکۆڵەکەیەوە ئەو کەشکۆڵەی کە هەرچەندە شاعیری کـورد هەیە بەناو و داو ئاساری کۆکردوونەوە. بەڕاستی زیندووی کردوونەوە. ئەمجارە کاغەزێکی مەولەوی کە بەفارسی بۆ مەحموود پاشای نووسیوە بەکوردی نەشری ئەکەین. ئەم کاغەزە کاتێ لە ساڵی ١٢٩٠ی هجریدا ماڵی مەحموود پاشا لە زمناکۆی شەمێران بوە بۆی نووسیوە:

ئەیاز هامـــــــراز ناڵە و ئاخ و دوود
عەرزش هەن وە خاک ئاستانەی مەحموود
ئەرنایدەی تۆ (زمناکـــۆ) جـــا کـــەرد
دوودی دڵی مـن نەگـــــــەردوون و ویەرد
گـــەر باوەڕناکـــەی لە خـــودا بتـــرسن
هەواڵ لە دیدەی هەســـــــاران پرسن

بەلام دەسەلات چییە؟ قیمەتی دووری نە بەدەست ئێوەیە نە بەقوەتی ئیختیاری ئەم دەروێشە (بێ وەی)یە.

چەرخ ئەمـــرەتێنێ بەهەمـــوو لادا
ناتوانێ لە خـــۆی حـــەســـوودی لادا

گلەیی بێ ئیخـلاسیـە لە مـن فـەرمـوە ئەوێ، من ئەمـویست عـەرزی ئێـوەی بکەم، ئێوە پێشدەستیتان فەرموو، با لە ڕووی گلەییشەوە بێ.



باز مژدەی یەک دڵییە:

ئەگەر تەقدیر لەگەڵ تەدبیر بگونجێ
وەها دێم چەرخی بەد خواه لێم بڕەنجێ
گەر فەلەک دەستم نەخا وەسڵی حەبیب
ئەمن و دەردی بێ نسیبی یانسیب

کتێبی عەقیدەنامەتان ویستبوو، ماڵم لە باخەسووتاوە، دڵیشم وای لێ قەوماوە. پیاوێ بنێرن لە عەبدوڵڵای کورمی وەرگرێ.

جاران لە گەشتی دەشتا و لە وزەی دیدەنی گشتابوون. ئێستا شابازی زمناکۆ، یا خوا پەناهم بەتۆ. زمناکۆم لێ بووە بەکـێوی (طور) ئاگرێکی تەجەلی ئەبینم، لە دوور بەو نوورە سووتاوم، بۆیە لە باخەسووتاو خزاوم ئاتەشی می بینم ئەی یاران ز دور گەرم می ئاید بەچشم کوه طور

ئەگەر مەحموود بۆ دەردی دووری نەکا چارەسازێ
بەسۆز و نیازی ئەیازی ئێمە هەمراز و دەمسازێ

## ٣- ساڵح زەکی بەگ

ئەمڕۆ چڵێ نێرگسم دی و ساڵح زەکی بەگم کەوتەوە یاد. ساڵح زەکی بەگ دوایی گوڵی باخی ساحبقران بوو لە زەکادا. لە سەخادا، لە وەفادا. من بەش بەحاڵی خۆم وێنەی ئەوم کەم دیوە، زۆرتر پەسەندم کرد لە پێشدا ڕابیتەی نەفسانی بوو، ئەو خاوەند خوان و من نەوسن کە تێرم خوارد، لە مصاحەبەتیا زەوقێکی ڕۆحانیم دی. ئنجا کەوتینە عالەمێکی ڕۆحانییەوە، بەڕۆح و بەدڵ خۆشم ئەویست. کاتێ بە(متصرف)ی هاتەوە ئێرە، ئەو سەردەمە دەستەی (مردم گریز)کانی ئێمە هەموو جومعان ئەچووینە زەڵم و دواوان. جارێکیان ئەویش هات لە ڕێوە چووینە (تووەقوت) لەوێوە هاتینەوە بۆ لای پردەکەی زەڵم، ئەو نێرگسەجاڕەی سەر ڕێگاکەی دی و وەستا. لە ئوتومبێلەکە هاتە دەرێ، پەلی من و کوڕەکانی گرت چووینە ناوەڕاستی ئەو نێرگسانەوە، باقەیەک نێرگسی کرد و لەناو ئەو نێرگسانەدا ڕاکشا و بەدەستە نێرگسەکە چاوی خۆی داپۆشی و وتی، خۆزگە لەم ناو نێرگسانە و لەم (سەرە ڕێی ئێلی جاف)ەدا ئەنێژرام. دوای ئەوە سەری هەڵبڕی وتی، کاکە توخوا تەماشای ئەم چەشم ئەندازە شیرینە و ئەم دەشتە ڕەنگینە بکە. ئەستەموڵ کە بەبەهەشتی ڕووی زەمینی ناو ئەبەن لە ناوەڕاستی (بیشکتش نشانطاش)دا کۆشکێکی سوڵتان عەزیزی تیایە لە نزیک ئەو باخچەیەکی قولیای تیایە پێی ئەڵێن: قولیاتر لاسی، بەهاران ئەم هەموو سەیرانکارەی لێ کۆ ئەبێتەوە، لەم چاڵەدا ئەمە گوایە بۆنی قولیا ئەکەن. ئەیکرن، دەسکی ئەکەوێتە مەجیدییەک. دە وەرە ئەمە ببینە وە ئەوێش!؟. بیر بکەرەوە و ئەم ڕووبارەیش بەم لەنجەولارە ببینە و ولاتی خۆتت لەپێش چاو شیرین نەبێ، ئەیویست خزمەتی

نیشتمانەکەی خۆی بکا، زۆری لە دڵدا بوو، لە (سەید صادق) بەولاوە دێیەکی عەسری بینا بکا و فابریقەی شەکری تیا دابنێ. وە دەستی پێکرد کە شار بگوێزێتەوە بناری گۆیژە و ئەودیوی گۆیژە بنێژێ بەباخ. ئێستە دەستی ناهەمواری دەوران لە دەمێکدا کە نێرگس چاوی کردەوە چاوی لێکنا!!. وەک نێرگسەکەی دەوری زەڵم!.

کوێر بێ ئەو چاوەی بەتۆ ڕوون ئەبوەوە و تۆ بەبێ چاوی ئەو چاوت کردەوە. بەڵام تۆ چیبکەی! تۆ هەر ئەوەی کە لەو دەشتە هەزاران ئەردەشێری سەرەتا و نەرەشێری هەرە دوایی وەک مەحموود پاشات دیوە و ئەوت بەرێ کردوە و لەو چاوە جوانەتەوە فرمێسکێکت دانەڕشتووە!. من بەو یادەوە ئەگریم، کەوا بێ من بەوەفاترم!.

## ٤- ئەمین زەکی بەگ

ئەمین زەکی بەگی کوڕی گەرەکم، هاودەمی ئەستەمولم، هەموو شەو و ڕۆژێ، هەینوان میوانی عەزیزی جزیرە (هەگبەلی)م، شەوقی چرای ژیان و ژینم، ئارایشی لاپەڕەی ژیان و ژینم، لە مەعنەویاتی ئیسلامیەدا، ئاینم ڕۆیی، بەجێی هێشتم، ئەو نایەتەوە، ناچار ئەبێ من بچمە لای. ئەڵێن ئینسان کە مردووی مرد و لەگەڵی چووە سەر قەبران، کە گەڕایەوە، هەر هەنگاوێکی فەرامۆشییەکی بۆ پەیدا ئەبێ ئەمە بەڕاست نازانم، من بەش بەحاڵی خۆم نەک هەر هەنگاوێک، هەر هەناسەیەک بەسۆز و بۆکرۆزتر ئەزانم و لە بیرم ناچێتەوە.

ئێستاکە بەتەنیا ئەمێنمەوە و یادی (حەمەد ئەمینم) ئەکەمەوە، بێ ئیختیار فرمێسکی چاوم ڕیشی ئیختیاری سپیم تەڕ ئەکا. خۆ هێچگار کە ئەڕوانمە (ژین) و ئەو هەموو نووسینەی، ئەوی تیا ئەبینم، یا کیسە خامە کۆنەکەی کە نامەی ئەو و جەعفەر پاشای بەختەتی خۆیانی تیایە و دەری دێنم، ئاخێکی دەرمەندی هەڵدەکێشم، بۆ ئەو دوو زاتە کە بۆ ئیشوکار چەند بەکار و بەدایەخی قەومەکەمان دەردەهاتن. نەخوازەلا ئەمین زەکی بەگ کە زیاتر لە کەڵک و کاری دیوانی ئاساری ئەدەبیاتی ڕۆحانی و سەرگوزشتەی کامەرانی و زیندەگانی پێشینیانی بۆ خستینە لاپەڕەی تەئریخی جیهانییەوە. هەروەکو ئەو مردووەکانی ناودارانی بەناو بۆ زیندووکردینەوە، بۆ خۆیشی ناوێکی وای بەجێ هێشت لە هەرکاتێکدا بپرسن ئەمین زەکی بەگ چی لێهات؟، هەموو لاپەڕەیەکی تەئریخ و ئەدەبیاتی ئەو دەنگ ئەداتەوە و بانگ ئەکا، بەڵێ ئەمین زەکی منم و سەدایەکی لاهووتیش ئەڵێ: ئەمین بن ئەمین زەکی نامرێ، بەختیاری و پایەداری بەرخورداری بۆ قەومێکە کە پیاوی وای تیا هەڵئەکەوێ. خوا شوێنی گوم نەکا و تەوفیقی (تۆفیق وەهبی) بدا، هەروەکو لە پایە و مەنسەبی ڕەسمیدا پایەی ئەوی گرتۆتەوە لە هەموو شیمە و ڕەویەی تریشدا لەو زیاتر بێ. ڕۆحی ئەوی پێ شاد ئەبێ! منیش کە لەژێر ئەم قوببەی گەردوونەدا چاوم لە هیچی



کەس نییە و تەنها ئاواتەخواز و بەنیازی سەربەرزی قەومەکەی خۆمم. کە ڕۆییم و لە مەڵبەندە نیشانکردنی کوڕیمەوە کە گردی یارەیە و لەوێوە ئەم دیارەم لێ دیارە، چاوم لێ بوو کە داڵدەدارین، چاوم لە دوای خۆم نابێ، خۆم دیومە لە شەڕا پیاو یا بەگوللە یا بەخەنجەر بریندار بووە، گەرمە برین بەخۆی نەزانیوە، تا سارد بۆتەوە، ئنجا بەلادا هاتوە! ئێمەیش برینی ئەمین زەکی بەگ، بەگەرماوگەرمی پێمان نەزانی تا سارد بووەوە، ئنجا تێگەیین کە چیمان لە کیس چووە!.

شاعیرێک مەرسیەیەکی وتووە ئەڵێ ئەوەی لە دەست من چوو ئەگەر وەک موڵکی سلێمانی لە دەست سلێمان بچوایە ئەهرەمەنیش لەگەڵی ئەگریا!. بەڵێ، نگینی زانستی سلێمانی بوو! هەموو کەس لەگەڵمان ئەگری.

ئەگەر لە من ئەپرسی ئەمین زەکی و تۆفیق وەهبی جووتە چرای ڕووناکی خوێندەواری و خزمەتگوزاری و کوردەواری بوون و دوو چاوی منن. وا خوا چاوێکی لێ سەندمەوە، باری حوکمی بینایی ئەو چاوەم کە کوێر بووە. بخاتە سەر ئەو چاوەم کە ماوە، یەعنی ئەمین زەکی ڕۆیی تۆفیق وەهبیم بۆ بێڵێ! ئەمیش بەبەریەوە هەیە بەئاسار و بەکردار شوێنی ئەو کوێر نەکاتەوە.

لە ساڵی ١٩٣٩دا، کە خۆی مابوو، نووسیبووم، بەشێوەی ڕەسمی و هەقی مەکسووبی ئێمە ئەشیا بماننووسیایە (مەعالی ئەمین زەکی)!. بەڵام بەرگی هونەرمەندی جیهان پەسەندی ئەو هیچی پێ ناوێ، تەنها ئەمین زەکی بەگ بێ بەسە!. ئەمجارە چاو ڕوونی غەزەتەکەی بە دوو شیعری جوانی بەناونیشان کردبوو، هەندێ ئەیانگوت ئەمین زەکی بەگ شاعیر نەبووە، نەیانئەزانی سەرەتای جونبوشی زەکای ئەو بەشیعر بووە. ئەوەڵ مەنزوومەی کە لە ئەستەمولّ پێ نیشانی من دا، لەوانەبوو بەچاوەوە ببێ، ئاتەشین و ڕەنگین، دوای ئەوە کە (نەژادی کوڕم لە جزیرەی- هەگبەلی) هاتە دنیا، ئەو قەسیدەیەکی نووسیبوو خالید ضیا و ئەکرەم بەگی ڕەجائی زادە زۆریان پەسەند کرد. بەڵام من زۆری لەگەڵ خەریک بووم، کە لەگەڵ شیعر خەریک نەبێ، قوەی تەحریری هەڵئەقرچێ! چاک بوو شوکور وازی لەو پیشە درۆزنەی ئەو سەردەمە هێنا و دەستی دایە عیلم و فەن کەوا ئێستا بەو عیلمەوەیە ئەو هەموو خزمەتە ئەکا.

لە ڕۆژی ١٩٤٨/٦/٢٩دا دوا نامەی خۆی لە بەغداوە بۆ ناردم، نووسیبووی: «چرای ئەدەبی ولاتەکەم، کارتە دلبەرەکەتم وەرگرت ئای چەند دڵسۆزانە بوو. چاوی ڕوون کردەوە و ژانی پەنجەکانمی شکاند. بەو هێزەوە دەسم دایە قەڵەم ئەم چەند دێڕەم نووسی خۆزگە بمتوانیایە بەکامی دڵ تێر بنووسم، نازانی چەند ئاواتەخوازی گفتوگۆم لەگەڵ تۆ؟!. یاخوا تۆ هەر بژیت، ئەگەر قسمەت بێ چاومان بەیەک ئەکەوێ».

لەبیرمە ساڵی ١٩٣٦ نامەیەکم بۆ ئەمین زەکی نووسیبوو، نامەکەم دۆزیەوە کە بەم جۆرە نووسرابوو:

نووری دیدەی عیرفانی وڵاتەکەمان

ئەمین زەکی بەگ:

زۆر کەس هەیە کردوویانە بەخوو، یەکێ مەنسەبێکی گەورەی دەست کەوتبێ کوتوپڕ تەبریکی بۆ دەنووسێ و کە لێشکەوت تەئەسور.

من ئەو دەمەی تۆ بووی بەوەزیر نووسیم، هیچ ئارەزووم نەبوو، بۆ تۆ بنووسم مەعالی، یەعنی حەزم نەکرد ببی بەوەزیر، ئێستاش زۆرم لا خۆشە لە وەزیریدا نەماوی، چونکو ئەمەندە ساڵی وەزیریت کرد ئەمما چیە وەزیرییەک.

دەڵێن موسیقا دوانزە مقام و بیست و چوار شعبەیە ئیدارەی دوانزە مقام و بیست و چوار شعبەت کرد بەقەد دوو جزمە تەئریخەکەت بەکار نەهات و لەمیشدا خۆم ئەزانم کە قەرزداری، بەسایەی خواوە وا ئەمجارە بۆ خۆمان، یەعنی بۆ قەومەکەت بوویتەوە بەماڵ. قەومەکەت ناڵێم ئەگەر قەوم دەبووین ئێمەش یەکێکمان لەکایەدا ئەبوو، ئەو یەکەش بەناچاری تۆ دەبوویت، چونکو کەسی تر شک نابەین بۆ ئەوە بشێ ئەوە کەیفی خۆیانە، ئێستا ئەوی من ئەمەوێ، تا من ماوم تۆ بنووسە من بۆت چاپ ئەکەم، بەرگوزاری کوردی بۆ کوردی هەژار، ئەوەیە یادگاری بەکار.

## ٥- گۆران - عەبدوڵڵا بەگی سلێمان بەگی کاتب فارسی

چەند ساڵێ لەمەوبەر خۆشبەختانە ڕێم کەوتە شارێکی لەتیفی کوردستان مودەتێکی موناسب لەوێ مامەوە، حەیاتێکی سادە و زەریف، حەیاتێکی پڕ لە شیعر و سنوحاتم ڕابوارد، ئەتوانم بڵێم، ئەم شارە بەدەشت و دەری شاعیرانەیەوە بەشاخ و نزاری پڕ لە ئەحلام و خەیاڵاتییەوە، لانەیەکی ئەزەلی و ئەبەدی شیعرە، زەرڕاتی هەوای پڕ لە ئیلهامە، تاریکە شەو و مانگەشەوی موتەساویەن. شاعیرانە و وەحی بەخشە بن هەر لقی دارێ، باغێکی سەد فریشتە و سەد پەری شیعری لێیە. لەو ڕۆژەوە بناغەی دانراوە، بێ شیعر و شاعیر نەبووە.

ئا لەم شارەدا ئەوەڵ ڕۆژی مواسەڵەتم لاوێکی زیرەک، تێگەیشتوو (رقیق الطبع) فەقەت مەحجوب، جەلبی دیقەتی کردم!. ئیفراتی مەحبووبیەتیەکەی تەقریبەن کردبووی بە مردم گریز، غالیبەن گۆشەیەکی ئینزیوای پڕ حیس و خەیاڵی تەرجیح ئەکرد، بەسەر حەیاتێکی پڕ جۆش و خرۆشی ناو خەڵقدا.

موعارەفەمان بۆ موددەتێکی مەدید عیبارەت بوو لە چەند مولاقاتێ فەقەت بەرە بەرە مولاقاتەکەمان تەزایودی کرد، ئاشناییەکی موتەقابیل هاتە وجود (ئاشناییێکی فیکری و حیسی) بالنتیجە قەناعەتی کامیلەم بۆ حاسڵ بوو کە (دوورڕ) لەژێر پەردەی کەسیفی



مەحجووبیەتەکەیدا حیسێکی ڕەقیق و بەرز، تەبعێکی شاعیرانە مەوجودە و شنەی بایێک خەفیف کافییە. ئەو پەردەیە لابدا و بەهەموو مەحاسنی بەدیعیەوە شەخسیەتی شیعری دەرخا. زەمان هات و تێپەڕی، ئەرز بەدەوری خۆیدا چەند خولێکی دا نیهایەت لە سلێمانیدا یەکمان گرتەوە. ئەمجارە بەمەمنوونیەتەوە دیم کە کزەبایەکە (هەرچۆنێ بووبێ) هەڵی کردوە و تا دەرەجەیەک بووە بەسەبەبی دەرخستنی شەخسیەتی. شەوێک کە دیسان لە مەوزوعی شیعر و ئەدەبیات ئەدواین، بەدەنگێکی نزم و ڕوویەکی سوور هەڵگەڕاوەوە بەعزێ شیعری خۆی لەبەر خوێندەوە زۆرم لا جوان بوون و تەلەبی نوسخەیەکم کرد، سبەینێ مەنزومەکانم لێ وەرگرت، کە دووبارە پیاچوومەوە بەتەواوی تەحەققوقی کرد لە لام کە ئەمانە زۆر دوور بوون لە شیعری شاعیرێکی موبتەدی، یا هەوەسکارێک، عەلاوەتی کە ئاهەنگ و سەلاسەتی مەوزوعەکانیشی جازیبەدار و پڕ حەیات بوون و بەخەیاڵێکی ورد و بڵند هۆنرابوونەوە و بەتەرزێکی جوان و ڕەوان ئەدا کرابوون. لە گوفتاری واتێگەیشتم ئەیەوێ ئەمانە لە گۆشەی نسیاندا بمێنێتەوە. فەقەت من ئەم ئیهمالەم بەرامبەر بەئالیهەی شیعر بەجورم عەد کرد و بالنتیجە قەرارم دا بەناوی (موستەعار)ەوە نەشر بکرێن.

## ٦- شێخ ڕەزای تاڵەبانی

دیوانێکی شێخ ڕەزام بۆ هات، باوەڕم نەدەکرد شێخ ڕەزا وا لێبکەن!، ئەو شێخ ڕەزایە کە من جارێک لە کێوی قافەوە ئەچوومەوە ئەستەموڵ لە (باطوم)ەوە سواری کەشتی بووم حەکیم باش و مەلیک و شوعەرای شیرازی تیا بوو کەوتینە یەک پرسی، وتم خەڵکی سلێمانیم. وتی ئەو خاکە کە ساحێبی قەسیدەی (شەبی یەڵدا)ی سالم و قەسیدەی (شاهوماهی) شێخ ڕەزای تیا هەڵکەوتوە؟! ئێستا ئەو شیعرە جوانانە خراوەتە ژێر زێرابی ئەدەبخانەوە. (ئەدەبخانە نا، چونکە ئەدەبخانە ناوێکی ئەدەبی تیایە).

ئەم نەریتە ناهەموارە مەبەستی شیعری هەجووە لە ئێراندا زۆر کاری کردە سەر پەروەرش و ئەدەبیش و ئەو پەیڕەویە زیاتر بۆ شێخ ڕەزای شاعیری وەهبی و ئیرتجالی مایەوە. ماڵی مایەی هونەری شێخ ڕەزای بەقوڕ گرت. شێخ ڕەزا گەوهەرێک و جەوهەرێکی بوو ئەتوانم بێ پەروا بڵێم نەک لە خاکی کوردستاندا، سایەی ئەو لە جیهاندا مانەندی نەبوو. جارێ هەرچی وتووە هی خۆیەتی لە کەسی نەدزیوە و لە فارسیشدا شێوەیەکی بۆ خۆی داناوە، دوای ئەو کەس نایگاتێ. بەڵام هەمووی لە کلکی (قەڵەمی دونبالەگیری) ئەنوەریدا خەرج کردۆتەوە و لە زیندەگانیشدا لەبەر ئەو ڕەنجەڕۆ و سەررۆ بووە، ئێستا لە بەختی ئەوروپایی شیعریان کردە فەن و ئەدەب و ناویان نا ئەدەبیات، لە کوڕەی زەمیندا لەناو هیچ میللەتێکدا ناوی دوو سەرە کاف لە هیچ لاپەڕەیەکدا نانووسرێ (حەتا ئادابی موعاشەرەتی ئیجتماعی) شێوەی هەڵکردی کۆمەڵی

*قانوونێکی وای داناوە کەسێ لەکەیەکی ئاشکرای نەنگی و بەدنامی پێوەبێ، تۆ پێی بڵێ ئەو خووەت هەیە ڕاستیش بێ جەزایەکی قورسی هەیە. لەم دەورەی ئەدەبدا وەرن تەماشای دیوانی بکەن لەلاپەڕەی چوارەوە چەند نامووسی خانەدانی گەورە پایماڵ کراوە! و یەکجار بەکۆمەڵ بۆ کەرکوک و سلێمانی چی بێژراوە چ جای مام و برازا. فیچقەیەکی پیس کە بەهەموو سەروچاوا هەڵپژابوو کەوتبووە ژێر پەردەی فەرامۆشییەوە، نازانم خزمانی بەچ هۆش و هەوەسێکەوە بەڵێنی چاپکردنیان دا!؟.*

*وا چەند کەسێکی وەک من بەچاویلکەی کۆنە شایەری جوانی ئەبینن ئەوانەی جوێنی پیس بەباوک و باپیریان دراوە بۆ ئەمەی بڵێن شیعرە چۆنیان لا خۆش ئەبێ؟!.*

*درێغی بۆ دەبدەبەی بڵندی شاعیریی شێخ ڕەزا کە ڕەووش و گەردشی زەمان شێواندی و ئەمەیش نەواندی، باز پایەی شاعیری ئەو نانەوێنێ و هەموو جنێوێکی پێ دەبەخشرێ، ئەمە وا!! ئەی لە چاپەکەی کە هەموو سەر و گوێلاکی شیعرە جوانەکانی شکاندووە چی بڵێن قەیناکا خوا حسابە ڕادێین!.*

**٧- زێوەر**

*پەنجەی مەرگ بەرۆکی زێوەری بەرنەدا ڕایکێشا بردی لەسەر ڕێی (هەڕووتە و دۆڵە میران)دا خستیە ژێر خاکەوە، تەنها شیعرەکانی لەپاش بەجێما کە لەم تەنگانە و گرانیەدا و لەم زەمانەدا ڕەبەیە ئارد بۆ ماڵ و منداڵە هەژارەکەی ناکا!!. بەڵێ شیعری زێوەر و زێوەر خۆی زێوەری هەموو شاعیری کوردەوارین. ئەمڕۆ نە بێخود نە بێکەس نە پیرەمێرد نەگەیشتوونە زێوەر. ساخوا کوڕەکەی بەختیار کا شوێنی باوکی بگرێتەوە.*

*زێوەر ئەخلاقی لە شیعری جوانتر بوو بەهەموو مەعنایەکەوە دیندار و بەویقار و قەناعەتکار بوو، لە کیسمان چوو داخی دووری سارێش نابێتەوە. ماوەیەک پێش ئەوەی کۆچ بکات، زۆرم بیر ئەکرد، پیر و ئیفتادە هەرچۆنێ بوو خۆم گەیاندە لای، ئۆف چەند دڵتەنگ بووم لە من نەخۆشتر و حاڵی ناخۆشتر بوو. من کە لەساڵی ١٣٠٥ی ڕۆمی ١٨٨٩ی میلادی لە سیتەک باشکاتب بووم و باوکی ئەو مەئمووری ظابط بوو، لەگەڵ باوکیا دامەمان ئەکرد، ئەو هێشتا پێنەگەیشتبوو دوایی کە چووین بۆ ئەستەموڵ هاوڕێی بەحر و بەڕ و سەفەر و حضرم بوو. کە دەستی کرد بەشیعر گەلێ لەپێش من و هەموو شاعرەکانی زەمان و زمانی خۆمانەوە بوو. لەم دواییەدا چەند شیعرێکی پاشەرۆکی بۆ ناردبووم لە چاو شیعرەکانیا، ئێستای خۆیەتی، ئەڵێ:*

بێ فائیدە و سەودازەدە بێ پارەو و پوولی
بێ سوودە کە بەستراوی خەمی پەرچەمی لوولی
ڕێی ڕاستی ئەگری کەچی هەر چەوتیە ڕێگات
شەفتوول ڕەوی شەترەنجی خەمی خانەی کوولی



نووستووی لە بەرامبەر سنعی عفت و ئەخلاق
بۆ زەوق و سەفای ڕاهی سەفاهەت چە عەجوولی
هەرچەندە جگەرگۆشەی گەورەی شهدایی
بێ کەڵکی کەوا لەکەی بەرچاوی بتوولی
ڕۆژ و شەوت ئەڕوا بەسەفاهەت نە بەتاعەت
شەرمندەی دەرگاهی خوداوەند و ڕەسوولی
ئەی شاعیری بێ کردەوە بێ زادی و بێ ئاو
وریا بە بۆ ئەولا دەچی ڕێبواری بە(طوولی)

**٨- عەلائەددین سەجادی**

*لە دیباجەی ئەمجارەی (گەلاوێژ)دا، عەلائەددین سەجادی منی بەوێنەیەکی خۆم ئاساییەوە خستۆتە گەلاوێژەوە، وە خۆمی پێ لە خۆم گۆڕیبووم.*

*عەلائەددین کەمتر لە چەند و چوونی من و زۆرتر لە بەرزی خەیاڵی خۆی و دڵپەسەندی و بڵندی خاکەکەی خۆی دواوە شێوەی بیمانەندی بەروبوومی مەرزوبوومی بێ بوومی وڵاتەکەی خۆی ناسیوە و زانیویە ئەم مەڵبەندە ئەشێ شاعیری بێ مانەندی تیا هەڵکەوێ، هاتووە لە خەیاڵخانەی خۆیدا یەکێکی شاعیر و ماهر و ئەدیبی سخنوەر و نیشتمانپەروەری دروست کردوە، ناوی ناوە پیرەمێرد!!. ئەگینە ئەو پیرەمێردەی کە تازە بەستایشی ئەو ناسیومە جگە لە نەوسنی و تیکەی نان و کەباب تێگلاندن هیچی ترم تیا نەدیوە، بەڵێ خاکەکەم، منیش ناسیومە کە (سەعید پاشا) یەکمان لێرەوە شوێن کاروان ئەکەوت ئەچوە ئەستەموڵ لەوێ ئەبوو بەیەکە پیاو، قەیسەری ئەڵمان لە دوایەوە ئەڕۆیی. شاعیری ئاسمانیی تورک (عەبدولحەق حامد) وتوویە:*

چەمەن در ار درکوهسار در فیض ربیعیدر
بویرلردە دوغاتلر شاعر اولمق یک طبیعیدر

*ئەویش لە تەک عەبدولحەق حامدا هاوفکرە هاتووە بەخەیاڵ لەم شوێنەدا یەکێکی دروست کردوە ناوی ناوە (پیرەمێرد) هەموو کردار و گفتاری پیرەمێرد ئەو پارچە بەندە پەخشانە ناهێنێ کە ئەڵێ:*

*«ئەگەر سەرچاوەی شیعر وتن هەوای بێگەرد و ئاسمانی ساف و دیمەنی دڵکەش و لالەزاری ڕەنگێکی بێ بەهەموو مەعنای کەلیمەوە کوردستان لە پێگەیاندنی شاعیرێکی وەک پیرەمێردا بەڕاستی درێغی نەکرد. پیرەمێردی شاعیریش لە دانانی شیعری نیشتمانی غەزەلی غرامی و فەلسەفی بۆ بەجێهێنانی وەفای خۆی نیسبەت بەمەڵبەندی هیچ کەموکوڕیەکی نەکرد».*

هەموو واتەی پیرەمێرد ئەم تەسویرە خەیاڵییەی عەلائەددین نایەنێ، کە نیشتمان ئەمەندە بەفەیز دادەنێ کە ئەبێ شاعر و ئەدیب و وەتەنپەروەری وای تیا هەڵکەوێ ئێمەیش بەپێی خەیاڵ و ئارەزووی عەلائەددین لە خوا ئەپارێینەوە خاکەکەمان زۆری وای تیاهەڵکەوێ دوعای پیران و ناڵەی پیری پیران بێگومان ئەگاتە ئاسمان.

تۆ هەموو ساڵێک دەقنەیەک بۆ گۆڤاری گەلاوێژ ئەکەی. لە هەموو غەزەتە و مجەلەکان ڕێکوپێکتر لە ڕۆژ و سەعاتی خۆیا بەهەموو لایەکدا ئەینێری، ڕاستت پێ بڵێم کە داوای پارە ئەکەی خاترانەیە، وەکو بەخۆتی ببەخشن وا لە دەستیان ئەبێتەوە، کەچی ئەوانەی لافی وەتەنپەروەری لێ ئەدەن و هەموو ئێوارەیەک هیچ نەبێ ئەوەندەی ئابوونەی گەلاوێژ ئەخۆنەوە و دە ئەوەندەیش لەسەر مێزی پۆکەر دائەنێن و ئەوەندە هەر بەبۆیاخی قۆندەرە ئەدەن با تەنها شەوێک بڵێین بۆ گەلاوێژ وەک کابرای ئەستەموڵ کە ڕۆژ بەڕۆژ ئەوی ئەیویست بیخوا ئەیگوت «صانکه یدم» وامزانی خواردم بەو پارەیە مزگەوتێکی دروست کرد ئێستایش پێی ئەڵێن (صانکه یدم جامعی). توخوا گەلاوێژ ڕۆحێکە ئینسان لە لەشی خۆی داماڵێ هیچ نەبێ بەپارەیەکی کەم بیکڕن و بیکەن بە(کوللکسیون) دوایی بیفرۆشنەوە گەلێ زیاتریان بۆ ئەکا.

عەلائەددین سەجادی زۆر مەمنوونی شیعری گرفت و نوکتە و جناسی کۆنە لە زبانەکەمانا شتی ئەوتۆی ئەدۆزییەوە چوار پێنج مەعنای لێ پەیدا ئەبوو، هەردووکمان لەسەر ئەوەین کە زبانی کوردی بۆ هەموو جۆرە نووسینێک لە زۆر زبان ڕەوانتر و بەماوەترە!.

ئەتوانین سەربەخۆ هیچ وشەیەکی بێگانەی تیا نەبێ، چی ئارەزوو بکەین بیلێین. بەڵام ئاخ دەستەیەک پارچە پەڵاسی ئەوتۆی بەڕوودا ئەکێشن جوانیەکەی ئەشارنەوە و ئەیشێوێنن.

## ٩- سەید ئەحمەدی خانەقا

خوا لە دوور کەعبەیەکی دروست کردوە لەگڵە، لە نزیکیش کەعبەیەکی هەیە کە دڵە، ئەویان حجاز و حجازە ئەمیان سەراپەردەی ڕاز و نیازە.

چل و پێنج ساڵ لەمەوبەر لە ئەستەموڵەوە چووبوومە کەعبەی حجاز لەوێ کەوتمە ناو دەستەمێردێکی مەرد، سەرقافڵەچیان سەید ئەحمەدی خانەقا بوو. نازانم تەئسیری هاونەفەسی ئەو خاکە بوو!؟ یا یاد و دووری وەتەن بوو، ئەمەندەم پەسەند کرد چل شەو لە بیابانی حجاز و شاما بەیەکەوە بووین، ئەو جازبە و ڕەفاقەتی حەجە تەئسیرێکی وای تێکردم کە لە ئەستەموڵ هاتمەوە، کردبووم بەعادەت ساڵی سێ ڕۆژ بەتایبەتی ئەچوومە خزمەتی، ئەمە چوار پێنج ساڵە کە نەمتوانیوە بچم. ئەمجارە بەئیشتیاقێکی واوە وتم ئەچم، «وەک ئەو ساڵەی لە دەربەدەری هاتبووەوە موریدێکی دەستی گرتبوو، بەری نەئەدا ئەیانگوت: کورە بەسیە ئیتر لە یەخەی بەرەوە، ئەیگوت: ئا، لەبیرم چووەوە؟ ئەو چەندەی ئەو لێرە نەبوو من وەک گوێلکی بێ دایک لە چەم و



دۆڵدا ئەمقۆڕاند!!» بەو حەسرەتەوە بووم، تا ئەم بەرە جەژنانە ئارەزووی زیارەتی کەعبەی دڵ بەکێشی کردم، ئێوارەیەکی جومعە گەیمە خانەقا ئەو لە ماڵەوە نەبوو، نانیان بۆ دانام، پشتم لە ڕێگاکە بوو، خەبەریان دابوویە، هات، چاوم لێی نەبوو، لە پشتەوە دەستی خستە سەرشانم، هات بەدڵما، گوایە بەنوکتەی جافی بێمە پێشەوە. هەروا لە خۆمەوە وتم، وا لەپشتەوە دەستت هاویشتە سەر شانم ئەگەر نەفسی عەزیز خۆیشی بێ پایزە لێت ناترسم، ئیتر لە خزمەتیا دانیشتم، ئەو پیرە، پیریی لەبیر بردمەوە. لەپێشەوە بەگاڵتە و سوحبەتی قەدیمەی خۆمانە ڕامان بوارد، تەنانەت فەرمووی نەختێ گوێم گران بووە، عەرزم کرد قوربان منیش کەڕم، بەئیملای کۆن کەڕاوکەڕ کەوتووین و لە خانەقای تەوێڵەدا نین!. دوای ئەوە یادی شەوێکی خانەقای سەید ئەحمەد کە لە (ژیان)ی کۆنا نووسیبووم، لە نوێژێکی نیوە لەوبەر مەرقەدەدا ئەو جلوەی نوورە و تەجەلیاتی سرووره کە دیبووم تەزوویەکی بەسەرما هێنا، کڕی کردم، ئنجا کڕی و کەڕی پەکی خستم!. تا بەیانی ئیتر سەید ئەحمەدم نەدیەوە، زۆرتریش مات و مەلوولی ئەوە گرتبوومی کە ئەگەر سەید ئەحمەد نەمێنێ نەک کەرکوک و سلێمانی عالەمی کوردەواری ئەبێ چی بکەن؟!. چونکە نایەتە عەقڵەوە یەکێکی تری وا ئیتر هەڵکەوێتەوە، بەڵام واتایەکی پێشینیانم هاتەوە بیر کە وتوویانە بێچوە مراوی لە تەبیعەتدا مەلەوانن، لەو شوێنە موبارەکەدا دوعایشم بۆ کوڕەکانی کرد، وە ئەمینیشم کە بەم حاڵ و ساڵەوە لالانەوەم گیرایە، بەم عەرەفەیەش دوعا ئەکەم تا من ماوم سەید ئەحمەد بمێنێ و دوای خۆیشم قیامەتە!.

ئەم جاری دواجارەم کە چوومە خزمەت سەید بەنەخۆشی ڕامکێشا! لە خانەقا خۆمان ئاسایی دەستمان کرد بەلەقلەقیات، تێفکریم ئەو لە من بەگوڕترە و بیرترە! باوەڕم کرد لەپێش مندا نامرێ! هەروەکو بەخۆیم وتووە وەک لە ڕێگای حجازدا (وەفایی)مان ناشت و بۆی گریاین و گرینۆکە!. بەو یادەوە پێنج خشتەکیەکی وەفایی خوێندەوە ئەمەندە جوان و بەزەمزەمە بوو، هەر چەند زۆر جار خۆم خوێندوومەتەوە لە تافەتی شیعرەکان و شێوەی خوێندنەوەکەی ئەو هێندە تەئسیری تێکردم تازەم کردەوە، ئەهلی زەوق تێر و پڕ بیخوێننەوە:

سولتانی هەموو سەرو و قەدان ماهی حەساری
ئەو چاوە غەزالەی دەگرێ شێر شکاری

دوو هێزم هەبوو یەکێکیان جازبەی مەلا مەجنوونی هەورامی کە لەوێ دۆزیبوومەوە، دووهەمیان سەید ئەحمەدی خانەقا کە ئێستا واکزۆڵە و بێدەنگ لێی هەڵئەژیاگە!!. ئای نایناسن چەند بەسۆز و عەشق و جەزبەیە، لە حاڵەتی سەرمەستیدا کزە و ناڵە و ئاوازە و کروزانەوەیەکی هەیە دار و بەرد دێنێتە جونبوش. دەنگیشی خۆشە و موناجات و تەوحیدی چاکیشی لەبەرە. بەو شکی منی تەڕ کردبووەوە.

دوو دار پێکەوە بخەیتە کوورە
هێند لێکیان خۆش دێ گڕیان وەک نوورە
ئێستە هەردووکمان وەها پواوین
گیرمان نەماوە جەرڕی سواوین!

لەم بەرە جەژنانەدا بەو یادەوە چووم بەڵام سارد بووبوومەوە.

جەزبەی ئاهینم دەماخ دان پەرداخ
مغناتیس تۆی جام کەردەن وە یا تاخ
کهربا نە دەور کام مەدەر و دەور
نە دەورەی مورەی (کارەبا -کا تەور)

خانەقاکەی سەید دار و بەردی بەزبانی حاڵ و ئیلقای مەعنەویات شاهێدی ئەدەن، کە زۆر پەککەوتە و داماو و لێقەوماوی تیا بووژاوەتەوە و ژیاوە و پارێزراوە. ئەمەیش وە نەبێ بەسووساتی دیوانی و ئیجارە و خەساندنی مسکێن و گەڕ و تەشقەڵە بووبێ. ڕەنجی شان و کشتوکاڵ و ماڵی حەڵاڵ، بەشی خۆم سێ پادشای ناودار و گەلێ بزورگەواری ڕۆژگارم دیوە، کەسیان ئەوەندەی سەید ئەحمەد مەجلیس ئارا و لەسەر سفرەی خۆی ڕووخۆش و حەز بەنان بدەیم نەدیوە. زۆریش جەسوور و بەغیرەتە، نیشان بەو نیشان لە ڕێی حەج لەسەر ئەمەی پیاوێکی ئەوڕەحمان پاشای میرحەج کە (مرعي) ناو بوو حوشتری دابوو بەکرێ بەحەجاج و دوایی حوشترەکانی لێ شاردبوونەوە سەید لەو سەتوەتی ئەوڕەحمان پاشایە نەترسا (مرعي) دایە بەر قەمچی.

ئاخ، ئەمانە دوای خۆیان قەدریان ئەزانرێ. ئەمڕۆ زیندوویەکمان هەیە نەک تەنها ناودار، بگرە بەهەموو مەعنایەکەوە هەڵکەوتووە، ئەبێ بەخێر من ڕاوەستم تا ئەو ئەمرێ؟! ئنجا دوو شیعری مەرسییەی یا شینێکی زبانی بۆ بکەم؟!، نەوەڵڵا باوکە، ناوەستم، ڕەنگە من لەپێش ئەودا بمرم!. ئەویش خوانەکا، یاخوا تا من ماوم نەمرێ، دڵم تەنگ نەبێ و نەگریم !. دوای من کەیفی خۆیەتی.

### ١٠- تۆفیق وەهبی

کاتی کوڕێنیم بوو، کەوتبوومە کۆڕی مەلا ئەدیبەکان، وەک مەحوی و ئەحمەد صائب و مەلا عوبێد و یەکێ لە کۆنە مەلاکان کە کەوتبووە وەزیفەی دیوانیەوە و دیسان هەمیشە هاونشینی ئەو مەلایانەی ئەکرد، زۆرتر لە ماڵی ئەوانیش کۆ ئەبوونەوە. ئەو زاتە مارف ئەفەندی صندوق ئەمینیی بوو مخلص (مەعروف وەهبی) بوو، باوکی تۆفیق وەهبی. دیتە منی خۆش ئەویست هەرچەند ئەچوومە ئەوێ، ئەم کوڕەی تازە پێی گرتبوو، جووتێ پاوانەی زیوی لە پێدا بوو



بەخلەخل و خرنگەی پاوانە ڕاست ئەهاتە باوەشی من ئەوسایەش گرۆگاڵی منداڵیی ئەو وەک واتا تازەکانی ئێستای لە شێوەی وشەی منداڵانی تر جوێ بوو. گەردشی چەرخ منی دوورخستەوە چوومە ئەستەموڵ. ئەویش هاتە مەکتەبی حەربیەی ئەوێ. دیسان ئەمدی بەڵام نەدەهاتەوە بیری کە مامەی منداڵی ئەو بووم!. تا هەموو لا یەک هاتینەوە بەغدا. ئەو بەهۆی خوێندەواریەکەیەوە لە ئەستەموڵ پێی بوو بەئەرکانی حەرب. لە عیراقدا کەوتە کارەوە. لەپێشدا خزمەتێکی باشی خوێندەواری کرد و بناغەی الف بای لاتینی دانا... یەکێ لە پروفیسۆرە ناودارەکانی فرانسە (پیەروتد) لە دەوری ڕەواجی لاتینی دواوە و من بەکوردی لە (ژیان)دا نەشرم کردوە. زۆر تەقدیری تۆفیق وەهبی کردوە. دوای ئەوە بوو بەمتصرفی ئێرە و هات خزمەت بکا. بۆی بووە نەگبەت! چەندێک بەنەنگەویستی دیوانی ئەو دەورە تەنگانەیەکی تەواوی کێشا، بەڵام نەبەزی لەو سەردەمەیشدا هەر خزمەتی عیلم و ئەدەبیاتی کوردی کرد و (دەنگی گێتی تازەی) دەرکرد. ئنجا هەندێ وشەی کەس نەبیستووی هێنایە مەیدان کە لەوەدا من جوێ بوومەوە، ئەو بوو بەوەزیر، ئێستاکە وەزیر نییە هونەر ئەوەتە هەندێ لە سیفاتی چاکەی بخەمە ڕووی ئەوانەی کە چاکەی دەربارە کردوون و پێیان نەزانیوە. جارێ لەگەڵ ئەوەیشدا کە بەتیری کوردایەتی لە پایەی ئەوجی سلێمانیدا سەرەنگرێ بوو دیسان تا بۆی لوا بەدامەزراندنی هاوزوبانەکانی خۆی درێغی نەبوو. زۆر کەسی لە سایە و پەنادا حەسایەوە و زۆریش خزمەتی سحافە و سەقافەی کردوە. لەگەڵ ئەوەیشدا کە خێری ئابوونەیەکی بۆ (ژین) نەبووە دەستە برایەکی وەک (دەنگی گێتی تازە)ی هێنایە مەیدان کە لە گێتی کوردەواریدا دەنگی داوەتەوە. بەڕاستی عالم و زبانزان و بێ دەعیەیە. خوا بکا هەشت نۆیەکی وامان زیاد بێ و دەوروپشتی مؤیدی کوردەواری (ئەمین زەکی بەگ) بگرن.

### ١١- بەدرخانییەکان

هەموو جارێ لە بەیروتەوە ڕۆژنامە کوردییەکانم بۆ دێت. هیچ درۆی تیا نییە چاوم ڕوون ئەبێتەوە و دڵم ئەگەشێتەوە. ناوی کامەران ئەمباتەوە سەر دەورەی کامەرانییەک کە لە ئەستەموڵدا لەگەڵ بەدرخانییەکان ڕامانبوارد و زۆر جار لە شەرەفی مصاحبتی ئەمین عالی بەگ، کە هەردووکمان لە (قاضیکوی) دراوسێ بووین. هەمیشە لە مەجلیسی ئەودا ڕامان ئەبوارد. (مەحمود پاشای ئورفەی)ش کە لە شوورای دەوڵەتا ئەعزابوو ئەهات شەترەنج بەرێتەوە، بەقەد فیلێک زل بوو، بەپیادەییەک لە ئەسپ ئەکەوتە خوارەوە، پاشاهی و شاهی مات ئەبوو. ئێمە (مەدحەد بەگ و حەسەن بەگ، مراد بەگ و حەسەن پاشا) لە شوێنێکدا ئەعزا بووین، زەمان بەسەردا ڕۆی هەریەکە کەوتینە جێیەک لەم دواییەدا لە خزمەت (عەبدولڕەزاق بەگ)دا ئەو و (سەید تەها) و من لەگەڵ (حەیدەر بەگی) والی موسڵ هاتینە موسڵ، ئەوەبوو (نەوزاد

حەرامزاد) کە (مرخص)ی اتحاد و ترقی بوو دەرمانخواردی کرد و بەزەهر کوشتی. پاش ئەوە خەلیل بەگ متصرفی (ملاطیە) بوو، منیش لە ئەماسیە بووم. دراوسێی یەک بووین. (میجر نوئیل) هات بۆ ئەو ناوە. سوپای مستەفا کەمال دەورەیان گرت. ئێمە بەهۆی (بەدری ئاغا) و عەشائری کوردەوە ڕزگارمان کرد کاتێ گەڕامەوە بۆ عیراق لە حەلەب دیسان کامەران و جەلادەت و مەمدوح خزمەتێکی زۆریان کردم. دوای هەمووان جەلادەتم لە بەغدا دی. تەماشاکەن وا کامەران گیانی خۆی و ژیانی لە ڕێی قەومیەتی خۆیا بەخش ئەکا. لە هەموو شوێنێک و دەوڵەتێک و جەمعیەتێکدا ئاوازەی داد و بێدادی ئەو لەکارایە، بەو دوعایە بێ کە پیران بۆی ئەکەن.

## ١٢- ئەحەی جاو

ئۆه خۆزگەم بەخۆی، ئەگەر ئەتانەوێ بیبینن بەشوێن منا وەرن پاش نیوەڕوان لە حەوشی مزگەوتی سەید حەسەندا لە دەستە ڕاستەوە لەبن تووەکەدا یەکێ لێی ڕاکشاوە، سینیەکی حەڵوای گەزۆ و ماجومی و مەسکەتی لە ژوور سەری خۆی داناوە. خەریکە ماندوویەتی خۆی ئەحەسێنێتەوە. ئەگەر ئەتەوێ خەبەری کەیتەوە دەست بەرە بۆ حەڵواکەی ئەو هەڵدەسێ، پڕ چنگی ئەکا لە حەڵوا ئەڵێ فەرموو، وا ئەزانێ تۆ مشتەریت و لێی ئەکڕی. ئەوەندەیشت پێ ئەڵێ: ئەم حەڵوایە بۆ هەندێک بایی چل ملیۆنە و هەندێکیش چل ملیۆنیان هەیە و فلسێکی پێ نادەن! ئیتر ئەکەوێتە فەلسەفە.

ئەم زاتە کەڵەگەتێکە ڕیش سپی کۆنێک و کراسە شڕێکی لەبەردایە، هەمیشە سنگی بەرەڵڵایە. مووی سنگی وەکو پووشی شارەزوور بەدەرەوەیە. ڕیشیش هیچ دەستی لێ نادا هەروا بەتەبیعەت خۆی پێکاهاتووە. جار بەجار دەلاکێ بەخێری خۆی ماکنەیەک بەڕیشیا دێنێ!، کورتی ئەکاتەوە. ئیتر هەروا هەرچی تەکلیفێکی تری توالیت تەراش و بیجامەیە ئەو لێی ئازادەیە.

بەیانیان زوو کە هەڵدەسێ سینی حەڵواکەی ئەگرێ بەبن دەسیەوە لەسەردا بەبازاڕدا ئەڕواتە خوارەوە لە زۆر لاوە منداڵەوردکەی بێعاری شوێن ئەکەوێ، حەڵوای لێ ئەفڕێنن، بەردی پیا ئەدەن هێشتا دەستی لە کەس نەوەشاندووە. سا ئەگەر چەند حەڵوایەک ئەویش ناسیاوەکان لێی بکڕن. جارێ لەپێشەوە پارەی حەڵواچیەکەی لێ ئەداتەوە، ئنجا کولێرەیەکی لێ ئەکڕێ ئەیخاتە باخەڵیەوە و دێتەوە. لە چایخانەکەی بەر مزگەوتی سەید حەسەن چایچیەکە چای بۆ تێئەکا، کولێرەکەی پێوە ئەخوا و ئنجا ئەگەر کەسێکی دەستکەوت قومارەکەی لەگەڵ ئەکا هەمیشە دەستەیە کاغەزی ئەسکەملی لە باخەڵدایە. تا قوماری بۆ هەڵکەوتبێ هیچی تر ناکا و ئەگەر حەڵوایشی نەفرۆشتبێ و هیچیی نەبووبێ کولێرەیەک و دەستەیە کاغەزی لە باخەڵا یە. زۆرجار کە زانیومە هیچی نەبووە نانی پێ بکڕێ دە فلسم بۆ ڕاگرتوە وتوومە ئەمە تۆ قەرزی کۆنت لەلامە



ئەتدەمێ نانی پێ بکڕە، نەیویستوە. کولێرەیەکی گەرمی لەبن باخەڵی دەرهێناوە وتوویە ئەو کولێرە. بەم ڕەنگە، مەردێکە، نەبەردێکە، بەبرسێتی، بەڕووتی، بەسەرما، بەگەرما، بەبێ جێیی، بەبێکەس نانەوێ. گلەیی ناکا، چاوی لە خێری کەس نییە. جار بەجار کە ئەچم ئەیدۆزمەوە ئەمەوێ لە قەرزە کۆنەکەی شتێکی بدەمەوە بەزۆر پارەکەی ئەدەم بەسەردا. ئەویش بەزۆر ئەوەندە حەڵوا بەسەر ئەو منداڵانەی کە دائیما لە دەورین دابەش ئەکا. بەم حاڵەوە کە موحتاجترین و بێ ڕێ و جێ ترینی بەشەرە، چەند سەرماوسۆڵە و نەخۆشی دیوە و چەند بەردی منداڵانەی لێدراوە هێشتا ئۆفێک و کفرێکی لە دەم نەترازاوە. ئەمەیش نموونەیەکە خوا پیشانی ئێمەی ئەدا. ئەڵێ سەیرکەن چەند خۆشەویستە لای من کە ئالوودەی فێڵ و فەرەج و شەڕ و ماڵی خەڵک خواردن و حەسرەتی و دەوڵەت و بادە و تەفرەی ژنان و دەردی موزاهەرە و سەرەخۆشی ئەولادم نەکردووە. کە مردیش هیچی لەپاش بەجێ نامێنێ کە داخی بۆ بخوات و ببێتە میقرۆبی شەڕی ئەولادی، خۆزگەم بەخۆی!.

## ١٣- مەولەوی[1]

جارێکی تریش نووسیبووم، منداڵ بووم، لە بیرمە جارێ مەولەوی هاتە ماڵی ئێمە، قاپووتێکی کورکی سەوزی لەبەردا بوو، منیان خستە باوەشیەوە و دەمی ماچ کردم، لە دەمی دەم ماچکردندا چاوم بەچاوی کەوت، بروسکەیەکی پڕ خەندەی لێ ئەبووەوە. مەولەوی ناوی عەوامی (عەبدولڕەحیم)ە، بۆ شیعر (مەعدووم)، کەچی لە هەموو شیعرێکدا مەوجودە. ئەچێتەوە سەر مەلا ئەبوبەکری مصنف خوا لێی ڕازی بێ. لە هۆزی (تاوغ گۆزی)ن، پیری خدری شاهۆیش لەوانە. لە ساڵی١٢٢٢ی هیجری- ١٨٠٤ی میلادی لە خاکی جوانڕۆ لە دێیی (تاوغ گۆز)دا[2]، هاتۆتە دنیاوە. ئەو خوێندەواریە بڵندە و ئەو هەموو ئاسارە دڵپەسەندە بەفەقێیەتی لە مزگەوتانا فێری بووە. دوازدە عیلم بووە، لە (عەقیدە) باوەڕدا ماهیر بووە. عەقیدەنامەکانی لە میسردا بەهۆی هیممەتی هاوڵاتییەکانی خۆمانەوە لە چاپ دراوە.

لەپێشدا بەفارسی و عەرەبی شیعری وتووە. بەسەودای مەعنەویاتی شێخ سراج الدین (قدس سره) هەموو ئاسارێکی و کردارێکی نەقشی هەورامانی لێدراوە و پەردەی پەنهانی مەعنەویاتی بەسەردا کێشراوە. مەولەوی بەهۆی محەبەت و حورمەتی بەگزادەی جافەوە هێجگار (قادر بەگی کەیخەسرەو بەگ) کە مامی مەحموود پاشا و وەسمان پاشا بووە لە تەک بەگزادەدا ڕایبواردووە. شوهرەتی مەولەوی دوو بەشی بە قادر بەگ و مەحموود پاشاوە بووە. زۆرتر شیعرەکانی ئەوان

(١) لە ڕاستیدا ئەم بابەتەی پیرەمێرد سەبارەت بە مەولەوی لە بەشی یەکەمی ئەم لاپەڕانەدا بوو بەڵام لە نووسینەوەدا کەوتە بەشی (١٣)وە.

(٢) مەولەوی لە دێیی (سەرشاتە)ی ناوچەی تاوەگۆز لە دایک بووە.

کۆیان کردۆتەوە و دەربارەی ئەوان بووە.

ماڵی مەولەوی لە (چورستانە) بوون[٣]. کە ئێستا ئاوایی جەنابی (ئەحمەد بەگی حەمە ساڵح بەگ)ـە. لەو زەمانەدا سەد ماڵێ لە ئەفغانستانەوە هاتوونە شارەزوور، مەولەوی کچێکی لێ هێناون کە ناوی (عەنبەر خاتوون)ـە و مەولەوی شینی ماتەمی کردوە بۆ عەنبەرخاتوون. (سەید محەمەد و سەید ئەحمەد و سەید مەحموود و سەید عەبدوڵڵا) چوار کوڕی بووە، لە چورستانە ڕەچەڵەکی بڕاوەتەوە. تەنها سەید عەبدوڵڵا ماوە. ناچار ڕای کردووە گوازتوویەتە پشت قەڵای شەمێران لە دێی (سەرشاتە) لەوێ وەفاتی کردووە.تەئریخی وەفاتی ساڵی ١٣٠٠ی هیجری ١٨٨٢ی مەسیحییە. زاتێکی میانە باڵا، ڕیشێکی تەنک دوو چاوی بەڕەونەق و پڕ جیلوە. ئەو چاوە جوانانەی لە دواییدا کوێربوو. گفتوگۆی لەسەرخۆ وەک شێخی ضیائەددین دانەدانە و بەنوکتە و نیوە خەندەیەکی بەمەعنا کە ئیمای دڵپاکی و ڕووناکی بکا، جارجار ئاهێکی بەسۆز لە کوورەی دەروونێکی پڕ عەشقی مەعنەوی دەهاتە دەرێ، وەک تەوەجوهی شێخێکی نەقش تأییدی ڕابیتەی دەکرد و بەو عشقەوە بەجۆش. ئەمە مەولەوی خۆی، ئەمیشە شیعرەکانی وەک ئاوی حەیات لە توێی میدادا.

شیعری مەولەوی بەدەنگی خۆش و هیجرانی (عەزیزی ئامینە)وە لەناو ئێمە برەوی پەیدا کرد. عەزیز گۆیندەیەکی عەزیز بوو. لە مەجلیسدا هیجرانی و لە چیادا قەتار هەر لەو ئەهات. ئەمە ڕاستە کە بەیانییەک لە ڕاوەکەودا قەتارێکی خوێند کەوی کوهسارانی هێنایە جونبوش و قاسپە. یەک دوو شیعری بوو، زۆری لە دڵ ئەسەند، ئێجگار لە بەهاراندا. لە ئێواراندا لەسەر کارێزی شەریف کە دەیگوت: وەهارەن، سەوزەن، ئاوەن، پێکاوەن.

یاخوو:

گوڵ چون ڕووی ئازیز نەزاکەت پۆشان
بەفراوان چون سەیل دیدەی من جۆشان

یا بەیانیان کە بەقەتارەوە ئەیگوت:

لە ورشەی شەونم لەتوێی پەردەوە
نێرگس مەست مەست چەم بڵاو کردەوە

ئەمانە و ئەو دەنگە داودییە و نەشئەی بەهاران و دڵپاکی ئەوسای یارانە. جا لێکی بدەنەوە چ شۆرێک و چ سۆزێکی ئەخستە کەللە و دەروونەوە، من ئەم شۆرەم هەر لە کەللەدا بوو ئەمویست بەسەر یاراندا دابەشی کەم. بەڵام شێوەی زوبانەکەی ئەو گیانە شیرینەی لە ئێمە شاردبووەوە تەنها

(٣) تکایە بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیانی مەولەوی و خێزانی و شیعرەکانی و دۆست و خۆشەویستانی، تەماشای یادی مەردان بەشی دووهەمی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مدەرس بکە.



چەند کەسێک لە هەوراماندا تێی دەگەیشتن. ئەو سەردەمەی لە ئەستەموڵ شاعیرەکانمانا ڕۆژنامەدا بەڕێز ئەنووسی لەوێ کەس لە مەولەوی نەدەگەیشت. نیازم بوو وەک شینی حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە و چوار شەخس ڕەنجووریم کرد بەتورکی ئەویش وەرگێڕمە سەر تورکی. بەڵام ئەو گیانە بڵندە لەو گۆڕە تەنگەدا نەدەگونجا و دانەدەمرکا!. ئەو ئارەزووەم هەر لە دڵا مایەوە تا هاتمەوە و بەزۆرە ملی ئاڵاندمیانە نووسینی ڕۆژنامەوە و ئەشبایە هەموو ژمارەیەک هیچ نەبێ شەش حەوت ڕەنگ نووسین بنووسم، عیلمی و فەنی، تەئریخی کردوکۆشی، گاڵتەوگەپ، ئیجتماعی، حقووقی، ئەدەبی، ئەدەبیاتمان لە هەموویان بۆ ئەم خاکە پێشتربوو. جارێ لە پەندی پێشینانەوە تێهەڵچووم، دیتم ئەوە خەرجی عامە، باڵا نییە، ئنجا هاتم بەفەننی (ئەسپری تیزمە - جەلبی ئەرواح) گیانی مەولەویم هێنایە (ژیان)ەوە و ژیاندەوە. لە قەڵای زاڵمی زەڵم وەک تاڤگەکەی زەڵم کێشامە دەشتی شارەزووری ئەدەبیاتی کوردەوە. ئەو تاڤگەیە ئەلەکتریکی نووری لێ پەیدا بوو ڕوحەکەی و ئەسڵەکەی بووە پەلکە زێڕینەی کوردستان.

ئاخ هەر خۆم ئەیزانم چەندم ڕەنج داوە تا لەم لا و لەولا کۆم کردەوە خوا هەقە بۆ ئەمە موفتی[٤] هۆی کردەوە و دیوانی مەولەوی دامێ و حەسەن بەگی عەلی بەگی جافیش سەراوردی مەولەوی دەست خستم. خوا هەردووکیان پایەدار و کامگار کا.

باوەڕم نەدەکرد من بگەمە ئەو ڕۆژەی فەردی مەولەوی کۆبکرێتەوە و لە چاپ بدرێ. خوا هەردووکیانی بۆ من ئاسان کرد. لە هەر شوێنێ ناڵەیەکی مەولەویم بیست خستمە قەوانەوە. بەڵام زۆر داخی دیوانی ناڵی و کوردی و شێخ ڕەزا و حاجی قادرم لەدڵدا بوو کە ئابڕووی ئەو یادگارە جوان جوانانەیان بردبوو. من بەشی گرانترم گرتە ئەستۆی خۆم زوبانی هەورامی و زوبانزەدەی مەولەوی ئەمڕۆ لەم خاکەدا کەم کەس ئەیزانێ. هەرچی خۆم نەمزانیبێ بە (کەعب الأخبار)ی کوردستان (مەلا عبدالله)[٥] کە وەک مەولەوی لەدواییدا چاوی نابینا بووە و بەشاعیری هیوای ئەدەبیاتمان، بینای هیوا (گۆران)[٦] ساغ کردەوە. وە لەتەرتیب و چاپیشا ڕەنجم دا چ ئەسڵی شیعرەکان و چ چاپەکەیان ڕاست و ڕەوانە خانەی چەوتی و ڕاستی بۆ ناکەم. خۆزگە شیعری مەولەوی ئەهلی دڵ ئەیخوێندەوە. گۆران ویستبووی غەزەلێکی هەڵبژێرێ بیکا بەعەرەبی، هەرچی تەماشای کردبوو هەڵبژاردە بوو. خوا ئەیزانێ و ئەهلی مەعنا باوەڕ دەکەن کە

(٤) موفتی: موفتی سلێمانی - مەلا عەزیزی موفتی - زانای ئایینی.

(٥) مەلا عەبدوڵڵا (مەلا عەبدوڵڵای مەریوانی) شارەزای شێوەی هەورامی کە یارمەتییەکی زۆری پیرەمێردی داوە لە وەرگێڕانی شیعرەکانی مەولەویدا.

(٦) (گۆران) مامۆستا گۆرانی شاعیر بەهۆی ئەوەی ماوەیەک لە هەوراماندا مامۆستا بووە، شارەزایی لە شێوەزمانی هەورامیدا پەیداکردوە.

*رۆحی مەولەوی وەک (مثنوی) مەولەوی[٧] ڕۆح نەواز و دڵپەسەندە. تائێستا لەپەردەی زوبانی هەوراماندا بوو وا دەرکەوت. چونکە هەمووی پێنج سەد لاپەڕەی ئەگرتەوە. کردمان بەدوو جلد. هەرزانتریش ئەبێ.*

*جلدی یەکەمی مەولەوی وەک گڕی ئاگری زەردەشتی لەسەر کۆی ئاتەشگاوە، کە شاعیری بڵند هەمیشە یادی کردووە، درەوشایەوە کوردستانی پڕ کرد لە نووری ئەدەب. زۆرم پێ خۆشبوو کە بەبازاڕدا ئەڕۆیم هەندێ دیوانی مەولەوی بەدەستەوە و هەندێ لەبەر وەک بولبول بەنەغمەی ڕۆحی مەولەوی جریوەیان ئەهات. ئۆف چەند خۆشە دەنگی هەستی و بەبادەی هەستی نەشئەی سەرمەستی. من ئەوا دوایی ڕۆژمە بەوتەی خۆم نەبێ ئەدەبیاتی زۆر قەوم و ناودارانی زۆر میللەتم دیوە هیچیان ئەوەندەی ڕۆحی مەولەوی پڕجۆش و خرۆش نییە. ڕەنگە لە مەعنای شیعری مغلقی عەرەبی نەگەم کە (معلقاتی سەبعە)، حەوتەوانەی کەعبە پێچ و تاب و بریقەی شیر و ئوشترم ئەخاتە کەللەوە. (بێدڵ)[٨]یش خەوم لێ دەخا و مەولەوی بەناڵەی دڵسۆزییەوە بێداری کردمەوە، مەعدومم لە قوللەی قەزالەی عەدەمەوە هێنایە سەر کۆی ئاتەشگا.*

*وا دەزانم ئەم دیوانە لە ئەدەبیاتی کوردیدا هلالی شەواڵە، هەورامان بەئاشووبی زەمان شێوا. بەرگوزاری مەعدوومی تازە ڕەنگ و بۆی بەهار پەیدا ئەکا. خۆزگە وەک نەمردم دیوانی (مەولەوی)م بەچاپکراوی دی ئەشمبیست ڕادیۆی عیراق بەدەنگی (ڕەشۆڵ)و یەکێکی تر قەتار و هیجرانی و ئای ئایی بەشیعری مەولەوی ئەڕازاندەوە.*

## وەسیەتنامەی پیرەمێرد

*ئەمجارە ئەمرم، لە مردن ناترسم، ژیانێکی باش و عومرێکی درێژم ڕابواردوە، گەلێ شاران و وڵاتان گەڕاوم، گەورە و پادشاهانم دیوە، تاڵی و سوێری زۆرم چەشتوە. بەنیوە خوێندەواری لە سلێمانی دەرچووم و خوێندنێکی بەرزم هێنایەوە. بەسەربەرزی ئەزانم کە لەڕێی باوەڕی خۆما حەپس و زیندانێکی زۆرم دیوە. لەم وڵاتەدا دوو چاوم هەبووە، یەکێ زانست و یەکێ ژین. ئێستە کە ئیتر لەوانەیە کەڵکی خزمەتم پێوە نەمێنێ ببم بەبار بەسەر خەڵکەوە، ڕوو ئەکەمەوە قاپی ئەبەدی بەبێ ئەوەی کە ماڵی کەسم خواردبێ، موحتاجی کەس بووبێتم. هیچم پاشەکەوت نەکردووە، هیچیشم لەدوا بەجێ نەماوە چاوم لە دوای خۆم نییە، خۆم بەئاخرخێر ئەزانم. هەرچەندە یەگانە هیوام ئەوەبوو کە ببینم قەوم و میللەتەکەم پلەیەک لەمە بەرزتر و خوێندەوارتر و پێگەیشتووتر بن، بوو بەگرێ لە دڵما و نەمدی. لەگەڵ ئەوەشا بەختیارم چونکە بۆم دەرکەوت کە*

(٧) مەولەوی (مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی) خاوەنی مەسنەوی (سروودی نەی).

(٨) (بێدڵ)ی شاعیری بەناوبانگی ئێران. کە هەمیشە ناوی لەگەڵ ناوی (کلیم)دا پێکەوە دێت.



*قەوم و میللەتەکەم لە پێشکەوتنان و هەموو جۆرە توانا و قابیلیەتێکیان تێدایە. ئامۆژگاریم ئەوەیە بخوێنن کوڕ و کچ تا خوێندەوار نەبن بێ سوودە. هەموو شتێک بەعیلم و فەنەوەیە. وەکو وتوومە:*

«لای من بەخوێندەواریە، ئاه خوێندەواریە
هەر میللەتێ کە فەنی نەبێ، دەردی کاریە
ئاخ خۆزگە خوێندنیش وەکو من ئارەزوو ئەکەم
بیبینم و نەبێتە گرێی قورسی کفنەکەم»

*ئامۆژگاریم ئەوەیە بەشوێن مادە مەکەون، دنیا زۆر بەگران مەگرن. تا ئەتوانن خزمەتی ڕاست و بێ موقابلی قەوم و زمان و وڵاتەکەتان بکەن و دەستی داماوان بگرن و لە دین لامەدەن. خوا و پێغەمبەری خۆتان بناسن و ڕەوشتتان پاک و خاوێن بێ.*

*ئامۆژگاریم ئەوەیە چاپخانەکە مەفەوتێنن، ئەم قەلەندەرخانەیە تێک مەدەن. ئەو یەک دوو کەسانە ئەم بەینە لەم قەلەندەرخانەیەدا خۆیان داوەتە پەنای من بێ نازیان مەکەن حەقیان بەسەرمەوەیە.*

*ڕۆژنامەکەش لەدەست مەدەن. چاپخانەکە ئیش پێبکەن چونکە لەلایەکەوە ناکوژێتەوە و خزمەتێکی پێ ئەکرێت لەلایەکی تریشەوە ئەو جیهەتانەی من یارمەتیم داون بەڵکو بەهۆی ئیشکردنی چاپخانەکەوە ئەو یارمەتیەیان لێ نەبڕێت.*

*ئامۆژگاریم ئەوەیە شیعر و نووسینەکانم کۆکرایەوە مەیفەوتێنن ئیستفادەی لێ ئەکرێت. ئامۆژگاریم ئەوەیە لە گردی یارە بمنێژن. بۆم مەگرین. ئەگەر زۆر بیرتان کردم جارجار سەرم لێدەن. فائق ئەم ئامۆژگاریانەم بۆ تۆیە و بۆ ئەو کەسانەیە کە بەتەنگمەوەن.*

# ژیانی پیرەمێرد

### یەکەم: ژیانی لەخوێندن و فەرمانی میریدا:

* پیرەمێرد ناوی (تۆفیق مەحموود هەمزە)یە. واتا تۆفیق بەگی مەحموود ئاغای هەمزاغای مەسرەف.
* لەساڵی ١٨٦٧ی زاینی، ١٢٨٨ی کۆچی، لەگەڕەکی گۆیژە لەشاری سلێمانی لەدایک بووە.
* باپیری (وەکیل خەرج) واتا بەرپرسیاری دارایی (ئەحمەد پاشای دوا میریی بابان) بووە. بۆیە ناسراوە بەمەسرەف (مصرف). تۆفیقی مەحموود ئاغا، لە تەمەنی شەش، حەوت ساڵیدا، نراوەتە بەرخوێندن، یەکەمجار ئەچێتە حوجرەی مەلا حوسەینە گۆجە قورئان و کتێبە سەرەتاییەکانی خوێندنی حوجرەی ئەوکاتە لەوێ تەواو دەکات. ئنجا ئەچێتە حوجرەی مەلا

سەعیدی زڵزڵەیی.

* دوای ئەوە ژیانی فەقێیەتی دەست پێدەکات. لەسەرەتاوە لەمزگەوتەکەی باپیری کە ئێستاش ماوە (مزگەوتی هەمزاغا) کە نزیک ماڵی خۆیان بووە، لای مەلا مەحموود دەرسی عەرەبی دەخوێنێت. لە خوێندنی عەرەبیدا دەچێتە پێشەوە و دەست ئەکا بەخوێندنی (سیوطی) بەدوای خوێندندا وەک هەر فەقێیەکی ئەو سەردەمە لە شار و جێگەی خۆی دوور دەکەوێتەوە. دەگاتە مزگەوتەکانی شاری (بانە) لە کوردستانی ئێران. ماوەیەک لەوێ ماوەتەوە و گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی.
* لە ئەیلوولی ساڵی ١٨٨٢ی زایینیدا، لەتەمەنی (١٥) ساڵیدا دەبێت بەکاتبی نفوسی سلێمانی. زۆری پێ ناچێ دەبێت بەکاتبی (ظبط)ی دادگای سلێمانی.
* لە حوزەیرانی ١٨٨٣دا کراوە بەکاتبی ئەملاکی هومایونی لە هەڵەبجە.
* لە ئەیلوولی ساڵی ١٨٨٦دا دەبێت بەباشکاتبی مەحکەمەی شارباژێڕ.
* لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٩٥دا بووە بەمعاون مودیری شاری (کەربەلا) بەڵام نەچووە و دەستی لەکار و فەرمانی میری کێشاوەتەوە.
* شێخ مستەفای نەقیب کردوویە بەوەکیلی خۆی بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش و کارەکانی و ژیانێکی باش و لەباری بۆ خوڵقاندوە.
* لەسەر دەعوەتی (بانگ کردنی) سوڵتان عەبدولحەمید، شێخ مستەفای نەقیب و شێخ سەعیدی حەفید، کاروانێک ڕێک دەخەن و لە ساڵی ١٨٩٨ی زایینیدا، دەچن بۆ تورکیا، پیرەمێرد، دەبێتە هاوسەفەریان. دوایی باسی ئەم کاروانە و سەفەرە دەکەین.
* لە ئەستەمۆڵ لە (مابەین) دەبنە میوانی پادشاهیی. لەپاش ساڵێک لەگەڵ شێخ سەعید و شێخ مستەفا و گەلێ لە ڕۆشنبیر و پیاوانی بەناوبانگی سەفەرەکەیاندا دەچن بۆ (حەج)، تۆفیق دەبێ بە حاجی تۆفیق، لەلایەن پادشای عوسمانییەوە پایەی (بەگ)ێتی دراوەتێ و بوو بە حاجی تۆفیق بەگ.

کاتێک لە حەج دەبن، وەفایی شاعیر و سەید ئەحمەدی خانەقای کەرکووک، دەبنە هاوڕێی حاجی تۆفیق. لە گەڕانەوەدا لە ڕێی حیجاز وەفایی کۆچی دوایی دەکات و، هەر لەوێ دەنێژرێت. سەید ئەحمەد ڕووە و عێراق دێت و حاجی تۆفیقیش دەچێتەوە بۆ تورکیا.
* لەو ساڵەدا (عزەت پاشا)ی کاتبی دەرباری شەهریاری، وەڵامی ئەو نامەیە کە (ناصرالدین شا) بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی نووسیبوو، بەحاجی تۆفیق دەنووسێتەوە، شێوەی نووسینی نامە فارسییەکە و خەتەکەی و زیرەکی حاجی تۆفیق زۆر بەلایانەوە پەسەند دەبێت. لەبەرئەمە لە (١٤)ی ئەیلوولی ١٨٩٩دا فەرمانی شاهانەی بۆ دەردەچێت و دەبێت بەئەندامی مەجلیسی



بەرزی ئەستەمولّ. هەر لەو ماوەیەدا بەهۆی عزەت پاشاوە لە ئەستەمولّ لە کۆلیجی یاسا (کلیة الحقوق) وەردەگیرێت و بڕوانامە (شەهادە)ی حقوق وەردەگرێت، لە تەموزی ١٩٠٥دا کە بانگی مەشروتیەت درا و مەجالیس تێکچوو، حاجی تۆفیق هەتا ساڵی ١٩٠٨ لە ئەستەمولّ بەمحامیەتی و گۆڤار و ڕۆژنامەوە خەریک بووە.
* لە ساڵی ١٩٠٧دا کە (کۆمەڵەی کورد) بەنهێنی پێکهات بەسەرۆکایەتی (شێخ عەبدولقادری شێخ عەبدوڵلای شەمزینی) وە لە ساڵی (١٩٠٨)دا کە حیزبی (اتحاد و ترقی) کەمالیستەکان سوڵتان عەبدولحەمیدیان لابرد، ئەو کۆمەڵەیە بەئاشکرا خۆی ناساند وە پیرەمێردیش یەکێک بوو لە ئەندامەکانی.
* لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٠٩دا بووە بە قائیم مەقامی چۆلەمیرگ.
* لە مانگی نیسانی ١٩١٢دا بووە بەقائیم مەقامی (قەرەمورسل)
* لە شوباتی ١٩١٥دا بووە بەقائیم مەقامی (بالاوا).
* لە ئەیلوولی ١٩١٦دا بەهەمان پلە بۆ (بیت الشباب) دانراوە.
* لە مارتی ١٩١٧دا بەهەمان پلە بۆ (گموش کوی) دانراوە. لەهەمان ساڵدا و لە هەمان پلەدا چۆتە (اطه پازاری، هەگبەلی ئوطە) کە دوورگەیەکی خۆش و ناوداری تورکیا و هاوینەهەوارە.
* لە مانگی نیسانی ١٩١٨دا کراوە بە (متصرف)ی شاری (ئەماسیە) لە تورکیا. هەتا ساڵی ١٩٢٣ لەوێ بووە.
* کە حکومەتی عیراق لە ساڵی ١٩٢٣-١٩٢٤دا دامەزرا، لە تورکیاوە گەڕایەوە بۆ بەغدا و لەوێوە بۆ شاری سلێمانی و لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٥دا گەیشتەوە سلێمانی.
* لەو ساڵەوە نەچووە بەلای فەرمان و ئیش و وەزیفەی میریدا و کاتێ لە ساڵی ١٩٢٦دا ڕۆژنامەی (ژیان) لەلایەن شارەوانی سلێمانییەوە دامەزرا و (حسین ناظم) بووە مودیری ئیدارە و سەرۆکی، پیرەمێرد دەکرێت بەسەرپەرشتیاری ڕۆژنامەکە. کاتێک لە ساڵی ١٩٣٢دا حوسێن نازم کۆچی دوایی دەکات پیرەمێرد دەبێت بەمودیری مەسئولی ڕۆژنامەکە.
* لە ساڵی ١٩٣٨دا ناوەکەی دەگۆڕێت بە(ژین) و هەتا ١٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٠ هەزار و پانزە ژمارەی لێ چاپ دەکات.

### ژیانی پیرەمێرد - دووەم

* لە ڕۆژی ١٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٠دا، لە سەعات چواری پاش نیوەڕۆ، بەرانبەر بەچواری ڕەمەزانی ١٣٦٩ی کۆچی لە سلێمانی بەهۆی نەخۆشی شەکرە و گورچیلەوە، لە تەمەنی هەشتا و سێ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات و لەسەر داوای خۆی، گردی (مامەیارە)ی سلێمانی

دەبێتە ئارامگای هەمیشەیی ئەو مرۆڤە مەزنە.

## ژیانی ئەدەبی و رۆژنامەنووسی پیرەمێرد

خولیای شیعر و ئەدەب هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ پیرەمێردا ژیاوە، بەهرەیەکی خاوێن و مەزن ئاوێتەی گیانی بووە و داهێنانی فرەی پێ بەخشیوە. وەک لە پێشەکی ئەم کتێبەدا پیرەمێرد خۆی باسی ئەو خولیا و دنیای شیعر و سەرەتای دەستپێکردنەی خۆی دەکات، لەسەرەتایەکی زۆر زووی تەمەنییەوە ویستوویەتی شیعر بڵێ، باسی ئەو کەشکۆڵەمان بۆ دەکات کە چۆن نووسیویەتیەوە. هەروەها ئەو هەوڵە سەرەتاییانەی خۆی لە بواری شیعردا. خۆی دەنووسێت «لە بیرمە معلم ناجی مەرحووم لە قیسمی ئەدەبیاتی (ترجمانی حقیقت)دا سەرپەرشتی ئەکرد، لێرەوە پەنجا ساڵ لەمەوپێش ١٨٨٣ی میلادی مەنزوومەیەکم نووسیبوو دەرجی غەزەتەی کردبوو، لەژێریشیا نووسیبووی (زکای ناتراشیدە) فکرێکی شێوەی نادروست - هەر کا دەوام بکەی ئاخری هەر دەبیتە شاعیرێکی باش»[9]. هەروەها مامۆستا محەمەد رەسوڵ هاوار لە دیوانی پیرەمێردی نەمردا لە لاپەڕەی(٩٣-٩٤)دا نووسیویە:

«هەر لە منداڵییەوە نیشانەی ئەم بەهرەیەی تیا دیاری دابوو. هەر لە منداڵییەوە حەزی لە شیعر خوێندنەوە و شیعر لەبەرکردن بووە. ئەوە بوو لەگەڵ مامۆستاکەیدا لەسەر شیعرێکی خواجە حافز تێک ئەچێ، لە شارەزایەکم بیستوە کە وەختێ وەسمان پاشای جاف لە ساڵی ١٣٠٠ی هیجریدا خانویەکی سێ نهۆمی دروستکردوە، دیوارەکانی ژووری دیوەخانەکەی هەموو ئاوێنەبەنگ بووە و بەئاوێنەی گەورە گەورە رازێنراوەتەوە، ئەو سەردەمە ئاوێنەبەنگ لە کوردستاندا ئەوەندە نەبینراوە، بەتایبەتی تیرەی جاف کە کۆچەری بوون و هەمیشە لەژێر رەشماڵا ژیاون ئەو خانوەی وەسمان پاشایان زۆر لەلا شتێکی سەیر بووە، پیرەمێرد بۆ دروستکردنی ئەو خانوە و بۆ دانانی مێژووی دروستکردنەکەی ئەم دێڕەی بەفارسی نووسیوە:

«شد بەتوفیقی خدایی لاینام

در هزار و سیصدی هجری تمام»

بێگومان ئەبێ ئەو سەردەمە پیرەمێرد لە یەکێک لە مزگەوتەکانی هەڵەبجەدا فەقێ بووبێت و بەپێی ئەو دێرە تەمەنی پیرەمێرد لەو کاتەدا (١١، ١٢) ساڵان بووبێت کە ئەمەش نموونەیەکی تری زیرەکییەتی»[10]

هەروەها مامۆستا عەلائەددین سەجادی هەر لەم بارەیەوە بیروڕای خۆی دەربڕیوە و نووسیویە: (لە تەمەنی دە ساڵیدا کە دەرزی (شیرین و خەسرەوی نیزامی) لەلای مەلا سەعیدی

(٩) ژیان- ژمارە ٣٧٥-٣١ی ئابی ١٩٣٣.

(١٠)پیرەمێردی نەمر- م. هاوار ل ٩٤.



زەلزەلەیی ئەخوێند و ئەبینێ سەرەتای بەم شیعرە ئەکاتەوە کە ئەڵێ:

خوداوند دەر توفیق بو گشای

نظامی را رە تحقیق بنمای

ناوی تۆفیق لە کانگای دڵییەوە دەنگ ئەداتەوە، لە قەراغ کتێبەکەیەوە ئەمیش ئەم شیعرە ئەنووسێ:

نظامی چون بەتوفیق ابتدا کرد

تەعاون بین کە توفیقش چها کرد؟![11]

لەپێش رۆیشتنی پیرەمێرد بۆ تورکیا واتا پێش ساڵی ١٨٩٨ کە تەمەنی ٣١ ساڵ بووە هیچ بەرهەمێکیمان نەبینیوە یاخود باس نەکراوە هەتا لێرەدا بۆ جیهانی شیعری ئەو سەردەمەی بگەڕێینەوە و لەبارەیەوە بنووسین. ئنجا ئەو کە لە تەمەنی یانزە و دوانزە ساڵیدا خولیای شیعری کەوتبێتە سەرەوە و هەتا تەمەنی ٣١ ساڵ کە رۆیشتوە، دیارە کەم یاخود زۆر بەرهەمی هەبووە تەنانەت ئەو شیعرەی کە معلم ناجی لە رۆژنامەی (ترجمانی حقیقت)دا بۆی بلاو کردۆتەوە لەبەردەستا نییە هەتا شتێکی لەبارەوە بڵێین!.

ئێمە ئەو سەردەمەی پێش رۆیشتنی ناو دەنێین هەنگاوی یەکەم، لەو هەنگاوەدا بەرهەمی هەبوە و وەک باوی ئەو سەردەمە کە خۆی باسی دەکات شیعری، نالی و مەولەوی و مەحوی و حاجی قادر و... هتد. لە کەشکۆڵەکەی خۆیدا نووسیوەتەوە. زەوق و بەهرەی لەو شیعرانە وەرگرتووە و بۆتە شەیدا و عاشقی بووکی شیعر.

هەنگاوی دووەم بەلای ئێمەوە لە ١٨٩٨ەوە دەست پێ دەکات کە چووە بۆ تورکیا هەتا گەڕانەوەی لە ساڵی ١٩٢٤دا. لەو ماوەیەدا لە ولاتێکی دواکەوتوو و پەرێشانەوە کەوتە ناو ولاتێکی پێشکەوتوو و شارێکی گەورەی وەکو ئەستەمووڵ کە شوێنی زانست و ئەدەب و کانگای هونەر و رۆژنامە و شانۆ و هەموو جۆرە چالاکییەکی فیکری بوو. بۆیە دەبینین کە منەوەرانی ئەو سەردەمە، نەک لە کوردستاندا بەڵکە لە هەموو رۆژهەلاتدا، بەتایبەتی لەوانە بوون کە خوێندن و پێگەیشتنیان لە ئەستەموڵ بووە. ئەستەموڵ بەهۆی دەسەلاتی گەورە و بەرفراوانی دەوڵەتی عوسمانییەوە لەلایەک و ستراتیژیەتی شوێنەکەی کە رۆژهەلاتی دواکەوتو و رۆژئاوا (ئەوروپا)ی پێشکەوتووی دەگەیاند بەیەکتری، لەلایەکی ترەوە بایەخێکی گرنگی پەیدا کردبوو. ئەوی بەدوای زانست و ئەدەب و فێربوون و پلەوپایەدا بگەڕایە رووی دەکردە ئەو شارە. پیرەمێرد لەبارەی پێگەیشتنی خۆیەوە لە ئەستەموڵ لە زۆر موناسەبەدا بەئاشکرا نووسیویە، لەوەسیەتنامەکەیدا دەفەرموێت «بەنیوە خوێندەواری لە سلێمانی دەرچووم و خوێندنێکی بەرزم

(١١) مێژووی ئەدەبی کوردی - عەلائەددین سجادی ل ٤٦٢.

هێنایەوە». [١٢] یاخود نووسیویە «ئێمە زۆرترمان لەوێوە لە ئەستەموڵەوە پێگەیشتووین» [١٣]، هەروەها باسی ئەوە دەکات کە هەرچی زانیاری و ڕۆشنبیری خۆی هەیە هەمووی لەوێ لە ئەستەموڵ کۆکردۆتەوە و لە ناو مێشکیا هەڵی گرتوون و لەبری کتێب و کتێبخانە هەموو جار بۆ مێشک و بیرەوەری و توانای شت لەبەرکردنی خۆی دەگەڕێتەوە و بەهرەی لێ وەردەگرێت و دایدەڕێژێتەوە، پیرەمێرد ئەو توانای لە مێشکا هەڵگرتن و لەبەرکردن و بیرتیژیەی خۆی بەتورەکەیەکی ئارد شوبهاندوە کە هەرچەند هەڵیتەکێنێ تۆزی لێ بەرز دەبێتەوە، دەنووسێت «هەرچی تۆ بلێی کتێب و مەئخەزە لەلام نییە و بەدەستمەوە نییە، سەرمایەیەکەم (حافظ)ەیە، هەرچی ئەنووسم لە توورەکە کۆنە جاوەکەی ناو کەللەمی دەردێنم کە هەشتا ساڵە من هەڵیئەتەکێنم، وەک جەواڵی ئارد تۆزی لێ ئەبێتەوە» [١٤].

بەڕاستی ئەو مەبەستەی پیرەمێرد بۆی ڕۆیشتبوو وە ماوەی بیست و پێنج ساڵ وڵاتی خۆی و خێزانەکەی لەپێناودا بەجێ هێشتبوو بەوپەڕی سەرکەوتنەوە گەیاندیە ئاکام و جێگای شیاوی خۆی. کاتێک تەماشای چالاکییە ئەدەبی و سیاسییەکانی دەکەین کە لە تورکیا نواندوویەتی لە پێناوی نەتەوە و نیشتمانەکەیدا بۆمان دەردەکەوێت کە لە ڕۆژی یەکەمی گەیشتنییەوە بەتورکیا بەرنامەی خۆی بۆ داناوە و ساتێک نەوەستاوە و ڕۆژێکی لەو ماوە زۆرە بەفیڕۆ نەداوە. ئنجا پێش ئەوەی بەوردی ئەم لایەنەی ژیان و تێکۆشانی ئەدەبی ئەم بلیمەتە ڕوون بکەمەوە، پێویستە باسێکی بڕوا پێکراوی خاوەن بەڵگەی ئەو سەفەرە بنووسین، کە پیرەمێرد یەکێک بووە لەناو ئەو کاروانەدا کە لە سلێمانییەوە چۆتە ئەستەموڵ.

هەموو ئەو سەرچاوانەی کە باسی ئەم سەفەرەی پیرەمێرد دەکەن کە ساڵی **١٨٩٨** بووە ئەوەندە دەڵێن کە پیرەمێرد لەگەڵ شێخ سەعیدا دەچێت بۆ تورکیا. بەڵام ئێمە گەلێ زانیاری نوێمان لەم بارەیەوە دەستکەوت، بەتایبەتی لەم دواییەدا کە یاداشتەکانی شاعیری نەمر زێوەر [١٥] بڵاوبووەوە و لە چەند لاپەڕەیەکدا باسی ئەو کاروانە دەکات کە خۆی یەکێک بووە لەوان.

لە کاتی خۆیدا دوو کاروانی شێخانی سلێمانی حەفیدزادەکان لەسەر داوای سوڵتان عەبدولحەمید و فەرمانی حاجی کاک ئەحمەدی شێخ بەرەو ئەستەموڵ ڕێکەوتووە. سەبارەت بەمە با بزانین زێوەر لە یاداشتەکانیدا چی نووسیوە: «سوڵتان عەبدولحەمید سەبەب بەئیخلاسێ کە دەرحەق سادات و مەشایخی هەبوو، دەرحەق بەحەزرەتی کاک ئەحمەد زیاتر بوو، کاک

(١٢) بڕوانە لاپەڕە (٤٧)ی ئەم دیوانە.
(١٣) بڕوانە ژین – ژمارە ٨٩٣ ساڵی ١٩٤٧.
(١٤) ژین– ژمارە ٨٩٦ ساڵی ١٩٤٧
(١٥) گەنجینەی مەردان – زێوەر. ساڵی ١٩٨٥.





ئەحمەدیش لەبەر ئیختیاری توانای سواری و سەفەری نەمابوو، ئەو ئارەزووەی هەر لەدڵا بوو، سوڵتان ئیرادەی کرد کە حەفید و وەلی عەهدی کاک ئەحمەد، شێخ سەعید بچێتە ئەستەنبووڵ بۆ حوزوری شاهانە، ئەویش لەسەر ئەو ئەمرە تەشریفی چوو وە نائیلی ئینعام و ئیلتیفاتی پادشاهی بوو.

لەپاش چەند ساڵێکی تر دووبارە ئەمری کرد کە شێخ سەعید بچێتەوە بۆ خدمەت زاتی شاهانە. مەرحووم شێخ تەدارەکی سەفەری ڕێکخست لە خزمان و ئەشراف و عولەما و خدمەتکار نزیکی چل کەسی ئینتخاب کرد کە لەو سەفەرە لە خدمەتیا بن. لە ئەقاریب شێخ مستەفا و شێخ عومەری برای و شێخ مەحموودی کوڕی. باقی لە ئەشراف و موعتەبەران و عولەما بوون. بەواسیتەی جەنابی شێخ مەحموود کە مەرحەمەت و ئیلتیفاتی لەگەڵ من هەبوو منیشی داخڵی هەیئەتی سەفەرییە بووم. ئیرادەی شاهانە سادر بوو کە هەموو مەساریفی ڕێگای شێخ و تەبەعەی هەتا ئەستەنبوڵ لەسەر حوکوومەت بێ» [١٦]، هەروەها زێوەر لە باسی پیرەمێرددا هەر لەو یاداشتانەدا باسی سەفەری پیرەمێرد دەکات بۆ حەج لەگەڵ شێخ مستەفای نەقیب و شێخ سەعیددا، دەنووسێت «لەخدمەتیا (لەخدمەت شێخ مستەفا)دا چوو بۆ ئەستەنبووڵ و لە ئەستەنبووڵەوە ئیشتراکی سەفەری حیجازیشی کرد، نائیلی تەوافی بیت الله بوو. کە نەقیب لە مەککەی موکەرەمەوە وەفاتی کرد لە خدمەت شێخ سەعیددا دێتەوە ئەستەنبووڵ» [١٧] هەروەها لەبارەی پیرەمێردەوە دەنووسێت: «ڕەفیقی سەفەر و حەزەرم، دۆستی دانا و موعتەبەرم، پیرەمێرد» [١٨].

پیرەمێرد لە ساڵەکانی یەکەمی گەیشتنیدا بەتورکیا و هەر لەو کاتەوە کە ئەندامی مەجلیسی عالی ئەستەموڵ و قوتابی کۆلیجی حقوق بووە دەستی کردوە بەنووسین و وەرگێڕانی شیعر و وتار و زیندووکردنەوەی ئەدەبیاتی کوردی و ناساندنی بەو جیهانە نوێیە. لێرەدا ناوی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانە دەنووسین کە پیرەمێرد یاخاوەن و سەرنووسەری بووە یاخود دەستەی نووسەرانی بووە یا نووسەرێکی چالاک بووە و بەبەشداری قەڵەمەکەی لاپەڕەکانیانی ڕازاندۆتەوە.

١- گۆڤاری (ڕەسملی کتاب)، خاوەنی ئیمتیاز حاجی تۆفیق بەگ ئەستەمووڵ.

ئێمە لەبارەی ئەم گۆڤارە: ساڵی دەرچوون و داخستنی، ژمارەکانی، بەچەند زمان دەرچووە، باباتەکانی چی بوون و نووسەرەکان کێ بوون، هیچ زانیاریەکمان دەست نەکەوت.

٢- ڕۆژنامەی کورد یاخود (کورد تەعاون و ترقی غزەتەسی).

ڕۆژنامەیەک بووە، بەکوردی و تورکی لە ئەستەمووڵ یەکەم ژمارەی لە ٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٠٨دا دەرچووە. هەتا حوزەیرانی ساڵی ١٩٠٩ بەردەوام بووە. خاوەنی ئیمتیازی حاجی

(١٦، ١٧، ١٨) گەنجینەی مەردان–زێوەر لاپەڕەکانی ٥٦، ٥٧، ١٤٧، ١٤٨.

تۆفیق بەگ بووە و سەرنووسەری (ئەحمەد جەمیل پاشا) بووە. دەنگی کۆمەڵەی کورد – کورد تعاون و ترقی جمعیتی– بووە کە شێخ عەبدولقادری شەمزینی سەرۆکی بووە.

٣– لەگەڵ (فائق صبری بەگ) ڕۆژنامەی (مصور محیط)یان دەرکردووە.

٤– لە زۆربەی ژمارەکانی گۆڤاری (ژین)ی ئەستەمووڵدا شیعر و نووسین و وەرگێڕانی هەیە. ئەم گۆڤارە لە ساڵی ١٩١٨–١٩١٩ لە ئەستەمووڵ بەکوردی و بەتورکی دەرچووە ئێمە هەتا ئێستا پانزە ژمارەمان لێ بینیوە کە بەڕێز، ئەدیبی دڵسۆزی کوردستانی تورکیا (محەمەد ئەمین بۆز ئەرسەلان) لە سوید چاپی کردۆتەوە و تەواوی ژمارەکانی وەرگێڕاوەتە سەر پیتی لاتینی.

٥– لە ڕۆژنامەی (شەمس)دا زۆرجار دەینووسی، لە تورکیاوە شیعر و نووسینی بۆ ئەنارد بۆ تاران. خاوەنی ئەم ڕۆژنامەیە (سەید حسێنی ئێرانی) بوو. پیرەمێرد لەم بارەیەوە نووسیویە «گەلێ خزمەتی غەزەتەی شەمس–م ئەکرد کە سەید حسێنی ئێرانی خاوەندی بوو»[19].

٦– لە گۆڤاری (فەرهەنگ) و ڕۆژنامەی (شەفەقی سورخ)دا نووسین و شیعری هەبوە دەنووسێت «ئەو سەردەمە کە ڕۆژنامەی (شەفەقی سورخ) و مجلەی (فرهنگ) لەتاران دەردەچوو هەمیشە من لە ئەستەمووڵەوە مەقالە و شیعرم بۆ ئەناردن»[20]

پیرەمێرد بەرهەمەکانی بەهۆی (ئاغا تاهیری هەمەدانی)یەوە دەنارد بۆ تاران.

٧– زۆر جار سەروتاری بۆ ڕۆژنامەی (إقدام) و (حریت) ئەنووسی.

٨– کاتێ لە ئەستەمووڵ لە ساڵەکانی ١٩٠٤–١٩١٢دا گۆڤاری (اجتهاد)[21] لەلایەن عەبدوڵڵا جەودەتەوە دەردەچوو، بەرهەمی خۆی و نەژادی کوڕی بڵاو دەکردەوە، پیرەمێرد لەم بارەیەوە دەڵێت: «عەبدوڵڵا جەودەت لە پاش مەشروتیەت کە لە ئەوروپاوە هاتەوە، لە ئەستەمووڵ بوو، زۆرتر لە هەموو کەس من لە خزمەتیا بووم خۆم و نەژادی کوڕم (بەنظم و نثر) لە مجەلەکەیدا خزمەتمان هەیە».

٩– لە ڕۆژنامەی (ترجمانی حقیقت)ی معلم ناجیدا کە لە تورکیا دەرچووە شیعری هەیە.

١٠– بەهۆی (داود حەیدەری کوڕی ئیبراهیم حەیدەری)یەوە کە لە دەرچووانی خوێندنی بەرزی فەرەنسە بوو، شیعری نالی و نووسینی کوردیان بەفەرەنسی ناردوە بۆ ڕۆژنامەی (تان) کە لە پاریس دەرچووە.

ئێستا لە هەموو ئەو شیعر و نووسین و وەرگێڕانە جۆر بەجۆرانەی پیرەمێرد لەو گۆڤار و ڕۆژنامانەدا جگە لەبەرهەمەکانی پانزە ژمارەی گۆڤاری ژین نەبێت ئیتر هیچمان بەدەستەوە نییە

(١٩–٢٠) ژین ژمارە ٨٥٥ ساڵی ١٩٤٧.

(٢١) لەبارەی ژیان و بەرهەمی عەبدوڵڵا جەودەتەوە تەماشای گۆڤاری کاروان بکە ژمارە ٣٧ ساڵی ١٩٨٥ لاپەڕەکانی ٤ هەتا ١٢.



و بەداخەوە دۆزینەوە و وەرگێڕانی تورکی و فارسییەکانیشی ڕۆژ بەڕۆژ زەحمەت تر و دوورتر دەکەونەوە. من لەو باوەڕەدام کە بەرهەمی شاعیر و ئەدیب و ڕۆژنامەنووسێکی وەها لە ماوەی بیست و پێنج ساڵدا، لەناو جیهانێکی شارستانی ئەستەمووڵدا بۆ خۆی کەرەسەی کتێبێکی سەربەخۆ یاخود چەند دیوانی شیعرە. واتا ئێمە لەو هەموو گەوهەرە بەنرخانە و لە چەندین لاپەڕەی مێژووی ژیان و بەرهەمی یەکێک لە شاعیر و ئەدیبە گەورەکانمان بێ بەشین و هیچی لێ نازانین. ڕۆژێک ئەو بەرهەمانە بدۆزرێنەوە و ئەوانەی کوردی نین بکرێنە کوردی ئەوا لەلایەنێکی فراوانی شارراوەی ژیان و بەرهەمی پیرەمێرد ئاگادار دەبین و ڕووناکی دەکەوێتە سەر لایەنێکی تاریکی مێژووی ئەدەبیاتی نەتەوەکەمان.

وەک وتمان گۆڤاری ژین ١٩١٨–١٩١٩ بیست و پێنج ژمارەی لە ئەستەمووڵ لێ دەرچووە و ئێمە (پانزە) ژمارەیمان بەهۆی کەلەپورناس و دڵسۆزی ڕۆشنبیری کوردی مامۆستا (عەبدولڕەقیب یوسف)ەوە دەستکەوت.

پیرەمێرد لە زۆربەی ژمارەکانیدا بەم ناوانەوە بەرهەمی هەیە:

– سلیمانیەلی توفیق، س.ت، سلیمانیەلی مەحموود نەژاد، سلیمانیەلی م. نەژاد تۆفیق، م. م، سلیمانیەلی وداد، اسماعیل وداد. ئەمەش نووسینەکانیەتی:

١– کردلر ویقودە دکل– ژین ژمارە(١)، ٧ی تشرینی دووەمی ١٩١٨–١٣٣٤ی ڕۆمی ل ٥ ئەستەمووڵ.

٢– ادبیات کردیەدن بعض نمونەلر – ژین ژمارە (٢)، ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩١٨–١٣٣٤ی ڕۆمی ل ٩.

٣– ژین مجموعەسی واسطەسیلە کردی بتلیسی قرداشمە. واتا بەهۆی گۆڤاری ژینەوە بۆ برام کوردی بتلیسی – ژمارە(٤)، ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ی زاینی–١٣٣٤ی ڕۆمی ل ١.

٤– شیعری (کاروانی غەم) ژمارە (٥)، ١٢ی کانوونی دووەمی ١٣٣٤ی ڕۆمی، ١٩١٨ی زاینی، ل ٧.

٥– چامەکەی نالی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم) بەناونیشانی (مکتوب منظوم) هەر دێڕێک لەو شیعرە بەناوبانگەی بەرانبەری کردوە بەتورکی. ژین ژمارە (٦)، ٢٥ی کانوونی یەکەمی ١٣٣٤، ١٩١٨ ل ١٢.

٦– بەشی دووەمی ئەو کاغەزەی کە لە ژمارە(٤)دا بەشی یەکەمی بڵاوبووبوەوە. وە بۆ کوردی بتلیسی ناردبوو. بەناونیشانی «هەندێ جار بەهۆی پارچە بەردێکەوە مێژووی میللەتێک لە ئەفسانەکان زیاتر دیاری ئەکرێت». ژین ژمارە(٧)، ٢ی کانوونی دووەمی ١٣٣٤ی ڕۆمی ١٩١٨ی زاییینی.

٧- ادبيات كرديەدن بعض نمونەلر - هەمان ژمارەی پێشوو.

٨- كورد و تورك برلكی، ژمارە (٨)، ٩ی كانوونی دووەمی ١٣٣٥، ١٩١٨ی زایینی ل ١.

٩- لە هەمان ژمارەدا شیعرێكی پیرەمێردی تیایە بەناوی (بر كورد جوجفنك احتساساتی) ل١١.

١٠- كوردجە لسانمز - ژین ژمارە (٩)، ١٦ی كانوونی دووەمی ساڵی ١٣٣٥ی ڕۆمی ١٩١٩ی زایینی.

١١- نووسینی لە كوردە بەناوبانگەكانمان (حضرت مولانا خالد - قدس سره الطيبة) گۆڤاری (ژین)ی ئەستەموول، ژمارە (١٠)، ٢ی شوباتی ١٣٣٥ی ڕۆمی ١٩١٩ی زایینی.

١٢- ژین غزتەسنە - گۆڤاری (ژین) ئەستەموول ژمارە (١١)، ١٥ی شوباتی ١٣٣٥-١٩١٩ی زایینی.

١٣- كردلردە وهبی زكا- (ژین) ژمارە (١٢)، ٢٥ی شوباتی ١٣٣٥ی ڕۆمی ١٩١٩ی زایینی. ل٤. ئەم نووسینەی پیرەمێرد بریتییە لە پێشەكییەك و شیعرێك. لەو پێشەكییەدا باسی شاعیرە نەخوێندەوارەكانی كورد دەكات كە شیعرەكانیان تەنها لە بەهرەوەیە وە شیعرەكەی (ئەحمەد بەگی كۆماسی) دەنووسێتەوە و بەرانبەری دەیكات بەتوركی. بەڵام وەك لەم كتێبەدا ڕوونمان كردووە كە پیرەمێرد ئەو شیعرەی بەهی (حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە) زانیوە و لەگەڵ شیعری (گڵكۆی تازەی یار)دا لێی گۆڕراوە.

١٤- بیر مكتوب، گۆڤاری (ژین)ی ئەستەمول - ژمارە (١٥)، ٣٠ی مارتی ١٣٣٥ی ڕۆمی ١٩١٩ی زایینی. ل ١.

وەك وتمان ئێمە هەتا ژمارە (١٥)ی ئەم گۆڤارەمان دەستكەوتووە وە (١٠) ژمارەی ماوە، دیارە لەو دە ژمارەیەدا گەلێ نووسین و شیعری پیرەمێردی تیایە. هەروەها شیعری بەناوبانگی (سروودی نەورۆز) لەیەكێ لەو دە ژمارەیەدایە. بەڵام نازانین كام سروودی نەورۆزە.كە ئەڵێن مارشی نەورۆز، ڕەنگە سروودی (ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە) بێت!.

حاجی تۆفیق بەگ. هەتا ساڵی ١٩٢٣ لە توركیا دەمێنێتەوە و دوا پلەی كاری میری (متصرفی ئەماسیە) بووە. بەهۆی شۆڕشی كورد لە توركیا و تێكچوونی باری ژیانی كوردەكانەوە، وە بەهۆی ئەوەی كە پیرەمێرد خۆشی ئەندامی كۆمەڵەی كورد بوو، وە یەكێك بوو لە كوردە ڕۆشنبیر و ئەدیب و سیاسییەكانی ئەو كاتە، نەیتوانی بمێنێتەوە و ژنەكەی و هەردوو كوڕەكەی (نەژاد و وداد) لە توركیا بەجێ دەهێڵێ و بەڕێگەی (حەلەب)دا ساڵی ١٩٢٤ دێتەوە بۆ (بەغدا) و لەوێوە بۆ سلێمانی.

لەو كاتەدا ڕۆژنامەی (ژیانەوە) لە سلێمانی دەردەچوو، وە هەواڵی گەیشتنەوەی پیرەمێرد بڵاو



دەكاتەوە «جەنابی تۆفیق بەگی مەحموود ئاغا كە بیست و سێ ساڵە لەوەتەن دووركەوتۆتەوە شەوی ٣٠ی كانوونی دووەمی ١٩٢٥ تەشریفی هاتەوە مەملەكەتەكەمان بەقدوومی ئەم زاتە زۆر مەسروور و خۆشحاڵە، بەناوی هەموو خۆڵاتییەكەوە بەخێرهاتنی دەكەین»[٢٢].

حاجی تۆفیق لە گەیشتنیەوە بۆ سلێمانی توخنی هیچ كار و فەرمانێكی دەوڵەت نەكەوت و هەموو ژیانی خۆی تەرخان كرد بۆ خزمەتی ئەدەبی كوردی. ساڵی ١٩٢٦ كە ڕۆژنامەی (ژیان) لەلایەن شارەوانی سلێمانییەوە دەرچوو، پیرەمێرد سەرپەرشتی كرد و بەرهەمی خۆی تیادا بڵاوكردەوە.

بەرهەمەكانی بەناوی (حاجی تۆفیق بەگ)ەوە بڵاو دەبووەوە. هەتا بۆ یەكەمجار لەگەڵ بڵاوكردنەوەی شیعری (بەیانی بوو لە خەوهەستام كە ڕوانیم بەفرە باریوە)دا لە ژمارە(٣١٢)ی ڕۆژنامەی (ژیان)ی ساڵی ١٩٣٢ ناوی خۆی لە (حاجی تۆفیق بەگ)ەوە كرد بەپیرەمێرد. هەتا لە ساڵی ١٩٢٣دا كە (حوسێن نازم) كۆچی دوایی دەكات، پیرەمێرد دەبێت بەخاوەن و بەرپرسیاری. خۆی لەم بارەیەوە دەنووسێت «زۆر دڵشكستم بەكۆچ كردنی هاودەردێكی وەك حسێن ناظم بەگ، گەرچە منیش ڕێبوارم و نزیك بەبوارم بەڵام هێشتا هیوادارم (ژیان)مان نزیك بوو بەنەمان چونكە ئیتر (بلدیە) هیچی پێ خەرج نەدەكرا، ناچار لە گۆشەنشینی هاتمە دەرێ و دەستم دایە داوێنی (ژیان). چاك چاكی لە دەست نادەم، ئێستا بەسەرپەرشتی (ژیان) و چاپخانەكەم وەك خۆم بێ بەها و بەهیوای بێتە بەها، گرتوتە ئەستۆ، ئەزانم باوەڕم پێ دەكەن كە تێدەكۆشم پەنا بەیەزدانی پاك، دەیبەینە سەر. ئەمەندە هەیە هەموو كاڵایە بەخریدار دێتە برەو، من بەخریدارەكان دەنازم و پشتیوانیش لە خوا دەخوازم»[٢٣] ئنجا ئەگەر بەوردی تەماشای بابەتەكانی ڕۆژنامەی ژیان بكەین، بەتایبەتی لەو ژمارەیەوە و هەتا دوا ژمارەی (ژیان) كە ژمارە (٥٥٣) بوو وە لە (١٠)ی مارتی ١٩٣٨دا دەرچوو زۆربەیان بەرهەمی قەڵەمە جوانەكەی پیرەمێرد خۆیەتی، بەتایبەتی سەروتارەكان و پەندی پێشینیانەكان و شیعرە وەرگێڕاوەكانی مەولەوی و...هتد. بەڕاستی مرۆڤێك لەو تەمەنەدا و لەناو كۆمەڵێكی دواكەوتوودا و سەرەڕای كەم دەرامەتی و بڕوبیانووی دەوڵەت بتوانێت بەتەنیا حەوت بەشی ڕۆژنامەیەك هەموو هەفتەیەك بێ دواكەوتن ئامادە بكات و بڵاوی بكاتەوە شایانی هەموو ڕێز و نەمری و بەرزییەكە و هەتا هەتایە لە ویژدانی نەتەوەكەیدا سەدایەكی بڵند و ئاوازێكی نەمر و بەسەرهاتێكی نەتەوەیی پیرۆزە.

لەساڵی ١٩٣٨دا، مەجید یەعقوبی، كە توركێكی ڕەگەزپەرست و دژ بەكورد بوو بیانووی

(٢٢) ژیانەوە- ژمارە(١٤)، ٢ی شوباتی ١٩٢٥.

(٢٣) ژیان - ژمارە (٣٢٢) ساڵی ١٩٣٢.

بەپیرەمێرد گرت و ڕۆژنامەکەی داخست، بەڵام پیرەمێرد کۆڵی نەدا و چاپخانەیەکی بەدەست هێنا و ئیمتیازی بۆ وەرگرت و لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ١٩٣٩دا، لەسەر هەمان ژمارە و زنجیرەی (ژیان) ژمارە (٥٥٤)ی ڕۆژنامەی (ژین)ی بڵاوکردەوە و هەتا ژمارە ١٠١٥ی لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٥٠دا بڵاوکردەوە، واتا هەتا چوار ڕۆژ پێش کۆچ کردنی، دوا ژمارەی ڕۆژنامەکەی پێشکەش بەجیهانی ڕۆژنامەگەری نەوەکەی کرد. بۆ شارەزابوونی تەواو لە کاروانی پڕ شانازی ڕۆژنامەی (ژیان) و (ژین) و هەوڵی پیرۆزی بێ کۆڵدانی پیرەمێرد، ئەم نووسینەی شێخ سەلامی شاعیر بڵاودەکەینەوە کە لە ئاهەنگی بیست ساڵەی (ژین)دا لە ساڵی ١٩٤٦دا، خوێندوویەتیەوە و پیرەمێرد خۆی ئەو یادەی ساز کردووە و لە ئاهەنگەکەدا بووە و دواییش خۆی ئەو نووسینەی شێخ سەلامی لە ژمارە (٨١٩)ی، (ژین)ی ٧ ی شوباتی ساڵی ١٩٤٦دا بڵاو کردۆتەوە و تەواوی چیرۆکی ژیانی ئەو ڕۆژنامە نەمرەیە:

«ژیان لە سێلمانی لەسەر حساب و چاپخانەی (بەلەدیە) دەرئەکرا. لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ١٩٢٦ی میلادیدا ژمارەی یەکەمی دەرچوو. ئەم ڕۆژنامەیە ڕۆژنامەیەکی کوردی و هەفتەیی بوو. سەربەست بوو بەنووسینی هەموو شتێک پیرەمێردیش جاروبار بەنووسین بەشی خۆی تێ ئەخست. لە ٦ی مایسی ١٩٣٢دا مودیری چاپخانەی ژیان حوسێن نازم ئەفەندی مرد و پیرەمێرد کرا بەمودیری چاپخانە و معاشێک کە بۆ مودیر دانرابوو پیرەمێرد قبووڵی نەکرد. لە ژمارە (٣٢١)ەوە دەستی دایە تا ژمارە (٤٠٦) ئنجا لە ١٤ی ئابی ١٩٣٤دا چاپخانەکەی لە (بەلەدیە) گرت بەئیجارە و ئیمتیازی ئەم ڕۆژنامەیەی بۆ خۆی دەرکرد و بەهەموو هێزی دەستی دایە. لە ٣ی ئابی ١٩٣٥دا لاپەڕەکانی لە چوارەوە کرد بەشەش و دەستی کرد بەبڵاو کردنەوەی نووسینی لاتینی. لە ٣ی ئابی١٩٣٧دا ژمارە گەیشتە ٥٣٨، ئیجازەی چاپخانەکە دوایی هات و بۆیان تازە نەکردەوە. خۆ هەوای خزمەتی ئەدەبیش لە سەری پیرەمێرددا کەڵکەڵەی ئەکرد. ناچار دەستی دایە پێشەوە، چاپخانەیەکی گەورەتر بەپیتی تازەوە لە ٢٠ی ئەیلولی ١٩٣٧دا کڕی و ژمارە ٥٣٩ی دەرکرد و بەقەدەر ماکنەکەش ڕۆژنامەکەی زل کرد.

لە ١٠ی مارتی ١٩٣٨دا لە پاش دەرکردنی ژمارە ٥٥٣، بەهۆی ئەوەوە کە جارجار بەلاتینی ئەینووسی و بەکردنەوەی ئاگری نەورۆز، خێرخوا (دوشمن) لێی نەگەڕان و وتیان پیرەمێرد ئەیەوێ کورد بکا بەگاور و مەجووسی و ڕۆژنامەکەی داخرا.

بەوەش کۆڵی نەدا و لە پاش چەند مانگێک ئیمتیازی ڕۆژنامەی (ژین)ی وەرگرت. لە ٢٦ی کانوونی دووهەمی ١٩٣٩ یەکەم ژمارەی دەرکرد. بەڵام لەبەر ئەوە ژیان و ژین خوشک و برا بوون نەیویست زنجیرەی ژمارەی ژین جیا بکاتەوە و هەر لەسەر زنجیرەی ژیان ژمارە (٥٥٤)ی (ژین)ی دەرکرد. دوشمنی زاڵمی خوێنمژی زکماک. مەجید یەعقوبی، نەک تەنها ڕۆژنامەی





(ژیان)ی داخست، لام وایە پیرەمێردیشی بەڕەنگێ تەنگەتاوکرد شاری سلێمانی کە مەڵبەندی نیشتمانی بوو وە ئەستەمووڵی بۆ بەجێ هێشتبوو، بەجێ هێشت و ڕووی کردە بەغدا. ئایا لەبەر خاتری پیرەمێرد و یاخود لەبەر خوێشایەتی عائلە و یا بەشەرپەروەری، (تەها پاشای هاشمی) کە وەزیر بوو، ئەمری دەرچوونی ژیان بە(ژین)ی بۆ پیرەمێرد دەرکرد. پیرەمێرد دیسان بەدەستی وەیسکە و سوزنی پۆڵاین هاتەوە سەرباری بەڕەبۆر و بەبێ ترس و پرس لە جاران چاکتر دەستی پێکرد.

مودەتێکی کەم حوسێن نازم ئەفەندی مودیری ئەم ڕۆژنامەیە بوو لە دوای ئەو دیسان عەلی ئەفەندی عرفان و لە پاشا پیرەمێرد بەبێ معاش لەساڵی ١٩٣٠-١٩٣١ لەژێر ڕیاسەتی (میستر یانغ) کە وەکیلی مندوب سامی عیراق بوو لەگەڵ جەعفەر پاشای عەسکەری رئیس الوزرا و جمیل مدفعی، وەزیری داخلیە و جەمال بەگی بابان وەزیری عدلیە بۆ ئیستفتای ژینی کورد هاتنە سلێمانی. لام وایە زۆرتان لەبیرتانە کە ئەم ڕۆژنامە بێ دەنگە بەڕەنگێ ڕاپەڕی ئەتوانم بڵێم هیچ ڕۆژنامەیەک لە هیچ کات و هەلێکا بەو ڕەنگە پڕ بەدەم هاواری جانسۆزی بەرز نەکردۆتەوە. ئەو کاتە ٥، ٦ ژمارەی دەرچوو، باوەڕتان ببێ هەریەکێ لەو ژمارە جوانانە پێویستە میللەتی کورد لە گەنجینەی ئامالی میللیدا لە ژوور هەموو مجەوهەراتی سیاسی میللیەوە هەڵیواسێ. (ژیان)ی شیرین وەکو وترا هەتا ساڵی ١٩٣٧ لەلایەن پیرەمێردەوە لەژێر گەلێ ناڕەحەتیدا ژیانرا. هەر لەم ساڵەدا مەجید یەعقوبی متصرفی سلێمانی ڕۆژنامەکە و جەمعیەتی زانستی کە ئەویش ساڵی ١٩٢٥ لە سلێمانی دروست کرابوو هەردووکی داخست.

(ژیان) و (ژین) ئەم دوو ڕۆژنامەیە زۆر بەزەحمەت و ناڕەحەتی ژیاون کە هەر ڕۆژێ بەناوێ و هەر ساتێ بەداوێ گیرۆدە و خنکاون. بەڵێ، ژیانی ئەم دوو ڕۆژنامەیە ژیانی تاڵی قەومی لێقەوماوی کورد وەکو سینەما پیشان ئەدا.

هەرچەن دڵمان بەوە خۆش ئەکرد، کە تۆزێ تەمی نەزانی لەسەرمان ڕەویوەتەوە و هیواداربووین باری سەرشانی ژین بەهۆی زانین و تێگەیشتنمانەوە سووک بووە، بەڵام نەمانزانی کە هێشتا ڕۆژی زانین و تێگەیشتن و پێگەیشتنی کورد زۆری ماوە هەڵبێت و باری قورس و گرانی ژین هەر لەگرانیە و لەم پایزەدا ئەوەندەی نەمابوو (ژین) بەرگەلاڕێزان بکەوێ. نزیکەی مانگێ بوو کاغەزی ساڵانەی بڕابووەوە. پیرەمێرد پێی نەکرا پارەی ئەو دوانزە بەند کاغەزەی ساڵانە بنێرێ، کە دوای داواکردن ڕازی بوو بوون بەنرخی حکومەت بیفرۆشن. بەڵام دیسان پیرەمێردی جوان وەکو جاران دانەما و لە چواری کانوونی یەکەم ١٩٤٥دا خانووەکەی کە جێگەی خۆی و چاپخانەکەی (ژین) بوو خستیە بارمتەی ڕەهنی ئەیتام بەشەست دینار. بۆ بەیانی، کتوپڕ دوانزە دیناری بەحەواڵە نارد بۆ مودیری گەلاوێژ.

## بەرهەمەکانی پیرەمێرد

**جگە لە کاری ڕۆژنامەگەری، پیرەمێرد ئەم بەرهەمانەی هەیە:**

١- دیوانی مەولەوی (ئەسڵ و ڕۆح)، ساڵی ١٩٣٥، لە چاپخانەکەی خۆی بەدووبەرگ لە چاپی داون. دەقی هەورامی شیعرەکەی ناوناوە (ئەسڵ) و بەرامبەری وەری گێڕاوەتە سەر شێوەی سلێمانی و ناوی ناوە (ڕۆح)، واتا ڕۆحی مەولەوی، پیرەمێرد لەم کارەدا زۆر سەرکەوتوو بووە و وەک خۆی لە پێشەکی ئەو بەرگەدا نووسیویە، ئەم زاتانە لە هەندێ وشە و واتای هەورامیەکەدا بۆ وەرگێڕانی یارمەتیان داوە.

ا- مەلا عەبدوڵڵای مەریوانی

ب- مەلا عەزیزی موفتی سلێمانی

ج- (گۆران)ی شاعیر

٢- مەم و زین: کە چیرۆکێکی تراژیدی دڵدارییە، پیرەمێرد چیرۆکەکەی لە شێوەی شانۆنامەدا ئامادەکردوە و لە هەردوو لایەنی قەوارە و ناوەڕۆکەوە لە مەم و زینی (ئەحمەدی خانی) جیاوازە. ساڵی ١٩٣٥ لە چاپخانەی خۆی لە چاپی داوە. لەبەرگەکەیدا نووسیویە «دڵدارییەکی پاک و خاوێنی گیانی بەگیانی، سەودایەکی پڕ لە عەشقی پیرۆزی یەزدانی، لە کوردستانا ڕووی داوە».

لەکاتی خۆیدا ئەم چیرۆکەی پیرەمێرد کراوە بەشانۆگەری لە سلێمانیدا.

٣- چیرۆکی دوانزە سوارەی مەریوان - ساڵی ١٩٣٥ نووسیویە.

٤- چیرۆکی مەحموود ئاغای شیوەکەڵ - ساڵی ١٩٤٢ نووسیویە و لەکاتی خۆیدا لە سلێمانی خراوەتە سەر شانۆ.

٥- گاڵتە و گەپ - ساڵی ١٩٤٧، بریتییە لە هەندێک ڕووداوی خۆشی ناو کۆمەڵی کوردەواری، هەم بۆ پێکەنین و هەم بۆ پەندە.

٦- ڕۆمانی کەمانچەژەن، ساڵی ١٩٤٢ لە تورکییەوە کردوویە بەکوردی، ئەم چیرۆکە لە بنەڕەتدا بەرهەمی نووسەری دانیمارکی (ئەندرسن)ە، بەڵام لەکاتی خۆیدا و هەتا ئەم ساڵانەی دوایش نەزانرابوو کە نووسەرەکەی کێیە، هەتا لە ساڵی ١٩٧٩دا کاکەی فەللاح لە چاپی دایەوە و بەهۆی دکتۆر (عەلی کەریم عەلی)یەوە زانرابوو چیرۆکی (ئەندرسن)ە. هەروەها پیرەمێرد لەکاتی خۆیدا، لە پێشەکی وەرگێڕانەکەیدا ناوی (تۆفیق بەگی میرئالا) یاخود تۆفیق بەگی کەرکووکی نووسیوە، کە چیرۆکەکەی کردبوو بەتورکی.

٧- دیوانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی - کە بەزنجیرە لە ڕۆژنامەکەیدا بڵاوی دەکردەوە و ماوەی نەبوو لە کتێبێکدا چاپی بکات.



٨- شیعرەکانی وەلی دێوانە و بێسارانی، ئەوی کە دەستی کەوتبێ، لە هەورامییەوە کردوە بەشێوەی سلێمانی. جگە لە شیعری گەلێ لە شاعیرانی هەورامان و زەنگەنە. وەک (شەفیع و مەلا ولدخان و مەجذوب و فخر العلما و مەلای جەباری و عەبدوڵڵا بەگی زەنگەنە و... هتد).

٩- کۆمەڵێک پەخشانی هونەری جوانی نووسیوە و لەلایەن ئێمەوە کۆکراوەتەوە و لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە.

١٠- زنجیرە وتارێک دەربارەی مێژووی کورد، مێژووی میرنشینی بابان و خێڵ و تیرەکانی جاف و گەلێ ڕووداوی مێژووی گرنگ کە بابەتی کتێبێکی گەورەیە.

١١- هەزاران بەیت شیعری هەیە کە پەندی پێشینیانە و خۆی بەشێوەیەکی ئەدیبانە و شاعیرانە ڕێکی خستوونەتەوە. بەزنجیرە لە ڕۆژنامەکەیدا بڵاوی کردوونەوە و دواییش کاکەی فەللاح هەمووی کۆکردۆتەوە و لە چاپی داوە.

١٢- چەندەها بەند و بەیتی فۆلکلۆری و چیرۆکی فۆلکلۆری و چیرۆکی مناڵان و مەتەڵ. کە ئەمیش دەبێتە کتێبێک.

## پیرەمێرد و چیرۆک

پیرەمێرد سەرەڕای ئەو هەموو سەرقاڵی و ڕاپەڕاندنی کاری ڕۆژنامەنووسی و شیعر و وەرگێڕان و نووسینی هەمە چەشن لە بواری کورتە چیرۆکی کوردیدا چەند چیرۆکێکی هونەری و جوانی هەیە، کە بابەتەکانیان کۆمەڵایەتییە و لە کەلەپووری کۆنی کوردەوارییەوە دروستی کردوون. هەموو ئەم چیرۆکانەی لە (گۆڤاری گەلاوێژ)دا بڵاو کردۆتەوە. گەلێ لە نووسەران و ڕەخنەگرانی شارەزای ئەدەبی کورتە چیرۆکی کوردی لە کتێب و لێکۆڵینەوەکانیاندا باسی ئەم کورتە چیرۆکانەی پیرەمێردیان کردووە، وەک: حوسێن عارف، سەباح غالب، ئەکرەم قەرەداغی، عومەر مارف بەرزنجی، ڕەئووف حەسەن و چەند نووسەرێکی تریش، لێرەدا ماوەی ئەوەمان نییە کە بچینە ناو جیهانی چیرۆکەکانەوە و یەکە یەکەشیان بکەینەوە و لە بارەیانەوە بنووسین، ئەمە هەڵدەگرین بۆ لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ و ئێستا تەنها ناوی چیرۆکەکان و شوێن و کاتی بڵاو بوونەوەیان دەنووسین کە بریتییە لە پێنج کورتە چیرۆک.

١- ئەنجامی پیاوێکی بەنگ کێش. گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە(٩، ١٢) ساڵی ١٩٤١.

٢- زۆرەملی مل شکانی لە دوایە. گەلاوێژ ژمارە (٤،٣) ساڵی ١٩٤٢.

٣- دەماری کورد چیت لە بارایە - خانزادەی قەڕاڵیچەی سۆران. گەلاوێژ، ژ (٧، ٨) ئابی ١٩٤٢.

٤- فەلسەفەی کچە کوردێک، ژمارە (٥، ٦) گەلاوێژ ساڵی ١٩٤٢.

٥- غرامیی، کای کۆن، دووجار بڵاوی کردۆتەوە، یەکەم جار لە ڕۆژنامەی (ژیان) ژمارە (٤٨٣) ساڵی ١٩٣٦. دووەم جار لە گۆڤاری گەلاوێژدا بەئیمزای (کوڵ و کۆ).

### پیرەمێرد و زمان:

ئەگەر بەوردی تەماشای شیعر و نووسینەکانی پیرەمێرد بکەین، دەبینین زمان، وەک هەویرێک وابوە لەلای، هەرچییەکی ویستووە توانیویەتی لێی دروست بکات. زۆرجار نووسیویە کە زمانی کوردی هەموو شتی لێ دەردێت و هەموو مانایەکی پێ پێکدێت، ئەگەرچی هەندێ وشە و واتای بێگانە لەبەرهەمەکانیدا دەبینرێت، بەڵام کاتێک بەکاری دەهێنان و لە شوێنی خۆیاندا دای دەنان کەم کەس هەستی دەکرد ئەو وشانە کوردی نین. لەو سەردەمەی پیرەمێرددا وشەی خۆماڵی و باو دوور لە داتاشین و دروست کردنی بەزۆر، بەشێوەیەکی فراوان بەکاردەهێنران. جگە لەوەی کە سەردەمی منداڵی و لاوێتی ئەو پێش ڕۆیشتنی بۆ تورکیا، لەناو جەرگەی کۆمەڵی کوردەواریدا بووە ئەو کاتە، نەکارەبا هەبووە و نەڕادیۆ و تەلەفزیۆن و نەگۆڤار و ڕۆژنامە هەتا خۆی پێوە خەریک بکات، لە شەوانی سارد و دوور و درێژی زستاندا لە گوێ ئاگردان چەندەها چیرۆکی خۆماڵی و ئەفسانە و پەند و مەتەڵی بیستووە، گوێی بەشیعری نالی و مەولەوی و مەحوی و چەندەها شاعیری تر کراوەتەوە. ئەمانە بوونەتە هەوێنی زمانێکی پاراو، کوردی ڕەوان، سادە و بێ گرێ و گۆڵ و لەهەمان کاتدا قووڵ و پڕ مەبەست، خۆی واتەنی (سەهلی مومتەنیع) بابەتی پیرەمێرد و زمان، بۆ خۆی، بابەتێکی سەربەخۆیە و دەتوانرێت بکرێتە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی و بەشێوەیەکی زانستی و پشت بەبەڵگە و بەرنامەیەکی دیاریکراو نیشان بدرێت.

زمانزانی و شارەزایی پیرەمێرد لە زمانی کوردیدا ئەوەندەی لە شیعرەکانیدا دیارە، لەوە زیاتر لە نووسینەکانیدا، بەتایبەتی لە پەخشانە هونەرییەکانیدا، دەردەکەوێت. قەڵەمی پەخشان نووسینی بێ وێنەیە، من لای خۆم ئەو پەخشانە هونەریانەیم کۆکردۆتەوە و ئەگەر ڕۆژگار ماوە بدات و ڕۆشنایی ببینێ ئەو کاتە دەردەکەوێت کە پیرەمێرد لەم مەیدانەدا چەند گەورەیە.

پیرەمێرد وەک خۆی لە یاداشتەکانیدا باسی دەکات و بە بەرهەم و کاری ئەدەبیش ساخ بووەوە، بەچاکی، زمانی تورکی و فارسی و عەرەبی زانیوە، بەتایبەتی کە خوێندنی ئەو کاتەی پیرەمێرد لە کوردستاندا زیاتر فارسی بووە و تێکەڵ بوونی تورکیش لە کوردستاندا بەهۆی دەوڵەتی عوسمانی و کار و فرمانی ڕەسمییەوە و مانەوەی پیرەمێرد بیست و پێنج ساڵ لە تورکیا و، ئەو نووسین و شیعرانەی بەتورکی بڵاوی کردوونەوە. گەواهی ئەوەن کە سامانی ڕۆشنبیری و زمانزانی پیرەمێرد چەند بەرز بووە. ئەمە جگە لە زمانی عەرەبی کە زۆر بەباشی زانیوە و زمانە زکماکەکەی خۆشی کە کوردییە چۆن وەستایەتی تێدا نواندووە.

لەم تاقیکردنەوەیەی پیرەمێردەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە زمان و شارەزایی زمان و زانینی



چەند زمانێک چۆن دەبێتە هۆی پێگەیشتن و پێشکەوتنی هەر ئەدیب و شاعیرێک.

## نیشانە تایبەتییەکانی شیعری پیرەمێرد

### بابەت و ناوەڕۆکی شیعرەکان:

هەر لە سەرەتاوە شیعر لای پیرەمێرد دەنگی دەروون بووە، ویستوویە ئەوی لە ناخیدا پەنهانە ئاشکرای بکات. بەشێوەیەکی گشتی مۆرکی ڕۆمانتیکی بەسەر شیعرەکانیدا زاڵە، لە شێوەی تایبەتیشدا ئازاری مرۆڤ و خاک، گیانی نەتەوەیی و شۆڕشگێڕی لەگەڵێ لە شیعرەکانیدا دیارە.

شیعرەکانی پیرەمێرد لەیەک کاتدا لە چەند قوتابخانە، یاخود ڕێبازێکی شیعری جیاواز پێکهاتووە، کلاسیکی و ڕۆمانتیکی و ڕیالیزم، لەوکاتەدا کە لاسایی شاعیرێکی کلاسیکی کردۆتەوە، لەهەمان کاتدا سروشت و جوانی شیعریان پێ وتووە و ئەمانەی تێکەڵ بەباری کۆمەڵایەتی و گیانی نەتەوەیی کردووە. پیرەمێرد چەند قۆناغێکی ئەدەبی نییە، کە ڕێبازی کلاسیکی واز لێ هێنابێت و چووبێتە قۆناغی ڕۆمانتیکەوە و بەرەو ڕیالیزم چووبێت و ئیتر نەگەڕابێتەوە سەر قۆناغی یەکەم یاخود قۆناغی کلاسیکی. ئەو شاعیرێک بووە و لە هەمان کاتدا ڕۆژنامەنووسێک بووە کە دەبوا هەرچۆنێک بێت ڕۆژنامەکەی لەکاتی خۆیدا دەرچێت، وتار و شیعر و وەرگێڕان و بابەتەکانی تری ڕۆژنامەکە ئامادە بکات، هەموو (تەرکیز) و کاری ئەدەبی و بیرکردنەوەی بۆ شیعر نەبووە. بۆ نموونە لە ساڵی١٩٣٢دا شیعرێکی ڕۆمانتیکی دەنووسێت و لە ١٩٥٠دا وەک لە ژمارەکانی دوایی (ژین)دا دیارە شیعرێکی لاسایی شاعیرە کلاسیکییەکانی نووسیوە. بەپێچەوانەوە، لە ساڵی ١٩٤٨دا سروودێکی بەرزی بڵاو کردۆتەوە و تەواو بۆتە شاعیرێکی ڕیالیزمی و شۆڕشگێڕ، بەڵام لە نیوەی سییەکاندا لاسایی مەولەوی کردۆتەوە و بۆتە دەروێش و دیوانەی خەڵوەتگاهێک و پەنا دەباتە بەر مەزاری پیاوچاکێک و لێی دەپاڕێتەوە کە نەتەوەکەی ڕزگار بکات و بکەونە سەر ڕێی یەکگرتن و پێشکەوتن.

لە ڕووی بابەتی شیعرەکانیشەوە، دەڵێین، لەیەک کاتدا بۆ چەند بابەتێک شیعری وتووە و بڵاوی کردوونەوە وەک: نیشتمانی، ئایینی، دڵداری، شیوەن، مەتەڵ بەشیعر، کۆمەڵایەتی، چیرۆک بەشیعر، شیعری موناسەبات...هتد.

بەڵام سیفاتی گشتی هەموو شیعرەکان و ئوسلوبی داڕشتن و وشە و واتاکان یەکێکە و ئوسلوبی شیعری پیرەمێردی پێ دەناسرێتەوە.

### پیرەمێرد و شێوەی شیعر:

وەک زۆر بەکورتی باسی پیرەمێرد و بابەت و ناوەڕۆکی شیعرەکانیمان کرد، هەروەها بەکورتی بەشێوەی دەستنیشان کردنێکی خێرا - کە ناتوانین بڵێین لێکۆڵینەوەیەکی قووڵە - سیفاتەکانی

ئوسلووب و شێوەی شیعرنووسینی پیرەمێرد دیاری دەکەین:

شێوە لای پیرەمێرد مەرجێکی بنەڕەتی و گەورەی شیعر نەبووە، ئەو ویستوویە بابەتێک، باسێک، بێنێتە ناوەوە، ئنجا ئەو بابەت و باسە هەر جارەی بەشێوەیەک قاڵبی داڕشتنی خۆی دۆزیوەتەوە.

ئێمە دەتوانین بڵێین، زۆربەی شێوەی شیعر داڕشتنی پیرەمێرد، بەتایبەتی لە دوای هاتنەوەی بۆ (سلێمانی) لە تورکیاوە بە گشتی شێوەی داڕشتنی کێشی خۆماڵییە. کە (١٠) دە بڕگەیە و زۆربەی زۆری شیعری فۆلکلۆری کوردی بەو کێشە وتراوە و دەماودەم ماوەتەوە و هەتا لە دواییدا کە نووسین و خوێندنەوە لە کوردستاندا برەوی سەند ئەو فۆلکلۆرە دەماودەمییە نووسرایەوە. هەروەها زۆربەی داڕشتنی شیعری شێوەی گۆران (هەورامی و زەنگەنە) هەر بەکێشی دە بڕگەیی بووە. ئنجا تێکەڵ بوونی گیانی (ڕۆحی)ی پیرەمێرد لەگەڵ مەولەویدا، بەتایبەتی و شاعیرەکانی ئەو شێوەیەدا بەگشتی کارێکی وەهای تێ کرد کە زۆربەی شیعرەکانی بەو ئوسلووبە بێت.

پیرەمێرد دیارە کە هۆشیارییەکی زۆری نواندووە لە گرتنی ئەو ڕێچکەی شێوەی داڕشتنەدا چونکە هەر لە کۆنەوە گوێچکە و زەوقی ئەدەبی و چەشەی گوێگرتنی نەتەوەی کورد لەگەڵ ئەو جۆرە شیعرانەدا ڕاهاتبوو، ئەمیش لەبارێکی سەختی ئەو ڕۆژگارەدا دەیویست هەرچی دەڵێت بەهۆی ڕۆژنامەکەیەوە و بەو کێشە لەبارە ڕاستەوڕاست بگاتە کۆمەڵانی خەڵک و لەگەڵ زەوق و ئارەزوویاندا بگونجێ و تێی بگەن. پیرەمێرد ناوبەناو لە شیعردا لە کێشی فۆلکلۆری کوردی دوور کەوتۆتەوە و لەسەر (بەحر)ەکانی کێشی عەرەبی لاسایی شاعیرە کلاسیە کوردەکانی کردۆتەوە، لەو شیعرانەشدا کە وەری گێڕاون بۆ کوردی دیارە خۆی بەدەقی کێشی شیعرەکانەوە بەستۆتەوە و بەهەمان کێشی خۆی وەری گێڕاون.

## کارە مەزنەکانی پیرەمێرد لە پێشخستنی ئەدەب و فۆلکلۆری کوردیدا

کاتێک لە ساڵی ١٩٢٥دا پیرەمێرد گەیشتەوە سلێمانی، وەهای چاوەڕوان دەکرد، کە ئەو وڵاتەی لە ١٨٩٨دا بەجێی هێشتبوو پاش ئەو هەموو ساڵ و ڕۆژگار و دەورانە، گۆڕرابێت و لە بارودۆخێکی جیاواز و پێشکەوتوودا خۆی بنوێنێت، بەڵام بەداخەوە گۆڕان و بەرەو پێشچوونێکی ئەوتۆی تیادا بەدی نەکرد، لەگەڵ ئەمەشدا کە ئەو لەپلەوپایەی (متصرفی شاری ئەماسیە)ی تورکیاوە هاتبووەوە، لە هەموو ڕوویەکی پلە و بڕوانامە و خوێندن و شاعیری و ڕۆژنامەنووسییەوە کەم وێنە بوو، بەهیچ جۆرێک بەلای تەماع و کورسی وەزارەت و نوێنەرایەتی گەل و پلەی وەزیفی بەرزی میریدا نەچوو، بەرەو خانوە کۆنەکەی مەحموودی هەمزاغای مەسرەفی باووباپیرانی ڕۆیشت و هەر لە ساڵی ١٩٢٦ەوە کە ڕۆژنامەی (ژیان) دامەزرا هەتا بوو بەژین و (١٠١٥) ژمارەی لێ دەرکرد، کۆڵی نەدا و لە خەباتێکی بێ وچاندا بێ بەزین و ورە بەردان



لەناو کۆمەڵێکی دواکەوتووی ئەو سەردەمەدا گەورەترین خزمەتی پێشکەش بەئەدەبیاتی نەتەوەکەی کرد.

ئەو خزمەتی ڕۆژنامەی – وەک خۆی زۆر جار نووسیویە – لە هەموو شت بەپێشتر و پێویستتر زانی، ئەم قەناعەت و بڕوایەی هەروا لە خۆیەوە نەهێنابوو، بەڵکو ئەمە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی سەخت و درێژخایانی بیست و پێنج ساڵ ژیانی بوو لە ئەستەموڵدا، کە ئەستەموڵ لەو سەردەمەدا قیبلەی ڕۆشنبیران و سەرچاوەی زانست و ئەدەب بوو، چونکە لەو شارە گەورەیەدا دوو جیهان بەیەک دەگەیشتن، جیهانی کۆن و دواکەوتووی ڕۆژهەڵات، وە جیهانی نوێ و ڕاپەڕیوی ئەورووپا.

ئەو دەیویست ئەو بەرگی پێشکەوتن و گیانی ڕاپەڕینە شارستانییە بکاتە بەری وڵاتە دواکەوتووەکەی لەبەرئەوە خوێندەواری و فێربوونی بەمەرجی بنەڕەتی ئەو پێشکەوتنە دادەنا، زۆرجار نووسیویە، میللەت تا خوێندەوار نەبێ هەنگاوێ نانێ، بێ خوێندەواری هەموو شت بێ سوودە. هەر لەبەرئەمەش بوو کە لە قوتابخانەی (زانستی)دا دەوری ڕابەرو دامەزرێنەری بینی.

لەلایەکی تریشەوە دەوری پێشڕەوی بینی لە کردنەوەی قوتابخانەی کچاندا لە سلێمانی و هاندانی کۆمەڵانی خەڵک بۆ ناردنی کچەکانیان بۆ قوتابخانە. لەبەرامبەر ئەم کارەدا تووشی گەلێ هێرش و توانج بوو بەڵام دیسان کۆڵی نەدا و گەرمتر و جوانتر شیعری بۆ کچان و قوتابخانەی کچان دەگوت. هانی دەدان بۆ خزمەتی نەتەوەکەیان بەرەوپیری خوێندن و فێربوون بچن، بڕوای وەها بوو کۆمەڵ ناتوانێ تەنها بەهێز و توانای پیاو پێش بکەوێت ئەگەر ئافرەتیشی لەتەکدا نەبێت و هاوشانی هەنگاو نەنێت ناتوانێ ڕێگای سەختی بەئامانج گەیشتن ببڕێت.

بەرهەمی بەلێشاو و بەپێزی پیرەمێرد لەوە زۆرتر و گەورەتر بوو کە تەنها شیعر بتوانێت ئەرکی هەمووی بەجێ بگەیەنێ، لەبەر ئەمە پیرەمێرد دەبوا گەلێ ڕێگە بدۆزێتەوە و بەکاریان بێنێ بۆ گەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەی خۆی، لەبەرئەمە چەند ڕێگایەکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری گرتە بەر وەکو:

یەکەم: ڕۆژنامە، کە بەهۆیەوە تەواوی بەرهەمەکانی خۆی پێ دەگەیاندە خەڵکی و توانی (١٠١٥) ژمارەی ژیان و ژین دەربکات. لە چاپدانی ڕۆژنامەکە و بڵاوکردنەوە و مسۆگەرکردنی پێداویستەکانی بەزۆری لە ئەستۆی خۆیدا بوو.

دووەم: هەر لە چاپخانەکەی خۆیدا چەندەها کتێبی باش و سوودبەخشی لە چاپدا و بڵاوی دەکردنەوە و مێژینە و کەلەپووری نەتەوەی زیندوو کردەوە، وەک کتێبەکانی: مەم و زین و دوانزە سوارەی مەریوان و مەحموود ئاغای شیوەکەڵ و ڕۆحی مەولەوی و کەمانچەژەن و گاڵتە و گەپ. جگە لەمانە ڕۆژنامە هەفتەیییەکەی دابەش کردبوو بەسەر هەشت بەشدا:

١- ئەدەبی: واتا بەشی ئەدەبیات و زیندووکردنەوەی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی لەبیرکراو و ڕۆشنایی خستنە سەر گەلێ لایەنی تاریکی ژیان و بەرهەمی شاعیرانی کورد ئەوانەی کە بەهۆی ڕۆژنامەکەوە ناویان هاتەوە مەیدان و ئەمە بووە هەنگاوی یەکەم کە خەڵکانی تریش بکەونە خۆیان و بەشوێن بەرهەم و شێوەی ژیانی ئەو شاعیرانەدا بگەڕێن.

٢- کۆمەڵایەتی: لەم بەشەدا پیرەمێرد هەوڵی دەدا باری نالەبار و دواکەوتووی کۆمەڵەکەی بخاتە ڕوو، ناتەواویەکانی دەستنیشان بکات، تەنانەت گەلێ جار چارەسەری زۆر شارەزاییانەی بۆ دەدۆزینەوە و بەئاشکرا نیشانی کاربەدەستانی دەدا و دەیخستنە بەردەم هەڵوێستێکی تایبەتییەوە.

٣- ئابووری: هەموو ژمارەیەکی ڕۆژنامەکەی دەڕازاندەوە بەباسێک سەبارەت بەئابووری ولاتەکەی و پەرەپێدانی باری ئابووری، بەتایبەتی مەبەستی ئاوەدان کردنەوەی کوردستان بوو. لە ڕووی باسکردنی باری ژیانی جوتیار و دابەشکردنی زەوی و سوود وەرگرتن لەو هەموو خێر و بێرەی کە لە خاک و ئاوی ولاتەکەیەوە پەیدا دەبوو. دەیەها جار بانگەوازی بۆ کردنەوەی کارگەی شەکر بەرز دەکردەوە، باسی سامانی ئابووری گەورەی شارەزوور و شارباژێڕ و هەورامانی دەکرد. باسی هەوڵی کردنەوەی ڕێگاوبانی بۆ ناوچە دوورەکان دەکرد و شێوەی بەئاسانی گەیاندنی ئاوی خواردنەوە و کارەبای بۆ ئەو جیگا دوورانە دەهێنایە پێشەوە.

٤- فەلسەفی: بەشێکی دیاری کردبوو بۆ باسی فەلسەفە و ڕوانینی فەلسەفی بۆ شیعر و ئەدەب و بۆ لێکدانەوەی هەموو دیاردەکانی ئەم جیهانە. باسی فەلسەفەی کۆن و، بەتایبەتی فەلسەفەی ئایینی ئیسلامی دەکرد و کاریگەرییەکانی ئەو فەلسەفەیەی لەسەر ئاکار و هەڵسوکەوتی مرۆڤ دیاری دەکرد.

٥- تەئریخی - مێژوویی: کە بەناونیشانی (تأريخ وأشخاص) گۆشەیەکی بۆ تەرخان کردبوو. هەرجارە باسی مێژووی کارەسات و ڕووداوێک یاخود بەسەرهاتی تیرە و خێڵێکی کوردی دەکرد. بەگشتی نیازی لەمە دوو شت بوو، یەکەم: ڕووناک کردنەوەی لایەنە تاریکەکانی مێژوو کە یا لەبیر چووبوونەوە یاخود بەهەڵە و ناتەواو باسکرابوون، دووەم: بۆ پەند و سوود وەرگرتنی ڕۆڵەکانی نەوەی نوێی کورد لەو بەسەرهات و پەندە مێژووییانە لە ژیانی خۆیاندا. مێژووی فەرمانڕەوایی بابان و مێژووی تیرەی جافی نووسی، مێژووی گەلێ کارەساتی زیندووکردەوە.

٦- زانیاری- زانستی (عیلمی): لەم بەشەدا هەوڵی دەدا گرنگی زانست ببەستێتەوە بەپێشکەوتنی کۆمەڵەوە، ئەوەی دیاری دەکرد کە یەکەم هەنگاو بۆ گەیشتن بەدنیای زانست خوێندەوارییە، ئنجا لە دەرگای خوێندەوارییەوە دەتوانین بچینە جیهانی گەورە و بەرفراوانی



زانستەوە.

٧- ئایینی: کە خۆی پێی دەگوت (فقهي): بەو پێیەی کە پیرەمێرد خۆی لە هەموو ژیانیدا مرۆڤێکی ئایینی بووە و زۆر بەتەنگ پاراستنی بیروباوەڕی ئایینی خۆیەوە بووە. لەو بەشەدا گەورەیی ئایینی ئیسلام و مرۆڤە ئایینییە بەناوبانگەکانی کورد و جگە لە کوردی باس دەکرد، جگە لەوە بەزنجیرە شیعری (ناڵەی پیری پیران)ی ئایینیی خۆی بڵاو دەکردەوە.

٨- بەشی گاڵتە و گەپ و خۆشی و پێکەنین کە خۆی پێی دەگوت (مزاحی و فکاهی): ئەمە ئەو هەشت بەشە بوون کە بەردەوام لە ڕۆژنامەکەیدا گۆشەی تایبەتی خۆیان هەبوو، بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٣٢ەوە کە ڕۆژنامەکە کەوتە دەست خۆی ئیتر تەواو ئەم گۆشانەی چەسپاند و هەتا دوا ژمارە بەردەوام بوو. ئنجا بەلای منەوە ئەگەر ئەم زنجیرە باسە هەمە چەشنانە کۆبکرێنەوە و ڕێک بخرێن ئەوە چەند بەرگ لە کتێبێکی بەنرخ و پڕ بایەخی لێ دێتە بەرهەم لەبارەی ئەدەب و فەلسەفە و ئابووری و باری کۆمەڵایەتی و ئایینی و مێژوویی و زانستی و پەند و ئامۆژگاری و فۆلکلۆری ئەدەبی کوردی. ئەمە دەبێتە سەرچاوەیەکی ڕوون و سامانێکی گەورەی ڕۆشنبیری کوردی کە نەوەکانی دوارۆژ بۆ هەموو ئەو بابەت و باسانە دەتوانن وەک سەرچاوە تەماشای بکەن و بەرهەمەکانی خۆیانی پێ بەپێز و بەبرەو بکەن.

پیرەمێرد یەکێک بوو لەو فۆلکلۆریستە گەورانەی کە بەخششی بۆ دنیای فۆلکلۆر و ئەدەبی میللی نەتەوەکەی بێ وێنەیە و کەس نەیگەیشتۆتێ.

لەساڵانی سییەوە هەموو ژمارەیەکی ڕۆژنامەکەی بەگۆشەی (پەندی پێشینان) دەڕازاندەوە، ئەم کارەی پیرەمێرد بایەخەکەی لەوەدا بوو کە ئەو پەندە کۆنە فۆلکلۆرییانەی دەهێنا و دەیکردن بەشیعر و بەجۆرێک لەگەڵ یەکتریدا دەیگونجاندن کە خوێنەری دەجولاند و زەوق و چێژێکی تایبەتی لێ وەردەگرت، تەنانەت بەشێوەیەک دای دەڕشت کە ئەو دێڕ و نیوە دێڕانەی خۆی لەناو دەقە فۆلکلۆریەکەدا نەدەناسرایەوە. ئەم تێکەڵی و گونجاندنەی پیرەمێرد لەگەڵ فۆلکلۆردا مێژینە و ڕابردووی خۆی هەیە، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی و تەمەنی لاوی و هەرزەکاری ئەو لە ولاتانی سلێمانی و دێکانی دەوروپشتیدا. لەو سەردەمانەدا گۆڤار و ڕۆژنامە و ڕادیۆ و هۆیەکانی ڕاگەیاندن نەبوون، بۆیە بەتایبەتی لەشەوانی سارد و زوقم و سەهۆڵبەندانی کوردستاندا خەڵکی لە دەوری ئاگردان و لەبەر شەوقی چرا و قوتیلە دادەنیشتن و تا درەنگانێ چیرۆکی فۆلکلۆری و ئەفسانەیی و بەند و باویان دەگێڕایەوە و چێژ و تامێکی تایبەتیان لێ وەردەگرت. دەنگدانەوەی ئەو پەند و چیرۆکانە لەلای پیرەمێرد کۆن نەبووبوون، زیندوو بوون و بەهۆی بیری پێگەیشتوو و هۆشیاری خۆیەوە دەیزانی چەندە سامانێکی میللی گەورەیە و پاراستن و تۆمارکردنی چەندە پێویستە، ئنجا ئەم ئەرکەی بەوپەڕی سەرکەوتنەوە بەئەنجام گەیاند،

بەڕاستی ئەگەر پیرەمێرد نەبوایە ئەو سامانە فۆلکلۆریە گەورەیەمان بەم شێوەیەی ئێستا دەست نەدەکەوت.

پیرەمێرد پشت بەو ڕۆشنبیری و زانیاری و گەڕان و پشکنینەی لە تورکیا، ویستی بزووتنەوەی شانۆیی بەتایبەتی لە سلێمانیدا پەرە پێ بدا، بەهۆی کۆمەڵەی زانستییەوە چەند شانۆنامەیەکی خۆی پێشکەش کرد، لە ڕۆژنامەکەیدا جێگای تایبەتی بۆ باسکردن و پێداهەڵگوتنی ئەم شانۆگەریانە تەرخان کردبوو. شانۆگەری مەم و زین و مەحموود ئاغای شێوەکەڵ و شەریف هەمەوەندی نووسی و هەریەکە لە کاتی خۆیدا پێشکەش کران، زۆرجار دەستکەوتی ئەم شانۆگەرییانەی بەسەر قوتابی هەژار و خەڵکی دەستکورتدا دابەش دەکرد، گەلێ جار باسی بایەخ و گرنگێتی شانۆی نووسیوە لە ژیانی کۆمەڵدا، بەتایبەتی لە کۆمەڵی دواکەوتوو و نەخوێندەواردا.

پیرەمێرد بەهەموو شێوەیەک دەیویست ئەدەب و زمان و مێژوو و فۆلکلۆری کورد ببووژێنێتەوە و پەرەی پێ بدا، جێگا دەست و کارە مەزنەکانی کە باسمان کرد ڕاستی ئەم بیروڕایە دەسەلمێنن.



وێنەی پیرەمێرد لە تەمەنی لاویدا لە تورکیا

## پیرەمێرد و هەوڵێک لە چەسپاندنی ئەدەبی بەراوردکاریدا

وەک باسەکانی پێشوو لێرەدا هەر ئەوەندە ماوە دەبێت کە بەخێرایی چەند تیشکێک بهاوینە سەر ئەو هەوڵە مەزنەی پیرەمێرد لە بواری هێنانە پێشەوەی بەراوردی ئەدەبیدا.

ئەگەرچی لە پێش پیرەمێرددا، لە ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستیدا ساڵی ١٩١٨ و لە کتێبی (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد)ی ئەمین فەیزیدا بەکورتی هەوڵێک بۆ بەراوردکردنی شیعری کوردی و شیعری تورکی و فارسی دراوە بەڵام وەک پیرەمێرد بەئاشکرا و ناوهێنانی و دەستنیشانکردنی دیاری نەکراوە. پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٣٦دا لەژێر ناوی (بەراوردی ئەدەبیاتدا) لە ژمارەی (٤٦٣)ی (ژیان)دا، کورتە باسێکی ئەم بەراوردە دەکات. شیعرێکی عەرەبی و کوردی و تورکی و فارسی، واتا ئەدەبیاتی چوار نەتەوە بەراورد دەکات، کە ئەو چوار شیعرە لەلایەن چوار شاعیرەوە بۆ یەک



دەسخەتی پیرەمێرد

١

مەسەلە وتراون، ئەویش کۆچ کردنی خۆشەویستیانە. ئەم هەوڵەی پیرەمێرد ئەگەر بیخەینە بەر تیشکی زانستی ئەدەبی بەراوردکاری و بەپێی ئەو مەرجانەی کە لەو ئەدەبەدا هەیە ئەوا دەچێتە خانەی (ئەدەبی گشتی)یەوە. چونکە ئەدەبی بەراوردکاری دەبێت لەنێوان ئەدەبی دوو نەتەوەدا بێت کە ئەو دوو بەرهەمە بەئاشکرا پەیوەندی و کاریگەری یەکێکیان لەسەر ئەوی تریان دیار بێت، وە پەیوەندی مێژوویی و جۆری ئەدەبەکە لە نێوانیاندا هەبێت بەڵام ئەگەر لە ئاشکراکردن و دۆزینەوەی پەیوەندی لە نێوان ئەدەبی دوو نەتەوە زیاتر بوو ئەوا دەبێتە ئەدەبی گشتی.

ئەوەندەی من ئاگادار بم پیرەمێرد سێ جار لە ڕۆژنامەکەیدا بابەتی ئەدەبی بەراوردکاری هێناوەتە مەیدان و ئەوەندەی توانای ڕۆشنبیری و ئاگاداربوونی خۆی لە ئەو ئەدەبە باسی کردوە بەپێشەکی بۆ نووسینی و هێنانەوەی نموونە لەو چەند جۆرە ئەدەبە. لەلایەکی تریشەوە پیرەمێرد لایەنێکی لە بەراوردکردنی ئەدەبەکە وەرگرتووە ئەویش لایەنی شیعرە، نەک لایەنی ئەدەب بەگشتی وەک چیرۆک و ڕۆمان و شانۆ و... هتد. هەروەها بەراوردکردنی دوو دەقی ئەدەبی لە ئەدەبیاتی یەک نەتەوەدا ئەدەبی بەراوردکاری پێک ناهێنێت، وەک پیرەمێرد بەراوردەکەی کردووە، بەڵکو دەبێت لە نێوان ئەدەبی دوو نەتەوەی جیاوازدا هەبێ و کاریگەری ئەو دوو ئەدەبەش لەسەریەکتری دیار بێت.

بەهەر حاڵ ئەم باسە لە داهاتوودا دەکەینە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ و ئەم هەوڵە مەزنەی پیرەمێردیش هەرچۆن بێت جێگەی سەرنج و بایەخ و ڕێزە.

# چەند لاپەڕەیەکی شارراوە لە ژیانی پیرەمێرد

## بەشی یەکەم

### نامەیەکی بڵاونەکراوە

ئەم نامەیەساڵی ١٩٣٨ نووسراوە، لەبەرئەوەی لەم ماوە دوور و درێژەی تەمەنیدا بەسەریەکدا نوشتاوەتەوە و لە خانەی بیرچوونەوەدا دانراوە، لە چوار بەش، بەشێکی لێ بزر بووە. هەرچی هەوڵمان دا بۆمان نەدۆزرایەوە، بەڵام بەشەکانی تری کە دەست و قەڵەم و خەتە خۆشەکەی پیرەمێردی نەمرە لەمەبەستی نامەکەمان دەگەیەنێت.

ئەم نامەیە، ساڵی ١٩٣٨پیرەمێردی مەزن ناردوێتی بۆ هەڵەبجە بۆ (عەلی باپیر ئاغا)ی شاعیر. لە دامێنی خوارەوەی نامەکەدا هەر بەخەتی عەلی باپیر ئاغا لەسەری نووسراوە: ئەمە نامەی پیرەمێرد - حاجی تۆفیق خاوەنی (ژین)ە. لە ساڵی ١٩٣٨دا بۆ عەلی باپیر ئاغای نووسیووە کە ئەوسا لە هەڵەبجە بووە. مەبەستی بنەڕەتی نامەکە گفتوگۆی بیروڕا گۆڕینەوەیە





سەبارەت بەوەی کە لەلایەن پیرەمێرد و عەلی باپیر ئاغاوە هەوڵ بدرێت چەند کەسێک کۆبکرێنەوە و بچن بۆ (سەرشاتە) کە ئارامگای مەولەوی لێیە هەتا مەزارەکەی بۆ هەڵبەستن و لەلایەکی کەشەوە بیکەنە موناسەبەیەکی ئەدەبی. پیرەمێرد لە چەند نووسینێکی تریشدا لە ڕۆژنامەکەی خۆی و گۆڤاری (گەلاوێژ)دا ئەم مەبەستەی باس کردووە و زۆری ئارەزوو لەوە بووە کە ئارامگای شاعیری بلیمەت (مەولەوی) هەڵبەسرێت و جێگا و ناوی لەبەردەم بەسەرهاتی ڕۆژگاردا ون نەبێت و بمێنێتەوە. مەبەستی دووەم لە نامەکەی پیرەمێرد کە تیایدا نووسراوە گلەیی پیرەمێردە لە (حەسەن فەهمی بەگی جاف)ی نووسەر و ئەدیب، کە جێگای ژیانی هەڵەبجە بووە و لە ڕووی گوزەرانیشەوە دەسەڵاتدار بووە و دەوڵەمەند بووە. گلەیی ئەوە لە حەسەن بەگ دەکات کە بیریان چووە ئابوونەی ڕۆژنامەی ژین بۆ پیرەمێرد بنێرن، کە ئابوونەکە پارەیەکی هێجگار کەم بووە. ئەم گلەیییەی پیرەمێرد لە حەسەن بەگ ئەوە ناگەیەنێت کە پیرەمێرد بیروڕا و خۆشەویستی بەرانبەر ئەوان گۆڕابێت بەڵکە لە زۆر موناسەبەدا بەشیعر و بەنووسین ستایش و سوپاسی ئەوانی کردووە بۆ خزمەت کردنی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی. بۆ نموونە لە چەند نووسینێکدا باسی کەشکۆڵەکەی مەحموود پاشای جافی کردووە و لە موناسەبەی لەدایک بوون و کۆچ کردنیاندا شیعری نووسیوە. ئەمە دوو پارچە شیعرە کە بۆ لە دایک بوون و کۆچ کردنی کوڕێکی حەسەن بەگ وتوویەتی:

مـــژدەیەکی خـــۆش هات بەتەلگراف
کوڕی بوو بەدوو حەسەن فەهمی جاف
لەناو جـــەژنانا جـــەژن بوو بە سێ
دیارە بوو بە دوو سـێـیـەی لە دوو دێ
ئەمـــە تەئریخی ڕۆڵەی زەکـــیـــە
(محەممەد سەروەر) گشت ئێل بەگییە

هەر ئەم «محەممەد سەروەر»ە پاش دوو ساڵ کۆچی دوایی دەکات و پیرەمێردیش ئەم شیعرە لە شیوەنیا دەنووسێ و دیسان ئەم شیعرەش لە دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاواردا نەنووسراوە:

خـــودا داد لە دەست ئەم پیـــرە زاڵە
چەند بەســـــــەر دڵی نازدارا زاڵە
حەسەن بەگ لەجێی دوو پاشا ماڵە
دوو چرای هەڵکرد لەو بنەمـــــاڵە
بای مـــەرگ یەکـــێکی کـــوژاندۆتەوە
دڵی ئەو ئێلەی ڕەنجـــــــاندۆتەوە
مـــحەممەد سەروەر کـــۆچی بەخـێـــرە

کۆچی قوربانی قەزا وەگێڕە
خوا، ڕۆڵە مردن، بەئەجر ئەژمێرێ
یەک بەدە تۆڵەی بۆ ئەبژێرێ
تەئریخە بۆ ئەو وەکو سروشتە
(محەممەد سەروەر) پەپولەی بەهەشتە

ئەگەرچی نامەکە پارچەیەکی بزر بووبوو خەتەکەش لەگەڵ شێوەی نووسینی ئەمڕۆدا جیاوازە، بەڵام هەرچۆن بوو توانیم بیخوێنمەوە و لە مەبەستی تەواوی بگەین، ئەمەش دەقی نامەکەیە ئەوەندەی نووسینی لەسەر بێت:

«تۆ ئەڵێی چی؟! لە هەڵەبجەوە تا سەرشاتە چۆن بچین؟! بۆ ئەمە جۆش و خرۆشێک پەیدا بووە، زۆر لە دووریشەوە کوڕگەل دێن، لەولایشەوە لە حەسەن بەگ دڵگیرم، تۆ «مەبەست لە عەلی باپیرە» بەو دەستە تەنگەوە، بەو دڵە گەشاوەتەوە، پارەت بۆ ژین ناردووە کە ئەبوایە ژین پارە بدا بەتۆ کە بیخوێنیەوە. ئەوەبوو چوار ساڵ لەمەوبەر لە پاداشی ستایشی مەحموود پاشادا دوو دیناری ناردبوو، دوایی وتی: پارەی ئابوونە نانێرین. غەزەتەیشی بۆ ئەچێ، ئەوەندەی هەیە ژین جۆکەری تیا نییە هەزار دیناری پێ بدۆڕێنێ!. لەگەڵ ئەوەیشدا چونکو نەوەی مەحموود پاشایە لێی ئەبوورم. تەنانەت بەفەخرەوە زنجیرەی باوک و باپیریشیم لە (ژین)دا نووسیوە... ئەگینە شەوێکی خۆش ئەبوو. هەزار دینار بۆ قومار، دوو دینار بەخشیش بگەڕێتەوە بۆ ئابوونەی چوار ساڵ، ئیتر تۆ سەلامەت بی هەردووکمان پوولەکی نین».

لەم نامەیەدا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە پیرەمێرد چەندە ئارەزوومەند و بەپەرۆش بووە بۆ هەڵبەستنی ئارامگای مەولەوی. تاوەکو جێگەکەی تەخت نەبێ و لەبیرنەچێتەوە. ئەمەش دیارە هەر لە خۆوە نەبووە و ئەو کاریگەریە بەر فراوان و قووڵەی کە شیعری مەولەوی لە ناخ و هەست و دەروونی پیرەمێرددا دروستی کردوە تەنانەت هانی دا کە هەرچی شیعری مەولەوی هەیە لە شێوەی هەورامی (گۆران)ەوە بیگۆڕێتە سەر شێوەی سلێمانی. هەروەها بەڵگەیەکی ئەدەبی و مێژوویی دەبێ ئاگامان لەوە هەبێت کە ڕەنگدانەوەی وێنە و دەنگدانەوەی شیعری مەولەوی لە شیعرەکانی پیرەمێرددا بەئاشکرا دیارە و دەستنیشان دەکرێت.

پیرەمێرد لە تەمەنی منداڵیدا بەچاوی خۆی مەولەوی بینیوە، بەڵگەشمان بۆ ڕاستی ئەمە، پیرەمێرد خۆیەتی، کە دەنووسێت «منداڵ بووم، لەبیرمە جارێ مەولەوی هاتە ماڵی ئێمە، قاپووتێکی کورکی سەوزی لەبەردابوو، منیان خستە باوەشی و دەمی ماچ کردم. لەدەمی دەم ماچکردندا چاوم بەچاوی کەوت، بروسکەیەکی پڕ خەندەی لێ بەرز بووەوە. ئەو چاوانە کە لە



دواییدا کوێر بووبوو چەند جوان و پڕ مەعنا و جازیبەدار بوو»[٢٤].

جگە لەمەش لە دوای ئەو نامەیەی پیرەمێرد کە بۆ یەکەمجار بڵاومان کردەوە بەماوەی (١٠) ساڵ دوای ئەوە واتە لە ساڵی ١٩٤٨دا دیسان پیرەمێرد دەیەوێ ئەم ئارەزووە پیرۆزە بەجێ بگەیەنێ، ئارامگای مەولەوی هەڵبەستێت، بەڵام بەداخەوە ئەمجارەش بۆی نەچووەسەر و دڵشکاو و نابەکام مایەوە. لەو پارچە پەخشانە جوانەدا پیرەمێرد دوو کاری گرنگ ئەنجام دەدات. یەکەمیان هەوڵدانە بۆ زیندووکردنەوەی شیعری مەولەوی و نزیک کردنەوەیەتی لە هەست و دڵی لاوە ڕۆشنبیرەکانی ئەو سەردەمە. دووەمیان ئەو نرخاندن و هەڵسەنگاندنە ئەدەبییە هونەرکارانەیە کە پیرەمێرد دەربارەی شیعری مەولەوی نووسیویەتی کە بەڕاستی لە توانای قەڵەمی ڕەخنەگرێکی کارامە کەمتر نییە. بۆ سەلماندنی ئەم بیروڕایانە با تەماشای پەخشانە ئەدەبییە ڕەنگینەکەی پیرەمێرد بکەین «ئێمە بیری تەرتیباتی زیارەتی ڕۆحی مەولەویمان کردووە، کە چەند ساڵێ لەمەوبەر بەجۆش و خرۆشێکەوە عالەمی کوردەواریمان هێنایە سەر ئەو هەوەسە و لە هەموو شوێنێکەوە ئارەزوو پەیدابوو، بەڵام ناهەمواریی زەمان و کەشمەکەشی دەوران بەرهەڵستی ئەو ئارەزووەی کردین. زاتەن ئەو زیارەتە چونکە قسنی مەولەوی لەوبەر ئاوی سیروانەوەیە هەموو مەوسمێک ناتوانین بپەڕینەوە. ئەشێ دەمەدەمی پایز بێ، کە ئەو سایە سیروان بوار ئەدا، سەیرکەن بەهۆی سیروان و پایزەوە دوو شیعری مەولەویم کەوتەوە یاد، کێ توانیویەتی ئەو سنعەتە لە شیعردا بکات، بۆ سیروان وتوویە:

پایز، زەرد بەخەم، جام، چارشێوی تەم
دێرەن سوارکەن نەو عروسی خەم

ئەم ئارەزووە ئەوەندە ساڵە لە دڵی پیرەمێردا ماوەتەوە، ڕەنگە بیشیباتە گڵەوە، خۆزگە دوای خۆیشم لە گردی یارەوە ئەمبینی کە دەستەی لاوان و هونەروەران و ئەدەب پەروەران کەوتوونە ڕێ ئەچن بۆ ئەو تەوافە فەرزەی ئەو گیانە بەرزە و لە تەئریخی کوردیدا ئەنووسرا»[٢٥].

تێبینی: برای هونەرمەند (خالید ڕەسوڵ) وێنەیەک لەو نامە بڵاونەکراوەیەی پیرەمێردی بۆ هێنام کە ئەویش لە (سەید عەبدوڵڵا)ی خەیاتی وەرگرتبوو.

## بەشی دووەم

کاتێک کە تۆفیقی مەحموود ئاغای هەمزاغای مەسرەف بەفەرمانێکی میری لە ساڵی

(٢٤) پەخشانی مەولەوی. نووسینی پیرەمێرد. دەستنووس.
(٢٥) زیارەتی مەولەوی. پەخشانی پیرەمێرد. دەستنووس.

١٨٩٥دا دەگوێزرێتەوە بۆ (کەربەلا) ناچێت بۆ ئەوێ و دەست لەکاری فەرمانبەری هەڵدەگرێ. لە ساڵی ١٨٩٨ بەهاوڕێیەتی شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحموودی حەفید دەچێت بۆ تورکیا و ساڵی دوای ئەویش دەچێتە حەج و دەبێتە حاجی تۆفیق. مامی گەورەی ناوی سەعید هەمزاغا بووە. مامەکانی تری ناویان حسەین، حەسەن، فەتاح بوو، بنەچەی خێزانیان دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی (بەختیاری). پیرەمێرد خۆی دەڵێت: «خۆم و خزم و کەس و کارم کەمتر ئەم شارەمان بەقیسمەت بووە، مامی گەورەم، سەعید هەمزاغا لە پیلانی حەڵەبدا مردووە. مامە حسەینم کەوتە لای باطوم و گورجستان، حەسەن لە هەڵەبجە و فەتاح لەحلە و کوڕەکانم لە تورکیە. بنچینەمان کە بەختیارین و سەردار ئەسعەدم لە تەورێز دیبوو. لە زیندانی تارانا مرد»[٢٦].

پیرەمێرد پێش ڕۆیشتنی لە سلێمانی ژنی هێناوە و ژنەکەی ناوی (غەزالە خان) بووە. لەم غەزالە خانە سێ کچی هەبووە و کوڕی نەبووە، ئەمەش ناوەکانیان:

١- مەهدیە لە تەمەنی منداڵی کۆچی دوایی کردووە.

٢- ئەمنە یاخود ئامینە، بۆتە خێزانی (میرزا محێددین)ی برای میرزا فەرەج. دوو کچی بووە و هیچیان نەماون.

٣- ڕەحمە خان کە ساڵی ١٩٧٧ کۆچی دوایی کردووە و هەر لە سلێمانی دەژیا دایکی فائق هۆشیار و ئەحمەد زرنگە. خۆم لەم ساڵانەی دوایی تەمەنیدا لە سلێمانی چەند جارێکم بینیوە. ئێستا ئارامگاکەی لە گردی مامەیارە لە تەنیشت پیرەمێردی باوکیەوەیە. هەروەها خوشکی پیرەمێرد ناوی فاتم بووە. خۆی دەڵێت «فاتمی خوشکم جامی بەفر و دۆشاوەکەی هەمیشە لە تەنیشتەوە بوو»[٢٧].

پیرەمێرد ساڵی ١٩٠١ دەچێتە کۆلیجی یاسا، ئەو کاتە پێیان وتوە (مەکتەبی حقوق) و لە ساڵی ١٩٠٥دا تەواوی دەکا و دەبێتە پارێزەر (محامی).

بەهۆی گیانی نیشتمانپەروەری و بوونە ئەندامی کۆمەڵەی کورد[٢٨] و بڕوانامەی (حقوق) دەبێتە، خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی کورد کە -ئۆرگانی جەمعیەتی تەعالی و تەرەقی کورد- بووە لە ئەستەمول.

لە تورکیا ژنێکی تری هێناوە، لە ماوەی ئەو بیست و پێنج ساڵەی لە تورکیا بووە لەو ژنە دوو کوڕی هەبووە. ناوی کوڕی گەورەیان (نەژاد) و کوڕی بچووکیان (وداد) بووە. پیرەمێرد لە ساڵانی دوایی ژیانیدا لە سلێمانی گەلێ جار بەنووسین یادی ئەو دوو کوڕە دووروڵاتەی خۆی

(٢٦) هەڵمەتی خەفەت- پەخشانی پیرەمێرد.
(٢٧) لە کوردستاندا چۆنمان ڕابوارد- پەخشانی پیرەمێرد.
(٢٨) کۆمەڵەی کورد- جەمعیەتی تەعالی و تەرەقی کورد لە تورکیا .



کردۆتەوە. نەژادی کوڕی گەورەی لە دوورگەی (هەگبەلی أطە) کە پێشی ئەڵێن (أطە بازاری) جێگایەکی خۆشە لە تورکیا لەدایک بووە. لەوکاتەدا پیرەمێرد قائمقامی (هەگبەلی أطە) بووە و لەشەوی ئاهەنگی لەدایک بوونی نەژاددا، ئەمین زەکی بەگی مێژوونووس لەوێ بووە و شیعرێکی بۆ ئەو موناسەبەیە بۆ کوڕەکەی پیرەمێرد نووسیوە، بەڵام بەداخەوە هەتا ئێستا ئەو شیعرە مێژووییەمان دەست نەکەوتووە. پیرەمێرد دەڵێت «دوای ئەوەی کە نەژادی کوڕم لە جزیرەی (هەگبەلی أطە) هاتە دنیا ئەمین زەکی بەگ قەسیدەیەکی نووسیبوو خالید ضیا و ئەکرەم بەگی ڕەجائی زادە زۆریان پەسەند کرد»[٢٩]. هەروەها نەژاد وەک حاجی تۆفیقی باوکی گیانی کوردپەروەری و نیشتمانپەروەری بەرز بووە و لەگەڵ ئەوەشدا لە نووسینی پەخشان و وتاری ڕۆژنامەدا دەستی هەبووە[٣٠].

بەرهەمی خۆی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەی تورکیادا بڵاو کردۆتەوە. پیرەمێرد لە باسی نەژاددا دەڵێت «لە ئەستەمول کە جەمعیەتی کورد[٣١] تەشکیلی کردبوو، لەگەڵ (اتحادچییەکان)[٣٢] بەربەرەکانیان بوو. اتحادچییەکان خەڵکیان ئەترساند، فیدائیان هەبوو (ئەحمەد صمیم) و (حەسەن فەهمی) وەک من غەزەتەچی بوون کوشتنیان. ئەم عەزیزەش، (مەبەست لە عەزیز یامولکییە) نەژادی کوڕی منی هەڵفریواندبوو خۆیان بەفیدایی جەمعیەتی کورد قەید کردبوو»[٣٣].

نەژادی کوڕی حاجی تۆفیق بەگی پیرەمێرد بڕوانامەی (حقوق)ی هەبووە و دووجار سەردانی باوکی کردووە، لە تورکیاوە بۆ شاری سلێمانی.

جارێکیان لە ساڵی١٩٣٣دا. بەڵگەشمان بۆ ڕاستی ئەوەیە کە پیرەمێرد دەڵێت «نەژادی کوڕی پیرەمێرد بۆ دیداربینی لە تورکیاوە هاتۆتەوە، بەجارێ پیر و جوان بەچاوڕوونییەوە هاتوون. هەردوولایان، باوک و کوڕ زۆریان پێ خۆشە، تێکڕا سوپاسی چاکە و غەریب نەوازی هەموو لایەک ئەکەن»[٣٤]. هەروەها لە چلەی ماتەمینی پیرەمێرددا لە ساڵی ١٩٥٠دا دیسان لە تورکیاوە هاتووە و ئامادەی ئەو ماتەمییە بووە. ساڵی ١٩٥٤ لە تورکیا کۆچی دوایی کردووە.

نەژاد دوو کوڕی هەبووە بەناوی (ئەتێلا و محەممەد).

(٢٩) ژین ژمارە (٥٥٤) ساڵی ١٩٣٩.
(٣٠) ژین ژمارە (٧٠٤) ساڵی ١٩٤٣.
(٣١) سەرچاوەی ژمارە سێ.
(٣٢) مەبەست لە ئەندامانی حزبی اتحاد و ترقی تورکی ئەو کاتەیە.
(٣٣) ژین ژمارە (٨٥٥) ساڵی ١٩٤٧
(٣٤) ژین ژمارە (٣٦٨) ساڵی ١٩٣٣

وداد کوڕی دووەم و بچووکی پیرەمێردە. لە تورکیا لە دایک بووە. بڕوانامەی دکتۆرای لە ئابووریدا هەبووە. لە یەکێ لە ساڵەکانی پێش جەنگی جیهانی دووەمدا هاتووە بۆ سلێمانی بۆ لای پیرەمێردی باوکی و ئنجا چووە بۆ بەغدا و چووە بۆ هندستان و لەوێ بڕوانامەی بەرزی لە زمانی «سانسکریتی»دا وەرگرتووە، لەم بارەیەوە پیرەمێرد دەڵێت «بەر لە جەنگی جیهانی سۆزی دوایی جەمعیەتێکی ئینسکلوپیدی لە تورکیا ڕێکخراوە. لە دانشمەندانی گشت میللەتێک پێکهاتبوو. پرۆفیسۆرێکی ئەڵمانیان هەڵبژاردبوو سەرۆک بێ. ودادی کوڕی منیش هەروا لالە سەنگی خۆی تێ هەڵقورتاند. تێفکریم ڕۆژێ لە ناگاھ پەیدابوو. وتی بابە منیان داناوە بچم بۆ هیندستان لەوێ شارەزای زبانی سانسکریتی ببم. هەتا بچمەوە تورکیا ئەگەر جەمعیەت هۆی کەوتە ئاساری سانسکریتی بۆیان بخوێنمەوە. پارەیان داومێ، هیچم لە تۆ ناوێ، منیش هەڵسام بردمە بەغدا، پەساپۆرتەکەیم لە سەفارەتی بەریتانیا بۆ ڤیزە کرد و (ڕەشید نەجیب)یش تەوسیەی بۆ جێیەک بۆ نووسیبوو لەوێ زۆر بەکەڵکی هاتبوو[٣٥]».

## بەشی سێیەم

### خۆشەویستی پیرەمێرد و میهرەبان خاتوون

ساڵی **١٩٣٦**[٣٦] پیرەمێرد بەقەڵەمی خۆی ئەم چیرۆکە دڵدارییە دڵتەزێنەی خۆی نووسی و بڵاوی کردەوە، هەروا بەکپی و فەرامۆشکراوی مایەوە هەتا ساڵی **١٩٤٨** کە بۆ دووەم جار بڵاوی کردەوە ئەمجارە لە گۆڤاری گەلاوێژدا و لەژێر نازناوێکی خواستراودا بەناوی (کولۆکۆ)وە بڵاوی کردەوە. ناونیشانی چیرۆکەکەشی کردە (گڵکۆی میهرەبان)[٣٧].

پیرەمێردیش کاتێ بۆ یەکەمجار ئەم ڕازەی درکاند پەنجا ساڵ تێپەڕیبوو بەسەر دڵدارییە ناکامەکەیدا.

ئایا بڕوا بکەین ئەم بەسەرهاتە ڕاست هی (تۆفیق)ی لاوی دڵدار و عاشق بووە؟! یاخود ئەم وەک نووسەرێک سروشی (وەحی) ڕووداوەکەی وەرگرتبێ لە کەسێکی تر کە ئەوەی بەسەرهاتبێت. لە وەڵامدا هەر خۆی پێمان دەڵێت:

١- «شەوێکم لە زیندەگانی گوزەشتە هاتەوە یاد، وەک شەونم فرمێسک بەسەر ڕیشی سپیما باری[٣٨]».

٢- ئەو تەڵە ڕیحانەیەی کە لەسەر ئاوەکە لێت بەجێماوە بەتۆراوی ناردوویەتیەوە[٣٩].

٣- «ئەم ماجەرایە پەنجا ساڵی بەسەرا ڕابوورد، لەم یەک دوو ڕۆژەدا لەگەڵ جەنازەیەکی ئازیز ڕێم کەوتە مەڵبەندی میهرەبان[٤٠]».

لەم سێ خاڵەدا بۆمان دەرکەوت کە ڕووداوەکە تەواو ڕاستەقینەیە و کارێزەکەی (کانی سپیکە)ش کە ئەم عەشق و دڵدارییەی لەسەر دروست بوو هەتا ئێستاش ئاوە ڕوونەکەی و چنارە نازدارەکانی ماون. بەڵام ئایا (میهرەبان) ناوی تەواوی خۆی بووە یاخود پیرەمێرد لەبەر نەناسینەوە باری دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە ئەم ناوەی بۆ هەڵبژاردبێت؟!. ئەمەیان ڕوون نییە!. ئێستا ئێمە و قەڵەمە بەپێز و هونەرکارەکەی پیرەمێرد:

«بەهارە، چۆن بەهارێک، باران چوار جار بەهاری کۆنەی سەرلەنوێ بۆ زیندوو کردینەوە. لەدەشت و هەردە و شیو و کۆسپ، گوڵاڵە و گەزیزە و بەیبوون و گوڵەزەردی تازەی بۆ ڕواندینەوە، لە کارێزی حسەین خەیمەی بەهارە. سەیرانی ئێمە و خەیمەی گوڵاڵانی خوایی یەکدگیربوون. شەوە، لەسەر گازی پشت لێی ڕاکشاوم. تەماشای جریوەی ئەستێرە و تریفەی مانگ ئەکەم گوێم لە خوڕەی ئەستێرکەکەش گرتووە. بەڵام دوورم، ئەستێرەی ناو ئەستێران نابینم، شەوێکم لەزیندەگانی گوزەشتە هاتەوە یاد، وەک شەونم فرمێسک بەسەر ڕیشی سپیما باری. جۆش و خرۆشی سەودای نەوجوانی وەک پەپوولە زێڕینە (کەڵەبەک) بەسەر هەموو گوڵێکدا ئەیگێڕام، لەسەر هیچیان نەدەنیشتمەوە. گاھ پەروازی شاعیرانە وەک (ژوپیتەر) ئەیبردمە میحرابی پەرستشی ئالیهەی جەمال (ڤینۆس)ەوە. بۆ سەودای لەیل و مەجنوونی دەگەڕام، گاھ کەمەندی خەیاڵاتی مەم و زین لەو ئاسمانی باڵا پەروازیەوە دەیهێنامە سەر زەمین شار بەشار دیارە و دیار دەیگێڕام. تا ڕۆژێ لە کانی سپیکە سەیران بوو لەناو سێبەری پەڵە چنارێکدا کارێزێکی لێ بوو چووم ئاو بخۆمەوە، ناگاھ (میهرەبان) بەهەڵەیی هاتە سەر کارێزەکە، لە پڕ منی دی کەمێ سڵەمییەوە. دوایی بەغرووری جوانی خۆی و خزمایەتی و بۆرە دەستگیرانیەکەوە بێ پەروا هاتە پێشەوە. نیهایەت ئەمەندەی گوت: ئای ئەمە تۆی؟! دانیشت، دەم و چاوی شت، ئۆف ئەو دەنگە و ئەو ڕەنگە بەهەناسەیەک، هەناسەیەکی پێ هەڵکێشام. برووسکەیەک لەو چاوە جوانانەوە وەک پزیسکی وێڵ پەڕیە سەر پەڕەی جەرگم. شێتانە هەستام لەناو چنارەکان هاتمە دەرێ، ماینەکەمی لێبوو سوواربووم، ڕاست خۆم گەیاندە ماڵەوە. بەدەمەوە لێی کەوتم.

تاوەکو شەوێ هیچم پێ نەخورا. شەوێ دایکەکەی هات تێفکری من کەوتووم وتی، تۆ بۆچ

(٣٥) ژین ژمارە (٩٣٩) ساڵی ١٩٤٨

(٣٦) ژیان ژمارە (٤٨٣) ساڵی ١٩٣٦

(٣٧) گۆڤاری گەلاوێژ ت٢ ساڵی ١٩٤٨

(٣٨-٣٩-٤٠) ژیان ژمارە (٤٨٣) ساڵی ١٩٣٦ .

کەوتووی؟! تۆ میهرەبانت تۆراندووە و نەخۆشت خستووە. ئەوەتی هاتۆتەوە ئەگری، کولّی نانیشێتەوە، بۆ جوابت نەداوەتەوە؟! ڕووت نەکردووە بەلایەوە؟ نیشان بەو نیشان ئەو تەلّە ڕیحانەیەی کە لەسەر ئاوەکە لێت بەجێماوە بەتۆراوی بۆی ناردوویەتەوە. ناچار بەو شەوە چووم ئاشتم کردەوە. ئەمەبوو بەسەرمایەی سەودایەک کە ئەوی فێری دلبەری و دلّسۆزی کرد و فەیزی جنوون و زەوقی شیعر پەرستشی جەمالّ و کەمالی دایە من. تا هات ئێمە لێمان زیاد کرد دایک و باوکی هەردوو ڕێی دیدەنییان نەدەبەستین. زاهیر ئێمەیان بۆیەک دانابوو. هەندێ جار کە دەکەوتینە یەک بەدانیشتن و سەرگرشتەی عەشقی پاکی مەعسوومانە بەرامبەری یەک ڕۆژمان لێ دەبووەوە بەدەنگی تەمجید و سەلاوە هەلّدەستاین. نوێژێکی لاهووتیمان دەکرد. هەردووکمان عەشقمان لە وەسلّ پێ خۆشتربوو. گوێم لێ بوو دەستی هەلّبڕی بوو لە خوا دەپاڕایەوە «ئیلاهی ئەم عەشقەمان کۆن نەکەی، عەشقی پاک لە وەسلّی زەهرناک خۆشترە».

ڕۆژێ سەفەرێکم هاتە پێش، لەجێیەکی دوور لە خۆمەوە دلّم داخورپا و خەبەری دا کە میهرەبان سەخلّەتە. هاتمەوە وتیان میهرەبان زۆر نەخۆشە، چووم، لە جێگەدا کەوتبوو، چاوی ئەمەندە گەش و بەپرشنگ بوو زاتم نەدەکرد تێری بڕوانمێ. بەزەردەخەنەیەکی بێ هێز و بێ تینەوە دەستی نایە ناو دەستم. وتی: ئۆخەی عەشقەکەمان کۆن نەبوو وا من بەسۆزی عەشقی تۆوە دەڕۆم، ئەوەندە پێکەوە نەماینەوە کۆن ببم و لەبەرچاوت بکەوم. وەسیەت بێ کە هاتن بمبەن بۆ گردی سەیوان ئەوەلّجار سەری دارەمەیتەکەم تۆ هەلّیگرە و کەدایان هێشتمە (الحد سەرا)ی خاکەوە، سەرم بەدەست تۆوە بێ و کە هاتن سەنگپۆشم کەن تەلّێ ڕیحانە وەک ئەو ڕەشە ڕیحانەیە کە لە کارێزەکەی کانی سپیکە لێت بەجێ مابوو بۆنی عەشقی تۆی لێ دەهات، بەدزیەوە لە ڕاستی دلّم بیخەرە سەر کفنەکەم.

ئۆف!، خدمەتێکی چەن گران و جەرگ سووتانێکی چە ناگەهان ئای، لێرەدا وا دیسان بەندی هەناوم سووتایەوە، برینی کۆنەی دلّم کولایەوە و ئاگر لە کای کۆن بەردرایەوە. ئەوا گوێم لێیە کسپەیەک لە دلّمەوە دێ قەلّەمی دەست و پێم، دەست و پێی قەلّەمم شکا. ئەم بەدبەختییە و هەموو لکێکم لە بیرە ئاخ و داخ! قوەی تەسویری ئەو چاوانەم نییە. ئەم ماجەرایە پەنجا سالّی بەسەرا ڕابوورد لەم یەک دوو ڕۆژەدا لەگەلّ جەنازەیەکی ئازیز ڕێم کەوتە مەلّبەندی میهرەبان. لەناودار ئەرخەوانەکانی گردی ناوەڕاست هێلانەی بەکارەتی ڕۆحی بەنووری لاهووتییەوە دیاربوو. ئەو ئەرخەوانانەم بەخەیالّی گوزەشتە لێ بوو بەسپی چنارەکانی (کانی سپیکە)، ڕۆحم بۆی دەگەڕا. ناگەهان بەبەرگی سپی فریشتەی ئاسمانییەوە هاتە پێش چاوم، لە حالّەتێکی بێ هۆشیدا گوێم لێ بوو بەو دەنگە نازکە بانگی کرد، وەرە، بەسە!! بەگریانەوە دوو فەردی مەولەویم هاتەوە یاد:



بەمەرگت قەسەم، وادەی مەرگم هات
ئەمڕۆ سبەیە، منیش دێمە لات
ڕەشۆلّ قەتاری مردن بەجێیە
ساقی تۆیش جامێ یار چاوەڕێیە[٤١]

# چەند زانیارییەکی نوێ لەبارەی نەورۆز و پیرەمێردەوە

## بەشی یەکەم

لەم کوردەوارییەی ئێمەدا هەتا ئێستە کە باسی نەورۆز دەکرێت ئەوا پیرەمێردمان دێتەوە یاد. پیرەمێرد و نەورۆز و گردی یارە و ئاگری نەورۆز هاوکێشەیەکی وەهایان دروست کردووە یەکتری تەواو دەکەن. ئەوەی کە پەیوەندی بەنەورۆز و پیرەمێردەوە هەیە، هەموو سالّ لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکاندا دەخرێنە پێش چاوی خوێنەران چەند واتایەکی دووبارە بووەوە و جوینەوەی یەکترە. ئێمە لێرەدا هەولّ دەدەین کە هەندێ باس و ڕاستی نوێ بێنینە مەیدانەوە و لە پەنجەرەیەکی کەوە تەماشای ئەو دنیایە بکەین.

### نەورۆز و پیرەمێرد لە پێش سالّی (١٩٠٠)دا و پێش چوونی پیرەمێرد بۆ تورکیا:

کاتێک تۆفیقی مەحموود ئاغای هەمزاغای مەسرەف، نەبووبووە (پیرەمێرد) و پیر نەبووبوو، لاو و بەلّکو مندالّێک بووە، باوکی ناردبوویە بەر خوێندنی ئایینی و لە حوجرەی مەلا حوسێنە گۆجە دەیخوێند. مەلا حوسێن لە نەورۆزدا داوای نەورۆزانەی کردووە کە تۆفیقی منالّ و هاوەلّە قوتابییەکانی بۆی بێنن. جگە لەمەش هەر لەو تەمەنەدا بەکۆمەلّ چوونەتە لای (شێخ ئەوزا سوورەی تۆلّەتوویی) کە دەستخەتی خۆش بووە، نەورۆزنامەی بۆ نووسیونەوە. ئەم یادگارانەی مندالّی لە بیر و مێشک و دەروونی (تۆفیق)دا ماونەتەوە، هەتا گەورە دەبێ و دەچێتە تورکیا و بیست و پێنج سالّ لەوێ دەبێ و دوایی دێتەوە سلێمانی. ئەو کاتە پیر دەبێت و لە سالّی ١٩٣٢دا بۆیەکەمجار[٤٢] نازناوی پیرەمێرد بۆ خۆی هەلّدەبژێرێ. با بزانین خۆی لەم بارەیەوە چی دەلّێ: «مندالّ بووم، لای مەلا حوسێنە گۆجە دەمخوێند، کە گەیشتینە دەمی بەهار مامۆستا ئەیگوت، بچن نەورۆزانە بێنن، ئێمەیش بەسەر دایکمانا ئەگریاین، سا دایک و باوکمان هەرچیان لەدەست بهاتایە، هەرچیان لە بارا بوایە یا چەخی یا قڕانی حەمە شایی یا بە نەبات ئەیاندایني، ئەمانهێنا ئەویش بەشی خۆی لێ هەلّدەگرت، یەکێ قەمەریەکی ئەدایني ئەچووین لە

(٤١) پیرەمێرد دەسکاری ئەو بەیتەی کردوە و ناوی ڕەشۆلّی تیا داناوە!.

(٤٢) پیرەمێرد بۆ یەکەمجار لەگەلّ بلاو کردنەوەی شیعری (بەیانی بوو لەخەو هەستام)دا سالّی ١٩٣٢ نازناوی «پیرەمێرد»ی بۆ خۆی دادەنێت.

مزگەوتی شێخ ئەورەحمانی شێخ ئەبوبەکری شێخ ئەوزا سوورەی تۆڵەتوویی، خەتی خۆش بوو، نەورۆزنامەی بۆ ئەنووسینەوە[٤٣]». کاتێکیش کە سامانێکی زانستی و ڕۆشنبیری لە تورکیا پێکەوە دەنێت و دەگەڕێتەوە، وەک خۆی دەڵێت «بەنیوە خوێندەواری لە سلێمانی دەرچووم و خوێندنێکی بەرزم هێنایەوە[٤٤]». لەو ڕۆژگارەدا کە دەوڵەتی عیراق دروست بوو، خوێندن لە وڵاتی سلێمانیدا لە تورکی و فارسییەوە دەبێ بەکوردی، ئیتر حاجی تۆفیق دەگەڕێتەوە و یاد و بیرەوەری ڕۆژانی نەورۆزی منداڵی خۆی و زیندووکردنەوەی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی نەتەوەکەی لەبیر و خەیاڵدا دەبێت. ئەوەبوو هەر لەسەرەتای ساڵانی ١٩٣٠ەوە بەهۆی دروست بوونی (کۆمەڵەی زانستی)یەوە کە خۆی کوڕگەلی زانستی[٤٥] پێ دەگوت، کەوتە کرد و کۆشی و هەوڵێکی زۆر بۆ ژیاندنەوەی ئەم نەریتە کۆنە و نوێ کردنەوەی بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە لەگەڵ ڕەوتی سەردەمەکەی خۆی بگونجێ. چونکە لای ئەو نەورۆز مانایەکی لەوە گەورەتری هەبووە کە تەنها ئاگرکردنەوە و هەڵپەڕین و ئاهەنگ گێڕان بێت، یا سروود وتن بێت، بەڵکە ئاگرکردنەوە لای ئەو دوو مانای گەورەی هەبووە، یەکەم، گۆڕانی سروشت و نوێ بوونەوە و ژیاندنەوەی خاکی مردوو. تەقینەوەی کارێز و کانی وشک بوو. دووەمیش مەسەلەی ڕووناکی، کە ئەمەیان زۆرتر مەبەستی ئەوە بووە. ڕووناکی کە ڕەمزی پێشکەوتن و بەئاوات گەیشتنی نەتەوەکەی بووە. وەک خۆی دەڵێت: «ئەمەوێ عالەمی مەدەنیەت ئاگادار بکەم کە ئاگری یارەی ئێمە بۆ ئایینی ئاتەشپەرستی نییە، بۆ ئەمەیە کەسەری ساڵی تازە، ڕێی بەختی میللەتەکەم ڕووناک بکەمەوە[٤٦]».

وەک لەمەوپێش نووسیمان بوونی نەورۆز و ئاهەنگ گێڕان و نەورۆزنامە خوێندنەوە بەو بۆنەیەوە هەر لەسەردەمی منداڵییەوە لای پیرەمێرد ژیاوە و لەدڵ و دەروون و بیریدا چەسپاوە، واتە لەو ڕۆژەدا کە لەسەر لووتکەی چیاکان ئاگر کراوەتەوە و نیشان دراوە کە ئەو ڕۆژە ڕۆژی دەستپێکردنی یەکەم ڕۆژی ساڵی نوێی کوردییە. چونکە لە سەردەمانەدا وەک ئێستا خوێندەواری نەبووە هەتا بەهۆی ڕۆژژمێر و ڕادیۆ و هۆکانی ترەوە هەواڵ بگاتە هەموو ناوچەیەکی نزیک و دووری کوردستان وە ڕایبگەیەنن کە یەکەم ڕۆژی ساڵی نوێ دەستی پێ کرد. جگە لەمەش ئەو ئاگرە لەو ڕۆژەدا مانایەکی گەورەتری هەبووە. ئەویش ڕەمز و نیشانەی سەرکەوتنی کاوەی

(٤٣) من و نەورۆز- ژین ژمارە (٧٣٧) ساڵی ١٩٤٤.

(٤٤) دیوانی پیرەمێردی نەمر- محەمەد ڕەسول هاوار ل٢٠.

(٤٥) پیرەمێرد واتای کوڕگەلی زانستی بۆ قوتابیانی قوتابخانەی زانستی بەکاردەهێنا. وەک دەنووسێت «کە مردیشم توخوا کوڕگەلی زانستی کۆن، ڕۆڵەکانی خۆم، لە گردی یارە، ئاگری نەورۆز لەژوور سەرم هەڵگیرسێنن. ئەو ئاگرە ڕووناکی ڕێی ئایندەی کوردە.» ژین ژمارە (٨٢٠).

(٤٦) ژین (٩١٠) ساڵی ١٩٤٨





ئاسنگەری کورد بووە بەسەر ئەژدەهاکی زۆردارا. واتە دوو شۆڕش بووە. شۆڕشی ژیانەوەی سروشت. شۆڕشی کۆمەڵانی خەڵک دژی زۆرداری. جگە لەمانەش پیرەمێرد ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەم جەژنە لە تورکیاش کراوە و لەوێ بەڕۆژێکی پیرۆز دانراوە و بەنیشانەی ساڵی نوێ و نوێ بوونەوەی سروشت بینراوە، دەنووسێت «کاتێکیش چوومە ئەستەموڵ لەسەرای پادشاهیدا ڕۆژی نوێی مارت هەموو (وکەلا و وزەرا) ئەهاتنە (مابەین) تەبریکیان ئەکرد. نیشان بەو نیشان شیرنی نەورۆزیان ئەخوارد و شەوی نەورۆزیش لە هەموو منارەکاندا قەندیلیان دائەگیرساند[٤٧]». ئەگەرچی ژیاندنەوەی ئەم نەریتە نەتەوایەتییە بۆ پیرەمێرد بۆتە مایەی ڕەنج و ئەرک و ماندووبوون و تانە و توانج لێدانی. بەڵام وردە وردە ئەو گیانە خاوێنە سەرکەوت و گیانە خاوێنەکانی (قوتابییانی زانستی)، شوێن کەوت و زیندوویان کردەوە و کردیانەوە بەجەژنی نەتەوایەتی، بڕوانە پیرەمێرد دەنووسێت «ئەم ئاگرکردنەوەی نەورۆزە کە لە پێشدا لەناو ئێمەدا باو بووە، ئێمە تاب و توانا و مەوجودیەتێکی وامان نەمابوو کە هەموو ساڵێ ئاگری نەورۆزی نیشانەی ساڵی تازە بکەینەوە. ئەو ڕۆژە بەجەژن بزانین و سەیرانی تیا بکەین. کاتێ من لە ئەستەموڵ هاتمەوە بەخۆشی خۆشییەوە بیستم ناونیشانێکمان بۆ پەیدا بووە و زبانمان بووە بەکوردی و مەئمورمان لە خۆمانە. ئەوەم بەجەژن زانی و هاتەوە یادم کە ئێمە هەموو ساڵێ جەژنێکی نەورۆزمان بووە و نەورۆزنامەیان بۆ ئەنووسینەوە، بەو یادی گیانی باووباپیرەوە هەڵسام ڕۆڵەی زانستیم پێش خۆم خست و لە گردی یارە شەو ئاگرم هەڵگیرساند و ڕۆژ سەیرانم کرد[٤٨]».

## دووەم: پیرەمێرد لە نێوان ئاگری نەورۆز و تاوانبارکردنی بەلایەنگریی ئینگلیزەکان

پێش ئەوەی بێمە سەر ئەوەی ئەو ڕاستیانە ڕوون بکەمەوە کە دەیسەلمێنێ نەورۆز و پیرەمێرد هیچ پەیوەندی بەسیاسەتی ئینگلیزەوە نەبووە، پێویستە بڵێین، کە پیرەمێرد هەمیشە لە بارێکی ئابووری نزم و ژیانێکی کولەمەرگیدا دەژیا، مرۆڤێک بووە تەنها پیاوی بیروباوەڕ و خەیاڵی شاعیرانەی خۆی بووە. تەنانەت چەند جارێک دەفتەری مووچەی خانەنشینییەکەی خۆی و خانووەکەی خستۆتە بارمتەی پارەیەکەوە کە پێویستی چاپخانە و ڕۆژنامەکەی پێ دابین بکات و پەکیان نەکەوێت لەسەرێکی تریشەوە ئەوەندە نەدارا و کەمدەست بووە، بەجۆرێک کە چەند زاتێک جلوبەرگیان بۆ ناردووە لەبەری بکات. چونکە ئەو کاتە بەهۆی دواکەوتوویی کۆمەڵەوە جگە لەوەی پارەی ئابوونەی ڕۆژنامەکەیان بۆ نەدەنارد توانجیشیان تێ دەگرت. بزانە خۆی چی

(٤٧) سەرچاوەی دووەم.

(٤٨) سەرچاوەی پێنجەم.

دەنووسێت «من ئەگەر لە شوێن پارە بگەڕامایە پارەم بۆ خۆم ئەویست، بەسەر خەڵکا دابەشم نەئەکرد و خۆم پێنج ساڵە جلەکۆنی خەڵاتی زاتێکم نەدەپۆشی!! من لەوانەم کە پارەی ئابوونەیشم لەوانە نەویستووە، ئا بۆ ڕۆژێکی وا کەسەر بۆ کەس دانەنەوێنم، لە شوێنم ئەگەڕێن، بەڵام کاتێک بۆم ئەگرین، کە تێپەڕیوم!!؟»(٤٩). دیارە ئەگەر پیرەمێرد بەڕێ و ڕەسم و ویست و مەبەستی ئینگلیزەکانی بکردایە هەرگیز وەها نەدار و کەمدەست و هەژار نەدەبوو. یاخود زۆر بەئاسانی دەیتوانی هەر لە سلێمانیدا ببێتە کاربەدەستێکی باڵای حکومەتی بەریتانی و لەوپەڕی ئاسوودەیی و خۆشیدا بژی و پارە و سامانێکی زۆریش پێکەوە بنێ. بەڵام ئەو تەنها بەوە ڕازی بوو کە خۆی بەو شێوەیە دەژی و گەورەترین سامان لای ئەو خزمەت کردنی نەتەوەکەی بوو. لەم بارەیەوە دەنووسێت «لام وایە ئەوانەی من بەتەرەفداریی ئینگلیز دەزانن لەم دواییەدا تێم گەیشتوون کە من ئینگلیزم بۆ خۆم خۆش ناوێ و هەرچی مەنفەعەتی شەخسی و (تخصیصات) و تەنانەت پارەی ئابوونەیشم لەوان نەویستووە و نایشمەوێ. تەنها بۆ ئەمە کە لە ڕەوشت و ئەخلاقی ئەوان دەرسێکی ئیدارە وەرگرین و پەیڕەوی ئادابی ئەوان بکەین، هیچ نەبێ لەناو خۆمانا یەکیەتی و هاوبەشیەکی وامان هەبێ کە لە پیاو بچین!؟»(٥٠).

لەو کاتانەدا کە پیرەمێردی نەمر عاشقی خزمەتکردن و تێکۆشانی نەپساو خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو، بۆ هەڵگیرساندنی ئاگری نەورۆز، خەڵکانی کۆنەپەرست و خاوەن بیری دواکەوتوو یاخود ئەوانەی کە خۆیان مایەپووچ و هیچ لە بارا نەبوو بوون دەیانویست بەتوانج گرتنە پیرەمێرد و تاوانبارکردنی بەپیاوی ئینگلیز و ئاگرپەرستی هەم خۆیان لەسەرشانی پیرەمێرد بەرز بکەنەوە و هەم پەکی خزمەت کردنی ئەویش بخەن. بەڵام ئەو نەبەزیوە و ئاگری نەورۆزی خۆی هەرکردۆتەوە. لەم بارەیەوە پیرەمێرد بەچەند شتێک تاوانبار کراوە، کە وەڵامی ڕاستیان دەدەینەوە.

١- پەیوەندی ئاگرکردنەوەی پیرەمێرد بەمەسەلەی ئایینی ئاگرپەرستییەوە! لە وەڵامی ئەم تۆمەتەدا دەڵێین پیرەمێرد لەمەبەست و ڕەمزی ڕووناکی ئاگر ئەوەی ویستووە کە گەواهێک بێ بۆ ڕووناکی دواڕۆژی نەتەوەکەی. ڕەمزێکی گەورەی مرۆڤانە، شاعیر و ئەدیبانە، کە دیارە ئاگر ڕووناکی دەبەخشێ و شەوی نەزانی و دواکەوتن لەناو دەبات. لەم بارەوە دەڵێت «ئەم پیرە کە هەموو ساڵێ ئاگری نەورۆز ئەکاتەوە، پەیڕەوی باوو باپیرە بەبلێسەی ئاگری چیاکان ڕاگوزەری ئایندەکان ڕووناک ئەکاتەوە»(٥١). لە جێگەیەکی کەدا بۆ ڕوون کردنەوەی

(٤٩) ئامۆژگاری پیران ژمارە(٩٠٩)ی ژین، ساڵی ١٩٤٨ .

(٥٠) ژین ژ. (١٠٠١) ساڵی ١٩٥٠

(٥١) ژین ژ. (٣٥٨) ساڵی ١٩٣٣



مەبەستی ئاگرکردنەوە و پەیوەندی نەبوونی نەورۆز بەهیچ ئاینێکەوە دەنووسێت «ئەمە دەخلێکی بەئاتەشپەرستییەوە نییە. هەموو، ئەوی ئەمناسێ ئەزانێ کە موسوڵمانم، خواپەرستم و بەهەوا خواهی هیچ دەوڵەتێک و حکومەتێکم نەکردووە»(٥٢).

٢- بەوە تاوانبار کراوە کە ئاگری نەورۆز فەرمانێکە لە دەسەڵاتدارێتی ئینگلیزەکانەوە بۆی دێت و ئەم دەبێ بەگوێی ئەوان بکات!.

وەڵام: پیرەمێرد نەیتوانیوە ڕاستەوخۆ بەربەرەکانێ و بەرهەڵستی دەسەڵاتدارێتی ئینگلیزەکان بکات. بەڵام ئەگەر بەوریایی لە شیعر و نووسینەکانی ورد بینەوە دەبینین زۆر لەو کەسانە ئازاتر و ڕاپەڕیوتر بووە دژی ئینگلیزەکان کە ئەمیان بەئینگلیزچییەتی تاوانبار کردووە. تەنانەت زۆر لەوانە کوردتر و خزمەتگوزارتر بووە. بڕوانە دەڵێت:

ئەگینە من خۆم لەکێ دادمە
نان و کەبابێ سەر و زیادمە(٥٣)

یاخود:

ئەگەر تەڵقینم بەکوردی نەدرێ
گوێی لێ ناگرم با کفنم بدڕێ
ئەمە دینمە دینێکی بەهەق
لەسەر بەیتی خۆم ئەگەر بکرێم شەق(٥٤)

یاخود دەنووسێت: «هەندێک وتبوویان ئەمە بۆ ئینگلیزەکان ئەکا، ئەمە لە کفری ئاتەشپەرستی کفرترە. ئینگلیز چە دەخلێکی بەنەورۆزەوە هەیە؟!. یاخود من کەی لە خوانی مووچەی ئینگلیز نیعمەت خۆر بووم؟!»(٥٥). پیرەمێرد لە جێگایەکی کەدا بەئاشکرا پەردە لە ڕووی ئەوانە هەڵدەماڵێ کە دژی نەورۆزی ئەم وەستاونەوە ویستوویانە خۆیان ئاهەنگی نەورۆز بکەن و ئاگر بکەنەوە. پارەیەکی زۆریان بەم بۆنەیەوە کۆکردۆتەوە و دواییش نە پارەکە شوێنەواری ماوە و نە ئاگر!! ئاهەنگی نەورۆزیش دەنگ و ڕەنگی نەبوو!!، سەبارەت بەو کەسانە دەڵێت «هەموو ساڵێک هەر چیم دەست ئەکەوت ئەمکرد بەسەیرانی نەورۆز، کە تا ئێستا کەس ئەوەی نەکردووە. ئەمە بۆ ناو و شۆرەتێکی کوردەواری بوو، بەهیچ وازم نەهێنا، تا پار هەندێ بێ ناموس و زۆڵی

(٥٢) سەرچاوەی ژمارە پێنج.

(٥٣) پیرەمێردی نەمر م. هاوار ل٣١.

(٥٤) هەمان سەرچاوە.

(٥٥) سەرچاوەی ژمارە پێنج

بەرو هەڵسان وتیان حاجی تۆفیق نەورۆز بۆ ئینگلیز ئەکا!!. ئێمە نایەڵێن ئەو بیکا و خۆمان ئەیکەین، پارەیەکی زۆریان کۆکردەوە، نیوەیان خوارد و پەکی سەیرانی منیشیان خست»[٥٦].

٣- بەوە تاوانبار کراوە کە پیرەمێرد ئاهەنگ و ئاگری نەورۆز بەمەبەست و ئارەزووی ئێران ساز دەکات، لە وەڵامدا ئەڵێین: لە ساڵانی ١٩٤٠دا قونسڵی ئێران لە سلێمانی بووە، ئەم قونسڵە زۆر لە نزیکەوە هاورێ و هاوەڵی پیرەمێرد بووە، کە تایبەتی پیرەمێرد فارسییەکی باشی زانیوە و شیعریشی پێ نووسیوە. بەڵام کاتێک هاتۆتە سەر ئەوەی ئاگری نەورۆز بکاتەوە، بەهیچ جۆرێ ماوەی نەداوە کە ئەو قونسڵەی ئێران توخنی ئەم مەسەلەیە کەوێ، نەوەک لەلای خەڵکی ئەمەش وەک مەسەلەی ئینگلیزەکەی لێ بێت!!. خۆی دەڵێت «تەنانەت دۆستێکی گیانیم لێرە قونسڵی ئێران بوو، نەمهێشت بێتە سەیرانەکەم نەک بڵێن، ئەمە بەهەوای ئێرانەوەیە!!»[٥٧].

## بەشی دووەم

### لێکدانەوە زانستییەکانی پیرەمێرد بۆ نەورۆز

### یەکەم: باوکی باڵا و دایکی خوارەوە:

نەورۆز بەلای پیرەمێردەوە تەنها کردنەوەی ئاگرێک و گێرانی ئاهەنگێک نەبووە، بەڵکو شتێکی لەوە گەورەتر بووە. لای ئەو هاوکێشەی مەرگ و ژیانەوەی وەرگرتووە. لەلایەکەوە سروشتی مردوو ژیاوەتەوە، لەلایەکی تریشەوە ڕەمزی شۆڕش و ڕزگاربوونی گەل بووە. لایەنی سێیەمیش کە زۆر گرنگە و لێرەدا دەمانەوێ ڕوونی بکەینەوە لێکدانەوەی ئەو بۆچوون و زانیاریانەن کە بەپێی ڕادەی ڕۆشنبیری خۆی پیرەمێرد بەدەستی هێناوە. لەسەرەتادا نووسیمان باوکی باڵا و دایکی خوارەوە، بۆ لێکدانەوەی ئەم واتایە پێویستە بڵێین، پیرەمێرد بەپێی ئایینە کۆنەکان کە دیاریان کردووە لە بوون و دروست بوونی مرۆڤی ڕوانیوە. بیروڕای ئەوانی خستۆتە ڕوو کە مرۆڤ لە چوار (عونسور) گەوهەر پێک هاتووە، ئاگر، با، ئاو، خاک، کە ئەمانە دایکی خوارەوەن وە زیندوویێتی سروشت لەوانە پێک دێت. ئاو لە خاکدا ژیان دروست دەکات. درەخت و میوە و کشتوکاڵ و خواردەمەنی مرۆڤی لێوە پێک دێت. وە هیچیان بێ ئەوەی کەیان نابێت. واتە نە ئاو بێ خاک سوودی دەبێ، نە خاکیش بەبێ ئاو بەرهەمی دەبێ. پیرەمێرد دەنووسێت «بە تووبی کۆن ئادەمیزاد لە چوار گەوهەر سروشتی دراوە. ئاگر، با، ئاو، خاک. دوانیان ئاگر و با، باوکی باڵان، دوانیشیان ئاو و خاک دایکی خوارەوەن»[٥٨].

### دووەم: ئاگری نەورۆز پەیوەندی بەزەردەشتەوە نییە:

پیرەمێرد بۆمانی ساغ دەکاتەوە کە تۆمەتی ئاگری نەورۆز و ئاگرپەرستی و ئایینی زەردەشت بەتاڵە و ئەمانە هیچیان پەیوەندیان پێکەوە نییە. زەردەشت یەکێک بووە لە نێردراوەکانی خوا و (ئاوێستا) باسی تەنهایی خوا و دەسەڵاتی دەکات و زەردەشت خوای پەرستووە، نەک ئاگر!. دەنووسێت بەتەئریخ سابیتە ئەم ئاگری نەورۆزە ئەساسی زەردەشتیی نییە و زەردەشت ئاتەشپەرست نەبووە. پێغەمبەرێکی ڕاست و دروست و (موحد) عەینی دینی موبینی ئێستای ئێمە کە محەممەد(ص) بۆی داناوین، ئەشوبهێتە ئێمە و ئەمەیش بە (گات) و کتێبەکانی (زەند)دا ئاوێستای سابیتە»[٥٩]. لە شوێنێکی کەدا پیرەمێرد باسی ئەوە دەکات کە گاتەکانی زەردەشت دۆزراونەتەوە و زەردەشت یەکێک بووە لە نێردراوەکانی یەزدان و لەپێش پەیامبەران (عیسا و موسا)دا بوە و، بەڵام ئایینی ئیسلام دوا ئایینی یەزدانی بووە، کە خوا بۆ مرۆڤی ناردووە. پیرەمێرد ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە زەردەشت خواپەرست بووە و ئاگرپەرست نەبووە. خوای بەتاک و تەنیا زانیوە و سەرچاوەی ئایینەکەی لە سروش (وەحی) ئەوەوە وەرگرتووە و زەردەشت نەورۆزی بەسەری ساڵ داناوە. ئیتر ئەمە هیچ پەیوەندی بەئاگر و ئاگری نەورۆزەوە نییە. دەنووسێت: «زەردەشت وەک هەندێ گومانیان بردوە ئاگرپەرست نییە، پێغەمبەرێکە یەزدانپەرست، خوا بەیەک ئەناسێ»[٦٠]. دوای ئەمە زیاتر لەسەر مەسەلەی زەردەشت و نەورۆز قووڵ دەبێتەوە و لایەنێکی ڕووناکتر دەسەلمێنێ و دەڵێت «باووباپیرمان، ئەم ئایینە کە خوا بەرۆژێکی موبارەکی داوە، زیندەگی تیا بەخشیوە بەجەژنیان داناوە نەک بەئایینی زەردەشتی»[٦١].

### سێیەم: لێکدانەوەی ئەستێرەناسی (فەلەکی) و زانستی سەبارەت بەنەورۆز:

پیرەمێرد ئەوەی سەلماندووە بەپێی لێکدانەوەی زانستیانەی کۆن (کەلووی بەرخ) واتا (برج الحمل)ی کردووە بەنیشانە واتا ئەو ڕۆژەی کە (خۆر) دەچێتە کەلووی بەرخەوە سەری ساڵی نوێیە ساڵێک دوانزە کەلووە. دوانزە (برج)ە. هەر مانگە لە بورجێکەوە هەڵدێ. ساڵێک دوانزە مانگە. هەر مانگێکی بە (٣٠) ڕۆژ داناوە. هەر بورجێ سێ ڕێبازی هەیە. کاتێ خۆر چووە

(٥٦) ژین ژ. (٩٥٨) ساڵی ١٩٤٩

(٥٧) ژین ژ. (٩١٠) ساڵی ١٩٤٨

(٥٨) ژین ژ . (٥٢٠) ساڵی ١٩٣٧

(٥٩) نەورۆزی ئێمە چییە؟ ژین ژ. (٥٦٠) ساڵی ١٩٣٩

(٦٠) سەرچاوەی ژمارە (١٠)

(٦١) هەمان سەرچاوە

کەلووی بەرخەوە ئەبێ بەسەری ساڵی نوێی ڕۆژهەڵات. هەر مانگە لە بورجێکەوە هەڵدێ و هەر ڕۆژە بەڕێیەکدا دەڕوا، واتە هەڵدێ و ئاوا دەبێت. دیارە سروشت دەژیەتەوە و وەک وتراوە (يحيي الأرض بعد موتها) پیرەمێرد ئەم لێکدانەوەیەی لە چەند سەرچاوەیەکەوە وەرگرتووە. وەک (نص)ی قورئان (حسابی) یوشع پێغەمبەر، شیسی کوڕی ئادەم، ئیدریس پێغەمبەر. هەریەک لە پێش ئیسلامدا نێردراوی خوا بوون. لێرەدا دەقی لێکدانەوەکەی پیرەمێرد دەنووسین «ڕۆژ ئەچێتە کەلووی بەرخەوە و ئەبێ بەسەری ساڵی تازەی ڕۆژهەڵات. گوایە ئاسمان دوانزە کەلووی تیایە، هەر کەلوویەک سێ ڕێبازی هەیە، هەر مانگە لە کەلوویەکەوە هەڵدێ و هەر ڕۆژە بەڕێبازێکا ئەڕوا. بەساڵێ ئەو دوانزە کەلووە ئەو (٣٦٥) ڕێبازە ئەبڕێ. لە پێشدا شیسی کوڕی ئادەم کە پێغەمبەرێکە کردوویە بەساڵنما و دایناوە. دوای ئەو ئیدریس پێغەمبەر بووە»[٦٢].

## چوارەم: بەرانبەر وەستانی شەو و ڕۆژ:

پیرەمێرد سەلماندوویە کە بەرانبەر وەستانی کات و ماوەی شەو و ڕۆژ لە پایزدا وە دانانی ئەم بەرانبەر وەستان بەسەری ساڵ هەڵەیە و لە ڕاستییەوە دوورە. لای ئەو بەهار ژیانە و پایز مەرگ. لای ئەو یەکەم ڕۆژی بەهار کە نەورۆزە شەو و ڕۆژ بەرانبەر یەک دەوەستێ و دەبێتە سەری ساڵ. لەم ڕووەوە دەڵێت: «ئەوانەی کە شەو و ڕۆژ بەرانبەر وەستانی پایز بەسەری ساڵ دائەنێن نادروستە. بەهار زیندەگی و پایز مەرگ ئەنوێنن. ئەم نەورۆزە کە سەری ساڵی ڕاستییە و سەرەتای بەهارە کە زەمین و زمان زیندوو ئەبێتەوە و شەو و ڕۆژ بەرانبەر ئەوەستێ[٦٣]».

## دواجار: وێنەیەک لە خەم و ئازارەکانی ئەم مرۆڤە:

لەنەورۆزی ساڵی ١٩٤٩دا داخ لە دڵیی کۆنەپەرستان و زمان خراپی هەندێ گێرەشێوێن، دەبنە هۆی ئەوەی میریی ئەو کاتە هان بدەن نەورۆز لە پیرەمێرد قەدەغە بکەن. ئەویش بەتۆمەتی ئاگرپەرستی و پشتکردنە ئایینی ئیسلام. ساڵی ١٩٤٩ چووە ڕیزی ئەو چەند ساڵەوە کە نەورۆزیان لە کورد و پیرەمێرد قەدەغە کرد. دیارە هەڵوێستی شاعیر و پیری هەشتاو دوو ساڵە و بێ پشتگیریی و بێکەسیی وای کرد کە تەنها ئەم ڕق و نارەزاییەی خۆی بەشیعر دەربڕێ. کە ئاگریان کوژاندەوە و هەڕەشەی داخستنی چاپخانەکەشیان لێ کرد، ئەم شیعرەی نووسی:

کاری ناچارییە، بێزار لە شەوی ئەم شارەم
چەند ڕۆژێکە بەتۆراوی لە گەردی یارەم
گەردی یارە وەک ئاتەشکەدەی نەورۆز بوو
وا کوژاندیانەوە سووتاوی گڕی ئەو نارەم

(٦٢) هەمان سەرچاوە
(٦٣) هەمان سەرچاوە



کەس نییە هاودەمی ناڵەی شەو بێداریم بێ
باری زۆر قورس بووە، دەربەستی ئەڵێ بێچارەم
کردەوەی خۆمم ئەزانی، کە نەتیجەی وایە
ئێستە ڕابوردووە فایدەی چییە، ئەم هاوارەم![٦٤]

## پیرەمێرد و ڕۆژنامەی «کورد»:

«ڕۆژنامەی کورد وەک لەم لێکۆڵینەوەیەدا ساغ دەبێتەوە دووەم ڕۆژنامەیە لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا».

## سەرەتایەکی مێژوویی:

دیارە دەرچوونی هەر ڕۆژنامەیەک و لەهەمان کاتیشدا داخستنی ڕاستەوخۆ پەیوەندی هەیە بەبارێکی سیاسی و ڕۆژگارێکی تایبەتییەوە، وە هەر ڕۆژنامەیەک ڕەنگدانەوەی تاکتیک و ستراتیژی دەسەڵاتی کۆمەڵ و دەستە و تاقم و حزبێکی سیاسییە. ئنجا ئەو نووسینانە لە هەچ بوارێکی ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتیدا بێت، لە خزمەتی ئەو لایەنەدا دەبێت کە ڕۆژنامەکە دەبات بەڕێوە و هەموو ئەرک و لێپرسراویەکی دەخاتە ئەستۆی خۆی. لەسەرەتای ئەم سەدەی بیستەمەدا کاتێک دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمید لەلایەن تورکە لاوەکان و دواییش (حزبی اتحاد و ترقی)یەوە لەناوچوو، کەش و بارێکی جیاواز لەوی پێشوو هاتە پێشەوە. دەسەڵاتی گرتن و زۆرداری سوڵتان لەسەر هەموو نەتەوەکانی ناو سنووری تورکیا نەما و سەردەمێک لەسەربەستی دەربڕین و داوای سەربەخۆیی نەتەوەیی و هەموو جۆرە سەربەستییەک بۆ ئەو نەتەوانە دروست بوو.

## سەبارەت بە ڕۆژنامەی (کورد) و کۆمەڵەی کورد:

لاوە ڕۆشنبیر و دڵسۆزە کوردەکانی ئەو سەردەمەی تورکیا کەوتنە خۆیان و لە ساڵی ١٩٠٨دا یەکەم کۆمەڵەی سیاسی کوردییان لە تورکیا ئاشکرا کرد. ئەو کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٠٧دا لەسەردەمی دەسەڵاتی سوڵتان (عەبدولحەمید)دا بەنهێنی دروست کرابوو وە کاری دەکرد. ناوی تەواوی ئەو کۆمەڵەیە (کۆمەڵەی هاوکاری و پێشخستنی کورد - کورد تعاون و ترقی

(٦٤) ژین ژ. (٩٥٨) ساڵی ١٩٤٩

جمعيتى)[٦٥] بوو.

ئەمین زەکی بەگ، دەڵێت: «ئەوەڵ جەمعیەتی سیاسی کورد (کورد تعالی و ترقی جمعیتی)یە و لە ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٩٠٨دا دامەزرا. مۆئەسیسەکانی ئەمین عالی بەدرخان، فەریق شەریف پاشا، شێخ عوبەیدوڵلا زادە، شێخ عەبدولقادر ئەفەندی)[٦٦].

هەتا ئێستا گەلێ سەرچاوە باسی دروست بوونی ئەم کۆمەڵە و ئەندامانی کردووە. حاجی تۆفیق بەگ واتە (پیرەمێرد) و عەبدولڕەحمان بەدرخان و سەعید کوردی و ڕەشید بەگی موفتی زادە و ئیسماعیل حەقی بابان و ئەحمەد جەمیل پاشا و سەدەها لاوی ڕۆشنبیر و دڵسۆزی ئەم کاتە لە هەمووولایەکی تورکیاوە بوونە ئەندامی ئەم جەمعیەتە. لە هەموو شارەکانی کوردستانی تورکیا لقی ئەم کۆمەڵەیە کرایەوە. بەتایبەتی لە شارەکانی دیاربەکر و بتلیس و موش. ئەم جەمعیەتە یەکەم کاری ئەوەبوو لە شاری ئەستەموڵدا لە ڕێکەوتی ٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٠٨دا یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردی بڵاو کردەوە. ناونیشانی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکە بەم جۆرە نووسرابوو (کورد تەعاون و ترقی جەمعیەتی غەزەتەسی). بەڵام بەناوی ڕۆژنامەی کوردەوە ناو ئەبرا. ئەم ڕۆژنامەیە هەفتەی جارێک بەکوردی و تورکی بڵاو دەکرایەوە، دەگەیشتە هەموو شارەکانی کوردستانی تورکیا. هەشت لاپەڕە بوو. خاوەنی ئیمتیازی پارێزەر و ڕۆژنامەنووس (توفیگ بەگ) بوو. کە حاجی تۆفیقی پیرەمێردە. ئەو کاتە هەتا نەهاتبووەوە، سلێمانی نازناوی (پیرەمێرد)ی لە خۆی نەنابوو[٦٧]. بەڵکە ناوی تۆفیق بەگ لەسەر ڕۆژنامەکە نووسرابوو. سەرنووسەری ئەم ڕۆژنامەیەش ئەحمەد جەمیل پاشا[٦٨] بوو. تەمەنی ڕۆژنامەکە هەشت مانگ بووە. لە ٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٠٨ەوە دەرچووە هەتا مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٠٩، کاتێک جەمعیەتی کورد قەدەغە کرا و ڕۆژنامەی «کورد»یش کە دەنگی ئەو کۆمەڵەیە بوو داخرا، چاپخانەکەشی لەلایەن دەسەڵاتدارێتی تورکیاوە دەستی بەسەرا گیرا. بەو حسابەی کە ئەم ڕۆژنامەیە لە ماوەی ئەو هەشت مانگە، هەفتانە، کە دەرچووبێت، ئەوا (٣٢)

(٦٥) لە ژمارە ٣٢ی مانگی مایسی ساڵی ١٩٨٥ی گۆڤاری کارواندا بەڕێز دکتۆر جەبار قادر باسێکی دەربارەی ئەم ڕۆژنامەیە بڵاو کردەوە. ئێمە پێشتر ئەم لێکۆڵینەوەی خۆمان نووسیبوو. چەند ساڵێک لە نێوان گۆڤاری (بەیان و ڕۆژنامەی هاوکاری)دا هاتوچۆی کرد و دوایش هەر بڵاو نەبووەوە هەتا بەڕێکەوت لە ژمارە ١١٧ی ساڵی ١٩٨٦دا بڵاو بووەوە. لە نووسینەوەی ئەم نوسخەیەی باسەکەدا سوودمان لەو نووسینەی دکتۆر جەبار وەرگرت.

(٦٦) ئەمین زەکی بەگ (کورد و کوردستان) ساڵی ١٩٣١ ل ٣١٤.

(٦٧) حاجی تۆفیق بەگ، بۆ یەکەمجار لە ژمارە (٣١٢)ی ٢٥ی شوباتی ساڵی ١٩٣٢ی ڕۆژنامەی (ژیان)دا، لەگەڵ بڵاو کردنەوەی شیعری، (بەیانی بوو لەخەم هەستام)دا نازناوی پیرەمێردی بۆ خۆی دانا.

(٦٨) ئەحمەد جەمیل پاشا برای ئەکرەم و قەدری جەمیل پاشایە.



ژمارەی لێ دەرچووە. بەڵام نووسەری ئەرمەنی (شاهبازیان) لە کتێبەکەیدا (مێژووی کورد و ئەرمەن)[٦٩] کە ساڵی ١٩١١ لە ئەستەموڵ چاپکراوە باسی بابەت و ناوەڕۆکی شەش ژمارەی ئەم ڕۆژنامەیە دەکات. دیارە کە شاهبازیان تەنها ئەو شەش ژمارەی لێ بینیوە.

کاتێ کە شۆڕشی ١٩٠٨ بەرپابوو وە سەرکەوتنی بەدەست هێنا، کوردەکان، بەتایبەتی ڕۆشنبیرەکان دەورێکی گەورەیان بینی، شێخ عەبدولقادری شێخ عوبێدوڵلا لە ئەنجوومەنی نوێی شۆڕشەکەدا کرا بەسەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران (رئيس مجلس النواب). کە ئەمە دیارە بۆ کوردێکی خاوەن دەسەڵات بەدەسکەوتێکی باش دەگەڕێتەوە بۆ میللەتەکەی کە تا ئەو کاتە سەربەستی و ڕزگاری بەخۆیەوە نەدیبوو، هەروەها کوردێکی دڵسۆز و ڕۆشنبیری تر کە (ئیسماعیل حەقی بابان) بوو کرا بەوەزیری مەعارف. پەروەردە و فێرکردنی تورکیا. ئنجا کە هەریەک لە خاوەنی ئەم دوو دەسەڵاتە گەورە و فراوانە دوو کوردی دڵسۆز و دوو ئەندامی چالاکی (کۆمەڵەی کورد) بن، دیارە دەبێ پەرەگرتن و بڵاوبوونەوەی لقەکانی ئەو کۆمەڵەیە پەرە بستێنێ. وە دەرچوونی ڕۆژنامەیەکیش لەلایەن ئەو کۆمەڵەوە شتێکی ئاسان و لەبار بێت.

جگە لە کتێبی (مێژووی کورد و ئەرمەن) و ئەو گۆڤارە فەرەنسییەی کە ساڵی ١٩١١[٧٠] باسی ڕۆژنامەی (کورد)ی کردووە، گەلێک بەڵگە و سەرچاوە لەبەردەستی ئێمەدان کە ڕۆشناییەکی زۆر دەخەنە سەر گەلێ لایەنی ئەم ڕۆژنامەیە.

ڕۆژهەڵاتناس (مینورسکی) ١٨٧٧-١٩٦٦، لە کتێبەکەیدا بەناوی کوردەوە، لە پاش باسکردنی ڕۆژنامەی «کوردستان-١٨٩٨»، کە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردییە دەڵێت: «ڕۆژنامەی دووەم دوای شۆڕشی تورکی دامەزراوە. شێخ عەبدولقادر دایمەزراندووە. بەڵام زۆری نەخایاندووە»[٧١]. لێرەدا مینورسکی چوار زانیاری بەسوودمان پێ دەبەخشێ.

١- ڕۆژنامەکەی بەدووەم ڕۆژنامە داناوە، دوای ڕۆژنامەی کوردستان.

٢- نووسیویە، دوای شۆڕشی تورکی دامەزراوە کە دیارە شۆڕشی مەشرووتەی ساڵی ١٩٠٨ی تورکە لاوەکانە.

٣- باسی ئەوەی کردووە، کە شێخ عەبدولقادر دایمەزراندووە. واتە ڕۆژنامەکە لەلایەن ئەو کۆمەڵەیەوە دەرچووە کە شێخ عەبدولقادر دایمەزراندووە و سەرکردەیی دەکرد.

٤- نووسیویە، زۆری نەخایاندووە، دیارە ئەمەی لە خۆیەوە نەوتووە و پشتی بەسەرچاوە

(٦٩) د. جەبار قادر ڕۆژنامەی کورد (کاروان) ژمارە ٣٢ ساڵی ١٩٨٥.

(٧٠) هەمان سەرچاوە.

(٧١) مینورسکی، کورد ل ٩٤ د. مارف خەزنەدار کردوویە بەعەرەبی. حەمە سەعید حەمە کەریم کردوویە بەکوردی. ساڵی ١٩٨٤.

بەستووە. ئەگەرچی ناویشی نەهێناوە.

هەروەها ڕۆژهەڵاتناس (م.س.لازەریف) لە کتێبەکەیدا مەسەلەی کورد لەلاپەڕە ١٤٥، هەتا ٤٠٤، باسی ئەوە دەکات کە ڕۆژنامەی (کورد) و زانیاری دەربارەی، لە ئارشیفی کتێبخانەی «باسیل نیکیتین»دا هەیە. هەروەها دکتۆر (م.س.لازەریف) دەڵێت: «لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی ١٩٠٨[٧٢] بەهارێکی کورت لە ژیانی کورددا دەستی پێکرد. بۆ یەکەمجار مێژووی کورد چەند کۆمەڵ و دەزگایەکی ڕووناکبیری و سیاسی بەخۆیەوە بینی»[٧٣].

پایزی ساڵی ١٩٠٨ واتە یەکسەر دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ناوبراو ئەمین عالی بەدرخان و شەریف پاشا و شێخ عەبدولقادری شەمزینی و ژمارەیەک سەرداری ناسراوی تر کۆمەڵی تەعالی و ترقی کوردستانیان دامەزراند و بەناویەوە (کورد تەعاون وە تەرەقی غەزەتەسی)یان بڵاو کردەوە»[٧٤].

هەروەها ئەگەر دڵسۆزێکی ڕۆشنبیری کورد ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕێی بکەوێتە ئەو ئارشیفەی (باسیل نیکیتین) دیارە گەلێ زانیاری لە بیرکراومان بۆ دەدۆزێتەوە سەبارەت بەڕۆژنامەکە.

ئێمە نووسیمان کە (تۆفیق بەگ) واتە پیرەمێردی نەمر ئەو کاتە خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی (کورد) بووە. لێرەدا پێویستمان بەبەڵگەی زانستی و مێژوویی هەیە بۆ ئەمە و باسەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

وەک ڕەفیق حیلمی دەڵێت: «پیرەمێرد لە کلیەی حقوقی ئەستەمۆڵ دیپلۆمی وەرگرتووە. ئەندامی مەجلیسی عالی ئەستانە بوە»[٧٥]. ئنجا ئەم بروانامەیە ڕێگەی بۆ خۆش کردووە کە بتوانێت ئیمتیازی ڕۆژنامە وەرگرێت. ساڵی ١٩٠٦ هەتا ١٩٠٧ ئیمتیازی گۆڤاری (ڕەسملی کتاب)[٧٦] وەردەگرێت. دوای ئەوەش لە شۆڕشی ١٩٠٨ کە خۆی یەکێک بوو لە ئەندامانی کۆمەڵەی کورد ئیمتیازی ڕۆژنامەی (کورد)ی وەرگرت. عەلائەددین سەجادی دەڵێت: «ڕۆژنامەیەکی کوردیان دەرهێناوە ناوی (کورد) بووە. ئیمتیازی بەناوی ئەمەوە بووە.»[٧٧] بۆ

(٧٢) شۆڕشی ١٩٠٨ بەم ناوانە ناودەبرێت: شۆڕشی تورکانی لاو، شۆڕشی لاوە تورکەکان، شۆڕشی مەشرووتە، شۆڕشی ئیتحادیە تورکەکان.
(٧٣) تێگەیشتنی ڕاستی د. کەمال مەزهەر. ل ٧٤ ساڵی ١٩٧٨
(٧٤) هەمان سەرچاوە ل٧٣
(٧٥) شیعر و ئەدەبیاتی کوردی ڕەفیق حیلمی. باسی پیرەمێرد ساڵی ١٩٤١
(٧٦) پیرەمێردی نەمر محەمەد ڕەسوڵ هاوار ل ١٤ ساڵی ١٩٧٠.
(٧٧) مێژووی ئەدەبی کوردی عەلائەددین سجادی ل ٤٥٨ ساڵی ١٩٧١.



ڕاستی مەسەلەی پیرەمێرد و ئیمتیازی ڕۆژنامەکە پشت بەچەند بەڵگەیەک دەبەستین کە تۆفیق بەگی ئەوێ و پیرەمێردی لەمەڕ خۆمان بۆی نووسیوین پیرەمێرد دەنووسێت:

١- ئێستا خوا دەرووی لێ کردووینەوە، گۆڤار و کڵێشە و چاپ کەوتۆتە ناومان. نۆبەرەی غەزەتەمان لە ئەستەمۆڵ غەزەتەی (کورد) بوو، کە ئیمتیازەکەی بەر من کەوت[٧٨].

٢- لە ئەستەمۆڵ غەزەتەی «کورد»م دەرئەهێنا[٧٩].

٣- دوای ئەوەی کە لە ئەستەمۆڵ غەزەتەچی بووم، بیست ساڵیشە لە نیشتمانەکەی خۆم کە (عیراق)ە صحفیم[٨٠].

٤- لە پایتەختیدا (ئەستەمۆڵ) غەزەتەی کوردم دەردەکرد و لە غەزەتەی (محیط مصور)ی میسردا وتارم ئەنووسی[٨١].

٥- بەوە دەنازم کە غەزەتەی «کورد» لە ئەستەمۆڵ من خاوەند و نووسەری بووم»[٨٢].

لەدوای ئەم پێنج بەڵگەیە گومانمان نەما کە پیرەمێرد (تۆفیق بەگ) خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی کورد بووە. جگە لەوە وەک خۆی زۆرجار نووسیویە، بەسێ ئیمزا نووسینی بڵاو کردۆتەوە «س.ت، سلیمانیەلی توفیق، پیرە کورد». بۆ ئەندامێتی خۆشی لە جەمعیەتەکەدا دەنووسێت «من ئەو (تۆفیق)ەم لە ئەوەڵ تەشکیلی جەمعیەتی کوردا لە ١٣٢٤دا لە ئەستەمۆڵ هەتا ئێستا لە هەموو جەمعیاتی کوردا سەلاحیەتدارم»[٨٣].

پێشتر لەم باسەدا نووسیمان هەریەک لە ڕۆژهەڵاتناسان مینورسکی، باسیل نیکیتین، م.س.لازەریف، شاهبازیانی ئەرمەنی و گۆڤارێکی فەرەنسی، لای خۆیانەوە سەبارەت بەم ڕۆژنامەیە نووسیبوویان. ئێستا دێینە سەر ئەو بیروڕایانەی لەلای خۆمان هەتا ئێستا سەبارەت بەڕۆژنامەی (کورد) نووسراون وە باری سەرنجی خۆمانی بەرامبەر دەنووسین و هەڵەکانیان ڕاست دەکەینەوە.

مامۆستا عەلائەددین سەجادی یەکەمین کەس بووە کە ساڵی ١٩٥٢ چەند ڕستەیەکی لەبارەی

(٧٨) ژین ژمارە (٩٣٣) ساڵی ١٩٤٨
(٧٩) ژین ژمارە (٩٤٨) ساڵی ١٩٤٨
(٨٠) ژین ژمارە (٨٣١) ساڵی ١٩٤٦
(٨١) ژین ژمارە (٩٥٣) ساڵی ١٩٤٩
(٨٢) ژین ژمارە (٦٩٦) ساڵی ١٩٤٣
(٨٣) ژین ژمارە (١٦٧) ساڵی ١٩٢٩

ڕۆژنامەی «کورد»ەوە نووسیوە. دەڵێت: «کورد ڕۆژنامەیەکی هەفتەیی ئەدەبی و کوردی و تورکی بووە. کۆمەڵی شێخ عبدالقادری شێخ عبیدالله لە ١٩٠٧دا لە ئەستەموڵ دەریان کردووە»[٨٤]. مامۆستا سەجادی دیارە ئەو کاتە هەر ئەوەندەی زانیاری دەستکەوتووە، دەربارەی ڕۆژنامەکە، بەڵام لەوکاتەدا ئەوە کەم نەبووە. تەنها سەرنجمان لەم بارەوە ئەوەیە کە ڕۆژنامەکە لە ٩ی تشرینی دووەمی ١٩٠٨دا دەرچووە، نەک ١٩٠٧!.

بەڵام بەداخەوە مێژوونووسی نەمر (ئەمین زەکی بەگ) لە کتێبە پڕ نرخەکەیدا (مێژووی کورد و کوردستان-١٩٣١)[٨٥] هیچ زانیارییەکی دەربارەی ڕۆژنامەی کورد نەنووسیوە! کاتێ باسی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی ئەوسای تورکیا دەکات. ئەگەرچی باسی کۆمەڵەی (کورد)یشی کردووە و ئەو کاتەش خۆی لە ئەستەموڵ بووە!. هەروەها شوێنی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامە (کوردستان) بەئەستەموڵ دادەنێت لەکاتێکدا کە دیارە لە قاهیرە دەرچووە[٨٦]. مامۆستا محەمەد ڕەسوڵ هاوار ساڵی ١٩٧٠ لە کتێبی (پیرەمێردی نەمر)دا کە دووەم سەرچاوەیە لەم بارەیەوە، دەنووسێت «حاجی تۆفیق یەکێک بووە لە ئەنجامدانی ئەو کۆمەڵە (کۆمەڵەی کورد) ڕۆژنامەی (کورد) کە زمانی حاڵی ئەو کۆمەڵە بووە، حاجی تۆفیق بردوویەتی بەڕێوە»[٨٧]. نووسەر تەنها ئەمەندەی وتووە، نەینووسیوە کەی دەرچووە و بابەتەکانی چی بوون!. دیارە ئەویش هەر ئەوەندە زانیاری لەو بارەیەوە دەستکەوتووە.

لە ساڵی ١٩٧٠دا کتێبی (مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی) لەلایەن (عەبدولجەبار محەمەد جەباری)یەوە دەرچوو. نووسەر لەبارەی ڕۆژنامەی «کورد»ەوە دەڵێت «ڕۆژنامەی کورد ڕۆژنامەیەکی وێژەیی هەفتانەیە بەزمانی کوردی و تورکی لە ئەستەموڵ لە ساڵی ١٩٠٧ لەلایەن کۆمەڵەی شێخ عبدالقادرەوە دەرئەچوو. خاوەن ئیمتیازەکەی پیرەمێردی شاعیر بوو. ئەم ڕۆژنامەیە کەوتە سەر هێرش بردنە سەر بنەماڵەی بەدرخانییەکان ئەوانیش بەو جۆرە بەهۆی ڕۆژنامەی کوردستانەوە وەڵامی هێرشەکانی ئەمانیان ئەدایەوە. لە ئەنجامی ئەم شەڕە جوێنە ڕۆژنامەکەیان داخست»[٨٨] هەروەک وتمان نووسەر کە ئەم بیروڕایانەی لەلاپەڕە (١٤٧)ی کتێبەکەیدا نووسیوە، کەوتۆتە سێ هەڵەوە وا ڕاستیان ئەکەینەوە.

١- دەرچوونی ڕۆژنامەکە وەک نووسیمان لە ٩ی تشرینی دووەمی ١٩٠٨دا بووە نەک ١٩٠٧.

٢- نووسەر هیچ بەڵگە و سەرچاوەیەکی بەدەستەوە نییە، کاتێک ئەو ڕایەی دەربڕیوە. کە

(٨٤) مێژووی ئەدەبی کوردی سەجادی، ل٦١٠ ساڵی ١٩٧١

(٨٥) مێژووی کورد و کوردستان، ئەمین زەکی بەگ ل ٣١٥ ساڵی ١٩٣١

(٨٦) سەرچاوەی دوانزە

(٨٧) هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١٤

(٨٨) مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، عەبدولجەبار محەمەد جەباری، ل ١٤٧ ساڵی ١٩٧٠



ڕۆژنامەی کورد هێرشی بردبێتە سەر بەدرخانییەکان یاخود ئەوانیش بەهۆی ڕۆژنامەی (کوردستان)ەوە وەڵامیان دابێتەوە. جگە لەمانە تۆفیق بەگ (پیرەمێرد) کە خاوەن ئیمتیاز و بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی (کورد) بووە هەمیشە بەشانازییەوە باسی بەدرخانییەکانی کردووە و پلەی ئەوانی لە جێگایەکی بەرزدا داناوە، وەک دەنووسێت «خوا هیممەتی بەدرخانییەکان بەرقەرار کات، کە زیننەتی لاپەڕەی کوردەوارین و فیداکاری گەل و نیشتمانن»[٨٩]. هەروەها بەشێک لە ئەندامانی کۆمەڵەی کورد و دامەزرێنەرانی لە بەدرخانییەکان بوون. هەروەها کۆمەڵەی (کورد)یش خۆی بە شتی وەهاوە خەریک نەکردووە. چونکە «ئەوانەی ژمارەی (کورد تەعاون و ترقی غەزەتەسی)یان دیوە دەڵێن ناوەڕۆکی بۆ مەسەلەی نەتەوەیی و زمان و ژیانی ڕووناکبیری و فۆلکلۆری کوردی و ئەو جۆرە باسانە تەرخان کرابوو، لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا باش دەنگی دابووەوە»[٩٠].

بۆ ڕاست کردنەوەی هەڵەی سێیەمی نووسەر دەڵێین: «ڕۆژنامەی کورد بەهۆی زۆرداری و تورکچییەتی دەسەڵاتداری ئەو کاتەی تورکیاوە داخراوە و هەموو کۆمەڵە سیاسییەکان قەدەغە کران و لقەکانیشیان داخران.

سەرچاوەی چوارەم کە باسی ئەم ڕۆژنامەیەی کردبێ (ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی) جەمال خەزنەدارە. لەوێدا نووسراوە کورد ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بووە، بەزمانی کوردی و تورکی لەلایەن هاوبیرانی شێخ عبدالقادری شێخ عبیداللەی شەمزینییەوە دەرچووە. لە شاری ئەستەموڵ ساڵی ١٩٠٧»[٩١]. هەروەها بەعەرەبیش نووسراوە «معلوماتنا عن الجريدة قليلة»[٩٢]. سەبارەت بەشوێنی پیرەمێرد لە ڕۆژنامەکەدا دەڵێت «پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٠٧دا ڕۆژنامەی کوردی دەرهێنا لە شاری ئەستەموڵ»[٩٣]. تەنها سەرنجمان لەم بارەیەوە ئەوەیە کە باشتر وابوو لە پێناسەکردنی ڕۆژنامەکەدا لە پاڵ ناوهێنانی (کۆمەڵەی کورد)دا ناوی پیرەمێرد (تۆفیق بەگی) خاوەن ئیمتیازی بنووسیایە. لە کاتێکدا کە خۆی لەلاپەڕە (١٣٩)دا لەمە دڵنیا بووە. جگە لەوەی وتمان ساڵی ١٩٠٨ دەرچووە نەک ١٩٠٧.

سەرچاوەی پێنجەم کە دەربارەی ئەم ڕۆژنامەیە نووسراوە کتێبی (تێگەیشتنی ڕاستی) دکتۆر (کەمال مەزهەر)ە. لەم کتێبەدا بەشێوەیەکی زانستییانە و پشت بەکۆمەڵێ زانیاری نوێ و بەبەڵگەوە دانراو باس لەم ڕۆژنامەیە کراوە. دەتوانین ئەم کتێبە بەباشترین سەرچاوە دابنێین، کە هەتا ساڵی ١٩٧٨ سەبارەت بەڕۆژنامەی کورد نووسرابێت، لە پێناسەکردنی ڕۆژنامەکەدا

(٨٩) ژین پەخشانی چاو ڕوونی. ساڵی ١٩٤٤

(٩٠) تێگەیشتنی ڕاستی د. کەمال مەزهەر ل ٧٤ ساڵی ١٩٧٨

(٩١) ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی جەمال خەزنەدار ل ١٨ ساڵی ١٩٧٣

(٩٢) هەمان سەرچاوە ساڵی ١٩٧٣

(٩٣) هەمان سەرچاوە ل ١٣٩ ساڵی ١٩٧٣

هەروەک بیروڕاکانی ئێمە بەدووەم ڕۆژنامەی کوردی داناوە و ژمارە (دوو)ی داوەتێ دەنووسێت: «کورد ئۆرگانی یەکەم کۆمەڵەی سیاسی کورد بووە کە دوای شۆڕشی ساڵی ١٩٠٨ بنەماڵەی شەمزینی و بەدرخانی دەریان کرد، بەکوردی و تورکی بڵاو دەبووەوە»[٩٤]. هەروەها دەربارەی ئەم ڕۆژنامەیە دەڵێت: «مەبەست لە ڕۆژنامەی کورد، هەر ئەو (کورد تەعاون و ترقی غەزەتەسی)یەیە کە دوای شۆڕشی ١٩٠٨ دەرچوو. ناوی لە چەند ڕاپۆرتێکی دیپلۆماسی و نهێنی و ژمارەیە سەرچاوەی باوەڕپێکراودا هاتووە»[٩٥]. تەنیا باری سەرنجی ئێمە لەم بارەیەوە ئەوەیە خۆزگە دکتۆر ئەو ڕاپۆرتە دیپلۆماسی و نهێنیانەی ڕوون بکردایەوە هەتا زیاترمان لە بارەی ڕۆژنامەکەوە بزانیایە. ئێستا دوای ئەم لێکۆڵینەوە و پشکنین و بەشوێنداچوونە دەتوانین سەبارەت بەڕۆژنامەی کورد بڵێین:

١- ڕۆژنامەی کورد یاخود (کورد تەعاون و ترقی غەزەتەسی) ڕۆژنامەیەکی ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی بووە. لاپەڕەکانی پڕن لە باسی مێژووی گەلی کورد و ئەدەبیاتی ئەم گەلە.
٢- بەزمانی تورکی و کوردی لە هەشت لاپەڕەدا دەرچووە.
٣- ئۆرگانی کۆمەڵەی کورد (کورد تعاون و ترقی جەمعیەتی) بووە.
٤- ژمارەی یەکەمی لە شاری ئەستەموڵ لە ڕێکەوتی ٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٠٨دا دەرچووە. هەتا مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٠٩ بەردەوام بووە.
٥- خاوەنی ئیمتیازی تۆفیق بەگ (پیرەمێرد) بووە. سەرنووسەری (ئەحمەد جەمیل پاشا) بووە.
٦- گەلێ لە ئەدیب و سیاسی و ڕووناکبیری ئەو سەردەمەی تورکیا بەشداری نووسینیان کردووە. وەک تۆفیق بەگ (پیرەمێرد) ئەحمەد جەمیل پاشا، ئیسماعیل حەقی بابان، ئەکرەم جەمیل پاشا، قەدری جەمیل پاشا، سەعید کوردی، عەبدولڕەحمان بەدرخان، ئیبراهیم حەیدەری.
٧- ڕۆژنامەی کورد بەدووەمین ڕۆژنامە دادەنرێت لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، چونکە لەدەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی (کوردستان ١٨٩٨)ـەوە هەتا دەرچوونی ڕۆژنامەی (کورد ١٩٠٨) هیچ ڕۆژنامەیەکی تر لە هیچ شوێنێکی کوردستان و دەرەوەدا دەرنەچووە.

## چەند لایەنێکی شارراوە لە ژیانی ڕۆژنامەگەری پیرەمێردی نەمر

### بەشی یەکەم: پیرە کوردی[٩٦] ئەستەموڵ

پیرەمێرد پێش ئەوەی بڕوات بۆ ئەستەموڵ و لە نیشتمانی دوور بکەوێتەوە فەرمانبەر بووە، بەتایبەت (باش کاتب) و چاودێری زەوی و زاری (سنیە) بووە لە شارەزوور و شارباژێڕ و

(٩٤) تێگەیشتنی ڕاستی، د. کەمال مەزهەر، ل ٢١٧ ساڵی ١٩٧٨

(٩٥) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

(٩٦) پیرەکورد، حاجی تۆفیق بەگی مەحموود ئاغای هەمزاغای مەسرەف، زیاتر لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ئەستەموڵدا بەناوی «پیرەکورد»ەوە بەرهەمی بڵاوکردۆتەوە.



ماوەت. ئەو کاتانە لە هەڕەتی لاویدا بووە و هاوینان چۆتە گورگەدەر[٩٧] لەوێ زەوی و زار کشتوکاڵ و باخیان هەبووە.

هەر لەسەرەتای تەمەن و بیرکردنەوەیدا پێش ڕۆیشتنی بۆ تورکیا و دوورکەوتنەوەی بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ[٩٨] لە وڵاتی خۆی، ئارەزووی لە کۆکردنەوەی شیعر بووە و ئاوازی پڕ ناڵەی (نالی) تێکەڵ بەسۆزی (مەولەوی و بێسارانی) بووە. بەتایبەت کاتێ لە هەڵەبجە بووە و بەسەرانسەری دەشتی شارەزووردا بەوپەڕی ئارەزوو و ئاواتیەوە گەشتی کردووە، هەر لەو کاتەدا کەشکۆڵێکی نایابی بۆ خۆی پێکەوە ناوە و هەرچی شیعرێکی بەرگوێ کەوتبێ یاخود دەستی کەوتبێ لەو کەشکۆڵەدا نووسیویەتیەوە. کاتێکیش لە ساڵی ١٨٩٨دا[٩٩] وڵاتی بەجێ هێشتووە و ڕووی کردۆتە ئەستەموڵ ئەو کەشکۆڵە پڕ بایەخەی لە سلێمانی لە ماڵی خۆیان لە ژێر زەویدا بەجێ هێشتووە. دەفتەرێک بیست و پێنج ساڵ لەژێر گڵدا شاردرابێتەوە، دیارە سەرەنجامی چی لێ دێت!. با بۆ ڕاستی ئەمە گوێ لە پیرەمێرد بگرین بزانین چی دەڵێت: «نازام چە دەردێک بوو بەمنەوە نووسابوو، هەر لە منداڵییەوە من دڵم دابووە شیعر و گۆرانی، دەنگی خۆشیشم لەبەر شیعری خۆش، ئەویست، تا (مەولەوی)م نەناسیبوو (نالی) لەلام پێغەمبەری شیعری کوردی بوو[١٠٠]. پێش ئەوەی بچمە ئەستەموڵ کەشکۆڵێکم نووسیبووەوە بەکاغەزی زەرد و شین و سۆر و مۆر، هەرچی شاعیرێ کە بیستبووم چەند غەزەلێکی نایابی ئەوم نووسیبووەوە، خەڵک و خوا ئەیانبرد لەبەری بنووسنەوە، تاقەتیان نەدەبوو، هەر لاپەڕەیەکی شیعری خۆشی تیا بوایە ئەیان پچڕی و دەریان ئەهێنا. تا دوایی سوێندم خوارد بەکەسی نەدەم، بەوەش وازیان لێ نەهێنام ناچار لە ژووری ئەو خوارە چاڵە گەنمێکی ساڵی گرانیمان بوو خستمە چاڵەکەوە. بەسەریا ڕۆییم بۆ ئەستەموڵ. خوا ئەیزانێ لەو چاڵەدا وەک قامیشە نەیەکەی کە مەولانای ڕۆمی مەسنەوی لەسەر داناوە چەند بۆ خۆی شەرحی جودایی داوە تا نەماوە. جا بەهۆی ئەوەوە کە شاعیرەکانم لەوێدا کۆکردبۆوە گەلێ ئەشعار و ئاساری ئەو ناودارانەم لە بیر مابوو لە سینەمدا نەقشیان بەستبوو، لە ئەستەموڵ لە غەزەتەی (ژین)دا[١٠١]، برای (ژیان)ی ئێستا بەزنجیرە هەندێکیم دەنووسین و

(٩٧) «گورگەدەر» دێیەکی ناوچەی شارباژێڕە لە نزیک سلێمانی.

(٩٨) بڕوانە شیعری ئەوا ڕووم کردە تۆ ئەی دایکی موشفق.

(٩٩) ژین - ساڵی ١٩٤٤ .

(١٠٠) مەبەست لەم واتایە ئەوە نییە کە دوای چوونە ناوی جیهانی ڕۆحیی مەولەوییەوە نرخی نالی لەلا کەم بووبێتەوە.

(١٠١) مەبەست لە گۆڤاری (ژین)ی ئەستەموڵە، کە یەکەم ژمارەی لە ٧ی تشرینی دووەمی (١٣٣)ی ڕۆمی ساڵی ١٩٠٨ی زاینیدا بەزمانی کوردی و تورکی دەرچووە. بیست و پێنج ژمارەی لێ دەرچووە. بەڕێوەبەری بەرپرسیاری (ئەشرەف حەمزە) و دوای ئەو (مەمدوح سەلیم) بووە.

ڕەنجیشم لەگەڵ ئەدان دیسان بەشیعر وەرم ئەگێڕانە سەر تورکی»[١٠٢]. ئنجا مرۆڤێک بەو خولیایەوە ڕوو بکاتە ئەستەموڵی ئەو سەردەمە کە جێگای بەیەک گەیشتنی ڕۆشنبیری و زانستیی ڕۆژهەڵاتی دواکەتوو و ڕۆژئاوای پێشکەوتوو بوو. ئەستەموڵی ئەو سەردەمە کە هەرچی منەوەرانی ئەم وڵاتە هەبوون دەستکردی بیر و ڕۆشنبیریی ئەوێ بوون. کەسێکی وەک تۆفیقی مەحموود ئاغا بەنیمچە خوێندەوارییەوە ڕووی تێ کرد و ئەو ڕێگا سەختەی گرتەبەر، وەک دەنووسێت: «بەنیو خوێندەواری لە سلێمانی دەرچووم و خوێندنێکی بەرزم هێنایەوە»[١٠٣]. یاخود دەنووسێت: «ئێمە زۆرترمان لەوێوە پێ گەیشتووین»[١٠٤]. با لێرەدا بوەستین، بزانین بەرنامەی نووسینەکەمان سەبارەت بەم مرۆڤە چۆن دەڕوات:

١- ئەوەمان دیاری کرد کە پێش چوونی بۆ ئەستەموڵ کەڵکەڵەی شیعر و کۆکردنەوەی ناو کەشکۆڵی هەبووە.

٢- ئەو کاتانە چووبێتە هەر جێگایەک هەوڵی داوە بەدوای شوێنەواری دێرینەدا بگەڕێت، خۆی ڕاستی ئەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: «لە پەنجا ساڵ بەولاترە، لە هەڵەبجە بووم، خووم دابووە ئەمەی بزانم ئەو شارە کۆنانە و ئەو هەڵبەستە خرافاتە کەی بوون؟ لە کوێوە هاتوون وەک ئەمەی (کۆی ئاتەشگا) کە زۆرتر مەولەوی لە شیعرەکانی خۆیا ناوی بردووە»[١٠٥]. هەر لەو تەمەنەدا بەعەشقی خوێندنی بەرز و خزمەت کردن و بینینی جیهانی نوێ لە کوردستانەوە ئەچێتە ئەستەموڵ. کاروانێک لە سلێمانییەوە لەسەر بانگهێشتی سوڵتان عەبدولحەمید بەسەرپەرشتی شێخ سەعیدی حەفید ڕێک دەکەوێت و پیرەمێردیشی تیادا دەبێت. (لە کۆتایی ئەم نووسینەدا، بەتایبەت باسی ئەو کاروانە دەکەین) بۆساڵی دوایی پیرەمێرد لە ئەستەموڵەوە دەچێتە حەج و دەبێت بەحاجی تۆفیق، لەکاتی گەڕانەوەدا باسی هەریەک لە هاوڕێیانی حەجی خۆی دەکات کە (وەفایی) شاعیر و سەید ئەحمەدی خانەقا بووە، بەم جۆرە: «وەفایی، کە لە پێشدا مەفتوونی شیعرە جوانەکانی بووم. وا ڕێکەوت لەماڵی خوایشا هاوناڵە و ئەفعانی بووم، لە پاش حەج لەڕێی حجازدا مرد و سەید ئەحمەدی خانەقا لەسەری بەند بوو تا ناشتنی ڕەفیقی گریانی بووم»[١٠٦].

لەشامەوە بەرەوژوور دەچێتەوە جیهانی نوێ، ئەو سەفەرە بیست و پێنج ساڵ دەخایەنێت، بۆ

(١٠٢) ژیان ژمارە (٥٤٧) ک٢ ١٩٣٨

(١٠٣) پیرەمێردی نەمر – ئامادەکردنی محەمەد ڕەسوڵ هاوار. ل٢٠.

(١٠٤) ژین (٨٩٣) ساڵی ١٩٤٧

(١٠٥) ژین (٦٨٩) ساڵی ١٩٤٣

(١٠٦) ژین (١٠٠٦) ساڵی ١٩٥٠





سەلماندنی ڕاستی ئەم ژمارەیە لە گەڕانەوەیدا لە تورکیاوە بۆ عیراق لەشەمەندەفەردا ئەم شیعرە دەنووسێت، وە لە سەرەتای شیعرەکەدا دەنووسێت: «ئەم شیعرە لەگەڕانەوەدا لە (ترەنی)[١٠٧] ڕێی ئەستەموڵدا بێژراوە»[١٠٨].

«ئەوا ڕووم کردە تۆ ئەی دایکی موشفق بیست و پێنج ساڵە<br>
لە غوربەتدا بەیادی تۆ ئەژیم خوا شاهیدی حاڵە»[١٠٩]

لە ئەستەموڵ بەهۆی وریایی و زیرەکی خۆیەوە و یارمەتی دانی (عزت پاشای کاتب)[١١٠] ئەو نامە فارسییەی کە لە وەڵامی نامەیەکی بۆ سوڵتان عەبدولحەمید نووسیبوو دەبێتە ئەندامی مەجلیسی عالی و کاری دیوانیی سوڵتان عەبدولحەمید بەڕێوە دەبات، نازناوی (بەگ)ی دەدەنێ و دەبێتە حاجی تۆفیق بەگ.

ئەگەرچی ئەم مرۆڤە دوور وڵاتەی لە وڵاتێکی دواکەوتووەوە بەبێ بڕوانامەی بەرز و خوێندنی موناسب ڕووی کردبووە ئەستەموڵی جێی شارستانی و خوێندنی بەرز، بەڵام زانرا لێهاتووە و ڕادەی هۆشیاری باشە لە کۆلیجی یاسا (قانون) وەرگیرا. بووە قوتابی و چوار ساڵ لەوێ خوێندی و بەپلەیەکی بەرز بڕوانامەی (یاسا)ی وەرگرت و بووە پارێزەر (محامی) و دەستی بەکار کرد، بەڵام لە هاوشان و هاوکارەکانی نەدەچوو، خووی دایە نووسین و، کاری ڕۆژنامەگەری، ئەو دوو خۆشەویستەی لەناخیدا بەحەسرەتەوە بۆی دەژیا.

کۆمەڵێ هاوڕێی ڕۆژنامەنووس و ئەدیب و شاعیر و مێژوونووسی بۆ پەیدابوو، وەک خۆی زۆرجار نووسیویەتی بەگشتی ناویانم کۆکردەوە و بریتی بوون لەم زاتانە «ئەمین فەیزی، تۆفیق وەهبی، ئەمین زەکی بەگ، مستەفا پاشای یامولکی، ئەشرەف حەمزە، ساڵح زەکی بەگ، مەعروف جیاووک، عەبدوڵڵا جەودەت، شەریف سەهل پاشا، کامەران بەدرخان، جەلادەت بەدرخان، شێخ مستەفای نەقیب، شێخ مەحموود جەلالەددین کوڕی ئەحمەد پاشای دوا میری بابان، شێخ محەمەدی موفتی، دکتۆر فوئاد، دکتۆر کەمال، یوسف ضیا، ئیبراهیم ئەفەندی، زەکی مغامز، ئەحمەد ڕاسم، ڕەزا تۆفیق، خەلیل بەگ، عەبدولحەق حامد، مەلا سەعیدی بەدیع ئەلزەمان، ئەکرەم بەگی ڕەجائی زادە، ئەکرەم جەمیل پاشا، ئەحمەد جەمیل پاشا، قەدری جەمیل پاشا، سەعید کوردی، عەبدولڕەحمان بەدرخان، ئیبراهیم حەیدەری، مەمدوح وەفی وە گەلێکی تر

(١٠٧) ترەنی- لەترەینی ئینگلیزیەوە هاتووە (train) شەمەندەفەر.

(١٠٨) ژیان ژمارە (٣٦) ساڵی١٩٢٦

(١٠٩) هەمان سەرچاوە.

(١١٠) پیرەمێردی نەمر م.هاوار. ل١٤

له ئەدیب و شاعیر و ڕۆژنامەنووس و مێژوونووس»(١١١).

لێرەدا پێویستە لەسەر ئەوە بوەستین و ڕوونی بکەینەوە و بزانین لە ماوەی ئەو بیست و پێنج ساڵەدا حاجی تۆفیق بەگی یاساناس و ڕۆژنامەنووس و ئەدیب و شاعیر چی کردووە؟!، ئەو خزمەتانەی کردوونی چۆن کاری کردۆتە سەر مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، پیرە کوردی ئەستەموڵ دەڵێت:

١- دەمێکیشە غەزەتەچیم، هەتا لە ئەستەموڵیش غەزەتەچی بووم(١١٢).

٢- لە ئەستەموڵ لە غەزەتەی ژیندا شیعری شاعیرە نەخوێندەوارەکانم نووسیبوو (أمي شاعرلريز)(١١٣).

٣- لەڕۆژنامەی (شمس)دا، کە لە ئەستەموڵ، سەید حسین ئێرانی بەفارسی دەری دەکرد شیوەنێکم نووسیبوو(١١٤).

٤- لە غەزەتەی ژین کە لە ئەستەموڵ دەردەچوو دوانزە ساڵ لەمەوپێش لەبەردە نووسراوەکەی ماوەت دوابووم(١١٥).

٥- لە ئەستەموڵ غەزەتەی (کورد)م دەردەهێنا، لە غەزەتەی هەرە گەورەی (تان)ی فەرەنسەدا شیعری کوردیم ئەنووسی(١١٦)، هەروەها «ئێستا خوا دەرووی لێ کردووینەوە، گۆڤار و وێنە و کلێشە و چاپ کەوتۆتە ناومان نۆبەرەی غەزەتەمان لە ئەستەموڵ غەزەتەی (کورد) بوو، کە ئیمتیازی ئیمتیازەکەی بەر من کوت(١١٧).

٦- لە ئەستەموڵ لە زەمانی عوسمانلیدا لە غەزەتەی (إقدام)دا بۆ ئاوەدانی (شارەزوور) بەهۆی ئیسکانی عەشائرەوە مەقالەیەکم نووسیبوو زۆری تەئسیر کرد(١١٨).

٧- شیوەنێکم نووسیبوو ناردم بۆ ڕۆژنامەی (فەرهەنگ) کە لە تاران دەردەچوو سەروساختمان لەگەڵ یەکدا هەبوو(١١٩).

(١١١) لە ڕۆژنامەکانی (ژیان)ی ١٩٣٢ هەتا (ژین)ەکانی ساڵی ١٩٥٠ ئەم ناوانەی نووسیوە.
(١١٢) ژیان (٥١٣) ساڵی ١٩٣٧
(١١٣) ژین (٧٧٥) ساڵی ١٩٤٥
(١١٤) ژین (٧٦٨) ساڵی ١٩٤٤
(١١٥) ژیان (٤٣٠) ساڵی ١٩٣٥
(١١٦) ژین (٩٤٨) ساڵی ١٩٤٨
(١١٧) پەخشانی گەلاوێژ پێنج ساڵانە «گەلاوێژ» ک٢ (١٩٤٦)
(١١٨) ژیان (٥٣٥) ساڵی ١٩٣٧
(١١٩) ژین (٧٦٨) ساڵی ١٩٤٤



٨- لە پایتەختدا غەزەتەی کوردیم دەردەکرد، لە غەزەتەی (محیط مصور)ی میسردا و ڕۆژنامەی هەرە گەورەی پاریس، (تان) و لە (شەفەق سورخ) و (فەرهەنگ)ی ئێراندا بانگی کوردیم ئەدا(١٢٠).

٩- شاعیری مەشهوری فەرەنسە (لامارتین) مەدحێکی حەزرەتی محمد (د.خ)ی کردبوو (ئیبراهیم ئەفەندی)، بەشێوەیەکی وەک خۆی بەلیغ نەزمی کردبوو، من لە ئەستەموڵ لە غەزەتەی خۆمدا نەشرم کرد(١٢١).

لەم نۆ خاڵەی سەرەوەدا دەگەینە ئەم ئەنجامانە.

١- حاجی تۆفیق بەگی پارێزەر (محامی) لە ئەستەموڵدا خاوەنی ئیمتیازی ڕۆژنامەی کورد بووە. ئەم ڕۆژنامەیە بەزمانی کوردی و تورکی دەرچووە. ڕاگەیەنەری دەنگی سیاسی (کۆمەڵەی کورد) بووە، هەفتەی جارێک دەرچووە.

٢- لە گۆڤاری (ژین)ی ئەستەموڵدا کە خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەری ئەشرەف هەمزە و مەمدوح سەلیم بووە بەشدارییەکی بەردەوامی کردوە و گۆشەیەکی هەبووە بەناوی شاعیرە نەخوێندەوارەکانمان. ئەو گۆڤارە ساڵی ١٩١٨و١٩١٩ی زایینی بەرامبەر ١٣٣٤-١٣٣٥ی ڕۆمی لە ئەستەموڵ بیست و پێنج ژمارەی لێ دەرچووە.

٣- لە ڕۆژنامەی سەید حوسێنی ئیرانیدا کە ناوی (شمس) بووە، بەفارسی شیعر و نووسینی کوردی بڵاو کردۆتەوە.

٤- بەشیعر و نووسین و وەرگێڕان، لەم گۆڤار و ڕۆژنامانەدا بەشداری کردووە، بەسێ زمان، کوردی، تورکی، فارسی. اقدام، محیط مصوری میسر، تان-ی فەرەنسی، شەفەق سورخ و فەرهەنگی ئێرانی. وە لەو ڕۆژنامە و، گۆڤارانەدا بەچوار ئیمزا بابەتی بڵاو کردۆتەوە.

١- سلێمانیەلی تۆفیق. ٢- س. ت. ٣- پیرە کورد- تۆفیق. ٤- مەحموود نەژاد تۆفیق.

لەمەوە دەتوانین بڵێین ئەگەر کەسێک مەبەستێکی گەورە و خۆشەویستی خاک و میللەتی خۆی لە هەست و بیردا نەچەسپیبێ وە بۆی نەژیابێ هەرگیز ناتوانێ ئا بەو ڕەنگە بێتە پێشەوە و هەموو خۆشییەکی ژیانی خۆی بنێتە پێناوی ڕۆژنامە و نووسین و وەرگێڕانەوە وە لە جێگایەکی گرنگی وەکو ئەستەموڵدا دەنگی نەتەوە دواکەوتووەکەی خۆی بەجیهان بگەیەنێ و ئەوە بسەلمێنێت کە کوردیش وەک گەلانی جیهان خاوەن ئەدەب و ڕۆشنبیری و کەلەپووری نەتەوایەتییە. وە هەر ئەم سەرچڵی و گیانە نەتەوەییە بوو کە لە ساڵی ١٩٢٤دا

(١٢٠) ژین (٩٥٣) شوباتی ١٩٤٩
(١٢١) ژین (٧٢٣) ١٩٤٣

بووە هۆی ئەوەی (حیزبی اتحاد و ترقی) دەسەڵاتداری تورکیا لەسەر بەرپابوونی شۆڕشی کورد و بەشداری کردنی (حاجی تۆفیق بەگ) لە کۆمەڵەی کورددا فەرمانی گرتن و لەسێدارەدانی دەربکات و ئەویش بەپەلە و خێرا بگاتەوە عێراق.

ڕەنگە لای زۆر کەس ئەم ڕاستییە جێگەی خۆی نەکاتەوە کە ئایا حاجی تۆفیق بەشداربی کاری سیاسی کردبێ لە کوردستانی تورکیادا. بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە خۆی دەنووسێت: «لەسەورە و کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کورداندا لەگەڵ خالید بەگ و یوسف ضیاء و دکتۆر فوئاد و کەمال – دا لە خزمەت مەلا سەعید بەدیع ئەلزەماندا ڕەنجم ئەدا و ئیدارەی عورفیەی ئەستەمولّ بەئیعدام مەحکومی کردم»[١٢٢]. واتە حاجی تۆفیق لە بەرامبەر ڕژێمی ئەتاتورک و حیزبی (اتحاد و ترقی)یەوە داواکراوە بۆ دادگا و پاشان (غیاب)یەن حوکم دراوە.

لەلایەکی تریشەوە ئەگەر تەماشای ئەو ژمارانەی گۆڤاری (ژین) ی ئەستەمولّ بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە «پیرەمێرد ـ پیرەکورد» لە زۆربەی ژمارەکانیدا بابەتی خەملّیوی قەڵەمە پیرۆز و نەمرەکەی خۆی بڵاوکردۆتەوە و هەر هەموو ئەو شیعر و نووسین و وەرگێڕاوانەش لە خزمەتی نەتەوەکەی و ئەدەبیات و ڕۆشنبیرییەکەیدا بووە. لێرەدا وەهام بەباش زانی کە ئەم باسە لەبەشێکی سەربەخۆی پێشەکی ئەم کتێبەدا بڵاو بکەمەوە. بەڵام چەند شتێک هەن کە پێویستە لەم نووسینەدا فەرامۆشیان نەکەین.

لە ڕۆژنامەی (العراق)ی ڕۆژی ١٩٨٤/٨/٢٢دا[١٢٣]، کاک مەحموود زامداری نووسەر و ئەدیب، بەکورتی باسی بڵاو بوونەوەی قەسیدەیەکی نالی دەکات و بایەخی ئەو وتارەی پیرەمێرد دەردەخات کە لە ژمارە (١٢)ی گۆڤاری (ژین)ی ئەستەمولّی ساڵی ١٩١٩دا بڵاو کراوەتەوە. ئەگەرچی نووسەر (ژین)ی بەڕۆژنامە زانیوە، بەڵام لەو کاتەدا (ژمارەکانی) ئەو گۆڤارە نەهاتبوە لای ئێمە و زانیاری دەربارەیان زۆر کەم بوو، وە گەلێکی هەڵە و ناتەواو بوو. هەتا ئەدیبی دڵسۆزی کوردی کوردستانی تورکیا (محەممەد ئەمین بۆز ئەرسەلان) لە سوید تەواوی ژمارەکانی گۆڤاری (ژین)ی کۆکردەوە و هەمووی وەرگێڕا بۆ نووسینی لاتینی و پێشەکییەکی زۆر سوودبەخشی بۆ نووسیوە. وە ئەو کارە مەزنەی ئەو کوردە دڵسۆزە گەیشتە لای ئێمە و بۆ یەکەم جار ئێمە چووینە جیهانی ئەو ساڵانەی کە بەو شێوەیە ئەو گۆڤارەی لە ئەستەمولّ تیادا دەرچووە واتە ساڵەکانی ١٩١٨-١٩١٩ی زایینی. کاک مەحموود زامدار لە باسکردنی ئەو نووسینەی پیرەمێرددا دوو پرسیار دێنێتە گۆڕێ کە بریتین لە:

(١٢٢) ژین (٩٥٣) شوباتی ١٩٤٩

(١٢٣) ڕۆژنامەی العراق ١٩٨٤/٨/٢٢ مەحموود زامدار



١- ئایا ئەو شیعرە کامەیە کە پیرەمێرد دەڵێ شیعرێکی (نالی)مان لە ڕۆژنامەی (تان)ی فەرەنسیدا بڵاو کردەوە؟!

٢- ئایا شیعرەکە کێ وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی؟!.

لەوەڵامدا دەڵێین:

١- ئەو قەسیدەیە بریتی بووە لە قەسیدە بەناوبانگەکەی (نالی) کە بەم بەیتە دەست پێ دەکات:

لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان
بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان[١٢٤]

بەڵگەشمان بۆ ڕاستی ئەمە پیرەمێرد خۆیەتی، دەڵێت: «یەک دوو شیعری (نالی) بۆ سنعەت دەنووسین، بزانین کێ توانیویە ئەو شێوەیە بنووسێ؟!». غەزەلێکی هەیە کە پیرەمێرد لە ساڵی ١٣١٩دا لە ئەستەمولّەوە بەفرانسزی ناردوویە بۆ غەزەتەی (تان)ی پایتەختی فرانسە (پاریس) کە دەڵێ:

لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان[١٢٥]

٢- ئەو کەسەی کە نەک هەر ئەو شیعرەی نالی بەڵکە شیعرێکی (لامارتین) وە گەلێ نووسینی تریشی لە کوردییەوە کردووە بەفەرەنسی لە فەرەنسیشەوە بۆ کوردی (داود)ی کوڕی زانای گەورە (ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری) بووە. لەم بارەیەوە با گوێ لە پیرەمێرد بگرین: «لەپاش برنادشۆ، شاعیرێکی فەرانسە لامارتین قەسیدەیەکی محەممەدی بەفرەنسزی وتبو، مەرحوومی جەننەت مەکان ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری (شیخ الأسلام) لەسەر ئەو تەرجەمەیەی (داودی کوڕی) بۆی کردبوو، ئەو بەتورکی نەزم و تەرتیبی کرد منیش لە غەزەتەی ئەستەمولّی خۆمدا کە ناوی (کورد) بوو نەشرم کرد»[١٢٦]، «ئیبراهیم ئەفەندی لە عیراقشیدا بەکەماڵ و حورمەت و ئارەزووی خۆی ڕایبوارد»[١٢٧]. لە دوای ئەم سەلماندنەی پیرەمێرد دەتوانین بڵێین کە وەرگێڕ (داود) بووە و ئیبراهیم ئەفەندی باوکیشی کە ئەدیب بووە بەشیعر و پەخشان بەرهەمە وەرگێڕاوەکانی ڕێکخستووە. پیرەمێردیش کە هەستی کردووە ئەدەب نیشانەی زیندوویێتی نەتەوەکەی و هەنگاوی پێشکەوتنیەتی و ناساندنی بەگەلانی تر ناساندنی نەتەوە دواکەوتووەکەیەتی بۆیەکا لە بڵاوکردنەوەی ناو و بەرهەمی ئەدەبی ئەو شاعیرانە دریغی نەکردووە. جگە لەمانەش بەپێی بەڵگەی نووسینی خۆی پیرە کوردی

(١٢٤) دیوانی نالی، مەلا عەبدولکەریمی مدەڕس

(١٢٥) ژین (٨٦٠) شوباتی ١٩٤٧

(١٢٦) ژین (٩٨١) ساڵی ١٩٤٩

(١٢٧) هەمان سەرچاوە.

ئەستەمولّ ئەم کارە گرنگانەشی ڕاپەڕاندووە:

١- هەولّدان بۆ دانانی دەستوورێک بۆ زمانی کوردی، خۆی دەنووسێت «لە ساڵی **١٣٢٩**ی ڕۆمیدا کە لە ئەستەمولّ غەزەتەی کوردی دەرئەچوو، من لە (چۆلّە مێرگ)ەوە مەقالەیەکم بۆ ناردبوون تەکلیفم لە جەمعیەتی کورد کردبوو کە لە هەر دیارێکی کوردستانەوە زبانزانێک بانگ بکەنە پایتەخت و زبانێک بۆ عمومی کورد هەلّبژێرن و بیکەن بەفەرهەنگ، وە دەستوور، هەتا (مصارفاتی) لە چاپدانیشم گرتبووە ئەستۆی خۆم. کەس گوێی نەدایە، ئێستا هەر کەسە بەهەوەسی خۆی شێوەیەک دێنێتە کارەوە، وایان شێواندووە بەم بەستەزبانی و بێ ژیانییەوە، چە لافێک لێ بدەین؟! بۆچ کوردستان تەنها ئەم (هۆمەرە کوێر)[١٢٨]ەیە؟! بۆچ کوردستانی گەورە لە زبانمان نەگا؟!»[١٢٩].

٢- هەولّدان بۆ چەسپاندنی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کورد. وەک دەنووسێت «زبانی کوردی بەڕەنگێ شێواوە من کوردم، کەچی لە ڕۆخی (وان) و هەکاری تەرجەمانم بۆ کوردیی ئەوێ ڕادەگرت؟! لەم بن دەستەوە، هەورامی لە زبانی جاف ناگا، ئەو هەمموو موحیتی کوردستانە کە من باوەڕم وایە تا زبانیان یەک نەکەوێ یەک ناکەون، ئەمەندە هونەرمەندی زبانزان و قەواعید شوناسی تیا هەلّکەوت ئەهمیەتێکیان بەزمان نەدا»[١٣٠].

٣- هەولّدان لەگەلّ (ئەمین فەیزی)دا بۆ دانانی کتێبێک کە شیعری شاعیرە ناسراوەکانی کوردی تێدا کۆبێتەوە. ئەوەبوو لەگەلّ ئەمین فەیزی بەگدا دەست دەکەن بەئامادەکردنی کتێبی (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد)، بەلاّم لە کاتی کارکردندا سەبارەت بەزەوقی ئەدەبی و هەلّبژاردنی شیعری شاعیران ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان. بیروڕایان ڕێک ناکەوێ و لەیەکتر جوێ دەبنەوە، بەلاّم ئەمین فەیزی لە ئەستەمولّ کتێبەکە چاپ دەکات، لەم بارەیەوە پیرەمێرد دەلّێت: «لە ئەستەمولّ لەگەلّ ئەمین فەیزی مەرحومدا قەرار وابوو لە ئەنجومەنی ئەدیباندا ئیشتیراکی بکەم، لەسەر ئەم ئیختلافی زەوق و هەلّبژاردنی پایەی شاعیرانە لێک جوێ بووینەوە»[١٣١].

٤- دەتوانین بلّێین پیرەمێرد سەرچاوەیەک بووە کە ئەدیب و ڕۆشنبیرانی کوردی ئەو سەردەمەی تورکیا ڕوویان تێ کردووە ئەمیش بەدەوری خۆی کۆی کردوونەتەوە و تەنانەت مەسەلەی سیاسەت و کوردایەتی هێناوەتە کاری ڕۆژنامەگەریەوە و بەیەکتری ئاوێتە کردوون. هەولّی

(١٢٨) هۆمەرە کوێر، جێگایەکی نزیک سلێمانییە.
(١٢٩) ژین (٦٧٩) ساڵی ١٩٤٢
(١٣٠) هەمان سەرچاوە.
(١٣١) ژین (٨٨٨) ساڵی١٩٤٧





داوە دەستووری زمانی کوردی پێک بێت و ڕێنووسێکی ڕاست ڕەچاو بکرێ. لە وتارەکانیدا هەولّی داوە لە تورکیا باسی کوردستان بکات و ناتەواوی و گیروگرفتەکانی ئاشکرا بکات.

٥- لە ڕووی مێژوویییەوە خزمەتی زۆرە و ئەگەر نووسینە مێژووییەکانی کۆبکرێتەوە کتێبێ دروست دەکات لەسەر مێژووی کورد. لە ڕووی چاکی و مرۆڤانەوە کاری لە منالّەکانی کردووە لە تورکیا واتە هەردوو کوڕەکەی (نەژاد)یان دەبێتە شاعیر و پەخشاننووس، (وداد) دەبێتە پسپۆڕ لە زمانی سانسکریتیدا لە هندستان. ئەمە دوو نموونەی نووسینی خۆیەتی لەم بارەیەوە:

«عەبدولّلا جەودەت کە لە پاش مەشرووتیەت لە ئەورووپاوە هاتەوە لە ئەستەمولّ بوو، زۆرتر لە هەموو کەس من لە خزمەتیا ئەبووم، خۆم و نەژادی کوڕم بە(نظم و نثر) لە مجەلەکەیدا خدمەتمان هەیە»[١٣٢].

سەبارەت بەودادیش دەنووسێت «جەمعیەتێکی ئەنسکلۆپیدی لە تورکیە ڕێکخرابوو لە دانشمەندانی گشت میللەتێک پێکهاتبوو، پرۆفیسۆرێکی ئەلّمانیان هەلّبژاردبوو سەرۆک بێت، (وداد)ی کوڕی منیش بەشدار بوو»[١٣٣].

٦- لەگەلّ شاعیرانی ولاّتاندا هەولّی داوە پەیوەندی بکات و باسی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیان بۆ بکات. بۆ نموونە هاوڕێی نزیکی عەبدولحەق حامدی ڕابەری شیعری نوێی تورک بووە. وە عەبدولحەق حامد هێندە نووسینی پیرەمێردی لاپەسەند بووە کە پەخشانێکی پیرەمێرد بەشیعر دەکات بەتورکی و بلاّوی دەکاتەوە. پیرە کورد دەلّێت:

«لە غەزەتەی کۆندا بەندێکی پەخشانم بەرچاو کەوت کە لەوەختی کۆندا لای عەبدلحەق حامد[١٣٤]ی شاعیری مەزنی تورک دەمودەست بەتورکی نەزم کرابوو، بەتەرزێک کە گوایە لە کەس وەرنەگیراوە و نەبیستراوە. عەبدولحەقیش زۆری پەسەند کردووە ئنجا دوای چەند ساڵێک لێرە کراوە بەکوردی، سا هەرچۆن بێ ئەو بەندی پەخشانە (شیعری منثور)ە کۆنە ڕۆحمی تازە کردەوە و تەنها بۆ یادی کۆنی خۆم تازەم کردەوە»[١٣٥].

٧- نووسینەکانی پیرەمێرد بەگشتی و مێژوویییەکانی بەتایبەتی بووە بەسەرچاوەیەکی گرنگ لەبەر دەستی ئەو ڕۆژهەلاّتناسانەی ویستوویانە لەسەر کورد بنووسن. خۆ ئەگەر ڕۆژگار

(١٣٢) ژین (٦٧٩) ساڵی١٩٤٢
(١٣٣) ژین (٩٣٩) ساڵی١٩٤٨
(١٣٤) عبدالحق حامد لە شاعیرانی نوێی ماوەی وریابوونەوەیە لە تورکیا.
(١٣٥) ژین (٩٨٣) ساڵی١٩٤٩

کارێکی کرد ئەدیبێکی کورد دەستی بگاتە ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانە ئەوا هێندە زانیاری نوێ و لاپەڕەی نەبینراومان بۆ دێنێتەوە کە خۆمان بڕوا نەکەین و لە توانای لەبن نەهاتووی ئەو مرۆڤە گەورەیە سەرسام بین.

## بەشی دووەم

ئاشکرایە کە زەمینەی لەبار و ژیانی ئارام بەتایبەت بۆ ئەدیب و هونەرمەند دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەردەوام بۆ ئیشەکەی خۆی بژی و کارە لاوەکییەکانی ژیانی ڕۆژانە بیر و هەستی پەرت و بڵاو نەکەن و قەڵەمی داهێنانی کول نەکەن. تاقی کردنەوەی ژیانی ڕۆشنبیرانی جیهان بۆی سەلماندووین کە ئەو جۆرە ئارامییە هونەرمەندی گەورەی پێگەیاندووە. بەپێچەوانەی ئەمەشەوە چورتمەکانی ڕۆژگار و گیروگرفتە سەختەکانی کارێکی نالەبار دەکەنە سەر داهێنان و بەرهەم. ئەگەریش تەماشای مێژووی ئەدەبیاتی کورد بکەین هەر لەسەرەتاوە بۆمان دەردەکەوێت کە نووسەر و ڕۆشنبیری کورد هیچ کات نەزەمینەی لە باری بەدڵی خۆی بۆ خولڤاوە نە لە ژیانێکی وەها ئارامیشدا بووە کە هەموو ساتێکی ژیانی تەنها بیرکردنەوە و داهێنان بووبێت. لەگەڵ ئەوەشدا کۆڵی نەداوە و خاوەن داهێنان و بەرهەم بووە. شاعیر و ئەدیبی کورد ئازایانە بەرگەی گرتووە و نەوەستاوە و قەڵەمی دانەناوە. بەگشتی پیرەمێرد ئەوەندەی کە ڕۆژگار گیروگرفتی بەسەردا هێناوە و نالەبار بووە بۆی ئەوەندەش خۆی بەرگەگر بووە و کۆڵی نەداوە و پەیامی پیرۆزی خۆی گەیاندووە. لە چاو ئەو ژیانە سەخت و گیروگرفتانەی لە دوای گەڕانەوەی لە تورکیا، لە وڵاتی خۆیدا (سلێمانی) کە تووشی هاتووە ئەوەندە پێش گەڕانەوەی واتا کە لە تورکیا بووە ڕۆژگار گونجاوە بۆی و لە ژیانێکی ئارام و خۆشدا بووە و ئەمەش زیاتر هانی داوە لەگەڵ ڕۆژنامەگەری و نووسین و فێربوونی زمانی تورکیدا سەرگەرم بێت و لەو بیست و پێنج ساڵەدا کە لە تورکیا بووە، سامانێکی فیکری و ڕۆشنبیرییەکی وەها پێکەوە بنێ و ببێتە خاوەنی کە لە دوای هاتنەوەی لە ١٩٢٥ەوە هەتا ١٩٥٠ واتە بیست و پێنج ساڵی دووەمی ژیانی لە سلێمانی پشت بەو سامانە ڕۆشنبیرییە خزمەتێکی گەورەی ئەدەبیاتی کوردی و ڕۆژنامەی کوردی بکات.

دەتوانین ژیانی پیرەمێرد لە تورکیا بکەین بەدوو بەشەوە:

١- ژیانێکی ئارام و زەمینەیەکی لەبار بۆ کارکردن.

٢- بەشێکی گیروگرفتی سیاسی و تێکەڵ بوون بەکۆمەڵەی کورد و شۆڕشی کوردستانی تورکیا.

لە سەرەتای ژیانیدا لە تورکیا بەئارامی ژیاوە، بۆی لواوە بەئارەزووی خۆی بخوێنێتەوە و بنووسێت، ببێتە میوانی هەمیشەیی (کتێبخانەی بایەزید) کە ئەو ڕۆژگارە لە کتێبخانە بەناوبانگەکانی جیهان بووە. وەک خۆی دەڵێت بۆ یەکەم جار لەوێ شەرەفنامەی خوێندۆتەوە. لە



نۆ گۆڤار و ڕۆژنامەی جۆربەجۆردا بەشداری کردووە. بەردەوام شیعر و نووسین و وەرگێڕانی هەبووە. ژیانی هێمن و خۆشبەختانەی، ماوەی داهێنان و کارکردنیان زۆر کردووە. باوک و مامۆستا بووە بۆ کوڕەکانی، هاوڕێکانی هەڵبژاردە و نموونەی پیاوانی ئەدیب و شاعیرو ڕۆژنامەنووس و ڕابەرانی سیاسی ئەو ڕۆژگارە بوون.

لەو پەڕی دەسەڵات و خۆشگوزەرانی ژیانیدا دڵی لای باخات و کوێرە دێیەکی کوردستانەکە بووە. بڕوانە دەنووسێت: «لە ئەستەموڵ بەڕوتبە و نیشان و ئەعزایەتی مەجلیسی عالییەوە لە (أطه) کە مەڵبەندی پرنسەکانی کۆنی ڕۆم بوو لە قەسرێکی مومتازدا دائەنیشتم، کە شەو ئەنووستم لە خەوما لە گورگەدەر لە باخەکەی شێخ ئەحمەدی بازلیخا هەنارم ئەدزی»[١٣٦]!! هەر لەم ڕووەوە دیسان دەڵێت: «لە دەورەی خولیای شەبابدا کەوتمە ئەستەموڵ، یەکەمجار لە (أطه) دراوسێی ڕەجائی زادە ئەکرەم بەگ و عوشاقی زادە خالید ضیا و حسێن ڕەحمی بووم. (ڕەزا تۆفیق)یشیان پێ ناسیم. کەوتمە بەهەشتی سەروەتی فنوونەوە، کە ئێواران لە ئەستەموڵەوە بەواپۆڕ ئەگەڕامەوە بۆ لای سەعادەتی خۆم کە (أطه) بوو وە (سەروەتی فنوونم)[١٣٧] لە گۆگرتەی ئەو واپۆڕی سەر دەریای مەڕمەڕیەدا ئەخوێندەوە. تەئسیری ئەو شیعر و ئەدەبیاتە لە سندبادی بەحری زیاتر ئەیخستمە دەریای خولیاوە و لە غرامەفۆندا کە گوێم لە نەغمەی بەستەی خۆم دەگرت کە بۆ (مهر النسا)م وتبوو ڕۆحم ئەچووە تەختی سلێمانیی. وام ئەزانی فریشتەی ئاسمان و پەری سەر کێوی قاف گوێ لە دەنگی شیعری من ئەگرن. هەندێ جار شەوی مانگەشەو کە ئەچوومە کەنار دەریا و تریفەی مانگ ئەیدا لەو ئاوە و جریوەی ناز و غەمزەی ئەو کچە ڕۆمە دولبەرانە، ئەفسوونی ئەو ئەفسوونگەرانەم ئەبیست لە هیچە ئەکەوتمە خولیای شیعرەوە. وام ئەزانی گوڵ بۆیە ئارایشتی خۆی ئەدا من شیعری پیا هەڵدەم، بولبول بۆیە بەدەوریا ئەسووڕێتەوە شیعری منی بەسەرا بخوێنێتەوە»[١٣٨]. ئەمە ئەو بەشە پڕ ئارامی و خۆشبەختیەی (پیرەکورد) بوو کە بۆمان ڕوون بوەوە و تەنانەت جێگای وەزیفەی ژیانی لە دوورگەیەکی زۆر خۆش و ڕازاوەدا بووە کە یەکێکە لە هاوینەهەوارەکانی تورکیا. خۆشی دیسان شاعیرانە ژیاوە و شاعیرانەش باسی ئەو ژیانەی کردووە. بەڵام ئەم ژیانەی هەروا بۆ نەچۆتە سەر، گیانی نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەری ڕۆژ بەڕۆژ لای ئەو گەورەتر و بڵند دەبوو. ئەو دایکی موشفیقەی ساڵەها بوو لێی دوور بوو شەوان لە خەوەکانیا نوێ دەبووەوە و لە جارانی جوانتر دەبوو. ئەمیش دێوانە ئاسای ئەو عەشقە نەمرە دەچووە خەڵوەتەوە، نەک تەنیا بۆ گریان و یادکردن بەڵکە بۆ زیاتر

(١٣٦) ژین (٨٩٤) ساڵی ت٢، ١٩٤٧

(١٣٧) ثروة الفنون- گۆڤار

(١٣٨) ژین (٩٦٧) حوزەیرانی ١٩٤٩

شکۆدارکردنی بەشیعر، بەنووسین، بەوەرگێڕان، دواییش بەخەباتی سیاسی بەبێ سڵ کردنەوە، هەتا ئەو کاتەی لە کوردستانی تورکیاوە دەنگی شۆڕش بەرەو ئەستەموڵی پایتەخت و هەموو لایەک پەخش و بڵاو بووەوە. ئەمە زیاتر ڕۆشنبیرە کوردەکانی ئەستەموڵی بزواند، هانی دان، یەکێک لەو گیانە نەمرانە پیرەمێرد بوو، بۆ سەلماندنی ڕاستیمان (مەعروف جیاووک)ی نیشتمانپەروەر و ئەدیب دەنووسێت: «لەساڵی ١٣١٨ی ڕۆمیدا لە ئەستەموڵ بەڕێکەوت لە ماڵی شەریف سەهل پاشادا یەکدگیر بووین، وا بزانم تەبیعەتیشمان لە دوو نوقتەی موهیمدا ڕێک کەوت، یەکێکیان سەربزێوی میللیەت، دووەمیان زەوقی ئەدەبی بوو»[139] ئنجا لەم واتەیەی مەعروف جیاووکەوە دەردەکەوێت کە سەربزێوی میللیەت دەبێ لای ئەدیبێک چۆن بکەوێتەوە. هەر ئەم گیانە بوو کە پاڵی پێوە ناو خەباتی ژێرزەمینیی و پیرە کورد ئاشکرا بوو، وە خرایە بەندیخانەوە، خۆی دەنووسێت: «هەندێ شت هەیە بەترس و لەرز و تەهلەکە تێدەپەڕێت کەچی لە پاش چەند ساڵێک کە یادی ئەکەیتەوە وەک چووبی بۆ سەیران وا ئەیگێڕیتەوە، من خۆم ئەمانەم بەسەرهاتووە، کە لە زیندانی ژێرزەمینی، (بلوکی بەکر ئاغای ئەستەموڵ) گیرابووم بەیعی خنکاندنم بوو، ئێستا کە ئەیگێڕمەوە ئەمەندە بەلەزەتە وەک لە ڕاو و شکار و دۆشەکی نەرمی یارا بووبم وایە»[140]. جارێکی تریش ئەم گرتن و فەرمانی خنکاندنە سەرلەنوێ تووشی دەبێتەوە و لەگەڵ پەرەسەندنی شۆڕشەکەدا دەسەڵاتدارانی ئەتاتورک و حیزبی اتحاد و ترقی داوای دەکەن بۆ دادگا و ئەم خۆی ون دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ عیراق. ئەوانیش بەشێوەی (غیاب)ی حوکمی خنکاندنی دەردەکەن. پیرەمێرد وەک جارێکی تریش وتمان باسی ئەوە دەکات و دەنووسێت: «لەسەورە و کۆمیتەی ئەرزڕۆمی کوردا لە خزمەت مەلا سەعیدی بدیع الزماندا ڕەنجم ئەدا، ئیدارەی عورفیەی ئەستەموڵ بەئیعدام مەحکومی کردم»[141]. بەم شێوەیە ئەم مرۆڤە لە ساڵانێکی وەهادا کە کۆمەڵی کوردەواری لە هەموو لایەکدا دەیناڵاند بەدەست باری دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی زۆرداری دەرەبەگ و ئاغاکانەوە، سەرباری هەمووی چەوساندنەوەی دوو لایەنی و زەبروزۆری ڕژێمە کۆنەپەرستەکانیش لەو ساڵانەدا لە برەو دابوون. کەسێکی وەک (تۆفیقی مەحموود ئاغا) هەموو خۆشی گوزەران و لانەی ئارامی و خێزانەکەی خۆی تێک دا و هەواری تێکۆشان و نیشتمانپەروەری و خزمەتی ئەدەبیاتی کوردی لە ئەستەموڵەوە گواستەوە بۆ عیراق و لە خاکی سلێمانیدا ژیایەوە و لە (پیرەکوردی) ئەستەموڵەوە بووە (پیرەمێردی سلێمانی).

(١٣٩) ژین (٨٢٠) ساڵی١٩٤٦

(١٤٠) ژین (٨٨٣) ساڵی١٩٤١

(١٤١) ژین (٩٥٣) ساڵی ١٩٤٩



### پیرەمێرد و سێ نووسینی مێژوویی:[142]

ئەم سێ نووسینە کە سەبارەت بەپیرەمێرد نووسراوە، بەلای ئێمەوە پێویست بوو سەرلەنوێ خوێنەری ئەمڕۆی کورد بیانبینێ و ئاگاداریان بێت لەبەر ئەم چەند هۆیە:

١- نووسینەکانی کورتن و لەلایەن ئەم بەڕێزانەوە نووسراون. نەجمەددین مەلا، عەلی کەمال باپیر، زێوەر. کە هەریەکەیان لەلاپەڕەکانی مێژووی ئەدەبیاتماندا جێگای تایبەتی خۆیان هەیە.

٢- نووسینەکانی لە کاتێکدا بڵاوبوونەتەوە کە پیرەمێرد خۆی لە ژیاندا بووە و بینیونی.

٣- ئەگەرچی نووسینەکانی کورتن و سادەن و قووڵ بوونەوە و لێکۆڵینەوەی زانستی نین بەرامبەر ژیان و شیعر و بەرهەمی پیرەمێرد، بەڵام لە ڕووی نرخی مێژووییانەوە و لە چاو ئەو کاتەدا کە نووسراون جێگای بایەخن.

٤- لەو نووسینانەدا دەتوانین گەلێ زانیاری نوێ و خاڵی گرنگ لەبارەی پیرەمێردەوە بەدەست بهێنین.

٥- هەر لەو سەردەمەشدا کە پیرەمێرد لە ژیاندا بووە دوو نووسینی گرنگی تریش کە لەو سێ نووسینەی پێشوو فراوانتر و زانستی ترن نووسراون، یەکەمیان لەلایەن مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) و لە ساڵی ١٩٤١دا لەبەرگی یەکەمی (کتێبی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)دا بڵاوی کردۆتەوە. دووهەم لەلایەن مامۆستا (عەلائەددین سەجادی) و لە ساڵی١٩٤٣ لە (گۆڤاری گەلاوێژ)دا بڵاوکراوەتەوە. وە لە ساڵی ١٩٥٢دا دووبارە لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا مامۆستا سەجادی بڵاوی کردەوە.

پیرەمێرد ئەم نووسینەی مامۆستا سەجادی زۆر بەدڵ بووە و لە بارەیەوە نووسیویە:

«لەدیباجەی ئەمجارەی گەلاوێژدا عەلائەددین سەجادی منی بەوێنەیەکی خۆم ئاساییەوە خستۆتە گەلاوێژەوە خۆمی پێ لەخۆم گۆڕیبووم. عەلائەددین کەمتر لە چەند و چوونی من و زۆرتر لە بەرزی خەیاڵی خۆی و دڵپەسەندی و بڵندی خاکەکەی خۆی دواوە...هتد».

١- ئەو سێ کورتە نووسینە مێژووییەی سەبارەت بە پیرەمێرد نووسراون لەم سەرچاوانە وەرگیراوە.

أ- کەشکۆڵی نەجمەددین مەلا، کە ساڵی ١٩٣٧ بۆ (محەمەد ئەمین حەمە ساڵح ئاغای قزلجی) نووسیوە. لاپەڕە ٢١٤.

(١٤٢) ئەو سێ کورتە نووسینە مێژووییەی سەبارەت بەپیرەمێرد نووسراون لەم سەرچاوانە وەرگیراون.

ب- گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم، ١٩٣٩- عەلی باپیر ئاغا.
ج- گەنجینەی مەردان، زێوەر ل ١٤٧-١٥٠.

***

**نووسینی یەکەم:**

نەجمەددین مەلا، ١٩٣٧ زایینی

حاجی تۆفیق بەگ کوڕی مەحموود ئاغایە، لە خێڵی عەزیز مەسرەف و هەمزە ئاغای وەکیلی خەرجی ئەحمەد پاشای (بابانە). لە ساڵانی ١٢٨٩ھ لەشاری سلێمانی هاتووەتە دنیا. لە حوجرە خوێندوویەتی، هەتا بووە بەمیرزا. لەپاش ئەوە بووە بەکاتب و ئەمینداری (شێخ مستەفای نەقیب) لە سلێمانی.

وەختێ شێخ مستەفای نەقیب چۆتە ئەستانبول حاجی تۆفیق لەگەڵی چووە. لەوێ چووەتە مەدرەسەی حقوقەوە. لە پاش دەرچوونی بەگەلێ وەزیفەی ئیداری لە ئەستانبول ڕایبواردوە و بووە بەسەرنووسەری غەزەتەی (پیام صباح). لە ساڵی ١٩٢٦م بیری وەتەنی کردووەتەوە، ڕوو بەسلێمانی خشاوە و لێرە بووە بەرەئیسی کۆمەڵی زانستی و سەرنووسەری غەزەتەی (ژیان). ئێستا کە ساڵی ١٩٣٧ی میلادییە، لەم وەزیفەیەدا دەوام دەکا. تۆفیق ڕەفیقی بێ.

هەروەها نووسیویە: حاجی تۆفیق بەگ زیاتر لە تەرجەمەی شیعردا وریایی هەیە. شیعری عەرەبی، تورکی، فارسی، ئەگۆڕێتە سەر کوردی، عەینەن، بەشیعر مەعناکەی تێک نادا، بەرگی کوردی ئەکا بەبەرا.

دیسان حاجی تۆفیق بەگ دیوانی مەولەوی کە زمانی هەورامییە کردوویەتی بەزمانی کوردی سلێمانی.

چەند سەرنجێک لەبارەی ئەم نووسینەوە:

١- نەجمەددین مەلا ناوی ڕۆژنامەی (پەیام صباح)ی نووسیوە، کە پیرەمێرد سەرنووسەری بووە. بەڵام لە هەموو ئەو سەرچاوە باوەڕپێکراوانەی لای ئێمەن ناوی ڕۆژنامە یا گۆڤارێکی وەهای تیا نییە. پیرەمێرد خۆی لە زۆر موناسەبەدا باسی هەموو ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی کردووە کە تیایدا نووسیوە، بەڵام لە هیچ جێگەیەکدا باسی بلاوکراوەیەکی وەهای نەکردووە و نازانین نەجمەددین مەلا ئەو زانیارییەی لە کام سەرچاوە وەرگرتووە.

٢- نووسیویە کە پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٢٦ی زایینیدا هاتۆتەوە بۆ سلێمانی. بەڵام لە ڕاستیدا لە مانگەکانی دوایی ساڵی١٩٢٤دا لە تورکیاوە بەرەو حەڵەب هاتووە و لەوێوە بۆ بەغدا و لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٥دا گەیشتۆتەوە سلێمانی. بەڵگەی ئەم ڕاستییەش ڕۆژنامەی (ژیانەوە)یە کە لە ژمارە ١٤ی ٢ی شوباتی١٩٢٥دا هەواڵی گەیشتنەوەی پیرەمێردی بەم جۆرە بلاوکردۆتەوە:

«جەنابی تۆفیق بەگی مەحموود ئاغا کە بیست و سێ ساڵە لەوەتەن دوورکەوتۆتەوە شەوی ٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩٢٥ تەشریفی هاتەوە. مەملەکەتەکەمان بەقدوومی ئەم زاتە زۆر





مەسروور و پێخۆشحاڵە. بەناوی هەموو خۆڵاتیەکەوە بەخێرهاتنی دەکەین».

٣- مامۆستا نەجمەددین مەلا کاتێ باسی وەرگێڕانی شیعرەکانی مەولەوی دەکات لەلایەن پیرەمێردەوە نووسیویە «دیوانی مەولەوی کە زمانی هەورامییە کردوویەتی بەزمانی کوردی سلێمانی». کە دیارە لەوێدا دەبوا بینووسیایە شێوە زمانی هەورامی یاخود گۆران کە هەورامیش بەشێکە لە شێوە زمانی گۆران. بەڵام دیارە ئەمە ناکرێتە ڕەخنە لە مامۆستا نەجمەددین مەلا، چونکە نابێ لەبیرمان بچێت کە ئەو نووسینە ساڵی ١٩٣٧ نووسراوە و ئەوکات وەکو ئێستا دابەش کردنی شێوەکانی زمانی کوردی و ڕێزمان و ئەو ناوانە نەبوون کە ئێستا هەن و گەلێ کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە لە بارەیانەوە دواوە.

هەڵبەتە لایەنەکانی گرنگی و نرخی ئەم نووسینە لەو لایەنانە زۆرتر و باشترن ئێمە سەرنجمان دانێ و ڕاستمان کردنەوە.

**نووسینی دووەم:**

## پیرەمێرد - حاجی تۆفیق بەگ

عەلی باپیر ئاغا (١٩٣٩)

«حاجی تۆفیق بەگ، کوڕەزای هەمزەی مەسرەفە، ئەمساڵ پێی ناوەتە حەفتا و دوو. زۆرزانە. لە زەمانی عوسمانیدا وەزیفەی بینیوە. دوایی لە متصرفی ئەماسیەوە تورکیەی بەجێ هێشتوە کە حکومەتی عێراق پەیدا بووە ئەویش هاتۆتەوە، ساڵەها خزمەتی زانستی و زبان و ڕۆژنامەگەری کردووە.

خەریکی ئەوەیە کوردی لە زنجیرەی قافیەی بێگانە و تورەهاتی طرەی زوڵف و خەتی دەوری لێو و خاڵی دانە دەرکا. ڕەوان، ئاسانی گران مەعنایەکی جوانی بێ.

ئەسەری زۆری هەیە و چاپخانەیشی داناوە، هێشتا شیعری خۆی چاپ نەکردووە و دیوانی مەولەوی لە زبانی هەورامییەوە کردووە بەزبانی خۆمان، وەزن و مەعنای نەگۆڕاوە. شیعری نموونەی کوردی پەتییە. وانەی بێگانەی تیا نییە، سێ غەزەلی هەریەکە لە وەرزێک ئەنووسین».

چەند سەرنجێک لەبارەی ئەم نووسینەوە:

١- مامۆستا عەلی باپیر ئاغا هەروەک مامۆستا نەجمەددین مەلا زمان و شێوە زمانی بەیەک دیاردە داناوە و وەک ئەمان لەو سەردەمەدا دابەشکردنی شێوەکانی زمان و لێکۆڵینەوەیان هێشتا پەیدا نەبووبوو.

٢- تەمەنی پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٣٩دا کە عەلی باپیر ئاغا لەو ساڵەدا کتێبەکەی نووسیوە دەکاتە ٧٢ ساڵ، نەک ٧٠ ساڵ.

٣- لەو نووسینەدا، ئەگەرچی کورت و سادەیە، بەڵام دەستنیشانی گەلێ خاڵی گرنگی

کردووه، که جێگای چەندەها باس و لێکۆڵینەوەن.
وەک: ڕزگارکردنی شیعر له زنجیری قافیەی بێگانه، ڕزگارکردنی لەلاسایی کردنەوه، وەکو باس کردنی زوڵف و خاڵ و ڕوو و خەتی لێو و... هتد، دۆزینەوەی ئوسلوبی ئاسانی گران (سهل الممتنع)، که یەکێکه له سیفەته گرنگەکانی شیعری پیرەمێرد، مانا و مەبەستی جوان، واتا گرنگی دان بەناوەڕۆک پێ بەپێی ئەو شێوه ئاسانه، بەکارهێنانی زمانی خۆماڵی کوردی پەتی و لاخستنی وشه و واتای بێگانه. ئەم نووسینەی مامۆستا عەلی باپیر نرخێکی زانستی خۆی هەیه و له مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا نابێ فەرامۆش بکرێت.

## نووسینی سێیەم:

# پیرەمێرد

زێوەر

ڕەفیقی سەفەر و حەزەرم، دۆستی دانا و موعتەبەرم، پیرەمێردە، که ناوی حاجی تۆفیق بەگه، ئەم پیره له سولەیمانی تەحسیلی ئیبتدائی تەواو کردوه، له ئەستانبووڵیش حقوق. جەنابی حەق بەهرەیەکی وای له عیلم و مەعریفەتدا داوەتێ ئەتوانم بڵێم له سولەیمانیدا هاوتای نییه. له پاش تەحسیلی ئیبتدائی مەهارەت و ئیقتدارێکی تەبیعی له کیتابەتی تورکی و فارسی و عەرەبیدا بوو، بەو واسیتەوه حوکومەت موحتاج بوو بەکەسێکی وا له وەزیفەدا ئیستخدامی بکا. بەباشکاتبی مەحکەمه تەعین کرا، مودەتێ لەسەر ئەو وەزیفەیه بوو. نەقیب شێخ موستەفا ئیحتیاج بوو بەکاتبی خسووسی بۆ لای خۆی، دڵخۆشی دایەوه. بردیه لای خۆی که عەینی معاشی حوکوومەتی بداتێ و مەسرەفی جل و بەرگ و خواردنی ماڵ و مناڵیشی عەلاوه بێت. خۆیشی دائیما لەسەفەر و حەزەردا له خدمەتی خۆیدا بێت. هەموو تەدارەکاتی و ئەسپی سواری و مەیتەر بۆ ئەسپی ببێت. بەم شەرائیته چووه خدمەتی شێخ موستەفا، تەرکی خدمەتی حکوومەتی کرد، که حوڕیەت و سەربەستی لەوێدا زیاتربوو. ئەویش تەحریراتی بۆ ویلایەت یا ئەستەنبووڵ یا موتەسەڕیفیەت ببوایه ئەینووسی و ئیش و کارێکی نەقیب له دائیرەێکدا بوایه ئەچوو تەعقیبی ئەکرد. باقی بەڕاووشکار له خدمەت نەقیبدا ڕای ئەبوارد. تا له خدمەتیا چوو بۆ ئەستەنبووڵ و له ئەستەنبووڵەوه ئیشتیراکی سەفەری حیجازیشی کرد. نائیلی تەوافی (بیت الله) بوو. که نەقیب له مەککەی موکەڕڕەمه وەفاتی کرد له خدمەت شێخ سەعیددا دێتەوه ئەستەنبووڵ، لەوێدا مایەوه، نەهاتەوه سولەیمانی بەواسیتەی ئیستیعدادی تەبیعی لەسەر وەزیفه موعەتتەل نەبوو، کرا بەمودیری ناحیه، بەقائیممەقام، هەتا موتەسەریفی تەرفیعی کرد. له ئیعلانی مەشرووتیەتی عوسمانی لەگەڵ کوردەکانی ئەستەنبووڵ جەمعییەتیان دروست کرد بۆ خدمەتی کورد و نەشری غەزەته و مەجەللەیان دەست پێ کرد. ئەمجا کەوته خدمەت کردن بۆ میللەت و وەتەن بەهەموو ڕەنگێ له خدمەت دوانەکەوت.



لەپاش چەند ساڵ و کەشاکەشی حوڕڕیەت پەروەرانه هاتەوه سولەیمانی له سولەیمانیش له خزمەت زیادی کرد. غەزەتەی (ژیان )و (ژین)ی بیست و پێنج ساڵ بەفیکری بیکری، بەقەڵەمی ئاگرینی بڵاو ئەکردەوه، ئەدەبیاتی کوردی ژیاندەوه. بەچەند سەترێکی غەزەتەکەی پەندی پێشینانی هێنایەوه بەرچاو، که ئەو پەندی پێشینانەی دیوانێکی مەنزوومی خۆیەتی.
هەر بەخدمەت کردن، نووسین ڕازی نەبوو، کەسێ ئیشێکی ببوایه یا موحتاج، خۆی (بالذات) شوێن ئیشەکەی ئەکەوت هەتا بۆی ڕێک ئەخست و دەفعی ئیحتیاجی مواراجیعینیشی لەلا وەکو فەرز وابوو. خوا تەبیعەتێکی وای داوەتێ پاره و ماڵی دنیا له نەزەریا بێ قەدر و قیمەته. ئەو مەعاشەی که بووی لەگەڵ مەنافیعێ له غەزەته پەیدای ئەکرد بەشی مەساریفی ئەو نەبوو که موجەڕڕەد و تەنهاش بوو.
جەژنی نەورۆزی له سولەیمانیدا زیندوو کردەوه، هەموو ساڵێ ئەووەڵی بەهار، نزیک سەد بار داری ئەکڕی لەلای گردی سەیواندا ئەیکردەوه بەئاگر و بۆ زائیرین خێوەت و ڕەشماڵ لەو دەشتەدا هەڵئەدرا. عوموومی مەئموورین و تەلەبه و توجارِ و ئەشرافی دەعوەت ئەکرد بۆ زیافەتی جەژنی نەورۆز. مەسرەفێکی زیاد له چێشت و گۆشت و حەلەویات و قاوه و چایی ئەکرا بۆ ئەم هەموو خەڵقه و ژنانیش بەجوێ خێوەت و ڕەشماڵیان بۆ ڕێکخرابوو ئەهاتنه ئەم سەیرانه. خولاسه ئەوی ئەو ئەیکرد و ئەو شادی و سورووره که دڵی ژن و پیاوی پێ خۆش ئەبوو، هیچ مەلیکێ له جەژنی نەورۆزدا نەیکردووه.
له خسووسی دیانەتەوەش هەتا له دەستی بێ، بێ قوسووره، ئەکسەری ساڵ مەولوودێکی پێغەمبەر له مزگەوتەکەی هەمزه ئاغا که ئەو مزگەوتەش باپیری ئەو بینای ناوه، ئەخوێنێ. حافز قورئان و مەلایان و تەلەبەی علووم دەعوەت ئەکا. ئەو مەولووده و تەعامێکی زۆریان بۆ ئەکا. له هەموو حەفلەیەک که لەسولەیمانیدا بۆ ئیعانەی مەعاریف بێت، یا فەقیران یا سائیره، حازره وەک دەعوەت کراوەکان بەقەدەر خۆی ئیعانه ئەدات وه زیاد لەوان بۆ تەرغیب خوتبەش ئەخوێنێ.
ئەو جەژنی نەورۆزەی له سولەیمانیدا زیندووی کردەوه تەئسیری کرده ڕۆحی هەموو تەلەبەی مەداریس. له هەولێر، کەرکووک، له کۆیه، له سەلاحیه، له خانەقین، حەتتا له شاری بەغدا. ئەم جەژنه بەزەمزەمه و خۆشییەوه ئیجرا کرابوو. تەبیعەتی مەوزوونی ئاساری له غەزەتەکانیا دەرئەکەوێ. ئەدیب، شاعیر، دانا، نیکتەگۆیه. ئەمما قەڵەمی له نەسرا بێ میسله، کەس نایگاتێ، خوا ئەم پیرەمێردەمان بۆ ئەم نەوعه خدمەتانه لێ نەستێنێ.

## چەند سەرنجێک دەربارەی ئەم نووسینه:

١- نووسینەکه بەشێوەیەکی گشتی باسی هەموو لایەنێکی ژیان و بەرهەم و کەسێتی پیرەمێرد دەکات. ڕۆشنایی خستۆته سەر گەلێ لایەنی شاراوەی ژیان و بەرهەمی پیرەمێرد. جۆره ناساندنێکی پیرەمێرد بەخوێنەر. ناساندنێکی تێکڕایی.
٢- ئەوەی زۆرتر گرنگ بێت لەم نووسینەی زێوەردا بەلای منەوه ئەوەیه سەرەڕای باسکردنی شاعیریەتی پیرەمێرد باسی قەڵەمی پەخشان نووسینی دەکات، که بەڕاستی زۆرجار هەندێ

پەخشـانی هونەری نووسـیـوە لە گـەڵێ شـیـعـری خـۆی بەهێـزترە. زێوەر زۆر بـەدڵنیـایی و پێ داگرتنەوە بەم شێوەیە باسی توانای پەخشان نووسینەکەی دەکات «ئەمما قەڵەمی لەنەسرا بێ میسلە، کەس نایگاتێ!».

**تکایە لە پەراوێزەکاندا تەماشای ئەم تێبینیانە بکە:**

١- پ. واتە پیرەمێرد

٢- م. ه واتە محەمەد ڕەسوڵ هاوار

٣- ن.م واتە نەجـمەددین مـەلا لە کـەشکۆڵی مـحـەمەد ئـەمین حەمـە ساڵح ئاغـای قـزلجیـدا کە بەخەتی خۆی بۆی نووسیوەتەوە ساڵی ١٩٣٧.

لە پ. دا پشـتـمـان بەشـیـعـرەکـانی ڕۆژنامـەکـانی ژیان و ژین بەسـتـووە، کـە پیـرەمێـرد خـۆی سەرپەرشتی کردووە.

## له ترەنی ڕێی ئەستەموڵدا بێژراوە[1]

**١٩٢٤**

ئەوا ڕووم کردە تۆ، ئەی دایکی مشفق، بیست و پێنج ساڵە[2]
لە غوربەتدا، بەیادی تۆ ئەژیم، خوا شاهێدی حاڵە
بەیانی دا، نەسیم لای تۆوە هات، بۆنی وەتەن پێوە
ئەوا نووسرایەوە پیرانە سەر، عومرم لەسەرنوێوە
ئەڵێن نەفخەی حەیاتی[3] پێوەیە، بادی[4] بەهار وایە
بە سروەی بای وەتەن ماوم، بەهار و بای لەلام بایە
ترەن[5] جووڵایەوە، وا کەوتەڕێ، باوەڕ بەخۆم ناکەم
خەوە یاخود خەیاڵ، یا ڕاستە ئەم حاڵی فەرەحناکەم
هەوای تەختی (سلێمان)ی[6] هەیە، بادی (ترەن)، بابێ
بڵێ[7] بابێ، لە شەهبا[8] بێ، لەفەیحابێ[9] لە زەورا[10] بێ
بەچاومابێ ئەگەر تۆزێ، لە تۆزی بای سلێمانی[11]
کە نووری (طور)[12]ە، توورێک[13] نایەنێ، سوورمەی سلێمانی[14]
کە با، بۆنی گوڵێکی کانی با[15] بێنێ، لەلام وایە
تەڵای کەیخوسرەوی[16]، وەک گەنجی باداوەر هەمووی بایە
گزنگی ڕۆژ[17]، ئەداتە بەفرەکەی شاخی عومەر گدروون[18]
بریقەی خۆشترە لای من، لە دوڕڕو گەوهەری قاروون[19]
بە ئاواتی ئەخوازن خەڵک، تەعامی مائدەی عیسا
لەلام حەڵوا گەزۆیە نایەنێ، دەستم کەوێ ئێستا[20]
سەبا[21] دێنێتە گوێم، دەنگی مناڵانی قوتابخانە
نەشیدەی[22] میللیان لاهووتیە، قووتی دڵ و جانە[23]
ئومێدم[24] وایە، ئەم دەستە کوڕانە، مەشعەلێ[25] هەڵکەن
لە تاریکی جەهالەتدا[26] بەزانستی وەتەن دەرکەن[27]

---

(١) لەرۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی (١٩٢٦)دا ئەم ناونیشانەی بۆ دانراوە. پیرەمێرد خۆی وەهای ناردوە بۆ بڵاوکردنەوە.

(٢) ١٩٠٠ هەتا ١٩٢٥ دیارە کە بیست و پێنج ساڵە.

(٣) م. ه نووسیویە (ژیان) بەڵام شاعیر خۆی نووسیویە (حەیات).



(٤) باد: با، هەوا.

(٥) لەوشەی (train)ی ئینگلیزییەوە بەواتای شەمەندەفەر.

(٦) مەبەست لە تەختی سلێمان پێغەمبەر و هەروەها شاری سلێمانییە.

(٧) لە م. ه.دا نووسراوە (بلا) کە بەشێوەی بادینانی واتە (دەبا)– م. ه.

(٨) شەهبا: شاری حەڵەب– م. ه.

(٩) فەیحا: شاری شام– م. ه.

(١٠) زەورا: شاری بەغدا– م. ه.

(١١) سلێمانی: شاری سلێمانی.

(١٢) نووری طور: ڕووناکی چیای طور، سەرچاوەی ئەمە لە قورئاندا هەیە.

(١٣) توور: سەلکەتوور.

(١٤) مەبەست لە سلێمان پێغەمبەرە.

(١٥) کانی با: لای م. ه. نووسراوە، کانیەکی بچووکە لە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانیدا، گردێکی لە تەنیشتەوەیە، دار و شەخسێک بەسەر ئەو گردەوەیە کە لە بەهارا سەیرانکەران بەتایبەتی ئەچن بۆ ئەوێ بۆ سەیران و لای هەندێکیان وایە کە ئەو شوێنە بۆ باداری باشە.

(١٦) کەیخوسرەو.

(١٧) لای م. ه بووە بە (گزنگی خۆر) پیرەمێرد کە بڵاوی کردۆتەوە (گزنگی ڕۆژ)ی نووسیوە. بڕوانە ژیان ژمارە ٣٦ ساڵی ١٩٢٦.

(١٨) عومەر گدروون بە بەسەرچوونی ڕۆژگار بووە بە پیرەمەگروون.

(١٩) قاروون: کابرایەکی زۆر دەوڵەمەند بووە لە کۆندا.

(٢٠) پیرەمێرد لە ڕۆژنامەکەدا وەها بڵاوی کردۆتەوە. بەڵام لای م. ه. بەم جۆرەی لێ هاتووە: هەمووی حەڵوا گەزۆیەک ناهێنێ دەستم کەوێ ئێستا.

(٢١) لای م. ه سەبا بووە بەشەماڵ، بەڵام لای پ، ن.م وشەکە سەبایە.

(٢٢) لای م. ه بووە بەنەشید لای پ، ن. م (نەشیدەی)ـە.

(٢٣) لای م. ه نووسراوە گیان بەڵام لای پ، ن. م نووسراوە جان.

(٢٤) لای م. ه نووسراوە هیوام پێیانە. لای پ، ن.م (ئومێدم وایە) نووسراوە.

(٢٥) پ. نووسیوە، مەشعەل. لای م. ه بووە بەمەشخەڵ!

(٢٦) لای م. ه بووە بەنەزانین بەڵام لای پ،ن.م (جەهالەت)ـە.

(٢٧) بەهۆی زانست و زانینەوە نیشتمان لە نەزانین ڕزگار بکەن.

***

## دامەزراندنی کۆمەڵەی زانستی(١)

بەرزو بڵندە هێند، دەرەجەی خاکەکەی وەتەن
هێشتا بەهاری ئێمە نەهات، سەوز نەبوو، چەمەن
چوار لا بەهارە، بەزمە، سەدای ساز و زیلەیە
لای ئێمە، هەر شەستە، سەر بەکڵاوە و(٢) ڕەهێڵەیە
نیسان بەهاری ئێمەیە، وا چاوەڕێین کە بێ
هەر قەترەیەکی، گەوهەرە، تەرزەی لەگەڵ نەبێ
زستان گەلێ(٣) بەزوقم و هەڵا بوو، ئەمانەوێ
پاداشتی ئەو هەڵڵایە، بەهارێکی دەرکەوێ
هەر گۆشەیەکی خاکی وەتەن، بێتە گوڵشەنێ
هەوری بەهار بگری، چەمەن شاد بێ، پێکەنێ
سەر هەر چڵێ(٤)، گوڵێ، سەدایەکی(٥) بولبولێ
بەزمێکی جەم بێ، بادە وەکو کانی، هەڵقوڵێ
هەر بێشەیەکی، پڕ لە هوژەبرو پڵنگ و شێر(٦)
بۆ ڕۆژی ئیحتیاجی وەتەن، جانفیدا و دلێر
لەفزێک چەند موهەیجە، ناوی وەتەنی کەریم
بیبیەم، سەماعی عالەم، لاهوتە دێتە گوێم(٧)
مژدەی بەهاری پێیە، شکۆفەی نیهالی گوڵ
وەکو ئایەتی ژیانەوە(٨)، ئومێد ئەدا بەدڵ
ئەمشەو(٩)، گوڵی ئومێدی وەتەنمان ئەپشکوێ
میللەت ئومێدەوارە بەزانستی پێشکەوێ
زانستییە، سەویەی(١٠) میللەت بڵند ئەکا
زانستییە، کە ئێمە بناسێت بەئەوروپا
زانستی زۆر بەقیمەتە(١١)، ئومێدی ئاتییە(١٢)
ئەم ئیحتفالە فەئلە(١٣)، ڕوو لە هاتییە
تۆفیقی هەق، ببێتە(١٤) ڕەفیقمان لەم ئیشەدا
وا دەست لە دەست، هەڵبەتە خوا قوەتیش ئەدا

(١) دەربارەی کۆمەڵەی زانستی کوردان، بڕوانە کتێبی (کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی) غەفووری میرزا کەریم، ساڵی ١٩٨٥ لە چاپ دراوە. ئەم شیعرە پیرەمێرد خۆی لە ژمارە ١٣ی ڕۆژنامەی ژیانی ساڵی ١٩٢٦دا بڵاو



کردۆتەوە.
(٢) سەربەکڵاو ـ بەخوڕزەم
(٣) لای پ. نووسراوە گەلێ و لای م. ھ بووە بە گەلێک
(٤) لای پ. نووسراوە چڵێ لای م. ھ بووە بە چڵێک
(٥) هەمان شێوەی پێشووە.
(٦) لە م. ھ دا وشەی پڵنگ نەنووسراوە
(٧) ئەم بەیتە لە ڕۆژنامەکەدا هەیە و لای.م. ھ نەنووسراوە
(٨) ئایەتی «يحيي الأرض بعد موتها»
(٩) پیرەمێرد شەوی ٦ی نیسانی ساڵی (١٩٢٦) لە ئاهەنگی کردنەوەی کۆمەڵەی زانستیدا ئەم شیعرەی خوێندۆتەوە.
(١٠) م. ھ نووسیویە (پلەی ولات) بەڵام پ. خۆی نووسیویە، سەویەی میللەت. واتا: تای ترازوو
(١١) لای پ. بەقیمەتە، لای م. ھ بۆتە بەنرخە.
(١٢) ئاتی: داهاتوو، پاشەڕۆژ
(١٣) فەئل: سەرەوخێر. فاڵ
(١٤) پ. نووسیویە، ببێتە. م. ھ نووسیویە، بێتە

***

## ختوکەی شاعیرێکە تێدەگا خۆی

١٩٢٧

دیومە بولبول، شەو دەخوێنێ، بۆ من و تۆ، خۆ، شەوە
شەو، خەوە، خەو شەو، چە خۆشە، خەو بەشیعری خۆشەوە

***

شەوێ لەگوێ شەتی بەغدا، خەیاڵی کوردم ئەکرد(١)
گەلێ لەگەڵ بەجێ مابووم، دەستوبردم ئەکرد
بەباڵی شیعر و خەیاڵ، کەوتمە پەلە و تەک و تاز
لە ئاسمانی سەرفرازی، بەجارێک کەوتمە پەرواز
فەزای ئومێدم ئەدی، بێ نیهایەت، ڕۆشن، ساف
تلووعی تالعی کورد، بووبووە نووری پەردەشکاف(٢)
کە دیم، دەوڵەتی تازەی، شوێن دەوڵەتی عەباسی
منیش ئەکەوتمە خولیا، خولیای لالە عەباسی
خەتی حدودم ئەکێشا لە خاکی ڕۆم و عەجەم
بەپانی فەیلی و لوڕ و زەهاویشم دابووە دەم

لە ڕاستەوە سابلاخ بوو هەتا خەتی حەکاری
لەبەر تەماسی شیمال لازمە هەتا (چاری)[٣]
کە ڕاست و چەپ ئەمە بێ، ڕوو لە ڕۆژهەڵات بڕۆ
هەموو قەومی خۆمانن، ڕەنجەڕۆن و سەرەڕۆ
ئومێدی زۆر بەکوردی موکریانە، دیندارن
بەڵام لە دەست، گەڕی زاڵم، کەساس و خەمبارن
ئەلەکتریک لە بەرانانەوە، هەتا گۆیژە[٤]
تەلی بەسەر شارا ڕاکێشرابوو بەبێ پەیژە
لە ڕاستی تەختی سلێمانی، چوار پێنج ئەوەندەی مانگ
گڵۆپی نوور، دەروو ژوور، ڕووناک ئەکاتەوە، تا بانگ[٥]
تەرەسوداتی[٦] تەلەسکۆبی، لەسەر عومەر گدروون
لە پێش قوللەی ئیڤل[٧]، بۆی لواوە کەشفی شئوون
لە سەرچنارەوە تا تانجەڕۆ، لە ڕیزی چەم
بوخاری ماکینە، ڕووی ئاسمانی، کردووە بەتەم
لە گوڵپ[٨]ەوە چەمی خواجایی[٩] هەتا شنروێ[١٠]
بەپێی تەبیعەتی بەگزادە، مونتکارلو[١١]ی ئەوێ
بە تاڤگەی سەری زەڵم بۆچی نەڵێم نیاگارە
ئەوەندە بەفەیزە، پڕیشکی کەفی گەوهەر بارە
ئەساسی مەرکەزی تەیارەخانە لای خورماڵ
مواسەڵاتی لەگەڵ ئەوروپا ئەکات ئیکماڵ
تونێڵ بەناو گۆیژە و تاریدەرا وەکو تووس
خەتی شەمەندەفەری پێ گەیییە ناو خاکی ڕووس
دەماری مەعدەنی ئاڵتونی شاری عەواڵان
تیجارەتی هەموو دنیا، کێش ئەکا وەکوو تاڵان
بۆری نەوتی سپیمان، گەیشتە بەحری سپی
شکستی خوارد، ئەمەریکا، کە بیری نەوتی تەپی
لە گۆیژەوە سەرکەوە، بۆ ئەزمر هەتا قەیوان
بەریزە، ئوتێل و ئەیوانی گەیوەتە کەیوان
ئەمانە، من بەخەیاڵ، یا بەخەو کەوا ئەمدی
هیوام بەخوایە، بۆ کورد، بەڕاستی بێنێتە دی



بەفەیزێتی سابیتە، هەولێر، دیبەگە و، مەخموور
ڕەواجی دەغڵی، پێستەی[١٢] بیلادی[١٣] خستە فتوور
هەموو تیجارەتی ئیزمیر[١٤]، تەنها بەهەنجیرە
ئەوەندە زۆرە، ئەترشێ و فڕێی ئەدەن لێرە
خەڵووزی ماوەت، ئەڵماسی مۆمیای دەوری (خاوێ)[١٥]
ئەمانە بێنە برەو، مەعدەنی تری، ناوێ
سەهۆڵی پیری موبارەک[١٦]، بۆمانتی[١٧] سەر قەندیل
دەماری نەوت، یەک بگرن، ئەبێتە ڕووباری نیل
داری میوەی بەرداری، داری کەرستەی بەرزی
چەوەندەر و گێزەری، لەگەڵ سێوی بن ئەرزی
گەزۆ، بنێشت، کەتیرە، سمۆرە، ڕێوی، دەڵەک
بەراز و گورگ و چەقەڵ، ئاسک و پڵنگی بەڵەک
برنج و تووتن و مازوو کەتیرە و سەعلەب
خوری و پەنیر و مەڕی جاف، گەیشتە شاری حەڵەب[١٨]
ترێ و هەنار و بەهێ، قۆخ، هەڵووژە، سێو، گێلاس
کەما، چنوور، بەڕەزا، کاشمە و قارچک و ڕێواس
بەقوەتی ئەمەوە، ویسعەتی قەریحەم بوو
لە خاکی ڕۆم و عەجەم، گەیشتمە مەتڵەبی زوو
وەختێ لەوێ هاتمەوە، ڕووم کردە دجلە و بەغدا
کەچی خیلافی ئەمەل، موشکلات ئەبوو پەیدا
وەکو سەدای بێگانە، جۆششی ئاوی دجلە
بەعارەبی بانگی کرد وتی: لاتجی وەحلە
وەختێ چاوم هەڵبڕی، لۆزەندەیێکی لنگ ڕووت
بەیابە ڕووی کردە من و عەتابەی ئەوت
تەمای بوو بێتە سەرم، تۆپزی لە دەس ئاڵان
چاوی کەوت بەخەنجەری کوردی ڕای کرد تێی تەقان
لە گوێم دێ، دەنگی لای لایەی وەتەن، دایک جگەر سووتاو[١٩]
ئەڕژێنێ بەسەر وێرانەکەی خوێناوییا خوێناو
ئەلاوێنێتەوە و ئەگری، سەری شینە لە ماتەمدا
شەو و ڕۆژ، کۆتەڵی منداڵەکانی[٢٠] وا لەبەردەمدا

ئەڵێ: لەو فیتنەیەی کوردا، کوڕی چاکم نەما کوژران[21]
ئەوەش مابوون[22]، هەموو مردن، لە برسا بێ کفن نێژران
خودا پاداشتی ئەم تەنگانەیەی وا دایەوە، وام دی
بەپێی خۆی هاتە بەرپێم، تاجە[23] گەوهەردارەکەی کوردی
صلاح الدین جەلالی وای نەبوو، تەئریخ لە پێش چاوە[24]
هەموو پاشای[25] بابان مردن، بەحەسرەت ڕۆژێکی واوە
شەوێ دەس ئەهرەمەن کەوت، خاتەمی موڵکی سلێمانی[26]
کەچی، میر و گزیری پێ ئەکرد، قەدری وەها زانی
بەدەم ئەم ناڵەوە، دەستی درێژ کرد، خستیە سەرشانم
وتی: تۆفیق هاتیتەوە، بۆ باری میحنەت ئەیزانم[27]
بەڵێ حاڵم پەشێواوە، فڕندە باڵی سووتاندووم
نەما غەیری کەلاوە، شەو بناڵێنە لەوێ وەک بووم
وتم دایە، کە دایکم مرد! نەگریام، چونکە تۆ ماوی
ئەگەر ئەولادەکانیشت بکوژرێن، تۆ ئەبێ چابی
قەسەم بەو عەزمی کوردەی شانی ڕیچارد[28]ی بەشیر ڕووشان
کڵاوی کورد ئەبێ قووچ بێ کە هاتوو شانی خۆی جووڵان
شەوێ، پیاوێ، لە بەفرا، ما، نەمرد، ئاگرێکی دووری دێ
لەلای من نائومێدی کفرە، ئەم ئاگرەی دڵم بۆ کێ

.........................................

(١) پیرەمێرد لە ژیانی ژمارە ٤٤٧ی ساڵی ١٩٣٥دا باسی ئەم شیعرە دەکات و دەنووسێت: لە ساڵی ١٩٢٦دا لە بەغدا مەنزومەیەکم نووسیوە، خەیاڵە و لەگەڵ کەهانەتدا تێکەڵ. سەربەندی ئەمەیە: شەوێ لە گوێ شەتی بەغدا...هتد.

(٢) پەردەشکاف: پەردەدڕ، تاریکی لابەر.

(٣) چاری، ناوچەیەکە لە هەرێمی (شوکاک) کە جاران بەشی ئیسماعیل خانی سمکۆ بوو لە کوردستانی ئێران. م. ه

(٤) بەڕاستی پیرەمێرد لەم شیعرەدا وەستایەتییەکی وردی نواندووە و هەموو وجودی کلّپە و گڕێک بووە بۆ ڕۆشن کردنەوەی ئاواتی ئەو کوردستانەی ئەو خەوی پێوە دیوە.

(٥) تا بانگ تا بانگی بەرەبەیان، هەتا دنیا ڕۆشن دەبێتەوە.

(٦) وشەکە عەرەبیە و لە (رصد و مرصد) واتە ڕوانگەوە هاتووە.

(٧) مەبەست بورجی ئیڤلی بەناوبانگی فەرانسەیە لە پاریس.

(٨) گولّپ: گوندێکە لای ژوورووی شاری هەڵەبجە. م. ه



(٩) چەمی خواجایی چەمێکە نزیک شاری هەڵەبجەیە. م. ه

(١٠) شنروێ چیایەکە لە ڕۆژهەڵاتی شاری هەڵەبجە. م. ه

(١١) مونتکارلو: شارێکی بچکۆلەی سەربەخۆیە کە مەرکەزەکەی مۆناکۆیە و بەقومارکردن بەناوبانگە، بەگزادەکانی جافیش لە هەڵەبجەی ئەو سەردەمە بەوە بەناوبانگ بوون کە حەز لەقومار ئەکەن. پیرەمێرد لە شوێنێکی تریشدا باسی قومارکردنی جافەکان ئەکات.

(١٢) پیسە: جۆرە پارەیەکی بێگانە بووە. م. ه

(١٣) بەهەموو شتێکی بێگانەی جاران ئەوترا (بلادی). م. ه

(١٤) ئیزمیر: شارێکە لە تورکیا بەهەنجیر بەناوبانگە. م. ه

(١٥) خاوێ: گوندێکە لەناوچەی قەرەداغ لە سلێمانی.

(١٦) پیری موبارەک: نیازی لە چیای پیرەمەگروونە لە ڕۆژئاوای شاری سلێمانی کە هاوین و زستان هەمیشە سەهۆڵی پێوەیە.

(١٧) بۆمانتی: کارخانەی بیرەیە.

(١٨) ئەم بەیتە لە م. ه دا نییە.

(١٩) پیرەمێرد ئەم شیعرەی خۆی لە ڕۆژنامەی ژیانەوەی ژمارە ٣٤ی ساڵی ١٩٢٥دا بڵاوکردۆتەوە. یەکەم شیعری بڵاوکراوەیەتی دوای هاتنەوەی لە تورکیا شیعرەکەی جۆرە گلەییەکە لە شێخ مەحموودی حەفید.

(٢٠) لای م. ه نووسراوە منداڵەکانیت کە دیارە هەڵەیە.

(٢١) لای م. ه ئەم نیوە بەیتە وا نووسراوە «ئەڵێ لەو گەردشەی کوردا، کوڕی چاکم هەبوو کوژران» وابزانم ڕاستیەکەی ئەوەیە ئێمە نووسیومانە.

(٢٢) م. ه نووسیویە مابوو پ. نووسیویە (مابوون).

(٢٣) م. ه نووسیویە تاجی پ. نووسیویە (تاجە).

(٢٤) م. ه نووسیویە لەبەرچاوە لای پ. نووسراوە (لەپێش چاوە).

(٢٥) م. ه نووسیویە بەبان پ. نوسیویە (بابان).

(٢٦) مەبەستی نگینەکەی پێغەمبەر سلێمانە. ئەم دێرە تێهەڵکێشەی هی ئەحمەد بەگی ساحێب قرانە و پیرەمێرد لەم مناسەبەتەدا بەکاری هێناوە. م. ه.

(٢٧) شیعرەکە لەم بەیتەوە هەتا ئەو پێنج بەیتەی کۆتایی لە ڕۆژنامەکەی ١٩٢٥دا نییە و لەبری ئەو دوو بەیتەی تر نووسراوە. لەبەرچەند هۆیەک بەباشمان نەزانی بینووسینەوە. ئەوی مەبەستیەتی!! با تەماشای ڕۆژنامەکە بکات، هەروەها پیرەمێرد بە شیعری (ئەبێ بەخشندە) داوای لێ بووردن لە شێخ دەکات و، چونکە ئەو شیعرە وەرگێڕاوی شیعرێکی فارسییە. لە شوێنی خۆیدا دەینووسینەوە.

(٢٨) ڕیچارد شای ئینگلیز کە لە شەڕی سەلیبییەکاندا زامدار کرا.

***

سەر لەژێر سەدارە نانێم، کوردم و تەپلەم بەسە
جۆق و بۆق[1]م بۆ چییە، گۆرانی و چەپڵەم بەسە
ئاسمانی باوە پیارە، کاری بۆ فەیسەڵ[2] نەداین
مائدەی بۆ عەمر و زێد بێ، من بەڕوو خەپلەم بەسە

قەت گەزۆ ناخۆم، کە ناوی مەننە زادەی مننەتە
کوردی دۆشاو خۆرم و چرکی[٣] دڕی[٤] و ڕەزڵەم[٥] بەسە
هەر بەمندالّی لەسەر شاخی بلّند پەروەردە بووم
بەرزە ئەستۆم نانەوێ، بۆ مەسنەد ئەم ئەقڵەم بەسە
سانعی ئەم ئەرزە، ئێمەی خستە ژوور بەغدا بەجێ
زۆر بەجێیە، عوسبە[٦]، مۆری کرد و ئەم شەقڵەم بەسە
وەک غرامافۆن لە قەشقە، هەوهەوی سوارەی بەبان
هەر لەگوێم دێ ئێستەکەش، ئەم عەنعەنە و تەپڵەم بەسە
ئەو کەسی خۆی وا لەژێر خەڵکا ئەڵێ: سوارت ئەبم
ئەحمەدی سوارە و حەمەی خەتابم ئەم نەقڵەم بەسە[٧]
بۆچی وەک کەو جن خۆم ڕاکێشمە ژێر داوی بەلا
دانی گەنمی ناو قەفەز ناخۆم، گیا و گەپلەم بەسە

........................................

(١) جۆق و بۆق: نیازی لەو باندی مۆسیقایانەیە کە لەو سەردەمەدا لەبەغدا هەبووە.

(٢) مانای چاک و خراپ لێک جیاکەرەوە و نیازیش لە مەلیک فەیسەڵی یەکەمە کە لەو سەردەمەدا مەلیکی عیراق بووە. م. هـ.

(٣) چرکی: بەدۆشاوێک ئەڵێن کە دووجار کولاّبێت و زۆر خەست و توند بووبێتەوە م. هـ.

(٤–٥) ناوی دوو دێیە، دڕی لە ناوچەی ماوەتە، ڕەزڵە لە ناوچەی بەرزنجەیە. هەردوو دێیەکە بەترێ و دۆشاو و باسووق و سجووق بەناوبانگن.

(٦) عوسبە: عصبة الأمم کە لە جەنگی جیهانی یەکەمدا دانی بەمافی کوردا نابوو.

(٧) م. هـ لەم بارەیەوە نووسیویە: بۆ ئەحمەدی سوارە و حەمەی خەتاب پیرەمێرد ئەم چیرۆکەی خوارەوە ئەگێڕێتەوە، ئێمەش لێرەدا ئەم چیرۆکە بۆیە بلاّو ئەکەینەوە، بۆ ئەوەی دەری بخەین کە لەو سەردەمەدا دەمارگیریی گەیشتبووە چە ڕادەیەک. پیرەمێرد ئەڵێ لە ساڵی ١٢٤٢ی کۆچیدا عەبدولڕەحمان پاشای بابان بەخۆی و سوپاکەیەوە، ڕوو ئەکاتە شاری بەغدا بۆ داگیرکردنی، پاشا ئەسپێکی نایابی ئەبێ کە ڕەخت و شەقەبەندەکەی زێڕ ئەبێ، ئەحمەدی سوارە و حەمەی خەتاب هەردووکیان مەیتەر و ئێشکچی ئەو ئەسپە ئەبن، شەوێک لە ئارامگای سوپادا ئەحمەدی سوارە ڕەخت و شەقەبەندەکە ئەخاتە ژێر سەری نەوەکو لەو چۆڵە بیدزن. حەمەی خەتابیش ڕەشووی ئەسپەکە لە دەستی خۆی دەئاڵێنێ و بەهەردووکیان ئاگاداری ئەسپ و ڕەخت و شەقەبەندەکە ئەکەن. دوو عەگال بەسەر کە بەڕۆژ چاویان بەئەسپەکەی شا کەوتبوو بەشەو بڕیار ئەدەن کە ئەسپ و شەقەبەندەکە بدزن، کە ئەگەنە ئارامگای لەشکر ئەحمەدی سوارە و حەمەی خەتاب وریا ئەبن هەردوو عەگال بەسەر ئەگرن و ئیشیان بۆ چاک ئەکەن!!. جا پیرەمێرد هاتووە ئەو کردەوەیەی ئەو دوانەی بەشتێکی ئازایانە پیشان داوە.



## بۆ جەژنی لەدایک بوونی مەلیک غازی

١٩٣٩

یاخوا سەروەرمان، هەر شای غازی بێ
بەشمان بەغازی سەرفرازی بێ
ئەو نەسلی پاک و ئێمە قەومی چاک
پێکەوە بژین لە عالەم بێ باک

***

## شیوەنی شەهیدانی کوردی سەروو[١]

ئەم ئاسمانە شینە، کەوا بەرگی ماتەمە
تەحلیلی وا کراوە، قوببەی، غەمە، تەمە
چەرخێکی کۆنە ماکینەی ژەنگی گرتووە
چەوری نەکا بەخوێن پەکی سووڕانی کەوتووە
پیرەژنێکە هەر شەوەی شوویە ئەکا بەخەڵق
سووراو بەخوێنی مێرد ئەکا، پێی ئەڵێن شەفەق
گوڵگوون بەخوێنی عاشقە دێوجامەکەی فەلەک
چنگی پلّنگی ناوەتە ژێر تاقمی بەڵەک
گاهێ بەخوێنی ئالی نەبی سوور ئەبێ فورات
خوێناوی کوردی تێکەڵە دیجلە کە زیاد دەکات
سەرداری ئێمە بوو کە لەسەردار بەپێکەنین
بانگی ئەکرد «بە کوشتنی من میللەتم ئەژین»
ئەویان یەزیدی زاڵم و ئەم خائینی لەعین
تاکەی بەدەست ئەمانەوە یارەب ئەسیر بین
داوای حەیات ئەکەین، بەمەمات تێی دەگەن، بەشەر
فەرقی نییە، چ ژین و چ مردن و چ خەیر و شەڕ
لەم عەسری بیستەمەی مەدەنییەت، لە ئاخرا
هەر لایێکی قەنارە بوو، بۆ کوردە هەڵخرا
ئێستەش لە کەللە، قوللە دەکەن، دوژمنانمان
زکیان دڕا بەسونییەوە، تیفلی بێ زمان

هەرچی ڕەئیسی کورد بوو، بەسێدارەدا کرا
باقی بەماڵی خواشەوە، سووتان لەئاگرا[٢]
کێ دی بەغەیری میللەتەکەم، لەم قەبارەدا
ئینشادی شیعری میللی، لە پایەی قەنارەدا
«کیم در بزی منع ایلەیە جەک باغی جناندن
میراتی پدر در گیرەرس خانە پزم در»[٣]
شادین و فەخری پێوە دەکەین، بەم حەمییەتە
مردن، کە بۆ ژیانی وەتەن بێ، مەزییەتە
سەر دەفتەری شەهیدی وەتەن، ناوی (خالید)ە
وەک ناوی خالیدە، ئەبەدی خۆیشی خالیدە[٤]
شێخ قادرە[٥] ڕئیسی هەموو خانەدانی کورد
میراتی جدی (کوڕ بوو بەڵابوو) بەئیرسی برد
دایکی زەمانە جارێکی تر نایهێنێتە دی
لەم کوردەدا غەزەنفەری[٦] وەک سەید محەممەدی[٧]
خۆ شێخ سەعیدی[٨] گەورە، کە مادی و مەعنەوی
نەبووە بەعەزم و ڕەزمەوە، پیرێکی وا قەوی
یوسف ضیا[٩] ضیایە بوو، ئاه زوو کوژایەوە
گەورەی کەمالیی، ڕێویە بوو، ئەو بەلایەوە
دکتۆر فوئاد، کە ڕۆژی ئەزەل، عەشقی کوردی بوو
تا مرد، لە حەسرەتی وەتەن، ئاهی سەردی بوو
دوو عاشقن، کەمال[١٠] و فوئاد، هەردوو بێ میسال
ئەو عەشقەیان، گەیاندبووە، مەرتەبەی کەمال
قۆچ زادە[١١]، وابووە قوربانی[١٢] میللەتی
سەد ئافەرین، لە عەزم و سەبات و مەتانەتی
زاتەن شەهید، شەریفی(شەریف)[١٣]یش شەهید کرا
ڕۆژی قڕان بوو، قڕ لە وەزیع و شەریف خرا
لەم قافڵەی موبارەکەدا شاعیریش هەبوو
بۆ وەزنی شیعریان بوو، ئەگینا خەتای نەبوو
ناوی ئەمانە، لازمە بیکەینە بەر، هەموو
تەهیجی حیسی میللیە، بۆ ئینتقامی زوو



ئەم خوێنی کوردە، هەروەکو خوێنی سیاوەشە
هەقی نەسێنرێ، هەڵدەقوڵێ، دائما گەشە
بۆ ئێمە لازمە، هەموو ساڵێک، هەتا دەژین
ئەم ڕۆژی ٢٤ی ئایارە، بکەین بەشین
ڕۆژێکە، کە ڕۆژی مردن و ژینە برادەران
فەرزە غەزا، مەقلوبە نەقدی دڵ و زوبان

.................................................................

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی بۆ شەهیدانی شۆڕشی کورد نووسیوە لە تورکیا. کە ڕۆژی ٢٤ی ئایاری ١٩٢٥ لە سێدارە دران. یەکەمجار لە ساڵی١٩٢٧دا بەشی دووەم و سێیەمی ئەم شیعرە بڵا کراوەتەوە، ئەویش لە نامیلکەیەکدا کە عەلی عیرفان ساڵی ١٩٢٧ لە چاپی داوە بەناوی (کورد لە کەیەوە خەریکە) وە لە چاپخانەی فرات لە بەغدا چاپ کراوە. بۆ دووەم جار پیرەمێرد لە ژمارە ٧٠٦ی ڕۆژنامەکەیدا ساڵی ١٩٤٣ لەهەمان مانگدا ئەم شیعرەی بڵاوکردۆتەوە. بەڵام بەبێ ناونیشان. لەو نامیلکەیەدا کە باسمان کرد لەلاپەڕە ١٤دا بەشی دووەم و سێیەمی شیعرەکە بڵاوکراوەتەوە و بەناوی (کاکە ڕەشید)ەوە پێشەکیەکی کورتی بۆ نووسراوە کە دیارە ئەوکاتە پیرەمێرد لە تورکیا گەڕابووەوە، چونکە کارەساتەکە لە مانگی مایس/ئایاری ١٩٢٥دا بووە، پیرەمێرد لەسەرەتای ساڵی ١٩٢٥دا گەڕاوەتەوە و ڕۆژنامەی (ژیانەوە) باسی گەڕانەوە و بەخێرهاتنەوەی دەکات بۆ شاری سلێمانی. نامیلکەکەش ساڵی ١٩٢٧ دەرچووە و شیعرەکەی بڵاو کردۆتەوە و لە پێشەکیەکەیدا نووسراوە «ئەم شیعرانە قیسمێکە لە قەسیدەیەکی شاعیرێکی میللی کورد، چونکە زۆر مناسەبەتی هەیە بەم مەقالەیەوە و عادەتەن موتەمیمی یەکترین، بۆ ئەمەی ناوی هەندێکیان لە غایەی میللیەتدا لە تەرەف تورکەوە بەئیعدام مەحو کراونەتەوە ئەبەدەن لە فیکر ناچێتەوە چاپمان کرد».

هەروەها کاتی خۆی برای بەڕێز عومەر مارف بەرزنجی لە گۆڤاری دەفتەری کوردەواری ژمارە٣ی ساڵی ١٩٧٠دا ئەم شیعرە و شیعری «پیاو ئەبێ لەسەر قەولی بمێنێ»ی بەتەواوی بڵاو کردەوە کە ئەویش شیعری یەکەمی لە ڕۆژنامەی ژینی ژمارە ١٦١٥ی ساڵی١٩٦١ەوە وەرگرتووە و شیعری دووەمی لە (ڕۆژی نوێ)دا ژمارە ١ی ساڵی یەکەم وەرگرتووە.

شیعری یەکەم نەجمەددین مەلا لەو ژمارەیەی ژیندا بڵاوی کردبووەوە، بەڵام لە هەشت بەیتەکەی پیرەمێرد خۆی کە ساڵی ١٩٤٣ لە ژیندا بڵاوی کردبووەوە دوو بەیتی تیا بوو کە نەجمەددین مەلا نەینووسیبوو. ئێمە لەم کتێبەدا بۆ یەکەم جار دەقی تەواوی شیعرەکە بڵاو دەکەینەوە کە(٢٨) بەیتە.

هەروەها لە کاتی خۆیدا ئەم شیعرە کاری کردۆتە سەر شاعیرێکی ناوچەی موکریان کەناوی (شێخ ئەحمەدی سریل ئاوایی)یە، وە ساڵی ١٩٤٣ شیعرەکەی لە ژمارە ٣ی ساڵی ١٣٢٢ی هەتاوی ١٩٤٣ی گۆڤاری «دیاری» کۆمەڵەی (ژ.ک)دا لە مەهاباد بڵاو کراوەتەوە. شیعرەکە تەواو کاریگەری بەشی یەکەمی شیعرەکەی پیرەمێردی لەسەرە و تەنانەت چەند واتا و دێڕی بەکەمێ گۆڕینەوە دووبارە کردۆتەوە. ئێمە لە پەراوێزدا تەواوی شیعرەکەی شێخ ئەحمەد دەنووسینەوە بۆ بەراورد.

هەروەها دکتۆر مارف خەزنەدار لە کتێبەکەیدا لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە لەلاپەڕە ١٥٠دا سەبارەت بەم شیعرەی پیرەمێرد دەنووسێت: «لەبابەت ئەم شیعرەی پیرەمێردەوە مامۆستا هێمن لەنامەی ناوبراو لە پەراوێزی

ژماره ١٢ی ئەم باسەدا بۆی نووسیوە و دەڵێ: ٣٠ ساڵ لەوەو پێش کۆمەڵەی (ژ.ک) لە کوردستانی ئێران کتێبێکی بچووکی شیعری سیاسی کوردی چاپکرد بەناوی (دیاری کۆمەڵەی ژ.ک) کە ڕەنگ بێ نوسخەی کەم مابێ. لەو کتێبەدا شیعرێک چاپکراوە شاعیرەکەی ناوی (شێخ ئەحمەدی حیسامی)یە وەک لە بیرم مابێ ئاوا دەست پێ دەکا:

«ئەم ئاسمانە شینە کەوا بەرگی ماتەمە
ئیجادی واکراوە کە قوببەی هەم و تەمە»(*)

شێخ ئەحمەد کوردێکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەر و شاعیرێکی ڕووناکبیر و خۆش زەوق بوو، باوکی ناوی شێخ جەلال و لە بنەماڵەی قازی و خزمێکی نزیکی قازی محەممەد بووە. لێرەدا زانیارییەکانی مامۆستا هێمن تەواو دەبێت.

(*) شیعرەکە بەو جۆرە نییە کە مامۆستا هێمن نووسیویە و لێرەدا تەواوی شیعرەکە لەبەر گۆڤارەکە دەنووسینەوە و گلەییش لە هێمن ناکرێ، چونکە ئەو هەر لەبەری بووە و کاتەکەش زۆر لە مێژوو بووە و گۆڤارەکەی لەلانەبووە.

ئەمەش تەواوی شیعرەکەی (شێخ ئەحمەدی سریل ئاوایی) لەگەڵ ئەو پێشەکییە کورتەی بۆی نووسراوە لە گۆڤاری (دیاری کۆمەڵەی ژ. ک) ژمارە ٣ ساڵی ١٣٢٢ - ١٩٤٣ .

«دوای جەنگی ڕابووردوو کە جەمهوریەتی تورکیا سازبوو، مەحکەمەیەک بەناوی (مەحکەمەی سەربەخۆیی) داندرا، جەنابی شێخ عەبدولقادر شەمزینی و سەید محەممەدی کوڕی دەگەڵ هەندێ لە گەورە و ناودارانی کورد لەم مەحکەمەیەدا محاکەمە کران و هەڵیان ئاوەسین. ئینجا شێخ ئەحمەدی سریل ئاوایی کە پیاوێکی بەناوبانگی موکوریانە ئەم شینەی خوارەوەی بۆ شەهیدانی ڕێگەی سەربەستی کورد گێڕاوە:

ئەم ئاسمانە شینە، کەوا بەرگی ماتەمە
ئیجادی وا کراوە، کە قوببەی هەمم و غەمە
بارانی مەرگە، بەفرە کفن، ڕەعدە نەفخی(صور)
ئەوڕۆ گرانی، قابیزی ئەڕواحی عالەمە
سەرتیپی، تیپی هەورە، شەماڵ بۆ سەفی قیتال
نارەنجەکی تەرزەیە، تەییارەیی تەمە
ڕۆژی سیایە، ڕۆژ و شەوی تارە، چەرخی پیر
هەوری لەدوودە، ئاهە، تەمی وی هەموو غەمە
ئەم چەرخە، کۆنە، ماشێنەکەی ژەنگی گرتووە
چەوری نەکا، بەخوێنەکی سووڕانی عەستەمە
لەم قەرنی بیستەمی مەدەنیەت بەخوێنی کورد
ژەنگی لەسەر نەهێشتووە، هێشتاکە پێی کەمە
«تارندراوە چەرخی ستەم، کارییە
ئەو زوڵم و جەورە، قسمەتی هەرشین و زارییە»
خاصە بەخوێنی کوردی شیمالی، هەموو زەمین
گوڵزاری خوێنە، خونچە سیفەت، دڵ هەموو غەمین



هەوری خەفەت، لە ئەوجی فەرەجدا، موسەڵەتە
شادی نەبوو، لە هیچ دڵێ دا، نەبێ بەشین
مەحشەر میساڵە، دەشتی، شیمال، کەربەلا سیفەت
غەمناکە لەم موسیبەتە، سوکانی حەوتەمین
ئەکسەر لەوانە سەیدن و هاشمی نەسەب
میراسی جدیانە، شەهادەت، کەپێی گەیین
فەرمانی قەتڵی عامی(کەمال)(*) بێ کەمالییە
مەقسوودی، مەحوی دینە، لە ئیعدامی ئەهلی دین
«وا، حەسرەتا، چرای ئومێدم کوژرایەوە
قەتڵی، موحەڕڕەمی، لە شیمالی بڕایەوە»
(جەنگیز ) (کەمال)ە ئەهلی کەمال، شاهێدی دەدا
کوانێ زەمان و عەسری مەغۆل، زوڵمی وا کرا
هەر بەو گوناهە. دوژمنی دین، مەحوی کردەوە
لەو جێ و مەکانی کوردە، کە بێنی(**) خودا کرا
نەسسی حەدیسە، تەرکی تورک(***) ئێستە مەحکەمە
بەو زوڵمە، خیبسی باتینان، بەرمەلا کرا(****)
دڵ بەحری خوێنە، سۆفی مەپرسە، چە فایدە
تەعدادی ناکرێ، کە بڵێم چەند خەتا کرا
هاوارە، قەومی کورد، وەرن، ڕۆژی غیرەتە
نیسبەت بەئێمە، زوڵم و تەعەددا چەهاکرا
غوسسەم(*****) ئەوەندە زۆرە،، دڵم هێندە پڕ غەمە
سەحبانی ناتیقم(******)، لە غەما لاڵ و ئەبکەمە

........................................................................

(*) کەمال: مەبەست لە کەمال ئەتاتورکە.

(**) کە بێنی خودا کرا: واتا کە بۆی خواناسی لەو جێگە پیرۆزانەدا وەک مزگەوت و خانەقا ئەکرا.

(***) ئاماژەیە بۆ فەرمودەی محەممەد(ص) «اترک الترک ولوکان أخوک».

(****) بەرمەلا کرا: ئاشکرا کرا.

(*****) غوسسە: واتە خەفەت.

(******) سەحبانی ناتق: وتەبێژی بەناوبانگی عەرەب

(٢) لە ڕۆژی ٢٤ی ئایاری ١٩٢٥ (١٥) مزگەوتی دیاربەکر پڕ کرا لە مناڵانی کورد و سووتێنران.

(٣) واتا کێ ئێمە مەنع بکا لەم باغی بەهەشتە، میراتی باو و باپیرمانە، هەر هی خۆمانە و هەر هی خۆمان ئەبێ، ئەم شیعرە بەتورکی دکتۆر فوئاد وتوویەتی.

(٤) خالید بەگی جبران کە میر لیوا بووە.

(٥) شێخ عەبدولقادری شێخ عوبێدڵڵای شەمزینی کە لە کوردستانی ئێراندا لەبەر خۆشەویستی بەغەوسی سانی

بەناوبانگە.

(٦) غەزەنفەر:شێر

(٧) سەید محەممەد کوڕی شێخ قادر، پارێزەر بووە، لەژێر پێیا سەریان بڕی.

(٨) شێخ سەعیدی پیران.

(٩) یوسف ضیا، مەبعوسی شاری بتلیس بوو لەو کاتەدا.

(١٠) کەمال: ئەفسەرێکی لاو بووە لە خێڵی جبرانی.

(١١) قۆچ زادە: محەممەد عەلی بەگ، یاوەری ئالای هەشتی تورک بوو.

(١٢) قۆچ بوو: بووە قوربانی.

(١٣) شەریف: شێخ شەریف.

***

## هاتن شەهیدەکان(١)

هاتن شەهیدەکان، بەجلی سووری خوێنەوە
دایکی وەتەن، دە هەڵسە سڵاویان بسێنەوە
شێخ قادرە لە پێشەوە، سەرقافڵەی ئەوان
چەند جوانە، خوێن و ڕیشی سپی، پیر و نەوجەوان
سەیری ئەمانەکە، کە هەموو کوردی سەف شکەن
ڕۆحیان فیدا ئەکرد و ئەیان وت، بژی وەتەن
قوربانی تۆن بەڕیزە، کە تۆ غەم لەبەر نەبی
بۆ ئێمە مردنە، ئەگەر ئازادە سەر نەبی
مەگری و مەناڵە، با بەخەفەت، دڵ شکست نەبن
نەختێ لەلات ئەمێننەوە و بۆ بەهەشت ئەچن
توخوا لەباتی ئێمە بەچاوێکی ڕوونەوە
فەرموو کە، خوا ئەزانێ لەبیرمان نەچوونەوە
ئاخۆ لە فرسەتێکی ترا، بەختیار ئەبین؟
ئێمەش وەکو ئەوان، لە دڵی میللەتا بژین؟
من وام ئەوێ، کە حەشر ئەکرێم، خوێن بەبەرگەوە
بەو عەشقی میللیە و بەکزەی سۆزی جەرگەوە
ئەو ئاگرەی لە دڵمەوە، بەربێتە کفنەکەم
تا دوژمنم نەکا بەزوخاڵ، شەرتە پف نەکەم

(١) ئەم شیعرە لەلاپەڕە(١٠٤)ی م. ھ دا زۆر بەناتەواوی بڵاوکراوەتەوە! نازانم مامۆستا م. ھ لەبەر کام





دەستنووس یاخود کام چاپ ئەم شیعرەی وەها بەشێواوی وەرگرتووە. لەکاتێکدا تەواوی شیعرەکە و بێ هەڵە ساڵی ١٩٥٢دا لە مێژووی ئەدەبی کوردی عەلائەددین سەجادی لە باسی پیرەمێرددا بڵاو کراوەتەوە. هەروەها دوو بەیت لە شیعرەکە بەیتی شەشەم و حەوتەم لای م. ھ چاپ نەکرابوو. لێرەدا ئێمە تەواوی شیعرەکە، کە ئەو دوو بەیتەشی لەگەڵە بڵاو دەکەینەوە.

***

## تاکە بەیت

١٩٤٨

گوێلکی خۆماڵی، بۆچ نابێ بە گا؟!
کەر نابێ بە گا، قۆچمان تێ هەڵلا؟!

***

## من و ئەستێرەکان(١)

ئەستێرە بەرزەکان، ئەدرەوشێنەوە بەشەو
وەک من بەداخەوەن، نە سرەوتیان هەیە، نە خەو
چەند ساڵە، ئاشنای شەوی بێداری یەکترین
وەک سەرسەرین، شەوێ سەرێ ناکەینە سەر سەرین
من خوار و ژوور لەدەست چوەکەی بێوڵەت، ئەوان
وەک خێڵی خوار و ژوورکەری کورد، وێڵی ئاسمان
شەو، شەونمی ئەوانە چیمەن ئاو ئەخواتەوە
ڕۆژ، هەڵمی ئاوی چاوی منە، سەربەخاتەوە
دوێ شەو، بەری بەیان بوو، دەگریان بەسەر منا
منیان کەساس ئەبینی، لەناو دۆست و دوژمنا
دڵسۆزی وام نەدیبوو، کە بۆم بگری، وەک خەشیم
فرمێسکەکەی ئەوان بوو، بەئاونگی تێگەییم
(با)م ڕاسپارد، بڵێ کە خەفەت بۆچ ئەخۆن ئەوان؟
وەک ئێمە نین، نزیکتری لای بارەگای خودان!
ڕاسپێرییان نووسیبوو، بەشەونم، لەسەر گیا
تا ئاسمان، پریشکی بەدی ئێوە، هەڵپژا
هاوکاری کوردەکانی سەروو گەییە ئاسمان
بەو دووکەڵی هەناسەیە، ئاو دێ لە چاومان(٢)

(١) پیرەمێرد دووجار لە ژیانی خۆیدا ئەم شیعرەی بڵاو کردۆتەوە. یەکەمجار لە ڕۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە

١٩٢٦دا، جاری دووەم لە گەلاوێژی ژمارە ٧، ٨ی ساڵی ١٩٤٢دا. شاعیر جاری دووەم لە گەلاوێژدا دەستی بەشیعرەکەدا هێناوەتەوە و ئێمەش لەبەر ئەو نوسخەیە نووسیمانەوە. ئەوی لای م. ه کە نازانم لە کام سەرچاوەی وەرگرتووە هەڵەی زۆرە و نەدەکرا هەمووی لە پەراوێزدا ڕاست بکەینەوە.

(٢) پیرەمێرد، لەو نوسخەیەی ڕۆژنامەی (ژیان)دا کە باسمان کرد ئەو چەند دێڕە پەخشانە جوانەی لە کۆتایی شیعرەکەوە نووسیوە و مەبەستی لە کوردی پەتی نووسینە (ئەم کچە کوردەم، کە بەم جلە کوردییە، پەتییە، پۆشتە کردۆتەوە و پرتۆڵێکی بێگانەی تیا نییە، پێی لێ ئەنێم، تەنیا لە جل برینەکەیا دەستمی تیایە کالاکەی والایەکی منی تیا نییە، هی یەکێکە، لە پێگەیشتووە، تێگەیشتووە، بەشەوقە پڕ شەوقەکانی وەتەن. کەواکەی بەری سەروبەرە، سەرکەوێ، بەرکەوێ. ئەو منی هێنایە سەر سەودای کوردی پەتیی نووسین، بەشۆڕێکی زۆرەوە، ئەیەوێ نووسینمان چاک و پاک و ڕێکوپێک بێ. تێکەڵ و پێکەڵ نەبێ. گوڵ بێ، پەیکوڵ نەبێ. بەچرای خۆمان بەرێدا بڕۆین و بەرێوە بچین. لەم دیارەدا ئەمە لەوەوە دییاری داوە. دیارە ئەبێ بکرێ بەدیاری (ئەو)(*) خوا یاربێ.

(*) ئەو: مەبەست لە ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی. موتەسەریفی ئەو کاتەی سلێمانی بووە.

***

## پێ هەڵخزان[1]

١٩٢٦

پێ هەڵخزانە، بە بەستی خەزان، هەڵدەسینەوە
ساڵ بێ بەهار نییە، بە بەهار، هەر دەژیەینەوە
حەقی حەیاتی میللی کە کەوتە کلێشەوە
(صور تەبذیرە) ڕەنگی بەقا، بەو قلێشەوە
چەند ترسنۆک و بێ ورە بوون گەنجەکانی کورد
مەئیوس ئەبن، بە بایەکی، بێ وادە، دەستوبرد
پێیان بڵێن تەکەڕوڕە تەئریخی کائینات
ڕۆما و (دۆچە)چی بوون و ئێستا، چییان لێ هات
ئەم دیجلەیە، کە ئێستا، بەبێ خەم، دەکا گوزەر
ئەو دیجلەیە، هۆلاکۆ، بەری بەستبوو بە سەر
ئەمڕۆکە شەمسی طالعە، بەو طالعە قەمەر
ئەگرێتە باوەش و جلی نووری، دەکاتە بەر
بەو شەوقە تازە، شەوقی لەشەرقا ئەکا ظهور
بەو مانگ و ڕۆژە، دەردەکەوێ، شاهراە نوور

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا نییە. شاعیر دووجار بڵاوی کردۆتەوە. جارێک لە(ژیان)ی ژمارە٤٤ ساڵی ١٩٢٦ جاری دووەم لە (ژین)ی ژمارە ٧٤٢ی ساڵی ١٩٤٤. لە بەرئەوەی شیعرەکە لەو دوو بڵاو



کردنەوەیەدا ئەوەندە جیاوازی زۆرە ناچار هەردوو دەقەکەمان نووسیوە.

***

## پێ هەڵخزان

پێ هەڵخزانە، بە بەستی خەزان، هەڵدەسینەوە
ساڵ بێ بەهار نییە، بە بەهار، هەر دەژینەوە
ئەم خاکە بەرزە، فێرە بەزوقم و بەفر و با
وا بای بەهار، لەشکری زستان، ئەدا بە با
چەند ترسنۆک و بێ ورە بوون، گەورەکانی کورد
نەومید ئەبن، بە بایەکی، بێ وادە، دەستوبرد
پێیان بڵێن تەکەڕوڕە تەئریخی کائینات
ڕۆما و لەوچە چی بوون و ئێستا، چییان لێ هات
ئەم دیجلەیە، ئێستە کە سەربەست، ئەکا گوزەر
ئەو دیجلەیە، هۆلاکۆ، بەری بەستبوو بە سەر
سەد کاسە گڵ، لە کاسەی کەللەیان، کرا
چەند (نادر و ڕەزا) لەسەر ئەو تەختە دانرا
ئەم کوردە، گوردە، ناوی لەناو ناچێ مایەوە
ڕۆژی ئەویش بەرێ دەکەوێ، دێتە کایەوە
عەشقی ژیانی میللی، کە کەوتە کلێشەوە
ئەدرێ لە چاپی ژین و ژیان بەو قلێشەوە

***

## حسی کوردی لاوکی سادەی دەوێ[1]

ئەدەبیاتێکی مومتاز: شیعری بێ نوقتەی کورد:

١٩٢٩

وا دەمی دەورەی ڕەواحە، گوڵ لە سەحرا ڕەوح ئەدا
مەل، لەگەڵ گوڵدا، دڵ ئاگاهی لە سڕی لەوح ئەدا
(طوری) سووری لالە، ئاگری (طور)ی موسا هەڵدەکا
ئەو گڕی (طرارە) ئەم سیحری حەلاڵە هەڵدەکا
هەر دە ئاڵ و سوور و مۆرە، وەک کەوای سوورمەی عرووس
گوڵ گەڵای لوول کردووە وەک طوڕڕەی دڵداری ڕووس

ساحەی وادی، لەوادەی ڕووی سەحەردا (طاوسە)[2]
کەڵکەڵەی ئەم مولّکە، دوو سەد کاوسی لێ ئاوسە
عەکسی میهر و مەه، لە ڕوودا سلسلەی داوی دڵە
طالعی کورد هەروەکو ئەو سلسلەی لای سەر دڵە[3]
گرمە گرمی هەوری دوور دێ، کێ دەڵێ دڵ دەسرەوێ
ڕۆحی علوی کورد سەمای ئامالی سامالی دەوێ

..............................................................

(١) ئەم شیعرە شاعیر خۆی لە ڕۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە١٧٣ی ساڵی ١٩٢٩دا بڵاوی کردۆتەوە.
(٢) لای م. ﻫ لە دیوانەکەدا ل٦٥ نووسراوە «ساحەی وادی لەوادە ڕووی سەحرا طاوسە» کە دیارە هەڵەیە و مانا نابەخشێ.
(٣) لای م. ﻫ نووسراوە «طالعی ئەم کوردە وەک ئەو سلسلە سەدری دڵە» کە نازانم ئەمە مانای چی ئەبەخشێ.

***

## کۆستی بوومەلەرزەی پێنجوین[1]

١٩٤٦

دڵخۆشیمان ئەداتەوە خوا، گوایە کێی بوێ
بەو ویستنە، ئەبێ خەفەتی زۆری بەرکەوێ
ئەم کوردە ڕەنگە، ئەو ئەسەری خۆشەویستە بێ
ڕۆژێ نەبوو کە چەرمەسەرێی قورسی تووش نەبێ
شاعیر ئەڵێ، بەڵا، کە لە لای خوا خرایە ڕێ
سەردەق، لە پێشەوە گەڕەکی کوردی دێتە ڕێ
یاخود ئەگەر لەبەر ئەمەبێ بەرزە جێگەی
بەرزی نەوی، نەوینە پەلی ئێمە تا بەکەی
بەرزی تەوژمی، بەندەنی بەرز و نزار بوو چوو
وا ڕەو ئەکەین و لەشکری بێگانەمان لە دوو
تەکلیفی تۆ خوایە، لە وەسعت، وەسیعترە
تووشی بەڵایە بووین، کە لە تاقەت بەدەرترە
جاران لە ئاسمانەوە بوو، ئێستا لەژێر زەمین
مووی گا ئەکا بەتیر و پەلامار ئەدا بە قین



مەڵبەندی سەر حدود، یەکەمین بەندەری گوزین
بێ ئێلّی جاف، گوزەرگە بوو، ئێلاخی پێنجوین
ئێستا بەبوومەلەرزەوە، کەوتە زەلزەلە
ماڵیان ڕووخا و لەترسی ژیان کەوتنە پەلە
ئۆف خوایە وا منالّ لە خەوا، نووستووە و شەوە
دەستیشی وا لە گەردنی دایکیا و ئەژی بەوە
کاتێ ئەزانێ، خانوو بەسەریا ڕووخا، لە پڕ
هەر گرمەیە، زەوی هەموو، دێت و دەچێ بەگوڕ
دایک بەڕەحمەوە، دەستی خۆی دایە بەر ورووژم
دار و دیوار، بەسەریەکەوە، کەوتووەتە تەوژم
هاوار و بانگە، ورد و درشت، شین و ڕۆیەتی
کێ گوێی لە کێیە، هەر کەسە دەربەستی خۆیەتی
ئێستا ئەمانە هاتوونە ژێر باڵی ئێمەوە
هاوخوێنەکان، خۆیان ئەخەنە ماڵی ئێمەوە
لاوان بەجارێ کەوتوونە جۆش و خرۆشەوە
تەمسیل و باربوویانە بەهەوڵ و پەرۆشەوە
ئاواتەکەم ئەبینم، ئەوا هاتە دی، بەچاو
دەستەی کوڕان بەمەشعەلی فریاوە کەوتنە ناو

..............................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ﻫ دا نییە.

***

## بۆ لافاوی سلێمانی[1]

١٩٣٢

شینی زبان بۆ ژیان
چڵکە هەورێ، کەوتە ڕووی ئەم ئاسمانەوە، تاڵی کرد
هاتە گرم و هۆڕ، با و هەورەتریشقە دەستوبرد
هەوری پایز، زۆر لەسەرخۆیە، گوڕە و نالەی نییە
هەر دەمانوت، ئەم برووسکە و لێزمەیە کاری چییە

کەوتە بارینێکی وا، ئاوی بەخوڕەم لێ پژا
وات دەزانی، دەرکی کوندەی سەربەرەوژێر هەڵڕژا
کردیە لافاوێکی وا، هاژەی لە گرمەی هەور ئەچوو
دەت وت، ئەرز و ئاسمان، دوو دوژمنە تێک هەڵدەچوو
خەڵک لەناو شیرینی خەوا، نووستوو بەپرخەی گەرمەوە
کاتێکت زانی، سەر ئاو کەوتن، لە جێگەی نەرمەوە
قاو و قیژی دایک و منداڵ و، زریکەی بێ کەسان
لرفەلرفی ئاو فڕاندن، نەعرەتەی خانوو ڕووخان
ئۆف لە هاواری ئەوانەی، وا بەزۆر ئاو ڕای فڕان
دایکێ، چوار منداڵی ئاو بردی، هەناوی هەڵکزان
خۆ ئەوانەی، وا لەژێر خانووی تەپیوا مانەوە
ڕۆحیان ئەسپارد، بەناچاری بەدەم گریانەوە
هەر کەسێ هەوڵی سەری خۆی بوو، برای بیر چووبووەوە
خەڵک وەرەی بەردا بوو، بەم تۆفانی تاریکە شەوە
خۆ زیانی ماڵ و خانوو، بەم هجومی ئاوەوە
شەکر و چا و کوتاڵ بەجارێ، کەوتە ژێر لافاوەوە
تانجەڕۆ هات، ئەرخەوان سوور، سووری بووکێنی دەکرد
شەکری شاری کردە شەکراو، هەر بەبار کوتاڵی برد
خوا دەزانێ، هەر کەسێ هۆشێکی ئینسانی ببێ
تێر و پڕ ئەگری بەسەرمانا، ئەگەر دوژمن نەبێ
ماڵ وێران، بێ خانوو مان، ڕوو لە زستان پێ پەتی
ئێمە بۆ (سوریا) پیتاکمان ئەنارد، بۆ یەکیەتی
ئێستە لێقەوماو و داماو، کەساس و جەرگ بڕاو
چی دەبێ، با جامعەی خاکی عیراقیش بێتە ناو
خوایە تۆ فریاکەوی، تۆڵەی هەژاریمان بکە
چونکە هاوارمان بەتۆیە، دەستگیرت بێ شکە

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی بۆ ئەو لافاوە وتووە کە لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٢دا لە سلێمانی هەستاوە و زیانێکی زۆری داوە. هەروەها (ڕەشید نەجیب و حەمدی بەگی ساحێبقرانیش بۆ هەمان لافاو شیعریان هەیە. ئەم شیعرەی پیرەمێرد لە دیوانەکەی. م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.



پیرەمێرد بۆ جاری دووەم لە ژمارە (٥٨٩)ی ژینی ساڵی ١٩٤٠دا چوار بەیت لەو شیعرە پێشوو بڵاو دەکاتەوە، بەڵام هەندێ دەستکاری و ئاڵوگۆڕی تیادا کردووە، بەتایبەتی کۆتایی شیعرەکە دوا بەیتی لەم نوسخە نوێیەدا زۆر جوان دەستکاری کردووە و لە بەیتی کۆتایی ئەوی پێشوو زۆر پڕ مانا و شاعیرانەتر و جوانترە.

خەڵک لەناو شیرین خەوا، نووستووە بەپرخەی گەرمەوە
کاتێکی زانی، سەر ئاو کەوتەوە، لە جێگەی نەرمەوە
قاو و قیژی دایک و منداڵ و زریکەی بێ کەسان
لرفەلرفی ئاو فڕاندن، نەعرەتەی خانوو ڕووخان
ماڵ وێرانی خانوو مان و ڕوو لە زستان، پێ پەتی
ناهومێد و ڕووت و برسی، دیلی دەستی نەگبەتی
بۆ ئەمانە هەر کەسێ هۆشێکی ئینسانی ببێ
ئاوی چاو، کیسەی دراو، دێنێتە ناو، سانی دەبێ

***

## بورجی ڕۆژی کورد[١]

١٩٤٥

بورجی ڕۆژی کورد، کە ڕۆژهەڵات بوو
هەڵمان هەڵنەکەوت، بەشمان هەڵات بوو
قافیەی ئەکراد، هەر بەدنیهاد بوو
بوومی شووم لە شوێن بووڼمان دڵشاد بوو
سەرچاوەی دیجلە، لە دیاربەکرا
هێند خوێنی کوردی، تێکەڵ ئەکرا
وەک ئەرخەوان سوور، ئەبوو بەلافاو
پیرەژنی چەرخ، ئەیکرد بەسووراو
هەتا خوا وای کرد ڕۆژ گەڕایەوە
دادی هەژاران، پرسرایەوە
لە ڕۆژ ئاواوە، ڕۆژمان بۆ هەڵات
غوولی مەغوولی بیابان هەڵات
ئەڵێن کاتێک ڕۆژ، ئەگەڕێتەوە
دەوری زۆرداری، ئەبڕێتەوە

ئەبێت بەدەوری، مەهدی سەر زەوی
لەسەر ئایەتی (خاتم النبي)
پەیڕەوی (نبي) دیموکراتییە
دیموکراتییە، ڕوو لەهاتییە[2]
من باوەڕم کرد کە ئەم ئاینە
ئاوێنەیە بۆ کوردی ساف سینە
بۆیە ئینگلیزم بەدڵ خۆش ئەوێ
ئەمجارەیش فریای ئێمە ئەکەوێ[3]
ئەگینە من خۆم، لەکێ دادمە
نان و کەبابێ، سەرو زیادمە
مایەی ژیانی، ئێمە کە (با) بێ
بۆ نەیگۆڕمەوە، من بە کەبابێ
خوا تۆفیق وەهبی و جیاووک بهێڵێ
بۆ پێشەوایی و سەر بەرزی خێڵێ[4]
ئەو دوو پیاوەمان کە خوێندەوارن
جێی هیوای گەلن، کەفیداکارن

............................................................

(١) ئەم شیعرەی بۆ کۆماری مەهاباد وتووە. م. ه نووسیویە کە ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٤٥ شیعرەکە نووسراوە. بەڵام ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٤٥ ڕێکەوتی بڵاوبوونەوەی ژمارە(٧٩٢)ی ڕۆژنامەی (ژین)ە کە ئەو شیعرەی تیادایە نەک دانانی شیعرەکە.

(٢) دیموکراتییەت: دروشمی بەرەی سوێندخوارەکان بوو لەشەڕی جیهانی دووەمدا. م. ه.

(٣) لەلاپەڕە (٣١)ی دیوانی پیرەمێردی م. ه. دا نیوە دێڕی یەکەمی ئەم بەیتە دەستکاری کراوە بە «من سوێند خوارانم بۆیە خۆش ئەوێ» لەکاتێکدا لەڕۆژنامەکەدا کە م. ه شیعرەکەی لەبەر نووسیوەتەوە نووسراوە «بۆیە ئینگلیزم بەدڵ خۆش ئەوێ». وە ئەم نیوە دێڕە هیچ کەمی و ناتەوایەک بەرەوڕووی پیرەمێرد ناکاتەوە، چونکە نەک پیرەمێرد، بەڵکو زۆر لە ڕۆشنبیرانی ئەوکاتە چاوەڕێی دەستکەوتێک بوون بۆ کورد ئەگەر جەنگ کۆتایی بێت. وە ئینگلیزیش کە یەکێک بوو لە هێزەکانی (حلفاء) ئەو دەنگوباسەی گەیاندبووە گوێی کورد و، بەڵام دوایی دەرکەوت کە ئەو پڕوپاگەندەیەی تەنها تاکتیکێک بوو بۆ بەرژەوەندی خۆی لە کاتی جەنگدا.

(٤) م. ه نازانم لەبەر چ هۆیەک ئەو دوو بەیتەی لەبەر ڕۆژنامەکە نەنووسیوەتەوە و لە دیوانەکەدا چاپ نەکراوە. لەکاتێکدا کاروکردەوە و خزمەتی هەر یەک لە(تۆفیق وەهبی و مەعروف جیاووک) شتێک نییە فەرامۆش بکرێ. دەبوا مامۆستا م. ه ئەو ئەمانەتە بپارێزێ.

***



## ئەستێرەی بەختم[1]

١٩٤٧

ئاسمانەکەی، جێی ئەستێرەی بەرز
ئەدرەوشێتەوە، بەشوعلەی سەد تەرز
ئەو دەمەی تیشکی، ڕۆژ ئەدا لە ئەرز
بۆچ ئەستێرەکان، دێنە ترس و لەرز؟
خوا وای کردووە، ڕۆژ باڵادەستە
مانگیش لەڕوویا زەبوون و پەستە
ئەمە تەقسیمی، ڕۆژی ئەلەستە
عالەم لەم سڕە، گێژ و دەم بەستە
وای تەرتیب داوە، ڕەحمانی ڕەحیم
وفوق کل ذي علم، علیم
لە ڕاستی قوەت، کە نەبێ تەسلیم
دیارە ئەکەویە، گێژی ترس و بیم
دەستێ نەتوانی، لەبندا بیبڕی
ئەبێ بیشۆیت و بە خاولی بیسڕی
کە ورچ لەسەر پرد، ڕێی لەتۆ بڕی
ئەبێ ملوانکەی مووروی، بۆ بکڕی
ئەمساڵیش دیسان، وا شەشی ئەیلوول
لە فەلەستیندا کردیە، گەردولوول
عالەمی ئیسلام، دڵگیر و مەلوول
کوردیش بەجارێ، هاتنە جوڵەجووڵ
ئەی سپەهیی پیر، ئەو ئەستێرانە
هەریەکە شانی، هەر یەکێکمانە
ئەستێرەی بەختی، منیش لەوانە
بیگۆڕەرەوە، ئێسکی گرانە
ئەستێرەیەکی، وای لە شوێن دانێ
ڕێی سیاسەتی، دەوران بزانێ

شەوقێکی وای بێ، گەل پێی بڕوانێ
نەک کاروان کوژەی، کوردبێ و نەزانێ

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## یادێکی حەزین[1]

مارت (ئازاری) ١٩٤٩

پیاو ئەبێ لەسەر، قەولی بمێنێ
سەرومال بدا و، بەڵێن نەشکێنێ
لەسەر پێستی خۆی، شەقی کەن وەک گا
پێستی کەللەیشی، بئاخنن لە کا
باز گەشتی نەبێ، لە ئاستی مەردی
تەئریخ بێ بڵێ: کوردی نەبەردی[2]
خۆ ئەگەر لە ڕێی، میللیەتا بێ
ئازا و شێلگیر بێ، نەبەزێ تابێ
من ئەم مەردەیەم، لە کوردا دیوە
شینی شەهیدان ئەمەی نووسیوە
ئەمڕۆ کە بیست و چواری ئازار بوو
سەرداری کوردان سەر لەسەر دار بوو
لە دیاربەکرا، گەورەکانی کورد
لە تەناف دران، ناڵەیان نەکرد
شێخ قادر نەوەی شێخ عبیداللە
ئیرسی جدی بوو، زوڵمی کەربەلا
لەسەر سێدارە، بانگی کرد مەگرین[3]
با من بکوژرێم، میللەتم بژین
دکتۆر فوئادیش، وتی وا ئەمرم
میراتی باوکمە، من وەری ئەگرم



من هەموو ساڵێ، بیر یەخەمەوە[4]
هەم بەفەخرەوە، هەم بەخەمەوە

---

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی بۆ کارەساتی شەهید بوونی شۆڕشگێڕانی کورد وتووە لە تورکیا کە ساڵی (١٩٢٥) ڕووی دا. لە (ژین)ی ژمارە ٩٥٩ی مارتی ١٩٤٩دا بڵاوکراوەتەوە. ئنجا نازانم ٢٤ یاخود ٢٥ی ئایار کە ڕۆژی کارەساتەکەیە چۆن لێرەدا بۆتە ٢٤ی ئازار (مارت)؟!! ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.
(٢) لە ڕۆژی نوێی ژمارە(١) و لە دەفتەری کوردەواری ژمارە(٣)دا وشەی (تەئریخ) کراوە بەمێژوو.
(٣)، لە ڕۆژی نوێی ژمارە(١) و دەفتەری کوردەواری ژمارە(٣)دا نووسراوە:
«لەسەر دار بانگی ئەکردن مەگرین
با من بکوژرێم، هۆزەکەم بژین»
(٤) ئەمە هەڵەیە و پیرەمێرد خۆی لەو ژمارەیەی (ژین)دا کە باسمان کرد بەو جۆرەی ئێمەی نووسیوە. هەروەها بیریەخەمەوە ڕاستە نەک بیری ئەخەمەوە.

***

## ئاوات[1]

١٩٤٤

بولبول بەهارە، شەتاو بەهارە
بانگ ئەکەن ئەڵێن، بەهرەی بەهارە
ئارایشی دا، بەهەردە و کۆهسار
خەملی لە گوڵدا، دەشت و بەربنار
نەورۆز، ڕۆژی نەو، لەنێو جیهاندا
ژینی دابەش کرد، بەکوردستاندا
دریغ، بەهاری من ئەمە نییە
کە زوو بەسەرچوو، گوڵ کەڵکی چییە؟
ئەمەوێ خاکی کوردستان، یەکسەر
گوڵی گیاندارمان، بۆ بێنێتە بەر
لاوان وەک لاولاو، بئاڵێنە دار
بۆ خاکیان بینە، پەرژینی گیاندار

ئەوسا کوردستان، ئەبێ بەباغێ
خوێندن تیا ببێ، بەشەو چراغێ

........................................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێرد م. ھ دا بڵاونەکراوەتەوە.

***

## ئەم خاکە پاکە

ئەم خاکە پاکە، هێندەم لا چاکە
بەشۆری سەودای دیدەم نمناکە
بە تەماشای دوور، تێری لێ ناخۆم
کەی دەمکێشێتە، سینەی خۆی ئاخۆم[(١)]
من بەسەر ئەودا، ئەویش لەسەر من
بەیەکتر شاد بین، بەکوێری دوشمن[(٢)]
لەمەودوا ئەگەر، ئێواران یاران
لە دووم بگەڕێن، وام لە کۆساران
کاریزی شەریف، دەمی بەربەیان
بریقەی وێنەی[(٣)]، سینەی بەربەیان
ئارامگای شۆخی، دیدە مەستانە
ڕەشێنەی ڕوخسار، حەسرەت کێشانە
لە گردی یارە، چاوم لێیەتی
نازانم وێڵی، سەودای کێیەتی
یاخوا ئەو کەسەی، کە ئەم دوو ساڵە
لێم کەوتە گیزە، وەک زەردەواڵە
نەی هێشت ئاگری، یارە بگرێ
چەقۆی ئاهی من، جەرگی هەڵدڕێ
بەنەشئەی بەهار، لەو مێرغوزارە
کۆ ئەبوونەوە، خەڵکی ئەم شارە
سەیری شیرینیی، وڵاتیان ئەکرد
داخی زستانیان، لە دڵ دەرئەکرد



نیشتمان بەسەیر، دێتە بەرچاومان
بە «حب الوطن» بەرز ئەبێ ناومان
من زەوقی شیعرم، بەچەشم ئەندازە
شنەی بەیانم، لەگەڵ هامرازە
ئەمەوێ گوێژە و ئەزمڕ بێ بەرێم
وەک قەیسی دوجەیل پیایا بگەڕێم
لەگەڵ باڵندە و، دڕندەی یار بم
وەک تاق تاق کەرە، شەوان بێدار بم
هەر جێیەک خاکی وڵات پڕ نم بێ
هەر شوێنێ دانەی ئاو لەسەر لم بێ
ئەوە جێی جۆشی گریانی منە
ئەوە هەواری هاواری منە

........................................................................

(١) لای م. ھ ئەو بەیتە بەم شێوە تێکدراوە. بڕوانە ل ٤٨ی دیوانەکەی پیرەمێرد.
«بە تماشای دوور تێری لێ ئەخۆم
کەی دەم گەیشتە سینەی خۆم ئەخۆم»
کە دیارە بە بەراورد لەگەڵ بەیتەکەی سەرەوەی ئێمەدا دەزانرێت ئەمە هەم هەڵەیە و هەم ماناش نابەخشێ.
(٢) پیرەمێرد هەمیشە نووسیویەتی (دوشمن) نەینووسیویە (دوژمن).
(٣) ڕاستییەکەی (بریقەی وێنەی)یە نەک وەک لای م. ھ نووسراوە بریقە و وێنەی.

***

## تاکە بەیتێ[(١)]

فائق بۆ ئەمەی کە ببێ بەکورد
ناومان نا هوشیار ناوی تەبدیل کرد

........................................................................

(١) ئەم شیعرە، پیرەمێرد و حوسێن حوزنی هەر یەکە نیو دێڕیان نووسیوە و ناوی (فائق تۆفیق)ی کچەزای پیرەمێردیان کرد بە (فائق هوشیار).

***

## نالەی دڵتەنگی(١)

حوزەیرانی ١٩٤٨

ئەم قــەومی کــوردە، ئەگــەر تێنەگـا
کـە غـایەی چییـە؟ ڕوو لە کـوێ ئەکا
سـەر گـەشـتـەی چۆڵ و بیـابان ئەبێ
ناگــاتە ھەوار، ســەرگــەردان ئەبێ
تا یەک نەکـــەون، ڕێـگە دەرناکـــەن
ئەبێ بەکـــۆمـــەڵ وەتەن ئـاواکـــەن
ئەم خـاکـە ناوی، خـاکی عـیـراقـە
لەســەر زەمــیـندا، بێ وێنە و تاقـە
دوو تیــــرەی بـرای، یەکی تـێــدایە
یەک دین و ئیــسـلام، بەندەی خـودایە
(لا عــصــبــیــة في الأسـلام) ڕێـیــە
فـەرمـوودەی نەبی، ھەمـووی بەجـێیـە
خــۆ خـــوا داوینێ، ئەوەی ڕەھبـــەرە
نەسلی ھاشـمی، شـوێن پێـغـەمـبـەرە
ئەوەی خـــــراپە، قـــــەدر نەزانین
چونکە گـــیــرۆدەی جـــەھل و نەزانین
ئەگــەر بەخـــوێندن، لەمــانە نەگــەین
وەک کەر کەری بار، بۆ خەڵکی ئەبەین
ئەگــەر ئەتەوێ، کــارت مــەحکەم بێ
نەخــوێندەواریت، ئەبێ زۆر کـــەم بێ
ئیـــقــبـــالی ئومێ، گـــڕ و دەورێکە
وەکـــو نیـــــشـــانەی پەڵە ھەورێکە
ھەتا ســــایەمــــان تەواو بەرز ئەبێ
پەل و پۆی عـیلم و فـەن سەد تەرز ئەبێ
بەتەقـــــو ھوری تـفـــەنگ و ھەرا
کــاتێکمــان زانی، لێــفــەکــە برا



بە کـــــۆڵانانا، کــــــە بنەڕێنین
گــەلێ لە گــەلان، بەجێ ئەمــێنین
خــۆمــــان لە حـــوجــــرە بدزینەوە
لە مــــاڵی باوکـــمــان ئەگـــوێزینەوە
کــــە کــــاســــبی تر، لەناوا نەبوو
ئیـــتـــر چاوەڕێی وەزیـفــەین ھەمـــوو
خــۆ مــیــریش مــعــاش بەئومێ نادا
ھەمـــــوو ھیــــوامــــان ئەڕوا بەبادا

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ھ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## قەلەندەر تۆراوە(١)

١٩٤٩

کــاری ناچاریە، بێــزار لە شــەوی ئەم شــارەم
چەند ڕۆژێـکە بەتۆراوی، لـە گــــــردی یـارەم
گـــردی یارە، وەکـــو ئاتەشکەدەی نەورۆز بوو
وا کـــوژاندیانەوە، ســـووتاوی گـــڕی ئەو نـارەم
کەس نییە، ھامدەمی ناڵەی شەوی بێداریم بێ
باری زۆر قـورس بووە، دەربەستی دڵی بێچـارەم
دەستەڵاتم نییە، چی بکەم، ئەمە کاری خوایە
چاکی ناسـیـوم ئەزانێ، کـە کـەری ئەم بارەم
کـردەوەی خـۆمم ئەزانی، کـە نەتیـجـەی وایە
ئێـسـتـە ڕابووردووە، فـایدەی چییـە ئەم ھاوارەم

(١) ساڵی ١٩٤٩ ڕێگە نادەن پیرەمێرد وەک ساڵان ئاگری نەورۆز بکاتەوە. ئەویش داخی دڵی خۆی بەم شیعرە دەردەبڕێت. ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێرد م. ھ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## له بەردی توانج[1]

تشرینی یەکەمی ۱۹٤۳

لەبەردی توانج، هێند سەرم سوڕما
بەرد بوو بەکولانەی سەرما لەسەرما
بەفرە، بێ و بفرە، بەپێچ و دەورە[2]
بۆ گەرمی سەرما، سەرمایەی دەورە
لەفەلەک دڵم له خۆی نامێنێ
کە، کەچیی لەگەڵ مندا ئەنوێنێ
سەری خورشیدی بووکی بڕیوە
بە پاشکۆی خۆیدا هەڵی واسیوە
پێم ئەڵێن پۆکەر مەکە، حەرامە
ئەوەی حەڵاڵ بێ، لەم شارە، کامە؟!
کیلۆیەک شەکر، لەجێی یەک تەنە
ئەوی هەرزان بێ، لافی وتەنە
سەردەمێک باو بوو، نیشتمانپەرست
ئێستا برستی، براوە بەرست
داخی داخداریم، ناوە لە دەستم
کە وتبێتم، وەتەنپەرستم
بەرێکەوت هەرچی، بۆی رێکەوت رۆژێ
وەک دەعبا پەنجەی، دایکی ئەکرۆژێ
پێستی رووەتیان، هێندە ئەستوورە
تەڕی و تەریقی، زۆر لەوان دوورە
سا خوایە بەسیە، ئەم تەنگانەیە
کەیف و قرپ و جرپ، بۆ بێگانەیە

(۱) پیرەمێرد ئەم شیعرەی له ساڵی ۱۹٤۳دا نووسیوه و له لاپەڕە ۲٤۱ی م. ھ دا ھەیه. جاری دووەمیش ساڵی ۱۹٤۸ بڵاوی کردۆتەوە و جیاوازی ئەمجارەیان لەگەڵ شیعرەکەی (۱۹٤۳)دا زۆرە. بۆیە بەباشمان زانی ئەویش بنووسینەوە.
(۲) ئەم بەیتە لای م. ھ چاپ نەکرابوو.

***



هەمان شیعر لەساڵی ۱۹٤۸دا بەجیاوازی لەگەڵ ئەوی پێشوودا:

لەفەلەک دڵم، له خۆی نامێنێ[1]
ئەم جەورە لەگەڵ کوردا ئەنوێنێ
سەری خورشیدی، بووکی بڕیوە
بە (بەن سامووتە)[2] هەڵیان واسیوە
پێم ئەڵێن غەیبەت مەکە حەرامە
ئەوی حەڵاڵ بێ، لەلامان کامە؟!
هێند شت گرانە، کیلۆیەک تەنە
ئەوی هەرزان بێ، لافی وتەنە
داخی ئەمانەم، نا لە پشت دەستم
ئیتر قەت نەڵێم، وەتەنپەرستم
بەرێکەوت هەرچی، بەرێکەوت رۆژێ
وەک تووتک پەنجەی، دایکی ئەکرۆژێ
تۆفانی نووحە، کەوتە تەنگانە
منداڵ ئەخنە، ژێر پێ بروانە
هی ئەوتۆ، دایکی وەتەن، باس ئەکا
بۆگەنی، ئەهلی، نامووس کاس ئەکا

(۱) ئەم شیعرە له دیوانی م. ھ دا بڵاو نەکراوەتەوە.
(۲) بەن سامووتە: ئەو تاڵە بەن یاخود چەرمەیە کە سوار بەمەلاو بەولای زینا داینا‌وە هەتا نیچیری پیادا هەڵواسێ.

***

## تاکە بەیت

۱۹٤۸

هەر کەسێ هەڵکا، بە وشک و بە تەڕ
بێ غەمتر ئەژی، له شای بەحر و بەڕ

***

١٩٣٦

ئەم قەومی کوردە، زۆر گەورەی بووە
بەڵام هەریەکەی، بۆ لایەک چووە
(نادر) و (کەریم خان) کەوتوونە ئێران
عەزیزی میسرە (صلاح الدین)مان
ئەمانە بەشی، ئیداریمان بوو
لە ئاسۆی عیلما، بڵندترمان بوو
چونکە کوردستان خۆی بێ نسیبە
ئەدیبەکانی تیادا غەریبە
خۆ (ئەحمەد شەوقی) و (محەممەد عەبدە)
شوعەرای عەرەب، لەلایان عەبدە
داخی سەرداخان، جەمیل زەهاوی
لەناو کورداندا ون بووبوو ناوی
بەڵێ مومکینە، جەمیل ئەدزرێ
بەڵام زەهاوی، لە کورد ناخوازرێ
باعەیبیش بووبێ، کافی زەهاوە
هەرچی خۆی گۆڕی، دیارە بەدناوە
مستەفا پاشا، بۆیە پەسەندە
فەخری بەکورد بوو، لای خوا و بەندە
لەوەسیەتیشدا خۆی لێ نەگۆڕا
بەوەسیەتی خۆی، لە سەیوان نێژرا
لەسەر کوردێکمان، غیرەتی وابوو
بەگژ شاهێکی ئێراندا ئەچوو
بیگرە باوەشت، ئەی گردی سەیوان
پاشای کوردستان، هاتوە بەمیوان
کورگەل گەورەتان ئەگەر خۆش بوێ
زۆر گەورەی ترتان، تیا هەڵئەکەوێ
ئەمڕۆ ئەم یادە، بوو بەیادگار
زۆر کەس هەوڵ ئەدا بۆمان بێتە کار

***



## تاکە بەیت

١٩٤٨

ئەو ڕۆژە خۆشە، دڵتی تیا خۆشە
ڕۆژی ڕەش، جەژنیش، ماتەمە و بۆشە!

***

## بۆتەی سروشت

ڕەنگی ژەنگێکی، کە بۆتەی سروشت[١]
قاڵبی کوردی، منی پێ دارشت
خۆ تاکو دەمرم، لێم نابێتەوە
کەواتە واتەی چیم لێ بێتەوە
بەڵێ هەر کوردم، کوردێکی سەرچڵ
پەژارەی هەژار ئەبەمە ژێر گڵ
هەرزەگەرێکم بەسەر یاڵەوە
سەر ئەدەم لەبەرد بەدەم ناڵەوە
ئەبینم هەرچی، بانگی ئەکەمێ
دەمی گیراوە، ئاخ بۆ هاودەمێ
ئەم قەومە وەکو مەڕی بێ زمان
دوای هەر کەسێ کەوت نەیبردە ناو ڕان
بەخوری و شیری، دەست هەڵناگرێ
بۆ گۆشتی مەڕە، سەری ئەبڕێ
ئێستا دەستەیەک، پەیدا بوون غەیبین
کە دەنگیان هەیە و ڕەنگیان نابینین
کەوتووە خولیای باڵا پەروازی
بەڕیشی بابا، کەوتوونە بازی
بەباڵی خەیاڵ، بەلاف و گەزاف
هەڵمان ئەفڕێنن، بۆ سەر کێوی قاف
ئێمە لە خاکی، عیراقدا ئەژین
چۆنمان بۆ ئەلوێ، لەم خاکە دەرچین

عێراقێک کە خوا، دایمەزراندبێ
تۆوی دوو قەومی، تێدا چاندبێ
چۆن ڕێی تێدەچێ، کە ڕێی بێگانە
بکەوێتە ناو، ئەم جێ و مەکانە

..............................

(١) پیرەمێرد ساڵی ١٩٤٥ ئەم شیعرەی نووسیوە. جاری دووەمیش بەشێوەیەکی جیاواز لە ساڵی ١٩٤٧دا بڵاوی کردۆتەوە. ئێمە هەردووکیان دەنووسین. شایانی باسە پارچە شیعری دووەم لە دیوانی م. ھ دا نییە.

**هەمان شیعر بەهەندێ جیاوازییەوە ساڵی ١٩٤٧:**

هەرچی پێشمان کەوت، کێشاینیە ژێر بار
لە ئێمەی ڕوو دا، چە گورگ و چە سوار
بەردێکین لەناو قۆچەقانیدا
ئەگەرێین بەدەور سەری خانیدا
کەچی فریمان ئەدەن لە گۆترە
تا دوورتر بڕۆین، لایان خۆشترە
بەباڵی خەیاڵ، بەلاف و گەزاف
هەڵمان ئەفڕێنێ بۆ سەر کێوی قاف
ئێمە لە خاکی عیراقا ئەژین
لە شوێنی باو و باپیر چۆن دەرچین

***

**١٩٤٨**

ئەو جەژنەی میللەت تێیدا کەساسە[١]
من سەرم شینە و بەرگم پەلاسە
مەڕ سەربڕینە، قۆچی قوربانە
قوربانی ئێمە، کچ و کوڕمانە
با، گەرتن، تەمی ترسم لێ لابا
بریندار نەبێ، شێر هەڵمەت نابا
کورگەل، بەگاڵتە، بڵێن بەدوژمن
کەوتن بۆ ئەوە و، سەرکەوتن بۆ من



قوربانی ئێمە، زۆر پەسەندترە
هی حاجی مەڕە، ئێمە، کچ، کوڕە

..............................

(١) مامۆستای شاعیر محەممەد ساڵح دیلان بۆی گێڕامەوە کە ساڵی ١٩٤٨ داوای شیعرێکی لە پیرەمێرد کردووە بۆ نەورۆزی ئەو ساڵە. پیرەمێردیش ئەو شیعرەی بۆ ناردوون، بەڵام مامۆستا دیلان بەدڵی نەبووە کە بیکات بەسروود و ئاوازی بۆ دابنێت. دوایی، پیرەمێرد شیعرە بەناوبانگەکەی (ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە)ی بۆ ناردووە و ئەویش وەک لای هەمووان لە گوێماندا دەزرنگێتەوە بۆ یەکەمجار بەدەنگی دیلان ساڵی ١٩٤٨ بوو بەو سرووده.

***

## نەورۆز

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە، نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە، بەخۆشی و بەهاتەوە
چەند ساڵ، گوڵی هیوای ئێمە، پێ پەست بوو، تاکو پار
هەرخوێنی لاوەکان بوو، گوڵی ئاڵی نەوبەهار
ئەو ڕەنگە سوورە بوو، کە لە ئاسۆی بڵندی کورد
مژدەی بەیانی، بۆ گەلی دوور و نزیک ئەبرد
نەورۆز بوو، ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە
لاوان بەعەشق ئەچوون، بە بەرەو پیری مەرگەوە
ئەوا ڕۆژهەڵات، لە بەندەنی بەرزی وڵاتەوە
خوێنی شەهیدە، بەڕەنگی شەفەق شەوق ئەداتەوە
تا ئێستە، ڕووی نەداوە لە تەئریخی میللەتا
قەڵغانی گوللە، سنگی کچان بێ، لە هەڵمەتا
پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن، شیوەن و گرین[١]
نامرن ئەوانە، وا لە دڵی میللەتا ئەژین

..............................

(١) مامۆستا م.ھ. لە پیرەمێردی نەمردا لاپەڕە ١١٧ دەربارەی ئەم شیعری نەورۆزە نووسیویە:
«لەبیرم دێ ڕۆژێک دەمەدەمی عەسر بوو، لە شاری سلێمانی، وابزانم ساڵی ١٩٤٨ بوو، لاوان بەکوڕ و کچەوە، بەناو شاری سلێمانیدا بەشەقامەکاندا خۆپیشاندانێکی گەورەیان نواند، شاری سلێمانی بەتەواوی سامی لێ نیشتبوو. کۆنەپەرست و دوشمنانی گەل بەسەرشۆڕییەوە ئەیان ڕوانیە دیمەنی ئەم لاوە خوێن گەرمانە، ئەو ڕۆژانە ڕۆژەکانی ڕاپەڕین بوو، لە شاری هەڵمەت و قوربانیدا وەکو هەموو شوێنەکانی تری عیراق.

لەو خۆنیشاندانەدا، تاقمێک کوڕ و کچی منداڵ لە پێش هەموانەوە ئەڕۆیشتن، سەرو چەپکە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگیان بەدەستەوەبوو، هەموو ڕوویان ئەکردە گردی سەیوان، بۆ ئەوەی ئەو چەپکە گوڵانە لەسەر گۆڕی شەهیدانی ڕێی ئازادی، کوردستان دابنێن. لەو کاتەدا پیرەمێرد لەبەر دەرگای سەرادا لەبەر دوکانەکەی وەستا حەمە سەعیدی خەیاتا بەخۆی و بۆرە گالۆکیەوە ڕاوەستابوو، چاوەکانی بڕیبوە شەپۆڵی ئەو لاوە سەربەرزە نەبەردانەی کە هەموو قین و بێزاری و تووڕەییان لێ ئەتکا، بەرامبەر بەدوشمنانی گەل. پیرەمێرد جاروبار شانی هەڵئەتەکاند و تفی قووت ئەدا. ڕەنگێکی ئەهێنا و ڕەنگێکی ئەبرد. لە دڵی خۆمدا وتم دیارە خاڵە شتێکی پێیە لەوکاتەدا یەکێک لە نزیک پیرەمێردەوە ڕاوەستابوو، توانجێکی زۆر ناڕەوا و بێ سەروپێی گرتە پیرەمێرد، بەڵام پیرەمێردی دڵپاکی دڵسۆز بۆ گەل، ئەو پیرەمێردەی کە دڵی تەنها بۆ خۆشەویستی گەل و نیشتمانەکەی تەرخان کردبوو، ئەو جۆرە توانج و قسە پڕوپووچانە لە کوێ کاری تێ ئەکرد.

لەدواییدا بیستم کە شەو دایەت و میوانەکانی قەلەندەرخانە گرد ئەبنەوە پیرەمێرد ئەڵێ جەمیل (نیازی لە جەمیل صائبی خوشکەزایەتی) کچ و لاوەکانی ئەمڕۆت دی؟، ئەویش لە وەڵامدا ئەڵێ: بەڵێ خاڵە(*).

پیرەمێرد ئەڵێ، دەگوێ بگرە، ئەم هەڵبەستەم پێشکەش بەوانە کردووە.

(*) خاڵە: زۆر کەس لە زمانی خوشکەزاکانی پیرەمێردەوە پێیان ئەوت (خاڵە).

***

## نەشیدەی زانستی بۆ نەورۆز[1]

١٩٣٦

ئەمڕۆ نەورۆزە، وا گوڵ پەیدا بوو
لە عەشقی گوڵدا، بولبول شەیدا بوو
بولبول لەسەر گوڵ، مانگی بەبانگە
خوێندنی ئێمە ساڵ دوانزە مانگە
ئەو تەنها بۆ گوڵ، سەردەر هەوایە
ئێمە سەربەرزی قەومان هیوایە
بولبول لە عەشقی گوڵدا بەسۆزە
سۆزی ئێمە بۆ دایکی دڵسۆزە
بولبول لەبەرگی، گوڵ پەیدا نابێ
ئێمە لەم خاکەین، یاخوا ئاوابێ
بولبول ئەتۆرێ، چون بێ وەفایە
ئێمە ڕیشەمان لەم خاکەدایە
بولبول دەڕەنجێ، بەجەفای خاشاک
ئێمە بۆ سوجدە، سەر دەخەینە خاک





وا دایکی وەتەن، هات و دەفەرمووێ
من نەغمەی ڕۆڵەی، زانستیم[2] ئەوێ
چونکە زانستی، جێگای هیوایە
میللەت بەزانست، لە برەو دایە
زیرەکی ئێمە، لەگەڵ زانستی
ئەگەر یەک کەون ناکەونە پەستی

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ھ دا چاپ نەکراوە. پیرەمێرد لە (ژیان)ی ژمارە ٤٧٠ی ساڵی ١٩٣٦دا بڵاوی کردۆتەوە.

(٢) سەبارەت بە (کۆمەڵی زانستی و قوتابخانەی زانستی) تەماشای کتێبی (کۆمەڵی زانستی) غەفوری میرزا کەریم بکە، ساڵی ١٩٨٥ لە چاپ دراوە.

***

## تاکە بەیت

١٩٣٤

مەولەوی ئێمە و مەولانای ڕۆمی
ئەویان نەی، ئەمیان، ناڵەی مەعدوومی

***

## بەهار و نەورۆز[1]

١٩٤٤

یاران بەهارە،
شنەی پڕ نەشئەی، بادی بەهارە
لالە ئاگری، ناو چیمەن زارە
ئاگری نەورۆزیش لە گردی یارە
پێشخانەی نوورە، بۆ ئەم دیارە
ئەو ئاگرەی مووسا، دی لەکێوی (طوور)
بۆ ڕێی سەربەرزی، بوو بەگڕی نوور
ئاگری نەورۆزیش، لە نزیک و دوور
بۆ ڕێی کورد ئەبێ بەچرای سوور
مەشخەڵی نووری پەروەردگارە

ئەو شەوەی وتیان، ئەمشەو نەورۆزە
جۆشا و خرۆشا ، لاوی ئەم هۆزە
دەهۆڵ و زوڕنا و، جەژنە پیرۆزە،
ئاگرەکەی گردی یارە بەسۆزە
ڕووناکی بەختی بەخشی، بەم شارە
ئەمە جەژنێکی باوک و باپیرە
نەورۆزنامەیان، ئێستاش لەبیرە
دەهۆڵ و زوڕنا و شایی هی پیرە
نازانین بۆچی هاوسێ دڵگیرە
کوڵەوەیبابمان مارێکی هارە

---

(۱) ئەم شیعرە لە دیوانی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## نەورۆزنامەی نەسرین و پەروین[۱]

پار دێتە بیرم وەک خەوێ
کە دیبینێتم[۲] پێرێ شەوێ
ساڵێکی وا تازەم دەوێ
کە کورد بەهاری بەرکەوێ
وەتەنی پێ بیت بەگوڵزار
مژدە بێ ساڵ گەڕایەوە
ئاگری نەورۆز کرایەوە
بەفری زستان توایەوە
گژوگیا و گوڵ ژیایەوە
نوخشەش بێ لە کوردی هەژار
گوڵ بەباغا خۆی دەنوێنێ
بولبول بەڕوویدا دەخوێنێ
هەور مرواری ئەپژێنێ
شەماڵ زیندەگانی دێنێ
نێرگز مەستە و چاو بەخومار



وا فەرشی چەمەن ڕاخرا
گوڵاڵە بوو بەشەو چرا
گوڵ دەستەیان بەست وەک برا
نەسرین و لاولاو تێکخرا
هاتنە لەنجە سەرو و چنار
بولبول شەو بەئاواتەوە
بادەی شەونم ئەخواتەوە
دەگری بەموناجاتەوە
بەڵکو گوڵ دەم بکاتەوە
ئەو پێکەنێ و ئەم بگری زار
وەنەوشە وەک من شین پۆشە
لە سوجدە دایە خامۆشە
دڵی بۆ گریان بەجۆشە
بەهاری لە لا ناخۆشە
بێزارە لە نەغمەی هۆزار

---

(۱) پیرەمێرد سێ جار ئەم شیعرەی بڵاوکردۆتەوە. وەهەر جارەی کۆمەڵێ دەستکاری لە شیعرەکەدا کردووە، بەجۆرێک کە لە یەکتری دوور ئەکەونەوە. لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا ئەم پارچەیە بڵاو کراوەتەوە، بەڵام دوو پارچەکەی تریان لە دیوانەکەدا نییە و ئێمە دوای ئەم شیعرە بڵاویان دەکەینەوە.
(۲) م. ه نووسیویە کە «دەی بینم» ئەمەش دیارە کە هەڵەیە.

***

## نەورۆز[۱]

۱۹٤۹

مژدە بێ ساڵ گەڕایەوە
ئاگری نەورۆز کرایەوە
بەفری زستان توایەوە
سەرچاوەی دڵ ژیایەوە
نوخشەیش بێ لە کوردی هەژار

وا فەرشی چیمەن ڕاخرا
گولاڵە بوو بەشەوچرا
لاولاو تێک ئالاَن وەک برا
بەفر و هەڵەکۆک پێک برا
کەوتنە لەنجە سەرو و چنار
بولبول شەو بەئاواتەوە
بادەی شەونم ئەخواتەوە
دەگری بەموناجاتەوە
بەڵکو گول دەم بکاتەوە
ئەو پێ بکەنێ و ئەم بگری زار
وەنەوشە وەک من شین پۆشە
گەردنی کەچ و خامۆشە
بەهاری لەلا ناخۆشە
بەداخەوە بەپەرۆشە
بۆ ئێمەی بێ کەسی هەژار
خوا زەوی زیندوو کردەوە
تەمی لەسەر لابردەوە
ئێمەیش بەدەشت و وەردەوە
دەستمان لای خوا بەرزکردەوە
دوعامان بۆ بکەوێتە کار
ئاگرێ لەسەر گردی یارە
لەم دیارەوە وا دیارە
ئاگری نەورۆزە و بەهارە
ڕووناکی ڕێی کردگارە
لەگەڵ نووری (طور) بوو بەیار
ئاوی ئەو کارێزە جوانە
چەند خۆش و ڕوون و ڕەوانە
ئەمە نموونەی دڵمانە



بابزانن کورد موسڵمانە
لێڵ نابێ بەلێزمەی بەهار

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی ی م. ه دا بلاَونەکراوەتەوە.

***

## نەورۆزانە(١)

مژدە بێ ساڵ گەڕایەوە
ئاگری نەورۆز کرایەوە
بەفری زستان توایەوە
گیاوگول و دڵ ژیایەوە
نوخشەیش بێ لە کوردی هەژار
گول لە باخا خۆی ئەنوێنێ
بولبول بەڕوویا ئەخوێنێ
هەور مرواری دەپرژێنێ
شەماڵ ژین و ژیان دێنێ
نێرگس مەستە و چاو بەخومار
وا فەرشی چیمەن ڕاخرا
گولاڵە بوو بەشەوچرا
گول دەستیان بەست وەک برا
نەسرین و لاولاو تێک خرا
هاتنە لەنجە سەروو چنار
بولبول شەو بەئاواتەوە
بادەی شەونم ئەخواتەوە
ئەگری بەناڵە و ئاواتەوە
بەڵکو گول دەم بکاتەوە
ئەم پێبکەنێ ئەو بگری زار
وەنەوشە وەک من شین پۆشە
گەردنی کەچ کردوە خامۆشە
ماتەم دەگری و بەپەرۆشە
بەهاری لە لا ناخۆشە

بۆ کوردی بێ کەسی هەژار
خوا زەوی زیندوو کردەوە
تەمی لەسەر لابردەوە
کورد بەدرشت و وردەوە
دەستیان لای خوا بەرز کردەوە
ڕەنگە خوا بیانخاتە کار
ئاگرێ لەسەر گردی یارە
لە تەختگای خواوە دیارە
ئاگری نەورۆز و بەهارە
چرای ڕێی پەروەردگارە
لەگەڵ نووری (طوور) بوو بەیار
ئاوی ئەو کارێزە جوانە
بێ قەوزە و ڕوون و ڕەوانە
ئاوێنەی دڵی کوردانە
دەرمان ئەکا لە تەنگانە
کەوتە کار ناڵەی ئیختیار

(١) ئەم شیعرە لای م. ه بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## نەورۆز و مەولود

١٩٤٢

ڕەبیعی عەرەب، نەوبەهاری کورد
دەست لەملانیان لە نەورۆزا(١) کرد
جەژنی مەولودی پێغەمبەرمانە
وا مەولودمان کرد بەنەورۆزانە
ئەم دوو جەژنەمان کەوا یەک کەوتن
ڕێی ڕێکەوتنە خوا یەکی خستن
ئاگری نەورۆزمان کە کرایەوە
بەو ئاگرە ئاگری شەڕ کوژایەوە



ئاگری نەورۆزمان لە هیتلەر بەردا
خۆڵی مردوومان بێژا بەسەردا
کە خۆڵی مردووی کرا بەسەردا
دەستی لەیەخەی شەڕ و گەڕ بەردا
کە هیتلەر نەما غوولی یابانی
زۆری نامێنێ بۆ مل شکانی

(١) لای م. ه لە لاپەڕە (٣٢٢)ی دیوانەکەدا نووسراوە «لە بەهارا» بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە ئێمە نووسیمان.

***

## وەفدی کوردستان(١)

١٩٣٠

وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان
هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان!
چەپکێ لە گوڵەکەی، باخەکەی سەرا
کە بەخوێناوی میللەت(٢) ئاو درا
بیبەنە بەردەم عەرشی عیراقی
بڵێن یار باقی، هەم سوحبەت باقی
پەردە و تارای سوور بەرن بۆ ئەمیر
بڵێن پاش کوشتار، هێشتا تۆی دڵگیر؟
دەک خەجاڵەت بن، لە ڕووی مەحشەرا
ئێمە خاکی خەم، ئەکەین بەسەرا
ئێوەش ئەو عەرشەی بەخوێن گوڵڕەنگە
سوجدەی بۆ ئەبەن، هیچ ناڵێن نەنگە
کورد نەمردووە، خەیاڵتان خاوە
بەراتی نەجات، بەخوێن نووسراوە
من ڕەنگی سوورم، بۆیە خۆش ئەوێ
مژدەی شەفەقی لێ دەست ئەکەوێ(٣)

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی بەبۆنەی شەڕی بەردەرکی سەرای سلێمانییەوە وتووە کە ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلول ڕووی دا. وە (بێکەس) تەخمیسی کردووە.

(٢) لای م. ه لاوان بەڵام لە ڕاستیدا (میللەت)ـە.

(٣) مامۆستا م. ه لەلاپەڕە (١٠١)ی دیوانی پیرەمێرددا لە بارەی ئەم شیعرەوە دەنووسێت:

لە ڕۆژی شەشی ئەیلولدا کە بەڕۆژە ڕەشەکەی شەشی ئەیلول بەناوبانگە کە لەساڵی (١٩٣٠)دا ڕووی داوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە لە ڕاپەڕینەکانی گەلی کورد. بەهۆی هەڵبژاردن و ئیستفتایەکی درۆوە، گەلی کورد لە شاری سلێمانیدا خۆنیشاندانێکی زۆر گرنگ ئەگێڕێت. لە ئەنجامدا سەربازانی میری کە بەرامبەر لاوان بەچەکەوە وەستابوون، دەستدرێژی ئەکەنە سەریان و دەستڕێژیان لێ ئەکەن و چەند کەسێک ئەکوژرێ و چەند کەسێکیش زامار ئەبێت.

گەلی کورد لەو هەڵڵایەی شەشی ئەیلولدا کوشتاری لێ ئەکرێ و خوێندەواران و مامۆستایانی هەموو لە بەندیخانەکان تونگ ئەکرێن گەلی کورد دڵشکاو و زویر ئەبێ، کەچی سەرەڕای ئەوەش کاربەدەستانی ئەو سەردەمەی میری بەناوی (ئەشراف)ەکانەوە وەفدێک دروست ئەکەن و بێ شەرمانە ئەو وەفدە ئەچێتە بەغدا بۆ ئەوەی کڕنووش بەرێت بۆ عەرشی عیراقی، بۆ ئەوەی سەرەڕای ئەو هەموو کوشتار و زوڵم و زۆر و تاوانە، ئەو وەفدە تکای لێبووردن لە عەرش بکات. قەوانی ناردنی وەفدی دروستکراو و کڕنۆش بردن شتێکی کۆنە ئەمە یەکەمجاری نەبووە، بەڵام گەل خۆی ئەزانێ کە کێ وەفدی ڕاستەقینەیەتی و لە چە کاتێکدا وەفدی خۆی ئەنێرێ. پیرەمێرد لە چوونی ئەو وەفدە، پاش ئەو هەموو کوشتار و ڕەش بگیرە زۆر دڵگیر ئەبێ و ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بەو وەفدە، بەم هەڵبەستە بەرزە دەرئەبڕێت.

هەروەها مامۆستا م. ه لە پەراوێزێکی ئەو لاپەڕەیەدا دەنووسێت: ئەو ساتەی کە شەشی ئەیلول ڕووئەدا شێخ مەحموودی مەزن بەچیای پیرانەوە ئەبێ، هەواڵی ئەو شەڕ و کوشتارە زۆر پەست و دڵگیری ئەکا و ماتەمی دائیەگرێ یەکێک لەو کوژراوانەی بەر دەرگای سەرا ناوی (ئەلە گون سووتاو) ئەبێ کە حەماڵ ئەبێ و بەڕێکەوت بەوێدا تێپەڕ ئەکا و بەبێ تاوان ئەکوژرێ. شێخ مەحموود ئەڵێ، پەیمان بێ ئەبێ نەیەڵم خوێنی ئەلە گون سووتاو بەفیرۆ بڕوات. لە تۆڵەی ئەو شەڕی بەر دەرگای سەرایەدا شێخ مەحموود خۆی ئەگەیەنێتە دەوری ئاوباریک و لەوێ شەڕێکی زۆر گەورە بەرپا ئەکات بەرامبەر بەهێزی میری ئەو سەردەمە. کە بەڕاستی لەو شەڕەدا حەشریان پێ ئەکات.

***

## هاوین

١٩٤١

هەوای هاوینە، هەوای هاوینە،
ئەمساڵ، هاوینمان، زۆر لێ بەقینە
گڕی ئاگری، سەبوون بەتینە
بەرگی ئاسمان، بۆ ئێمە شینە
فەسڵی گوڵگەشتی، باخی پێنجوینە
ئەم سەبوونەمان، لە کوێوە بۆ هات
بەتینی گەرمی، هەڵقرچا وڵات



ئەستێرەی تالع، ڕووی کردە نەهات
بێ شنە و سروەی، شەماڵ کشومات
دڵ بەم گەرمایە،، کز و غەمگینە
گردەکەی یارە، جێی خۆرەتاوە
ڕێگای سەیرانی، نەورۆز بڕاوە
کاریزی شەریف، ئاوی نەماوە
ئەرخەوان، لق و پۆپی شکاوە
گردەکەی سەیوان جێی زار و شینە
ساخوایە هەڵکەی، کزەی شەماڵێ
هەوای ژەنگی غەم، لە دڵ بماڵێ
ئای بۆ دەنگخۆشێک، لەگەڵ شمشاڵێ
بە ئای ئایەوە، تێر بۆم بناڵێ
دەردم کاریە و جەرگم برینە
گوڵ بوە بەخار، بولبول پڕ جەخار
باخەوان کەوتووە، لەپەنا حەشار
شاباز تۆری کرد، گلا میر شکار
یەکسەر گرانی، کەوتە ناو بازاڕ
کەوتوونە ڕەواج، سلق و پەڵپینە

## هاوین

هاوینمان بۆ هات، وەک کڵپەی تەنوور
تەپە دووکەڵی، خستە شارەزوور
زوڵفی بەڕەزای، شۆخی هەڵقرچان
نێرگسەجاڕی، بەجارێ تەپان
چنووری چون نوور، کەوتە ناو دووکەڵ
ملی وەنەوشە، کەچ بوو بەئاژەڵ[١]

........................................

(١) پیرەمێرد ئیلهام و شێوەی دەربڕینی هەستی لەم سێ بەیتەدا لە مەولەوییەوە وەرگرتووە.

***

(لاوس)ی ناو بوو، بەڕەزای پەست کرد
پەلی چنار و سەوڵی بەیدەست کرد

مانگەشەو جلوە و تریفەی کەم بوو
وێنەی دەماوەند، گەردوون پڕ تەم بوو
خۆزگە ئەم گڕە، ناوی عەشق ئەبوو
لە دڵی وەتەنپەرست بەرئەبوو
ئەوسا ئەو جۆشە، دڵی ئەنەخشان
دڕکی تەماعی، شەخسی ئەسووتان
هانام بەتۆیە، خوای «ژیان» و «ژین»
لەم دەرفەتەدا، شپرزە نەبین
جارێکە و ئەمجار، کورگەل بێنە کار
کاڵای کوردستان، بخەنە بازاڕ

***

## نەعرەی دێوانە

کاک ئەحمەدەکەی[۱] ،خۆشەویستی خوا
زۆرکەس بەسایەی تۆوە نان ئەخوا
لەوانە زیاتر، من تۆم خۆش ئەوێ
هەرتۆی سەربەرزی، قەومەکەت ئەوێ
کە لە زیندانیان تێک خزاندبووین
سێدارەیان بۆ داچەقاندبووین
تۆ چوبوویتە لای «بدیع الزمان»[۲]
مژدەت دابوویە، بەژیان و مان
فەرمووبووت ئێوە، نامرن ئەمێنن
تا سەر ئازادی گەلتان ئەسێنن[۳]
خۆ من باوەڕم بەوە کردووە
بەوەسیەت ناوی ئەوەم بردووە
بەڵام وا ئەمڕوم بەو ئاواتەوە
بشمرم گۆڕم دەنگ ئەداتەوە

(۱) کاک ئەحمەد، نیازی لە کاک ئەحمەدی شێخە کە باوکی باپیری شێخ مەحموودی قارەمانە. مرۆڤێکی پاک و ئایندار بووە. پیاوی دنیا نەبووە. وا بەناوبانگە کە هەتا جولەکەکانی سلێمانیش خۆشیان ویستووە.
(۲) بدیع الزمان زانایەکی زۆر بەرزی کورد بووە لە ئەستەموڵ دانیشتوە و نیازی لە بدیع الزمانی هەمەدانی نییە.



(۳) بەلای منەوە پاش قافیەی (ئەسێنن) زیاتر دەگونجێ وەک لە (ئەبینن) واتە، ئەمێنن (ئەسێنن).

## بۆ شەهیدانی ٢٤ی ئایاری ١٩٢٥

١- شێوەی سلێمانی:

گوڵاڵە بەڕەنگ سوور ئەکاتەوە[۱]
وەک من داخدارە لەبنیاتەوە
لە جورعەی شەونم خوێن ئەخواتەوە
شەهیدەکانم بیر ئەخاتەوە
ئۆف، ئۆف، ئۆف
پایز ڕەنگی ماتەمە
دنیا تاریک و تەمە
نووری چاوانم کەمە

٢- شێوەی زەنگەنە:

گەزیزەی پایز، چوون من ڕوو زەردەن
جەگوڵی گوڵان، جودایش وەردەن
ئاە جەو بۆنەوە خاسیش دەربردەن
سەرنەیای فرار شەهیدان کەردەن
ئۆف، ئۆف، ئۆف

٣- شێوەی بادینانی:

دڵ، د ژین تەوەلایە
نەوەی شێخ عەبیدوللەیە
بەدەستا تورک خنکایە

(۱) ئەم شیعرە کاتی خۆی کراوە بەگۆرانی.

***

## مامە خەمە[۱]

١٩٤٨

هەتاوی هاوین، بەردی گەرم کرد
کاتێکت زانی، وتیان فلان مرد

ئێمە بۆ مەرگی جوانمان ئەگرین
ترسی ئەوەیشمان هەیە کە ئەمرین
هی وامان هەیە، لە مەرگ ناترسێ
هێندە بێزارە، لە کەس ناپرسێ
ئەوانەی کەڵکی، پیاوەتیان بوو
کۆچیان کرد دەوری، ئەوان بەسەرچوو
ئێستە هیوامان، بەکەس نەماوە
زەوقی هەڵکردمان، ناوە بەلاوە
لەبەر ئەوەیە، وەک (بێسارانی)
لە عالەم تەریک، بوومە زیندانی
بە چلەی هاوین، لە ژووری زستان
ڕادەبوێرم، ئاوڕشێن، گریان
وەک بەختم، بەرگی ڕەشم لەبەردا
باخاکی، عالەم، بکەم بەسەردا
ئاخ بۆ هام دەردێ، دڵسۆز و یار بێ
بەدەردی ئێلی، دڵ بریندار بێ
دەستی یەک بگرین، ڕوو بکەینە شاخان
پێکەوە بگرین، بەکوڵ لە داخان
بۆ ئەوانەی وا، بەبای باڵی دێو
لەترسا و برسا، ڕوو ئەکەنە کێو
دەستی دڵسۆزێ، دەوایان ناکا
وا دەتلێنەوە، لەسەر ڕووی خاکا

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## یاران نەوبەهار[١]

**١٩٤٩**

یاران نەوبەهار،
ڕەنگی خەزانە، لەلام نەوبەهار



وەنەوشە، سەرشین، چەوتاوە خەمبار
سۆسەن شێواوە، لە جەخاری خار
گوڵ باهەر نەڕوێ، نە ئاڵ و نەزەرد
گیای سەوز و وشک، بێ بەداخ و دەرد
با کەو نەخوێنێ، لەسەر نزاران
با نەپرژێنێ، شەونم بۆ داران
ئەرخەوانەکەی، سەرقەبری ڕۆڵەم
بم گرێنێ بۆ، شیوەن و ماتەم
لافاوی دیدەم، وا جۆش بسێنێ
سەدەی بەربەستی، ئاو بڕووخێنێ
دیجلەی فرمێسکی، دووری عەزیزان
سەلمانی پاکم بۆ بخاتە گریان
کلیلەی بەفری. چیا و ئاسۆ و هەرد
باداوە پێچ و گێژەڵووکەی دەرد
بەدوعا و ناڵەی، دڵ مەئیوسیمان
ڕوو بکاتە شاری، تەقیانووسیمان
ئیتر نە لە شاخ، دەنگی گیاندار بێ
نەسەدای بولبول، نە گوڵشەن دیاربێ
چونکو قیلەکەم، ئیمساڵ غەمگینە
دیارە کە فەلەک، لێمان بەقینە
خوایە گیرا کەی، ئاهو هەناسە
هاوارە ڕەحمێ، ئێلم کەساسە[٢]

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

(٢) تەواو لێم ئاشکرا نییە کە پیرەمێرد ئەم شیعرەی بەچ بۆنەیەکەوە وتووە وە چ کارەساتێک وەها دڵی بریندار کردووە و هەستی ئاڵۆز و خەمبار کردووە. بەڵام بەوەدا کە شیعرەکەی لەسەرەتای مانگی نیساندا بڵاو کردۆتەوە ڕێی تێدەچێ کە بەهۆی ئەوەوە بووبێ، کە ئەو ساڵە ١٩٤٩ نەیان هێشت ئاگر بکاتەوە و ئاهەنگی نەورۆز بگێڕێت.

***

## جەژنی مەولود و نەورۆز[1]

١٩٤٣

وا سەرلەنوێ، زەمین گیا و گوڵ، ژیایەوە[2]
گێرۆدەیی و کەسیرەیی سەرما، بڕایەوە
خوابکا هەوای ئاسایشی ئەم خاکە بێتەوە
ئەم ئاگرەیش بەئاوی نیسان، دامرێتەوە
وەیا اللە نور السماوات
چرای ڕێمان بێ، مصباحی مشکات
فەرمووتە (نار نور علی نور)
مەولود و نەورۆز، واهاتنە (ظهور)
دوو ڕەبیع، یەکێک مەولودی سەردار
ئەو ڕەبیعی تر، نەورۆزی بەهار
ئەم دوانە ئەمساڵ، کەوتوونە مانگێ
بۆ پیرۆزی کورد، ئاواز و بانگێ
نیەتی مەولود، لە نەورۆز دێنین
لە گردی یارە، مەولود ئەخوێنین
بەو نیەتە خوا، ئەم دوو جەژنەمان
پیرۆز کا و ببێ بەجەژنی جیهان
یەعنی ئەم شەڕە، بکوژێنێتەوە
ئەم فەلاکەتە، ببڕێنێتەوە
جاری نەورۆزمان، ڕۆژێکی وایە
ڕۆژێ سروشتی هەموو دنیایە
ئەو ڕۆژەیە ساڵ، نوێ ئەبێتەوە
زەوی و درەخت و گیا ئەژیەتەوە
بە (یحي الأرض بعد موتها)
زیندەگی تازە، ئەبینین وەها
ئنجا مەولودی ئەو پێغەمبەرە
تەعریف و مەدحی لەحەد بەدەرە
تیفلێکی بێ کەس، خۆی نەخوێندەوار
خودا بەو دینە، کردی بەسەردار



شێوەی سروشتی، لەدەست خۆی ناوە
خۆی چۆنی ویست وا، دروست کراوە
بۆ ئەم دوو جەژنە، لە گردی یارە
کۆ ئەبنەوە، خەڵکی ئەم شارە
کاڵەک و شووتی و توور و پرتەقاڵ
لەگەڵ یاپراخ و چا، جەژنانەی ساڵ
هەرچەند ئەمانە، ئەمساڵ گرانە
لەلای پیرەمێرد، هەمووی ئاسانە
چرای باپیران، ناکوژێتەوە
هەرچی خەرج ئەکا، لەجێی دێتەوە
باوک و باپیرمان، با ناو دەربەرن
ڕۆڵەی (زانستی)یش تێر تیا هەڵپەڕن

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

(٢) لە ژمارە٧٠٠ی ژیندا ساڵی ١٩٤٣ کە ئەم شیعرە پیرەمێرد خۆی بڵاوی کردۆتەوە بەو جۆرە نییە ئێمە لە سەرەوە نووسیمان، بەڵکو ئەو چوار دێڕەی کە کێشەکەی لە تەواوی شیعرەکە جوێیە هەر لەگەڵ شیعرەکەدا نووسیوە. سەیر ئەوەیە ئەو چوار دێڕەش نیوە دێڕی یەکەمی ١٣ بڕگەیە و سیانەکەی تر چواردە بڕگەن. وە دوای ئەوە شیعرەکە هەمووی کێشی خۆماڵی ١٠ بڕگەییە.

***

## کۆنەفرۆشی[1]

١٩٤٨

دیجلە بەهاران، کەکەف ئەچێنێ
زنجیر کراوە و، شێتی ئەنوێنێ
پایزان بێ دەنگ، دۆش دائەمێنێ
دیارە کەس لەسەر، باری نامێنێ
دیجلە ئەم هەموو خەلیفەی دیوە
لە لەنجە و لاری خۆی نەلەخشیوە
ڕاست بەناو جەرگی بەغدادا ئەڕوا
ئەیان خنکێنێ، کە دەستی ئەڕوا
ئەم دیجلەی ئێستا، کە ئەکا گوزەر
(هۆلاکۆ) بەری بەستبوو بەسەر

هەزار هۆلاکۆی، هیلاک و کز کرد
لالە عەباسی ئالّی لەناوبرد
هەروەک خۆیەتی، بەبێ غەم ئەڕوا
لە خوڕە و گوڕە، ناکەوێتە دوا
هەر کەلوی بەردە، لە تاقی کیسرا
بانگ ئەکا (بەقا نەبودە کسرا)

(١)ئەم شیعرە لە دیوانی (پ.م)ی (م. هـ)دا بلاو نەکراوەتەوە

***

## فەلەک نایەڵێ(١)

١٩٤٩

فەلەک نایەڵێ، خۆشی تاکو سەر بێ
ئەوی پیاو بێ، ئەبێ هەر دەربەدەر بێ
ئەبینم ئاسمانی باوەپیارە
شیعارێکی نییە، شێوەی بەدر بێ
لەناو ئەو باخەدا، خۆی ناشتی ئێستا
درەختێکی نەهێشت، سێبەر لەبەر بێ
بەهار هات، شاعیرێکی پێ نەهێشتین
وەکو بولبول، کە نالّەی کاریگەر بێ
لە گەردی یارەوە، ئاگرێ دیارە
ئەسووتێ هەرچی نەورۆزی لەبەربێ
نییە غەیری وەنەوشە و لالە وەک پیر
قەدی چەوتی، لەبەرداخی جگەربێ
خەوی مەرگە، مەگەر گورگی ئەجەل هات
لەڕانی داین و نەی دی کەس خەبەربێ
بەجارێ، چوار پەلی گرت و فڕاندی
وەرە جەژنت نەبێ و قۆچت لەسەربێ
ئەڵێن بەم حالّە، شوکرانەبژێر بە
نەوەک ڕۆژێکی لەم ڕۆژە بەدتر بێ



کە من کەوتمە مەلەی ناچار لە گۆما
بەلّام قوولّ بێ نەوەک خوڕ و خەتەربێ

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بلاو نەکراوەتەوە.

## شەڕ لەگەڵ هەوادا(١)

١٩٤٢

نازانم هەوا، بۆ چ وا بەکولّە(٢)
لەم دەنگوباسە، بۆچ نابەدلّە
ئێمە زیانمان هیچ لەو نەداوە
ئەو بۆ چ تەگەرەی لەکارمان داوە
ئەو قینی چییە، وا ڕێگا ئەگرن
بەدناوی نەبێ، هیچی پێ نابڕن
ئەو دەم و واتە، زبانە شیرینە
لەلای ئەو تالّە، هەروەک هەنگوینە
(لەندەن) ئەتوانێ، ئەو لەرزەش ببڕێ
بەربەخەی هەوای، دەروێش دادڕێ
خەیالّە تازە، بۆ کورد بەیانە
شەوی بەسەرچوو ئەم قەومە جوانە
با تەقس لاچێ، ڕێگا بکا چۆڵ
بەسە، لاخواری، بەسە بۆڵەبۆڵ
لووتت دەشکێ، هەروەکو نازی
ئاخر، ئاواتی مەرگت ئەخوازی
دەنگی مامۆستا (ڕەمزی)(٣) ببیبیەم
شیعرەکەی (گۆران)(٤) بابێتە بەرگوێم
بەقاسپەی چالاک(٥)، هەروەک نێرەکەو
با ڕام چەنێنێ شەوە، گیان لە خەو
سەیرکە، چەن خۆشە، ناوی ئەم پێنجە
لێکی دەینەوە، وەک زێڕ و گەنجە
ژین و ئیزاعەی شاری سلێمانی
وا کوردی ئێران، هەموو پێی زانی

دەنگی (کامل) بەگ، شەوقی گەلاوێژ
بڵاوبووەوە، هەزار تۆپ هاوێژ
قسە خۆشەکەی، شاری فەلەستین
گورزی کاوەیە، مزگێنی بۆ ژین
خۆزگە زانستی[6]، ئێمەیش بمایە
بانگی (هەربژی) لێ نەبڕایە
ئەوسا نیشتمان ئەگەییە غایە
هەموو لاوانمان ئەگەییە غایە
ئیتر هەربژی، بەریتانیا
دەنگی خستینە، ناو هەموو دنیا

........................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێرددا بڵاو نەکراوەتەوە.

(٢) پیرەمێرد ئەم شیعرەی بۆ ئێستگەی (شرق الأدنی) وتووە کە ساڵی ١٩٤٢ لە یافا (حلفاء) لە جەنگی جیهانی دووەمدا کردبوویانەوە. بەشێکی کوردی تیابوو کە گۆران و ڕەفیق چالاک و ڕەمزی قەزاز بەڕێوەیان دەبرد.

(٥،٤،٣) مەبەست لە ڕەمزی قەزاز و گۆران و ڕەفیق چالاکە. کە لە بەشی کوردی ئەو ئیستگەیەدا کاریان دەکرد.

(٦) مەبەست لە کۆمەڵی زانستی و قوتابخانەکەیەتی لە سلێمانی

***

## شیعری دووەم - بۆ ئێستگەی یافا

١٩٤٢

دەنگێکی قودس[1] لای قودس[2]ەوە هات
ناو جەژنانی کرد، بەجەژنێکی ڕاست
ئەو شەوە بەختی، میحوەر وەرگەڕا
نووزەی نازیەکان، لە لیبیا بڕا
ڕۆژی ڕومیل[3]یش بوو بەشەو شکا[4]
ئابرووی فاشست، ئێجگاری تکا
ئەمەریکا هات، جەزائری گرت
ئەمیرال دارلان[5]، کەوتە جرت و فرت
ئەو شەوە بانگی ڕۆڵەی کوردستان
لەشەرقی ئەدنا[6]، گەییە ئاسمان



لە شوێن میعراجی (مسجد الأقصی)
دەنگی گۆرانی (گۆران)[7]مان هەڵسا
فەلەستین شوێنی (صلاح الدین)ە
بۆیە ئەم دەنگە، هێندە شیرینە
ئافەرین ڕەمزی بەتەوای قەزاز[8]
ڕاست میللەتەکەت، پێ کرد سەرفراز
لاوکی کوردی وەک دەنگی زەبوور
دەنگی دایەوە لە نزیک و دوور
سەری گۆیژەمان لە (صخرة الله)
تا پایەی عەرشی، یەزدان خۆی هەڵڵا
شۆڕێک کەوتە ناو کوردستانەوە
ڕۆحی نیامان[9] پێی حەسانەوە
ڕادیۆ وەک (صوری اسرافیل) وابوو[10]
(بعث بعد الموت) لە پڕ پەیدابوو
ئەمە نەزەری بەریتانیایە
مسی کرد بەزیو کە کیمیایە
ئەم ژیانەوە و ئەم زیندەگییە
تا دەمرین چرای ڕێی بەندەگییە
شێوەی عیراقیش دیموکراتییە
ئەمە نیشانەی، ڕێگای هاتییە
یاخوا لەسایەی، بەریتانیادا
پێکەوە بژین، تێر لە دنیادا

........................................

(١) قودس: پیرۆز.

(٢) قودس: شاری قودس.

(٣) سەرکردەیەکی بەناوبانگی نازیەکان بوو لە ژووررووی ئەفریقادا لەشەڕی (علمین)دا شکا. م. ه.

(٤) م. ه نووسیویە (ڕۆژی ڕۆمیلیش بەو شەڕە شکا)، بەڵام لە ڕاستیدا وەهایە: ڕۆژی ڕۆمیلیش، بوو بەشەو شکا.

(٥) سەرکردەیەکی دەریایی فەرەنسا بوو. م. ه.

(٦) مەبەستی لەو ئێستگەیەیە کە ئەم شیعرەی بۆ وتوە. ئێستگەی (شرق الأدنی) لە یافا.

(٧) مەبەست لەو سروود و گۆرانیانەیە کە گۆران شیعرەکەی نووسیبوو وە (چالاک) دەیگوت.

(٨)ڕەمزی قەزاز.

(٩) مردوو.

(١٠) ئەم شیعرە لێرەوە لە دیوانی پیرەمێردی م. ھ دا نەنووسراوە یا قرتێنراوە. وە بریتییە لە پێنج بەیت واتە (١٠) نیوەدێڕ.

## جەژنی قوربان[1]

خوا حەزرەتی ئیسماعیلی لەژێر تیغ ھێنایە دەر
ساڵتان هەموو هەر بەجەژن و بەشادی بباتە سەر
ئەو جەژنە جەژنە، میللەتی تیا بەشادمانی بژی
بۆیە بەھاری پەسەندە، گوڵ و میوەی دێتەبەر
پێکمانەوە بێ، جەژن و دڵشادی
تا سەر بێ، سەر و گەردن ئازادی

(١) پیرەمێرد بەبۆنەی جەژنێکی قوربانەوە لەسەر کارتێک ئەم شیعرەی بڵاو کردۆتەوە

***

## عەشرەت ھاوارە[1]

١٩٤٧

عەشرەت ھاوارە، عەشرەت ھاوارە
کەوتوومە (ئاراس) ئاو بێ بوارە
ڕێم نییە منیش، شوێن ئەوان کەوم
پیرم، ھەنگاوێک بنێم، ئەکەوم
لێرەش وا کەوتووم بەدەم دەردەوە
لە ئێشی دووری و ئاھی سەردەوە
دکتۆر دەوای تۆم ناوێ لێم گەڕێ
بەڵکم بەئاھم، دەوران وەرگەڕێ
یا وا وەرگەڕێ ئێڵم سەرکەوێ
یازرمەی تۆپی زەڕڕەی بەرکەوێ
ئەو ساکە دوعای من وا گیرابێ
لە خانەی خاکا، ئاواتم نابێ



ئنجا تەڵقینم بدەن بەکوردی
بڵێن ئاواتت، ھاتە جێ، مردی

(١) م. ھ لە لاپەڕە ١١٦ی دیوانی پیرەمێرددا نووسیویە شاعیر ئەم شیعرەی بۆ ئەو قارەمانە بارزانییە کوردانە وتووە کە لە سنووری تورکیا و ئێرانەوە گەیشتنە خاکی شوورەوی.

## فەریادی پیرەمێرد[1]

١٩٤٥

ئەڵێن فرمێسکی ھەور بارانە
گوایە گریانی شینی یارانە
کوا ئەگەر ھەور وا بگریایە
ئەشیا بارانی ھیچ نەوەستایە
چونکە چوار ساڵە ئەم سەرزەمینە
تێکڕا بەخوێنی کوژراو ڕەنگینە
ئێمە کە خۆمان، یەکتر بکوژین
ھەور و ئاسمان بۆچ، بۆمان بگرین
ئەم قڕە قڕە و، قڕی ئینسانە
ڕاستت پێ بڵێم، فیتی شەیتانە[2]
خواستی خواییە، ئەبێ بێتەجێ[3]
بۆ ئەوەی زەمین، بەفەساد نەچێ

(١) مەبەستی پیرەمێرد لەم شیعرەدا کارەساتی جەنگی جیھانی دووەمە.

(٣،٢) لێرەدا جێی سەرسوڕمانە کە بیروباوەڕی ئایینی بەو جۆرە کاری لە شاعیر کردووە لەبری ئەوەی ھۆی بەرپابوونی جەنگ بۆ واقیعی دروست بوونی بگێڕێتەوە، تاوانەکەی ئەخاتە ملی شەیتان و خواستی خوا. لەکاتێکدا شەیتانیشی وەک ڕەمز دانەناوە.

***

## لەو ساوە

لەو ساوە کە شاری سلێمانی دروست کرا
کوشتاری ئێمە بوو بەشەڕی دوو برا
ساڵێک بەتوورەکانە بەماڵ و مناڵەوە
ئەژیاین بەڕیزە، ڕیزکەری کەوش بووین لەماڵەوە

ديواربڕێک بەدزییەوە گەسکی لەماڵ ئەداین
شەو خەنجەرێک بەدزیەوە، باوکی لە چاڵ ئەناین
سەرمایەی تجارێکی پێشوو، مەعاشێکی ئێستە بوو
ترسێکی وای بوو کێ خەوی ئێستای لەچاو ئەچوو؟
ئەمن و ئاسایش و نیعمەت و سەیرانی ئێستەکە
توخوا بەناشوکری مەیبڕە و سپڵەیی مەکە
باوەکوو ئەوانەی ژووروو، نەخنکێین بەدارەوە[1]
با دانەهێنرێین بەتەری بەپۆپەی مەشارەوە
قەیوان و قوترە و کونەماسی لەدەست نەدەین
دوایی بەجەرت و فرتەوە هانا بۆ کێ ئەبەین!؟

(١) مەبەست لە شۆڕشگێڕانی شۆڕشی شێخ عەبدولقادری شەمزینی و شێخ سەعیدی پیرانە کە لە سێدارە دران.

***

## ئێمە کە کوردین

١٩٢٦

ئێمە کە کوردین، لەلامان وایە
زوبانی کوردی، زۆر بێ هاوتایە
لاوکی کوردی، دەنگی زەبوورە
(جنة المأوى) لە شارەزوورە
صلاح الدین و کەریم خانی زەند
بابا شەرەف خان، شای کۆی دەماوەند
قارەمان قادر[1]، فیدایی فوئاد[2]
لەڕێی وەتەندا، بەجەننەت بوون شاد
گەورەی هیچ قەومێک وەک گەورەی کوردان
لەڕێی وەتەندا، نەبوون بەقوربان
فکری میللەتیان، ئیحیا کردەوە
قەدری وەتەنیان ئەعلا کردەوە
شادین ئەی میللەت بۆ ئەم گەورانە
فەخری تەئریخی، لایق بەوانە



ناویان ون مەکەن، بەخاس و بەعام
تاکو دەس کەوێ، ڕۆژێ ئینتقام
بێنە جوولەجوول، باڕۆحیان شادبێ
پێی میللەتەکەم، لە بەند ئازاد بێ
کچانمان لەژێر، بەیداخی ڕەشدا
چاو هەڵنەهێنن، بەخوێنی گەشدا
بەخوێنی لاوان، وەتەن نەجۆشێ
میللەت بۆ وەتەن، سیا نەپۆشێ
هەزاری وەک من، هەتا نەکوژرێ
بەقەڵەمی خوێن، شیوەن نەنووسرێ
ئەم میللەتەی کورد، ڕزگاری نابێ
بێ شک ئەم ئیشە، ئەبێ هەر وابێ

(١) قادر: شێخ عەبدولقادری شەمزینی.
(٢) فوئاد: دکتور فوئاد یەکێ لە پێشەوایانی شۆڕشی کورد بوو لە تورکیا لەتەک شێخ عەبدولقادر و هاوڕێکانیاندا شەهید بوون.

***

## تاکە بەیت

١٩٤٣

لەناو، ئەو ئاوە جوانەی، تەرزی، تەرزە
دڵی (بی)و(مانگ)و(شاعیر) هاتە لەرزە

***

## دایکی وەتەن[1]

بۆ شەشی ئەیلولی ١٩٣٠

دایکی وەتەن ڕاوەستاوە
فرمێسکی خوێنی لە چاوە
پرچی بەشانیا بلاوە
ئەڵێ ئەولادم کوژراوە

دڵم براوە، جەرگم سووتاوە
هێزم نەماوە، پشتم شکاوە
دوکەڵێ کەوتە رووی ئاسمان
بەچکە شێرانمان گشت شەهیدکران
منداڵەکانمان بەبێ باوک مان
کزەی خەزانە، گەڵارێزانە نابڕێتەوە!
ئەی شەهیدانی، بەرگ خوێنین
خۆتان بۆ ئێمە کرد بەپەرژین
لە خوێنتان دەس بەردار نابین
لە دڵی میللەتدا دەژین
شەشی ئەیلولە، رۆڵە مەقتولە
چاوە، پڕ ژانە، گەڵارێزانە، نابڕێتەوە

..........

(١)ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە. کاتی خۆی کراوە بەسروود بۆ شەشی ئەیلول.

***

## سەرگوروشتە

١٩٤٣

عیراق کە شوێنی (بنو عباس) بوو
باخی ئیرەمی، لالە عەباس بوو
وەک جورجی زێدان، نووسیویە بۆمان
تا بەسرە بووبوو، بەباخ و بێستان
دنیا لەسەر هیچ بارێ نەماوە
بەغدایش لەو حاڵە کەوتبووە دواوە
وەک مەلای مەزبوور ئەڵێ ئەم مانگە
دەورەی پڕتەوی کە چواردە دانگە
ئەیبڕن ئەیکەن بەئەستێرەی ورد
ئەم چەرخی چەپەیش، وای لە بەغدا کرد
ئەم دیجلەی کەوا، پیا ئەکا گوزەر
هۆلاکۆ بەری بەستبوو بە سەر



لە دەورەی تورکدا ولایەتێ بوو
لە مانگە رێوە والی بۆ دەرچوو
تا خوا هەلێکی باشی بۆ رەخساند
لە کەشمەکەشی دەست بێگانەی ساند
رۆڵەی ناوداری، وەتەنی عیراق
پشتیان دایە یەک کەوتنە ئیتفاق
ئنجا لە نەوەی، هاشمی ئەکبەر
مەلیک فەیسەڵ هات، کردیان بەسەروەر
هەرچەند خوا کردی و چەرخی دنیا بوو
دامەزرێنەری، بەریتانیا بوو
هێشتاکو تەواو دانەمەزرابوو
لەهەر چوار لاوە ئاشووب پەیدابوو
هیتلەر لەدەر و میتلەر لەناودا
بارگیری بەدی فیتنەیان تاودا
تا پێیان کرا درێغیان نەکرد
ئینگلیز کەوتە فریا دەستوبرد
ئێستا بەحوکمی ئایەتی قورئان
کە باوەڕ ئەکا پیاوی موسوڵمان
کەسێ پاش مردن، زیندوو بێتەوە
دیارە کە ئیتر نامرێتەوە
بەغدایش پاش مردن، زیندوو بۆتەوە
ئیتر مردنی لەبیرچۆتەوە
لەم (بعث بعد الموت)ە ئەمێنین
هەتا دنیا بێت ئێمە ئەمێنین
وا بەپەیمانی (ئەتلانتیک) عیراق
لەگەڵ دوو دەوڵەت، کەوتە ئیتفاق
لە(ساحەی صلح)دا ئێمەیش جێ ئەگرین
هەقی سەربەستی، بەهەق وەرئەگرین
رەنگە کە هەندێ لە گرۆی بەدکار
بە هۆی بەدخوویی وەک دووپشک و مار

بڵێین ئیعلانی شەڕ بۆ شەڕ چوونە
ئەوی گوێی باتێ، دڵی زەبوونە
ئەم دوو دەوڵەتەی کە یاری ئێمەن
بۆ هەموو دەردێ، خەمخواری ئێمەن
چ پێویستێکیان بەئێمە هەیە
دەوڵەتی عادل دیارە بێ وەیە
ئەبێ بزانین کە (گا) گۆڕاوە
نوزەی بڕاوە، هەر کلکی ماوە
باوەجود ئێمە کە ناومان کوردە[1]
لە شانامەدا، ناوبانگمان کوردە
توخوا نەنگ نییە لەشەڕ بترسین
لەم ڕەنگ هەرا و گیڤە بپرسین
من وام ئەوێ کورد لە پێشەوە بێ
وەک فەرهاد بازووی بەتێشەوە بێ

.................................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## سێ بەیت

١٩٤٨

«هەر کارێ لەلای بەندە گرانە
ئەوە لەلای خوا گەلێ ئاسانە
بەڵام بەو شەرتەی بڕوات بەخوابێ
ئیشێکی وایش بێ، غەدرت لێ کرابێ
ناڵەت ئەبێتە، سەرەبزووتێ
وەک ئاگر و پووشوو، زۆردار ئەسووتێ»

***



## بۆ مستەفا صائب[١]

مستۆ[٢] وادیارە تۆش جل خوار ئەکەی[٣]
ئەستۆت ئەخورێ و مەیلی بار ئەکەی
نامە ئەنووسیت بەزبانی تورکی
لە میللیەتدا مایل بەشرکی
ئێمە کە کوردین لەلامان وایە
کوردی زبانێکە زۆر بێ هاوتایە
ناوی پێغەمبەر، حەمەی ڕەسوڵە
نوێژمان بەکوردی لای خوا قبوڵە
ئەگەر تەڵقینم، بەکوردی نەدرێ
گوێی لێ ناگرم، باکفنم بدڕێ
گەر مەڕنەموکەی[٤] عارەب لێم پرسێ
وای تێ ئەخورم، کە ئەو بترسێ
ئەمە دینمە و دینێکی بەهەق
لەسەر بەیتی خۆم ئەگەر بکرێم شەق
نووسیوتە گوایا، وەزیفەم ماوە
هەرچیمان کردووە هەر ناتەواوە
چیم کردووە ئێستا جارێ لە کوێمە
میللەت لەمەودوا ئومێدی پێمە
سەیرکە بەهارم لێ بێ ئینشاالله
لە کوردستاندا، بیکەم بەهەڵڵا
شیمال و جنوب، تێکەڵ کەم بەقین
بلەرزێنمەوە، گاکەی ژێر زەمین
بەیداخی کوردی، بلەرێنمەوە
ئیرسی ڕۆیوەکان بگەڕێنمەوە
صلاح الدین و کەریم خانی زەند
بابا شەرەف خان شای کۆی دەماوەند
بێنە جموجۆڵ، ڕۆحیان شاد بێ
پێی میللەتەکەم، لەبەند ئازاد بێ

لەسەر هەر کێوێ، شێرێ تێخوڕێ
ناوجەرگی هەموو، دوشمنان ببڕێ
ئەوجا سەربەستی، بەئێمە ئەدرێ
خێر ئەوان بیدەن، کەڵک ناگرێ
نامەوێ بیدەن، ئاهبێ[5]، بیسێنم
فکرم ئەمەیە، هەتا ئەمێنم
هەزاری وەک من، هەتا نەکوژرێ
بەقەڵەم، بەخوێن، مەرسیەی نەنووسرێ
بەو خوێنە خوێنی، میللەت نەجۆشێ
میللەت بۆ وەتەن، سیا نەپۆشێ[6]
کچانمان لەژێر، بەیداخی ڕەشا
چاو هەڵنەهێنن، بەخوێنی گەشا
تا خاکەکەمان، بەخوێن نەشۆررێ
ئیمان بەسکەی، ڕوپیە نەگۆڕڕێ
تەشەبوساتی، من تەواو نابێ
موتڵەق، ئەم ئیشە هەر ئەبێ وابێ

---

(٣.٢.١) مستەفا صائب: نووسەر و ڕۆژنامەنووسی گەورە و بەتوانا. ژمارەکانی ڕۆژنامەی (ژیانەوە) و ( ژیان)ی ساڵانەی بیست و سی، هەروەها لە چاپدانی دیوانە شیعرییە کوردییەکان و پێشەکی بۆ نووسینیان گەواهی ئەمە دەدەن. نووسەری وردبین و بەهرەمەند (کەمال ڕەئوف محەممەد) تەواوی بەرهەمەکانی ئەم نووسەرەی لەلایە و خەریکی ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەیانە. ئەم شیعرەی پیرەمێردیش تەنها لەو ڕووەوە دڵگیری و زویری بەرانبەر مستەفا صائیب تیایە کە نامەی بۆ پیرەمێرد بەتورکی لە سلێمانییەوە بۆ ناردووە. لە زۆر نووسیندا پیرەمێرد ڕێز و خۆشەویستی خۆی بەرانبەر مستەفا سائیب دەربڕیوە. هەروەها ئەم نووسەرە بەناوی (زەکی صائب) و چەند نازناوێکەوە نووسینی خۆی بڵاو کردۆتەوە (مستۆ) یا (مصطو) لە شێوەی کرمانجی سەروودا بەمستەفا دەڵێن مصطو. جل خوار: تورک خواهان، ئەوانەی سەر بەتورک بوون.

(٤) مەڕنەموکە (من ربک)ی عەرەبییە وای لێ هاتووە. گوایە دوای ناشتنی مردوو مەلائکەت دەچنە سەری و لێی دەپرسن (من ربک) ئەگەر مردووەکە ئیسلامی تەواوبێ دەتوانێ وەڵام بداتەوە.

(٥) ئاهبێ: عەهدبێ، پەیمان بێ.

(٦)سیا نەپۆشێ، بەرگی ڕەش نەپۆشێ.

***



## بەندی قەتار[1]

١٩٤٦

ساقی بەعەشقی بەرزی خاکەکەم
بەیادی قەومی دڵ خەمناکەکەم
بۆم تێکە جامێ، با دڵ خامۆش بێ
کەڵکەڵە و سەودای سەر فەرامۆش بێ
توخوا سا (ڕەشۆڵ)[2] تۆش قەتارەکەت
سەدای سوب سەحەر پای کۆسارەکەت
بەڵکو بێنە جۆش، نەوجەوانانمان
تێکۆشن بەعیلم بۆ خان و مانمان

---

(١) ئەم بەیتە لە لاپەڕە٨٢ی م. ه دا بەهەڵە نووسراوە. ڕاستمان کردەوە.

(٢) ڕەشۆڵ: دەنگخۆشێکی کوردە، کەماوەیەکی زۆر بەبولبولی کوردستان بەناوبانگ بوو، مرۆڤێکی قسەخۆش و لە خۆبوردوو و بەوەفایە، گوێ ناداتە ماڵی دنیا، هەر زرمەی دێ، لای من تەنها هەر عەیبی ئەوەیە کە ژمارەیەکی کەمی لە هەڵبەستەکانی کوردی لەبەرەو ئەبوایە زۆربەی هەڵبەستە بەناوبانگەکانی لەبەربکردایە، هەروەها ژمارەیەکی زۆر کەمیشی لە گۆرانییەکانی تۆمار کردووە کە ئەمەش ڕاست نییە. ڕەشۆڵ کە ئەو گۆرانییەی ئەوت (ڕەشوڵ)ەکەی ئەکرد بەکوردە و بەم جۆرە ئەیوت: توخوا سا کوردە تۆش قەتارەکەت.

***

## بۆ بیست ساڵەی ژین

لە(١٩٢٦)ەوە بۆ (١٩٤٦)

### بەستەی هەی ژین

هەی ژین، هەی ژین، گوڵی باخی ژین
هیممەتی پیرت، بۆ بوو بەپەرژین
بەختت وەک تەختی سولەیمان بەرزە
شیعرت وەک عەرشی بەڵقیس سەد تەرزە
بینای نەزانیت، هێنایە لەرزە
خۆشەویستی تۆ لەلامان فەرزە
هەی ژین، هەی ژین

ئەمڕۆکە ساڵی، بیستە، تەواوە
زەماوەندێکی، وات بۆ کراوە
لە کوردا جەژنی وا ڕوی نەداوە
گشت ڕۆڵەت هاتوون لەم لاو لەولاوە
هەی ژین، هەی ژین
نەورۆزت هانی، بەچلەی زستان
بەبانگی بەیان کورد لە خەوهەستان
ئاوازەی بەرزیت، کەوتە کوردستان
یاخوا گەرم بێ، هەروا مەجلیستان
هەی ژین، هەی ژین

پیرەمێرد پێش ئەوەی ئاهەنگی بیست ساڵەی دەرچوونی ڕۆژنامەکەی بگێڕێت، وەک ئاگاداری و بانگهێشتنێکی هەموو لا، لە ژمارە(٨١٧)ی (١٧)ی کانونی دووەمی (١٩٤٦ی ژین) دا ئەم چوار بەیتە بڵاو دەکاتەوە.

ژین کە پەیامی، ژینی کوردانە
فریشتەی مژدەی، سایەی یەزدانە
ئەم بیست و شەشەی کانوونی دوایی
ساڵی بیستەمیە، کەوتووینە شایی
فەرموون با ئێوەش، بەشتانی تیابێ
یاخوا زۆر ڕۆژی، وەهای لە دوابێ
سەعات لە چواری دەمەو ئێوارە
شوێن شایی قەسری (فائق هوشیار)ە[1]

........................................

(١) مەبەست فائق هوشیاری کچەزای پیرەمێردە. واتە کوڕی ڕەحمەخانی کچی پیرەمێردە. پارێزەرێکی وریا و خاوەن تاقی کردنەوەی زۆرە.

***

## کزەی دەروون[1]

دواوانەکەی[2] شوێن ماڵە گەورە
سەرەو خوار ئەڕۆی، بەپێچ و دەورە
ڕوون و ڕووناکی، وێنەی بلووری
ئاوی زیندەگی، گشت شارەزووری



وام لە کەنارت بەدڵەی پڕخەم
ڕۆژی ڕووناکم، لێ بووە بەتەم
ئەگریم و ئەڵێم، تۆ وەک ئاوێنەی
بۆ شوێن دەستکردی، کردگار وێنەی
بۆچی نانوێنی، وێنەی فۆتۆگراف[3]
وێنەی شیرینی، نازدارانی جاف
نموونەی دەستی، پەروەردگاربوون
بەدەوری تۆدا، گوڵی بەهاربوون
بەشەدەی لار و، کراسی کەتان
وەک مانگ کەتانی[4] جەرگیان ئەسووتان
وێنەی مانگەشەو، بەشەوی دەیجوور[5]
بورجی ڕەشماڵیان پڕ ئەکرد لە نوور
شەوی مانگە شەو، ئاوایی خەوتن
لە دوای سرەوتن، کاتێ تێکەوتن
ئەو لەش و لارە، بەشڵپەی مەلە
دڵی دڵداریان، ئەخستە پەلە
ئای بۆ (پەری خان) نازداری جافان[6]
ئاهو زەڕباهووی سوورمە کلآفان[7]
ماڵە بەگزادە و زیڕەی سەماوەر
ڕووی ڕووبارەکەی تۆی ئەگرتەبەر[8]
دەنگی نەکیسا و بەزمی خوسرەویی
لای مەحموود پاشا ئەکەوتە نەوی
ئاوازەی باز و سەقر و باڵەبان
حیلەی ماین و ئەسپی کەحێلان[9]
ئەمانە گشتی، خوا دابووی بەجاف
حوکمدارێ بوون، بێ لاف و گەزاف
لەم دواییەدا، خۆ (ناهیدەخان)[10]
شا خانمێ بوو بەلاو دیوەخان
شوێنی دوو پاشای[11] پڕ کردبووەوە
گرەوی لەڕووی[12] چەرخ بردبووەوە

تووخوا ئاوەکەی بۆن گولاوەکە
بۆ سەرچاوەکە. کەمێ لاوەکە
بڕوانم ئاخۆ جامی فۆتۆگراف؟!
نیشانم نادا؟ شێوەی ئێلی جاف؟
نەء، ئەو دەبدەبە و سەر ئەو سەرئاوە
ئێستە ئەفسانە و نەخشی سەرئاوە
ئەو دڕک و داڵە و ئەو قەل و داڵە
جێگیرن لە شوێن ئەو گەورە ماڵە[١٣]
نازداران وێنەی ماسی سەرئاوان
بەبۆمبای دەوران کەوتنە سەرئاوان[١٤]
لە تاوەی جەوری چەرخی چەپگەڕدا
ئەوان ئەسووتێن منیش لە هەردا
وێڵ و ئاوارەی ئێلی مرادیم
هەر ڕوو لە ڕۆڕۆی ڕووی نامرادیم[١٥]
بۆ بازی موراد هەر (قەیسەر قوو)مە[١٦]
بەختم شوومە و باز کەوتە وەیشوومە
من بۆ ئێل ئەگریم مات و دڵ خەستە
ڕستی خێوەتی بەگزادە ڕێستە[١٧]
لە شوێن سەرمەلا و (الله اکبر)
(کاریّ)[١٨] کار ئەکاو (ستریّت بەجۆکەر)[١٩]
ئێستاکە ڕێی کۆچ گوشادە و ئاسان
کوا سەرئێل کۆچی لێ خوڕێ بۆ کوێستان

..............................

(١)ئەم شیعرە لە لاپەڕە١٢٤، ١٢٥، ١٢٦ی دیوانی م. ھ دا بەجۆرێک شێواوە کە هەتا ئەم دەقەی ئێمە، کە پیرەمێرد خۆی لە (ژین)دا بڵاو کردۆتەوە نەبینی نازانی ڕادەی هەڵە و دەستکارییەکەی چەندە. لەم شیعرە و لە شیعری (یادی نازدارانی جاف)دا، تەنها هەڵەی زەق و دێڕی نەنووسراو نیشان دەدەین. چونکە ئەگەر هەموو هەڵە ورد و درەشتەکان لە پەراوێزدا ڕاست بکەینەوە ئەوا پەراوێز دەبێتە دوو ئەوەندەی شیعرەکە.

(٢) بۆ خۆش وتن و خوێندنەوە ناوترێ، دووئاوان، دەگوترێ، دواوان.

(٣) ڕاستیەکەی (بۆچی نانوێنی)ە، نەک بۆچ پێم نانوێنی.

(٤) کەتان: جۆرە گوڵێکی زۆر جوانە کە لەبەهارانا لەدەشت ئەڕوێ. ئەڵێن کە تیشکی مانگەشەو ئەدا لەو گوڵە ئیتر گەڵاکانی هەڵئەکەوێ. پیرەمێرد دڵی خۆی شوبهاندووە بەو گوڵە کە بەدیمەنی مانگ ڕوخان لەت و پەت



ئەبێ م. ھ

(٥) م. ھ نووسیویە وەک مانگ بەشەدەی تاریکی دەیجوور، کە نازانم ئەوە مانای چییە. ڕاستییەکەی وەهایە، وێنەی مانگەشەو، بەشەوی دەیجوور.

(٦) پەری خان: کچی مەحمود پاشای جاف بووە.

(٧) ئەم نیوە دێرە لای م. ھ بەم جۆرەیە: ئاهوی زەڕباهوی عەنبەر کلافان.

(٨) ڕووی ئەو ڕووبارەی وا ئەگرتەبەر. لای م. ھ بەو جۆرە نووسراوە. بەڵام ئەوەی ئێمە ڕاستە چونکە پیرەمێرد قسە لەگەڵ ڕووبارەکەدا ئەکا و ئەڵێ (تۆ).

(٩) لای م. ھ نووسراوە:

ئاوازی سەقر و باز و باڵەبان
حیلەی مایینی جنسی کەحێلان

(١٠) ناهیدە خان ژنی عەلی بەگی مەحموود پاشای جاف و دایکی حەسەن بەگی جافە.

(١١) دوو پاشا واتە محمود پاشا و وەسمان پاشای جاف.

(١٢) م. ھ نووسیویە: گرەوی لە ڕۆحی چەرخ بردبووەوە. ئەم نیوە بەیتە بەم جۆرە نە مانا دەدات بەدەستەوە و نە کێشەکەشی لەگەڵ کێشی شیعرەکەدا ڕێک دەکەوێت.

(١٣-١٤) ئەو دوو بەیتە لای م. ھ بەم شێوەیە نووسراوە،

«ئەم دڕک و داڵە و ئەم قەل و داڵە
ماونەوە لە شوێن ئەو گەورە ماڵە
نازداران بوونە ماسی دواوان
بەبۆمبای ڕاوکەر کەوتنە سەر ئاوان»

(١٥) لای م. ھ بەهەڵە نووسراوە نزیک لە مەرگم دووریش لە شادیم.

(١٦) قەیسەر قوو: بانگێکە بۆ بانگ کردنی باز لە ڕاودا.

(١٧) ئەو پارەیەیە کە لە کاتی یاری قوماردا قومارچی لەبەردەم خۆی دادەنێ.

(١٨-١٩) دوو واتان لە پۆکەردا بەکاردێن.

***

## یادی نازدارانی جاف

پۆڕە جوانەکەی دەوری زەردیان
های بۆ کناچەت دەمی بەیانیان
کاتێ سفیدەی سەحەر دەرکەوێ
پێشخانەی شەفەق لە کێو سەرکەوێ
دەمی بێداری کە دەستی مریەم
قۆناغی عیسا، ئەشوا لەسەر چەم

ئاوی زیندەگی، دێتە زەمزەمە
ئەبێ بەزەمزەم، ئاوی ئەو چەمە
زەڵم و تانجەڕۆ، دەست لە ملان بن
سەرپۆپەی گوڵان، جێی بولبولان بن
دەنگی کناچەت بەرز و سەر ئازاد
دەنگ بداتەوە بێ ترسی صیاد
لە کەناری زەڵم، ئەو سەوزە گیایە
تۆوی کەنیشکی جافی تێدایە
تۆ بەکناچە و لەنجەو لارەوە
من بەدوو دیدەی[1] فرمێسک بارەوە
بەرامبەر بەیەک زارزار بناڵێن
هەردووکمان وەک یەک بۆ خێڵ[2] عەوداڵێن
شێوەی ئەو سنگەی جەودانەی سەد تەرز
لە سینەی مندا، شیوەن بکا بەرز
گوێم لە دەنگت بێ، بەیادی جاران
کوا ماڵە گەورە و پۆلی نازداران
منیش بەفەردی (مەولەوی)یەوە
بەهۆرەی جافی، ناو دەربەندییەوە[3]
بەشینی تیپی نازدارانی جاف
دووکەڵی ئاهم، شین[4] کا سەمای ساف
وەک چیهرەی خەیاڵ ڕوخسارەکەی خۆی
لە پەردەی دڵەی پڕ ئاخ و پڕ ئۆی
شوعلەی ڕووی نواند شای سۆسەنا خاڵان[5]
کەم کەم لە گۆشەی بورجی ڕەشماڵان
لە توێی تاریکی (شەدە)ی بێ گەردا
لە تافەت ئاوی، زیندەگی دەردا[6]
ئێستا لەو شوێنەی[7] ئەو عیشوە و نازە
بایەقوش لەگەڵ تۆدا هامڕازە
ئێڵی جاف ڕێگەی کوێستانیان نییە
نازانم مەیلی فەلەک[8] بەچییە؟!



ئومێدم وایە هەر بەم زوانە
ئێلات بچنەوە بۆ ئەو کوێستانە[9]
وەلی دێوانە ویستی لە یەزدان
ڕێگەی شەم نەبێ بچێ بۆ کوێستان[10]

........................................

(١) لای م. ھ نووسراوە «من بەچاوێکی فرمێسک بارەوە».
(٢) هەروەها نووسیویە: بۆ یار عەوداڵێن وابزانم ئەوەی ئێمە ڕاستتر بێت.
(٣)هەروەها نووسیویە: بەهۆرەی گوڵبانگ پەهلەویەوە. هۆرەی گوڵبانگ یەعنی هۆرەی بەرز. هەروەها گوڵبانگ بەخوێندنی بولبولیش ئەڵێن کە گوایا بانگ ئەکاتە گوڵ.
(٤) لای م. ھ نووسراوە پڕ کا سەمای ساف
(٥) هەروەها نووسراوە:

پرشەی ڕووی دەرکەوت شای سۆسەن خاڵان
کەم کەم لە گۆشەی، لای سیا ماڵان

(٦) لای. م. ھ نووسراوە:

لە توێی تاریکی شەدەی بێ گەردا
وەک ئاوی حەیات، شەپۆلی ئەدا

پیرەمێرد ئەم شیعرەی مەولەوی گۆڕیوەتە سەر شێوەی سلێمانی و لەو شیعرەی خۆیدا تەنها سێ دێڕی لە حەوت دێڕی دەقی شیعرەکەی مەولەوی بەکارهێناوە. لە کەشکۆڵی نەجمەددین مەلا کە بۆ حەمە ساڵح بەگی قزلجی نووسیوە لەلاپەڕە٦١دا گۆڕینەکەی پیرەمێردی نووسیوە، هەروەها دەقی شیعرەکەی مەولەوی لەلاپەڕە ٢٠٢، ٢٠٣ی دیوانی مەولەوی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس دا بڵاو کراوەتەوە. لێرەدا دەقی شیعرە هەورامییەکە و گۆڕینەکەی پیرەمێرد دەنووسین.

«چون چیهرەی خەیاڵ ڕوخسارەکەی وێش
نەتۆی پەردەی دڵ مەعدوومی دڵ ڕێش
نمانا جەمین شای سۆسەن خاڵان
کەم کەم جەگۆشەی لای سیاماڵان
زەمین منەت بار پامنیاو مەویەرد
جارجار وەڕووی ناز باوەشێن مەکەرد
باوەشێن مەکەرد ئەو صەفحەی بێ گەرد
نازکیش جەباد ئیحتیاط مەکەرد
نەتۆی تاریکی تای شەدەی بێ گەرد
لەطافەت چون ئاو حەیات مەوج مەوەرد
غەریب بیم چەنیم کەرەم نمانا
وەسەوقات پەرێم خەدەنگێ شانا

ئەرصەد چون یاران گیان تەسلیم کەردم
خاس بی پەی یادگار خەدەنگێ بەردم»

گۆرینەکەی پیرەمێرد

«وەک چیهرەی خەیاڵ ڕوخسارەکەی خۆی
لە پەردەی دڵەی پڕ لە ئاخ و ئۆی
پرشەی رووی دەرکەوت شای سۆسەن خاڵان
کەم کەم لە کووچەی لای سیاماڵان
زەمین منەت بار کە پێی پیا دەنا
باوەشێنەکەی بۆ دادەهێنا
شیرینی لە تویێی تاری شەدەدا
وەک ئاوی حەیات شەپۆلی ئەدا
سەر کولمی ئاڵی لە تویێی سەرپۆشا
بەشنۆی پارێزی خەیاڵ نەڕوشا
چونکی غەریب بووم لاواندمیەوە
تیرێکی لێ دام تواندمیەوە
هەرچەند بەو تیرە گیانم تەسلیم کرد
بەیادی دیاری ئەو تیرەم هەڵگرت

(٧)لای م. ه نووسراوە «ئێستا لە شوێنی ئەو عیشوە و نازە»

(٨) هەروەها نووسیویە «نازانم فەلەک مەیلی بەچییە ؟!

(٩)مامۆستا م. ه لە پەراوێزی ئەم دێڕەدا نووسیویە: جاران ئێلاتی کۆچەری بەئارەزووی خۆی گەرمیان و کوێستانی ئەکرد و هیچ سنوورێکیان بۆ نەبوو. لە زستاناندا ئەچوونە ئەم دەشتی گەرمیانە هەتاکو سەرما و تۆفی زستان بەسەر ئەچوو. ئەوسا لە بەهار بەدواوە ڕوەو کوێستانەکان سەرئەکەوتن و ئەو مەڕ و ئاژاڵانەی کە هەیانبوو لە مێرگ و مێرغوزاری کوێستانەکاندا ئەیان لەوەڕاند. بەڵام لەم دواییەدا کە سنووری ئێران و عێراق تێکچووە ئیتر لە ئێران پووشانەیان لەو ئێلاتە سەندووە و تەنگیان پێ هەڵچنیون و ڕێگەی کوێستانیان لێ گرتوون.

(١٠) ئەو نیوە دێڕە لای م. ه وەها نووسراوە: «کە ڕێی شەم نەبێ بچێت بۆ کوێستان».

***

## تاکە بەیت

١٩٤٩

چەندێک، چەند خۆش بوو، کە دڵمان خۆش بوو
غەمی جیهانمان، لا، فەرامۆش بوو



ئەوسایە دوعای ئەو گیرا بوو بوو
ئێستا بازاڕی وەلی بەسەرچوو
جێنشینی ئەو، منم ئەمەوێ
ئێل بۆ هەوارگەی کوێستان سەرکەوێ
بەڵام کوا شکۆی سای ماڵە گەورە[1]
کوا ئەو زەمزەمە و شادی ئەو دەورە
ئێستا قەل و داڵ لەسەر دڕک و داڵ
لەو شوێن هەوارە ئەپرسن ئەحواڵ
منیش بەوێنەی ئەوان داخ لە دڵ
یادی نازداران ئەبەمە ژێر گڵ
ئەگریم و ئەڵێم، بەدیدەی نمناک
دادی نیشتمان ئەبەمە ژێر خاک

........................................

(١) لەلاپەڕە (١٣٠)ی دیوانی پیرەمێردی م. ه دا شیعرەکە لەنیوە دێڕی (ئێل بۆ هەوارگەی کوێستان سەرکەوێ) دا تەواو دەبێت، بەڵام ئەو شیعرە هەشت نیوەدێڕ، واتە چوار بەیتی مابوو. لای خوێنەریش وەهایە کە تەواو بووە. ئێمە تەواوی شیعرەکەمان لەم دیوانەی خۆماندا نووسییەوە.

***

## تاڤگەی زەڵم[1]

ئاوە جوانەکەی سەرچاوەکەی زەڵم
بۆ چ بەهار لێڵی و پایزان بەتەم؟!
ئەڵێی سەرچاوەی بەختی کوردانی
لەسەردا سارد و سەر لە ئاسمانی
زۆری پێ ناچێ، ئەکەویە زەوی
وەک فرمێسکی چاو بڵاو و نەوی
وێڵ و عەودالی ڕێی چغورد و هەرد
بە قەڵبەزەوە سەر ئەدەی لەبەرد[2]
یەکدگیر ئەبی لەگەڵ تانجەڕۆ
بەعەشقی سیروان وێڵ و ڕەنجەڕۆ
لە دوادانادا کە یەک ئەکەوی
وەک دوو مەصرەعی فەردی مەولەوی:

«سیروانی ئەو چەم، تانجەڕۆی ئەم چەم[3]
بدەن وەهەمدا، ئەم چەم تا ئەو چەم
سەربنێرەوە بەرێگە و خاکا
بگری لە ڕەوزەی سەلمانی پاکا[4]
بڵێ بەقوربان، تۆ ناوت پاکە
بمانخەرە ڕێی یەکێتی و چاکە
تۆ خۆت ئەیزانی ئەو خاکە دێمە
چەند پاراو ئەبێ بەئاوی ئێمە
کەوابێ گوڵ و نێرگس پێکەوە
با شاد بن بەدڵی ڕێکوپێکەوە

..........................................................................

(١) پیرەمێرد چەند شیعرێکی بۆ «دووئاوان و تاڤگەی زەڵم» وتووە. ئێمە لەم دیوانەدا هەموویان بڵاو دەکەینەوە. ئەو شیعرانە ئەگەرچی بەگشتی ناوەڕۆکی نیشتمانی هەیە و، تاڤگەی زەڵم هەمیشە لای پیرەمێرد ڕەمزێکی نەتەوەیی بووە، بەڵام لە شێوەی شیعرەکان و داڕشتن و تەنانەت گەلێ بەیتیشی تێدا هەیە کە دەقا و دەق بابەتی (مەولەوی)یە و کاریگەری ئەو شیعرەیان لەسەرە کە مەولەوی بۆ (تاڤگەی زەڵم)ی وتووە. بڕوانە (دیوانی ڕۆحی مەولەوی)، پیرەمێرد ١٩٣٥ لاپەڕە ٢٧١ بەشی دووەم.

(٢) پیرەمێرد ئەو بەیتەی لەو شیعرەی مەولەوییەوە وەرگرتووە کە دەڵێت:

سەیرکە تووڕی دا پەردەی نام و نەنگ
بێ پەروا سەری خۆی ئەدا لە سەنگ

ڕۆحی مەولەوی لاپەڕە ٢٧٣

چغوورد: بێشەڵان

(٣) پیرەمێرد خۆی لە شیعرەکەیدا ناوی (مەولەوی) دێنێت و ئەم بەیتەی دەنووسێتەوە. کە ئەمە دەقی هەورامییەکەیەتی. بەڵام ناوی (سیروان) و (تانجەڕۆ)ی پاش و پێش خستووە. لە دەقی هەورامییەکەدا تانجەڕۆ لە پێش سیروان دایە.

تانجەڕۆی ئەی چەم، سیروان ئەو چەم
جۆشاوێ وەهەم، ئەی چەم تا ئەو چەم

دیوانی مەولەوی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لاپەڕە ١٣١

(٤) لای م. ه نووسراوە «بگری لەبارگەی سەلمان پاکا» لە نوسخەی لای مندا نووسراوە «بگری لە ڕەوزەی سەلمانی پاکا».

***





## بۆ کۆچی شێخ نووری شیروانی

«ئەهلی عیرفان، وان لەشین و ماتەما
نووری شیروانمان لەسەر لاچوو، نەما

٢٦٦ ٦٥٨ ٣٠٠ ٤٦ ٩٦ = ١٣٦٦ – ١٩٤٧

***

## تاڤگەی زەڵم

تاڤگەی زاڵم زەڵم، تاڤگەی زاڵم زەڵم
گریەی چاوی چەرخ، پڕ لە ناڵە و تەم
زادەی جەرگی کێو، مەوجودی عەدەم
دێوانە ئاسا، شەیدای ڕوو لە چەم
سەر لەبەرد ئەدەی، تۆش بەسەودای شەم[1]
سرەوتت نییە، لە ناڵە یەکدەم!
لەو کێوە بەرزە، ئەکەویە خوارێ
ڕیزە مرواریت لەدەم ئەبارێ
دیارە عاشقی وا ناڵە کاری
سەحرا نەوەردی، پەی جۆیی یاری
پەروانە بەسۆز، خۆی ئەسووتێنێ
ئاوی ساردی تۆ جیهان ئەژێنێ
ئەم سەر لەبەرد و ئەم هەڵپژانەت
(یاهو یا من هو)ی قودسیی تەرانەت[2]
بۆ زیندەگانی، شارەزوورمانە
ئاخ مسیللەتەکەت قەدر نەزانە
باخ و بێستانت لەبەرا ناکەن
تا بەو سایەوە وڵات ئاواکەن
ئەگەر گشت کێڵگەی داچێنرێ (دەڵێن)[3]
فیرعەونی[4] خاکی میصری پێ ئەڵێن
ئەگەر شارەزوور بێت و ئاوا بێ
ڕۆژی شەطی[5] میصر ئەبێ ئاوابێ

خورنەوەرزانی شای خان ئەحمەد خان[٦]
بووبووە نموونەی ئیرەمی جیهان
ئێستە ئەو شوێنە کەوا وێرانە
بۆ چاوی هیوام بووە بەتانە

..........

(١) شەم: شەمسە، خۆشەویستی وەلی دێوانە.
(٢) واتە (یاهو یا من هو)ی پیرۆز دەبێتە گۆرانی هەمیشەییت. تەرانە: فارسییە واتە: گۆرانی.
(٣) دەڵێن: جۆگە ئاوێکی بەناوبانگە لە شارەزوورا کە برنج و کشتوکاڵێکی زۆری لەبەرا ئەکرێ. م. ه
(٤) پیرەمێرد نیازی ئەوەیە کە ئاوی دەڵێن بەقەد فیرعەون دەسەڵاتی ئەبوو م. ه.
(٥) مەبەست ڕووباری (نیل)ە.
(٦) خان ئەحمەد خان حوکمدارێکی بەناوبانگ بووە لە شارەزوورا تەئریخی ڕاشد لە بارەی (خان ئەحمەد خان)ەوە بەم جۆرەی خوارەوەی باس کردووە: وەختێک کە سوڵتان موڕادی چوارەم چۆتە سەر بەغداد لە پێشدا لەشکرەکەی لە شارەزووردا هەڵئەدا. حوکمداری ئەو سەردەمەی شارەزوور کە خان ئەحمەد خان بووە پەلاماری ئەو لەشکرەی سوڵتان مورادی داوە و ڕای فڕاندووە و تاڵانی کردووە. خان ئەحمەد خان لە ئەنجامی ئەوەدا بارگەکەی (سەدری ئەعزەم)ی دەست ئەکەوێ.

خان اکراد یعنی خان احمد
سال (بخت)(*) آمد از عدم بیرون
سال (کچ بخت)(**) یافت حکم و جلوس
در (غلط)(***) گشت واله و مجنون
باز صبح بیافت اندر (غم)
یافت حکمی زبیشتد افزون
سال (غمها)(****) هزیمتش دادند
رفت بیرون ازین زمانەی دوون

(*) بخت: بەحسابی ئەبجەد ئەکاتە(١٠٠٢)ی هیجری کە ئەمە مێژووی هاتنە دنیای (خان ئەحمەد خان)ە.
(**) کچ بخت: بەحسابی ئەبجەد ئەکاتە (١٠٢٥)ی هیجری کە ساڵی چوونە سەرتەختی خان ئەحمەد خانە.
(***) غلط: ئەکاتە ١٠٣٩ی هیجری کە ساڵی لەسەر تەخت لابردنی (خان)ە
(****) غمها: ئەکاتە ١٠٤٦ کە ساڵی مردنی (خان)ە.

هەروەها دەربارەی خان ئەحمەدخان (زەنوری) کە شاعیرێکی کوردە بەشێوەی هەورامی باسی بەسەرهات و حوکمداری خان ئەحمەد خانی کردوە. پیرەمێرد ئەو هەڵبەستەی گۆڕیوەتە سەر شێوەی سلێمانی و لە کاتی خۆیدا لە ڕۆژنامەکەیدا بڵاوکردۆتەوە م. ه.

ئێمە لەم دیوانەدا لەبەشی ئەو شیعرانەدا کە پیرەمێرد گۆڕیویە ئەم شیعرەی (جەمالەددینی زەنووری) بڵاو دەکەینەوە.

***



## بۆ شایی بابا عەلی

١٩٥٠

«بابا عەلی، لەناومانا کە هەڵکەوت
بەم شاییە، ڕەوشتی شایی سەرکەوت
لە نەشاتی، شوباتا، تەئریخ دەرکەوت
سیادەت و ڕەشادەتمان وا یەک کەوت»

***

## کوردیی ڕەوان[١]

شوباتی ١٩٣٢

بەیانی بوو، لەخەو هەستام، کە ڕوانیم، بەفرە باریوە سلێمانی ئەڵێی بەڵقیسە، تارای زیوی پۆشیوە دەمێ بوو، چاوەڕێی بەفرێکی وا بووم، مژدە بێ باری سەرم بەفرە، کەچی هێشتا، شەڕە تۆپەڵمە بۆ یاری لەبیرمە[٢]، شێرە بەفرینەم ئەکرد، سواری ئەبووم بێ زین نسێ بوو جێگەکەی، ئەیبەست، ئەما تاکو دەمی هاوین بە بەرگی سپییەوە، چەن شۆخە، شاخی گۆیژە، بیبینە لە ڕەنگی ئاسمان دولبەرترە، ئەو سپییە، ئەم شینە ئەڵێن بەرگی فریشتەی ئاسمانیش سپییە، وەک بەفرە فریشتەی ئێمە بالایە، بەڵام ئاخ بۆچ ئەخۆین تەفرە؟! هەموو پێچەکلوی بەفرێک، فریشتەی خوای لەگەڵدایە فریشتە کەوتە ناومان، بۆیە وا ئاشووب و هەڵایە ئەوا سامالی کرد، ڕۆژ کەوتە سەر شاخی گڵەزەردە بەسەر ئەو بەفرەدا، تیشکی هەتاو، ئەڵماسی خواکردە بەسەر گۆنای سپیدا، خشڵی زێڕینە، بریسکەی دێ پەری سەرکێوی قافیش، هێندە پرچی زەردی خۆی لێ دێ لەسەر سەربان، بەفر تویژاڵی بەست وێنەی چۆڕی شیرە قەتارەی سەر لق و پۆپی درەختیش سپییە، دڵگیرە چلوورەی گوێسەوانە، پلپلەی زیوی کچە کوردە سەهۆڵ ئاوێنەیە، ئەم پلپلە و ئاوێنەیە وردە

که پیریژن سەر و پۆیلەی بەشینی چلە تێک ئاڵا
بەهار یەت، داری پیر ئەژیەتەوە، دێتە قەد و باڵا

................................

(١) مامۆستا م. ه لە پێشەکی ئەم شیعرەدا بەهەڵە نووسیویە: پیرەمێرد ئەم هەڵبەستەی لە ڕۆژێکی مانگی نیساندا وتووە لە ساڵی ١٩٣٢دا. (لاپەڕە ١٣٥). لێرەدا ئەو هەڵەیە ڕاست دەکەینەوەو دەڵێین. ئەم شیعرە یەکەم جار پیرەمێرد خۆی لە ڕۆژنامەکەیدا ڕۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە ٣١٢ی ٢٥ی شوباتی (١٩٣٢)دا بڵاوی کردۆتەوە. ئیتر نازانم چۆن لای مامۆستا م. ه ئەم شیعرە لە مانگی شوباتی چلەی زستانی وڵاتی سلێمانیدا چۆتە مانگی نیسانەوە. جگە لە بەڵگەی ڕۆژنامەکە لەبەهاردا ڕووی نەداوە لە سلێمانیدا بەفر وەها بارببێ کە شێرە بەفرینەی لێ دروست بکرێ. هەروەها بۆ یەکەم جار حاجی تۆفیق بەگ نازناوی پیرەمێرد بۆ خۆی لەم شیعرەدا دادەنێت. و پێشتر نازناوی پیرەمێرد هیچ دەنگێکی نەبووە. هەروەها پیرەمێرد لەو ژمارەیەی یەکەم جار ئەم شیعرەی تیادا بڵاو کردۆتەوە، سەبارەت بەمەسەلەی (کوردی پەتی) نووسین، نووسیویە «بەڵێن ئەدەم هەچ کەسێ بەم شێوە ڕەوانە زبان زادەکانمان بهۆنێتەوە، نیوەی مانگانەکەم وەرگرێ. بەڵام هەڕەمە و تەک و بۆنەبێ، بەخۆ هەڵکێشانی ناڵێم، چەشەیە؟!». ژیان ژمارە ٣١٢ ساڵی ١٩٢٣ .

(٢) لەهەندێ نوسخەدا نووسراوە (مناڵ بووم) لەبری (لەبیرمە).

***

## ئای نائومێدی[1]

نیسانی ١٩٤٧

ئای نائومێدی، ئای نائومێدی
ئای ڕەنجەڕۆیی و دڵ نائومێدی
بەدبەختی وەک من، توخوا سا کێ دی؟[2]
دەردی مەجنونم، لێ هاتۆتە دی
هەر لە (نەجەد)ەوە، تا هەردەی دوجەیل
بۆ لەیل ئەگەڕام، دەروون لە غەم کەیل
هاتمە بێستوون، لای قەسری شیرین
بۆ فەرهاد گریام، بەدیدەی نمین[3]
چوومە زمناکۆ، ڕاگوزاری ئێل[4]
هیچ کەسم نەدی، نەشیرین، نەلەیل
لەدەربەندیخان، هەتا کەلیخان[5]
ئەو ناوە یەکسەر شێواو و وێران
شیو و هەرد و بەرد، تا لوتکەی بەرزان



پڕ لەوەیشوومە، بەگەڵاڕێزان
نەکەرۆز گەڕام، وادی بەوادی
شوێنی هەوارگەی ئێلی مورادی[6]
بەجەوری فەلەک، یەکسەر وێرانە
بایەقوش تیایا، کردوویە لانە[7]
پرسیم بایەقوش، دۆستی هاودەردم
لە جیهان بێزار، یاری چۆڵگەردم
بۆچی وا چۆڵە، ئەم مەرز و بوومە
لە کوێ پەیدابوو، وەیشوومەی شوومە
جوابی دامەوە بەقوڵپەی گریان[8]
منیش وا جەرگم، بووە بەبریان
ئەمساڵ بەهارمان کە بێ باران بوو[9]
گوڵاڵەی سوورمان جەرگی یاران بوو
لەهەردوولاوە شایە بەڕیزە[10]
خەنەبەندانیان خوێنی ئازیزە

................................

(١) دەربارەی دەقی ئەم شیعرە و ساخکردنەوەی بڕوانە کۆتایی شیعرەکە.

(٢) لای م. ه نووسراوە «ساتوخوا کێ دی»

(٣) م. ه بەهەڵە نووسیویە «بەدڵەی نمین». لێرەدا من سەرم سوڕماوە کە بۆچی مامۆستا م. ه ئەوەندە ئارەزووی بووە دەستکاری شیعرەکانی پیرەمێرد بکات. لەکاتێکدا، بۆ نموونە، ئەم شیعرە لە ژمارە (٨٦٨)ی ژینی ١٩٤٧ بڵاو بۆتەوە و م. ه هەر لەو سەرچاوەیەوە وەری گرتووە کە من دەقەکەیم نووسیوە.

(٤) بەهەڵە نووسیویە «ڕاگوزەرگای لەیل»

(٥) لای م. ه نووسراوە «لە دەربەندیخان هاتە کەلیخان»

(٦) خێڵێکی کۆچەری جافە

(٧) لانە: هێلانە

(٨) لای م. ه نووسراوە «بەقوڵپی گریان»

(٩) هەروەها: ئەمساڵ بەهارمان کە بێ بارانە
گوڵاڵەی سوورمان جەرگی یارانە

(١٠) هەروەها:

لەهەر سێ لاوە شایە بەڕیزە
خەنە بەندانمان خوێنی ئازیزە

پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە کارەساتی ڕووخانی کۆماری مەهاباد دا نووسیوە.

تێبینی: بیروهەستی ڕەنجەڕۆیی وەلی دێوانە کاری کردۆتە زۆر شاعیر، یەکێک لەوانە پیرەمێرد بووە، کە لەسەر شێوەی شیعرەکەی (وەلی) ڕەنجەڕۆیی نەتەوەکەی خۆی پیشان دەدات: بنەمای مەسەلەی پیرەمێرد و ئەم شیعرە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٣٩. لەو ساڵەدا و لە ژمارە ٥٧١ی ڕۆژنامەکەیدا دەقی هەورامی شیعرەکەی وەلی دەگۆڕێتە سەر شێوەی سلێمانی. ئێمە لێرەدا شیعرەکەی وەلی و گۆڕینەکەی پیرەمێرد دەخەینە پێش چاو، هەتا سێ دەقی شیعری «ئای نائومێدی» ببینین. یەکەمیان شیعرەکەی وەلی، دووەم گۆڕینەکەی پیرەمێرد، سێیەمیش ئەو شیعرە بوو کە پێشتر نووسیمان و پیرەمێرد لەسەر شێوەی وەلی و بۆ مەبەستێکی دوور لەو، نووسیویە.

**هەی نائومێدی،...**

هەی ڕەنجەڕۆیی، هەی نائومێدی
هەی یاران چون من، بەدبەختێ کێ دی
پەی هاڵ نەزانێ ڕووم کەرد نەبیدی
چۆڵان تەی کەردم، جەبەلان یەکسەر
جە «طەبەس» تون بیم، یاوام وە «طەبەر»(*)
هەردەی نەجد قەیس، گشت دام وەپاوە
پەروانە دەستوور، سەر وەسەوداوە
یاوام بەو زامەن، ماوای قیبلەم بی
مەکان و مەسکەن، گوزەرگای (شەم) بی(**)
هەواران چۆڵ دیم، زامەن وێرانە
بایەقوش بەستەن، جەو مەسکەن لانە
نەدەنگ دیارەن، نە سەدای یارەن
دەنگ وێرانەی (وادی القهار)ەن(***)
پەرسام، بایەقوش هام دەرد دەردم
ڕەفیق و هامڕاز، ناڵەی نەبەردم
مەن پەروانەی وێڵ وەڵگەی دامانم
جانشین قەیس، شای کەم فامانم
کۆشی کۆچ خێڵ، شای (شەم) جەمینم
گوشادی خاتر خار خەمینم
بایەقوش واتش، پەروانەی کەم فام
ئیسە ئامانی وەی ماوا و مەقام
کۆچ خێرش کەرد، لوا وە لەیلاخ
پەی مەن حەسرەت مەند، پەی تۆ ئاخ و داخ
وە ئیقبال نەحس وێم دامامەوە
نائومێد جەشەم هەم ئامامەوە



یاران هامسەران، نائومێدی وێم
هەی عەبداڵ، بەرگێڵ، دوور جە زێد وێم

..........................................................

(*) چۆڵی دەشت و شاخم دایە بەر و لە تونا و تونی «طەبەس» گەیشتمە «طەبەر». طەبەر: شارێکە لە ناوچەی خۆراسان. طەبەر ناوچەی گێلان و مازندەرانە لە ئێران. طەبەر یا طەبەرستان ناوی وڵاتی مازندەرانە.
(**) گەیشتمە هەوارگە و نشینگە و گوزەرگای شەم.
(***) نەدەنگی یار و نەدەنگی کەس، هەموو لایەک وەک وێرانە کپ و خامۆش بوو.

تێبینی: دەقی ئەم شیعرەی وەلی لە دیوانی (وەلی دێوانە)ی عوسمان هەورامی وەرگیراوە ل٧٧،٧٨،٧٩. هەروەها پەراوێزی شیعرەکەش.

دەقی گۆڕینەکەی پیرەمێرد ساڵی ١٩٣٩

هەی نائومێدی، هەی نائومێدی
هەی ڕەنجەڕۆیی، هەی نائومێدی
بەدبەختی وەک من، لە کوێ پەیدابوو
بۆ حاڵ نەزانێ شێت و شەیدا بوو
سەحرا و دەشت و دەر گەڕام سەراسەر
لە توونا و توونی طوسیش چوومە سەر
هەردەی دوجەیلی مەجنون گشت گەڕام
وێنەی پەروانەی، ڕەهەندی سەودام
«لێرەدا بەیتێکی نەگۆڕیوە»: ....................................
هەوار گشت خاڵی، چۆڵ و وێرانە
بایەقوشم دی، لەسەر هێلانە
نەدەنگێ دیار، نەسەدای یار بوو
(لیس في الديار) غەیرە دیار بوو
وتم بایەقوش، هاودەردی دەردم
ڕەفیق و هاوڕاز، ناڵەی نەوەردم
مەن پەروانەی وێڵ، شەمی شەوانم
جێنشینی قەیس، شای کەم فامانم
کەی کۆچی کردوە شای شەم جەبینم
شەوقی زیندەگی رووی سەر زەمینم
بایەقوش وتی: شێتی نەگبەتم
بۆ درەنگ هاتی فریا نەکەوتم
لەیلا کۆچی کرد، رووی کردە لەیلاخ
بۆتۆ حەسرەت و بۆ من ئاخ و داخ
بەچارەی نەحسی خۆم گەڕامەوە(****)
خۆم دا بەئەرزا بۆی تلامەوە

دەخیل هام سەران، چیم لێ قەوماوە
بەدبەختی دنیا هەر بۆ من ماوە

..........................................................

(****) پیرەمێرد لەو دوو بەیتەدا لە دەقە هەورامییەکەی (وەلی) دوورکەوتۆتەوە ئەگەر بەم جۆرە بیگۆڕیایە ڕەنگە باشتر بوایە:

بۆ چارەی نەحسی خۆم دامامەوە
نائومێد لەشەم هەم گەڕامەوە
یاران هامسەران، هەی نائومێد خۆم
هەی عەبداڵ و وێڵ دووری هەوار خۆم

***

## ئای چیم بەسەرهات(1)

ئابی ١٩٤٧

ئای چیم بەسەرهات
خۆیشم نایزانم بۆ چ وام بەسەرهات
لە دووڕیانی ڕێی هات و نەهات
ڕێ پیشاندەرم، لە تەکما نەهات
کەوتمە سەر ڕێگای، تەلەسمی ئەرژەنگ
گیرۆدەی سیحرم، بێ سەداو بێ دەنگ
ئەبینم کایان داناوە بۆ شێر
گۆشتیش بۆ گوێدرێژ هیچیان نابن تێر
منیش لە داخی ناسازی زەمان
لەجێدا کەوتووم، بێ دەست بێ زبان
ڕەنگ زەرد و لاواز، بێ یار، بێ خەمخوار
عەیشم، لا تاڵە، وێنەی ژاری مار
بەجەستەی خەستەی پڕ دەرد و کەدەر
کۆنەی چەندساڵەم، لێ کردۆتە بەر
چاوم نابینێ، مات و غەمگینم
ئەو چاتر، چارەی جاسووس نابینم
کاشکا گوێچکەیشم، وا نەی بیستایە
هەردەنگێ ئەبیەم، هەر ناڵەی تیایە



لەلایێ ڕۆژوو لەلایێ ڕۆڕۆ
لەلایێ قومار، لایێ تیاترۆ
ئەم قورە ڕەشەی واتێی چەقیوم
هێزی تەکان و جووڵەی بڕیوم
هانام بەتۆیە، خوای پەروەردگار
یا تاقەت یا مەرگ، یا دیداری یار

..........................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاونەکراوەتەوە.

***

## چوارین

١٩٢٧

فرت و فێڵت، کەوتە ڕوو، دەوران، لەلام، ئابڕووت تکا
بۆیە، وا، بەرزت کردمەوە، بمخەیت و ئازارم بکا
تێت گەیشتم، بۆیە هێلانەت لەجێی بەرز دابوومێ
هەتا تەرزە و هەورە تریشقە و بەفر و با، سەختم بکا

***

## ئای لە دەست پیریی(1)

١٩٤٧

ئای لەدەست پیریی، چەند جەفا کێشم
ڕێگای مردنی، هێنایە پێشم
بەکۆچی دوایی، دڵی ترساندم
وەک کونجی سەرساج هەڵی قرچاندم
تافی جوانی لەدەست فڕاندم
تۆماری عەشقی یەکسەر سووتاندم
گێژ و کەساس و بێ قەدری کردم
لەلای نازداران، ئابڕووی بردم

ئای بۆ ئەو کەیف و نەشئەی جوانییە
بڵند دەماخی و کامەرانییە
پۆلی نازداران، شۆخی جەبین جام
بۆ بەزم و سوحبەت ئەهاتنە لام
گا دەسکە گوڵی، بەتەرتیب بەستە
ئەدرایە دەستم، دەستە بەدەستە
گا ، کەمەندی زوڵف، ئەخرایە ملم
گا ، پرچ ئەپێچرا، لەپاو و پلم
ئێستا وا پیریی، کەساسی کردم[٢]
هێجگار مووی سپی، ئابڕووی بردم
پیریی لەپڕ هات بەپیریمەوە[٣]
بەندم بەزویری و ئەسیریمەوە
زەوقێ نابینم لەم بگرەو بەرە
ڕاستە گورگ پیر بوو، بووە مەسخەرە

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی م. ه دا چاپ نەکراوە.

(٣،٢) پیرەمێرد بەجۆرێک چۆتە ڕۆحی مەولەوییەوە کە زۆرجار، ئاگادار و زۆرجار بێ ئاگا ، وێنە و تەعبیری شیعری مەولەوی بەکارهێناوە، بۆ نموونە لەم شیعرەدا ، تارمایی دوو بەیتی مەولەوی دیارە کە باسی پیریی خۆی دەکات:

١- مووی سپی (قەڵغان) ڕووڕەشی پیرە
کەوانی قەدیش، بۆ تکای تیرە
«ڕۆحی مەولەوی ل١٨»
٢- موترب، بم گەرێ، ئامان دڵگیرم
واپیریی لەپڕ، هات بەرەو پیرم
«ڕۆحی مەولەوی ل١٩»

## تافی جوانی[١]

١٩٤٣

جوانی جەلایە بۆ زیندەگانی
های لە جریوەی تافی جەوانی
کاتێ شۆڕەکچ ئەچێتە کانی
گۆزەی مێشەرۆ وا لەسەر شانی



ملوانکە ئەخشێ لەناو مەمکانی
دڵ دێتە لەرزە بەهەڵتەکانی
لە خرنگەی بازن لەگەڵ شڵپی ئاو
کە ئەیپەخشێنێ ئەشوا دەم و چاو
تنۆکی ئاو و گزنگی هەتاو
بۆ پێشانی زیو ئەبێ بەزاخاو
دەوای لوقمانە بۆ جەرگی سووتاو
سەد لەعل و ئەڵماس بێ بەقوربانی
شەوی مانگەشەو چرپەی ناو کۆڵان
لەپەنا دیوار لێو لەسەر لێونان
بەو سەدایەوە لە یەکتر بڕان
بەو خەیاڵەوە خەوی شەو زڕان
بە ئاهو ناڵە تا دەمی بەیان
هیجرانی یار و دەنگی هیجرانی
لەسەر کارێزی شەریف بەهاران
سەیرانی (نەورۆز) تیپی نازداران
هەڵپەڕکێی بلوێر لەناو گوڵزاران
ئاوڕ و عیشوەی چاو بەخوماران
پیر ئەخاتەوە کەڵکەڵەی جاران
ئەیهێنێتە جۆش بۆ نیشتمانی

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە. بەڵام لەلاپەڕە ٢١٠ی ئەو دیوانەدا بەشێوەیەکی زۆر سەیر و ناتەواو چوار بەیت (هەشت نیوەبەیت)ی لێ بڵاوکراوەتەوە. ئەوا لێرەدا دەینووسینەوە هەتا خوێنەر خۆی بەراوردی بکات.

ئای بۆ سەرمەستی تافی جوانی
جوانی شەوقێکە بۆ زیندەگانی
چەند خۆشە نەشئەی عەشقی دێکانی
کە کچە کوردێک ئەچێت بۆ کانی
گۆزەی مێشەرۆ وا لەسەرشانی
ئاو دائەتکێنێ بۆ سەر زوڵفانی
مێخەک بەند ئەخشێ لەناو مەمکانی
هەزار ئەلمۆدە بێ بەقوربانی
***

## ناو قەدی چلەی زستن بچڕا

١٩٤١

ناو قەدی چلەی زستانمان بچڕا
ئەمڕۆ پشکۆکەی هەوامان گڕا
هەوا بەتینی ئەو ئەشقی شکا
پەنجەی لە گۆ چوو و پێکەوە لکا
بەفری سەرچاوەی زەڵم توایەوە
هەتاو کەوتە تین ڕۆژ گەڕایەوە
لەو بەرمانەوە، لە نێرگسەجاڕ
نێرگس بەبۆنی خۆشی کەوتە جاڕ
بەو چاوە جوانەی وەک دیدەمەستان
ئاگری خستە ناو جەرگەی زستان
شێوەی شیرینی نێرگس لەو ڕێیە
ئەفسوونی شێوەی شیرینی پێیە
کە ئەڵێن نێرگس ئەڵێ کێ؟ ئەو کەس
گۆشەی چاکی دڵ بەرنەدا لە دەس
ڕاستەوە بوونە بەو چاو جوانە
بە دوو لا نەشئەی بۆ دڵ و گیانە

***

## لەگیان بێزاریی(١)

١٩٤٩

پیری ئاخ پیریی، داد لەدەست پیریی
لەگیان بێزاری و زویری و دڵگیریی
گریمان وتیان میر و وەزیریی
مایەی حەسرەتە نییە تەدبیریی
هێزی جوانی لەبەدەن بڕیم
کفنی مووی سپی بەبەدەن بڕیم
دڵ بوو بەیاتاغ، ناڵە و ئاهی سەرد
دەروون وەک جانتای کۆکە و پڕمە و دەرد



چاو چوەوانێ، ڕۆینیی، ڕوونی
لەش گرفتاری سستی و زەبوونی
کوا ئەو دەماخەی ئەمڕوانیە جوانان
ئەکەوتە شوێنم بۆ پەنای بانان
لەگەڵ نازداران کە ئەچوومە گەشت
کێو و شیو و دەشت لێم ئەبووە بەهەشت
من ڕائەکشام لە ناو گوڵاندا
کچان لەسەودای دەستەملاندا
شەوی مانگەشەو چرپەی ناو گوڵان
باخ بەرەڵڵا بوو تاڵان هەی تاڵان
خۆ وردەڕازی تەنیایی گوێ ئاو
نەشئەی دڵداری ئەهێنایە ناو
گا دەسکە گوڵم ئەبەست بۆم ئەبرد
ئەو باوەشێنی ڕووی خۆی پێ ئەکرد
تایە لەو دەسکەی ئەدا بەدەستم
ئەیگوت بیخەرە سەر چاوی مەستم
ئنجا ئەتوانی بەبادەی مەستی
ماچ کەی بەبیانووی شێتی و سەربەستی
ئەوسا لە پەردەی گریشمە و نازا
دوگمەی سەر پەردەی بەیان ئەترازا
لەو بەیانەوە سفیدەی بەیان
وەک پێشخانەی نوور ئەکەوتە مەیدان
ئێستا وا پیری کردیە شەوی تار
شەبەیخوونی دا وەک سوپای تاتار
لێلایی هێنا بەدڵ و چاوا
عەکسی خەیاڵیش نەما لەناوا
ئەمەوێ یادیان بێنمەوە خەیاڵ
ئازاری بەدەن عەیشم ئەکا تاڵ
لەجێی قەهقەهە و دەنگی نازداران
چریکەی دەردە سوبح تا ئێواران

ئەمە ئەنجامی دنیاکەمانە
بەمە نازانن ئەبنای زەمانە
هەروا دەزانین تا سەر باقییە
شەونخوونی یاری و یاری ساقییە

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ھ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

١٩٣٥

متصرف هات، مژدەی لەدوا بوو
شایی و شوکرانە و شەربەت پەیدابوو

## گوارەکەی گوێی یار[1]

١٩٤٨

گوارەکەی گوێی یار
تاکێکم دەست کەوت، لەگوارەی گوێی یار
لە چاوم هەڵسوو، بەدڵەی پڕ جەخار
ڕووناکی بەخشی، بەدوو دیدەی تار
هێز کەوتە جەستەی، جەفاکەشیدەم
کەوتەوە سەرخۆی، ڕووی ڕەنگ پەڕیدەم
هیوای زیندەگی، تازە کردمەوە
خەفەتی لە دڵ، لابردمەوە
سەرم لە خۆشیا، گەیشتە ئەفلاک
فریشتەیش لەگەڵ مندا تەرەبناک
گەیمە پایەی شەوق بەکامەرانی
شام بەسەپانی خۆم نەدەزانی
وەک دەواگاهێ، ئەمنایە سەر دڵ
گا بۆنم ئەکرد، وێنەی خونچە گوڵ
من بەم کەیفەوە، ئەو مات و غەمگین
بێ زەوق، بێ شەوق، کز و ماتەمین



لێم پرسی توخوا، ڕاستم پێ بڵێ
بۆ چ وا دەروونت، بەقوڵپ ئەکوڵێ
وتی، عومرێکم لە بناگوێی سەرف کرد
سەر سەرەنگرێ، چەندێکم دەربرد
لەسای زوڵفیدا، لەنجە و لارم بوو
لە بناگوێیدا شەو قەرارم بوو
ڕۆژێ بەگێچەڵ، زوڵف ئاڵابووە من
بەری نەئەدام، لێم بوو بووە دوژمن
دەستی برد لە دەست زوڵفم دەرێنێ
نەمزانی جووڵەم گوێچکەی دێشێنێ
کە ڕایکێشابووم، گوێی داتلێشابوو
بەو ئازارەوە، دڵی ئێشابوو
ئیتر لەو ساوە، وام لەناو خاکا
ژەنگم هێناوە کە لە گوێم ناکا
بەزەیم پیا هات، پاکم کردەوە
بەدیاری بۆ لای یارم بردەوە
ئەو شاد بوەوە، بەوەسڵی دولبەر
منیش بەڕۆڕۆ ڕۆژ ئەبەمە سەر
بەڵام نامەوێ وەسڵ حاسڵ بێ
نەوەکا بەوەسڵ عەشقم زایڵ بێ

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانەکەی پیرەمێردی م. ھ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## چەند ساڵ

١٩٢٧

چەند ساڵ، گیرۆدەی قەفەس بووین، وەک کەو
ئێرە مەڵبەندی، چەتە بوو بەشەو
نەمان ئەوێرا، پێ، بنێینە دەشت
بێ دڵە کوتێ، هەڵسین، بێین، بۆ گەشت

ئێستا لەپەنای، ئێوەدا بێ ترس
وا دێین و دەچین، بێ تەگەرە و پرس
ئاخ، خوێندەواریش، تەواو بێتە ناو!
خوێندەوارییە، ئەمانکا بەپیاو!

## بەندی قەتار[1]

١٩٤٣

ساقی بەعەشقی بەرزی خاکەکەم
بەیادی قەومی دڵ خەمناکەکەم
بمدەرێ جامێ با دڵ خامۆش بێ
کەڵکەڵە و سەودای سەر فەرامۆش بێ
توخوا سا ڕەشۆڵ تۆش قەتارەکەت
ئاوازەی بەرزی پای کۆهسارەکەت
بەڵکو بێنە جۆش نەوجوانانمان
تێکۆشن بەفەن، بۆ نیشتمانمان
ئێستا زانیمان لاوان نەسرەوتن
سەرکەوتن دەستەی یانەی سەرکەوتن
ناویان کەوتە ناو قەتار و لاوک
ئەمین زەکی بەگ، مەعروف جیاووک

(١) لای م. ھ لەلاپەڕە ٨١دا بەجۆرێکی جیاواز لەم نوسخەیە بڵاو کراوەتەوە، هەروەها ئێمەش پێشتر لەم دیوانەدا نوسخەیەکی کەی هەر ئەم شیعرەمان بڵاو کردەوە.

***

## خەیاڵی خاڵی[1]

١٩٤١

خەیاڵی خاڵی، هەرگاه، بێ بەدڵما دووکەڵی ناڵەم
وەها ڕەش دادەگیرسێ، تەم ئەخاتە سەر سەری عالەم
لەژێر برژانگەوە، پرشنگی چاوی وا بریسکەی دا
وتم سیالەی بەرقە و لە هەوری ڕەش، بووە پەیدا



بەهاران گوڵ لەژێر خاکا، کە زیندوو ئەبنەوە، ئەڕوێن
بەعەشقی ئەو بەرۆکە سپیە، زەرد و سینە چاک دەردێن
نیگای ئەو چاوە بادامییە، وەهای کار کردە سەر ئەعزام
هەموو خوێنی لەشم، یەکسەر بەجارێ بوو بەڕۆن بادام
بەیادی ڕووی گوڵی، چاوم لەسەر هەر بەردێ، کە گریابێ
کە بەردیان کرد بەشووشە، پڕ گوڵاوە، عەشق ئەبێ وابێ

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ھ دا بڵاونەکراوەتەوە.

***

«پیرەمێرد ئێستایش شایی ڕەشبەڵەک
چاکترە لەلای لە کەوڵی دەڵەک»

***

## بەفری بەهار

مارتی ١٩٤٣

بەفری ڕوو سپی بەدەمە و بەهار
سەری دایەوە سەرمای پێ بوو هار
ئاوەدانی و چۆڵ، وەک پەموودانە
لە لۆکەی بەفرا، تێکڕا پەنهانە
دڵسارد و ڕووڕەش، بێ بەزەییە
ڕووسپیەتیەکەی ناوی تورکیە
وەک گەنمەشامی، برێشکەی سەر ساج
سپی هەڵگەڕا، هەژار بێ عیلاج
کلکە خاکەناز لەسەرما سووتا
گوێسوانەکانمان بەزوقم ڕووخا
گۆپکەی درەختی نازداری ترسان
پەلکی وەنەوشەی سیس کرد، چرووسان
ئەو چاوە جوانەی نێرگسی کوێر کرد
بەستەڵەک دەستی خانمەڵی[1]ی لێ برد
پیرێژنان ئەڵێن، بەفر ئارد بووە
قەدریان نەگرتوە لە کیسیان چووە

چی دەبوو بەفر شەکر بوایە
سەرمایە[2] ئەبوو بۆ ئەم سەرمایە
هاتووە خۆی پیشان هەڵکۆک ئەدا
جاڕی ڕیسوایی کۆکە کۆک ئەدا

(١) خانمەلی: جۆرە گوڵێکە کە لەبەهارانا لەسەرەتاوە سەوز ئەبێت م. ھ
(٢) سەرمایەی یەکەم لەم نیوە دێڕەدا واتا سامان و دەستمایە. وەسەرمایەی دووەم واتا «سەرما»

***

## سێ تاکە بەیت

یەکەم: ١٩٣٣

«سەرەتای دەرکەوت، نواب–ی تازە
دەمێکە، زۆرکەس، ئاواتەخوازە»

دووەم: ١٩٣٣

«سەرەتای کارێ، کە زۆر، بەکارە
خوا، بیکا بەهۆی، چاکیی ئەم شارە»

سێیەم: ١٩٣٣

«کاولەکەی وەتەن، هێندە شیرینە
ژاری دووپشکی عەرەبەت هەنگوینە»

***

## دیداری تۆ[1]

تەمموزی ١٩٤٨

لە زومرەی بێ نەوایاندا، گرفتاری خەمی ژینم
بەرووزەردی، بەرووما جاریە فرمێسکی خوێنینم
بەداخی تۆوە، وەک من سەد هەزارانێ گرفتارن
لەناویانا منی بێ بەرگ و بار، وەک چقڵی بەرژینم
سرەوتم نییە هەرگیز، لەرووی ئەم خاکەدا چی بکەم
دەمێ مەجنونی دوجەیلم، دەمێ فەرهادی شیرینم
جیهان گەر رووبەرووی من بێ، بەمەردی پشتی تێ ناکەم
بەڵام تەنها لە عەشقی تۆوەیە، ترسان و لەرزینم



لەدنیادا کە هیچ خۆشیم نەدی، ڕەنگە لە قەبریشا
بەلاما ڕابووری، ببیەی، فغان و ئاهو ناڵینم

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ھ دا بڵاونەکراوەتەوە. پیرەمێرد لەم شیعرەدا ویستوویە لاسایی شاعیرە کلاسیکییەکان بکاتەوە.

***

## گەڵێ سزام دی[1]

١٩٤٦

گەلێ سزام دی، لە ڕووی زەمیندا
زۆر نەهاتی هات، بەدڵەی خەمگیندا
ئەترسم بمرم، لەو دنیاش وا بم
ڕیسوا و سەرگەردان، هەر ڕەنج بە با بم
چۆن لە دنیادا، عومرم بەربادە
چۆن ڕەنجم هەروەک، ڕەنجی فەرهادە
ئەترسم لەولا، ڕەنجەڕۆتر بم
خۆشی نەبینم، دەسخەڕۆتر بم
سا خوا ڕەحمێ بکەی بەحاڵم
هێجگار سووتاوم وەک کۆی زوخاڵم
تەنها یەک ئاوات ماوە بیخوازم
تو گەورەیی خۆت بدە نیازم
ئەویش، ئەوەیە، لە دوای مردنم
لە دوای گیانەڵا و ڕۆح سپاردنم
خۆزگە ئەبوومە دارێ لە خواوە
ئەرِوام لە تەنیشت گڵکۆی لەیلاوە
بەڵکو بۆ مەحشەر، زیندوو بووینەوە
بەگورجی دەستی، یەک بگرینەوە
با لەرێی حەشرا، لەیل دەلیلم بێ
بۆ پرس و جوابیش، خۆی وەکیلم بێ

بۆ گوناهباریم، تکا کارم بێ
شاهیدی سزای، ڕۆژگارم بێ
ئەگەر وانەبێ، هەی ماڵ وێرانم
نە لە پرس ئەگەم، نە جواب ئەزانم

................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاونەکراوەتەوە، بەڵام بەهەڵە و لەبەر نەشارەزایی کەوتۆتە دیوانی وەلی دێوانەوە کە (مەحموود خاکی و س.ع. شادمان) زۆر بەناتەواوی ساڵی (١٩٨٣) بۆ جاری دووەم چاپیان کردۆتەوە.

***

## ڕۆژی تازە

مارتی ١٩٣٢

ڕۆژی تازەی، ساڵی تازەی، ئێمە هات
ڕۆژهەڵات، ڕۆژی هەڵات، سەرما هەڵات
بای بەهار هات، خاکی زیندوو کردەوە
بۆیە نێرگس، چاوی مەستی کردەوە
نەوجەوانی هات و پیری بردەوە
تیشکی ڕۆژ دەرکەوت، تەمی لابردەوە
هەردە سەوز و مۆر وێنەی بەرگی بووک
شایی دەنوێنێ، چراخانی گلووک
شەونمی ناو لالە بادەی بولبولە
بەو مەیە سەرخۆشە وا شەیدای گوڵە
چونکە خۆش ئاوازە[1]، هەم ئاواتەخواز
زۆر بەسۆزە، ناڵەکەی وەک سۆزوساز
هاتە جونبوش ئاو و سەوزە و با و درەخت
دەوری کانی بوو بەگوڵزاری بەهەشت
ئەو بەهەشتە خۆشە جێی بەزمی جەمە
دەم بەدەم جێی یەکدگیری هەمدەمە
بورجی بەرخە، ڕۆژ سەرەفرازی ئەکا
بەرخی ئێمەش بۆیە وا بازی ئەکا

................................................

(١) لای م. ه بەهەڵە نووسراوە: چونکە خۆش ئاواتە، هەم ئاواتەخواز.



## نەوبەهار

١٩٤٠

یاران نەوبەهار، یاران نەوبەهار
خوا نەشئەیەکی وای دا بە بەهار
گیاندار و بێ گیان، زەوی و گیا و دار
خرۆشا و زەڵمیش کەوتە هاڕەهاڕ
سەری نایە دەشت ویڵ و بێ قەرار
بەشۆڕی شێتی خۆی ئەدا لەدار
شارەزوور بەرگی سەوزی لەبەردا
کەمەری زیوی چەم لەکەمەردا
هەوای بووکێنی تازە لە سەردا
چەند خوازبێنێکە لە داخ و دەردا
دەستی لە زاوای نێرەمووک بەردا
لە دەردی سەری نابەکار بێزار
نێرگس بەدیدەی شۆخ و شەنگەوە
پۆڕ بەکناچەی خۆش ئاهەنگەوە
ڕاوکەر بەشوێنیا بەتفەنگەوە
نێرەکەر بەجۆش زەڕە و دەنگەوە
هەندێ بەسەودای قەنگەی بەنگەوە
هەریەک بەڕەنگێ کەوتوونە رووی کار

***

## بەهاری کەنار شار[1]

مارتی ١٩٣٢

دوێنێ بەیانی، چوومە قەراغ شار
خەیمەی بەهار بوو، دیارە و دیار
لە پرشەی ئاونگ، بەتیشکی هەتاو
گوڵ چووبوە شێوەی، بووکی سەربەدراو
شنەی بای بەهار، ئەیدا لە غونچە
ئەیگەشاندەوە و لای ئەدا پەچە

نەک دڵێ سەد دڵ، ئاواتەخوازی
ئەو پێکەنینە و گوریشمە و نازی
هەمیشە بەهار لە کەناری چەم
بووبوە لاگیرە و گوڵی سەر پەرچەم
لەڕێگاکانا، گوڵە زەرد یەکسەر
بووبوە زنجیرەی، تەڵای پشتەسەر
قەتارەی نەسرین لە نسێ و و شیو
بریسکەی ئەدا، وەک هەیاسەی زیو
سێپەرە و مینا، بەخنجیلانە
ئەت وت ملوانکەی موورو و شیلانە
پەلکی گوزروان، بەسەر گیاوە
جووتێ دڵخوازە، وا تێک ئالاوە
ئەگریجەی بووکە، بەڕەزا و چنوور
چاران چەقیلە، بۆتە تارای سوور
لیسپی گیای پیشۆک ئەدۆزرێتەوە
وێنەی پرچی کچ ئەهۆنرێتەوە
گوڵی زەرد و سوور لەگەڵ ئەرخەوان
وەک جسری مۆدە بەڕۆژی شەموان
شەوبۆ و ڕیحانە و کەنێر و گیابەن
پەکی لاوانتەی ئەورووپا ئەخەن
شنگ و هەڵەکۆک، چەورە و پێقەلە
چاوبازە و بزنە، ریشە و خەرتەلە
کاشمە و بیزا لوشە و ترشۆکە
کوزەڵە و کاردوو پونگە و بەنگۆکە
تۆڵەکە و جاترە، شویت بەڕیزە
کەرەوز، تەرخوون، پیاز، تەڕەتیزە
ئەمانە هەمووی کە گیای بەهارن
هەریەک بۆ دەردێک دەرمان و چارن
سەوزەڵە و نازدار بەلەنجەو لارن
تازە کچۆڵەی تیپی گوڵزارن



کارێزی شەریف مەڵبەندی جوانان
ئاخی پێ ئەبەن پەری ئاسمانان
ئەو ئاوە جوانەی، لەو دەشتە وێڵە
چاوی قرژانگی لە چاوا لێڵە
هارەهاری ئاو لەو کۆرە شیوە[2]
وەک سەرچۆپیکێش، دێتە قریوە
نازناز و نێرگس، شەوبۆ و گەزیزە
هەڵدەپەڕن وەک، کچان بەڕیزە
دەستیان گرتبوو، پڕ جۆش و خرۆش
گۆرانیبێژیان، بولبولی دەنگخۆش
بەسۆز و ناڵە پیاوی ئەگریان
وەک کای کۆن دڵی منی ئەسووتان
دار و گیا و گیاندار، پڕ نەشئە و دڵخۆش
من و وەنەوشە مل کەچ و شین پۆش
ئەو پابەندی خاک، کۆنە هەواران
من زێدەوانی مەزاری یاران

..........................................................

(١) ئەم شیعرە لە نەورۆزی ساڵی ١٩٣٢دا، لە ژمارەی ٣١٣ی ڕۆژنامەی (ژیان)دا بڵاوکراوەتەوە. بەڵام لای م. ه نووسراوە (١٩٣١/٤/١٠)

(٢) کۆرەشیو: کوێرەشیو کە لە بەهارانا ئەبووژێتەوە.

***

## بەیادی کۆن

١٩٣٢

ڕۆژێ بۆ سەیری، تەیارەخانە
ئەجەل بردمیە، سەر ڕێی ئەو جوانە
بۆمبای نێو نیگا درا لە جەرگم
شەهیدم کەفن، مەکەن بەبەرگم[1]
وتم هەر منم، کوشتەی ئەو چاوە
ڕوانیم لاڵ و پاڵ، زۆرن لەو ناوە

قۆچی قوربانیان، جەژنی قوربانە
ئەو دەشتە بووە بەقەسابخانە

(١) ئەم نیوە دێڕە هی وەلی دێوانەیە کە دەڵێت «شەهیدم کەفەن مەکەن وەبەرگم»

***

## محەبەت وەک یار[١]

١٩٤٦

محەبەت وەک یار، خۆی بێ وەفایە
دڵی رووخاندم، کە خۆیشی تیایە
ناڵەیش هەر جەرگی من ئەسووتێنێ
لە ئاقاری ئەو تەئسیر نانوێنێ
لەتنۆکی باران خوا گەوهەر ئەکا
فرمێسکی منیش هەر چاو تەڕ ئەکا
پیرێک شوێن جوانی کەوت بەسەوداوە
وتیان عومر ئەڕوا و مەرگی لە دواوە
بەزیندوویی هێند بەدەورتا گەڕام
کە مردم ئەگەر بێت و بێیتە لام
عەشق کێلی قەبرم، دێنێتە تەلاش
ئەسووڕێتەوە، وەک بەرداشی ئاش
کای کۆن ئاگری گرت ناکوژێتەوە
پیر بەهەوای عەشق ئەبووژێتەوە
مەولەوی پیرم، فەرمووی بەم حاڵە
دەورەی بلوغی عاشق سەد ساڵە

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## دەردی گرانی[١]

تەممووزی ١٩٤١

دەردی گرانی، گرانی کەم بوو
سەبوونی چلەی، سووکی بۆ غەم بوو



هەناسەی ساردی، دەم گەرمی گەرمام
ئیتر ناکەومە جێی گەرما، گەر مام
ئەڵێن هودڕە، لەم شارەزوورە
کەری خستووە، لەم شارە زوورە
هاوین هاودەمی، مار و دووپشکین
لەبەشی ژارا، خێوی دوو پشکین
ئای بۆ تاڤگەکەی، سەر ڕێگای بەڵخە
ئەو ئاوە ساردەی، بێ قەوزە و بەڵغە
هی واشمان هەیە، بەیادی مەستان
ژووری زستانەی لێ بووە بەکوێستان[٢]

(١) پیرەمێرد دووجار ئەم شیعرەی نووسیوەتەوە و بڵاوی کردۆتەوە. ئەم دەقەیان لە لاپەڕە ١٤٧ی دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو کراوەتەوە.
(٢) پیرەمێرد لەم دێڕەدا نیازی لە شێوەی ژیانی خۆیەتی کە ساڵ دوانزە مانگە لە ژووری قەلەندەرخانەکەیدا خزابوو. بەبێ ئەوەی گوێ بداتە گەرمای هاوین.

***

## گەرما[١]

١٩٤٠

گەرمەی تێکەڵی لە گەرما و گەرما
بۆ سری سەرما، بکشێن بەسەرما
لەجێی کەمەرە[٢]، دەست لە کەمەردا
بەبۆی هەناسەم، سنگ سێوی دەردا
کە جوو[٣] لە ترسا، جۆی جوو لە ترسا
پارسا[٤] پارسەنگ بوو، بۆ پەچە ترسا
پار پاڕامەوە، بەنیگای تکا
ئەبرۆی پێک هێنا، ئابڕووم تکا

(١) م. ه نووسیویە ئەم شیعرە، پیرەمێرد لە ٢١ی مارتی ١٩٤١دا پێشکەشی (شێخ محەممەدی خاڵ)ی کردووە. بەڵام پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە ژمارە٥٩٣ی (ژین)ی ساڵی ١٩٤٠دا بڵاوکردۆتەوە. هەروەها مامۆستا م. ه لەلاپەڕە ٢٩٨ی دیوانەکەدا ئەو پێشەکیەی نووسیوەتەوە کە پیرەمێرد کاتی خۆی لە پێشەکی ئەو شیعرەدا نووسیویە و لەو ژمارەیەی (ژین)دا کە باسمان کرد بڵاوی کردۆتەوە. بەڵام بەداخەوە لەمەشدا مامۆستا م. ه

دەستکاری ئەو چەند ڕستەیەی کردووە و لێرەدا دەقەکەی پیرەمێرد و ئەوی دیوانەکە هەردوو دەنووسینەوە هەتا جیاوازیەکە دیار بێت، جگە لەمەش لەلاپەڕە ٢٩٩دا سەبارەت هەمان شیعر مامۆستا چەند بیروڕایەکی خۆی نووسیوە، کە لەم دیوانەدا و لەشوێنی خۆیدا سەرنجی خۆمانی بەرامبەر دەنووسین!!.

دەقی نووسینی دیوانەکەی م. ه

ئاخ، خۆزگە ئەمتوانی، ئەم جلوە و ئاهەنگە، کە لە زمانی کوردیدا هەیە ئەم هەموو مولّکی مەرام و مەعنایە، کە لەوتەیەکی ئەوا پەیدا ئەبێت، بەزمانی چەند دەوڵەتێک ئەم هێنایە پێش چاو، هەتاکو تێبگەیشتنایە کە زمانی کوردی چەند ڕەنگین و دڵ نشینە. ئەمە چەند دێڕێکە، تەنها بۆ ئەوە وتراوە کە لە شێوەی یەک نووسیندا مەعنایەکی جوێی لێ ئەبێتەوە.

دەقی نووسینی پیرەمێرد لە ڕۆژنامەکەدا:

ئاخ، خۆزگە ئەمتوانی ئەم جلوە و ئاهەنگە کە لە زبانی کوردیدایە و ئەم هەموو لکی مەرامە و مەعنایە کە لە کەلیمەیەکی ئەو پەیدا ئەبێ بەزبانی چەند دەوڵەتێک ئەم هێنایە پێش چاو تا تێبگەیشتنایە چەند ڕەنگین و دڵ نشینە. ئەمە چەند شیعرێکە، تەنها بۆ ئەوە نووسراوە کە لە شێوەی یەک نووسیندا چەند مەعنایەکی جوێ جوێی لێ ئەبێتەوە.

(٢) کەمەرە جۆرە خشڵێکە ئەکرێتە کەمەری ئافرەت.

(٣) جووی یەکەم جوولەکەیەو جووی دووەم (جوین)ـە.

(٤) پارسا: خواپەرست و پیاوی ئایینی (عابد).

***

## کردەوەی هیتلەر[1]

١٩٤١

کردەوەی هیتلەر بێن تەماشاکەن
ئەوسا لە حزبی نازی حاشاکەن
بزانن هەروا چە پەنگێکی دا
بەگیانلەبەری ڕووی هەموو دنیا
دەبا من باسی ئێستای لای خۆمان
شتێکی بۆ سەیر بخەمە مەیدان
دەردی بێ بەرگی ئای کارێک ئەکا
ڕووتین وەکو سلّق، بێ بەرگین وەک گا
خۆ بەرگ و خواردن ئەمەندە بوون گران
پێیان ناوێرین، بوونە دێو لێمان
ئای لەو سەعاتەی دێینە شت کڕین
هێندەی ئەمێنێ باڵ بگرین، بفڕین



قاچم پێڵاوی پێوە نەماوە
بلۆقە و گەلێ جێی قلّێشاوە
کەچی ناوێرم خۆم قەرەی پێڵاو
بخەم، ئەترسم نەک بکەومە داو
ئەو کارەی کەوا شەکر و چا ئەیکەن
نەبووە و نابێ هەتا بەدەگمەن
ئەمەندە گەرمن، دەم ئەسووتێنن
پشتی دارایی هەژار ئەشکێنن
کار و کاسبی هەر ناویان ماوە
ئێستە ڕۆژێکە کە معاش باوە
ئەویش بەپارەش دەس کەس ناکەوێ
خوایە بۆ هەندێک، سازکەی بسرەوێ
لەبەر بێ دەستی بەهیوای معاش
گەلێ شاعیری کاسب بوون بەجاش
دەردی هیتلەرن، ئەمانە هەموو
لەناوی بەری خوایە زوو بەزوو
هێشتا گەلێکی ماوە برادەر
چاکە کۆتای کەم، گرانە دەفتەر
(عصبة الأمم) دەخیلە هاوار
فریامان کەوە، جارێکە و ئەمجار

........................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## های گەرمای هاوین

١٩٤١

های گەرمای هاوین، های گەرمای هاوین
قرچەی تێخستین، بەتەوژم و تین
ڕەشەبا دیسان، لێمان کەوتە قین
نەباغی هێشتین، نەگوڵ نەپەرژین

هانامان بەتۆ، خوای (ژیان)و(ژین)[1]
(لدوس)ی ناوە، لای تورک ڕەشەبا
لەگەڵ پەیدابوو، نەشئەی خەڵک ئەبا
تەختە قروسی وەک دێڵە بەبا
ئەسووڕێتەوە، خەو و خوێن ئەبا
بەبۆنی پیس و بەخروو گەزین
گوڵ و گوڵاڵان، کەوتنە پەستی
بولبول وا دیارە، ماری خار گەستی
نەناڵەی دیارە، نەسەدای هەستی
ڕێی ڕاوەماسیش، مەرەزە بەستی
وەرن بەشینی بەهار تێر بگرین

(۱) مەبەستی لە ڕۆژنامەی (ژیان) و (ژین)ە.

***

## پایزی دڵتەنگ

**١٩٣٩**

پایز دڵتەنگە، پایز دڵتەنگە
هەوری نوێی پایز، زویرە دڵتەنگە
تەلی تەمورەی، غەم پڕ ئاهەنگە[1]
پیری دەربارەی جوانی بەجەنگە
ڕەشەبا لێمان بەژار و ژەنگە
گەڵاڕێزانە، گوڵ ئاڵتون ڕەنگە
شەتاوان لە دەشت بەپێچ و دەورە
سەرشێتن لەدەس جەوری ئەم دەورە
تەم بەبەرگی شین، کێوی داپۆشی
بولبول ڕووی کردە، لانەی خامۆشی
خەڵووزە[2] گەڵای، بێستانی سووتان
گەلاوێژ بەرگی هەتیوی دڕان
کچە کورد بەڕیز بە بەرزانەوە
بەلەرز ئەلەرزن بە(لەرزانە)[3]وە



منالان سەریان، کەوتە ژێر قۆچکە[4]
هۆمان کەوتەوە، جێی بەر بەڕۆچکە
ئەمان ڕوانیە ڕۆژ، بەڕووی ساردەوە
ئێستا پێویستە، وا خۆی شاردەوە
قاز و قولنگان، هاتنە خوارەوە
قیژ و هۆڕیانە بەسەر شارەوە
شەوگار درێژ بوو، بۆ ناڵەی غەمگین
زستان ستەمە، بەبێ دڵدار ژین
یارم بەئاشتی دەڵێن دێتەوە
بەختە بنوو با نەسڵەمێتەوە
خەڵک هاواریانە، لە بەختی نووستوو
من هاوار ئەکەم، بەختە زوو بنوو
خالانەی ئەوەی، وتم چاوکالان
تا چاو کاڵ ژینی بردم بەتالان

(۱) لای م. ه لە دیوانەکەدا لاپەڕە ١٤٨ ئەم بەیتە نەنووسراوە، هەروەها من ئەم شیعرەم لەبەر ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە ٥٨٤ی ساڵی ١٩٣٩ نووسییەوە و لەو نوسخەیەی لای م. ه جیاوازە.
(٢) خەڵووزە: جۆرە نەخۆشییەکە تووشی بێستان ئەبێ م. ه
(٣) لەرزانە: جۆرە خشڵێکە ئافرەت بۆ ڕازاندنەوەی خۆی بەکاری دێنێ.
(٤) قۆچکە: جۆرە کڵاوێک بوو لە شێوەی کلێتەدا لە قوماش دروستیان ئەکرد و تەنها منداڵ لەسەری ئەکرد.

***

## سێ تاکە بەیت

یەکەم: **١٩٣٣**

«زۆر شاعیرم دی، لەم دیوە و دیوە!
نوکتەی (مەولەوی)م، لەکەس نەدیوە!»

دووەم: **١٩٣٣**

«چوار پێچکەی لەناو تەنەکەی ئاوا
وەک سۆفی سەری، لەژێر کڵاوا»

سێیەم: **١٩٣٣**

«وا بەلرفە لرف، زستانمان بۆ هات
بەفر و بەستەڵەک کەوتە ناو وڵات»

## لافی جوانی[1]

١٩٤٦

شەوێ مانگە شەوی چواردە، ناوەڕاستی بەهار
کەناری شار، هەموو لایەکی چیمەنە و گوڵزار
لەژێر تریفەی مانگدا، بەشەونمی ئەڵماس
دیاری بووکی بەهار، پوولەکەی بەرۆکی کراس
لە دەوری چەم بەقەتار، کرمەکی گوڵە زەردە
بوە بەخشڵ و گوڵاڵەیش بەئاڵی وەک (پەردە)
بەناو گوڵاڵەی سوورا بڕۆ ڕوەو (گوێژە)
سەرت ئەخاتە سەمای شیعری بەرز، بەبێ پەیژە
لەپێشەوە لەسەر ئەستێری ئاوەکەی سەر ڕێ
بەپاکژی دەم و چاوت بشۆ، وەرە سەر ڕێ
بە کوردی ئێمە کە دەریاچە ناوی (ئەستێر)ـە
بەشەو چە جەوانە، لەناویا، جریوەی ئەستێرە
لەوێوە، چاو بخشێنە، لە نەخشی یەزدانی
دەبینی، شا ئەسەرە، تەختگای سلێمانی
وڵاتەکەت ئەمەیە، حەیفە نەیپەرستی بەدڵ
ئەوی کەخۆشی نەوێ، ڕووڕەشە و تەریق و خجڵ
بەئاوەڕۆیی (شەرەف) ڕادەخەن لە شوێنی فەرش
وەک ئەهریمەن، لە سلێمانیا، دز و ڕووڕەش

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## بۆ کوێخا خەلیلی بنگردی موان

١٩٥٠

کوێخا خەلیلی، بنگردی موان
(دپلۆم)ەی هەیە، زیاتر لە هەموان
ئەڵێ، هێنایان، لە بنگردیان نام!
گوایە، بەخێرێ، من لەوێ، کوێخام!



بنگردم هەرچەن (موو)انیشی بوو
بەڵام ئێشکچی، شەوانیشی بوو
جەردە، لەمانە، نەسڵەمیەوە
کۆنە ڕێویشی، دا بەدەمیەوە
لەپشت دەرگاوە، ئەبڵەق، ئەڕوانم
وەک مانگای مالوان، وا لەسەر گوانم

***

## شەوێ لە ئوتەی هەگبەلی[1]

١٩٢٢

شەوێ مانگە شەوی چواردە، دەمەدەمی نیسان
بەهاری تازە، کە زستانی خستە ناو نسیان[2]
لە هەر دڵێکەوە، جۆشێ بەبانگی دەنگخۆشی
لە لالەزارەوە، شەونم، شەرابی مەیی نۆشی
خەریکی جونبوش و زاخاوی ژەنگی زستان بوون
کچ و کوڕ و ژن و مێرد، پێکەوە لە سەیران بوون
منیش لە خوارەوە، چووبوومە، گوێ لەبی دەریا
بەدەردی خۆمەوە گیرۆدە، بێ کەس و تەنیا
لەپاڵ درەختی سنەوبەر، کە ناوی (چام)ە لەوێ
ئەوەی نەخۆش بێ، هەوای داری چامی پێ ئەکەوێ
لە ئەستەموڵ لە (ئوتەی هەگبەلی) بەبێ دەنگیی
خزامە بن دەسی جوانان بەلاپلەرسەنگی
لە پێشمەوە، ژن و مێردێکی عەرعەر و لاولاو
کە تیشکی کۆڵمی ئەوان، مانگی خستبووە ناو ئاو
بە یەک دڵی، تەکیان دابوە یەک بەسەوداوە
بەخۆشەویستیەکی پاک و ڕوون و ساواوە
بەمیهرەبانی (پەری شۆخی شەو) لەژوور سەریان[3]
بە تیشکی خۆی جلی زەربەفتی کردبووە بەریان
بە سۆزەوە، (کوڕە پرسی) لە هاوسەری گیانی
کە ڕۆژ هەڵێو، ون ئەبێ کامی خۆشە؟ ئەیزانی!

کچە وتی: کە بەڕووی تۆوە، ڕۆژ هەڵێ خۆشە
بەمەستی چاوتەوە، دڵ نەشئەدارە، سەرخۆشە!
بەڵام کە کاتێ، لەپێش چاو نەبیت و دوور بی لە لام
بینایی لێڵە، لە زەردەڵ پەڕایە، ڕۆژی هیوام
بەخۆشەویستییەوە، کوڕ، دەستی کردە گەردنی یار
سڕی لە ئاوێنەی ڕووی، بەلێوی، ژەنگی غوبار
وتی کەتۆ ئەمە بی! کێ گەواهی عەشقم بێ؟[4]
هەتا بژیم نەیەڵم، عەشقی تۆم لەلا کەم بێ

..........

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە ساڵی١٩٢٢ی زاینی دا لە تورکیا نووسیوە کە ئەوکاتە قایمقامی دورگەی (هەگبەلی ئوتە) یاخود (ئوتە بازاڕی) بووە. وە ئەم دوورگەیە بریتییە لە هاوینەهەوارێکی خۆش. وە ساڵی ١٩٣٩ سێ بەیتی دوایی شیعرەکەی بۆ زیادکردووە بۆ پیرۆزبایی کردن لە دەرچوونی گۆڤاری گەلاوێژ.

(٢) لای م. ھ نووسراوە(نەی سان) واتە قامیشەڵان. ئێمە (نسیان)مان بەڕاست زانی.

(٣) پەری شۆخی شەو: واتا مانگ.

(٤) ئەمە دوا دێڕی ئەو شیعرەیە و پیرەمێرد بەبۆنەی دەرچوونی گۆڤاری گەلاوێژەوە، لە کۆتایی شیعرەکەوە سێ بەیتی پیرۆزبایی بۆ گەلاوێژ نووسیوە! کە ئەمەیە:

کچە وتی، ئەوە ئەستێرەیەکی تازە هەڵات
بە کوردی ناوی (گەلاوێژ)ـە، شەوقی دایە وڵات
وەرە بەشوعلەی ئەو سوێند بخۆین کەیەک دڵ بین
لە خزمەتی وەتەنا، هەوڵ بدەین، هەتاکو دەژین
لە (ژین)ەوە ئەمە شاباشی ڕێی گەلاوێژە
لە کۆمەڵێ ئودەبا، نوکتەبێژ و گوڵڕێژە

***

## سەراپای کچە جاف

١٩٤٠

کچۆڵەی بەناز، کچۆڵەی بەناز
جنسی لەتیفی شۆخ و سەرفراز
شیرینی، دڵسۆز، لەیلی شەکەر ڕاز
خەندەی بۆ زامی، جگەر مەرهەم ساز
قوببەی سەر سینەت وەک هەرمێ وەڕاز
شەوقی تەوێڵی، بەیانی بەهار
ئەگریجەی بۆ دڵ، وەک ڕشتەی زەننار[1]



بڕۆی بەڕووی ڕوو، لەڕووی توران لار
وێنەی پڕگاری، سنعی کردگار
برژانگ لە قەوسی ڕوودا تیرانداز
چاو دیدەی ئاهووی[2]خەواڵووی خامۆش
برووسکەی تیژی شەڕ جۆی شەڕفرۆش
بەنەشئەی بادەی (نازی خۆی) سەرخۆش
مەیخانەی عەشقی، هێنایە خرۆش
حوسن و عەشق لەگەڵ یەک کەوتوونە ڕاز
گوارە کەوتۆتە، ژێر ئەگریجەی خاو
سەر ئاوێز وێنەی، لە خوێندا گیراو
لامل و گوارە، تەڵای تازە ساو
هەردوو ژێر ماڵەی، فەرقی زەڕکڵاو
گیان و دڵ بۆیان هاتۆتە پەرواز
سەرگۆنا سێوی، لاسوورەی سەردەشت
پاوانەی داوی، گەنمەکەی بەهەشت
تامەزرۆ زۆرە، هیچ کەس لێی نەچەشت
کەمەربەستەی دەست، وەیسی ماهی دەشت
ئاڵ لەسەر سپی، نەقشیی کارساز
دەم قوتووی لەعلە، بەدوو لێوی ئاڵ[3]
بووکی ڕۆح سووکی، وەک مناڵی کاڵ
دان ڕشتەیی لال، یاڕشتەی ئاماڵ
شەکری ناوچایی، بووە بەمیسال
خاڵ هندوی بەکچی، بووە بەسەرباز
سینەی زیوی قاڵ، لە بۆتەی یەزدان
جووتێ شەمامەی، سەر تەرزی جەنان
هێشتا نەیدیوە، داستانی دەستان[4]
پەنهانە لەژێر، کراسی کەتان
لەدرزی بەرۆک، وەک مانگ بەرق ئەنداز

..........

(١) زەننار: جۆرە پشتێنێک بووە کە سەلیبییەکان لە کاتی شەڕدا ئەیانبەست و خۆیان پێ شەتەک ئەدا بۆ گورج

بوونەوە. م. ه

(٢) ئاهوو: ئاسک، مامز.

(٣) ئەم پێنج نیوە دێڕە لە نوسخەی م. ه دا نە نووسراوە.

(٤) دەستان: لە قەبی ڕۆستەمی مازندەران (ڕۆستەمی زاڵ) بووە کە پاڵەوانێکی بەناوبانگە لە شانامەی فردەوسیدا.

تێبینی: ئەم شیعرەی ئێمە نووسیمانەوە و لە ژمارە(٦٠٦)ی ساڵی ١٩٤٠ی ڕۆژنامەی (ژین)دا بڵاوکراوەتەوە. وە جیاوازی زۆرە لەگەڵ هەمان شیعردا کە لە لاپەڕە(١٥٥)ی دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو کراوەتەوە. من نازانم مامۆستا م. ه لە کام سەرچاوەوە وەری گرتووە. ئەوا بۆ بەراورد ئەویش دەنووسینەوە.

## سەراپای کچە جاف

کچۆڵەی بەناز، کچۆڵەی بەناز
جنسی لەتیفی، شۆخی سەرفراز
بازی عیشوەباز، دۆستی شەکەر ڕاز
پێکەنینەکەت، بۆ زام مەرهەم ساز
بولبولی سەرچڵ، سەرچڵی غەماز[*]
شاهێنی شاهی سەر قوللەی پێباز
ڕەنگی ڕوخسارت، بەیانی بەهار
ئەگریجەت بەندی، دڵە وەک زەننار
برۆت لە ڕووی ڕوو، تۆرکردوی لووت لار
کەوانە پەرگار، دەستی کردگار
برژانگ لە کەوان، ئەبرۆ تیر ئەنداز
چاو دیدەی ئاهووی، خەواڵووی خامۆش
برووسکەی تیلی، شەڕ جۆی شەڕفرۆش
بە نەشئەی بادەی، نازی خۆت سەرخۆش
مەیخانەی عەشقی، خستۆتە خرۆش
حوسن و عەشق لەگەڵ، یەک کەوتوونە ڕاز
گوارە کەوتۆتە، ژێر ئەگریجەی خاو
هەڵاوەسراوە، لە خوێندا گیراو
لامل و گوارە، هەردوو تەڵای تاو
هەردوو ژێر ماڵەی، فەرقی زەڕکڵاو
گیان و دڵ بۆیان، کەوتۆتە پەرواز
سەر گۆنای سێوی، لا سوورەی سەردەشت
پاوانەت داوی، گەنمەکەی بەهەشت
تامەزرۆ زۆرە، هیچ کەس لێی نەچەشت
کەمەربەستەی دەست، وەیسی ماهی دەشت
ئاڵ لەسەر سپی، سونعی کارساز
سینە زیوی قاڵ، لەبۆتەی یەزدان
جووتێک شەمامەی، بێستانی جنان
هێشتا نەیدیوە دەستانی دەستان
پەنهانە لەژێر، کراسی کەتان
لەدرزی بەرۆک، وەک مانگ بەرق ئەنداز

..............................................................

(*) ئەم نیوە دێرە لێرەدا زیادە چونکە هەموو پارچەکان پێنج نیوە دێڕە.

***

## هەی کانی شەکراو[١]

١٩٤٠

هەی کانی شەکراو، هەی کانی شەکراو
کانیەکەت کانی، عەنبەر و گوڵاو
ئاوی زیندەگیت، ڕژاوەتە ناو
جێی حەسانەوەی، تیپی سەربەدراو[٢]
چەشمە سارێکی، سەر ڕێی نازداران
گوڵاڵەی دەورت، دەمی بەهاران
نەشئە دەخاتە[٣]، دڵی ڕێبواران
جێی سات[٤] و سەودای بۆ هەرزەکاران
گەرد و غوباری، ڕووی کچان ئەشۆی
تیف تیفەی زوڵفی، تیپی سەمەن بۆی
مایەی هەرزانی و ڕۆنی مەشکەدۆی
شوێن مەلەی قرگە و وێڵەدەری تۆی[٥]
کە مەشکەی لە کۆڵ، داگرت شۆڕە ژن
شڵپەی ئاو دێنێ، بەخرنگەی بازن
دڵ کون کون ئەکا، وەک سووژن ئاژن
چاو ڕوونیمان بێ، بەکوێری دوشمن
ئەم خاکە پاکە، کە دووربێ لە چاو
سەد چاوگەی تیایە، وەک چاوگی سەراو[٦]

قەدری نازانین، نایەینە بەرچاو
هاوارمە بۆ پیاو، بەجەرگی سووتاو[٧]

(١) کانی شەکراو: کانییەکە دەکەوێتە دەستەچەپی پردەکەی هۆمەوە کوێرەوە کە ئەکەونە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانی.
(٢) سەر بەدراو: نیازی لەو کچ و ژنە لادێییانەیە کە پارەی زیو ئەکەن بەکڵاوەکانیانا وەکو تاکە و جووتەی عەجەم کە ئەمە لە کۆنەوە جۆرە خشڵێکی ناو کوردەوارییە.
(٣) لای م. هـ بەهەڵە نووسراوە «نەشئە دەماغتە» بڕوانە ل١٥٢.
(٤) لای م. هـ نووسراوە «جێی سازو و سەودای بۆ هەرزەکاران» کە دیارە وشەی «ساز» هەڵەیە و «سات» ڕاستە.
(٥) لای م. هـ نووسراوە «جێی وسڵی قڕگە و وێڵەدەری تۆی»
(٦-٧) ئەم پارچەیە لە شیعرەکە یەک بەیت بوو. واتە بەیتی یەکەم بوو لای م. هـ. بەڵام ئێمە لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە٦١٢ی ساڵی ١٩٤٠دا بەیتێکی ترمان بینی و ناتەواوی شیعرەکەمان تەواوکرد.

***

## کوردی پەتی[١]

١٩٣٣

ئەمساڵیش، دیسان وا گەیمە بەهار
سەوزەی مێرغوزار، سۆزەی میرغوزار
دوگمەی سەرسینەی، بەیان ترازا
بەیان بەگوڵی، سپی و سوور ڕازا
هەوری بەهاری، کردی بەهەڵا
گوڵاڵە خەیمەی، ئاڵی خۆی هەڵا
بەرخ و کارژۆڵەی، بەهار بەقەتار
هەڵپەڕکێیانە، بە بەستە و قەتار
کە بای داراوس[٢]، ئەشنێتەوە
پیاو خۆی تێ ئەگا و ئەبووژێتەوە
ئەو بایەی خاکی، زیندوو کردەوە
پیری لە بیری، پیران بردەوە
بە دەماغ خۆیدا، لەدەماغی من
ئاخ بێ دەماغە[٣]، گوڵەباغی من
بە دەست پیریەوە، کۆکە کۆکمە
خوازبێنی بەفر و هەڵە کۆکمە



توخوا سا کوڕگەل، ئێوە و خوای خۆتان
سەیرکەن لە باتیم، تا دەلوێ بۆتان
کە (ژین) و بەهار، هەردوو بایەک بێ
جوانی و نەوجوانی، هەردوو بایەک بێ
ژین ئەو ژینەیە، بەیانیی بەهار
لە گۆشەی ئاوێ و یارێکی دڵدار
دوو دڵ یەک بۆ یەک. ئاواتەخواز بێ
نەک نەنگەویستی، نیاز و ناز بێ
دڵیان وەک ئاوی، بەیانیان ڕوون بێ
بەنەشئەی سەودای ڕووی یار گوڵگون بێ
تیشکی ڕۆژ بدا لەو ئاوە جوانە
شەوق بداتە سەر، کولم و بڕوانە
بە زەردەخەنە، سەر گۆنای چاڵ بێ
بە بۆی هەناسە، هەڵگرێ و ئاڵ بێ
دڵ سەراسیمەی، شێوەی نازی بێ
گوێی حەلقە لە گوێی، شیرین ڕازی بێ
گیان بادەی غەمزەی، چاوی بنۆشێ
دەست بێ پرس سێوی، سینەی بووشێ[٤]
ئەو سینە سافە، شەوق بداتە ئاو
ئاو بێتە لەرزە، شەرم هەڵسێ لەناو
سەرمەستی سەودا و سەر لەسەر ڕان بێ
ئەگریجە لەسەر ڕوو پەرێشان بێ
ئەو شلکەی ڕانە و زولفە سەد تەرزە
دڵ وەک (بی) ناو ئاو، بێنێتە لەرزە
دەم، دەمبەستەی تام، دوو لێوی ئاڵ بێ[٥]
زبانی بەستە، زبانت لاڵ بێ
ئنجا بەتکای، نیگا و بەنیاز
ڕازی دڵ بێتە سەرگرشمە و ناز
بەڵام عەشقی پاک، نەدەی بەئاوا
دڵێکی پاکی، منداڵی ساوا

چونکە عەشقی پاک، تاسەر ئەمێنێ
(وجود)یش نەبێ، ڕۆحت ئەژێنێ

.................................................................

(١) ئەم شیعرەی لای ئێمە هەندێ جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوی لای م. هـ. دا. ئێمە لەبەر ڕۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە ٣٥٦ی ٩ی مارتی ١٩٣٣. نووسیمانەوە کە پیرەمێرد خۆی بڵاوی کردۆتەوە..
(٢) بای داراوس: شنە بایەکە زۆر سارد نییە و لە سەرەتای مانگی سێدا هەڵدەکات. دار گۆپکەی پێ دەکات.
(٣) بێ دەماغ: لێرەدا بەواتای بێ زەوق هاتووە.
(٤) لای م. هـ نووسراوە «بپۆشێ» بەڵام بەلای ئێمەوە «بووشێ» ڕاستترە.
(٥) لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا، لاپەڕە ١٨١ بەم جۆرە نووسراوە:

دەم بەستەی تامی دوو لێوی ئاڵ بێ
دەماغ سەرخۆشی دوو لیمۆی کاڵ بێ
بەڵام عەشقی پاک، تاسەر ئەمێنێ
وجودیش نەبێ، ڕۆحت ئەژێنێ
ئەوی ناتوانێ، کە خۆی ڕابگرێ
خۆڵەمێش ئەبا، لەجێی ئاگرێ

***

## پیرەمێرد لەناو گوڵانا[*]

١٩٤٩

هەڵسە، وا گوڵان کەوتنە پێکەنین
با ساتێ لەناو گوڵانا بژین
یەکەم: (نەورۆز)ـە، دەرچووە لە خاک
لە عەشقی یاران شێت و یەخەچاک
سێ گەڵای جوانی، لەملاو لەولاوە،
هەرسێ تەڵاقی، دڵتەنگی داوە
(ئابی) و (ئاوداری) و (نیلوفەڕ)ی زەرد
حاشیەی دەوری وەک خاڵی بێگەرد
(گوڵە قەیسەری) بەرزە و ڕەنگاوڕەنگ
(لالە) و (شقائق) ئاڵ و شۆخ و شەنگ
(شەوبۆی) عەتر ئامێز، خۆش بۆی خۆش نەفەس
بۆ بەرگەردنی (مینایی) ئەنفەس



(گوڵە سوسەنان) نازک و نازدار
شفایە بۆ دەرد، (شەقشەقە) و (بیمار)
(فامیلیا)ی سپی، لە پای بەفراوان
لەنجەولارێتی، وەک کۆرپەی باوان
(چنوور) لە دەوری، حەلقەی بەستووە
ئەگەر پێی پیا نێی، پێتی گەستووە[١]
(گوڵە بەڕۆژە) عاشقی تەواوە
ئەسووڕێتەوە، ڕوو لە هەتاوە
(نیلوفەڕ) ئەویش، پەروەردی ئاوە
کە لە ئاوبڕا، بێ ئاو خنکاوە
(وەنەوشە)ی سەرشین، لەشوێن هەواران
گەردن کەچی غەم، دووری نازداران
(بەڕەزا) بەچین طوڕەی تاتاوە[٢]
با ئەیشەکێنێ، بەملاو بەولاوە
بەشکنجی زوڵف، خۆش قوماشەوە
تاتا پەخشانە، بەڕووی تاشەوە
(پەردە عروسی) لە پەردەی سوورا
ناز و نووزیە، بەسەر (چنوور)ا
گوڵی (بەیبوون) و گوڵی (مفرەح)
بۆنیان خۆشترە لە مسکی و قەدەح
گوڵی (سنەوبەر) گوڵی (یاسەمەن)
لەگەڵ (نەسرین) و گوڵی (نەستەرەن)
گوڵی (نیسان) و گوڵی (زەردەگوڵ)
پێکەوە ئەڕوێن، لەگەڵ (قرنفل)
گوڵی (خاشخاش) و گوڵی (کۆهکەن)
گوڵی (پایتونیا) ڕەونەقی چەمەن
گوڵی شاپەسەن، لالە عەباسی
(چەشمە خرۆش)، و (زوڵفی هەیاسی)
گوڵی (ئەسپەکی) و گوڵی (دووپشکە)
گوڵی (قەتارە) و گوڵی (گوێ مشکە)
گوڵی (ساقی سپی) و گوڵی (خەنایی)



(گوڵچینی) و (جەوهەر) (گوڵەخەتایی)
(خەتمی) و (گوڵ تەبەق) دوو شێوە و دوو ڕەنگ
باڵا وەک بەیداغ، درەفشی ڕووی جەنگ[3]
(لاو لاو) عاشقی، نەوبەرنەمامان
تێوە دەئاڵێ، سەر تا بەدامان
ئەمانە ئەڕوێن، لە خاکەکەمان
کەچی قەومەکەم، لە پایەی کەمان
بەهارمان خەزان، پێ هەڵخزانە
بۆ نەونەمامان، گەڵاڕێزانە
ساخوایە ئێمەش، تەنها تۆمان هەی
پەروەردگاری، کەرەمت بۆ کەی

---

(*) ئەو ناوانەی لەنێوان کەوانەکاندان هەمووی ناوی گوڵە.
(١) لای م. ه نووسراوە «پەنجەی پێی پیانای بەدی گەستوە» کە تێنەگەیشتم ماناکەی چییە ؟!.
(٢) ئەمە دەقی بەیتێکی شیعری مەولەوییە و پیرەمێرد ئاماژەی بۆ نەکردووە. بڕوانە دیوانی مەولەوی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ل٤٧٤.

«بە ڕەزا بەو چین توغرای تاتاوە
شەماڵ مشانۆش، بانێ وەی لاوە»

(٣) لای م. ه «درەخشی» نووسراوە. بەڵام «درەفشی» ڕاستە.

***

## دڵەم نەویوە[1]

١٩٤١

دڵەم نەویوە، دڵەم نەویوە
ڕەگی زیندەگیم، ئەم دیوە و دیوە
جەرگم، دڕکێکی، تێ هەڵچەقیوە
هیچ کەس، دەردی وا، سەختی نەدیوە
دوایی نەفەسمە، ساخودا هاوار
بینایی دیدەم، کوێری پیا لکا
تاقەت وەک فرمێسک، بەچاوما تکا
خوێن لە برینم، وەک سەیل سەر ئەکا
شووشەی ئومێدم، قڵپ بوەوە و شکا



زیندەگی دنیام، لێ بوە بەبار
گوڵم ناشتبوو، لە ساقی جوانا
پاراستم لەناو، سەرمای زستانا
ئەهاتنە سەیری، لەبەر هەیوانا
خۆم هەڵدەکێشا، لەناو یارانا
ئاخ چاوی پیسی، لێ کەوتبووە کار
لە پڕ بای خەزان، گەڵای هەڵوەران
وەیشوومە ساقی، ئەو گوڵەی شکان
ڕەشەبا لانەی، بولبولی ڕووخان
ئاگر خەرمانی، هیوامی سووتان
ناڵەم گەییشتە، لای پەروەردگار
پەنام بەتۆیە، شای دڵدڵ سوار
دەستێ بدەرە، قەبزەی زولفەقار
غیرەتی مەردیم، بۆ بخەرەکار
بدەن لە کەللەی بەدی نابەکار
(..............................)[2]

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.
(٢) بەداخەوە لە ڕۆژنامەکەدا ئەو نیوە دێڕە کەوتبوو.

***

## دانیشتبووین لەگەڵ یار

١٩٣٢

دانیشتبووین لەگەڵ یار
من سەرمەست و ئەو هۆشیار
بە تیلەی چاوی بیمار
دڵمی فڕاند بەیەکجار
شوێنی دڵ کەوتم ناچار
زۆری لێ پاڕامەوە[1]
ئاوڕێکی لێ دامەوە
کەوتم و هەڵنەستامەوە



تێکیەوە پێچامەوە
ئیختیاری بێ ئیختیار
ئنجا هاتە سەرینم
چاوی کەوت بەلەرزینم
گیان گەیبوە بەرینم
یەخەی لادا بیبینم
ڕووناک بوو دەر و دیوار
مانگ بەکەتان ڕازابوو
دوو دوگمەی ترازا بوو
دوونار لە نوور سازابوو
بالآ دەستی (بیضا) بوو
(نووری طور) لای تیرەوتار
هاتە گفتوگۆی یاری
بە شیرینیی گوفتاری
حەڵوای گەزۆ ئەباری
ئێجگار لێوی خاڵداری
ئاڵتر لە پەڕەی گوڵنار
ئاخ نازانن، دڵ چۆنە
لە برووسکەی سەر گۆنە
ئاگر بەربووە کای کۆنە
کەوتمە مەلە وەک سۆنە
خۆم خستە بەرپێی دڵدار
بە دوو زوڵفی وەک زنجیر(٢)
پێم بەسترابوو، وەک نێچیر
پێکەنی وتی ئەی پیر
وا تۆیشم هێنایە گیر
وەک جوانێکی بەختیار
پێم وت: پیری ئازاد بووم
قەلەندەری دڵشاد بووم



بەند نەبووم، بەندگوشاد بووم
قارەمانی، دێوزاد بووم
وا بۆ تۆ هاتمە ژێر بار
فەرمووی ئەو ڕۆژەی یەزدان
ئێمەی هێنایە مەیدان
ئەوسا بووین بەبناوان
بۆ سەرپەرشتی مێردان
ئێمە پیاو ئەخەینە کار
نەوەی پەرین، لە پێشین
ڕەگی دڵ ڕائەکێشین
بۆ لێ قەوماوان خوێشین
باری غەمتان ئەکێشین
هەم غەمخوارین، هەم دڵدار
گەر ئێمە نەبووینایە
پیاو چۆن ئەهاتە کایە
کەچی لای ئێوە وایە
جیهان هەر ئێوەی تیایە
خود پەسەند و دڵ ئازار
ئێمە حەز لە شەڕ ناکەین
بە هیوای خوێندن و چاکەین
نەتەوەی باش پەیداکەین
وێرانەمان، ئاواکەین
بە خوێندن ئەبین ڕزگار
ئەو مژدەیە لەو دەمە
لام هەناسەی مریەمە
چوومە ریزیان ئەو دەمە
خوا یاربێ ئەو سەردەمە
وەتەن دەکەین بەگوڵزار

(١) پیرەمێرد ئەوەندە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا تواوەتەوە کە وێنەی دووەمی ئەو شیعرە فۆلکلۆریەی

بەکارهێناوە کە دەڵێت:

چەندی لێ پاڕامەوە
ئاوڕی لێ نەدامەوە
ئەو ئاوڕەی لێی دامەوە
کەوتم هەڵنەستامەوە

(٢) پیرەمێرد لەکاتی خۆیدا ئەم بەشەی شیعرەکەی بەشێوەی لاتینی لە ڕۆژنامەی ژیانی ژمارە٤٤٧ی ساڵی١٩٣٥دا بڵاو کردەوە و ویستی نووسینی کوردی بەلاتینی پەرە پێ بدات. بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ پشتگیرییەکی نەبوو وازی لێ هێنا.

***

## بەستەی کوردی

١٩٣٢

وا بەیانە، گزنگی خۆر دەرکەوت
نمی شەونم، بەتیشکی ڕۆژ سەرکەوت
خونچە گوڵ، خۆ نواندنی بەرکەوت[١]
بولبولیش شۆڕی خستە ناو گوڵزار
لالە، تارایە بۆ پەری شاخان
فێنکی گیانە، بادی ئێلاخان[٢]
دەمی ئێوارە، سێبەری باخان
خۆشە بۆ یار و بادە و دڵدار[٣]
ئەم تەرانەی گوڵ و ملە گیانە
بێ تۆ لای من ژیانی زیندانە
جەژن و شادیم هەمیشە گریانە
من و بولبول بەجووتە زار و هەژار
فێری فرمێسکن، گوڵاڵەی دەورم
وا لەداخی تۆ، بێ وەفا ئەمرم
چاوەڕێم کەوا، بێیتە سەر قەبرم
بەهەوات زیندوو ببمەوە دووجار
لەبەهەشتا بەیادی تۆ شادم
بە تەماشای فریشتە ئازادم
جەننەت ئەفرۆشم ئادەمیزادم[٤]
بەنیگاهێکی دیدەیی بیمار



چونکە کوردم، بەناو و داو گوردم[٥]
مردبووم، کە بۆ بەهەشتیان بردم
وتم، ئەو عەهدەیە کەوا کردم
خاکی خۆم ئەوێ، بەهەشت بەچکار

...........................................

(١) لای م. ه نووسرابوو «بەکەوت» کە هەڵەیە.
(٢) هەروەها لە بڕی «ئێلاخان» نووسرابوو «لەیلا خان»، کە وا بزانم هەڵەیە.
(٣) نووسرابوو «خۆش بۆ یار و بادەیی سەر شار» کە نەمزانی مانای چییە؟!
تێبینی پیرەمێرد ئەم شیعرەی دووجار بڵاو کردۆتەوە بەم جۆرە:
١- ژیان ژمارە٣١٩ ساڵی ١٩٣٢
٢-ژین ژمارە ٧١٦ ساڵی ١٩٤٣
(٤) مەبەستی ئەوەیە کە ئادەم بۆ گەنمەکە بەهەشتی لەدەست خۆی دا.
(٥) لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا لاپەڕە ١٦٣ ئەم پارچەیەی شیعرەکە بڵاو نەکراوەتەوە کە چوار نیوەدێڕە و وا ئێمە بڵاومان کردەوە.

***

## خەڵکی هاواری

١٩٤٢

خەڵکی هاواری، چاوی بەدیانە
کەچی خەنیمی، من چاوی جوانە
شاعیر تەشبیهی، مانگ ئەکەن بە ڕووت
(سەرو)یش دائەنێن، لەگەڵ باڵات جووت
مانگ لە ڕاستی ڕووت، وجوودی نییە
(سەرو)یش، بێ بەرە، نموودی چییە[١]
بە لێوت ئەڵێن، یاقیقی ئاڵە
یاقیق بێ گیان و بێ حاڵ و خاڵە
یاقیق بەردێکە، هەر بۆ نەخش ئەشێ[٢]
لێوت گیاندارە و، ڕۆحیش ئەبەخشێ
دەم، دەمی عیسات، بووە بەهاودەم
ئەم گیان ئەدا و من، گیانی بۆ ئەدەم[٣]

ڕووی تۆ نەخشێکە (جەلال) دایناوە[٤]
سەیری سونعی ئەو، بێ نوقتە ماوە

---

(١) لای م. هـ نووسرابوو «سەرویش بێ بەرە بەکەڵکی چییە».

(٢) ئەم بەیتە بەداخەوە لای م. هـ نەنووسرابوو بڕوانە لاپەڕەی ١٦٤ی پیرەمێردی نەمری محەمەد ڕەسوڵ هاوار.

(٣) بەڕاستی ئەم بەیتەی پیرەمێرد زۆر شاعیرانە و وێنەیەکی ڕازاوەیە لەو جۆرە شیعرانەن کە پیرەمێرد خۆی ناوی نابوون «سەهلی ممتنع» واتە: ئاسانی گران.

(٤) لای م. هـ نووسرا بوو:
ڕووی تۆ نەخشێکە (جلال)ی ناوە
کە دیارە ئەمە هەڵەیە و هەم لە ڕووی ئاینیشەوە ناپەسەندە چونکە چۆن دەبێ بوترێ ڕووی تۆ نەخشێکە (خودای ناوە یا ناوی خوایە) دیارە هەردەبێ نوسخەی ڕۆژنامەکە ڕاست بێت کە ئێمە بەکارمان هێناوە و نووسراوە «ڕووی تۆ نەخشێکە جلال دایناوە» ئەگەریش جەلال نوقتەکەی لێ لابەرین دەبێتە (حەڵاڵ).

***

## تەفرە

١٩٣٢

بتزانیایە گۆڕە، سەرەنجامی ژینی تۆ
ئەرزێ لەژێر گڵا، قەد و باڵای سیمینی تۆ
نامێنێ خاڵ و میل و دەم و پێکەنینی تۆ
دڵت نەدەشکاندم

بتزانیایە، جامەیەکی جاو لەبەر ئەکەی
تەڵقینی کوێرەکانە، لە جێی دەنگی ئایی و نەی
لەو جێگە تەنگ و تارە، بەتەنهایی هەڵدەکەی
لە خۆت نەدەتەراندم

بتزانیایە، جوانی گوزەرگاهی پیرییە
مەرگیش کوتو پڕێکە دەوا ناپەزێرییە
دوایی ئەوی بەجوان ئەبڕێ دەستگیرییە
جوانیت پێ دەنواندم

بتزانیایە، دەست لەملانی کاتی بەیانیان
چەند خۆشە تا لە گۆڕ ئەخزی مەستی تێک خزان
چارەی بەبەزمی وایە غەمی گەردشی زەمان
دڵت نەدەشکاندم



## ناڵە[١]

١٩٤٩

ناڵە جێی تەنگ بوو لە دڵما، وتی جێی تەنگ نەنگە
چوو، گەڕا، هاتەوە، زانی هەموو دنیا، تەنگە
تووڕە بوو بوو لەفغان، ئەو بتی شۆخ و شەنگە
وتم هی تۆیە، ئەگەر تۆ نەبی دڵ بێ دەنگە
دۆستێکی ڕەحمەتیم وتی. دۆستیم لە کورد نەدی
خۆی چونکو ڕاست بوو، ڕاستی قسەی هاتە دی
بە ڕۆژ ئەڵێم، کە بەشەو، نوێژ ئەکەم و ئەیش خوێنم
لەداخی (والە) و (دام) ئەو ڕووە لە کوێ بێنم
ئەمەندە خۆشە قومار، تا هەناسە هەڵدێنم
درەنگی پێ دەچێ، هەڵدەگرێ خۆم بخنکێنم
ماچێکم ئەویست، لە لێوی بووکی دنیا[٢]
وتیان ئەمە یانسیبە نادرێ تەنیا
ڕام کرد کەبیتاقە وەرگرم، ئەو کێشرا
دنیا بۆ دەنی دەرچوو، بلوێری ژەنیا
هاتمەوە و[٣] زۆر ناسیاو هات بوو بەدۆست
دۆستی چی؟! ڕوانیم کە چاویان وا لە پۆست
هەر شەوێ بستێ لە پۆستیان کەندم و برد
هیچ نەبێ خۆ مامەوە، بێ دۆست و پۆست

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە. ئێمە لە (ژین)ی ژمارە ٩٨٣ی ساڵی ١٩٤٩وە وەرمان گرت.

(٢) نازانم چۆن پیرەمێرد حسابی کێشە شیعرییەکەی لێ تێک چووە و شیعرەکە تێکەڵە لە کێشەکانی ١٤، ١٣، ١٢، ١٠، ١١.

(٣) مەبەستی لە گەڕانەوەیەتی لە تورکیا لەساڵی (١٩٢٥)دا

***

## موعەمما

١٩٤٩

شێن و میم لەگەڵ، هەڵی بواردم
شێخ حەفصە[١] گەنمیساڵی بۆ ناردم
ئەمە گەنمەکەی حەوا و ئادەمە
دەرسێکە بۆ ئەم بەنی ئادەمە
حەوا گەنمی خوارد دەرچوو لە جەننەت
ئەم بەخشی، کەوتە جەننەت بێ مننەت
خواردن و بەخشین، بەریان لە کوێیە
بەخشندە و ماڵدار ناویشیان جوێیە

..........................................................

(١) شێخ حەفسە: حەپسە خانی نەقیب: کە بەو شێوەیە یارمەتی پیرەمێردی داوە وە ئەم شیعرە لای م. ه بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## دڵ بەندی[١]

١٩٤٩

دڵ لە بەندی جگەرا، تاسەیی ڕووت ئەنوێنێ
هاتە ناو چاومەوە، تا ڕاست و ڕەوان بتبینێ
سەبر ئەوا هاتۆتە سەر ڕێی، ئەیەوێ بەندی کا
ئاخ تیلایی چاوم ئەیەوێ پەتی بپسێنێ
من کە ئاوارە نیگەهێکی دەبینم بۆ خۆم
ئاگرێکە ئەیەوێ کسپە لە جەرگ هەڵسێنێ
چوومە (پیراڵک) و تۆبەم لە هەوای جوانان کرد
جوان بەرەو پیرێ کە هات، تۆبە بەپیر ئەشکێنێ
شاعیری کۆن کە ئەڵێ، سەر و قەدی مەه ڕوخسار
بەو دوو تەشبیهە نەزاندوویی خۆیی ئەنوێنی
سەرووی بێ سەر، مەهی بێ لەش چ وجودێکی هەیە
خۆی لە ئاستی سەر و قەدی ئەوا هەڵشرنگێنێ



ماری زوڵف، زەرکی موژە، قەوسی برۆ، چاڵی چەنە
ئەمە گوایە سیفەتی یارییە، گوایە ئەمترسێنێ
زوڵف بڕاوە خەتی لێو باوی نەما، تاشراوە
کۆنە لۆتی، لە گەڕایە، دۆم مەلەک ئەدوێنێ

..........................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## زەمهەریر[١]

١٩٥٠

بەفری سپی، کە ڕۆژی ڕەشی، بێ تفاقیە
هێند خوێنی ساردە، ڕووسپییەکی، سوقاقیە
ڕووی وەک خەڵووز بێ، دار و خەڵووزمان گران ئەکا
عالەم وەکو هەتیو، لە دەستی زاقەزاقیە
وا ڕێوی پێستە تووکنەکەی هەڵگێڕایەوە
کردی بەکەوڵ و کەڵکی نەبوو، واقەواقیە
گوارەی چلەی چلوورەیە، بۆ خاتوو زەمهەریر
گوێسوانە بەستی، بەسیەتی نۆرەی تەڵاقیە
لەولاوە پارەدار شەوی پێ ڕۆژ ئەکاتەوە
مێزی قومار و دەنگی قەتار دەوری ساقیە
ڕۆژێک ئەبێ ئەمانە (طي السجل) هەمووی
هەڵپێچرێ و بڵێن ئەمە (يوم التلاقى)یە
ئای بۆ ئەوەی کەئەمرۆ بەشی خۆی لەپێشەوە[٢]
نارد و، ئیتر ئەمینە کە گەنجێکی باقیە

..........................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.
(٢) واتا ئەوی کە لەم دنیا داوای خوای خۆی بەجێ هێناوە لەو دنیا دڵنیایە.

***

## بەیادی (ملک الشعرا) ڕەمزی[1]

١٩٥٠

دڵی دڵ ڕاگرە، چونکو لەگەڵ تۆ، کۆنە یارێکە
دەمێ هاودەم بە، بەڵکو پێت نەڵێن ئازردەکارێکە
لە واپۆڕا[2] کەسەیری ئاوی دەریام کرد، بەدڵ پێم گوت
هەزاران ئافەرین، وەک ئاوی چاوم، چەشمەسارێکە
بەئەگریجەی ڕەشی ڕووی بەرگی ماتەم پۆشی ئەفسوونە
وەفا کاری دەکا، بۆ کوشتوانی، تەعزێدارێکە
کە زوهرە دێتە بورجی نازو تاجی، زەڕ[3]، لەسەر دەگرێ
خەڵووزە دڵ دەسووتێنێ، چە نوورێک و چە نارێکە
حەیاتی تاڵ، دەردی شەکەرم[4]، شیرینە لا، چونکو
بەیادی گفتوگۆی شەکر لەب و، شیرین شکارێکە
وەرە، هاوشانی من بە، با قەدت، باچەوت نەکا گیانە
قەدی من وشکە دارێکە، بەلام پارێزگارێکە
کە، با، بێ مایەی ژین، با کەبابێک بێ خۆراکی من
کەبابێکم، کە ئاگریشم، بەڕووتم، شوعلەبارێکە

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ھ دا بڵاو نەکراوەتەوە، هەروەها پیرەمێرد لەم شیعرەدا ویستوویەتی لاسایی شیعرێکی (شێخ أبو الوفا)ی کوردی بکاتەوە، کە لەسەر هەمان شێوە وتوویەتی وە پیرەمێرد لە کاتی خۆیدا ئەو شیعرەی (شێخ أبو الوفای) بڵاو کردۆتەوە، بەلام نەینووسیوە کە ئەوە شیعرێکی فارسی (شێخ أبو الوفا)یە.

شیعرەکە وەها دەست پێ دەکات:

گۆڕینەکەی پیرەمێرد:

«بەڕوویا زولفی پەخشان کردووە، لەیل و نەهارێکە
لە شەودا ڕۆژی پەنهان کردووە، شێوەی عوزارێکە»

دیوانی پ.م ل٣٠٢

دەقە فارسییەکەی شێخ ابو الوفا:

«کند افگندە بر رخ زلف را، لیل و نهار است این
فروزان کردە در شب آفتابی را عذار است این»

یادی مەردان ب٢ ل٣٣٠

تەواوی ئەم دوو شیعرە لە بەشی گۆڕینەکانی پیرەمێرددا دەنووسین.

(٢) واپۆر: پاپۆر، کەشتی.



(٣) زەڕ: تەلا، زێڕ، ئاڵتوون.

(٤) مەبەستی لە نەخۆشی شەکرەیە کە تووشی هاتبوو.

***

## خواپێداو

١٩٣٧

لەبەغدا کۆشکێ، لەکەناری شەت[1]
باغی پڕ بولبول، شەتی پڕ لە بەت
چیمەن زارێکە، گوڵ و پەرژینە
هەرچی هات جۆشی بەهەڵپەڕینە
لێی ڕاکشابووم، بەخەیاڵەوە
بەشکو پەری بۆم بێتە ماڵەوە
ناگا چوار پەری، چوار دەوریان لێ دام
سفید پۆشێکیان، بەناز هاتە لام
بەتیلاییەکی، چاوی بیماری
دڵم ئەنگێورا، دەردم بوو کاری
من بەشەرارەی ئێشی زامەوە
لەبەر پێی ئەوا، ئەتلامەوە
لەپڕ قەهقەهەی، فریشتەی سەوزپۆش
گەییە سەروەختم هێنامیەوە هۆش
وتی: بەم پیرییە، چیت لە جوانانە
ئەکەویە داوی خاڵ و لەرزانە
وتم هەر پیرە، جوان تێک ئەبەستێ
نەمام بەداری، پیر، ڕائەوەستێ
وتی نامەوێ، تۆ نەمامگیر بی
بۆ ئەوە چاکی، نیشانەی تیر بی
تیرێکی هاویشت، لە برژانگەوە
وەک تیری شەهاب لە ڕووی مانگەوە
هات دای لە جەرگم، وامزانی مردم
جلە تازەکەی خوێناوی کردم
ئەو ڕۆیی ئنجا پەمەیی پۆش هات
ئەویش تیرێکی کردم بەخەڵات

وتی خۆت بگرە کافر بەگیری
پیری و بۆ ئێمە، کوڵەکەی تیری
وتم، تیرێکت لە جەرگی پیردا
سادەی تیرێکی تر بەشوێن تیر دا
بەم سێ تیرەوە دڵم نە ئەسرەوت
خوا دای زەرد پۆشێ، لەولاوە دەرکەوت
بەو بالای ئالای سەروی نازەوە
بەو چاوە بازەی عیشوە بازەوە
تریقەی قاقای، زیندووی کردمەوە
ئێشی خەدەنگی لەبیر بردمەوە
بەمیهرەبانی هات بەلامەوە
دڵخۆشی دەوای زامی دامەوە
بانگی کرد هەر سێ پەری کوشندە
هاتنە سەرینم بەعیشوە و خەندە
وتیان، هەرچەند خوێن کەوتە بەینەوە
ئەمجارە هاتووین، ئاشتت کەینەوە
دەست لەمەلان و گەردن ئازایی
کردمانە کەیف و بەزمی چا و شایی
چایی لەسایەی، گەردنیا دیار بوو
حۆری بەهەشتیان، لا خزمەتکار بوو
سیانیان دەربارەی من لوتفکار بوو
بەلام یەکێکیان، لەپێناو بێزار بوو
خوا تۆڵەی ئەویش لە بەد بستێنێ
دوژمنی جنسی لەتیف نەمێنێ
بەدەست لەملانیان بوومەوە بەکوڕ
سەرچۆپیم کێشا بەعەشق و بەگوڕ
بەدەماغەوە، ئەمگوت شا کێیە؟
بۆ کەس نەلواوە، ئەم هەڵپەڕکێیە

(١) نازانم پیرەمێرد بۆچی لێرەدا خۆی تووشی ئەو جووتە قافیەگران و ئێسک قورسە کردووە.



## شێخ لەتیف کلێشەی (ژین)ی ناردووە

١٩٣٩

«شێخێکی لەتیف[1] بەلوتفکاری
کلێشەی ژینی، ناردووە بەدیاری
(ژین) بەفەخرەوە، نایە سەر وەک تاج
بەو خەتە جوانە، ئەگاتە ڕەواج

(١) مەبەست شێخ لەتیفی دانسازە.

***

## بەیادی کۆن

١٩٣٩

خۆزگە یار ئەبوو بەخاوەن قەرز لێم
بۆ هەر کوێ ئەچووم ئەهاتە سەر ڕێم
یار لەناو ڕەزا، سەیری ترێی کرد
بۆڵێکم لێ خوارد مەست بووم دەستوبرد
بەیادی چاوی بادامی لەیلام
خوێنی بەدەنم بوو بەڕۆن بادام
فرمێسکم بۆ ڕووی لە بەرد تکا بوو
بەرد بوو بەشووشە گوڵاوی تیا بوو
مانگیش لەیەکتر کەوتوونە گزی
ڕەمەزان جەژنی لە شەوال دزی[1]
عەشرەی مەحەرەم کە جەژنی نووحە
بۆ شیعە بووە بەشین و نووحە[2]
سوێند ئەخۆم هێشتا من تۆم نەدیوە
لەگەڵ تۆ شێت بووم هۆشم پەڕیوە

(١) ڕۆژەکانی جەژنی ڕەمەزان ئەکەوێتە مانگی (شەوال)ەوە کەچی جەژنەکەش بەجەژنی ڕەمەزان بەناوبانگە. پیرەمێرد ئەم وردەکاریەی لە هەڵبەستێکی مەولەوییەوە وەرگرتووە، کە ئەڵێ:

ڕەمەزان طلوع صبح شادیشەن
شوال شام شووم نامرادیشەن

دەردینە شوال ئای زام سەختە من
تاڵە شووم شوال ئای بەدبەختەن من
غورە غورەی ئەو، سەفاش پەی غەیری
ئازیز قیبلەی من، وەفاش پەی غەیری

واتە: مانگی ڕەمەزان بەدەرکەوتنی بەرەبەیانی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان شادیەتی چونکە ڕۆژەکانی جەژن لە خۆی نییە و کەچی بەناوی ئەویشەوە بەناوبانگە، ئای لە دەردەداریی مانگی (شەوال) و من. ئای لە بەدبەختی هەردووکمان. سەری مانگ هی شەوالە و کەچی خۆشی و ئاهەنگەکەی بۆ ڕەمەزانە. ئازیزیش کە قیبلەی منە و ئەیپەرستم کەچی وەفای بۆ بێگانەیە. وەکو پیرەمێرد ئەڵێ مانگەکانیش کەوتوونە گزی کردن لە یەکتری و لەیەک ئەخۆن.

(٢) نووحە: نیازی لەو شین و شەپۆڕەیە کە شیعەکان بۆ حسەینی کوڕی عەلی ئەبی تالیب ئەکەن بەهۆی کوژرانییەوە لە کەربەلا. م. ه.

پیرەمێرد لەو هەڵبەستەیدا لەسەر پێڕەوی شاعیرەکانی کۆن خەریکی وردەکاری بووە و بۆ وشەی پڕ لێکدانەوە گەڕاوە و بەکاری هێناوە بەتایبەتی لە دزینی جەژنی ڕەمەزان لەلایەن مانگی ڕەمەزانەوە. لە دوا دێڕی هەڵبەستەکەدا بەئاشکرا دان بەوەدا ئەنێ کە ئەم هەست و سۆزەی کە لە سەرەتای هەڵبەستەکەیا گوایا بەرامبەر جوانێک دەری بڕیوە لە دوا دێڕی ئەو هەڵبەستەدا وەکو تەمی بەهار بەتیشکی ڕۆژ ڕەواوەتەوە، لە خەیاڵ بەولاوە هیچی لە کەللەدا نەماوە. ئەمەش ئەو ڕاستییە دووبارە ئەکاتەوە کەلەمەوبەر لێی دواین دەربارەی نەبوونی ژنێکی تایبەتی لە ژیانی پیرەمێرددا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا وەکو تەمورەی عەشقی دڵدارێکی هەرزەکار مرۆڤ ئەخاتە جۆش و خرۆش و لەگەڵ ئاوازی دێڕەکانیا پیاو بەخەیاڵ ئەفڕێ.م. ه

***

## کۆترە باریکە

١٩٣٩

کۆترە باریکەی خاڵ و میل ڕەنگین
لانەت لە پۆپەی دارتوبای بەرین
(حق و هوت) نەغمەی جبریلی ئەمین
بە گونای ئادەم کەوتە سەر زەمین
من و تۆ ڕشتەی بەینەت لەمل بووین
نەشیدەخوانی خونچەی یەک گوڵ بووین
سەرمەستی نەشئەی بادەی یەک مل بووین
زادەی سروشتی، یەک ئاو و گڵ بووین
کاتێ یەک باڵ و یەک ماڵ بووین لەدەشت
چینەمان ئەکرد، لە دەشت وەک بەهەشت
لە ناکاو دانەی بەدبەختیمان چەشت



لانەمان ڕووخا بەبای شوومی وەشت[1]
هەردوو گرفتار، داوی یەک سەیاد
من لە داخاو تۆ، لە شاخا ناشاد
دەست بەستەی بێداد چەرخی کەچ بنیاد
نەمردین دیمان ئەم جەژنەی ئازاد
ئەمبینی هەودای داوی نەهاتی
هۆنراوەی پەنجەی چەند هاووڵاتی
دڵسۆز بووم سۆزم، ئەدی لەباتی
هەڵۆ پەڕی خۆی بوو بەخەڵاتی
ئێستا کە دەوری دەوران وەرگەڕا
مانگای گەڵباخی مردوو دۆ بڕا
ژورناڵ، فۆڕمە، تەپڵ، هەرسێکیان دڕا
نازانم پیاوی بەد چی پێ بڕا

(١) لای م. ه نووسراوە: «لانەمان ڕووخا بەبای شۆڕی دەشت» کە مەبەست نادا بەدەستەوە.

***

## بۆ «شێخ سەلام»ی شاعیر

١٩٣٩

«سەلام، تۆ، شیعرت، لەمن باشترە
تا لە دوورتر بی، ناڵەت خۆشترە!»

***

## وا گوڵ بەسەرچوو

١٩٤٠

وا گوڵ بەسەرچوو، بولبول شەیدا بوو
گڕێک لە ناڵەی دڵی پەیدا بوو
گڕەی بەردایە، سەوزەی بەهاران
شێوا وەک زوڵفی چەمەرەداران
منیش کەمێ شۆر بولبول لەسەردا
سەری خۆم ئەنێم بەدەشت و دەردا

گەرمای هاوینم، بۆیە لا خۆشە
بەتینی سۆزی دڵ بەپەرۆشە
ئەو گڕ و تاوە، دڵ دەجۆشێنێ
بەیادی یاران تێر ئەم گرێنێ
چەند خۆشە یادی هیجرانی یاران
فرمێسک بەچاوما بێنێ وەک باران
ڕشێنەی فرمێسک دڵ ئاورشێن کا
شینی عەشق هۆشم بێ سەر و شوێن کا

***

## کەوتە کڵێشەم

١٩٤٠

کەوتە کڵێشەم، کەوتە کڵێشەم
شەوێک سەودای لەیل کەوتە کڵێشەم
پەروانە ئاسا ، تەوافی ڕووی شەم
تێکی هەڵشێلا هۆش و ئەندێشەم
ژاری پەژارەی بێ سامانمە
بەزۆری شۆری سەودای پڕ سەودا
ڕوو بکەمە کۆی یار لە نیوەشەودا
سەرگۆنای ماچکەم لە شیرین خەودا
هەرچیم بێتە ڕێ لە ڕێگەی ئەودا
خواست و ئارەزووی دڵ و گیانمە
بەرگی شەوگەڕیی نیلیم کردەبەر
(پەرەبلۆم)م[1] لێ بەستە کەمەر
جامانە و چەفتەی سورمەم نایەسەر
وەک شێری شەرزە لەلان هاتمە دەر
ئەمشەو لە مەرگ و ژین قەیرانمە
تیپی زیندەوەر یەکسەر کش و مات
کەڵەشێری عەرش قوقووی نەدەدات
شەوی دەیجوور بوو مانگ هەڵنەدەهات



هەنگاوم نایە ڕێی هات و نەهات
بە قەڵەم بازی عەشقی جانانە
ڕێگام لێ بوو بوو بەهەردەی دوجەیل
تا خۆم گەیاندە ئاستانەکەی لەیل
دڵ لە ئەندێشەی ترس و هەوا کەیل
گەیمە خوابگای جانانەی پڕ مەیل
سامی وەک پایەی عەرشی ڕەحمانە
بێ خشپە و بێ هەست گەیمە سەرینی
بە نەشئەی شێتی هیچم نەبینی
دەمم گەیانە خاڵی جەبینی
ڕاپەڕی وتی: تۆ کام بێ دینی
چۆن گەیشتیتە ئەم جێیە و مەکانە[2]
سەری هەڵبڕی چاوی بەمن کەوت
یەخەی دادڕی بەیانی دەرکەوت
سفیدەی بەیان سەر ڕەشی شەو کەوت[3]
هێندەی جنێو دا ، تووڕەیی سەرەوت
جنێوی بۆ من بوو بە بەهانە
وتم: جنێوت خەڵاتە بۆ من
کەمەندی سەودای تۆم کەوتە گەردن
وام ڕائەکێشێ بێ باک لە مردن
زیندەگانی خۆم لێ بوو بەدوشمن
ئەگینە چیمە لەم هەوڵدانە
وتی من چی بکەم ئەمە حاڵمە
بەدەست من نییە خەڵک عەودالمە
هەمووی ئاشووبی چاوی کاڵمە
خەتای تۆ نییە فیتنەی خاڵمە
ئەگینا من چیم لەم ئەزێتدانە؟!

---

(١) پەرەبلۆم: واتا دەمانچەی پەرەبێل. یاخود جاران ئەیانوت: پەرە بلۆ، جۆرە دەمانچەیەک بووە.
(٢) لای م. ه ئەم نیوە دێرە بەهەڵە نووسراوە

«چۆن گەیشتیتە ئەم جێ و مەکانە» دیارە کێشەکەی لەنگە
(٣) ئەم نیوە دێڕەی لە بێسارانییەوە وەرگرتووە کە دەڵێت:
«حەکاکان دەور گرد بەیانەوە
کێ دیەن مەغریب وە بەیانەوە!»

***

## کای کۆن

١٩٤١

لەبیرتە شەوێک هاتیە لام
بۆ دڵنەوایی و تەسەلام
بە زوڵف و خاڵت سوێندت دام
کە تا دەمرم تۆ بی لە لام
ئنجا لێوت لەسەر لێو نام
ئێستاش لەسەر ئەو پەیمانەم
هەتا ئەمرم ئەو دێوانەم
گیرۆدەی ئەو زوڵفە جوانەم
سیا بەختی ئەو خاڵانەم
تێم گەیشتووی چەند بەوەفام
ژین ئەوەیە عەشقی تیا بێ
دڵ ئەوەیە بەسەودا بێ
سەر پڕ لە شۆری لەیلا بێ
نەک کوولەکەی پڕ لە با بێ
ئۆف شێتی چەند خۆشە لەلام
عەشقی پاک نوورێکی خوایە
ئیلهامی شیعری سەمایە
تەجەلای ڕۆحی تیادایە
وەسڵی بەهەشتی لە دوایە
وەتەنە بەهەشتی دنیام

***



## پەروا

١٩٤٢

ئێستا خەو بۆیە نایەتە ناو چاو
جێی ئەو نەماوە پڕ بووە لە ئاو
بۆیە نایەڵێ کە خەو ببینم
با بەخەویش بێ نەک ئەو ببینم
دوو چاوم هەیە یەکێ چاوی سەر
کە بۆ ڕێگای دوور پەنای دێتەبەر
بەڵام چاوی دڵ بۆ دوورە مەنزل
هیچ مانعێکی بۆ نابێ حاسڵ
ئەگەر ئەو پەروای چاوی سەر ئەکا
چاوی دڵ هێندە تیژە سەر ئەکا
من لە خوام ئەوێ ئەو خۆی نەنوێنێ(١)
وەسڵ گڕی عەشق دائەمرکێنێ
لەزەتێکی وام لە عەشق دیوە
موڵکی ئازادیم بەوە کڕیوە
بە عەشق ئازادیم بۆ هاتۆتە دی
وەسڵ، نامخاتە ژێر باری مادی
من بەعەشق و ئەو، بەحوسن ئەخوڕێ
هەر جوانە لە شوێن عاشق ئەگەڕێ
ئەگەر مەجنون و فەرهاد نەبوایە
لەیلا و شیرین چۆن، ئەهاتنە کایە
بەڵێ تا عاشق ڕۆژی وەک شەو بێ
ئەبێ بەیانی ڕوخساری ئەو بێ

........................................

(١) لای م. هـ بەهەڵە نووسراوە: «من لە خوام ئەوێ ئەو خۆی بنوێنێ» ، کە ئەمە پێچەوانەی مەبەستەکەی شاعیرە، چونکە ئەو دەڵێت، با خۆی نەنوێنێ و نەیبینم و پێی نەگەم چونکە گەیشتن پێی گڕی عەشق ناهێڵێ.

***

## چوارین

١٩٣٩

**«بۆ خۆمە، کەس نەیباتە سەرخۆی»**

«پیرەمێردێ، کە پەرییە، کۆڵی (نۆما)یەکی تۆڕ
کەوت و بۆ (ماین) کەوتە، خەفەت و شین و شەپۆڕ
پێم وت، ئیتر بەسە، بۆ ناسرەوی، دنیات زۆر دی
وتی: بۆ پیر و جوان، هەوڵی جیهان، تا دەمی گۆڕ»

***

## هاپیر کەوت(١)

١٩٤٣

ناڵەم نایەڵێ، کەس بنوێ بەشەو
نەک بنوێ یارم ببینێ بەخەو
من پیرم بۆیە، ئەوێ کە دەرکەوت
بکەومە بەرپێی بڵێن ها پیر کەوت
لەناتەوانیش وایە مەبەستم
کە لەلای کەوتم، نەتوانم هەستم
بۆیە ئەو لە پڕ شەو دێتە خەوم
بە (گەشکە) بمرم، لە کۆڵی کەوم
کەچی نازانێ کە عەشقی منە
ئەوی کردووە بەم شۆرە ژنە
ئەگەر من نەگریم لەو بەردەرگانە
کێ دەزانێ ئەو ئەوەندە جوانە
هەموو کە ئەڵێ لەیلی جوان نەبوو
بە شۆری مەجنون وا ناوی دەرچوو
ئێستا شۆری عەشق بوو بەئەفسانە
بە یەک گەیشتن بەدەست خۆیانە
لەو ساوە مۆدەی شەرم نەماوە
مارەی کچ لەگەڵ پرچی براوە

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بلاو نەکراوەتەوە.



## مرواری(١)

١٩٣٩

چاوم کە ریزەی دانی تۆی بینی
فرمێسکم رشتەی مرواری هۆنی
تا بگریم بەدڵ رووناک ئەبمەوە
بە ئاوی چاوم خۆم پاک ئەبمەوە
چاوم لەدووریت ئەگریا بەکوڵ
گریان بەزەیی چاوی کەوتە دڵ
کە ئاگر دڕکی تەڕ ناسووتێنێ
رەحم بەحاڵی تەڕی ئەنوێنێ
ئەڵبەتە خودا رەحمی زیاترە
بۆ ئەو کەسانەی داوێنیان تەڕە

(١) ئەم شیعرە لە جیهانی شیعرەکانی مەولەوییەوە زۆر نزیکە. جا نازانم شیعرەکەی وەرگرتووە یاخود بیرەکەی دارشتۆتەوە!! لای م. ه بلاو نەکراوەتەوە.

***

## لاسایی گوڵەوە چنی(١)

١٩٣٩-١٩٤٣

ئەو تیرەی رۆستەم، چەسپاندیە کەوان
دای لە رۆبیتەن، بێزراندی لە گیان
منیش ئەو تیرە و کەوان و شەستە
ئەو زۆری بازوو، ئەو هێزی دەستە
بە تەوژم هات، درا لە جەرگم
خوێن قەڵبەزەی بەست گۆڵگون بوو بەرگم
بەو برینەوە، پێچم خوارد بێ دەنگ
رۆژی رووناکم. بوو بەشەوەزەنگ

من مات و بێ دەنگ هەتاکو توانیم
فەلەک ئەگریا بۆ نەوجوانیم
لە دەردی عەشقا، کە خاوەند سەبری
تۆ نەگریت مەعشووق، بەدڵ بۆت ئەگری
وەک شەهیدی عەشق، کەوتم لەسەر پشت
لەگەڵ ئەو خوێنە، جواناوم ئەڕشت
شادم کە کوشتەی دەستی دڵدارم
ئەو تیرە بووە بەیادگارم
ئەڵێن بێ زەخمی تیری مەهـ پەیکەر
نەنگە ڕوو بکەیتە، مەیدانی مەحشەر
من بەبرین و تیر و خەدەنگی
بێ دەنگ ڕووم کردە مەحشەر بێ نەنگی
بە سۆزی عەشقم لێم بوورد کردگار
ئەمە سەر مەشقە بۆ عاشقی زار

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی دووجار بڵاوکردۆتەوە ساڵی ١٩٣٩-١٩٤٣. هەروەها ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## کاریکاتێر بەشیعر

١٩٣٤

(زێوەر) کە ئێستا، پەڕەسێلکەیە
تازە (گۆران)مان، لەسەر هێلکەیە
گۆیژە کون دەکەن، دائرەی ئیشغال
(همة الرجال، تقلع الجبال)
بۆ قەشقۆڵی چوو، (مستەفا سائب)
ئەڵێی فەقێیە و ئەچێ بۆ ڕاتب

***



## وامزانی

١٩٤٣

وامزانی کە من دڵم دا بەتۆ
دڵی تۆش بۆ من ئەبێ بەمەکۆ
چی بکەم دڵەی شێت تووشی تۆی کردم
بەسەودای بێ سوود لە ناوی بردم
تۆش تێگەیشتی دڵ وا دوشمنە
ئیتر لەلای تۆ، بوو بە گای بنە
ئەگینا ئەگەر دوشمن نەبوایە
نەت ئەهێشت بێتە ئەو بەر دەرگایە
بەڵام گیانەکەم مادەی تۆ بۆشە
لە تێکەڵیدا هەر ڕاستی خۆشە
دڵی ئەڵماسی بێ گەردم ئەوێ
شتێ ساختە بێ زوو دەرئەکەوێ
توخوا حەیف نییە وەک ئەڵماس جوان بێ
بە ژەنگی خوێنی عاشق پەنهان بێ
دڵ بفڕێنی، بەدخووی کەی، وەک خۆت
ئەم جەور و زۆرە خێری چییە بۆت
چی دەبێ ڕۆژێک ئەگەر هی من بێ
دەست نەوەشێنی و ساتێک هێمن بێ

***

## ئێشی دیدەی تۆ

١٩٤٣

دیدە، دیدەی تۆ، دیدە، دیدەی تۆ
با گەیاندیە گوێم، ئێشی دیدەی تۆ
دیدەی شابازی خۆش پەروازی تۆ
دیدە نموونەی عیشوە و نازی تۆ
قولاپی جەرگی ئەوەی ئەتبینێ
ئیتر خودگیریت لە لا نامێنێ

ئای جەزبەی چاوت چەند بەتەئسیرە
بە نیگایەکی دڵ چەند ئەسیرە
حەیفە ئەو چاوە لەبەر چاو نەبێ
دڵی عاشقان پێی بەداو نەبێ[1]
شێتی چاوت بووم چوومە میری سوور[2]
دوعام بۆ کردی لە نزیک و دوور
چاوی چڵکنە لێت کەوتۆتە کار
بە (إن یکادوا)[3] بۆت کەوتمە هاوار
کاشکی دوکتوری چاو بوومایە من
ڕەگی چاو یەشەم ئەکێشا لەبن
دەرمانی لای خۆم ئەدۆزیەوە
بێم چاوت ماچ کەم چاک ئەبیەوە

(١) ئەم شیعرە هەتاکو ئێرە لە شیعرێکی هەورامی وەرگێڕراو دەچێت. ئێمە دەقەکەمان نەدۆزیەوە. بەڵام لەوە بەدواوە دیارە شیعری پیرەمێردە.

(٢) میری سوور: مەزارێکە لە ناوچەی شارباژێڕ نزیکی گوندی (ئەحمەد ئاوا) ئەوانەی کە تووشی نەخۆشی ببوونایە جاران ئەیانبردنە سەر ئەو مەزارە گوایا بەوە چاک ئەبێتەوە. م. ه

(٣) وإن یکادوا: سەرەتای ئایەتێکی قورئانە کە ئەڵێ «وإن یکادوا الذین کفروا». گوایە ئەم ئایەتە بۆ چاوەزار باشە لەبەر ئەوە نووشتە نووسەکان بۆ چاوەزار ئەو ئایەتە لە نووشتەکانیانا ئەنووسن.

***

## گیانە بەسیەتی

١٩٤٤

گیانە بەسیەتی، گیانە بەسیەتی[1]
توخوا بەسیەتی دەرد و مەینەتی
هەر هێندە ئەبێ تووشی و نەگبەتی
قنیاتم تەنها ژاراوی پەتی
لە نەحسی چارە و بەختی گومڕاهم
عالەم بێزارە لە ناڵە و ئاهم
ئەجەل قولاپی گیرکرد لە جەرگم
نیشانم ئەدا نیشانەی مەرگم



ئەوا هەناسەم کەوتە ژمارە
هێندەم نەماوە وا ئەمرم دیارە
توخوا وەسیەتم ئەمەیە لەلات
بەیادی عەشقی بەندەی جانفیدات
کاتی کۆچم کرد بۆ هەوارگەی نۆ
ئاوام کردەوە مەنزڵگای گڵکۆ
ئەوسا دیار نابم لەبەر دەرگاکەت
چۆڵ ئەبێ لە من سایە و پەناکەت
بزانە هەی لەیل قەیست مردووە
حەسرەتی ڕووی تۆی بۆ خاک بردووە
من لەوێ تەنها پەژارەی تۆمە
چە باکی چۆڵی و ساردی گڵکۆمە
تۆش سا بێ باک بە لەتانەی ئەغیار
وەرە سەر قەبرم بۆم بگری جارجار
بڕوانە قەبرێک لە قەبران تاکە
بەردی وەک خەڵوز خاکی نمناکە
ئەوە شەرارەی قرچەی تاسەمە
تەپەدووکەڵی شوێن هەناسەمە
فیدات بم گیانە، من داغ بردەی تۆم
توخوا دانیشە کەمێک لە گڵکۆم
تۆزێک بۆم بگری گوێم لە دەنگتە
لەگەڵ فریشتەی منا جەنگتە
دڵۆپی فرمێسک لە چاوت تکا
بەو فرمێسکەی تۆ خوا عەفوم ئەکا
تۆش وەفاداری لەگەڵ جوانی
بۆت ئەبێ بەناو فەخری جیهانی

(١) ئەم شیعرە تەواو تام و بۆی چەند شیعرێکی وەلی دێوانەی پێوەیە تەنها لە سێ بەیتی دوایی شیعرەکەدا قەڵەمی پیرەمێرد دیارە.

## شینی زین بۆ مەم[1]

١٩٣٤

هەی ڕۆ ئەمڕۆ ڕووی، شین و ڕۆڕۆمە
کە مەم ڕۆیی ڕووی، پەژارەی خۆمە
ئەم زوڵفە لوولەم، بۆ مەم شانە کرد
دەک فەلەک کوێر بێ، بۆنێکی نەکرد
ئەم خاڵ و میلە، من بۆ مەمم ڕشت
پەیمانم وایە، بۆی بەرمە بەهەشت
لێوم دانابوو، بۆ گفتوگۆی مەم
عەهدە تا مردن، واتەی پێ نەکەم
توخوا مەم، منت لە کوێ پەیدا کرد؟
گوناهم چی بوو، منت شەیدا کرد؟
هەر کەس هاوسەرێ، بۆ ژیان ئەگرێ
منت بۆیە ویست، لەبەرت مرێ
هەی خەجاڵەت بی چەرخی پڕ ستەم
هیچ شەرمت نەکرد لە نەوجوانی مەم
مەم لەژێر خاکا، بەمیوانت بم
بە برامەوە بەقوربانت بم
ناچارم بێ تۆ، ژیانم نابێ
وا بڕیمەوە، هەر ئەبێ وابێ
لەناو دوخمەدا، دوو جێگا ئەبێ
زاوا و بووکێنی، لە خاکا ئەبێ
ئای مەم، دەستی مەم، نەگەیشتە تۆ
وا نووکی خەنجەر، بوو بەسزای تۆ
خەنجەر بۆ دڵە، گەر ڕاستت ئەوێ
ئاخ مەمی تیایە، نەک بەری کەوێ
ئەی سینە بگرە، خەنجەر بۆ تۆیە
هەرچی زۆر جوان بێ، هەر ڕەنجەڕۆیە
بە بەرگی خوێنی، شایی ڕەنگەوە
بەسۆز و ناڵەی، خۆش ئاهەنگەوە



با دەست لەمل کەین، مەم یەکجارییە
نە ڕای بێگانە، نە بەدکارییە
ئاخ بۆ دەنگخۆشێ، لە ژوور سەرینمان
بە بەیتی کوردی، بدا تەڵقینمان
بڵێ ئاخ دڵی، دڵخواز مەشکێنن
بە زۆرەملی، کچان مەمرێنن!

(١) ئەم شیعرەی پیرەمێرد لە کۆتایی چیرۆکی مەم و زینەکەی خۆیدا نووسیوە لە دانانی خۆبەتی و پەیوەندی بەوەی (ئەحمەدی خانی)ەوە نییە.

***

## دوو تاکە بەیت

١٩٣٤

١

بە پیرەمێردی، هاوار، دێننە من
ئەمکەن بەدایک، ئەبمە پیرەژن

٢

جاران بەتوانج، ئەیان دایە ڕوو
چرا، ڕووناکی، بۆ ژێر خۆی نەبوو

***

## تۆ وام تێمەگە

١٩٤٣

تۆ وام تێمەگە، هەر چیاگەردم
من خاوەن سوپای ئەندێشە و دەردم
هەرچی لەدەشت و چیا و سەر ئاوە
لەباتی شێتی، خوا بەمنی داوە[1]
سفیدەی بەیان، زەردەی خۆرەتاو
تریفەی مانگ و لەنجەو لاری ئاو
سڵ و ئاوڕ و گەردن بەرزی ئاسک
قاسپە قاسپی کەو لەسەر ئاسۆ و باسک

گوڵ و گوڵاڵە و نێرگسی بەهار
شۆخی بەڕەزا و چنوور لە نزار
ئەمانە یەک یەک، بەتۆ ئەبەخشم
تۆش لە شێوەی خۆت، بمدەرێ بەشم[2]
بۆ سفیدەی سوبح، سای بەرۆکەکەت
بۆ زەردەی خۆریش، زەردەخەنەکەت
مانگ بۆ ڕوخسارت، ئاو بۆ جەبینت
ڕەمی ئاهوویش بۆ، لەنجەی شیرینت
قاسپە قاسپەی کەو، بۆ قاقای جوانت
نەغمەی بولبول بۆ، وردە ڕازانت
گوڵە بۆ نازکیت، گوڵاڵەش لێوت
چنوور بۆ زوڵفی لوولی پەشێوت
ئەمانەم لەگەڵ، بگۆڕەرەوە
بەراوردیان کە و گرەو بەرەوە

---

(١) لای م. ھ نووسراوە «بە بەهای شێتی خوا بەمنی داوە»
(٢) لای م. ھ نووسراوە «تۆش لە نازداری خۆت بدە بەشم»

***

## تاکە بەیت

١٩٣٤

١- چاپی هەڵەی دیوانی شێخ ڕەزا:
دیوانی شێخ ڕەزا، بەرەزای خزمی ئەو نییە
تیری قەزای ڕەزایە، گوناهی ئەوان چییە!!.

***

«چاپچییەکەی مەکتەب، ئەمەی نووسیوە
خوا ئەم زیرەکییەی، بێرە بەخشیوە»

***



## بەهاری ڕوو زەرد

١٩٤٧

بەهاری ڕوو زەرد، بەهاری ڕوو زەرد
منیشی خستە کەژ و کێو و هەرد
ڕەنگ زەرد و سەر شین، دەروون پڕ لەدەرد
بۆ عالەم شادی، بۆ من ئاهی سەرد
جەرگم لەت لەتە وەک هێڵی ناو وەرد
ئاخ بۆ دڵسۆزێک، بۆم بێ بەهاودەرد
ڕەنگ هەڵبژێرێ لە شێوەی بەهار
لەو ڕەنگە خۆش بێ لای دڵەی غەمبار
لە گوڵە زەرد ڕەنگ، لە گوڵ نەورۆز داخ
لە شەونم فرمێسک، لە تەمی چەم ئاخ
لە وەنەوشە شین، لەنێرگز خومار
لە گوڵاڵە خوێن، دیدەی شەوبێدار
لە خونچە پەیکان، لە سۆسەن خارێ
دڵ بریندار کا، لە دووری یارێ
من لە دووری ئێل، جەرگم خوێنین بێ
چەند خۆشە برین لەسەر برین بێ
ئەگەرێم بەشوێن، دەردەدارێکا
کەس و کار کوژراو، دڵ زامارێکا
وەک تاق تاقکەرە تا دەمی بەیان
ناڵە ناڵمە لەسەر (کەلی خان)
لافاوی فرمێسک، لە دووری یاران
سەرەو خوار ئەڕوا وەک لێزمەی باران

***

## کاریکاتێر بەشیعر

١٩٣٤

١- بۆ گۆران کە لەژێر ناوی (مێشۆ)دا خۆی شاردۆتەوە
مشەی مێشۆمان، لا گیزەی مێشە
لەناو (ژیان)دا، خواردن لە پێشە

ئەگەر زیافەتی ڕەئیستان ئەدی
ئەکەوتنە تەقە، وەک نەدی و بدی

١٩٤٠

«سوپای غەمزەت، بەڕاکردن، فتوحاتی بەهەم هێنا
بە هەڵگێڕانەوەی چاوت، سوپای دڵ تێک شکا و فەوتا»

***

## ستەمکاری

هەور ئەگری بەکوڵ، گوڵ پێ ئەکەنێ
باوک و فرزەندی، بێ ڕەحم ئەنوێنێ
نێرگز بەبۆنەی چاوی مەستەوە
ئەژاکێ لە دەست دەستاودەستەوە
گوڵاڵە ئاڵای ئاڵ و واڵای خۆی
بووە بە لەکەی داخی دەروون بۆی
بەڕەزا ئەڕوێ لە پەنا هەردا
بای مەینەت سەری ئەدا بەبەردا
وەنەوشە شێوەی شینی[1]، شینیی خۆی[2]
بووە بەباری گەردن کەچی بۆی
پیشۆک لە خاکا بەخاکساری
پەرێشان پرچە، لەبەر هەژاری
خۆی لەژێر خاکا ئەشارێتەوە
ژنە لادێیی ئەیدۆزێتەوە
هەڵەکۆک کە باو لە بەفر ئەسێنێ
بێڵەکان سەر و بنی دەردێنێ
شنگی شۆخ و شەنگ، بەسنگێکی دار
سنگی ئەشکێنن، ئەیخەنە بازاڕ
لاولاو کە بەشەو، ئەگەشێتەوە
ڕۆژ ڕووی خۆی لە ڕۆژ ئەپێچێتەوە
مێخەک گەردنی هەڵئەقرتێنن
سنگ و بەرۆکی پێ ئەڕازێنن



گوڵ بەو جوانییە ئەیخەنە مەنجەڵ[3]
جوانا و ئەڕێژێ بەهەڵم و دووکەڵ
بەبۆنەی بۆنە وا ئەیخنکێنن
ئامانی نادەن هەڵیەبچوڕکێنن
چیمەن کە سەوزەی نەوخیزی ناوە
بە لەقەی فتبول پێ پەست کراوە
ئەرخەوان پەنای بردە بەر مردوو
لەوێشا ئەیکەن بەداری مردوو
ئەمە ناو ئەنێن سەیرانی بەهار
منیش ئەڵێم داد، لەدەست ستەمکار

............................................................

(١،٢) شینی یەکەم واتا شیوەن. شینی دووەم واتا ڕەنگی شین.
(٣) پیرەمێرد ئەو بەیتەی لە(سەعدی)یەوە وەرگرتووە لە شوێنێکی تری ئەم دیوانەدا لە بەشی گۆڕینەکانی پیرەمێرددا دەینووسین.

***

## یاران کوێخایی

یاران کوێخایی، یاران کوێخایی
کارێکی پێم کرد، دەردی کوێخایی
لەگەڵ مامەوە کەوتمە تەنهایی
زەبوونی کردم، دەردی ڕیسوایی
کوێخایی لێم بوو بەتەختی شایی
لە دەستیان سەندم هەر بەخۆڕایی
داخم ئەو داخە کە بەشیربایی
گەیینە کوێخایی و لەخۆبوون بایی
لە دڵما نەما ئاهەنگ و شایی
لە چاومان ون بوو نووری بینایی
زیکری مەولەوی و ڕەقسی سەمایی
بۆ من بووبوونە سڕی سەمایی
وەک گێژەڵووکەی خێڵی دوایی
عومری کوێخایی خستە کۆتایی

خووی جیهان وایە بەبێ وەفایی
لای کەس نەماوە بۆی ئاشنایی
ئەگەر بۆم ڕێکەوت بەخواستی خوایی
بوومە کوێخا بەدڵنەوایی
سەد دەورەم بدەن ڕووتەی ئاوایی
بەکلکەلەقێی کەس نابم بایی

***

## کاریکاتێر بەشیعر

١٩٣٤

چوار کەس ئابوونەی (ژیان)یان نەویست
ناو لێبردنیان بوو بوو بەپێویست
جارێ ئەم جارە، با هەر داچڵەکێن
بۆ جارێکی تر، گاڵتەی دێ لە شوێن

***

## شۆڕەبی

ئەرێ شۆڕەبی سەر حەوزەکەمان
تۆ سێبەرێ بووی، هاوینان بۆمان
بەهار بەلەنجەو لاری خەرامان
شنەت ئەبوو بە باوەشێنی گیان
بە بەرگی سەوزی تاوسی کاڵات
حەوزەکە بوو بووە، ئاوێنەی باڵات
ئێستە بۆ ڕووت و بێ، بەرگ و باری
سەر شۆڕ و ڕەنگ زەرد کز و غەمباری
وتی، وێنەی تۆم، بەبێ زیاد و کەم
لە ماڵی تۆ دام وا لە تۆ ئەکەم
جوانی بەهارم، من کە شۆڕەبیم
لەترسی پایز وا کەوتوومە بیم



هیچ نەبێ بەهار من سەوز ئەبمەوە
ئێوە پیریتان، تاریکە شەوە

***

## سۆزی پیرەمێرد

١٩٤٥

یاران فەرهادم، یاران فەرهادم
بەوێنەی فەرهاد هەر ڕەنج بەبادم
هەم مەجنوونیشم لە هۆش ئازادم
کوردێکی پەتیم بۆیە ناشادم
دوو عاشقی کۆن هەردوو ناودارن
هەردووکیان کوشتەی عەشقی دڵدارن
هەردووکیان ناویان کەوتۆتە جیهان[1]
بوونە پێشەوای تیپی عاشقان
هەرچی شاعیرە بۆ ئەفسانەی عەشق
پیشەی ئەوانیان کردووە بەسەرمەشق
تاهر بەگ ئەڵێ: یاران فەرهادم
جێنشینی خاس قەومی فەرهادم
وەلی دێوانەش ئەڵێ: مەجنوونم
دێوانە واریس قەومی مەجنوونم
ئیتر مەجنوونە یاخود فەرهادە
تەرانەی عاشق داد و بێدادە
یەکێکیان مەجنوون قەیسی عامری
ئەوی تر فەرهاد لە دنیا بەری
فەرهاد کوردێکی دەوری بێستوون
لە عاشقیدا شێت تر لە مەجنوون
مەجنوون هیچ نەبێ لەیل دڵخوازی بوو
لە منداڵیشدا لەیل هامرازی بوو
فەرهاد بەتەفرەی شیرینی بەدناو
هەر لەخۆیەوە پێی خۆی خستە داو

نەدیو نەناسیو ڕەدوو[٢] کەوتبوو

وەک کچە مەنگوڕ[٣] هەڵیان گرتبوو

بەسیاسەتی ڕەقابەت هێنای

فەرهادی کردە دۆستی جانفیدای

خەسرەو لەشکری ئەسفەهانی بوو

شیرینیش ڕێکەوت فەرهادی بۆ بوو

فەرهاد نەیزانی کە بۆ ڕەقابەت

پێی ئەکەوێتە داوی سیاسەت

بەعەشقی شیرین تەشوێی ئەوەشان

بەزۆری بازوو کێوی ئەڕووخان

شیرین و خەسرەو بوونەوە بەیار

فەرهاد قوڵنگی خۆی لێ کەوتە کار

خۆ من عاشق نیم عەشقیش نەماوە

لەناو دڵخوازا بێ شەرمی باوە

بەڵام من لەسەر عاشقانی پێشووم

تەشوێی سیاسەت بوە بەتێشووم

ئەمەوێ کێوی بێستوون کونکەم

بەزمانی شیرین خوێنی خۆم ونکەم

ئاخ چی بکەم لەگەڵ، سەرنویشتی خوا

کورد بەقاڵەی دەم زوو تەفرە ئەخوا

---

(١) ئەم بەیتە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا لە چاپ نەدرابوو.

(٣،٢) ڕەدووکەوتن: هەڵگرتن. لەناو عەشیرەتی مەنگوڕدا کچ هەڵگرتن یاخود ڕەدووکەوتن باوەو لە پاش هەڵگرتن کەس و کاری هەردوو لا ڕێک دەکەون و هەموو شتێک ئەبڕێتەوە. زۆرجار ڕەدووکەوتن لەماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر ئەبێ لەناو یەکتریدا بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە گێچەڵێک ڕوویدا. مەنگوڕ لەناوچەی ڕانیە و پشدەردایە و بەو دیوی ئێرانیشدا هەیە.

***

## شیعرێکی کاریکاتێری بەناوی (فائق تۆفیق)ەوە[١]

**١٩٢٨**

خۆت لادە لەڕێ بۆ ئەسپی تازی

با نەختێک بۆتان بکەم ڕمبازی



بژی کەرەگول چەند نەشئە بەخشی

بەهەیئەت کەر و بەهیممەت ڕەخشی

قوربانە سادەی بێرە چوار ناڵە

هەرچی جۆیەکت خواردبێ حەڵاڵە

ڕووی خۆت سپی کە لەناو ئەم خەڵقە

دەخیلە نەمخەی لەم جێیە ڕەقە

گوێت قوت کەرەوە کلک ڕاوەشێنە

هەرچێکت تیایە لێرە بینوێنە

---

(١) ئەم شیعرە، پیرەمێرد لە موناسەبەی سەیرانێکدا نووسیویە کە ساڵی ١٩٢٨ لە سلێمانی کراوە. وە لە پێشکەوتنی سواریدا (فائق هوشیاری) کچەزای کە ئەوکاتە منداڵ بووە بەسوارییەوە لەبەر خوێندویەتیەوە.

***

## ئا دز کەدەیی[١]

**١٩٤٥**

لە ترسی هەر کەسێ خۆت شاردەوە، لووت و بزووت تووش دێی

کەچی من خۆم لەیارم دزیەوە، «نعم المرام» بوو بۆی

لەبەر دەرگاکەیا، سەگ دامەنی کێشام، وتم ئۆخەی

ئەوە ئەو ڕایسپارد، بمبا، کەچی چووم کردیە حەل، حەل، دەی

حەکیمی چاو ئەڵێن وا هاتووە، من ناچمە لای بۆ چاو

نەوەک ڕووی پیاوی دوو ڕووی پێ ببینم، خۆشترە لێڵاو

گرانی وای بەسەر هێناین قیامەت کەوتە دنیاوە

گوڵ و گیا سەر دەرێنن، وا ئەزانن، حەشرە هەستاوە

هەموو شەموان کە (جوو) وێڵی عەسای موسان بەپەیجووری

سەرایی ڕیشی فیرعەونە، بەهار ڕەنگی لە من گۆڕی

ئەگەر بێت و فەلەک ڕۆژێ، لەگەڵما سەرگرانی کا

وەکو ڕۆژ، شەو لە خاکیا دەردەچم، کوێر بێ لە تاریکا

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە

***

## دڵ بەپەرۆشە

١٩٣٩

دڵ بەپەرۆشە،...
خەبەرێکم بیست، دڵ بەپەرۆشە
ئەوەندەی مەرگی خۆم لام ناخۆشە
زبانم لەنگە، کەللەم بێ هۆشە
بیستم ئەگریجەی لوولت بڕاوە
هێلانەی دڵان یەکسەر شێواوە
هەیرۆ ئەو پەندە کێ بەتۆی داوە
کێ دەستی چووە ئەو زوڵفە خاوە
هەر لە ئەوەڵی دنیا تا ئەمڕۆ
شابەیتی شیعرە، شەعری سەمەن بۆ
ئێستا شیعر و عەشق کەوتوونە ڕۆڕۆ
بۆ ئەو ئەگریجە و زوڵفە جوانەی تۆ
دەک یاخوا ئەوەی پرچی بڕیوی
دەستی قەڵەم کەن بەقەمەی لیوی
دەردێکی گاتێ، لەکەس نەدیوی
منداڵەکانی بکەونە هەتیوی
جاران ئەیانوت وا وا لێ کراوە
لەسەر لێقەومان پرچی بڕاوە
ئێستا لەباتی ئەو بەند و باوە
بەبێ شوورەیی پرچ بڕین باوە
ئەم شیعرەم ئەخوێند چەند ساڵ لەمەوبەر
شانە تای زوڵفت دەرکێشێ ئەگەر
قامیش ئەکوتمە پەنجەی شانەگەر
بووی بەکاری قوت هەی خاکم بەسەر

***



## هەرا

١٩٣٤

بووە بەهەرا لە گردی سەیوان
زیندوو شەڕ دەکەن، لەسەر مردووان
مردووم بیستووە، بەشی زیندووخۆر
زیندووم نەدیوە، خۆی بخاتە گۆڕ
هیچ کەس نازانێ، لە کوێ دەینێژن
پێنجەی پەنهانی خوای پێ دەبێژن

***

## بانگی بەیان

١٩٤٦

پیر و ئیفتادە و ڕەنجوور و غەمبار
بێ هیوای ژین و ژیان ناڵەکار
لە دەست بێداری شای تەقیانووسی
تەئریخی مەرگی خۆمم ئەنووسی
وەک دەروێشەکەی گۆلی زرێبار
کەو و پۆستی خۆم کێشابووە کەنار
مەرزی کوردستان تار و شەوەزەنگ
شاری خامۆشان بێ دەنگ بێ ئاهەنگ
تەختی تەخت بووبوو بابا ئەردەڵان
کەلاوەی کاول، پەیکوڵ بەردەڵان
ئنجا لە قاپی شای پەروەردگار
ئاه و هەناسەی پیران کەوتە کار
ناگا ئاسۆ شەرق بەشەبەقی نوور
وەک خوێنی جوانان بوو بەتارای سوور
سەدای سەڵاو بانگ ئاوازەی شادی
ئەو شەوەی کردە ڕۆژی ئازادی

***



# نەتەوە

١٩٣٩

من ماسييەکم لە نەتەوەی نوون
يونس پێغەمبەر بەو بوو بە ذا النون
داپيرەم چەندێک لەناو سينەدا
پارێزگاری کرد وەنەوزی نەدا
بە(لا الـه الاّ أنت)ەوە
قەهری ئيزەدی لێ دوورکەوتەوە
کە هاتە دەرێ و بوو بەپێغەمبەر
ئيتر لە ئێمەی نەپرسی خەبەر
لەوساوە لێمان بوون بەتەريدە
ئەمانخۆن ئەڵێن (لحماً طريه)
لەناو تاوەدا ئەبين بەکەباب
بۆ کەيف ئەمانکەن بەمەزەی شەراب
ناڵێن ئەمانەش ڕۆح لەبەرێکن
نێر و مێ لەگەڵ يەک هاوسەرێکن
بۆچی نازانن کە ڕۆح شيرينە
لە گيانەلاّدا ئەوان ببينە
ئەو پەلەپەلە، ئەو واوەيلايە
هەموومان ڕۆحە لەبەرمانايە
ئينسان ئەوەيە کە ئازادی خۆی
بۆ کەسێکی تر نموونە بێ بۆی
کە بەبرينێک جەرگی خۆی بێشێ
بەخۆڕايی تيغ لە کەس نەکێشێ
جاران هەر بەتۆڕ ئەکەوتينە داو
ئێستا بۆمبامان بۆ ئەخەنە ئاو
کە بۆمبا زرمە لە ئاو هەڵسێنێ
سەر ئاو ئەکەوين هۆشمان نامێنێ
ئنجا ئەو کەيفە و ئەو ڕاکە و وەرە
عزرائيل لەوان بەرەحمترە



گۆڕيان بێ، ئێستا وا شەڕ قەوماوە
بۆمبا بۆ خۆيان دروست کراوە
ئێمە بێ کێردين بەستەزبانين
نەخوێندەوارين لە فەن نازانين
ئەو فەنەی ئەوان کەرێی پێ دەبەن[١]
هەر بۆ ئەوەيە کە قڕ لەيەکخەن
ياخوا هەروا بن ئەی بەناو ئينسان
نەتان پەرژێتە سەر ئێمەمانان

(١) ئەو بەيتە لە ديوانی پيرەمێردی م. ھ دا نەنووسرابوو.

***

## وشکە سۆفيەکان

١٩٤٣

وشکە سۆفيەکان بەهەشتيان ئەوێ
بۆ ئەوەی حۆری و کۆشکيان بەرکەوێ
يادی تۆم لەهەر شوێنێ دەستکەوێ
بەهەشت دۆزەخی لێ پڕ نامەوێ
ئاڵتونم هەيە کە هەر بيژمێرم؟
ناچارم ئەبێ بەتۆ ڕابوێرم
نائوميدييە و بێ موبالاتی
حەلاڵ خۆريە و کەم دەسەلاتی
ماڵدار ماڵی برد من ڕەزای خوايی
ماڵ لە کورتييە و ڕەزا لەزيايی
هەی قەلەندەری چەند «سبوکباری»
لەڕيش و سمێڵ بەريت يەکجاری
جاران ئەمانوت، قەلەندەرييە
لەڕيش و سمێڵ بۆيە بەرييە
خۆ ئێستا ڕيش و سمێڵ مەترووکە
هەرچی ئەبينی وەک تازە بووکە

عومری ئەو ڕیشە زبرە نەمێنێ
کە لەڕوومەت کەوت دای ئەچڵەکێنێ
من ئەڵێم، ئەوەی کە خاوەن ڕیشە
ئاین و ئۆینی کردووە بەپیشە
خوایە من ئەگەر خواهیشتی خۆم بێ
بۆچی بمەوێ کە ملم کۆم بێ
باری گوناهم ئەگەر لە ملە
بناوانەکەی باوکم وا شلە
ئەو نەیئەزانی شەیتان نایەوێ
کوێخایی عەرش و قورشی بەرکەوێ؟
ئێمە ئەیزانین کە ئەو شەیتانە
بۆ لەڕێ بردن لە پەیجۆرمانە
تەفرەمان بدا بەدەنکە گەنم
وا چاکە بمانخەیتە جەهەنەم

***

## سیابازێ بووم

١٩٤١

سیابازێ بووم، سیابازێ بووم
لە ئەوجی گەردوون تیژ پەروازێ بووم
لەدەستی میران ئارام سازێ بووم
دایم پەروەردەی قەدر و نازێ بووم
بەزەردەخەنەی پیرێژن مەغروور
کاتێ دەچووینە ڕاووشکاران
لە گوڕەی باڵم کەوی کۆساران
ئەلەرزین وێنەی بیی جۆباران
خۆیان ئەخستە پەنای نزاران
کونە مشکێکیان لێ ئەبوو بەژوور
بەدەنگی دلێر کەتێم ئەخوڕین
لایان نەدەما هێزی هەڵفڕین



ئەمخستنە ژێر خۆم نووزەم ئەبڕین
بەچنگاڵی قین هەڵم ئەدڕین
دڕندەیەک بووم لەڕێی مروەت دوور[(١)]
ڕۆژێ هەڵمەتم ئەبردە سەر کەو
لە پڕ شمقارێ هات بەتەکو دەو
پەلاماری دام لێم کەوتە هەوهەو
ڕۆژی ڕووناکی لێ کردم بەشەو
خستمیە خوارێ بەلنگەو تلوور
(قەرەتۆغانی)[(٢)] ئەمەت لەبیر بێ
ئەم پەندەت لەلا وەک پەندی پیر بێ
خوێنرێژی ناکا ئەو کەسەی ژێر بێ
زۆر لەکەس مەکە هەرچەند ئەسیر بێ
جەزای کردەی بەد ناکەوێتە دوور

................................................................

(١) لای م. هـ نووسراوە دڕندەیە بووم لەپیاوەتی دوور.
(٢) پیرەمێرد ئەم شیعرەی بەناوی (قەرەتۆغانی)یەوە بڵاو کردۆتەوە، واتا بازی ڕەش.

***

## قافیەی کوردی[(١)]

١٩٤٨

کێ دەڵێ کوردی قافیەی خۆی نییە
کە ئەمەیان دی، ئەوە خۆی نییە
ئامان چەند خۆشە تافی جوانی
خۆ کە خوا بیدا جوانی و نەوجوانی
بەهەرزەکاریم، کە باوکم ساغ بوو
هەرزەگەردیمان لەلا یاساغ بوو
ڕەز و خانوومان بوو لە گورگەدەر
گورگانە شەوێم ئەکرد بێ کەدەر
هاوینان کۆچمان ئەکرد بۆ ئەوێ
ڕامان ئەسپارد ولاغمان ئەوێ

وردە و درشــتــیــان ئەهاتنە شــوێنمــان
لەو دیارەوە (دیار) ئەبوو شــوێنمــان
ئەکـــــوتینە ڕێ بەڕیزە و قـــــەتار
بەناڵەی شــمـشــاڵ بەبەســتـە و قـەتار
لەســەری گـۆیژە هەڵپــەڕکێ و ســەمـا
سـەیریان ئەکـردین فـریشـتـەی سـەمـا
لەو بەندەنەدا چۆپی و دەســتــبــەندی
لـەو (دەربـەنـدە)دا بـەنـاو دەربـەنـدی
لەو بەرزیـیــــەدا ئاوازەی شــــایی[2]
بەرزتر لە تـەپڵ و ئاوازەی شــــایی[3]
لەبـەر ئـاوایـی تـفـــــــەنگ ئـەتـەقـی
ئـاوایـی دڵـی بـەکـــــــــار ئـەتـەقـی
ســاڵێ ئیـجـارەی کـردبـوو دەسـداری
دەست دار دەست بەدار خەڵک دەست بەرداری
هاتبـوون زەوی خـەڵکیـان ئەخـەسـان
نەوەک ڕەز خێویان[4]وەک خێو[5] ئەخەسان
بێــــــوەژنـێ بـوو، نـاوی پـەروەر بـوو
چوار هەتیــوی بوو هەتیــوپەروەر بوو
کـــاری هاتبـــووە ســـەر کـــرێکاری
دەســتی بەســتــرابوو بەگـرێی کــاری
مـــێـــردی ئەو ژنە ڕەزی ناشـــتـــبـــوو
تا هاتبـــووە بەر خـــۆیان ناشـــتـــبـــوو
ڕەزێـکـی وێـران لـە خــــــوار ئـاوایـی
ڕەنگی گــەڵای زەرد وەک خـــۆرئاوایی
ڕەزخـــەســـێنێکی لای خـــۆی دانابوو
چـوار بـار دەیـەکـی لـەســــــەر دانـابـوو
پەروەریان هێنا بەپەل ڕاکـــێـــشـــان
نیـــو هۆقـــە ترێی نەبوو بەکـــێـــشـــان
زۆردار گــــــاڵـی دا زۆری تـێ هـەڵـڵا
بەناچار کـــــردیە گـــــریان و هەڵڵا



ڕای کرد خۆی خستە قسنی (خەرگەڕەش)[6]
زۆردار دەســتــبــەجێ کــەوتە ڕۆژی ڕەش
تیـــری پەنهـــانی جـــەرگی بڕیبـــوو
بـۆ ئەوە دنـیـــــــــا لـەپـڕ بەری بـوو
خـــوا وای لێ کـــردوون، وا ئەو نەوەیە
هێند کـــزومـــاتن نەدەنگ، نە، وەیە
جـــەوری ســـتـــەمکار ئاهی لەدوایە
زۆر دەوری دوایـی کـــــــاری لـەدوایـە

........................................

(١)مامۆستا م. ه سەبارەت بەم شیعرە نووسیویە: لەکاتی خۆیا مامۆستا تۆفیق وەهبی نامەیەکی ناردووە بۆ پیرەمێرد لەبارەی قافیەی شیعرەوە بەتایبەتی شیعری کوردی پیرەمێردیش بەم شیعرە وەڵامی داوەتەوە. ل٢٣٣
(٣،٢)شایی یەکەم واتا زەماوەند، شایی دووەم واتا پادشایی.
(٥،٤) خێوی یەکەم واتا خاوەنی ڕەزەکە. دووەمیشیان واتا جنۆکە و لەو بابەتە شتە ئەفساناوویانە.
(٦) خـەرگـەڕەش: لە (خـەرقـە) (بەرگ)ی ڕەشـەوە هاتووە. واتا ئەو پیـاوچاکـەی بووە بە(شـەخس) لای (گورگەدەر)ی شارباژێڕ ئەو جۆرە بەرگەی لەبەردا بووە. م. ه

***

## پێکەنین

١٩٣٤

«کـــەوتووینە دەوری، بگرە و بەردەوە
یونســـمـــان کـــەوتە، دەریای دەردەوە
گـۆران کـە شـیـعـری کـەوتە ناو ژیان
تۆڵەی تاڵی بوو، بە(ســـەیوسێ نان)
عــــەزیزیش ڕۆیی بۆ قـــــەرەچەتان
بۆ (بێکەس) دەڵێین: یاالله و ڕامان!!»

***

## بای خەزان[1]

١٩٤٣

بای خــەزان، خــونچــەی خــزاند و دڕکی پیــر هەر مــایەوە
گــێـــژە هەرچی، خـــۆی ئەخـــاتە، گــێـــژی ئەم دنیـــایەوە

دادی ئاینمان لەدەست مەی نۆشی و ڕەش پۆشییە
هەش بەسەر ئەو جەژنە، وا سەرخۆشی، یا سەرخۆشییە
قژڕنین بۆ ماتەمی جاران کە ئێستا، قژ نەما
پیریژن، ما، مووی بڕووتێنێتەوە و بیدا بە با
زوڵف کە ڕووی داپۆشیایە بانگ و هاواریان ئەکرد
خەڵکە مانگ گیرا، لە تەپڵ و دومەڵەک دەن دەستوبرد
ئێستە زوڵف بڕرا، سفوری مانگە، ڕووپۆشی نەما
داخە، هێلانەی دڵان شێواوە، بێ، بێنە، سەبا
بێت و، شەو، تۆ بێیتە لام، ڕۆژی چرام پێویست نییە
تۆ وەرە و بمناسە، پیشەی من چرا وەکوژێنییە!
هەرکەسە هاواری چاوی پیس ئەکا و من چاوی جوان
بەندی جەرگی وا بڕیوم نیمە یادی نیشتمان!
ئەم گروگاڵانە شێوەی شیعری کۆنە ئێستەکە،
هەوڵی سەربەرزی گەلت بێ، زوڵف و ڕوو گوێ لێ مەکە!

---

(١) پیرەمێرد دووجار ئەم شیعرەی بڵاو کردۆتەوە. جاری یەکەم ساڵی ١٩٤٢ لە ڕۆژنامەکەیدا و جاری دووەم ساڵی ١٩٤٣ لە گۆڤاری گەلاوێژدا شیعرەکە لە هەردوو جارەکەدا ئەوەندە جیاوازی هەیە کە ناچار بووین هەردووکیان بنووسینەوە. ئەمەی ئێستا نووسیمانەوە لە گۆڤاری (گەلاوێژ)ی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٤٣دا بڵاو کراوەتەوە. هەروەها لە کتێبی (نرخ شناسی – عەلائەددین سەجادی)یشدا بڵاو کراوەتەوە. لە نیوەی دێڕی یەکەمی بەیتی سێیەمدا دوای (قژڕنین) لە گەلاوێژدا واتای (پرچ بڕین) نووسراوە کە شاعیر خۆی لە کەوانەدا دایناوە و تەفسیری (پرچ بڕینە) و ئێمە نەمان نووسیەوە هەتا کێشی شیعرەکە تێک نەدات. هەروەها واتای (بۆن) کە تەفسیری (بێنە)یە لە نیوە دێڕی دووەمی بەیتی پێنجەمدا، ئەمیشمان لەبەر هەمان هۆ نەنووسیەوە. ئنجا لە ژمارە(١١)ی گەلاوێژدا (میرزا مارف)ی شاعیر و نووسەر ڕەخنە لە کێشی شیعرەکە دەگرێت سەبارەت بەو دوو واتا زیادەیەی کە (تەفسیری)یە و ئێمە ئێستا ئاماژەمان بۆ کرد. وە لە ژمارە(١٢)ی گەلاوێژدا پیرەمێرد وەڵامی ڕەخنەکەی میرزا مارف دەداتەوە و تەواوی ڕەخنە و وەڵامەکەمان لەبەشی پیرەمێرد و ڕەخنەی ئەم دیوانەدا نووسیوە و بیروڕای خۆمان لەبارەیەوە دەربڕیوە.

تازە گوڵ – بای خەزان(*)

١٩٤٢

تازە گوڵ ڕۆیی و، لەباغا دڕکی پیر هەر مایەوە
گێژە هەرچی خۆی ئەخاتە گێژی ئەم دنیایەوە
دادی ئاینمان لەدەست مەی نۆشی و ڕەش پۆشییە
هەژ بەسەر ئەو جەژنە، یا سەرخۆشی(**)، یا سەرخۆشییە(***)



عادەتی جەژنی موسوڵمانانە، یەکتر ماچ ئەکەن
جەژنی ئێستا ماتەمە، ئەو ماچ و مووچە لا ئەبەن
بێت و شەو تۆ بێیتە لام، ڕۆژە، چرام لازم نییە
بێجگە لەو تەشبیهە من پیشەم چرا وەکوژێنیە!
زوڵف کە ڕووی داپۆشیایە، داد و هاواریان ئەکرد
خەڵکە مانگ گیرا، لە تەپڵ و دمەڵەک دەن، دەستوبرد
ئێستە زوڵف بڕرا، شەهاب گیراوە، مانگ گرتن نەما
حەیفە، هێلانەی دڵان شێواوە، بێ، بێنە، سەبا
هێند بەئازادی درۆ، ئەم عالەمەی پێ هەڵپەڕی
کەوتنە ژێر قەیدی بڕین، هەر قەیدی مووی زوڵفیان بڕی
پیری بێ پیرە و لەسەرمانا دەماغم وا سڕە
ئێستە هاڵاوێ لە پێلاو و پڵاوی خۆشترە

(*) ئەمە شێوەی دووەمی شیعرەکەی پیرەمێردە کە یەکەمجار ساڵی ١٩٤٢ بڵاوی کردۆتەوە. بەڵام ئەگەر تەماشای نوسخەکەی گەلاوێژ بکەین کە ئێمە لەلاپەڕەی پێشوودا نووسیمانەوە لەوە دەچێ شاعیر شیعرەکە خۆی پوختەی کردبێ.
(**، ***) یەکەم واتا دڵدانەوە دووەم واتا مەستی.

***

## بە عاشق کوژی(١)

١٩٤٨

بە عاشق کوژی ناوی بەدناوە
ترسی لای خوایشی ناوە بەلاوە
خەم و بەزەیی هەرگیز نەماوە
خوڕەی فرمێسکم لای هاڕەی ئاوە
کسپەی هەناوم کزەی کەبابە
ناڵەی حەزینم، نەغمەی ڕوبابە
وا خەیاڵ ئەکا لە گوێی جۆگایە
مەزەی کەباب و ڕوبابی لایە
چاو لەچاو یەکا مەستی ئەنوێنێ
بە ئەفسوونی چاو عالەم ئەنوێنێ

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ھ دا بڵاونەکراوەتەوە.

***

## عەشقی عەسری[1]

١٩٣٦

دوێ شەو، بەری بەیان بوو، بەیادت نەنووستبووم
بای ڕووی بەیان شنایەوە، فێنکایی دا لە ڕووم
بەو بۆنە خۆشەوە، کە لەلای تۆ، گەیاندیە من
بێخی غەم و پەژارەی هەموو هەڵکەنا لە بن
توخوا ئیتر بەبادی مەدە، ڕەنجی ئەم بولبولە
تا گوڵ بەباوە پێ نەکەنێ، ئەو لەسەر چڵە
کاتێ کە گوڵ بەشۆخی نیقابی حجابی دڕا
قانوونی عەشق ئەڵێ کە هیوای دڵ بەری بڕا
ئادابی عەسری ئێستە لە ڕووپۆشیا نەما
وەک زیکری مەولەوی[2] هەموو کەوتوونە سەما
ناچارە کچ، بەعادەتی مەنگوڕ ڕەدوو کەوێ
وەک ئەوروپا بمێننەوە بۆ (چەشک)ە چەند شەوێ
ناڵێم ڕەدووم کەوە، وەرە، ئەمما کە هاتمە لات
هێند ناز مەکە، کە خەڵقی بڵێن، عاشقی هەڵات

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

(٢) مەبەستی زیکرو حاڵ لێ هاتنی دەروێشەکانی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمییە (مەولەوی) نەک (مەولەوی لای خۆمان).

## کەوتمە ناو شێتان[1]

١٩٤١

کەوتمە ناو شێتان، کەوتمە ناو شێتان
سەر ئازاد وێنەی شێتان و وێتان
خود پەسەند نییە، بێزارم لێتان
هیچ هیوایەکم نەماوە پێتان
بەشێتی لەدەس ئێوە بووم ڕزگار
چەند خۆشە شێتی ئەستۆ بەرەڵڵا
دوور لە ناکەس و لە شەڕ و هەڵڵا



بەزبان دۆست و دوشمن لە دڵڵا
بۆ یەکتر خستن لە گەردوو خوللا
نزیک بێ، نزیک بەڕەنج و ئازار
چەند خۆشە سەحرای شێتی شوێنت بێ
بەرد سەرینت بێ و لۆنگت نوێنت بێ
نەشەڕە شەق و شەڕە جوێنت بێ
نەترس و کینەت لە هاوخوێنت بێ
نەنەزان هامڕاز، نەبێگانە یار
دەمی بەیانیان گزنگی هەتاو[2]
بووە بەکڵاو بەخەیاتەی خاو
کێوان پێی بێنە فەرقی زەڕکڵاو
دەربەندان پڕ بن لە شامە و شەتاو
سایەی گوڵاڵان بکەن بەهەوار
هەر شوێنێ خۆش بێ، بەڕۆژ لەوێ بێ
خۆشی نەزانێ بەشەو[3] لە کوێ بێ
زەمزەمەی زیکری عەرشی لەگوێ بێ
لە ڕەحمان نزیک لەشەیتان جوێ بێ
بۆ ڕێگای ئەولا سەڵت و سوبوکبار

---

(١) لای م. ه نووسراوە ساڵی(١٩٤٠). بەڵام پیرەمێرد ئەم شیعرەی بەناوی (تازە دێوانە)وە لە ژمارە ٦١٤ی ساڵی ١٩٤١ی (ژین)دا بڵاوکردۆتەوە.

(٢) ئەم پێنج نیوە دێڕە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

(٣) لای م. ه لاپەڕەی (٢٣٨)ی دیوانی پیرەمێرد لەبری وشەی (شەو) نووسراوە (ڕۆژ) کە دیارە هەڵەیە، چونکە لەنیوە دێڕی پێشوودا ڕۆژ نووسراوە.

***

## بەهار هات

١٩٤١

بەهار هات و دەردێ ئەبینم لە گوڵدا
ئەویش وەها دیارە گرێی وا لە دڵدا
ئەزانێ کەوا پێنج و دوو ڕۆژە دەوری
کە باوی نەما نامێنێ، کەس، لەدەوری

که ڕازاندیەوە سەرلەنوێ دەستی یەزدان
هەموو خەڵک بەئاواتەوەن بۆ، بەیانیان
بەناڵە و نزان، بولبـــول داخ لەدڵ بۆی
وەک مشت و مـاڵ ژەنگی دڵ نایەڵێ بۆی
بەرۆکی جـوانان و دەست و سـەرە جێی
بەڵێ کە خوا دای کێ دەڵێ کوڕی کێی
کەزادەی چقڵ ڕەنگ و بۆی جوانی وا بێ
ئەبی ڕەنجی شەوگاری بولبول بە با بێ
لە دوای ئا ئەم خۆشەویستییە کوتوپڕ
کە هەڵیان بچڕکان و کەوتە سەر ئاگر
لەگەڵ هەڵمی مەنجەڵ جواناو ئەڕێژێ
بەدەم قـــوڵپی گـــریانەوە وا دەبێـــژێ
کە بێ بایەخە، خۆشەویستی درۆزن
کە تێر بوو دەبینی فڕێی دا سەر و بن
ئەلای دولبەری دڵبەرە بایەخت بێ[1]
مەپندار[2] کەوا بۆرەپیاو دایەخی[3] بێ

.................................................................

(١) لای م. هـ نووسراوە:

ئەلای دولبـــەری دلبـــەرە بایەخی بێ
مـــەپندار کـــە بۆرەپیـــاو دایەخی بێ

کە دیارە ئەمە هەڵەیە ڕاستیەکەیان لەسەرەوە نووسیوە.

(٢) مەپندار: وشەیەکی فارسییە و بەواتای (بە هیوا مەبە)

(٣) دایەخی بێ: بەکەڵکی بێ

***

## بۆ پێکەنین

١٩٤٠

داخم ناچێ، شـــەڕ لەوپەڕی جیـــهـــانە، لێـــرە پاقلە گـــرانە
ئافەرین بۆ قەسابەکان، کە تەنها، گۆشتی ئەوان هەرزانە؟!

***



## کەو

١٩٤٣

هاوینان کـــە کـــەو بەتینی هەتاو
گـەرمـا ئەچێـژن دەم وشک و بێ ئاو
دێن لەسەر کانی دەندووکیان تەڕکەن
ڕاوکـــەر لە پڕدا قـــڕیان تێ ئەخـــەن
گـــوایە خـاوەندی ئایین و کـێـــشن
بۆ پارە و گـۆشتێ گـیانی ئەکێشن
کە خۆشیان گیانیان کەوتە تەنگانە
ئەو پاڕانەوە و داد و فـــوغـــانە
خۆ هێجگار ماسی کە بە بۆمبایەک
بێ گـیـــان ئەکـــەوێ پڕ بەدنیـــایەک
جـــاران کـــە ڕاوی مـــاسی بەتۆڕ بوو
بۆ ســـاڵێکی تر وردەیان زۆر بوو
ئێســـتـــە بەجارێ ورد و درشـــتـیـــان
بە بۆمبای زاڵم ئەکوژرێ گشـتیـان
من بۆچ بەزەیم بەمـــــانەدا بێت
ئێستا بنیادەم ئەمەی بەسەر دێت
هەمـووی هیتلەرێک بوو بەسەبەبکار
سا یاخـوا هیتلەر زوو بدەی لەدار

.................................................................

(١)ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاونەکراوەتەوە.

***

## ئەفسووس[1]

١٩٤٣

ئەفـســووس ئەو عـومـرەی کـەوا ڕۆیوە
بـۆم نـایـەتـەوە لـەدەسـت دەرچـووە
تایێ لە زوڵفت بکەم بەکـــەمـــەند
پێی بگێـڕمەوە و پێ بخـەمـە بەند

چی بکەم هەی هاوار پرچت بڕاوە
داخم بوو بەدوو جەرگم سووتاوە
بەڵام هێلانەی دڵ کە شێوابێ
لێ گەڕێ عومریش تەفر و توونا بێ

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## کاروان[(١)]

١٩٣٣

شێوەی ژیانی کوردی

جاران دە ڕۆژ بەهەچە هەچە و بارە بەرییەوە
بەگەرما و سەبوون و لێزمەی باران و تەڕییەوە
ترسی تەڕیدە، پێشکەشی سوار، شەو فڕێنی دز
دەستیاوی باری کەوتوو لە جێگای خلیسک و خز
ئەرکی گزیر و خانەگیر و مۆریانی نوێن
بۆڵەی کەیبانوو، کفری قەتارچی، پلار و جوێن
چەنگ سووتەکەی بەئاو و کەڕووی نۆردوەنانی کۆن
جووتە و لەقەی ناو تەویلە و هاڵاوی تەرس و بۆن[(٢)]
ئاگری تەپاڵە لۆکسی گزگل، گەڤینی سەگ
دەستەویەخەی قەتارچی لەسەر کا و شەڕە کوتەک
سیخورمەی قەتارچی بۆ هەڵسان و پەلەی
لۆقە و تریسکەی ئێستر و بازدانی جۆگەلەی
لاسەنگی بار بدەرە بەر پارسەنگی خوارییەکەی
خۆ کەوتی پێت لەخرگە چوو لەو دەشتە چی ئەکەی
ئێجگار کە ئافرەتت لەتەکا بوو بەترسەوە
هەر سوارێک دەرکەوێ ئەڵێی ئای جەردەیە ئەوە!
باج و پیتاکی زەنگەنە، گیروگرفتی جاف
هەرچیش کەهاتە ڕێ هەمەوەند بردی ساف لەساف



بەم کوێرەوەری و کولەمەرگییەوە بەچڵکەوە
سێ بەنگە وەرگەڕاو، بەسەر و ڕیشی کوڵکەوە
ئنجا دەچوویتە شارەوە، ناو ماڵی (عاصمە)
بێت و بنووسرێ، نابێتە خوێی چێشت، ئەمە کەمە
ئێستا سواری ئوتومبێل بە، بەسێ سەعات[(٣)]
ئەتباتە سەر شەمەندەفەر دەستوبرد کە هات
سواربە بنوو، بەیانی لە خەو هەستە زوو بەزوو
بەغدایە هات بەپیرتەوە دەیبینی ڕوو بەڕوو
جاران ئەیانوت، ئەوە (وەلی)یە، طەیی ئەرز ئەکا
ڕاستە لە لام کە فەن دووبارە ئەمە عەرز ئەکا
ئنجا کە هات برووسکە خرایە تەلێکەوە
هێنرایە خانووەوە لە چرای هەر پەلێکەوە
زۆرتر لە مانگەشەو دەر و ژوور ڕوون کرایەوە[(٤)]
تاریکی لاچوو، تێگەیینی ئێمە، مایەوە
جارێ ئەبێ بزانین، ئەمانە لە کوێوە هات
چی، چاکترە لەمانە بۆ بەرزی وڵات
لەلای من بەخوێندەوارییە، ئاه خوێندەوارییە
هەر میللەتێ کە فەنیی نەبێ دەردی کارییە[(٥)]
ئاخ خۆزگە خوێندنیش وەکو من ئارەزووی ئەکەم
بیبینم و نەبێتە گرێی قورسی کفنەکەم[(٦)]

(١) پیرەمێرد یەکەمجار ئەم شیعرەی لە ژمارە(٣٥٣)ی شوباتی ١٩٣٣ی (ژین)دا بڵاو کردۆتەوەو نووسیویە، شێوەی ژیانی کوردی.
(٢) لای م. ه وشەی (ناو) نەنووسراوە، کە دیارە کێشەکەی لەنگ کردووە.
(٣) نیازی لەوەیە کە جاران بەئوتومبیل بەسێ سەعات لە سلێمانییەوە ئەگەیشتیتە کەرکوک و لەوێشەوە بەشەمەندەفەر ئەهاتی بۆ بەغدا ئێستە لە سلێمانییەوە بۆ کەرکوک سەعاتێکە.
(٤)لای م. ه نووسراوە ڕووناک کرایەوە کە کێشەکەی لەنگ کردووە.
(٥) لە پێش دوا بەیتی شیعرەکەدا لە نوسخەی ڕۆژنامەکەی ساڵی ١٩٣٣دا ئەم بەیتە نووسراوە.
«شایستەی سوپاسە بەسایەی عیراقەوە
بۆمان لوا کڵاو ئەسپێرین بەتاقەوە»

لای م. ه ئەم بەیتە نەنووسراوە!!.

(٦) لای م. ه نووسراوە: ئاخ خوێندنیش وەکو من ئارەزووی ئەکەم - کە دیارە ئەو نیوە بەیتە لەنگە.

***

## ژیانی کورد[(١)]

**١٩٣٢**

بیستوومە کەوا ئافرەتێ لەسەر پێپیلکەی بان
گایەکی گرتە باوەش و سەرکەوت بەبێ وچان
دیارە کە ژن ئەوەندە هێزی نابێ چۆن ئەبێ
هێندەی کە گایەک هەڵگرێ، کەی هەڵمەتی ئەبێ
ئەو گایە، گوێلکێک بوو، لەپێشدا کە هەڵیەگرت
خۆی ڕۆژ بەڕۆژ بەبردن و هێنانی فێر ئەکرد
هەتا گوێلک زل بوایە، ژنە هێزی زۆر ئەبوو
ڕاهاتنە، بەکوردی، بەبونای (سپورت) ئەبوو
پێشینیانی ئێمە، بەهاران کە ئەچوونە دەشت
گەورە و بچووک بەجارێ لەوێ کۆمەڵێ ئەبەست
لایە بەکەوشەک و شەڕە تۆپ لایە وردەکان
ئاشە تەنگورە، بوخچە بەگەردانی، پشت لێدان
هێجگار کڵاوفڕێنێ، کوڕی گورجی پێ دەوێ
نابێ بگیرێ، باشەش و حەوتیشی شوێن کەوێ
هەرچی کەوا لەسەر قەلەمرداریَ[(٢)]نان ئەخوا
نابێ بێڵێ تۆپەکە بەرزبێتەوە بۆ حەوا
ئەیگرنەوە خراپە، ئەوان دێنە کایەوە
چوار نانە ئەو کەسەی کە بەوەستایی مایەوە
تەنها بەبابی بابی بوو[(٣)] کەرسوار سوار ئەبوو
ئێستا کەرسوارییە، سوار ڕۆیی باوی بەسەر چوو
ئەو بازە و هەڵبەزین و ڕاکردنی خوار و ژوور
ناو جەرگی پاک ئەکردەوە وەک ئاوێنەی بلوور
هەر کەوشی سوور بوو، قۆندەرە چۆن کورد لەپێی ئەکا
ئەو سنگە ڕووت و ساغە لە کوێ ماوە ئێستەکە
ئەو پیاوەی بەم هیوایە کە بەم ڕەنگە هەڵدەکەوت



ناوی لە ناو قەڵەمڕەوی تورکانا سەردەکەوت
ئێستەش ئەوانەیە کە لە عێراقا دەناسرێ
دیارە ئیتر قەت بەپاشەڕۆک سەوی پڕ ناکرێ
ئیدمانی ئێستە هاتۆتە سەر بەزم و خواردنەوە
هەرچی کە زۆری خواردەوە باش پاڵەوان ئەوە
پێکێکی زیادی کرد بەسەرا ئەوسا جێبەجێ
هۆش و دەمار و پارەی بەجارێ لە کیس ئەچێ
ئەو جێگە یارییە خۆشە کە چیمەن بوو سەر بەسەر
ئێستە لە شووشە شۆسەیە گەر پیا دەکەی گوزەر
دایکی وەتەن ئەڵێ، کە ئەسیری زەمانە بم
بەکردەوەی بەد، بەئومێدی چی ئەمانە بم

.................................................................

(١) چوار بەیتی سەرەتای ئەم شیعرە لەوە دەچێ کە پەیوەندی بەتەواوی شیعرەکە نەبێت. بۆ بەڵگەش دەڵێین کە جاری دووەم پیرەمێرد خۆی ئەم شیعرەی لەژمارە (٦٨٤)ی (ژین)ی ساڵی ١٩٤٢دا بڵاو کردۆتەوە ئەو چوار بەیتەی لەتەکدا نییە و لەوێوە دەست پێ دەکات کە دەڵێت:

پێشینیانی ئێمە بەهاران کە ئەچوونە دەشت.

(٣،٢) «قەلەمردارێ و بابی بابی» دوو یاری کۆنی کوردەواری بوون.

***

## بۆ قافیە

**١٩٣٥**

مەجلیسی نواب تەئجیل کراوە
زیافەتی قەرزی شاعیر نەدراوە
شاعیر بۆ قافیە، گەردوخولییە
دیارە قەرزاریش، ڕەگی گولییە!

***

## ژیانی کورد[(١)]

**١٩٤٢**

پێشینانی ئێمە بەهاران کە ئەچوونە دەشت
ورد و درشت بەجارێ لەوێ کۆمەڵی ئەبەست

لایە کەوشەک و شەڕە تۆپ لایە دەستەکان
ئاشەتەنوورە، بوخچە بەگەردانی حەیزەران
هێجگار کلاوفڕێنێ، کوڕی گورجی پێ دەوێ
نابێ بگیرێ با گەلی ئەولاشی شوێن کەوێ
ئەوسا بەبابی بابی بوو کەرسواری بەرئەکەوت
ئێستا کە کەرسوارییە سواربووی نەما سرەوت
ئەو باز و هەڵبەزین و ڕاکردنی خوار و ژوور
ناوجەرگی پاک ئەکردەوە وەک ئاوێنەی بلوور
زۆرخانە پاڵەوانی گەلێ پێگەیاندبوو
گەلێ ئازمایی پشتی لەڕی تێک شکاندبوو
هەر پاڵەوانێ کسوەتی چەرمی ئەکردە بەر
سەنگی ئەگرت هەتا سەد و پەنجای ئەبردەسەر
دوایی شنۆ بوو سنگ و پەراسووی ئەکرد بەبەرد
هەرچی شنۆی ئەکرد لە جیهاندا ئەبوو بەمەرد
ئنجا بەمیلی شەش مەنی سەرشانی نەرم ئەکرد
دوو پاڵەوان بەئەشغلم و ناو و داو و باو
چنگیان ئەدایە یەک وەک دوو شێری توندکراو
ئیدمانی ئێستە هاتۆتە سەر بەزمی خواردنەوە
هەرچی کە زۆری خواردەوە باش پاڵەوان ئەوە
بۆ نەشئە و ئیشتیهایە ئەوندەی کە کەر نەبێ
لێرە حەرامە خۆت نەخەیە شیو و تەڕ نەبێ
ئەو جێگە یارییە خۆشە کەچیمەن بوو سەر بەسەر
ئێستە لە شووشە شۆسەیە گەر پیا دەکەی گوزەر

---

(١) وەک سەرنج دەدەین ئەو شیعرە گەلێ جیاوازە لە شیعرەکەی کە ساڵی ١٩٣٢ بڵاوی کردبووەوە.

***

**١٩٣٧**

«من سەربەست ئەژیم، ڕەند و قەڵەندەر
سەودای مەبعوسیم، بۆچ، بکەوێتە سەر»

***



## بۆ کەنتوی بارامی تیاترۆچی

**١٩٣٩**

ڕاوەستن پێتان بڵێم، ئەم دنیایە چلۆنە
ئێستا کچان تێر ناخۆن بەدراوی پیاوی کۆنە
ئای ئامان ئامان سووتام، خۆشە وەک نوقڵی بادام
ڕەگی ڕۆحیان دەرکێشام، لیرەکانیان دەرهێنام
جادەی تازە (طي) ئەکەن، ئیسکارپین لە پێ ئەکەن
کردوویانە بەمۆدە، بەقەست خۆیان شەل ئەکەن[١]
میراتی زۆرم بۆ ما، کچان لێمیان دەرهێنا
لەڕێی سەودای کچانا، دەرپێم لەپێدا نەما
هەموویش پێم پێ ئەکەنن، پارێز نادەن ئەفڕن[٢]
بە چڕنووک ڕووم ئەڕنن، گیرفان و ڕیش ئەبڕن
ئای ئامان ئامان سووتام، شیرین وەک نوقڵی بادام
ڕەگی ڕۆحیان دەرکێشام، لیرەکانیان دەرهێنام

---

(١) لای م. ه نووسراوە «بەقسە خۆیان شل ئەکەن» کە دیارە هەڵەیە.
(٢) ئەو چوارنیوە دێڕەی دوایی شیعرەکە لای م. ه لە لاپەڕە٢٥٩ی دیوانەکەیدا تێک چوو بوو وە ئێمە لەبەر نوسخەی (ژین)ی ژمارە ٥٨٢ی ساڵی ١٩٣٩ ڕاستمان کردەوە.

***

## پۆکەر و جۆکەر

**١٩٤٣**

پۆکەر کە بۆ کەر لە هەموو شوێنێ
خەرج و باجی خۆی بەزۆر ئەسێنێ
وامزانی ئەمە تازە لەناوە
نەمزانی سەد ساڵ لەمەوپێش باوە
(سالم) لەمەوپێش باسی کردووە
ئەو بەگەنجەفە ناوی بردووە
سێ ئاس و دووشای داناوە بەفوول
کچیش (بی بی)یە کوڕ لۆتی بێ پوول

ئەوسایە جۆکەر دانەهاتبوو
وا دیارە پیاوی ئەوسا یەک ڕوو بوو
ئێستەکە جۆکەر لە ژوور هەموانە
دیارە دوو ڕوویی مۆدەی زەمانە
جۆکەر ناوی خۆی بەخۆیەوەیە
هەرچی بتەوێ بۆ تۆ ئەوەیە
ئەگەر وێر گولی[1] بکەوێتە ناو
ئالیک و چوار پێ یەک ئەخا تەواو
ئای پۆکەر چەندت ڕەست لەسەر بێژرا
ئای مۆنتکارلۆ[2] چەندت تیا کوژرا
هی وایشمان هەیە بەوشکە مەلە[3]
(پوت)یان دوو فلسە ئەویش هەر حەلە

.................................................

(١)واتا ئەگەر وێرگول بکەوێتە بەینی(جۆکەر)ەوە ئەوا ئەبێ بە جۆ، کەر کەیەکەمیان ئالیکە و دووهەمیان چوارپێیە- م. ه

(٢) شاری مۆنتکارلۆ لە فەرەنسە بەناوبانگە بەیاری قوماری هەمەڕەنگ.

(٣) ئەم بەیتە لە ڕۆژنامەکەدا هەبوو، بەڵام لای م. ه نەنووسرابوو ئەوا لە شوێنی خۆیدا نووسیمانەوە.

١٩٤٧

«وا بە بسم اللە، جنۆکە ئەڕوا
ئەی، چی لێ ئەکەی، کەبەندبێ و نەڕوا؟»

***

## دەردی کۆمەڵایەتی

تیاترۆی ئێرە و گشت ئینتزامی
ئێستا هاتۆتە سەر گەمەی ڕامی[1]
بڵاوبۆتەوە لەناو خاس و عام
جۆکەریان کردە ویردی سوبح و شام
گەر بێ خەبەری فەرموو بیبینە
شەوێک بچۆرە چاخانەی (مینە)[2]
ئەوسا ئەبینی لە هەموو لایەک
هەرچەند کەسێکە و چوونە پەنایەک



دەوری کاغەزیان داوە و دانیشتوون
بۆ وەسڵی جۆکەر شێت و شەیدا بوون
خەریکی یارین هۆشیان نەماوە
ملیان کووڕ بووە و پشتیان چەماوە
هەر زرم و هووڕوو هەرا هەرایە
سەیرێکی خۆشە وەک سینەمایە
بڵێ: «لَهُ الحمد» ئەم گەلی کوردە
بۆ شتی بێ فەڕ بەدەستوبردە
نیفاق و فیتنە و جاسووسی و قومار
تیایا شارەزان وەکو دانی مار
ئنجا بێینەوە سەر یاریکەران
هەر دەستەی بەجیا بۆت بکەم بەیان
تاقمێک مەئمور سدارە بەسەر
تێکەڵ بەیەک بوون، وەک چێشتی سواڵکەر
یەکێک مودیرە و یەکێک محاسب
یەکێک معلم یەکێک باش کاتب
ئەمڕۆ لەوێدا وەکو ئامووره
کۆڕیان دێتە جۆش بەچەشنی کوورە
لە هەوەڵی مانگ تا پێنج و شەشی
هەر لەسەر پارە ئەکرێت دووبەشی
بەڵام برادەر کە هەشت و نۆی دێ
گوی سەگ بە حاڵی هەر خۆی بەخۆی بێ
ئنجا قەرز ئەکا پارە لەم و لەو
لەبەر قەرزاری خۆ نانوێ بەشەو
بەم نەوعە لات بوو پارەی نەماوە
یارییەکەی دێتە سەرچایی و قاوە
بە کورتی، دائم پەست و غەمبارە
بێ قەدر و قیمەت سووک و قەرزارە
دەستەیەکی تر ئەویش تجارە
سلکی کاسبی و ئەهلی بازاڕە

به ڕۆژ هەوڵ ئەدەن بەو حاڵە پیسە
بەسەد ئۆین و سوێند و دەسیسە
دەستی خەڵک ئەبڕن شتێک ئەفرۆشن
کە شەویان لێ هات وەها بەجۆشن
لێکی بەرەوە و چاکی بزانە
ئەمە ئەحواڵی موجتەمەعمانە
من ڕێگەی یاری ناگرم بەکوللی
با بکرێت بەڵام بەموعتەدیلی
ئێمە قەومێکین وا لەژێر بارین
حەیفە ئەوەندە خەریکی یارین
جارێ با خۆمان دەرکەین لەوەحشەت
ئەوسا دەسبەنە ئەسبابی عوشرەت

........................................

(١) ڕامی: جۆرە یارییەکە بەکاغەزی قومار ئەکرێ.

(٢) چاخانەی مینە: نیازی لە چاخانەکەی مینەشەلە کە لە نزیک بەردەرگای سەرای سلێمانییەوە بوو.

***

## زێڕ

١٩٤٥

زێڕ و زیو بەرە بەتکاتەوە
زۆر زوو زویرت ئاشت ئەکاتەوە
زێڕ هێند پەسەندە بانگ کەیتە کەرێ
لەگەڵ وتت زەڕ ئەو بۆت ئەزەڕێ
کە زانیت دۆستت وا بەجێی هێشتی
بنێرە مشتی، بپەڕە پشتی
شەیتان بلوێری دا بوو بەشوانێ
لەگەڵ لێی ئەدا لە دیوەخانێ
هەرچی کە لێبوو، ئەکەوتە سەما
هیچ کەسێ لەسەر باری خۆی نەما
خوداوەندی لەوح لەوحێکی وای بوو
هەرچی بیدیایە تەسلیم ئەبوو زوو



ئێستا زڕەی زێڕ دەنگی بلوێرە
لەوحی بانقە نەوت هەرچی دی کوێرە
ئەمە سیحرێکە لەناو نابرێ
بەعەسای مووسایش چاری ناکرێ
هەرچەند کە پارە خوا خۆی دایناوە
بۆ ئەو هیچ کەس خوای لەبیرنەماوە
قانوون قانوونە و تەلی پێچراوە
عەدل (ه)ێکی لە دوو خراوە
وردە نازانێ چاری چۆن ئەکا
ماسی لە پێشدا سەلکی بۆن ئەکا
(ظیف)ی پارەدار (فیض)ی لەگەڵە
بەخشندە لەگەڵ هەموان تێکەڵە
واتەی عەزیزی دوڕ و گەوهەرە
بەڵام (کیم اوقلەر و کێم دیکلەر)ە[١]

........................................

(١) واتایەکی تورکییە واتا: کێ ئەیبیستێت و کێ بەقسەی ئەکا.

## وەمزانی

١٩٤٢

زستانان دووپشک ئەچنە کونەوە[١]
من خزاومە کون ئەمدۆزنەوە
وەمزانی سەرما دووپشک سڕ ئەکا
کەچی سەرما ئەو گەرمتر ئەکا
هەر هەنگ نامووسی خۆی ڕادەگرێ
بە پیاویەوە دا لە داخا ئەمرێ
بەرخ و کار دەنگی بلوێریان ئەوێ
سەد بلوێر لێدەی گا بۆی نانەوێ
جاران موختاران گزیریان هەبوو
بە گزیر ناوی چاکان دەردەچوو
یاخوا گزیرمان خوا لێ نەستێنێ
ئەگەر ئەو نەبێ پیاو چاک نانوێنێ

چەند خۆش بوو جاران بەمیر و گزیر
کە ئەموستیلە ئەیکردی بەمیر
یاخو باز ئەنیشت بەسەرسەرتەوە
ئەکەوتیە شاهی بەیاوەرتەوە
ئێستا ناوێری لە کون دەرکەوی
بەبابی بابی مەگەر سەرکەوی
بابی بابیشمان لە بەهارایە
بەهاریش هێشتا شەڕ لە کارایە
هانام بەتۆیە خوای پەروەردگار
لێمان نەشێوێ سەیرانی بەهار

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بلاو نەکراوەتەوە.

***

## لەخۆ بایی بوو

١٩٣٥

«جارێکی تریش، بۆمان نووسیبووی
تۆ بەخوێندن و نووسین، بایی بووی
نازانی، کارمان، بەئیلتماسە
ئەوی بێ پاسە، بەرگی پەلاسە
ئێستا کێ ئەڵێ، هونەرت بەچەن
ڕێوی قەباڵەی، پێ بوو، پێستیان کەن
دەست بەکڵاوی خۆتەوە بگرە
با جارێکی تر، نەتبەن بەسوخرە»

***

## زستانی سەخت

١٩٤٢

زستانی ئەمساڵ هێجگار سەخت و سارد و سۆڵە
پیرەژن و پیرەمێردی کرد بەگڵۆڵە



کەوتینە سووتاندنی گوێسوانە و کەمۆڵە
سەراپای جیهان ئەبریقێتەوە سەهۆڵە
چاڵە بەفرەکان هەر لە خۆوە پڕ بوونەوە
چلوورە بەسەر گوێسوانەدا شۆڕبوونەوە
ئێمە زۆرتر لەبورجی پیرەژن ئەترساین
ئەویش هات و تێپەڕی کرد ڕۆی و خەلەساین
خۆشی خۆشیمان بوو ئەمانوت کە بەهارە
ئیتر دەمی بۆس و کەناری جۆیبارە
کەچی فەلەک لەناکاو لێمان بەقینا چوو
ئاوات و خۆشی بەهارمان ئاڵۆزکا و تێکچوو
چڵکە هەورێ لەو پەڕی شەرقەوە پەیدا بوو
برووسکەی دا یەئجووج و مەئجووج بەیەکدا چوو
(سەنغافورە)ی سووتان هەموو (جاوە)ی هەڵقرچان
بەڵام زۆری پێ نەچوو، زرمەیان لێ هەڵسان
هەوریان پارچە پارچە کرد و ترسیان لەناوبرد
هەموو یەئجووج و مەئجووجیان تەفروتوونا کرد
ئێمەش لە شوێن خۆمان وەکو بەرزەکی بانان
ڕزگارمان بوو وەک نەبامان دیبێ نەباران

***

## بالۆره[1]

١٩٤٢

ڕەجمی شەیتانی حەجی موسوڵمان
قەومی یەهود و کوشتنی هامان
حەدیسە ئەڵێن دوو ئەبێ بە سێ
هیتلەر سێیەمە چۆن ئەخەلەسێ
هیتلەر نەک تەنها یەهود بەتەنێ
دەست هەرچی کەوێ پێستی ئەکەنێ
خۆزگە شەیتان و هامان و هیتلەر
چاومان لێ ئەبوو کە ئەکەونە شەڕ

بانگمان کردایە بەهەلەل هەلەل
قورقوراگەی یەک هەڵێنن سەگ گەل
شەیتان زۆرکەسی لەرێ وەرگێرا
هیچیان وەک هیتلەر شەری نەگێرا
یەکێ لەو پەری دنیا بەدکارە
لەم پەری دنیا بەجنێو بارە
هەندێ گوناهی ئەبێ بەزرێ
پەیکانی تیری دوعا نایبرێ
عاقڵ لەکاری خوادا نەزانە
(لایسئل عما یفعل) قورئانە
بەمێشوولەیەک نەمروود ئەکوژێ
خوێنی دنیایەک بەهیتلەر ئەرژێ
هەندێکیش بۆیە بەرز ئەبنەوە
کە کەوتنە خوارێ دەم نەکەنەوە
نانی دەلیلی حەجاج ئەبرێ
پێشڕەوی حوشتر بەکەر ئەبرێ

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ھ دا بڵاونەبۆتەوە.

***

## بەهاری[١]

١٩٤١

وا بەهار هات لەلاوە
تاوس چەتری هەڵداوە
نێرگس ڕووناکی چاوە
ڕێحانە زوڵفی خاوە
شاخ مێزەری بەفری بەست
خوتبەی سەربەرزی هەڵبەست
ریزی بەدەستەگوڵ بەست
بولبول بانگی هەڵداوە
سەیرانکەر کەوتنە جەولان



بەبەرگی ڕەنگی گوڵان
زەرد و سوور ئاڵ و واڵان
دەستە گوڵی بەستراوە
گۆرانی سەیرانکەران
دەنگی بولبول لە داران
خرنگەی پۆیلە داران
بە ئاهەنگ تێکەڵاوە
هەورە ترشیقە و باران
کوتوپڕ هەڵبوورونگان
هەم پێکەنین هەم گریان
هەر بۆ بەهار لەواوە
بەهەشتی جاویدانی
گەر نەتدیوە و نایزانی
بەهەشتی سلێمانی
بنوارە لە پێش چاوە
ئەو ئەرخەوانە جوانە
کە بەگەردی سەیوانە
سەیری کە ئەو کچانە
وەک قومری دەوریان داوە
گەردی یارە دیارە
جێ تەجەلی دڵدارە
خۆڵی ئەو نوور و ئاوە
کلی کە نووری چاوە
ئەو کاریزی شەریفە
کە مەڵبەندی زەریفە
ئاوی ڕوون و لەتیفە
چۆپی کیژان پێی داوە
بۆ ئەم خاکە وەک دڵسۆز
ئاگرم تێ بەربوو بەسۆز

نـاوم نـا ئـاگــــــــری نـەورۆز
لـەدڵـمـــــــا داپـۆشـــــــراوە

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

تێبینی: پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە ژمارە (٦٢٢)ی ڕۆژنامەکەیدا لە مارتی ساڵی ١٩٤١دا بەناوی (عزەت محی‌الدین)ەوە بڵاو کردۆتەوە. یەکەمین کەس کە بۆی ساخ کردووینەوە کە ئەم شیعرە شیعری پیرەمێردە و هیچ کەسێکیش یاخود شاعیرێک هەرگیز بەناوی (عزەت محی‌الدین)ەوە بوونی نەبووە، مامۆستا (نەجمەددین مەلا)یە. ئەویش لە ژمارەی دوای بڵاوبوونەوەی شیعرەکەی (ژین)دا واتا لە ژمارە٦٢٣دا نەجمەددین مەلا بۆ خوێنەرانی ئاشکرا دەکات کە عزەت محی‌الدین (پیرەمێردە) و کەسی تر نییە. هەر لەهەمان ژمارەدا و دوابەدوای نووسینەکەی نەجمەددین مەلا کە بەئیمزای (بێ کار)ەوە نووسیویە، پیرەمێرد وەڵامی دەداتەوە و ئاشکرای دەکات کە ئەو (بێ کار)ە (نەجمەددین مەلا)یە ئەمەش دەقی هەردوو نووسینەکەیە:

## بێ کاری

ژین ژمارە ٦٢٣ ساڵی ١٩٤١

ئـاخ، لـەدەس بـێ کــــــاری، تـووشـی دەردێـکـی کـــــــردووم
کـە بەهەمـوو بیـرمـەوە تێـبـینی لە ژیانم ئەکـەم، تێی ناگـەم!!

نازانم خەوە، یا مەستیە؟! نازانم بیرە یا ڕاستە؟! نازانم هەر لەبەر خۆمەوە ئەبزرکێنم، وەنەوز ئەدەم، چاکیشە شێت نابم؟!، (ماوەمە، هێشتا پاقلە، مەلا خۆر نەبووە). ها، ها، ها. خۆ ئەگەر بێت و گوێتان لە دەم و دوانم بێ، هەر شێت ئەبن؟! ئەوە بۆ نایەن گوێ لەم چەند وتەیەم بگرن، ئەڵێم، ئەی باوکی (ژین) و (ژیان)، زیندووکەرەوەی زمانی کوردستان، پیرەمێرد گیان، سوپاستان نایەنمە پایان، وە هیوای مانتان ئەخوازم لەیەزدان. لە ڕۆژنامەی ٦٢٢دا هۆنراوەیەکی بەهاریی زۆر جوان و نایابم دی، کە لەوانەیە هەر لەتۆ بوەشێتەوە، کەچی بەناوی یەکێکی تر نووسرابوو؟!. بەڵێ ڕاستە، بەهەڵە نەچووم، کە چوومە بنج و بناوانی ئەم ئیشەوە زانیم، خۆتی!، لەمە زۆر دڵگران بووم، چونکە ئاساری تۆمان لەوانەی یەکێکی تر بۆ جیا ناکرێتەوە (بێسارانی، وەلی دێوانە و، دەباشانی) و کێ و کێ!!. خۆت ئاگاداری لە سلێمانی، لە کونجێکی تەنیایی دا، سەرنووسەرێکی نرخداری ژیری کورد کە بە(نەجمەددین) ناوبانگدارە و لەلای من بە(نجم الأدب) ئەزانرێ، ژیانی خۆی کردۆتە تەرخان (وقف)ی ئەدەبی کورد، بەتایبەتی کۆمەڵە هۆنراوەیێ ڕێک بخەی بەناوی یەکێکی واوە بینووسی، ئەی (نجم الأدب) بەناوی کێوە بینووسێ؟!. خۆ (م. هۆشەنگ)[1]یش ئەیەوێ کە مێژووی ئەدەبی هەموو



کوردستان بنووسێتەوە، ئایا ئەگەر هۆنراوەیەکی جوانی وای دی ئەو چی بکا؟! ئەو ئیشە ئەبێتە هۆی پەل و پۆ وشک کردنی ئەدەبی کوردی ساوای تازە سەرپێ کەوتوو. وەکو ئەو نەورۆزنامەیەی کە لە دوو سێ ژینی لەمەوپێشدا دیمان کە بەبێ ناو نووسرابوو، ئایا بەکێی دابنێین؟! کێ وەکو من خوا گرتوویەتی وەک؟[2] پێ سووتاو سەر ئەکەم بەهەموو کونێکا و لە پاش هەزار چەرمەسەری زانیم کە موهەندیسی ئیشغالی سلێمانی (حکمت ئەفەندی) وتوویە؟!.

بەڵام ئاخ لە دەست چەند کەسێک کە ئەو (واجبات و شروط)انە پێویستە لە هونەرابێ لەوانا نییە؟! و لە خۆیانەوە دەستیان داوەتە هۆنراو وتن، ئەگەر ڕۆژگار یاریدەمان بدا دەست ئەکەینە (تحلیل) کردنی شەخسیی ئەو جۆرە کەسانە و ئەیانهێنینە بەرچاوی خوێندەواران وا ئەزانم ئەم نووسینەی کە نووسیم بەدەمم زیادە، بەڵام وتەکە هاتە سەر هەق، کردنی، چاکە و دیارە تۆش ئەگەر بزانی لێم ناگری، هەرچەند کە ناشمزانی، هەر لێم ناگری، چونکە لەناو کوردایەتیدا باوە ئەڵێن (شێخ و مشایخ) دوور و نزیکیان بۆ نییە، هەرووەها ناسیاو و نەناسیاویان بۆ نییە؟!. تۆش (شێخ و مشایخی).

بەخوا، زۆرم وتە ماوە، بەڵام بۆ جارێکی تر، ئیتر هیوام لێبووردنە، هیوام نووسینی ئەم نووسراوەیە، هیوام بەجێهێنانی نووسراوەکانمە، هیوام...»

بەئیمزای (بێکار)

وەڵامی پیرەمێرد: کۆنەپیاوەکان، کاتی تیروکەوان وتوویانە: تیر ئەهاوێ و کەوان ئەشارنەوە؟ تۆیش تیر ئەهاوی، کەوان ئەشاریتەوە؟! ناوی خۆت گۆڕیوە!!، خەڵک شیعر ئەدزن من خۆم دزیوە[3]، تۆ ئەو کوڕەی کە بەشوێن (زەرگەتەیی)دا چووبوویتە کۆنە کەلاوەکەی زەرگەتە!!، تۆ (نەجمەددین مەلا)ی لەمەڕ من و وێڵی ئەدەب و ئەدەبیاتی کوردی!، منیش زیندوویان ئەکەمەوە، لە چاپیان ئەدەم، لەسایەی خوا و خاکەکەوە، ئەم خاکە ڕووناکە ئەمەندەی شاعیر تیا بووە، هێندەی (کلمات ربی)، ئەگەر دەریاش ببێ بەمەرەکەب بەنووسینی ناگا!.

ئیمزا (پیرەمێرد)

---

(١) م. هۆشەنگ: واتا (محەمەد مستەفا حەمەبۆر)ی نووسەر و ئەدیب.
(٢) لەواتای کوردیدا دەگوترێ «وەک سەگی پێ سووتاو» گەڕۆکە.
(٣) واتا شیعرەکە هی خۆمە و کاتێ بەناوی یەکێکی ترەوە بڵاوم کردۆتەوە واتا لەخۆم دزیوە.

***

١٩٣٤

«نـەوتی کـەرکـوکـمـان بەبۆری ئاسن
وا گـەیشـتـە حـەیفـا خـودا بناسن!

## ئاخ بۆ ئەم خاکە[١]

١٩٤١

ئاخ بۆ ئەم خاکە، داخ بۆ ئەم خاکە
هیچ کەس نازانێ، ئەمەندە چاکە
تا هەڵیکۆڵی ئاوی لێ دەردێ
تا ئاوی دیدەی گوڵە، هەر هەردێ
بەهەشتی پەنهان، سلێمانییە
ئەو دوو جۆگە و ئەم، هەزار کانییە
بڕوانن هەرچی هەستا شاعیرە
لە زەوقا هەمووی وەک یەک ماهیرە
دریغا کوشتەی هەر، نائاشتییە
سەرپەرشتییەکەی سەرپەرشتییە
سەیر کە ئەمجارە بەشیعری ئاودار
(ژین) وەک نیشتمان بووە بەگوڵزار

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. ه دا بڵاونەکراوەتەوە.

***

## دەردی گران

دەردی گرانە، تووشی نەوەی نەخوێندەوار ئەبێ[١]
مێردەزمەیەکە، سواری کوڕانی بەکار ئەبێ
بەرزی خەیاڵە کە هەڵیئەبڕێت بۆ کەمەندی بەند
زهنی تەڕ و جوانە کە بەشیعر ئیختیار ئەبێ
سواری (سمندەر)سم لەهەوا دایە لەمەعنیا
نازانێ کە کەوتە خوارەوە، غەمخوارە خوار ئەبێ
ئاهەنگی وەزن و قافیەیە بەشەو لە کەللەیا
تاری درۆیە بە(أحسن أكذب) ئەشعار ئەبێ
دەعیەی دەماغی، نایەڵێ کاسبیەک بکا بۆ خۆی
بەشەو خۆی پیادەیە کەچی خەوی لێ سوار ئەبێ
دێتە ئەمەی کە بنووسێ، لە پڕ شیعری دێ بەتاو
نەینووسێ، بیری نامێنێ، ڕەنجی بەخەسار ئەبێ



تاریکە ژوور، چرای نییە، بۆی دێتە دەر بۆ حەوشە
گەر مانگیش نەمابێت، ئەستێرەی شەوقی دیار ئەبێ
بەو ڕەنگە، وا گریمان قەسیدەکە، تەواو کرا
کەس نابێ کە بۆی بخوێنێتەوە، بێ قەرار ئەبێ
جارێکیان لە ئەستەموڵ، لە شەوا، تازە شاعیرێک
شیعرێک ئەڵێت، لەخۆشی ئەو شیعرە گەشکەدار ئەبێ
چی بکات؟ ئەچێتە بەردەرگا و بەگچیەک[٢] تێئەپەڕێ
بانگی ئەکات بۆ خوێندنەوەی، ئەوسا شیعری سوار ئەبێ
بەم ڕەنگە فێری شاعیری بوون و سەهلە دوای ئەمە
سەد قۆرتی وا هەیە، کە گوزەران ژاری مار ئەبێ
چاوی ڕوا، بەشکو، نانێ لە (دوونان)[٣] دەستکەوێ
گەر ڕۆحی بوایە، مەدحی درۆ، شەرمەزار ئەبێ
کەوتووینە دەورەیەکەوە، کە بەهەزار بەزم و نەزم
باوەڕ مەکە، کەرەمکەر، کە بەدەست ئیختیار ئەبێ
هەجوویش ئەکەی، پەڵێکە ئەیهاویە ناو جۆگەلە
داوێنی هەجووەکەشت بەپڕیشک لەکەدار ئەبێ
من ئەم قسانەم بۆ ئەدەبی میللەتەکەم ئەکەم
کە ئاوێنەیەکە، زۆر کەسی وای تیا دیار ئەبێ
شیعرم هەیە کە بانگە لەناو کوولەکەی تەڕا[٤]
بووکم هەیە وەکو مانگە بەڵام جێی حەسار ئەبێ[٥]
زۆری نەماوە، کوڕگەلی کورد، بێنە ناو کایەوە
ئەوسایە شەخسی، شەخسی[٦]، خۆی بەخۆی سەنگەسار ئەبێ
ئەنجا ڕەواجی شیعر و ئەدەب، وەختی دێتە برەو
ئەو سنعەتە نەفیسە، هەر هەمیشە بەهار ئەبێ
نەزمی جەلیلە، کە موعجزەی «خاتم النبي»یە
شیعریش بەشێکە لە حیکمەت، وەک دین پایەدار ئەبێ
هاتم بەقافیە و بەقسەی قۆڕ و لەنگ و درێژ
نووسیم، نەوەک بڵێن کە تەڵاکەی کەم عەیار ئەبێ

خـــۆزگـــە ئەوانەی کـــە بەفـــەســـاڵ و بەفـــیـــشـــاڵ ئەدوون
لەو تیـــرەیە دەبوون، کـــە تیـــروکـــەوانیـــان دیار ئەبێ

(١) من لەلای خۆمەوە، سەرەتای ئەم شیعرە، یاخود هەتا چوار پێنج بەیتی یەکەمی، بەشیعری پیرەمێرد نازانم و لەوە دەچێ لەفارسی یاخود تورکییەوە وەری گرتبێ.
(٢) بەگچی: ئێشکچی شەو. حەسحەس.
(٣) دوونان: پیرەمێرد لێرەدا جناسی بەکارهێناوە، نیازی لە دوو نانە و نیازیشی لە مرۆڤی بەد و پیسە (کۆمەڵی دوون). پیرەمێرد نیازی لەو شاعیرانەیە کە مەدحی هەندێ مرۆڤی بەد و پیس ئەکەن، هەر تەنها بەنیازی ئەوەی کە نانێکیان (یاوەکو ئەو ئەڵێ دوونان)یان لێ دەسکەوێ بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی کە ئەو کەسە شایانی ئەو پیاهەڵدانەیە یا نا ؟! م. هـ.
(٤) لەسەرەتای ڕوودانی ئیسلامدا موسوڵمانە تازەکان لە ترسی قوڕەیشیەکان لەناو کوولەکەدا بانگیان ئەدا بۆ ئەوەی دەنگی بانگەکە دوور نەڕوات و قوڕەیشیەکان گوێیان لێ نەبێت. پیرەمێرد ئەڵێ: شیعرەکانی منیش وەک ئەو بانگە وایە، ڕاستە، بەڵام لەتاو بەدکاران ناوێرم بەدەنگی بەرز بیخوێنمەوە. م. هـ
(٥) جێی حەسار ئەبێ: واتە (حەسار) کە دیوارە ئەیشارێتەوە. م. هـ
(٦) شەخسی: واتە (خود پەسەندی). م. هـ

***

## وردە زیو

١٩٤٠

ناز نـازی نـازی، چـاوی شـــــــــابـازی
گـــەردنی قـــازی، بەگـــەردنی قـــازی
دان بەلیـــوبـایی، شـــەکـــری ناوچایی
مـاچی گـیـان بایی، گـوڵی هەرجـایی
کـوڵمی گـوڵ مـینا، گـەردنی مـینا
لەســـەر زەمـــینا، لە یەکـــەمـــینا
گـــڕ لە ســـینەمـــا، بوو بەســـینەمـــا
جـەرگ و دڵ نـەمـا، باسی سی نـەمـا[1]
سنگی زیوی قـاڵ، بەهێ و چاوی کـاڵ
من کـە نیـمـە مـاڵ، بۆم نابێ بەمـاڵ
شەو بەخەو هی من، بەخەو هەر هێـمن
بێ خـێـو مـاوم مـن، خـەو بوو بەدوژمن



دڵم پیـــر نابێ، تیـــفلە و ژیر نابێ
بۆم ئەسـیـــر نابێ بە بەند گـیـــرنابێ
مـاڵئـاوا خـەیاڵ، چاو لێک نێم دەرحاڵ
شـیـرین خـەت و خـاڵ، حـازرە لە مـاڵ

(١) لای م. هـ نووسراوە «جەرگ و سی نەما، باسی سی نەما». کە دیارە هەڵەیە.

***

## قافیەش گران بوو

١٩٤٢

ســـــــەیرانکـەران بـەهـاران
کـــــــەدەچنـە بـەر بـنـاران
بـەچـــۆپـــی پـــۆیـلـــەداران
عـــومـــر دەگـــێـــڕنە دواوە
تیـــپی کـــچـــان لەو دەشـــتـــە
وێنەی حـــۆری بەهەشـــتـــە
پێی پیـــاو ئەبەن لەخـــشـــتـــە
ســـەر لە ڕێبـــوار شـــێـــواوە
ئەو ئەرخـــەوانە جـــوانە
کـــە لە گـــردی ســـەیوانە
بەڕیزە ئەو کـــچـــانـــە
وەک قـــومـــری دەوریان داوە
ئەو کـــارێزەی لەو ســـەرە
کـــەجێ ڕاوگـــەی دولبـــەرە
ئەو ئاوەی وەک کـــەوســـەرە
چۆپی کـــیـــژان پێی داوە
بۆ ئەم خـاکـە وەک دڵسۆز[1]
گـــڕم تێ بەربـوە بەســـۆز
نـاوم نـا ئـاگـــری نـەورۆز
ئەم ئیـــرســـە بۆ من مـــاوە

بەهەشتی جاویدانی
هیچ کەس نەیدی و نەیزانی
بەهەشتی سلێمانی
ئاشکرا لەپێش چاوە
کردیە ڕەهێڵە و باران
دوایی هەڵپڕووکان
هەم پێکەنین هەم گریان
هەر لە ئاسمان ڕووی داوە
ئەم کوردیەی ڕەوانە
کە ئاسانە و گرانە
پێغەمبەری زبانە
بۆیە وا کەوتە دواوە

---

(١) لای م. ه نووسراوە (بۆ ئەم خەڵکە وەک دڵسۆز) کە دیارە هەڵەیە.

تێبینی: چەند پارچەیەک لەم شیعرە لەگەڵ شیعری (بەهاری) لەمەوبەر نووسیمان لەیەک دەچن، دیارە هەر خۆی دووبارەی کردۆتەوە.

١٩٣٥

«بێ دەسەڵات بی، هەڵدێنە سەرت
ئەگەر لێت ترسان، ئەمرن لەبەرت
ئەتەوێ شەڕت، پێ نەفرۆشن
ئامادەی شەڕ بە، لە ڕاستی دوژمن»

***

## ورێنە(١)

دڵ خەملیوی غەم، جەرگ بەزام ئاوا
بەم جۆرە شادم، ماڵی جەور ئاوا
هەر مردنە دەرد، ئەگێڕێتەوە
چرا هەر بە با ئەحەسێتەوە
ئەو کەهات ئەبێ خانەی خاڵی بێ
هیچ کەسی ناوێ ئەگەر حاڵی بێ



خاڵی ئەو مامی هێنا نوقتەدار
ئەوبەهارە و من پایز گەڵای دار
لەبەر ئەو برا، لەبرا بڕا
برستی بڕا، ئەوی لەو بڕا

---

(١) پیرەمێرد گەلێ شیعری بەم ناونیشانە بڵاو کردۆتەوە.

***

١٩٤٨

«بەئارەزووی دڵ، پێم خۆشە وەک مۆم
بۆ چاوڕوونی ئێل، توانەوەی خۆم!»

***

## خۆزگە

خۆزگە تەفرەی وام بیر ئەکردەوە
چاو و دڵم پێ ڕوون ئەکردەوە
دڵ ئەگری لەبەر دەردی تەنیایی
چاو ئەگری لەبەر نووری بینایی
خوایە ئەمانە تۆ وات لێ کردن
نازانم بۆچی بەم دەردەت بردن؟!
بۆچ ئەو ئافەتەت نیشان دا بەچاو
چاو شریخەی کرد لە دڵ و هەناو
وا دانامرکێن ئەم دوو مناڵە
گیزە گیزیانە وەک زەردەواڵە
ئەڵێم گرۆز بوون با بیاندەم بەو
ئاخ خووی دڵڕەقی وەرئەگریت لەو
دارتاش کە جەردە تەشوێکەیان برد
ئەیدا بەسەریا و بێدادی ئەکرد
بۆ ئەوەی نەبوو تەشوێکەی ئەبەن
ئەیوت ڕەنجەڕۆم دەمەسووی ئەکەن

***

## ناخۆشە لای

١٩٤٨

ناخۆشە لای بەچاوی تەڕم سەیری ڕووی ئەکەم
من تەڕ لەبەر هەتاوی ڕوودا بۆ خۆم هەڵدەخەم
چاوم ڕوا، بەرێکی لە لیمۆی بەرۆک نەدی
بێخی لە ئاوە، وشک نەبێ بەری دوایی دێتەدی
خوو و ڕووت[١] ئەگەر لەیەک ئەچوو من باغەوان ئەبووم
چی بکەم لەگەڵ گوڵا، ئەزەلی هاتووە دڕکی شووم
لێوت بەگفتوگۆ شەکرە و ڕوومەتت گوڵە
لەو دووانە گوڵ بەشەکرم ئەوێ قوەتی دڵە
عەشق و جەمال لەسەر من و تۆدا کە کەوتە ڕوو
من بەختی تۆم، خەوم نییە، تۆیش بەختی من، بنوو

(١) خوو و ڕووت: واتە ئەگەر خووی تۆ لوتف و دڵنەوازی بوایە بۆ من و وەک ڕووت جوان و میهرەبان بوایە ئەوا دەبوومە باخەوانی جوانیی تۆ.

***

## واتەی پڕ مانا

١٩٣٩

ڕێی ئەو دەشتانە کە لە پێش چاوە
دێڕێکە بەپێی مردوو نووسراوە
کێلی قەبرەکان[١]، نامەی ئاشکران
لە عوقباوە بۆ زیندووەکان نووسران
ئەو پێچ پێچۆکەی ڕێگەی خەراجیان
ڕێچکەی فێڵێکە بۆ ڕێوی دەوران[٢]
حیرسی ماڵداری و دووپشکی عەربەت[٣]
بۆ ئەهلی مەعنا بووە بەعیبرەت
تەشوێ کە سەری شۆڕ و داماوە[٤]
ڕەنجی فەرهادی لەچاو گیراوە



هەر دانە بەردێ لە سید صادق[٥]
سەری شاهێکە و مەردێکی لایق
هەر نەیجەیەکی[٦] سەرچاوەی قوماش
باڵای لاوێکە پڕ زۆر و پڕ خاش
قارەمان شەش پای لە قوماش داگرت
ئێستا دۆم جێگای قارەمانی گرت

(١) لە ڕۆژنامەکەیدا (قەبرەکان) نووسراوە. کەچی مامۆستا م. ھ کردوویە بە(گۆڕەکان) بڕوانە ژین ژمارە ٥٨٢ ساڵی ١٩٣٩.

(٢) ڕێوی، کە تانجی یاخود زەلام ڕاوی ئەنێت ڕێگای پێچ پێچۆکە ئەگرێ بۆ شوێنە ونی. م. ھ

(٣) گوندی عەربەت کە مەرکەزی تانجەڕۆیە بەدووپشکی ژەهراوی و کوشندە بەناوبانگە. م. ھ

هەروەها پیرەمێرد لە شوێنێکی تردا دەنووسێت:

کاولەکەی وەتەن هێندە شیرینە
ژاری دووپشکی عەربەت هەنگوینە

(٤) پیرەمێرد لەو دێڕەی دواییدا وردەکارییەکی زۆر بەرزی بەکارهێناوە، ئەڵێ، تەشوێ لەگەڵ ئەوەشدا کە دار و شتی سەخت دائەتاشێ کەچی سەری شۆڕە، چونکە ڕەنجی فەرهادی لەکیس دا و ئەو ڕەنجە بەفیرۆچووەی لێ گیرابوو.

(٥) سید صادق ناحیەیەکە لە نێوان سلێمانی و هەڵەبجەدا. لەسەردەمی پیرەمێردا گوندێکی بچووک بوو بەڵام ئێستا مەرکەزی ناوچەی شارەزوورە.

(٦) نەیجە، قامیشە هەروەها نەیجویشی پێ ئەڵێن کە هەمیشە لە گوێ چەما ئەڕوێ.

***

## فەلسەفەی کورد

١٩٤١

هەر ئەموت خۆزگە، دنیام بدیایە
گلەیی خەڵکم، لێ بپرسیایە
بم وتایە بۆچ، گلەیی ئەکەن
بۆ چ وا جنێوی سووکت پێ ئەدەن
ڕۆژێ بەتەنها لە ماڵەوە بووم
وەنەوزم ئەدا خەریک بووم بنووم
لەپڕ تەڕپیرێ، بەئاڵ و واڵا
تەنیا و سەربەخۆ، کردی بەماڵا

بەلار و لەنجە هات بەلامەوە
بێ پەروا دانیشت بەئارامەوە
وتی، ئارەزووی منت کردووە؟
خەڵک ناوی منیان بەسووک بردووە
ئەوەیش ئەزانم تۆ منت ناوێ
خۆت قەمتەر ئەکەی بەنان و ئاوێ
لەبەر ئەوەیە کەوا هاتمە لات
ئەوا خۆم هێنا، بۆ تۆ بەخەڵات
من ئەو سێبەرەم دوام کەوی ئەڕۆم
ڕووم لێ وەرگێڕی، من لە شوێنی تۆم
لەو ساوە کە خوا، منی داناوە
مۆری کچێنیم هێشتا نەشکاوە
ئەوی نێرپیاوە منی لا سووکە
ئەوی ئەیەوێم ڕاست نێرەمووکە
خوا پیاوی بەمن تاقی کردەوە
بۆ مەحەکی پیاو، بووم بەکردەوە
ئەوی کە جارێ گرتمە باوەشم
دین و ویژدانی کرد بەپێشکەشم
بەبێ ئیختیار تەسلیمی من بوو
کە ئەملام دایە ئەولای لە بیر چوو
هەر من بۆم تێکرد ئەو تێری نەخوارد
دوایش بەجێی هێشت بەهەناسەی سارد
ژنەکەی بردی، بۆ مێردی تازە
وتی با بۆرە، بێتە جێی بازە
خەڵک ئەم ئەحواڵەی وا لەپێش چاوە
کەچی هێشتاکو بۆ من سووتاوە
هێندە شیرینم شانەی هەنگوینم
پێی عاشق وەک مێش پێکا ئەلکێنم

***





## ئێمە

١٩٤٥

ئێمە مایەی چوار شتین، ئاو و ئاگر، خاک و با
ئەم هەوێنە، کامی زیاتر بێ، بەلای ئەویا ئەبا
خاک و ئاو دایکن، لەسەرخۆن، هێمنی و ڕوونی ئەدەن
ئاگر و با زۆر خراپن، خیلقەتی پیاو تێک ئەدەن
با، لەگەڵ کەوتە چیکڵدانە، لەبەرزیدا فڕی
کاتێکت زانی کە -ف-و-ت-یە ئیتر هێڵی بڕی
فرت و فێڵت کەوتە ڕوو ئەی چەرخ، لەلام ئابڕووت تکا
بۆیە بەرزت کردمەوە، بمخەیت و ئازارم بگا
ئێستە زانیم، بۆیە هێلانەم وێران بوو، تێک شکا
تەرزە و هەورە تریشقە و بەفر و با سەختم بکا
من کەوا بەرز بوومەوە و گوتم گوناهی کەس نییە
بۆیە ناگریم تێدەگەم، خۆکردوو تەدبیری چییە

***

## بەیتی ترێ

١٩٤٣

ڕۆڵە بزانە، ترێ چەند ڕەنگە
کامیان زوو ڕەزە و، کامیان ئاونگە
ترێ پادشای، هەموو میوانە[١]
هاوین پێخۆری، هەموو میوانە[٢]
خوا خۆی فەرموویە، ئەعناب و نەخیل
پێش خورمای خستووە، قورئانمان دەلیل
بە (دالیێت)ـەوە[٣] هێشووی چەن جوانە
نموونەی مەدح و نەزمی قورئانە
خەڵکی بۆ گەلای، بەئاخ و داخە
لەگەڵ پێگەیی، باوی یاپراخە
چووزەرەی، ژنی، تێ دەورووژێ
بێزوکەر تەرزی، دادەکرۆژێ

گەر کۆتەرەکەی، پیاو نەیسووتێنێ
بۆ نێرگەلەکێش، قرانێ دێنێ
رۆنی داری مێو بۆ (ریحی طیار)
لەگەڵ تێت هەڵسوو، ئەڕوا بەیەکجار
سێبەری سەر حەوز، هەمووی بەمێوە
هەر هێشوویەکی، توورەکەی پێوە
بەرسیلەی نەختێ، خوێی لەگەڵ بێنە
لە کاسەیەکا، هەڵیتەکێنە
بیخەرە دەمت، دەم بتەقێنە
بە تامە تامە، سەر بلەقێنە
هەنگ، شیلەی ئەوە، ئەیکا بەهەنگوین
(سێبەر) و (بەر) و سەری هەر رەنگین
نەشئە ئەبەخشێت، دایکی شەرابە
سارێژی گەزەی، جەرگی کەبابە
هەر لەو رۆژەوە، دنیا دانرا
مەدحی شەرابە، بەشیعر بێژرا
پایزان ترێ و کەباب چەند خۆشە
(شیرە) و (کاڵەکوت) چاری نەخۆشە
بۆ ساوەر کوتان، کەشکەک و ترێ
هێزی ئەوانە، دەست مێکوت ئەگرێ
دۆشاوی باوی سەرمای زستانە
باسووق و سجووق، راحەی کوردانە
دیومە پاقلاوە، لە نانە باسووق
ناردیان بەدیاری هەر لەبەر تاسووق
مێوژە رەشکەی، لە خورما خۆشتر
وەک ئەو شیرینە، لەویش فێنکتر
قەومێک لەلایەن، پارە بردنەوە
بە مێوژە رەشکە، تاقیان کردنەوە
ئەوەبوو وتیان، بەهەورامییانە
پادار بگیرۆ، بێ پا وێمانە[٤]



خۆ مێوژە سوورکە، لەگەڵ لەبلەبی
ئەوەند بەتامە، درەنگ تێر ئەبی
شەوارەی زستان، شەوچەرەی دۆستان
باسووق و سجووق، دێتە بەردەستان
بەسەر مێوژدا، مەولود ئەخوێنن
ئەبێ بەمەوفەرک، خەڵک ئەیفەرێنن
سرکە، ئەنواعی ترشی لێ ئەکرێ
(رەنگاو)[٥] بۆ شێخان، دەست بەدەست ئەبرێ
حەڵوای دۆشاوی، خەنیمی کوردە
چەند پێخۆرێکی، بەدەستوبردە
خەڵک کردوویانە، بەپەند و باوێ
وای لە قونێیە و، وای لە دۆشاوێ
من ئێستاش موشتاق بەزمی (مشتاغ)م[٦]
هەڵپەرکێ و بلوێر دای لە دەماغم
لەتکەی سەر (مشتاغ) دەمی سبەینێ
هەزار (رۆتاب)ی عەرەبی دێنێ
قلانگی سجووق، بەتەنافەوە
سێ داخی ناوە، بەدڵی جافەوە
پەڵوولە باسووق بە بادامەوە
وا دیسان تامە، تامەی دامەوە
چەکەرەی باسووق بیکەیتە ناو رۆن
هەر بیخۆی بڵێی، توخوا چۆنە چۆن؟
زستان (خۆشاو)ی[٧] مێوژت دەسکەوێ
خەفەتباریش بی خەمت ئەرەوێ
ئنجا با ناویان بڵێین سەربەسەر
من ئەڵێم و تۆ بیخەرە دەفتەر
یەکەم (زوورەز)ە، کە زوو پێدەگا
پێستی ئەستوورە، هەر وەک پێستی گا
ئەمجا (مەفرە) و (زەلکە) ئاودارن
بەڵام شیرین نین هەر مزرکارن

ئەمجا (سەعدانی) ڕەونەقی ڕەزان
بەلار و لەنجە وا هاتە دووکان
حەرامە لەپاش سەعدانی ترێ
خەرمەی زۆر خۆشە، تێری لێ ناخورێ
بیخەیتە بەفراو بەچلەی هاوین
بۆ دەمێک ئەشێ خاڵ و میل ڕەنگین
دەم دەنکی نەگرێت تەنگ و نازدار بێ
ترێی ڕەش لە سای گەردنیا دیار بێ
بەنەشئەی ترێ، کە چاو هەڵگێرێ
سۆفی و مەلا و شێخ، لە دین وەرگێرێ
ئاخ سبەینان زوو، پێش هەتاو کەوتن
لەگەڵ نازداری سوراحی گەردەن
بەلار و لەنجە و غەمزە و نازەوە
بەوردە ڕازی عەشقبازەوە
لەبن سێبەری، مێوی سەعدانی
ڕاکشێی سەرت بکەیە سەر ڕانی
سەیری ترێ کەی بەژوور سەرتەوە
ئەو بەناز ترێ، بکا بەدەمتەوە
(تالعی) (سەعدی) لەگەڵ سەعدانی
قران السعدین[8] تەواو بزانی
بەو عەشقە دنیا ئەبێ بەهی تۆ
ئەو شەوقەت نەبێ، شێتی و ڕەنجەڕۆ
(چاوەش ئوزومی) کەوا مەشهوورە
ئەم سەعدانییە بەلام ئەو دوورە
(کشمش ئەزمیریی) پێ کورەی ئەمە
هەرچی پێ بدرێ هێشتا هەر کەمە
ترێ (طائفی) (سەر قوولە)ی لەرە
(پایزە) و (سووراو) ناخورێ بێ فەرە
ترێ (سپیکە) خەرجی دۆشاوە
لەپاش سەعدانی، ئەمجا ئەو باوە



(هندویی) و(کاژاو) و(سورشامی) و(ڕەشکە)
بەبار بیهێنە و لە خەڵکی بەش کە
(بۆڵ ماز) و (مسکی) و (مێخی) و (ڕەزاقی)
(گون توولە) و (کلکەڕێوی) و (عوشاقی)
(نینۆکی بووکێ) و (شمیری) باشە
(چەمیلە) خواردنی دۆمی کلاشە
(یاقووتی) و (زەردی) و (مام برایمە)
(شەقشەقە) و (فەرخی) پێستیان قایمە
ترێ (دەردەبۆڵە) و (گونکە) و (شیرازی)
بێ تامن هیچ کەس، پێی نابێ ڕازی
(خۆشناو) ئەو کاتەی بەفری لێ باری
ئەوسا نایابە، بیبەی بەدیاری
ئەمە بەتەنها ترێکەمانە
هەرمێ و هەڵووژە و قۆخ دووچەندانە
قۆخێک لە پاریس بەدوو فرانقە
لێرە لەتکە قۆخ، سەرمایەی بانقە
لە دەست نەزانین، هەزار ئاخ و داخ
هێشتا تووتنمان، نەبووە بەساچاخ
ئاخ بۆ کەساسی، داخ بۆ کەساسی
خاکت ئەمەیە و کەچی نایناسی

........................................

(٢،١) میوانە: یەکەم واتە میوەهات. میوانی دووەم واتە میوان.
(٣) دالێت: ئەو دار میوانەیە کە بەدرەختی ترا هەڵئەگەڕێن.
(٤) واتا ئەوانەی ئەڕۆن بیانگرن و ئەوانی کە نارۆن هی خۆمانە و لە کیس ناچێ ئەمە لە تێکەڵ بوونی قالۆنچە و ترێدا بووە.
(٥) ڕەنگاو: جاران لە ئاخر و ئۆخری دا کە ترێ ڕەشکە خەریک ئەبوو دوایی بهاتایە، ئەهاتن هێشوە ترێیان ئەخستە ناو سرکەوە و بەو جۆرە بەتەڕێتی ئەمایەوە و نەئەبوو بەمێوژ. تاکو کەی بیان ویستایە دەریان ئەهێناو ئەیان خوارد بەو جۆرە ترێیەیان وتوە (ڕەنگاو)- م. ه.
(٦) مشتاغ: کە ترێ بەتەواوەتی پێ ئەگات، لەناو ڕەزەکاندا جێگەی مێوژ کردن و دۆشاو کولاندن و باسووق و سجووق کردن ئامادە ئەکەن. بەو شوێنە ئەڵێن، جێ مشتاغ. بەو کاتەش کە ئەو جێ مشتاغە ئامادە ئەکەن پێی ئەڵێن، وەختی مشتاغان. لە کوردستاندا بەتایبەتی لەو شوێنانەدا کە ڕەزی زۆرە وەکو شارباژێڕ و ماوەت، کە ترێ بەتەواوەتی پێ ئەگات لەناو ڕەزەکانا، لە شوێنێکی تەختدا، ساباتێک دروست ئەکەن، خاوەن ڕەز بەخاو

و خێزانەوە ئەچنە ژێر ئەو ساباتە و بەڕۆژ ترێ لە مێوەکان ئەکەنەوە و بەشەو لە خۆڵاوێکی تایبەتی هەڵئەکێشن و ئەیکەن بەمێوژ و یاخود ئەیخەنە ناو شاڵێکی تایبەتییەوە و ئەیگوشن و ئەیکوڵێنن و ئەیکەن بەدۆشاو و باسووق و سجووقیشی لێ ئەکەن. شەو لەناو ڕەزانا بەدەم خۆڵاوکردنی ترێ و دۆشاو کولاندن و باسووق و سجووق کردنەوە و بەدەم ئیشکردنەوە ئەیکەن بەگۆرانی و شمشاڵ لێدان و بەزم و ئاهەنگ تا شەوێکی درەنگ.

(٧) خۆشاو: جاران لە زستانا مێوژ و لەتکە هەرمێ یاخود قەیسی و کشمیش ئەکەنە ئاو و بۆ چەند ڕۆژێک لە ئاوا ئەمێنێتەوە، ئەوسا هەمووی نەرم ئەبێ و ئاوێکی خۆشی لێ پەیدا ئەبێ کە بەوە ئەڵێن (خۆشاو).

(٨) قران السعدين: نیازی لەو نزیک بوونەوەیەی هەردوو ئەستێرەی زوهرە و موشتەریە کە لەیەک نزیک ئەبنەوە. پیرەمێرد نیازی دووبارە لە زاوا و بووکێکە یاخود دوو دڵدارە کە وەکو ئەو دوو ئەستێرەیە کە لەیەک نزیک ئەبنەوە.

***

## بەیتی ترخێنە

سالّ و عەیامان کە ئەتوت زستان
ئەبوو بە بەفر و زوقم و ڕێ بەندان
کە بەفر ئەباری تا پشتێنەی پیاو
نە ئەتوایەوە بەتینی هەتاو
دەر و ژوور بیست ڕۆژ ڕێگا ئەبڕا
مەل و جانەوەر ئەچوون بەقڕا
کەو و کۆتر و داڵ ئەڕژانە شار
لە بیرمە کەوم ئەگرت جار بەجار
ئای لەو خۆشییە کە لەناو بەفرا
کەوم ئەگرت و ئەمکرد بەهەرا
گۆشت و دار و ماست ئێجگار قات ئەبوو
بەشەو ئەم شارە کش و مات ئەبوو
هاوین زەخیرەی زستانیان ئەخست
مالّی تفاقیان ئەهاتە نوشوست
قاورمە لەجێی گۆشت دائەنرا
بەکەشک تامەزرۆی دۆکولّیو ئەدرا
بە لەتکە هەرمێ، دەم تەڕ ئەبووەوە
بە خۆشاو ترێ لەبیر ئەچووەوە
گەڵا مێوی وشک بۆ یاپراخ ئەبوو
بۆ خەنەی بووک بوو کە ئەدرا بەشوو



دۆینەی بەیانیان چەند مزر و خۆشە
بەکەوچکی دار تێر هەڵی لووشە
ئینجا لەباتی سەوزە و میوەی تەڕ
شێلمی ترخێنە خۆی ئەخستە گەڕ
وا هاتینە سەر بەیتی ترخێنە
کە ترخێنە هات هەڵیقوڕێنە
لەناو عەرەبدا دوو بیدعە هەیە
یەکەم (حەسەن)ە دوو (سەیئە)یە
بۆ عەنعەنەی کورد ترخێنە و ئێستە
بلّێ (سیئە) هیچ لێی مەوەستە
چونکە ئێستا کە بەچلەی زستان
هەموو سەوزەیەک دێتە بەر دەستتان
لەباتی شێلم، سلّق و سپێناخ
لەگەڵ (ئەنکەناز) بیکە بەیاپراخ
هەمیشە گۆشتی تازە و ماست حازر
کەشک و قاورمە چی لێ بکەم ئیتر
کە خوا فەرموویە (لحماً طرية)
دیارە گۆشتی وشک لەتام بەرییە
کەوابێ شێلمی گەنیو چی لێ بکەم
گوێ ڕاگرە بەیتی ترخێنەت بۆ بکەم
شێلّم و بڕوێش تێک هەڵئەشێلرێ
چالّێکی قوولّی بۆ هەڵئەکەنرێ
لەو چالّەدایە، هەتا ئەترشێ
کرم و گڵ خۆرکەی تێ ئەورووژێ
بۆرە زەلامێک ئەچێتە ناوی
پاو و پل کولّکن، قول کرێشاوی
تیا هەڵدەپەڕێ و بەرز ئەبێتەوە
تاپێی ئەو چلّکەی لێ ئەبێتەوە
ئینجا دەگەنێ وەک دەعبای تۆپیو
دوکتۆر بیبینێ ئەیخاتە ناو شیو

کە دەریان هێنا دەستی نەشۆراو
ئەیکات بەتۆپەڵ بەسووری هەتاو
جار جار بەو دەستەی کە چڵم ئەسڕێ
ترخێنە ئەخوا و ناو سکی ئەگرێ
هەرچەند کە بێزووش بەترشی ئەکا
لەبەر بۆگەنی ناو چاو گرژ ئەکا
شێلم ئەکرۆژێ خرمەی دێ وەک گیا
لاسکە شێلمی لە لا وەک لۆبیا
لەلا جانگیدا ئەسپێ دەردێنێ
لەگەڵ ترخێنە هەڵیەفلیقێنێ
لالغاوەی پڕ لەکەف و بڕوێش
سەر و پۆتەڵاک وەک پرچی دەروێش
چیغێکی کۆنی پڕ لە چڵک و تۆز
کە بۆ کارەگەل کرابێت بەکۆز
دەیبەنە سەربان لەوێ هەڵیەخەن
سفرە بۆ مار و مێروو ڕائەخەن
کە ڕەشەبا هات تۆزی میز و گوو
ئەڕوانی بەگژ ترخێنەدا چوو
چونکە هاوین خەڵک شەو لەسەربانە
جێی میز و گووە وەک ئەدەبخانە
قەیناکا تۆزێک تۆزی لێ نیشتووە
پیشەی قەدیمە کە بەجێی هێشتووە
ناو زگی ئێمە لەو پاکتر نییە
لە زگدا فەرقی پاک و پیس چییە؟
ئەمە تەرتیبی ترخێنەمانە
بۆچ پێی نەئاوسێ زک وەک هەمانە
عەنعەنەی وا قۆڕ عەمری نەمێنێ
باشێلم بەترش لەجێی بخوێنێ

***



## وردەکاری مەولەوی

١٩٣٩

سەیرکەن، مەولەوی و ئەم نوکتە وردە
نابێ بە مەعدووم، مەردی، نەمردە
دوای سەد ساڵ پرسی مەعدووم لەکوێیە؟!
هەر فەردێک ئەڵێ ها، وا، لەوێیە!

## ڕەشەبا(١)

١٩٤٨

هاوینە و گەرما و میوە گەنانە
نیوەی ئەم شارە، شەو لە سەربانە
تۆزی ڕەشەبا و چاوێشە و هاوار
سەربانی وێران، پڕ دووپشک و مار
لە هەموو لایەک، گریانە و قووڕە
کفر ئەکا پیاوی بێ خەوی تووڕە
شەو لەسەربانان کە دەچنە سەراو
ڕۆژ هەڵدەقرچێ بەتینی هەتاو
ئنجا ڕەشەبا ئەو تۆزە دێنێ
بەدەم و لووتیا هەڵدەپرژێنێ
گۆزە و دیزەیشمان کە پڕن لە ئاو
ئەو تۆزەی تێچوو، گڵاو هەی گڵاو
هێجگار چەند ماڵێک، بەڕیز لەیەک بان
چیغێکی تەنک کەوتۆتە بەینیان
گوێیان لە پرخە و مرخەی یەکترە
تەگە و سابرێنی بەئەدەبترە
زۆر جار ڕەشەبا، دەرپێ ئەفڕێنێ
ڕۆژێکیش ئەبێ، دەرپێ نامێنێ
ئێستا توێژاڵێک، لە ژوور ئەژنۆیە
بەندی لاستیکی، بۆ من و تۆیە
پاکانەت بۆ بکا، بەهەڵاتەوە

بڵێ بەندە خوێن، نەکراوەتەوە
ڕاستە خۆ گرێی لە ناوا نییە
گرێ نەترازێ شوبهەی بۆ چییە
لاستیک شل بووە، خۆی داماڵاوە
لاولاو و تێلا، وا تێک ئاڵاوە
کۆنەکاهینێ وامان پێ بەژێ
تنۆکێکی خوێن، زۆر خوێن ئەڕێژێ
کە ئاگر و پووشوو، گەیشتنە یەکتر
ڕێی پارێزگاری نامێنێ، ئیتر
ئافەریدەکار، کەوا ئەتوانێ
(خوو)مان لە (خۆ)مان چاکتر ئەزانێ[٢]

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بلاونەکراوەتەوە.

(١) خوو: کار و کردەوەی هەمیشەیی. خۆ، یاخود، خۆمان: ئێمە، کەس و کار

***

## چوارینەی فەلسەفی

بەجیهان ئەڵێم، سێبەری ئەشکەوت[١]
لەوێدا ڕێبوار، سەرخەوی بەرکەوت
هەڵساو بۆی دەرچوو، هێندە تیا نەسرەوت
وا نەبوایە چۆن جێ بەر تۆ ئەکەوت

***

ئاخ، خۆزگە گوناه بۆگەنی ئەبوو
کەس بەلای پیاوی بەدا، نەدەچوو
ئەوسا بەبۆنەی ئەو بۆگەنەوە
پاک و پیس لەیەک جوێ ئەبوونەوە

***

ئەگەر پیاو خراپ هات مەدحی تۆی کرد
لە ڕەوشتی خۆت، لادە دەستوبرد



دیارە بە(لابە) لە ڕێت لا ئەبا
وەک کای ناو خەرمان ئەتداتە بەر با[٢]

***

من بەوە زانیم پیاوی تەواوم
بەدێکی ناودار جوێنی پێ داوم
ناویشی ناڵێم، نیە لەم شارە
دار هەڵدەبرم، ئەو لەوێ دیارە[٣]

***

نالی فەرموویە، دوانی بێ ئەدەب
ئەویان ئەوەڕێ، ئەمیان ئەکا سەب
«وخلقناکم اطواراً» دیارە
یەکێ بێ دەنگە و ئەوی تر هارە

(١) ئەم سێ چوارینەیە تارمایی فەلسەفەی (خەیام)ی تیادا دیارە، پیرەمێرد زیرەکانە گیانی چوارینە فارسییەکانی وەرگرتوە و وەک دەستوری خۆی داڕشتۆتەوە.

(٢) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمیردی م. هـ دا بلاونەکراوەتەوە.

(٣) ئەم دوو چوارینەیە، بیر و داڕشتنی پیرەمێرد خۆیەتی، بەڵام سوودی لە پەندی فۆلکلۆری کوردی وەرگرتووە کە دەڵێت: «دار هەڵبڕە سەگی دز دیارە».

***

## بۆ مەلیک غازی

«یاخوا عیراقمان جێی شانازی بێ
بەشمان بەغازی سەرفرازی بێ
ئەو نەسلی پاک و ئێمە نەوەی چاک
پێکەوە بژین، لە عالەم بێ باک»

***

## مزگەوتی گەورەی سلێمانی

یەکەم:

وەک ڕێوی شل بووم لە پێچ و دەورە
خزاوم حەوشی مزگەوتی گەورە

وامزانی خالّیی له (ماسیوایه)
گۆشەی عیبادەت جێی ئینزوایه
نەمزانی بانی دووهەوا تێدا
(من كل فج عميق) لەوێدا
بۆ ئەو کەسانەی، دڵیان وریایه
نووری کاک ئەحمەد، زۆر ئاشکرایه
له حەوز بەرەو خوار، تا بڵێیی خواره
گەر باوەڕ ناکەی وەره بنواڕه
حەوزە گەورەکەی، کە دەڵێن پاکە
پڕیه له قەوزە، هەر وەک شیاکە
حەوز نییە خەزنەی چڵم و بەڵغەمە
هەر بەڵغەمێکی سەلکە شەڵغەمە
ئەبارێت چڵم و بەڵغەم وەک تەرزە
باقڵم، ئاخ و تف لەلایان فەرزە
ئەدەبخانەکە و حەوزی تێکەوتن
پڕیانە لە ئاو هێندە بێ بەختن
له حەوزی حەوشە قنگ هەڵدەبڕن
شڵپە شڵپ پەردەی حەیا ئەدڕن
چڵم و بەڵغەم و گوی تیا بشۆره
له قولەتێن بوو (ماءً طهور)ە

دووەم:

وا دەستنوێژ شوررا، گوێمان له بانگە
بۆڕە بۆڕێک دێ، وەک بۆڕەی مانگە
(مەلا سەعیدە) وا سەڵا ئەکا
ڕۆحی بیلالمان بۆ ئەحیا ئەکا
دوور لە بانگەکە، ئەمەم هاتە بیر
«انكر الأصوات، لصوت الحمير»
دەک خوایە بانگدەر قۆڕەت لێ کەوێ
کە هەڵسایین بۆڕەت بڕابێ شەوێ



من بۆڕەی ئەمەم لا گران نایه
خەڵک ئەڵێن زەوقی مەملەکەت وایه
کەس نییە بڵێ: موسوڵمانینه
بانگی محەممەد، ڕەونەقی دینه
بۆچی دەنگخۆشێ نییە بانگ بدات
هەر لێرەم دیوه، بانگ بەقۆنتەرات
خۆ کەسێک بێت و، لەوێ بانگ بدا
لێی ڕائەپەڕێ و جوێنی پێ ئەدا
درەنگ بێ و وادەی بانگیش تێپەڕێ
بایێ وادەش بێ، ئەبێ بزەڕێ
خەڵک لێی ئەترسێ، هاره والسلام
ملۆزمێکه بۆ بانگی ئیسلام
نازانم خوا بۆچ بۆڕەی نابڕێ
یاخود پیغەمبەر بۆچ تێی ناخوڕێ
لەزەتی بانگی ئیسلامی نەهێشت
هەرچی گوێی لێ بوو، مزگەوتی جێهێشت
بەو دەنگە قۆڕە سەڵای نیوەڕۆ
هیچ فەرقی نییە لەگەڵ باوکەڕۆ
ئەگەر (الله دێر) بەو ڕەنگە بکرێ
باراش لە ئاشی گەرمیان ئەبڕێ

## نوێژ

بانگمان تەواو کرد، جەماعەت بەسترا
بۆ ئیمامەتی کوێرێک پێش خرا
بیست مەلای چاوساغ لەوێ وەستاوه
ئیمام کوێر نەبێ، نوێژ ناتەواوه
هەر ماڵی خوایە، شێواوه بێ خێو
مەشهووره فیکه بە برای بێ لێو
توخوا لێی گەڕێ له ئیمانی کورد
هەر بۆ ئەوەیە، بڵێن نوێژمان کرد

ئاخ ئەم خۆزگەیەی من ئەهاتە دی
شەڕە گۆچانی کوێرانتان ئەدی
سا دایکت ئەگێم، تەقەم بۆ بکە
ئەگەر نامەرد نیت مەڕۆ ڕامەکە
تەقەی کرد گۆچان وەک تیر ئەفڕێ
ناوجەرگی کوێرەی بەرامبەر ئەبڕێ
هەندێکیان وەک ئاش ئەسووڕێنەوە
بە دوو سەد چاوساغ لێک ناکرێنەوە
هەرچی نوێژ ئەکات لەو بەر هەیوانە
سوجدە ئەباتە بەر ئەو قەبرانە
لە شێخ ئەترسێت لە خوا قەیناکا
لەبەر شێخ نەبێت هیچ نوێژێک ناکا
قەیناکە قەبری شێخی سەرکارە
سوجدە بۆ شێخە (زاتەن) لەم شارە
لە جەردەییشدا نوێژیان تەرک ناکەن
بۆ هەژار کوشتن پف لە دۆ ناکەن
چاولێکەرییە، نوێژ کردنی کورد
هەر بۆ ئەوەیە، بڵێن نوێژمان کرد
ژن و شێخ لە خوا پێشترە بۆ سوێند
ئیتر بەسیەتی تەواومان تێ چێند

## کۆمەڵی

بێینە سەر باسی ئیجتماعیمان
ئەخلاقی عەسری (ضد)ە بۆ ئیمان
هەر لەو جێیەدا بڕۆ چایخانە
کە چووی دانیشە و ئەوسا بڕوانە
شەشی سیاسی و سێ چوارێک مەلان
لە دنیا و خەڵکی عالەم تەوەللان
هەر حکومەتێک کە باسی بکرێ
دەستبەجێ ناوی ژنی ئەبرێ



چە ڕایەکیان دەکەوێ ئەوان
ببن بەسەگی ناو موڵکی خۆمان
فەنی ئەوروپا هەمووی چاوبەستە
فەلسەفە و عیلمی فەلەک هەڵبەستە
بێتە بەرامبەر مەلای پێنجوینی
سەگ ئەڕێنێتە دین و ئایینی
سیاسییەکانمان هێند بەعینوانن
خەڵک بەمەخلووقی خۆیان ئەزانن
دەعوای ملووکی کرمی کەللەیە
کەر کامیان هەستێ گورگی گەلەیە
بەخۆ هەڵکێشان بە باڵ ئەفڕن
(ئوتیل ماجستیک) بەخەنجەر ئەگرن
بێینە سەرباسی چایخانەکەمان
هۆدە شڕێک بوو تاقی بەر هەیوان
چایچی کێری خۆی کرد بەپلار
بێ بەشی ناکا، مشتەری و ڕێبوار
بەو حاڵەشەوە، مایە سووتاوە
چای بەدوو پوولە و پارەی نەدراوە
دەفتەری بەقەد، گەڵای کوولەکە
نووسیوێتی وەک، قەرزی جوولەکە
هەر ئەشیڕێنێ و کەس گوێی ناداتێ
دێتەوە ژێر بار، لە پاش سەعاتێ
هەندێکیان تیایە، خۆیان و گونیان
وردە شاتری ناگاتە گونیان
چاوەڕێی مامەن بەزێویەوانی
چوار عانەی دەسکەوت تێ فکریت هانی
ئنجا سەیریان کە، شەڕە تەقسیمە
تێک گیران لەسەر پێسە و سانتیمە
ئەبم بەعانە و بەمامە بدرێم
هەر ئەو سەعاتە (چوار پارە) ئەکرێم

وەزیری ئەوقاف شێخ ئەحمەد داود
چایخانەی داخست، چایچی نابوود
وتی چایخانە لە مزگەوتایە
ئەوانەی لەوێن لەش پیسیان تیایە
حوکم و فەرمانی وەزارەت دەرکەوت
شەرعەن مەمنوعە لەش پیس لە مزگەوت
هەی دەستت بەگون، مەعالی وەزیر؟!
تۆی بۆ حکومەت، خاوەنی تەدبیر؟!
خۆت لە مزگەوتا، تا پێگەیشتووی
دەنگ وایە کەوا، پاکیان نەهێشتووی
بەو سەرمایەیە، ئێستە وەزیری
گەیشتیە پایەی، هەنگامی پیری
داخی سەرداخان شێخی مەندەبۆر
ڕیش دووکەڵاوی چاکی جبە شۆڕ
هەر ساڵی ماڵێ سێ مانگ میوانە
بە حوکمی شێخی بۆ ئەو تەرخانە
هەندێ جار ڕووی خۆی، بەشاڵ ئەپۆشێ
لە گوێ ئاگردان، چڵم هەڵئەلووشێ
هەرچی بیەوێ خۆی داوای ئەکا
نەیدەیتێ ئەڵێ، وا تۆوم تکا
بیستوومە هەندێک لە ئەوروپایی
بۆ تەحلیلی ڕۆح، خەڵکی گەدایی
بەرگی سواڵکەری دەپۆشن دەڕۆن
نایانناسنەوە، لەبەر چڵک و ڕۆن
یاخود هەندێکیان، موبتەلای دزین
شتێک نەدزن بەڕەحەت ناژین
بۆم تەحلیل نابێ ڕۆحی ئەم زاتە
کە لەناو خەڵکا، وەلی، سیفاتە
هێندەت زەحمەتە، پێت بڵێن شێخە
گوریسێک ڕاخە و، ئەم شارەی تێخە



## هەندێ ئەڵێن[1]

١٩٤١

هەندێ ئەڵێن کابرا تۆ بۆچ نوێژ ناکەی[2]
بەخۆهەڵکێشانتا دۆستداری چاکەی
کەچی جارێک نەمان دی بێیتە مزگەوت
دیارە، پیاوی خوا نیت دوورکەوتی دوورکەوت
جومعە ناکەی، ناچییە زکر و تەهلیلە
هەر کەبابە و هەریسەیە و قەندیلە
ڕۆژوو ئەگریت، کەچی لە نوێژ بێزراوی
بە فتوای شێخ، یەکانەی دەم بەسراوی
دەستنوێژ ناشۆی، پاک نابیتەوە گڵاوی
بێیتە خواردن، مێملێ گۆشت و پڵاوی
ڕەحمەت لەوەی لەلاتەوە نان ناخوا
پارێز ئەکات، چاکت ئەناسێ بەخوا
گیاندار کوژ و، تووڕە و تڕۆی لە ڕوودا
ماسیت نەهێشت لە زەڵم و تانجەڕۆدا
لە هیچ و پووچ هەرزە وەکیلی خەڵکی
هەر بۆ ئەوەی کە پێت بڵێن بەکەڵکی
ڕووت و قووت و لاهەڵپچڕاو، بێ پشتێن
بەشەو تەغارێک پرتەقاڵ تێ ترشێن
بەعومری خۆت خاولی بۆ ماڵ ناکڕی
کە نانت خوارد، دەستت بەڕیشت ئەسڕی
هێشتا فلست بەدەلاکێک نەداوە
خۆ حەمام هیچ، چڵکی پارت لا ماوە
کێ دی جلی تازەت لەبەر کردبێ؟
قۆندەرەت لای بۆیاخچییەک بردبێ!
توخوا سەر و ڕیشت سابوون ئەناسێ؟!
هەڕاجخانە ئەگەڕێی بۆ کراسێ!

پانزه ساڵه پەنجەرەت ناکرێتەوه
میکرۆب ناوێرێ بێتە ناو جێتەوه
له بەفر و دۆی هاوینان نائومێدی
بەندوباوی کابرات لێ هاتۆته دی

منیش ئەڵێم:

ئەمەی ئەوان، منیش له جوابا ئەڵێم
خوا له دڵمایه، هیچ کوێی بۆ ناگەڕێم
حاڵی دنیاش هەر چۆنێ دێتە بەر
تێ دەپەڕێ شاهو گەدا ئەیبەنە سەر
خوا بەتۆبە لەحەقی خۆی خۆش ئەبێ[3]
به (حەق الناس)ه پەت پەتیت تووش ئەبێ

---

(۱) ئەم شیعره پیرەمێرد خۆی نووسیویه و وەڵامی ئەو تانه و توانجانه دەداتەوه که خەڵکی نەزان تێیان گرتووه، ئەوه هەڵەیه که هەندێک دەڵێن ئەو شیعرەیان بەنامه بۆ ناردووه و ئەویش (وەک له دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا نووسراوه) بەیەک دێڕ وەڵامی داوەتەوه. ڕاستییەکەی ئەوەیه پیرەمێرد باسی توانجەکانی ئەوانی کردووه و بەچوار بەیت شیعر وەڵامی داونەتەوه.

(۲) بەیتی یەکەمی ئەم شیعره له دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاونەکراوەتەوه.

(۳) له لاپەڕه ۲٥ی دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا تەنها یەک بەیت لەو چوار بەیته نووسراوه که پیرەمێرد وەڵامی پێ داوەتەوه.

***

## مێژووی هاتنه دنیای (هۆشمەند)ی حەسەن بەگی جاف

تەئریخی هیجری، یەک زیاد، چونکو تاقانه و تەکه
جێ نشینی محمود پاشا محمود هۆشمەند یەکه = ۱۳٤٦ی کۆچی
میلادیش وا بۆ ڕێکەوت له پاشا
مەحموودی هۆشمەند دانیشت بەسەر جێ مەحموود پاشا = ۱۹٤٥ی زاینی
این تأریخ چو نام فرود آمد أز سما
جای محمود غزنوی محمود ما = ۱۳۲٤ی هەتاوی

***



## شیعرەکانی پیرەمێرد بۆ ئەمین زەکی بەگ[1]

۱- بۆ چلەی ئەمین زەکی بەگ:

۱۹٤۸

داخێ که فەلەک، نای بەجەرگما
کزەم، له کزەی سەرەمەرگما
بەخت و بەرگم ڕەش، چاو سپی بەشین
فرمێسک سوور و سوێر بۆ (حەمەد ئەمین)
ئۆف، لایه پیری، لایه نەخۆشی
لایه پەرۆشی، خەوش و سەرخۆشی
لایه ماتەمی و ماتی و بێ هۆشی
بۆ پیرێکی گەنج، که خاک داپۆشی
گوڵ لێم بوو بەخار، گوڵشەن پڕ جەخار
هۆزاری هەژار، زار و ناڵه کار
ئەلاوێنەوه، لاوان دڵ غەمبار
خوا ئاهی پیریم، بۆ بخاته کار
باوەڕم هەیه، کەوا گیانی پاک
نامرێ ئەچێته، هەوارگەی ئەفلاک
هەر وەک گەلاوێژ، بەجریوه و ڕووناک
پرشنگ ئەداته، ڕووی مەڵبەندی خاک
ها، ئەوه گیانی (حەمەددەمین)ه
نیگەهبانه بۆ ئەم سەرزەمینه
چونکه باوەڕی بەخوا و ئایینه
جێی خاڵی نابێ، له خۆی ئەمینه

---

(۱) پیرەمێرد که ئەو (نۆ) پارچه شیعرەی بۆ ئەمین زەکی بەگ نووسیوه. تەنها پارچەی نۆهەم له دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا چاپکراوه و هەشتەکەی تری پشت گوێ خرابوو.

***

۱۹٤۸

۲- چرای ڕووناکی، کورد کوژایەوه
تەختی سلێمانی، تەخت کرایەوه

تۆماری کوردی، تەئریخ هەڵپێچرا
پەردەی ڕەش بەڕووی، ئەدەبا کێشرا
ئەمین زەکی بەگ، ڕۆژی ڕەمەزان
هەوارگەی بردە، سەر گردی سەیوان
لەو ساوە کە ئەو، ئەسپەردەی گڵە
فرمێسکم تێکەڵ، بەخوێنی دڵە
دەرکەوت زاتێک بوو، بەعەهد و پەیمان
لەدوایی ڕۆژا، هاتەوە ناومان
بۆ میللەتەکەی هێند تێکۆشابوو
قەڵەمی دەست و پەنجەی شکابوو
دیسان بۆ پێنجوین، تێکۆشایەوە
خێر!! ئاو و گڵ بوو، وا هێنایەوە
تا چەرخی جیهان، لە گەڕ ئەکەوێ
پیاوێکی وامان، تیا هەڵناکەوێ
دایکی خاک وەهای، گرتۆتە باوەش
ئازاری دەستی، کردووە فەرامۆش
بەڵام، من بەندی جەرگم بڕاوە
زوو نەگەمە لای، کارم تەواوە

١٩٤٨

٣- ئەی چەرخی پیر، هیوام هیچ نەماوە پێت
ئاخ خۆزگە، ئەمدی، کردەوەکەی خۆت، ئەهاتە ڕێت
ئەو (شوێنەوار)ە، ناوی (خۆراوا)یە، ڕۆژێیە
ئەم (ڕۆژهەڵات)ە لاتە، ڕووناک بێ، گرانە پێت
ئەستێرەیەکی گەش، کە لە ئاسۆی بڵندی کورد
دەرکەوت، کوێرایی چاو بوو، مەگەر بۆ بووە تانە لێت
وات شاردەوە، ئیتر نەدرەوشێتەوە، بەڵام
خەتی شوعاعی، هەر لە برەو دایە، تاکو دێت
سەربەرزیە کە پیاوی وەها، هەڵکەوێ، لەگەڵ



ئەی نامەوەر، ئەمین بە، ئەمێنێ کتێب، لەجێت
ڕۆییت، ئەمین زەکی بەگ و زووبوو، بەهەشتە، جێت
٤٢٦ ١٦٦ ٢١ ٧١٢ ٤٧٣ = ١٩٤٨ی زاینی
روح الأمین لەپێش و مەحەممەد، ئەمینە، لێت
٣٤٦ ٣٤٣ ١٣٢ ١٠٦ ٤٤٠ =١٣٦٧ی کۆچی

١٩٣٧

٤- کابرای (زەکی) تۆیش، نەخەڵەتابی
بڵێی حسابی، دەوری نیابی
ئاگات لێبوو چەند، ئەزیەتت کێشا
بۆ تووتن و سووتن، چەند سەرت ئێشا
کەوا کەوتوویە، ناو گەڕەکەوە
چاو بەستەرەوە، بەدەسڕۆکەوە
بۆ خۆت، کتێبی، تەئریخ بنووسە
سەرپێچی مەکە، لەم چارەنووسە
مەقامی منیش، مەیلی مینایە
مینای دڵ، بەردی، ڕەجمی زۆر تیایە
من هیوام بەکەس، نییە بێ باکم
بەتەعنەی بەدکار، ئەزانم چاکم

١٩٥٣

٥- شەپۆڵی دجلەی گەردشی دەوران
پڕیشکی بەدی کەوتە سەر ژیان
دنیا و دجلە و چاو، هەرسێ پێکەوە
نازانین، ئاخۆ، ڕوون ئەبێتەوە؟!

١٩٤٨

٦- یادی دڵسۆزێک، بەگریانەوە
وا بەگردەکەی، شوێن سەیوانەوە
ئەنینی حەزین، بۆ ڕۆحی ئەمین
(روح الأمین)ی، بێ بە هاونشین

١٩٤٨

٧- دەنگێکی خۆش لە قوبەی ئەم ئاسمانەدا
(تەئریخی کوردە) ئێمە بەگێتی نیشان ئەدا

١٩٣٩

٨- ئەمین زەکی بەگ، کە دیارییە
ئاردی گەنمی، قەندەهارییە
ئەمجارە بەشیعر، هاتۆتە مەیدان
وەک سەروی سەربەرز، لە رووی دەربەندان
تەئریخی کۆنی، دەربەندی گەورە[1]
کەس نەیدەزانی، هەتا ئەم دەورە
بەیازدە شیعر، بۆی بەیان کردین
ئێستا شارەزای، دەوری رابردووین
یاخوا هەر بۆمان بمێنێ بەخێر
تا لە تەئریخمان شارەزابین، تێر

(١) لە ژمارە (٥٨٤)ی ژینی ساڵی (١٩٣٩)دا مامۆستا (قانع) بەهەشت شیعر داوای مێژووی دەربەندی گەورەی لە زانای مێژوو (ئەمین زەکی) کردبوو، ئنجا لێرەدا داواکارییەکەی قانع و وەڵامەکەی ئەمین زەکی بەگ دەنووسین و ئەو شیعرەی پیرەمێردیش کە نووسیمان بۆ هەمان مەبەستە.

***

## شیعری قانع ١٩٣٩

مامۆستای زانا، سەرچاوەی عیرفان
تەئریخ نووسەکەی، خاکی کوردستان
یاخوا هەر بژیت، تا دێر زەمانە
بۆ خزمەت کردن ئەم کوردستانە
ئەجدادی خۆمان نەبوو لە بیرمان
نەمانئەزانی باو و باپیرمان
زیندووت کردەوە حاڵ و ئەحواڵمان
هاتینە ریزی دراوسێ ماڵمان
گشت کەس ئەزانێ، کە کوڕی کێیە
باو و باپیری خەڵکی کام دێیە



ئێستەش بەندەی خۆت لە قەرەداغم
بۆ دیتن ئاسار، دڵ پڕ لە داغم
هەیکەلی گەورە، لە دەربەند گەورە
نازانین شەرحی حاڵی چ دەورە
ئایا ئەم پیاوە، کوردستانییە؟
یاخو عیسەوی، یا عیبرانییە؟
مەمنوونی لوتفین، بۆمان مەعلووم کەیت
ئەم گرێ زلە، لە دڵمان لابەیت

وەڵامی ئەمین زەکی بەگ بۆ پرسیارە شیعریەکەی قانع:

لە رۆژنامەی ژین لە سێی رەمەزان
هەشت[1] شیعرم بینی، زۆر شیرین و جوان
پێنج شیعری ئەوەڵ، شایستەی شوکرە
سێ شیعری دواییش، پرسینی، فیکرە
ئەڵێن هەیکەلی، دەربەندی گەورە
نازانین چییە و هینی چ دەورە؟!
عولەمای ئاسار بۆ ئەو تیمساڵە
ئەڵێن پاشماوەی چەند هەزار ساڵە
قڕاڵی ئاکاد (نارام سین) ناوێک
چل و حەوت عەسرە هەستا بەتاوێک
بۆ شەڕ هاتە سەر لۆلۆ و گۆتوو
لەقەرەداغدا داوا گەرم بوو
لە دوای شەڕ لۆلۆ و گۆتۆ ئەشکێنێ
مەلیک ساتونی دەرئەپەڕێنێ
باسی ئەو شەڕە و ئەو بگرە و بەردە
نووسراوە یەک یەک لەسەر ئەو بەردە
چەکی ئەو حەلە تیروکەوانە
لەلای هەیکەلدا دیارە نیشانە
وەک دار، تاشیان، ئەو شاخە گەورە
کردیان بەتیمساڵ، لە دەربەند گەورە

له دوای سی عەسرێک ساسانی هاتوون
زۆر تیمسالیان بوو، بەدەسەڵات بوون

(١) شیعرەکانی قانع نۆ شیعرە، نازانم بۆچی مامۆستا هەشتی نووسیوە.

## بۆ چلەی مستەفا پاشای یامولْکی[٢]

١٩٣٦

ئێمە کە ئیمرۆ دڵمان غەمگینە
جەژنی ئازادمان لە لا وەک شینە
مستەفا پاشا دێنێتەوە یاد
میللەت پەروەر بوو، کورد و سەر ئازاد
بووک و کچیشی، بوون بەڕەهبەرمان
بەوان هاتنە ناو، مەکتەبی کچان
من کە نموونەی ئەو هیممەتانەم
بۆ پێشکەوتنی، قەومێک نیشانەم

(١) پیرەمێرد لە ژمارە (٤٧١)ی (ژیان) دا لە سەرەتای ئەم شیعرەدا نووسیویە: (پەروین بانو) کە منداڵێکی پێنج ساڵەیە ئەم شیعرەی بۆ چلەی مستەفا پاشا وتووە.

***

## بۆ ئەمین زەکی بەگ و صالح زەکی بەگی صاحبقران

### ٩- پێشوازی

١٩٣٢

ئەمین زەکی بەگ، صالح زەکی بەگ
ئەم دوو زەکایە، دوو شوعلەن یەک یەک
ئەمین زەکی بەگ، پێشکەوت ئەمڕۆ دێ
صالح زەکی بەگ، دوای ئەو ئەکەوێ
یاخوا بەخێربێن، چاو گەلمان ڕۆشن
هەردووکیان، بۆمان، زۆر تێ دەکۆشن

***



## بۆ سانحەی کچی ئەمین زەکی بەگ

١٩٤٨

ئەستێرەیەکی گەش، کە ئەڵێی، مانگی بەرز ئەوە
سەر گۆیژە کەوت و، بۆ وەتەنی خۆی، چرای شەوە
ئەسڵی، لە نەسلی، قوتبی شیمالە، بەڕۆشنی
وەک، بێچوە قوتبە، مەرکەزی (زەورا) نشیمەنی
چەند ساڵ، لە خوام ئەویست، کە لە کوردا، کچێکی وا
لەم خاکە هەڵکەوێ، بەزەکا، بێ بەجێیی هیوا
وا ئەم هیوایە، هاتووەتە دی، زۆر بەدڵخۆشی
جنسی لەتیف و شیعری سنووحاتی دڵکەشی
ئەی سانحاتی، زادەیی، تەبعی وڵاتەکەم
نووسینی تۆیە، تامی خەڵات و بەراتەکەم
باوکت، کە وێنەیەکی تری، نایەتە، جیهان
پێی خۆشە، تۆ، کە تێپەڕی، لەو، نووری نیشتمان

***

## کورتەیەکی ژیان و بەرهەمی ئەمین زەکی بەگ[١]

محەممەد ئەمینی کوڕی حاجی عەبدولڕەحمانی کوڕی مەحموودی باپیرە. لە ساڵی (١٨٨٠ ز) لە گەڕەکی گۆیژەی شاری سلێمانیدا لە (حەبیبە)ی دایکی بووەتەوە و دنیای دیوە. باوک و دایکی نەخوێندەوار بوون و باوکی خاوەنی وڵاخ و کاروان بووە. لە (١٨٩٢ی ز.) چووەتە فێرگەی (مولْکیی) سەرەتایی سلێمانی، دوای ئەوەی لە فێرگەی مەلا عەزیز ماوەیەک خوێندوویەتی. لە ١٨٩٣دا چووەتە فێرگەی ڕوشدییەی سەربازیی سلێمانییەوە، دوای دوو ساڵ خوێندن چووەتە ڕوشدییەی سەربازی بەغداد. پاش سێ ساڵ خوێندن لە (١٨٩٨ ز.)دا چووەتە کۆلێجی سەربازیی هەروەها بەشی ئەرکانی ئەستەنبوول کە لە (١٩٠٢) دا بەپلەی (ڕەئیسی چاک)، دەرچووە و لە لەشکری عوسمانی شەشەمی بەغداد دامەزراوە. لە ١٩٢٥/١١/٢٤ دا بۆ یەکەمین جار لە وەزارەتی (عبدالمحسن سعدون) دا بووە بەوەزیری کارداری و هاموشۆ. لە وەزارەتەکانی زانستی و بەرگری و ئابووری و هاموشۆدا بووە کە لە ١٩٤٢/٢/١٠دا لەبەر نەخۆشی باداریی (رئیوماتیزم) بەیەکجاری دەستی لە هەموو فەرمانێکی دەوڵەت هەڵگرت. ئەمین زەکی نەمر ئارەزوومەندی شیعر، ئەدەب، خۆشنووسین، نیگارکێشان بووە. زمانەکانی،

کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی، ئەڵمانی، فرانسی، زانیوە. بەتورکی و عەرەبی و کوردی لە بابەت مێژووی جەنگ، لەشکر، مێژووی سیاسییەوە بەرهەمی بەنرخ و بێ هاوتای هەیە، (٩) یان تورکیە و دەربارەی دەوڵەتی عوسمانی و لەشکری و جەنگیەتی (نەکراون بەکوردی یا بەعەرەبی). یەکێکیان عەرەبییە دەربارەی لەشکری عیراق. بەرهەمە کوردییەکانی ئەمانەن:

١- محاسبەی نیابەت ١٩٢٨.

٢- خلاصەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان ب١، ب٢ (١٩٣١-١٩٣٧)

٣- دوو تەقەلای بێسوود ١٩٣٥.

٤- تەئریخی وڵاتی سلێمانی ١٩٣٩ کراوە بەعەرەبی.

٥- کوردی بەناوبانگ (١٩٤٥ ـ ١٩٤٧) کراوە بەعەرەبی.

٦- تأریخ الدول والأمارات الكردية ١٩٤٥.

---

(١) بڕوانە (گۆڤاری کاروان) ژمارە -٣٥- ساڵی ١٩٨٥ (چەپکێ نامەی مێژوونووسێکی کورد) کەمال ڕەئووف محەممەد ل ٨٧.

***

## سێ شیعر بۆ شێخ محەممەدی خاڵ

یەکەم:

**١٩٤١**

بۆ ئەو دانایەی[1]، وا لە چەمچەماڵ
هەر ئەو تێئەگا، لە قاڵ و لە حاڵ
لەلام، تەختی سلێمان بۆبە، با، ئەیبرد بەئاسمانا
بزانن سەڵتەنەت، بایە، بەقا نابێ لە ئینسانا
کەوابێ، گەر وەهاش بم، تەختی با بردووم، لەلا بایە
کە، با، بیبا، (کەباب)ێ بێ، کەبابیشم، لە خۆڕایە
مەڵێن، تۆ نەوسنی! باوکم، بەنانێ جەننەتی دۆڕان
من ئەو نانە، کەبابیشی، لەگەڵ بوو، دڵمی هەڵسووڕان
لە کوردیدا، کەباب، بابۆڵەیە، باوکێکە، وەک بابە
کە فرزەند بم، ئیتر بۆ قەدری باب نەگرم، ئەرێ بابە!
ئەڵێن ئاڵتوون، بەهەڵکەندن، بەدەست دێن لەناو بەردا
بەڕۆح کەندن، مەگەر پارەپەرستی، دەستی لێ بەردا



بە سەد دانە دەڵەک زاتێک، لەسەر کورسی ئەمەل دانرا
(دەڵەک) نەبوایە، چۆن وا زوو ئەو جێگەیە بە ئەو ئەدرا
بەبرژانگ، دەوری چاوی خۆم، تەنی، تەلبەند و پاسارە
نەوەک خەوبێت و ئەو دەرچێ، کە خەو زۆردار و لاسارە![2]

---

(١) لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا لەبری (دانا) بەهەڵە نووسرابوو (بۆ ئەو دانەیەی).

(٢) لە نوسخەی ژینی ژمارە (٦١٧)ی ساڵی ١٩٤١دا کە ئەم شیعرە بڵاوکراوەتەوە لە کۆتاییدا ئەم بەیتەش نووسراوە:

بەبۆمبا زیندەورە کز بوو، گەلێ مەعموورە، سووتاوە
هەمووی هیتلەر بوو، قەومانی، ئەجەل لەم ناوە بەد ناوە

***

دووەم:

گڕ و گاڵ بەیادی شێخ محەممەدی خاڵ، گیرۆدەی چەمچەماڵ

**١٩٤٤**

غازیی، شەهیدیی، لە لا خۆشترە[1]
نازانێ، کوشتەی، عەشق لەو پێشترە
ڕۆژی قیامەت، چۆن وەک یەک ئەبن
ئەم کوشتەی دۆستە و، ئەو کوشتەی دوژمن
ئەو دڵەی هیوا، بەتۆ، ئەبەستێ
ئاشکرا و پەنهان، تۆ ئەپەرستێ
مەیرەنجێنە و نەک، بشکێ و بێ بەخوێن
لەو خوێناوەدا، دڵگیر بێ و بێ شوێن
من لە پێش چاوی، چاوت ئەکوژێ
چۆن لەلای بیمار، خوێنم ئەرێژێ
دڵم هەمیشە یادی تۆ ئەکا
لە ڕێی ڕەزاتا، جستوجۆ ئەکا
ئەگەر لە خاکم، گیایەک، سەر دەرکا
بۆنی لە بۆنی، وەفای تۆ دەکا
لە جەهەننەمدا، یادی تۆ ئەکەم
گڕی ئەو ئاگرە، بەنوور تێ ئەگەم

ئەگەر بەهەشتم، ببێ و تۆ نەبی
تاڵ و بێ بەرە، لام وەک پەلکی بی
مستێ مەیلی تۆم، بێ جامی شەراب
بولبولی تۆم و بمکەن بەکەباب
لە سۆز و کزەی برژاندنمدا
هەر زکری تۆیە بەکوڵ دەنگ ئەدا
ئەگەر ڕۆژی تۆ بە بەندەگییە!
فرۆشیارییە، ئەی مووچەت چییە؟!
دوو کەعبە هەیە، یەکێ لەگڵە
ئەوی تر گۆشتە، کە ناوی دڵە
ئەو ئەچی، بەردی، ڕەشی ماچ ئەکەی
ئەم هەزار دەردی، پێ عیلاج ئەکەی
ئەگەر ئەتەوێ تۆ ببی بەمەرد
هەواو هەوەسی خۆت بکە بەگەرد
ئەلفی (مرادت) لەمراد، لابرد
ئەوسا ئەبێتە (مەرد)ی گوردی کورد
ئەڕوانیتە خۆت، بەتاو و تینی
خۆت لە ئاوێنەی دێوا ئەبینی
گلێنەی چاو بە، لەڕێی ڕووناکا
عالەم ئەبینێ و خودبینی ناکا
دوو قافیەمان، لێ بوو بەدوو باڵ
خاڵ و چەمچەماڵ، بەدرێژی ساڵ

---

(١) ئەم شیعرەی دووەم لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بلاو نەکراوەتەوە.

***

## شیعری سێیەم بۆ شێخ محەمەدی خاڵ

١٩٤١

شێخی ڕەوشەن خاڵ، چرای نەوەی خاڵ
بەحوکمی قەزا، قازی چەمچەماڵ



تەنها بۆ ئەوە، چووی بووی بەقازی[١]
پێت بڵێن: خودا و بەندەت لێ ڕازی
ئەگینا پایەت، بێ پایان بەرز بوو
خزمەتت لەسەر ئەستۆمان فەرز بوو
ئەوسا بارەگای خودات بەدەست بوو
هەر تۆ دەربەست بووی، کەچی دەر بەست بوو[٢]
ویستت، خزمەتت، بۆ عالەم عام بێ
یا خوا (اتقوا) لە تۆ ناکام بێ
دیارە ئەیزانی ڕۆژی بایەزید
خەرقەکەی تەڕ کرد[٣] بۆ (هل من مزید)
چووە ئەو ئاگرە، بکوژێنێتەوە
ئیسلامی لە دەم بسێنێتەوە
وەلەکێک توولێک ئەدا لە ڕانی
خەرقەی فڕێدا، لە کزەی ژانی
بە ئازارێکی هەتیوە ڕووتێ
وتی تەڕ و وشک تێکرا بسووتێ
من قازێتی تۆم لە لا خۆش نەبوو
دوایی بەشتێ، ئەو فکرەم تێکچوو
وتم هیممەتی خاڵت لەسەرە[٤]
بۆ ئەم ئیشە ئەو، دیارە ڕەهبەرە
بیستوومە ڕۆژێ، پێش جەژنی قوربان
ڕووەو شارەکەت، چوو بووی بۆ گەڕان
تووشی شەخسێک بووی لە ئەهلی قەڵەم[٥]
بەخدری زیندەت، دابووە قەڵەم
تۆ خۆت، عەرەفات، لە عەرەفات بووی
مەستی تەجەللای، زات و صفات بووی
جەمال و جەلال، نیگای ئاوارە
عەکسی کردۆتە، شووشەی سەیارە
تەجەللای خۆت بوو بەغەیرەت زانی
ئەمە سرڕێکە، لە عام نیهانی

یاخــو بەقــەولی گـاڵتــەی درۆزن
کــەرەکــەی خــۆتت لێ بوە ڕمــوزن
بەڵێ ئەو شـەخسـە کـە هات ڕووبەڕوو
لەسـەر کـانیـەکـەی خـدری زیندە بوو
لە (کـەر ترێنە)[6] (دەسنوێژی) نەشکا
کــەرترێنێ بوو لە شــێــوە و شکا
لە خــوام ئەوێ تۆ هەروا نیک بین بی
مــژدە وەرگــری (روح الأمـین) بی
بە فــەیزی ڕۆحی باپیــر ئەمین بی[7]
گـوڵدەسـتـەی باغـچـەی ژیان و ژین بی

---

(١) ئەو کاتەی کە شێخ محەممەدی خاڵ کرا بەقازی لە چەمچەماڵ و فەرمانی میری بۆ دەرچوو و شاری سلێمانی بەجێ هێشتووە، پیرەمێرد زۆری پێ ناخۆش بووە کەوا توخنی فرمانی میری بکەوێ بەڵکو ئەیویست لە جێگەی باپیری کە حاجی شێخ ئەمین بووە ببێتە جێنشین و ئەو مزگەوتە بەئاوەدانی بهێڵێتەوە. م. هـ.

(٢) دەربەستی یەکەم واتا بەتەنگەوەهاتن، وە دووەمیان واتا ڕێی لێ گیرا بوو.

(٣) لای م. هـ نووسرابوو خەرقەکەی تەرک کرد. کە هەڵەیە.

(٤) ئەو بەیتە لای م. هـ لە لاپەڕە (٣٠٢)ی دیوانەکەیدا نەنوسرابوو.

(٥) لای م. هـ نووسرابوو (ئەهلی عیلم) کە دیارە هەڵەیە و ڕاستیەکەی (ئەهلی قەڵەمە).

(٦) کەرترێنە: هەورازێک بوو لەبەینی قەرەهەنجیر و کەرکوکدا لە کاتی خۆیدا، بەڵام ئێستە ئەو هەورازە نەماوە بەڵکو بەگرێدەر وەکو تەختکراوی لێ هاتووە. م. هـ.

(٧) ئەمین: نیازی لە (حاجی شێخ ئەمین)ە، کە باپیری شێخ محەممەدی خاڵ بووە.

***

## بۆ کۆچی شێخ عەزیزی برای شێخ نووری شێخ صالحی شاعیر

١٩٣٦

ئەی چەرخی چەپگەرد، چەواشــەی بێ باک
لە بەهاراندا، گــوڵ دەردێ لە خــاک
تۆ نەوگــــوڵێکت، بردەوە ژێر گڵ
زۆر کــەست گــریاند، ســزات دا بەدڵ
عــەزیز گــوڵێ بوو، بەئاو کــەوت سیس بوو
جێ هیــوای خاک بوو، حەیفە لە کیس چوو



## دوو شیعری پیرەمێرد بۆ عەبدولواحد نووری[1]

شیعری یەکەم:

## بۆ چلەی عەبدولواحد نووری

١٩٤٤

زەردە پەڕ، لەسـەر گـڵـەزەردە، کـە دار و بەردە
زەرد هەڵگەڕاوە، ڕۆچووە، ناو ئوفقی لاجـوەردە
ئەو ڕۆژە جـوانە، بەم هەمـوو، پرشنگی نوورەوە
ڕووی کـردە شـاری تار و پەنای گـرت لە دوورەوە
ئێـمەش چرایەکی گەشی، عـیلمـمـان، کـوژایەوە
ڕۆڵەی وەتەن بەنـاڵـەوە، ئەگــــرین لە دوایەوە
(واحـد) کـە کـۆچی کـردووە، ڕۆژی چلەی ئەوە
یادی ئەکـەین بەداخــەوە، ڕۆژمــان لەلا شــەوە
چەند جوانە، وێنەکەی، کە لە (ژین)دا ئەژی وەها
کـوڕگـەل، هەمـیـشـە، یادی لەلاتان بێ، توخـودا

شیعری دووەم:

١٩٤٤

ئەم وێنەیەی، بەشینەوە، ژین[2] خستیە سەر سەری
شەخسێکی خۆشەویستە، بەفەزڵ و هونەروەری
ڕەنجــێکی زۆری داوە، گــەلێ لاوی پێگەیاند
ئاسـاری ئیـقـتـیـداری، بەتەئلیـفی خۆی نـواند
گەیییە ئەوەی، کە کەڵکی وەتەن بگرێ، دەستی مەرگ
پێـچـایەوە بەقـینەوە، خوێناوی خسـتـە جەرگ
داخی گــرانە، قــەدری نەزانرا، لە ژینیــا
هەر (ژین)ە، وا بەناڵەوە، ئەگـری لەشــینیـا
توخـوا، کـوڕینە، لاوینە، بۆ لاوی نیـشـتـمـان
وەک پیـرەمـێرد، چلەی بکەنە، مـاتەم و فـغـان

قەدری گوزەشتە، ڕەغبەتی ئایندەیە، بەتین
نامرن، ئەوانە، وا لە دڵی میللەتا، ئەژین

(١) ئەم دوو شیعرەی پیرەمێرد لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاونەکراوەتەوە.
(٢) ژین: مەبەست لە ڕۆژنامەی ژینە کە پیرەمێرد خۆی دەیبرد بەڕێوە.

***

## ئاهی زار(١)

١٩٤٩

بێ هۆش و شعور و دڵفگارم
ناچار کە خەریکی ئاهی زارم
سا، بیکەرەوە، گرێ لە زوڵفت
ئەو بەندە، گرێ، ئەدا لە کارم
وەک بەفرە هەمیشە، ئاهی ساردم
ناوێرێ، کە بێتە لام، بەهارم
چی بکەم، کە بەشێتی. کەوتمە ناو شار
هیند، بەردم، ئەهاونێ، سەنگەسارم
ئاخر! گوڵەکەم، کە تۆم لە دەست چووی
دڵ پڕیە لە خار و، پڕ جەخارم
لەم بێکەسییە و، لە جەوری بێ حەد
پاداشتم ئەوێ، لە کردگارم
دینیشت لەگەڵ دڵا فڕاندم
لای خوایشم نەماوە، شەرمەزارم
وا مامەوە، بێ پەنا و هیوای تۆ
تەنها بەخەیاڵە، دەمگوزارم

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

## بەدکار(١)

١٩٤٩

سافیلکەداری، دەستی بەدکارە
شەڕەدار هێجگار، زۆرە لەم شارە



سەیدی قەومێ، کە خۆش باوەڕە
بەدەست فیتنەوە، مێکوتی ساوەرە
هی وایشمان هەیە، بەدۆیش ئەیژەنێ
گۆشتی نەدیوە و دانی دەئاژنێ
ڕێی ئەکەوێتە، هەر دیوەخانێ
زەمی خەڵک ئەکا، هەتا ئەتوانێ
لە دیوەخانان، کە غەیبەت باوە
ئێستا بەپۆکەر، چاری کراوە
خوا عەیبی بزنی، وا خستۆتە ڕوو
کەچی کڵاوی کردووە بۆ بەڕوو
زۆری وا هەیە، موتوربە ئەکرێ
بە ڕووی کێوانە و کەستانە ئەگرێ
لەم هاوینەدا، کۆڵلارە زۆرە
بۆیە ژن و پیاو، کەوتوونە نۆرە
ڕەشەبای نیسان، کەوتۆتە وچان
وا ڕووی کردۆتە، سوریا و لوبنان
هەر وا زەعیمە و کە نون مارشاڵە
دوای با، ئەیبینین، کە قون بەتاڵە
یاخوا ڕۆژی شام، نەکەوێتە شام
(حسنی) و (سعادە) نەگەنە مەرام
شام کە سەرینگای (صلاح الدین)ە
(صالحیە)یش، کوردی بەدینە
«ارم ذات العماد» ئەوێیە
حەیفە نوشوستی بێنێ، ئەو جێیە

(١)ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە

***

١٩٤٨

گەرماوی ڕەمەزان لەگەڵ گرانی
ئاو لە دڵمان دێت لەبەر بێ نانی
خۆراک لە ماڵا هیچ نەماوە بۆم
ڕۆژوو، رامەکە، ئەتگرم، ئەتخۆم

## دوو شیعر بۆ کوڕێکی حەسەن فەهمی بەگی جاف[1]

یەکەم

**١٩٤٧**

مژدەیەکی خۆش، هات بەتەلغراف
کوڕی بوو بەدوو، حەسەن فەهمی جاف
لەناو جەژنانا، جەژن بوو بەسێ
دیارە بوو بەدوو، سێیەی لەدوو دێ
ئەمە تەئریخی، ڕۆڵەی زەکییە
محەممەد سەروەر، گشت ئێل بەگییە
٩٢ ٤٦٦ ٧٢ ٥١ ٢٧ = ١٣٦٦

دووەم:

**١٩٤٩**

خودا، داد، لە دەست، ئەم پیرە زاڵە
چەند بەسەر دڵی نازدارا زاڵە
حەسەن بەگ، لە جێی دوو پاشا ماڵە
دوو چرای هەڵکرد، لەو بنەماڵە
بای مەرگ یەکێکی، کوژاندۆتەوە
دڵی ئەو ئێلەی ڕەنجاندۆتەوە
(محەممەد سەروەر) کۆچی بەخێرە
قۆچی قوربانی، قەزا وەگێڕە
خوا ڕۆڵە مردن، بەئەجر ئەژمێرێ
یەک، بە، دە، تۆڵەی بۆ ئەبژێرێ
تەئریخە بۆ ئەو، وەکو سروشتە
محەممەد سەروەر، پەپولەی بەهەشتە
٩٢ ٤٧٦ ٦٦ ٧١٢ = ١٣٦٨

---

(١) ئەم دوو شیعرە لای م. هـ بلاو نەکراوەتەوە.



## قەلەندەر

**١٩٤٩**

لای قەلەندەر، هەموو، داراتی سلێمان[1]، بادە[2]
ئەو خوداناسە، سلێمانە، لە موڵک ئازادە
وا دەزانن، کە بناغەی لەسەر ئاوە، دنیا
یا سەراو، یاخود، سەراوێکە، زۆری بادە
لالە عەباسی، عەباسی، هەموو، وشکی کرد
ئاوی ئاوایی، لە شوێنیان، شەتەکەی بەغدادە

---

(١) سلێمان: واتە سلێمان پێغەمبەر.
(٢) باد: واتە با، هەوا و شتی نادیار.

***

## ئای گیانە جەرگم[1]

شوباتی/ ١٩٥٠

ئای گیانە جەرگم، ...
توێ، توێیە، بێ تۆ، توێی پەڕەی جەرگم
لە دەورت، دوورم، نزیکە مەرگم
بەخوێنی دیدەم، گوڵگونە بەرگم
خوا بەو جەماڵەی، کە بەتۆی داوە
شۆڕی جنونی، خستە دنیاوە
عەقڵ و هۆش و فام، لای کەس نەماوە
قیامەت، بەقەد، قامەت[2]هەڵساوە
گیانە تۆ جوانی، ئارامی گیانی
خۆت مەشارەوە، هەتا ئەتوانی
بۆ ئێمە سەیری، سنعی یەزدانی
بۆ تۆیش سەرفترە و زەکاتی جوانی
مەترسە ئەوەی، کە تۆ ئەبینێ
نایەوێ، دەقی، جوانیت، بشکێنێ
عەشقی ساف، عاشق، بەڕۆح ئەژێنێ
ئارەزووی وەسڵی، لە لا نامێنێ

هانا، هەی سەرخێڵ، نازدارانی جاف
تۆ ئاوێنەبە، بۆ عەشقێکی ساف
ئالودە مەبە، بەلاف و گەزاف
بۆ ڕۆحی عەشقم، ببە بەمەتاف

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.
(٢) قامەت: قامەتت، باڵات، بەقەد بەرزیت.

***

## بۆ کۆچی سەید نووری نەقیب

١٩٥٠

هەر نیوە شیعرێک تەئریخێکە بۆی
دەلالەت دەکا، لەسەر چاکیی خۆی
نووری میری سوور، چوو بۆ ناو جەننەت
٢٦٦ ٢٦٠ ٢٦٦ ٨٩ ٥٧ ٥٣ (١٣٦٩) کۆچی
فەقیدی سیادەت کەوتە بەر ڕەحمەت
١٨٤ ٤٧٥ ٤٣٦ ٢٠٧ ٦٤٨ ( ١٩٥٠) زاینی

## بۆ کردنەوەی یانەی فەرمانبەرانی سلێمانی[1]

شوباتی/١٩٣٣

دەمێ بوو داوای، نادیمان ئەکرد
زۆر بەخیلیمان بەشاران ئەبرد
خوا بۆی ڕێکخستین، قەراری درا
هەرچی پێویستە، وا بۆی ڕێکخرا
باخچەی بەر سەرا کرا بەنادی
گوڵ و گوڵزارە، وادی بەوادی
متصرف خۆی تەشریفی هێنا
ئینتخاباتی ئەعزای پێک هێنا
بەڕایی هەقیی نۆ کەس دانرا
هەموو تێکۆشن یەکسەر وەک برا
متصرفیش نوتقێکی وای دا



زۆریان تەقدیرکرد، خەڵکی لەوێدا
تەفسیری غایەی نادی بۆ کردن
یەکێتی و ڕێکی، خەفەت دەرکردن
خوا ڕەوای بینی، نادیمان بۆ بوو
بێ دەرەتانی، مەئموور بەسەرچوو

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## حەفصە بەهارە[1]

حەفصە بەهارە، گوڵ گەشایەوە
ئاوی کاریزی، شەریف ژیایەوە
هاڕە هاڕی ئاو، خوێندنی بولبول
سەد بار پیریش بی، شەوق ئەدا بەدڵ
چوالە گوڵی کرد، ئەرخەوان سوورە
هێشتا پشێوی، لەناو شار دوورە
گوڵاڵە سوورە، بووکی بەهارە
منیش بۆ بووکێ، دڵم داغدارە
بەفر و هەڵەکۆک لەمن قەوماوە
گوڵ بە (توفیق)ی هەولێر بڕاوە
تا تۆ و (فەهیمە) خۆشبن من هەروام
باوجود هەتا، دەمرم بەتەمام
نەیسە، بێینەوە، سەر باسی بەهار
وا سەوز بوو سێو، هەڵووژە و هەنار
شنگ و هەڵەکۆک، پرچیان درێژ کرد
هێندەم پیشۆک خوارد کەللەمی گێژ کرد
دارێکی زۆرم، کرد بەبێڵەکان
ئەیدەم بەئێوە بۆ بن گۆزروان
وا بەخلەخل، (نیسان)ەکەش هات
(چارشێوی) سەوزی پۆشیوە وڵات

(سیوجگەری) زستان، دەڵێن زۆر چاکە
بن توەکـەشـمـان، مـاڵـیـوە و پاکـە
شـــیش و مــقـــەڵی و ئاگـــرم داناوە
تەمـــاتەی ســـەوزی پاریشم مـــاوە
پشتە مەغزە و دووگ، گورچیلەش دێنم
هەرچی بیــفــڕێنێ، قـــۆڵی دەشکێنم

(١) مامۆستا م. هـ دەربارەی ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٣٣٦ی (پیرەمێردی نەمر)دا دەنووسێت: ئەم هەڵبەستەم لە دەستخەتێکی پیرەمێرد خۆیەوە وەرگرتووە. بەڵام مێژووی پێوە نییە، دیارە کە بۆ حەفصەخانی خوشکەزای وتووە کە خوشکی جەلال صائب و جەمیل صائب. هادی صائب بووە و ژنی میرزا فەرەجی حاجی شەریف بووە، کە بازرگانێکی بەناوبانگی بەغدا بووە و پیاوێکی زۆرباش و لەسەرخۆ و بێوەی بووە.
پیرەمێرد لە بەهارێکدا داوای لێ کردوون کە لە بەغداوە بەسەردان بێنەوە بۆ سلێمانی و بۆ ئەمە ئەم هەڵبەستەی خوارەوەی بۆ ناردوون.

بەنگۆکـــە و پیــاز و کـــەوەر و تەرخـــوون
لەگـــــەڵ بەهارا، هەمـــــوو پەیدا بوون
ســـەرتوێژی مـــاست و پەنیـــری تازە
هەمـــوو بەغـــدا بۆی، ئاواتەخـــوازە
ئاخ ئا ئەم بەزمـــە، بەتۆوە خـــۆشـــە
ئێـــوەی تیـــا نەبن، بێ تامـــە و بۆشـــە
شــــایی نەورۆزم، کـــــرد بەناو و داو
ئێـــوە دیار نەبوون، لێم بوو بەزووخـــاو
تو خوا و پێـغـەمـبـەر، بەسـیـە غـەریبی
ئەو عـومـرە خـۆشـە، لەگـەڵ ئێـمـە بی
وا بەشـــوێنتـــانا، خـــۆم دێمـــە ئەوێ
لام وایە مـــیـــرزا، منی خـــۆش ئەوێ
ئەگـــەر تەشـــریفی بێـــتـــەوە ئێـــرە
ئەوانی ئێـــرە، ئەبنە گـــای گـــێـــرە
لە ســـایەی خـــواوە، لە کـــاراین زۆرین
(مـــیـــرزا) گـــەورەبێ، خـــۆش ڕائەبوێرین

***

## بۆ شەهیدان مستەفا خۆشناو و محەممەد قودسی[1]

**١٩٤٧**

دیســان وا کـۆســتی نوێمـان کـەوتەوە
گـــەڕی گـــەردوونە، کـــوردی گـــرتەوە



ئەم دوو دار تەرمـــە، دوو نەڕەشـــێـــرە
زنجـــیـــریان پچـڕان، گـەیینەوە ئێـــرە
لە ڕێی ئێـمـەدا، گـیـانیـان فـیـداکـرد
ناوی بلـندیـان، وا بۆ خـــۆیان برد
ئەو پەتەی لەملی ئەمـــانە خـــرا
ئەوانی خنکاند، بەڵام پەت پچـــڕا
پڵنگی ئەنگێـــوراو بەهەڵـمـەتتـــرە
گـۆم هەتا قـووڵ بێ، مـەلەی خـۆشـتـرە
وا پێـــمـــان ئەڵێن دەم بەپێکەنین
گـیـانمان فـیـداکـرد، ئێـوەی پێ بژین
ئەم جـووتە شـێـرە، دلێـری شـەرزە
لەناو مـێـــژوودا، ناویان زۆر بەرزە
هیچ پێـیـان ناوێ کـفن و دفن و شین
شـــەهیـــدان لەناو دڵـمـــانا ئەژین

(١) ساڵی ١٩٤٧ دوای ڕووخاندنی کۆماری ساوای کوردستان لە مەهاباد، ئەو چوار ئەفسەرە کوردە تێکۆشەرەی بەشدارییان تیادا کردبوو بەهۆی بەهەڵەداچوونەوە خۆیان دایەوە دەست حکومەتی پاشایەتی عیراق ئەویش لەبری لێخۆشبوون فەرمانی لە سێدارەدانی بەسەرا دان. لە شەهیدان تەرمەکەی عزەت عەزیز برایەوە ئامێدی، خەیروڵڵا برایەوە بۆ هەولێر. مستەفا خۆشناو و محەممەد قودسی هێنرایەوە بۆ گردی سەیوانی سلێمانی.

***

## بۆ داخستنی گۆڤاری گەلاوێژ[1]

**١٩٤٩**

داد لە دەست جەورت هەی چەرخی سەر چەوت
وا گەلاوێژ[2] کەوت، گەلاوێژ[3] بۆچ کەوت!؟
ئاســۆی ئەدەبی، کـــوردی پڕ تەمـــە
ســفـــیـــدەی بەیان، شـــینە مـــاتەمـــە
(ژین) بۆ گـــەلاوێژ، بووبوو بەپەرژین
ئێـــســـتـــا لە دوای ئەو، بێـــزارە لە ژین
ئیـــبـــراهیم[4] لەناو (نار)ا ســـووتاوە
(سەجادە)ی[5] تەقـوا، بێ ڕایەڵ مـاوە

هیــوامـــان وایە کـــە چەرخ وەرگـــەڕێ
ســـەجـــادەم بەســـەر شـــەتدا بگەڕێ
پیـاوێکمـان ئەمرێ تەعـزیەی بۆ ئەگرین
بۆچ بۆ گـەلاوێژ، نەگـرین، تا دەمـرین؟
گـەلاوێژ هەرچەند، جـارجـارە هەڵدێ
لە بورجی خـــۆیدا، دوایی هەر هەڵدێ

(١) ساڵی ١٩٤٩ و دوای دە ساڵ بەردەوام دەرچوونی گۆڤاری گەلاوێژ لە ساڵی ١٩٣٩ وە، بەداخەوە داخرا.
(٣.٢) گەلاوێژی یەکەم ئەستێرەی گەلاوێژە و گەلاوێژی دووەم گۆڤاری گەلاوێژە.
(٤) ئیبراهیم: مەبەست لە ئیبراهیم ئەحمەدی خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری گەلاوێژ بووە. هەروەها نیشانەیە بۆ ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ (یا نار کوني برداً وسلاماً علی ابراهیم) ئیبراهیم خراوەتە ئاگرەوە و نەسووتاوە.
(٥) سەجادە: مەبەستی لە زانای ئەدەبی کوردی مامۆستا (علاءالدین سجادی) بووە کە سەرنووسەری گۆڤارەکە بوو.

***

## بۆ گۆڤاری گەلاوێژ[1]

١٩٤٤

لە (ژین)ەوە بۆ گەلاوێژ:

«کە ژین بستی عفریتەکان دەوری گەلاوێژیان داوە خەریکن لە گەلاوێژ کەوتنا، گەلاوێژ بخەن، ئەم شیعرانەی پێشکەش کرد».

پیرەمێرد

گـەلاوێژ، خـوشکە بالاّ بەرزەکـەی ژین
ملوانکەی تۆ، لەڕیشەی عەقدی پەروین
بەشـەوقی تۆوە ڕوونە، ئەم جـیـهـانە
بەڵام (خوفاش)[2] لە تیشکت کوێر و نابین
بەکـوێری چاو هەڵێنێ نەنگە ویـستـت
بەدی عـەشـرەت نمەکگیـرە بەئایـن
ئەگەر عفریت وەکو مانگ بێتە سەر ڕێت
کە کەوت جەستەی بەلنگەوقووچ ئەبینین
(شـەهاب)ی ساقـییت، ژینە مـەترسە
«جـعلناها رجـومـاً للشـیـاطین»

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.



(٢) خوفاش: شەمشەمە کوێرە.

***

## بۆ گۆڤاری گەلاوێژ

١٩٤٧

گـەلاوێژ کـەوتوە، یاخـوا نەکـەوێ[1]
کـوردسـتـان شـەوقی، شـوعـەرای ئەوێ
زۆری نەمـاوە، شـوعـەرا، لاڵ بێ
توخـوا مـەیەڵن، وا لاڵ و پاڵ بێ
(عـلاءالدین)ی سـەجـادی وا هات
وەک بەرات، سـفـرە، بێنیـتـە جـەمـات

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

## دوو شیعری پیرەمێرد بۆ مەحوی

کانوونی دووەم ١٩٥٠

قـەسـیـدەی (بەحـری نوور)ی مـەحـوییـە، بۆ ژین ئەمـجـارە
کـە بۆ ئەم جـەژنی مـەولودە ئەشێ ئەم نیـعـمـەت و گـفـتـارە

١٩٤٧

«مەحوی لەعەدەمدای، چە هەرای پێ ناوێ
پێچێکی سەرە، دەوری سەرای پێ ناوێ
بێگانەو بێ یار بە، کـە بارت سـووکـە
دڵ تێکەڵی یەکـە ئاشنای پێ ناوێ

***

## بۆ کۆتایی جەنگی جیهانی

١٩٤٥

حـیـجـازی کـوردی و نەوای عـیـراقی
هەردوو لە کـاران سـا دەی هەی سـاقی
ئـەمــڕۆ ڕۆژێکە، شـــەڕ بڕایەوە
دەرگـــای شـــادیمان بۆ کـــرایەوە

لەسایەی خواوە پێمان کەوت پەیمان
کە هاوپەیمانمان بۆ بوون بەتەیمان
ئێستا لە شایی سوێندخۆرەکانا
دەنگی دەهۆڵ دێت لە کوردستانا
وا بەهەڵپەڕکێش بەرز ئەبینەوە
بەپیریی ئەچین بەپیر ژینەوە
هۆ هۆ ژین، هەی ژین لە کوردستانا
خاوەن مژدە بی لە سای یەزدانا
لاوکی کوردی بۆ لاوانتە
جنة المأوی نیشتمانتە
ناوێرم لەمە زیاتری بلێم
قەتار و زەبوور وەک یەک دێتە گوێم

***

## شیوەنی نەو نەمامێک(١)

١٩٣٢

وا بەکوڵ، ئەگریم لەگەڵ تۆ، هەوری سووری بەهمەنی
من بەوەی گوڵ کەوتە ژێر گڵ، تۆ بەوەی گوڵ پێکەنی
تازە گوڵ، بۆ تۆ بوو، ئەم چەندانە، سەیرانم ئەکرد
تۆ بەجێت هێشتین، گوڵستان، بوو بەچاهی بێژەنی
دایکی خاک، وەک دایکێ بیگرە باوەش، ئازاری مەدە
جێگەکەی تاریکە وا ترسا، لە خەودا ڕاچەنی
دوێنێ نەورۆزم بەبەژنی، نەو گوڵانی ئاڵ ئەکرد
دەوری دەوران، دەورەمی ئەمڕۆ بەبەرگی شین تەنی
نیوە بەیتی دوایی ڕۆژی ڕۆینی ئەو دەردەخا
من ئەزانم سێبەری (طوبا)یە بۆ ئەو نیشتەنی

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی بۆ کۆچی خوشکێکی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ وتووە.

***



## دڵەکەم غەمگینە(١)

١٩٣٢

دڵەکەم غەمگینە، دڵەکەم غەمگینە
ئەگەر غەمخواری، وەرە بمبینە
خوایە ئەم دڵەت، تۆ بۆ چ دا بەمن
عەشق و حەیاتم لێک بوون بەدوژمن
عەشق غەمی ئەوێ، حەیاتیش خۆشی
ئاگر لە دڵدا، چۆن دادەپۆشی؟!
باری حکومەت، لە جەستەم بارە
دڵیش بەتیری یار بریندارە
دەورەی ڕۆژگار، گەردشی بادا
با بەبادە غەم بدەین بەبادا
کە غەم ئەمخاتە ماڵی بێهۆشی
ناچار دەست ئەکەم، بەبادەنۆشی
دەستگیریم بکە، ئەی یاری شەبگەرد
بە پەیامی یار، لە دڵ دەرکە دەرد

(١) مامۆستا م. هـ دەڵێت: پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە ئاهەنگێکی شانۆیی قوتابیانی زانستیدا نووسیوە.

***

## بۆ ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ(١)

بارانی نیسان بوو بەمرواری
بەڕەحمەت بەسەر ئێمەدا باری
زانستی بەینێک برەوی کەم بوو
وەک گەوهەر لەناو سەدەفدا ون بوو
غەواسی عیرفان لە نەسلی غەواس
زانستی(٢) لە گێژ، گێژی کرد خەلاس
زانستی و زانست یاخوا بمێنن
بەڵکو بێکەسان، بەشەو بخوێنن

خوێندنی شەوە، ڕۆژ ئەکاتەوە
پەردەی تاریکی، لائەباتەوە

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی بۆ ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ نووسیوە کە بۆ جاری دووەم بۆتەوە بەمتصرفی سلێمانی و قوتابخانەی زانستی ژیاندۆتەوە.
(٢) زانستی: قوتابخانەی زانستی.

***

## دوو شیعر بۆ کۆچی جەمیل صدقی زەهاوی

یەکەم:

١٩٣٧

تەوەکلی نەبوو، ئەمساڵ، ئەمەندە خۆڵ باری
تەعاملی نەبوو، هەور کەوتە گریە و زاری
فەلەک بوو، خاکی ئەبێژایەوە، بەسەرمانا
مەلەک بوو، چاوی دەئێشایەوە لە گریانا
بە بای زەهاوە بەهاران کە هەوری ڕەش ئەگری
بەشینی بولبولە گریانی شەونم و هەوری
هۆزاری گوڵشەنی ئەم خاکە پاکە بوو تاک بوو
فەزای ئەدەب بەچرای شیعرەکانی ڕووناک بوو
بە باڵی شیعر و ئەدەب، شاهبازی میعراج بوو
شەهی سەریری ئەدەب، فەلسەفەیشی سەرتاج بوو
ئیتر نەماوە ئومێدم، لە داری دنیادا
بگاتە ڕیزی جەمیل صدقی، کەس، لە(زەورا)دا
بە مەسرەعێکە دەمی مەرگ و تەرجەمەی حاڵمان
کسوفی ڕۆژە (ذهاب)ی زەهاوی لای عالمان

***



## بۆ کۆچی جەمیل صدقی زەهاوی

دووەم:

١٩٣٧

باوەڕ ئەکەم کە گیانی بڵند نامرێت و ئەژی[١]
جاران بەخەو بوو، ئێستە بەدیمانە هاتە دی
چەندە گیانی مردوو، بانگ ئەکرێ و گفتوگۆ ئەکا
فەن بۆ ژیانی تاسەری گیان، جستوجۆ ئەکا
بڕوانە ئاسمان بوەتە پەلکی زەرد و سوور
گیانی زەهاوییە کە ئەدرەوشێتەوە لە دوور
گوێم لێیە بانگ ئەکا بەخێربێن بەکۆمەڵی
ئەم هاتنەتان نیشانەیە، بۆ ڕەنگی یەکدڵی
شادم بەمە، بەمەیلەوە یادئاوەریم ئەکەن
دیارە بەقەدری خوێندنەوە، بەرز ئەبێت وەتەن
هەتا حورمەتی گوزەشتەی بێ، تازە پێ ئەگا
خوێنی حەماسەت هەڵدەقوڵێنێ لەناو ڕەگا
دەرکەوت زەهاوی وا لە دڵی ئێمە دا ئەژی
چەند بەختیارە، دیارە کە ئاواتی هاتە دی
سەد ساڵی تر بپرسی، جەمیل صدقی وا لەکوێ؟
دەنگی بڵندی خۆی، لە هەموو شعرێ دێتە گوێ
ناڵێم کە هەیکەلێکی ببێ، وێنە مردووە
دیوانی شیعری چاکترە، ناودار و زیندووە
پێرار بەشیعری ئەو بوو کە (فیردەوسی)[٢] ناسرا
فیردەوس[٣] بوو بەهەواری دوو فیردەوسی وەک برا
کاک جەمیل، بەیادی جەمیلت بوو، کە شیعرم هات
ڕاوەستە، زۆری ناوێ، وەختە منیش بێمە لات

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی بۆ چلەی ماتەمی جەمیل صدقی زەهاوی وتووە کە لە ڕۆژی ١٩٣٧/٥/٢٧ لە بەغدا پێکهاتووە. پیرەمێرد شیعرەکەی بەکوردی نووسیوە و دوایی کردوویە بەعەرەبی و لەوێ خوێندوویەتیەوە. وەک مامۆستا هاوار نووسیویە، منیش کە تەماشای شیعرە عەرەبییەکەم کرد لە ڕووی کێش و داڕشتنەوە ناتەواو بوو، بۆیە هەر کوردیەکەمان نووسیوە.

(٢) فیردەوسی: شاعیری بەناوبانگی فارس و خاوەنی شانامە.
(٣) فیردەوس: واتا بەهەشت.

***

## بۆ پەروین(١)

١٩٢٨

خوشکە گیان پەروین، ئەستێرەیەکی ئاسمانی
کەچاو هەڵدێنی و هەڵدێی، ئەوەندەی ڤینۆس جوانی
لە پەلکی(ئایشێ و فاتمە)(٢)دیلانێت بۆ هەڵئەخەم
بە پەیژەی عیسادا لە ئاسمانت سەرئەخەم
فریشتەکان دێنە لات، کە وەختێ خۆت نیشان دا
ڕایان کێشەرە خوارێ، بەڕێگای کاکێشاندا
دەبا لەناو کوردا، بەلکیسێکیش پەیدابێ
بەشکو تەختی سلێمان، بەهۆی تۆوە ئاوابێ

(١) ئەم شیعرەی بۆ (پەروین) کچەزای نووسیوە بەبۆنەی لە دایک بوونیەوە بەزمانی (فایق هوشیار)ی برایەوە بۆی وتووە.
(٢) ئایشێ و فاتمە: پەلکە زێڕینە، پرچی ئایشێ و فاتمە.

١٩٤٣

«نوقتەی سەیرانی یارانی لابرد
چووە سەر ڕەحمەت، خەڵکی لێی ڕاکرد
نەورۆزی خەستە، بارانی نیسان
وا ئەم جومعەیە ئەچین بۆ سەیران»

***

## ماتەم(١)

١٩٣٩

ئەمڕۆ ڕۆ ڕۆیە و شین و ماتەمە
چەرخی نیلگون خومخانەی خەمە
بەهار ڕوو زەردە، ڕەنگی وەرەمە
هەور بۆمان ئەگری هێشتا هەرکەمە



تازە نەمان، سەر لەگەڵایە
تازە نەمان سەر لەگەڵایە
دنیا گەرم بوو، وا دەی سێبەر هات
سێبەری ئێمە، ڕووی کردە نەهات
ئەو ڕۆیشت بۆ خۆی جێگای بەهەشتە
ئێمە کەوتینە شەڕی کەنیشتە
دنیا خراپ بوو تا هات ئەگۆڕڕا
جێی چاکان نەما مەگەر لە گۆڕا

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە کارەساتی کوشتنی (مەلیک غازی) دا وتووە.

***

## بۆ حاجی عەلی ئاغا(١)

١٩٣٩

موحبی ئالی کاک ئەحمەد(٢) سەدیقی نەسلی گەیلانی(٣)
ئەنیسی عالم و فازل، جەلیسی شێخی عوسمانی
چرایەکی سلێمانی بوو، شەوقی دابووە بەغدا
لە جێی پەروانە خۆی بووبوو، بەخزمەتکاری ئینسانی
خوا بەو خزمەتەی کردی، مکافاتی وەها داوە
لە خزمەت باوکیا نێژرا، لەبەر پێی غەوسی گەیلانی
لە ئاسمانی عیبادەتدا شوعاعی مانگ و ڕۆژێک بوو
بە فەیزی (قادر)(٤) و نەقشی منەوەر بان و ئەیوانی
ئەڵێم هەقمە بتۆرێم، بۆچی تۆ پێش خۆت نەدام گیانە
خەریکم پارە پارەی کەم، کراسی عومری گریانی
هەموو خزم و کەس و کارت هەتا بەغدا سەفەریان کرد
ئەوا من دێم لە خزمەتتا، هەتا دەرباری سوبحانی
دوعا دێنم لەگەڵ خۆمدا، بەدیاری، بارێکی سووکە
لە جەمعی ئالی قوربانی و هەموو شاری سلێمانی

کـــه چووی بۆ (جنة المأوی) ئەمــــه تـەئریخی ڕۆینتــــه
علـی غـــــالب چووە مـــــەئوای ئـازادی بەمـــــیـــــوانـی
**١٣٥٨ی کۆچی**

---

(١) حاجی عەلی ئاغای باوکی عبدالله لوتفی.
(٢) ئەحمەد: مەبەست لە حاجی کاک ئەحمەدی شێخە.
(٣) گەیلانی: شێخ عبدالقادری گەیلانی.
(٤) لای م. هـ بەهەڵە نووسراوە(بەفەیزی قادری نەقشی) ڕاستییەکەی ئەبێ بنووسرێت: قادری و نەقشی. چونکە زۆر کەس هەن پەیڕەوی هەردوو تەریقەتەکە دەکەن. واتا سۆفی و دەروێشن، نەقشی و قادرین.

***

**١٩٤٩**

«مـــام ڕەمـــەزان سێ لاقـــە، هەر لاقـــێکی دە ئەمـــوست
ڕۆژێ ئەمـــوســـتـــێکم بڕی لە بیـــست و نۆ دا ئەو نوست
ئـنجـــــا مـن ڕاست بـوومـــــــەوە، ئـازانـە چاپـک و چوست
ئـەوم دەرکـــــرد لـە مـــــاڵـی کــــــردم بەجـــــەژنـی دروست
حـــســـابی کـــۆن ســـەیریکە لەســـەر پێنج و دەیوو بیـــست
هەر سێ پێنج و دوو بیـــست بوو پەنجـا و سـەدم نەدەبیـــست»

***

## گوڵستان، ڕەنگی زەردە[1]

**١٩٣٣**

ئەوا پایزە گوڵستان، ڕەنگی زەردە
گەڵای دار وەری، بای سەحەر ئاهی سەردە
باڵندە لە هەردە
دڵی پڕ لە دەردە
پەڕێشانە سونبول، چنار بەرگی لوولە
گوڵی قەهقەهە ماتە، مینا مەلوولە
چە عالەم شموولە
ئەم ئەیلولە غوولە
درەختێکی طوبای بەهەشتی عیراق بوو





لە مەئوایە، مەئوای، کە، سایەی بەسەرچوو
درێغا لە دەست چوو
بەڵام زوو، بەزوو
لقێکی بڵندی لەجێ و، جێی هیوایە
وەک ئەسڵەکەی سایبان بی، خودایە
کە داڵدە و پەنایە
وەدیعەی نیایە
کە بەڵکو عیراق، وەک، عیراقی
عەباسی
بەهەشتی زەمین بێ، بەلالە عەباسی
بڵندە ئەساسی
نەبینێ کەساسی
بەعیلم و فنون بێبە دەورانی مەئمون
فرانسە دیسان پەیڕەوی بێت و مەفتون
هەموو شاد و مەمنون
وەکو عەهدی هاروون
کە ئێمەش نەوەی فازلی ئەو زەمانەین
ئەبێ سەرکەوین، تا بزانرێ لەوانەین
لە باپیر نیشانەین
فیدایی یەگانەین

---

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی بۆ ماتەمی کۆچی مەلیکی عیراق وتووە. هەروەها لە ساڵی ١٩٣٩دا دیسان دەستکاری کردووە و لە کۆچی مەلیک غازی دا بڵاوی کردۆتەوە. ئەم دوو شیعرە هیچیان لە دیوانی پیرەمێرد م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

تێبینی: لە سەرەتای هەردوو شیعرەکەدا پیرەمێرد نووسیویە: نەشیدەی ماتەم، گۆرانی مەکتەب. لەسەر وەزنی «بەهاران چە مەحزوون ئەناڵێنێ بولبول».
بڕوانە ڕۆژنامەی ژیان ژمارە ٣٨١ ساڵی ١٩٣٣ .
ڕۆژنامەی ژیان ژمارە ٥٦١ ساڵی ١٩٣٩ .

***

## ماتەمی بەهار

بەهار ماتەمی کەوتە ناو، ڕەنگی زەردە
بە گریانی هەور، بای سەحەر، ئاهی سەردە
باڵندە لە هەردە
دڵی پڕ لە دەردە
درەختێکی طوبای بەهەشتی عیراق بوو
لە مەئوایە مەئوای کە سایەی بەسەرچوو
دریغا لە دەست چوو
لە نەوجوانیا زوو
لقێکی جوانی لەجێیە و جێی هیوایە
وەکو ئەسڵەکەی سایەیان بێ، خوایە
پەنا و هیوایە
لەبنجی نیایە
کە بەڵکو عیراق، وەک عیراقی عەباسی
بەهەشتی زەمین بێ، بەلالە عەباسی
بڵند بێ ئەساسی
نەبینێ کەساسی
هەموو ئێمە بەندە و نەوەی ئەو زەمانەین
ئەبێ پێشکەوین، تا بزانرێ لەوانەین
لە ئەجداد نیشانەین
فیدایی یەگانەین

***

## بۆ ڕۆحی مەولەوی(١)

١٩٤٨

ئەی بەناو مەعدووم، وەی بەگیان مەوجود
عـــــەدەم زینـنەتـی، داوە بە وجــــــود
با مەعدوومیش بیت، نامری هەر ئەوی
شیعرت بانگ ئەکا، ها، ها، مەولەوی



سـۆزی شـیـعـری تۆ لە (ئاتەشگا)وە
ئاگـری نەورۆزی خـسـتـە دنیـاوە
ئەو حــــەوتەوانەی لە کــــایەدایە
هەر شـیـر و شـیـری وشـتـری تیـایە
شـیـعـری تۆ لەسەر، چیـای کـوردسـتـان
لەرزە ئەخـــاتە ســـوپهـــری دەوران

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی نەمری م. هـ دا بڵاونەکراوەتەوە.

***

## بۆ سەید ئەحمەدی خانەقا لە کەرکوک

١٩٤٩

«دوو دار پێکەوە، بخـەیتـە کـوورە
هێند لێکیـان خۆش دێ، گـریان وەک نوورە
ئێـسـتـا هەردووکـمـان، وەها پواوین
گـیـرمـان نەمـاوە، جـەڕی سـواوین»

***

## شینی مستەفا مەزهەر(١)

١٩٤٦

ئاخ چی بکەین لەگەڵ، چەرخی چەپگەردا
مـینای دڵمـانی، کـێـشـا بەبەردا
بـرینی جــــەرگی، کــــولاندینەوە
چـرای زانســــتی، کـــوژاندینەوە
لە گـردی سەیوان، مـەحـشـەر هەڵساوە
ئەم شـــارە تێکرا، وا خـــرۆشـــاوە
مـسـتـەفا ئەفەندی، کـۆچی دوایی کـرد
خـۆشی ئێـمـەشی لە تەک خـۆیا برد
هەوری ئاســـمـــان، کـــردی بەباران
فـرمـێـسـک ئەبارێ، لە دیدەی گـریان

هاوین و باران، مـــــانای لێ بگری
بۆ مــەرگی ئازیز، ئاســمــان ئەگــری
ئەم خـــەڵکە کـــەوا بۆی بەپەرۆشـــە
سەبارەت بەخووی چاک و ڕووی خۆشە
خـــزمـــەتێکی وای کـــرد لە دنیـــادا
دەرسی ئەخـــلاقی بەمـــەردمـــان دا
جـــۆش و خـــرۆشی شـــیـــوەن بڕوانە
تێـدەگـەی قـەومی کـورد قـەدرزانە
وەک ئێـشی داخی خـۆش نابێـتـەوە
شـــوێنیـــشی هەروا پڕ نابێـــتـــەوە
مـــســتـــەفـــا مـــەزهەرکـــە ناونراوە
١٩٤٦= ١٣٦٥= ١٠٤٥ ٣٢٠
بەو ناوە ســـاڵی مـــەرگی بێـــژراوە

.................................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## بۆ کۆچی مەلا عەزیزی موفتی

بەدوو مـەسـرەع بەمـیـلادی و بەهـیـجـری
بە دوو تەئریخ قـەڵەم بۆ مـوفـتی ئەگـری
ئەناڵـێنێ لە غـــەمگینی، کــە نەفــتی
(عزیز قوم لەدەستمان چوو بمفتی) ١٣٦٦ – ١٩٤٧ زاینی

***

## ناسۆرێکی تازە بۆ دڵی کوردەواری

ڕۆژی (٥)ی شوباتی (١٩٣٥) کە ئەحمەد موختاری وەسمان پاشای جاف بەدەستێکی ناپاک شەهید کرا.

دوو مـەسـرەع، یەکێ، کـەیخـوسـرەوانی
دووەمـــیـــان خـــاڵی، ڕووی ئەردەڵانی
بووبوو بەشـیـعـری، جـوان و نەوجـوان
درێغا فـەلەک، خسـتیـە ناو سیروان[1]





ئەحمەد موختاری وەسمان پاشا، لە باوکەوە کەیخوسرەوی، لە دایکەوە ئەردەڵانی، ئیفرات سەخاو زەکا بووبوە نەگبەتی سەرشانی. خۆی دانا دوو داخی بەدڵی عالەما نا.

شـاعـیـر بوو، شـاعـیـر، ئەنجامی وایە
فـــەلەک بەزەیی بەکـــەســـا، نایە!

.................................................................

(١) سیروان: ئاوی سیروان. ئەحمەد موختار بەگی جافی شاعیر لەو ڕۆژەدا لەسەر کەڵەکێک لە کەناری ئاوی سیروان شەهید کرا. ساڵی (١٩٨٥) من چووم بۆ عەبابەیلێ کە گۆڕەکەی لەوێیە و هەڵبەسترابوو ئەم بەیتەی لەسەر نووسرابوو. کەوا بزانم شیعری قانعە کە بۆی نووسیوە:

«ڕۆڵە مـــردوو نیم بزانە شـــیـــوەنی کـــوردانمە
نامـــەوێ دجلە و فـــورات و ئارەزووی ســـیـــروانمە»

***

## مزگەوتی خورماڵ

١٩٤١

چوومـە مـزگـەوتی خـورمـاڵ بەگـریان
ئاخ ڕۆژی ڕەش و وێران و عـــوریان
تەهلیلە بووە بەچەکـــەوکـــەوان[1]
ڕیزی بەســتــووە ئەسـپـێی مـریدان
هەر مـــاڵی خـــوایە ئەبرێ بەتاڵان
ئاسـاری کـۆنی ئیـسـلام ڕووخـاوە
بەجـاڵجـاڵۆکـە، مـینبـەر تەنراوە
ئیـمـامی مـیـحـراب کـولەکـەی ئاوە
پێـخـەفی کـۆنی تیـا هەڵچنراوە
خـەڵک لەبەر بێگار هاتوونە ئامـان
دەوری ئەسـحـابان سێ مزگـەوت کـران
یەکـێک لە (نگل) دووەم لە(کـرمـان)
سێهەم لە (خورماڵ) سەرچاوەی کوردان
هەر سێ ئاسـاری ئەولای هۆمـەران
ئاسـاری فـەخـرە بۆ دەوری ئەوان
سـولتـان سـەلیم گـۆی، شـاهی بردەوە
قـوبـبـە و منارەی تازە کـردەوە

قــەڵایەکی کــرد بەو ســەر گــردەوە
سەربەرزی خســتــە قــەومی کــوردەوە
شــێخ بوو بەواریس بۆ قــەومی ئەوان
کــە شــێــخــان تۆیەی مــورید دائەدەن
ئەڵێن (دەست زەنی)[2] ماڵی کەس مەکەن
بەڵام کــە خــۆیان مــورید ڕووت ئەکــەن
مەکەیان بۆ نییە، سواڵکەری مەککەن[3]
موڵکی خوا و سوڵتان کەوتە دەس ئەوان

(١) چەکەوکەوان: نیازی لە چەکەوکەوانی هەلاجە. وا دیارە لەو کاتەدا کە پیرەمێرد چۆتە مزگەوتی خورماڵ، هەلاجی تیابووە. کە لۆکەی شی کردۆتەوە تیایا م. هـ.

(٢) دەست زەنی: یەعنی دەستدرێژی.

(٣) مەککە: شاری مەککە لە سعودیە. لە کاتی خۆیدا پیش دۆزینەوەی نەوت زۆر هەژار بوون و گەلێکیان سواڵیان کردووە.

***

## چوارین

١٩٤٧

«ئۆخــەی پێکەنین دەمی هەڵپــچــڕیم
لەو خۆشیەی کەوا دانیشتووم ئەگریم
هەروەک ئاوێنەی ڕووت و بێ بەرگم
دەوران لــە ئــەرکــی بــەرگــی دابــڕیم»

***

## بۆ کۆچی مەلا ئەفەندی (هەولێر) (مەلا گچکە)

١٩٤١

ئاینی ئیــســـلام دەری خـــســـتـــووە
دوای مـــردن گـــیـــانی وەلی زیندووە
وەلی ســیـــفــاتی خــودای تێدایە
نــائــبــی نــەبــی و لــەبــەنــد ڕەهــایــە
بە هیــدایەتی خــودا مــەحــفــووزە
نەبی مەعــســوومە، وەلی مەحــفــووزە



ســیــفــەتی پایەی وەلێــتی ســیــانە
عــیلم و ئەدەب و زیکری ســوبحــانە
جگــە لــەوەی ئــەو، بــابــی هــەژار بــوو
چاکــە و بەخــشــندەی هەزار هەزار بوو
نیوە شــیــعری دوایی تەئریخی خشــتە
مــەدرەســەی مــەلای هەولێــر بەهەشــتــە

***

١٩٣٥

«مــژدەبێ حــەرفی تازەمــان بۆ هات
هاکـــا دیوانی مـــەولەوی دەرهات
حــەســەن بەگی جــاف گــەورەیی نواند
تەرجــەمــەی حــاڵی مــەولەوی گــەیاند»

***

## بۆ کۆچی شێخ حسام الدینی تەوێڵە

ڕەشــە هەور ئامــان، تەختی هەورامــان
تەخت بووە لەگــەڵ بەخــتــە هەرامــان
تاریکایی شـــەو ئێـــوارە دەرکـــەوت
لافــاوی دیدەی دینداران ســەرکــەوت
ئەم بوومـــەلەرزە و تۆف و تۆفـــانە[1]
دیار بوو نیـــشـــانەی ئاخـــر زەمـــانە
دوای حـــســـام الدین شـــیـــری دین ســـوا
خــار[2] لە تەوێڵی[3] تەوێڵــە[4] ڕوا
هەیکەلی نووری، شای (ذوالنورین) بوو
هیــوای دوو بەهای بەهای کــەونەین بوو
ڕۆژی کـــۆچی ئەو وا ئەنووسێ (ژین)
پای جنان منزل شـــێخ حـــســـام الدین     =١٣٥٨

(١) لە ساڵی ١٣٥٨ی کۆچیدا لە سلێمانی لافاو و بوومەلەرزەیەک بووە پیرەمێرد ئەڵێ گوایە ئەوە نیشانەی کۆچی دوایی ئەو بووە.

(٢) خار: دڕک
(٣) تەوێڵ: ناوچەوان، هەنیە
(٤) تەوێڵە: هاوینەهەوارێکی خۆشی هەورامانە و مەرکەزی ناوچەی هەورامانە.

***

## بۆ فەیسەڵی کوڕی ئەحمەد ئەفەندی
## کە لە هەولێر کوژراوە

١٩٤٣

هەورێکی سوور، لەکاولی وەتەن، کەوتە گرم و هووڕ
دایڕشت، بەشین و گریەوە، فرمێسکی خوێنی سوور
وامزانی پێشڕەوێکی، گوڵاڵەی بەهارییە
گوڵی نەورۆزە، بەرگی سووری، کوردەوارییە
هەی ڕۆ، تومەز گوڵاڵە نەبوو، خوێنی لاوێ بوو
هەڵکەوتوویەک بوو، بۆ هەموو کورد، نوری چاوێ بوو
لەم کاتەدا کە گوڵ لە هەموو لا دەپشکوێ
کوێر بی فەلەک لە تازە گوڵی ئێمە چیت ئەوێ
چرایە بوو بۆ نیشتمان، خۆی بەو هیوایەوە
ئەیویست ڕووناکی بنوێنێ، ئاخ زوو کوژایەوە
تو خوا کوڕینە سا تێر بگرین، شینی فەیسەڵە
ئەو خوێنەی وا ڕژاوە هیوای کوردی تێکەڵە
کۆمەڵ غەزایە، ماتەمە، شینە لەناو گەلا
تەئریخیە، فەیسەڵە چووە بۆ خزمەتی مەلا[1]

.........................................................

(١) مەبەستی لە مەلا ئەفەندی هەولێرە.

***

## بۆ کچانی سلێمانی

١٩٣٥

هەر لەو ڕۆژەوە کەوا کچانمان[1]
بوون بەئەستێرەی سپهری عیرفان
ڕۆژی هیوای من لەسەر ڕۆژهەڵات
هەڵات و نەگبەت لە چنگی هەڵات
ساحەی کوردستان ئنجا ڕووناکە
لاو پێگەیاندن بەدایکی چاکە
دایکی وەتەنە کە بانگی ئەکەین
هانا بۆ دایکی دڵسۆزمان ئەبەین
ئەمە دوو ساڵە لە مەکتەبی کچان
کردەوەی جوان جوان دێننە مەیدان
وەک پەری جلوەی نمایش ئەکەن
عالەم مەجبووری ستایش ئەکەن
بەنەقش و نیگار هونەر دەنوێنن
بەسنعەت ئەهلی هونەر دەنوێنن
ئێستا تەدبیری مەنزلیان زیاد کرد
بەخواردەمەنی منیان بەیاد کرد
دیارە دوای هیوای سەربەرزی ئەوان
تەنها خواردنە غایەم لە ژیان
سینیەکم بۆ هات شیرینی شیرین
نموونەی پەنجەی ڕەنگین و شیرین
وانیلیای عەتری عەرەقی ڕوخسار
بۆنی لوانتەی زوڵفی زێڕین تار
چۆن پوختە نابێ مەغزی ئەو لوتفە
کە مەمک ئەمژێ لە سای ئەو زولفە
بە یادی غەمزەی چاوی کاڵەوە
منیش کەوتمە، ناو خەیاڵەوە
(دوگۆچورباسی) ناوی چەن خۆشە
ئێستاش بۆ دڵم بەجۆشە
عیلم و سنعەت و خووی ئەم کچانە
ڕەهبەری بەختی نەوجەوانانە
ئەو نەتەوەیەی لەوان پاشکەوێ
دیارە میللەتی پێ پێش ئەکەوێ

نازی شـــاگـــردی بەفــــەن ئامـــادە
دیارە ئەســـەری ســـەعی ئوســـتـــادە
ئێـمـــەیش سـوپاسی هەمـــوویان ئەکـــەین
یەک بن و مــــوویان نەکـــەوێتــــە بەین

١٩٣٥

«خوا لەم بەهارەدا گوڵی جوانی گەشاندەوە[٢]
عەشقی جوانی خۆی لە دڵی من خشاندەوە
پۆلی کچان لەگەڵ گوڵی دەشت کەوتنە لەنجەوە
شەوق کەوتە گەنجەوە، دڵی پیر کەوتە ڕەنجەوە
دوێنێ کچانی مەکتەبی (زەهرا) وەکو زهوور
یاریان دەکرد و جنسی لەتیف پڕ بوو حەوش و ژوور
حەفلەی ژنان بوو فاتمەی عالیەی مودیرەیان
ڕازاندبوونیەوە وەک ئەستێرەکەی بەیان
خۆشی بەو نووری عیسمەت و فەزڵ و ویقارەوە
خۆش ئامادەیی دەکرد بەتەوازوع لە خوارەوە
بیست جۆر هونەر تەواوبوو، ستایش تەواو نەبوو
من هەر هیوام بەوانەیە بۆمان بکەونە ڕوو

١٩٤٩

چەند خۆشە ئینسان خەڵکی شاری بێ[٣]
هەرچی ببینێ، خوێندەواری بێ
خوێندن و هونەر ئەمەندە باو بێ
هەرچی بیدوێنی، فەزڵی تەواو بێ
کاتێ کە میللەت قەدر بزانێ
منداڵ هەوڵ ئەدا هەتا ئەتوانێ
کە منداڵێکمان، گەییە جائزە
بڵێی سەبەبی، سەعیە، جائزە
یەکێ خەڵاتی هونەر ئەپۆشێ
زۆر کەس ئەیەوێ وەک ئەو تێکۆشێ



قەومێک پێشەوای باشی پێشکەوێ
لە دوایش بێ دوایی، هەر پێش ئەکەوێ
عیلم عەلەمە بۆ سوپای شەوکەوت
ئێمەیش ئەمجارە هونەرمان دەرکەوت
ئۆخەی چەن خۆشە لەم شوێنە بەرزە
کۆمەڵ ببەستین زۆر جار بەم تەرزە
دڵمان بەفەیزی مەعارف شاد کەین
ئەمجا مدیری مەعارف یاد کەین

(١) ئەم شیعرە لای م. هـ بڵاو نەکراوەتەوە

(٢) ئەم شیعرە لای م. هـ بڵاو نەکراوەتەوە.

(٣) ئەم شیعرە لە ئاهەنگی قوتابییاندا خوێندراوەتەوە. هەروەها لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## بۆ خزمەتگوزارێک

١٩٤٩

چەند خۆشە یەکێ لەلای گەورەی خۆی[١]
بەزبانی خۆی، بدوێ، بلوێ، بۆی
ئەم ڕازی دڵی، باش ئەدا ئەکا
ئەویش پێی خۆشە کەوا تێی ئەگا
ئەم زاتەی ئەمڕۆ لامان میوانە
نەک میوان، خاوەند، هەم نیگەهبانە
دانگێکی ماوە، کە هەموو عیراق
بڵێن شەخسێکە، هەڵبژاردەی تاق
عومرێکە نەزمی ولاتمان ئەدا
وا هەڵناکەوێ یەکێ لەسەدا
گەلێ لەعەدلا عومری بردە سەر
سەر ڕێی عەدلی خا، عەدلی دوو عومەر
ئەم قەومی کوردەیش، کە قەدرزانن
بڕوانن بەدڵ، چۆن تێی ئەڕوانن



دڵخۆشییەکە، لە هەردوو لایە
بۆ هەردوو لایە، لوتفی مەولایە
کەواتە مەولا، لە مەولا یار بێ
لە ئەولادیشیا، جەوهەری دیار بێ

---

(١) ئەم شیعرە لەلای م. هـ بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## بۆ علاءالدین سجادی

«ئۆف علاءالدین ڕۆڵەی باوانم
ئاگرت بەردایە ژین و ژیانم»

***

## بۆ خزمەتگوزارێک(١)

١٩٣٩

قدومی ئێوە پێشڕەوی عیدە
قەدرتان، بەقەد، قەدر، سەعیدە
حوسنی نیەت و حوسنی ئەخلاقتان
ئێمە ئەخاتە سەرووی وڵاتان
هەرچی هەواڵی، دنیا تێئەگا
ئەڵێ بەخوێندن، قەومێ پێئەگا
بەڵێ ئینکاری خوێندن ناکرێ
بۆ هەموو شتێ، خوێندن کەڵک ئەگرێ
بەڵام زینەتی خوێندن ئەخلاقە
خوێندن بۆ بەدخوو مایەی شقاقە
شەیتان ئەو هەموو عیلمەی ئەزانی
چونکە بەدخوو بوو دوایی نەهانی
سەرچاوەی ئەخلاق دین و ئاینە
عالەم لە پیاوی دیندار ئەمینە



دینەکەی ئێمە هەڵبژێرراوە
کردەوەی چاکمان بۆ دانراوە
خزمەتی وەتەن بەدین ئەزانی
(حب الوطن من الأیمان)
تەربیەی ئەولاد لەسەر ڕێی ئیسلام
خزمەتی قەومە بۆ خاس و بۆ عام
ئەم قەومە بۆ تۆ دەست بەدوعایە
کە دەست لە دەست بێ قووەت لە خوایە

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێرد م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## دەمی بەیانیان(١)

چەند خۆشە هەستانی دەمی بەیانیان
بۆ گیانی ڕوون نوور دەباری لە ئاسمان
لەجێ هەستام، جریوەی چۆلەکە هات
چاوم شت و جلم گۆڕی ڕۆژهەڵات
چام خواردەوە و جانتام گرت بەدەستەوە
هاتمە مەکتەب، چومە سنفی دەرسەوە
چابوو شوکور بەدەرسما گەیشتم
دیتە زوو هەستابووم، چاک تێگەیشتم
ڕووم کردە خوا بەدڵ لێی پاڕامەوە
ئنجا لێی دانیشتم بەئارامەوە
بیری ئەمەم کردەوە، ئاخۆ دەژین
بەم خوێندنە کەڵکی نیشتمان بگرین
بەڵێ بۆیە ئارەزووی خوێندن ئەکەم
هەر خوێندنە ئاوا ئەکا وڵاتەکەم
ڕۆژ لە ڕۆژهەڵات، هەڵات بەم خوێندنە
خوێندن بۆ دوایی ڕۆژ وەک تۆو چەندنە

تۆو دەچێنم میللەت بیدروێتەوە
بەم کۆششە پەرە ئەگرێ نەتەوە
وڵاتم ئاوا بێ، منیش کە مردم
ڕۆحم نیگەهبانیە، کچە کوردم

........................................

(١) ئەم شیعرە لە لاپەرە٣٤٦ی دیوانی پیرەمێردی نەمری م. هـ دا لەو دە بەیتە تەنها پێنج بەیتی بڵاو کراوەتەوە، ئێمە لێرەدا تەواوی شیعرەکەمان بڵاو کردەوە. هەروەها قافیەی بەیتی یەکەمی شیعرەکە بەهەڵە نووسرابوو. بەیانی، ئاسمانی!.

***

## ئەی کچینە(١)

ئەی کچینە، وەرنە مەکتەب
ئێوە تەسکینی دڵن
زینەتی باغ و تەرەقین
ڕەونەقی دەستەی گوڵن
تازە ئێمە تێگەیشتووین
دایکی چاکی خوێندەوار
نەسلی وا دێنێتە مەیدان
قەومەکەی پێ بێتە کار
ژن شەریکی ژینی پیاوە
نەک خەریکی بەرد و دار
تەربیەی مێشکی منداڵی
بۆ وەتەن بێ و جان نثار

........................................

(١) پیرەمێرد سێ جار ئەم شیعرەی بڵاو کردۆتەوە. ئەمەی لەسەرەوە نووسیمان لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو کراوەتەوە ل٢٧، وە ئەو دوو پارچەیەی کە دەینووسین لە دوای ئەمەوە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***



## ئەی کچینە

١٩٣٩

ئەی کچینە وەرنە مەکتەب
ئێوە تەسکینی دڵن
زینەتی دیباجەی ئەدەب
تازە گوڵخونچەی گوڵن
ئێمە، تازە تێگەیشتووین
دایکی چاکی خوێندەوار
نەوەی وای بۆ بەجێ هێشتووین
میللەتی پێ بێتە کار
بۆیە ژن پێش ماڵ خراوە
ژن نەبێ ماڵیش نییە
نەخوێندەوار بێ، داماوە
نازانێ ڕێگە چییە!؟
ژن هاوبەشی ژینی پیاوە
نەک خەریکی پۆتەڵاک
خوا تەربیەی بەژن داوە
بە دایکە نەتەوەی چاک

***

## گۆرانیەکی مەکتەبی کچان

١٩٤٤

ئێمە تازە تێگەیشتووین
کە دایکێکی خوێندەوار
نەتەوەی وا دێنێتە کار
میللەتێک ئەکا ڕسگار
بۆیە ژن پێش ماڵ خراوە
ژن نەبێ ماڵیش نییە
بەڵام کە نەخوێندەوار بێ
ڕێگا نازانێ چییە

ژن هاوبەشی ژینی پیاوە
نەک خەریکی پۆتەڵاک
بەخێوکردن بەو دراوە
بە دایکە نەتەوەی چاک
پێغەمبەر خۆی وای فەرمووە
بەهەشت ژێر پێی دایکانە
بەڵام بۆ ئەوانە بووە
عیلم و فەنیان ڕەوانە

***

## سێبەر

خۆزگە من ببمە درەختێک
بۆ قوتابخانەی کچان
ئەو کچانەی وا دەخوێنن
ببمە سێبەر بۆ ئەوان
هەر کچانی خوێندەوارە
میللەتی پێ سەرکەوێ
تەربیەی منداڵ هیوایە
پێشڕەویمان بەرکەوێ
ڕۆژهەڵاتیش ڕۆژی هەڵدێ
خوێندنی کچ هاتە ناو
جەهلە تاریکە شەوی کورد
خوێندنیش تیشکی هەتاو
دەرزی چاڵ هەڵناکەنێ
فەن وەتەن ئاوا ئەکا
خوشکە، گیانی دایکی مشفق
نەسلی چاک پەیدا ئەکا

***



## تازە گوڵی چیمەنین

تازە گوڵی چیمەنین
بەرخە کۆرپەی وەتەنین
ئێمە کە دەستەی کچین
هەموو بۆ مەکتەب ئەچین
پێغەمبەر خۆی فەرموویە
بەهەشت ژێر پێی دایکانە
بەڵام دایک ئەوانەن
عیلم و فەنیان ڕەوانە
هەتا سەویەی کچانمان
بەرز نەبێت لە ئیدراکا
منالی چاک پێ ناگا
وەتەن تەرەقی ناکا
ئێمە حەز لە شەڕ ناکەین
بە هیوای خوێندن و چاکەین
نەتەوەی باش پەیدا کەین
وێرانەمان ئاوا کەین

***

## بەستەی کوردی

١٩٣٦

نیشتمانمان کە دایکی دڵسۆزە
خۆی ڕێکخست بەمرواری و پیرۆزە
نەوبەهار هات و جەژنی نەورۆزە
سەیری سەحرا کە، ڕۆژی بەهرۆزە
خوایە ئاوابێ ئەم گەل و هۆزە
تێگەیشتووین بەسۆزی زانستی
پێگەیشتووین بەشۆڕی سەربەستی
شەرتە هەرچی کە دایکمان ویستی

دەستەبەر بین و تیا نەکەین سستی
تا بەخوێندن ئەگەینە سەربەستی
نەوجوانانی کوردی پڕ جەوهەر
دەوری دەوران بووە بەدەوری هونەر
ئەوروپا ڕێی فنوونی گرتە بەر
ئێوە کارێ بگرن بیبەنە سەر
حەیفە ناوتان نەنێن وەتەنپەروەر

***

## گۆرانی

وا بوو بەشەڕ و هەڵڵا
جیهان خرۆشا
لاوانمان لە جێ هەڵسان
خوێنیان جۆشا
ئاه بۆ باسی وەتەن
دوانزە سوارەی مەریوان
زرێیان پۆشا
وا ڕوویان کردە مەیدان
قەڵغان لە دۆشا
ئاه بۆ دەفعی دوژمن
ئێمە ئەبێ پێشڕەو بین
بۆ فیداکاری
بەقاسپە قاسپ وەک کەو بین
کەوی بەهاری
ئاه بۆ بەرزی میللەت
پێشکەوین و نەترسین
وەک باوک و باپیر
لە ماڵ و گیان نەپرسین
خودامان دەستگیر



ئاه بگەینە سەعادەت
دەست بدەینە دەستی یەک
بۆ هەموو کارێ
یەک دڵ و یەک زبان بین
لە هەموو شارێ
ئاه پێی ئەبین بەپیاو
ڕوحمان بکەین بەپەرژین
بۆ خاکی پاکمان
لە دڵی میللەتدا بژین
بە ناوی چاکمان
ئاه ئنجا دێینە ناو

***

١٩٣٥

چەند خۆشە دوو بولبولی خۆش ئاواز
گاهی سەحەری کە دەبنە دەمساز
جۆشێ دەخەنە گوڵ و گوڵستان
شۆڕێ ئەدەنە دڵی جوانان

***

١٩٣٣

ئەگەر ئەتەوێ نەیەن بەگژتا
ئامادەی شەڕ بە لە هەموو وەختا
لە شێنەییشدا چەک بنوێنە
چاوی دوژمنی پێ بترسێنە

***

## گۆرانی سپورت

ئەی برادەران با بچینە یاری
نەوجوانیمان لێ بدا دیاری

وا لە مەیدانا ئێمە دەرکەوتین
بیکەینە گاڵە، ئەوا سەرکەوتین
ئەی برادەران با بچینە یاری
نەوجوانیمان لێ بدا دیاری
هەرایە کورگەل نەوجوانینە
گرەو بەرنەوە پاڵەوانینە
ئەی برادەران با بچینە یاری
نەوجوانیمان لێ بدا دیاری
بەیداغمان هەڵگرت ئێمە پێشکەوتین
مژدەبێ یاران دیسان سەرکەوتین
ئەی برادەران با بچینە یاری
نەوجوانیمان لێ بدا دیاری
بەیداغ هەڵگرن ئێوە بەدەستە
شاخ و کێو لەژێر پێتانا پەستە

***

## گۆرانی بەهار

کە دەڵێن ئەمڕۆ دەشت و کێو شینە[(١)]
چەندە مەڵبەندی ئێمە شیرینە
بچۆ سەرگردی یارە بیبینە
لە جیهاندا گوڵێکی ڕەنگینە
چونکە وایە، خوایە ئاوابێ
ئەو دەمەی ڕۆژ دەگاتە ئێوارە
روو بکەرە شاخی گوێژە بنوارە
عەرشی پەروەردگاری لێ دیارە
دامەنی وەک بەهەشتی ئابدارە
خۆشە بۆ هەڵبژاردە ئاوابێ
زەمزەمەی بولبولی بەهارانی
وردە بارانی ژێر دەوارانی
لەشەوی بەزمی سەرچنارانی



وشکە سۆفی ئەخاتە گۆرانی
جێی سلێمانە بڵێ ئاوابێ

---

(١) ئەم شیعرە لەلایەن خوا لێ خۆشبوو (مەلا کەریم)ەوە لەسەر قەوان تۆمار کراوە. هەروەها لەو کاتەشدا کە پیرەمێرد لە تورکیا بووە لەلایەن کچێکی دەنگخۆشەوە بەتورکی لەسەر قەوان وتراوە.

***

## گۆرانی نەسرین

نەسرین گوڵی نەسرینە
چووزەرەی یاسەمینە
خنجیلە و خوێن شیرینە
دەمی بەپێکەنینە
کەیفی لە هەڵپەرینە
شنە شنی بەبینە
نەسرین گوڵی بەهارە
لێو ئاڵە چاو بەخومارە
لەناو کچانا دیارە
خوازبێنیکەر هەزارە
لووتی لە هەموان خوارە
کەسی ناوێ لەم شارە
نەسرین گوڵی هاوینە
فریشتەی سەر زەمینە
پەریزادەی ماچینە
گوڵ ئەستێرەی نوورینە
نەتەوەی خاتوو زینە
پاوانەی پێی زیوینە
نەسرین گوڵی پایزە
بۆنخۆشە وەک گەزیزە
کچە کوردە ئازیزە
تورک و عەجەم بەڕیزە

لەبەر دەستیا کەنیزە
بۆیە بەدەعیە و فیزە
نەسرین گوڵی زستانە
شەو چرای کوردستانە
چاوی پیاڵەی مەستانە
چلوورەی گوێسەوانە
بەو چاوە بەستوویانە
نەسرین وادەی هەڵسانە
نەسرین ساڵمان تەواو کرد
سەیری دەشت و سارات کرد
جلی سەوزیان لەبەر کرد
بەحساب وا تۆش پێت گرت
شیعری خۆتت لەبەر کرد
بێخوێنەرەوە ورد ورد

***

## گۆرانی جەژن و بەهار

جەژن و بەهار گوڵ و گوڵزار
زۆر بەنەشئەدار
بولبول لەسەر چڵ دەخوێنێ
دنیا زیندەگی ئەنوێنێ
جەژنمان هەر بمێنێ
بەهیوای جەژنەوە، دڵ کرایەوە
بەدەن و گیان لە نوێ ئاو درایەوە
دیارە خۆشی جەژنمان زۆرتربێ
چاکترە، دڵ دەیەوێ خۆشتربێ
جەژن ئەکەین، جەژن ئەکەین
جەژن ئەکەین جەژنی وەتەن
جەژن و بەهار گوڵ و گوڵزار
زۆر بەنەشئەدار



ئێمە هەوڵی ئەوەمانە بەهەموو
یەک کەوین سەرکەوین
شاد بین زوو بەزوو
جەژنی ڕاستی ئەوەیە پێکەوە بین
لە وڵاتا بەسەر ئازادی بژین
جەژنەکەین جەژنەکەین
جەژنەکەین جەژنی وەتەن

***

## دڵ گەشایەوە

دڵ گەشایەوە بە بەهەشتی گوڵ
گەشتی ناو گوڵان بوو بەسەفای دڵ
بۆنی گوڵ ڕۆحی تازە کردەوە
دڵخۆشی، تاڵی لەبیر بردەوە
با بچینە ناو گوڵ بەگۆرانیەوە
بە زەمرەمەوە و شادمانیەوە
خوایە چەن خۆشە جیهان
لەناو گوڵانا ژیان
خۆزگە گوڵ تا سەر ئەما
یا دیسان نوێ ئەبوەوە
خۆش نەواو ئازادە سەر
بێ خەفەت بیبەینەسەر

***

## گلەیی لەکەس ناکەم

گلەیی لە کەس ناکەم
بۆ بەختی خۆم ئەگریم
دڵی خۆم بۆ تۆ هانی
زاڵم قەدرت نەزانی
دائم دڵم ئەشکێنی
ڕۆژێک ئەبێ نامبینی

چاوکاڵ لە تۆ تۆراوم
دڵم تەنگە و گریاوم
بەئاهم گرفتار بی
لای عەشقم شەرمەزار بی
هێندەت لێ پاڕامەوە
رووت نەکرد بەلامەوە
شەرت بێ رۆژێکم مابێ
نەیەڵم دڵمت لابێ
دێی دەگەڕێیت لە شوێنم
ئەو سایە من ناتبینم

***

## بەندی شەماڵ

شەوێک لەیلام کەوتە خەیاڵ
کەوتە یادم ئەو زوڵف و خاڵ
هاوارم بردە بەر شەماڵ
شەماڵ بۆم بکە ئەم فرمانە
شەماڵ ئەمشەو بێ قەرارم
موبتەلای چاوی بەخومارم
وەرە بچۆرە لای یارم
هاوار حاڵم پەرێشانە
شەماڵ داماو و زەلیلم
هانام بەتۆیە دەخیلم
وەرە ببە بەدەلیلم
بۆم بچۆرە خزمەت جانانە
شەماڵ تۆیی و شاهی مەردان
تۆ و سەر ڕاستی وەفای کوردان
تەی کە شاخ و کێو و هەردان
فریام کەوە بەم زوانە
شەماڵ وتی، بەچاوانم
درێغ ناکەم تا دەتوانم



بۆت دەچم بەدڵ و گیانم
ئەم خزمەتەم لا ئاسانە
نامەم نووسی بەخوێنی دڵ
بۆ یاری ڕوومەت پەڕەی گوڵ
خوێندم وەک بولبول لەسەر چڵ
بەنەغمەی شۆری مەستانە
شەماڵ نامەی پێچایەوە
تەکێکم دا بەلایەوە
زامی جەرگم کولایەوە
دڵی سووتا بەم گریانە
بە پاڕانەوە و دەخیلی
کەوتە ڕۆین بە تەعجیلی
وەری گرت نامەی زەلیلی
فێری سەفەری شەوانە
شەماڵ بەرابەری لەیلا
شنەشن لە نیوە شەوا
گەیشتبووە خزمەت لەیلا
لەیل نووستبوو ئەو وەختانە
کەنیز و خادم بوون لەوێ
ئەوان ئێشکچی بوون شەوێ
پرسیبوویان تۆ چیت ئەوێ
چۆن گەیشتیتە ئەم مەکانە
وتبووی من هاتووم لە کۆیە
نامەی مەجنوونێکم پێیە
بۆ یارێکی سەمەن بۆیە
ناوی شەهەنشای خووبانە
وتبوویان لەیل نووستووە
زوڵفی پەرێشان کردووە
مار دەوری گەنجی گرتووە

ڕێی کەس نادا لەو زوڵفانە
کاتێک لەیل لەخەو هەستابوو
لەو ورتە ورتە ترسابوو
لە کەنیزەکی پرسابوو
کێیە لەم دەور و دوکانە
وتیان قوربان شەماڵە هات
بە نامەوە هاتۆتە لات
عەرزەی مەجنونی دوور وڵات
هەر جانفیداکەی خۆتانە
نامەکەی لە شەماڵ وەرگرت
داوای قەڵەم و دوێتی کرد
جوابی نووسیەوە دەستوبرد
بەو دەستە و بەو پەنجە جوانە
نووسیبووی یاری وەفادار
وەک بولبولێکی ناڵەکار
عەشقی خۆت کردبوو ئیزهار
خۆش بوو ئەم ئاهو فوغانە
ڕاوەستە تاکو بەهار دێ
ناڵەی بولبول لە گوڵزار دێ
وادەی دیدەنی دڵدار دێ
وەرە بۆنکە ئەم سێوانە
شەماڵ تایەک لەم زوڵفانە
کە زنجیرە بۆ دێوانە
ئەیدەم بەتۆ بەنیشانە
بۆی بەرە شفای زامانە
شەوێک لەوێ نیشتبووە باڵ
بەهێزی عەتری زوڵف و خاڵ
بەتیری نیگای چاوی کاڵ
کەوتبووە ئەم ئاسمانە



مژدە بێ شەماڵ هاتەوە
بەنامە و بەخەڵاتەوە
زامی دڵ چاک ئەکاتەوە
هەی هەی لەم ئاگر بارانە
شەرت بێ تا من زیندووم شەماڵ
ئەمەم دەرنەچێت لە خەیاڵ
تۆ منت هێنایەوە حاڵ
وەفا هەر وەفای کوردانە

دەربارەی ئەم بەندە مامۆستا محەممەد ڕەسول هاوار لە لاپەڕە ٣٤٨ی دیوانی پیرەمێردی نەمردا دەنووسێت «لە زەمانی کۆندا، بگرە تا دەورووبەری زەمانی منالّی ئێمەش باو بوو کە گۆرانیبێژە دەنگخۆشەکان تاقم تاقم بەناو کۆڵانەکاندا بەشەو گۆرانیان ئەوت و ئەگەڕان، لەناو ئاهەنگ و کۆڕ و سەیراندا بەزمیان ئەگێڕا و ئەیانکرد بەبەزم و هەرا. پیرەمێردیش بەیادی گەنجی خۆیەوە لەو گەڕەکەی خۆیان کە گەڕەکی پوورەبەگی بووە، یاخود لە کاتی کاروان و ڕێبواریدا یاخود لەناو ڕەز و باخەکانی شارباژێڕدا لە کاتی ترێ ڕنیندا لە (دەمی مشتاغانا) کە خەریکی دۆشاو کردن و خۆڵاو کردنی مێوژ بوون، گوێی لە گۆرانی خۆشی گۆرانیبێژەکان بووە. بەیادی ئەو ڕۆژانەوە ئەم بەندەی (شەماڵە)ی وتووە کە بێ گومان ئەبێ لە کاتی خۆیدا بەنقامێکی تایبەتی وترابێ».

***

١٩٣٧

ڕەشیدی ڕەشید دیاریت دیارە
ژوور باپیری خۆت کەوی لەم شارە

***

١٩٣٦

مادەی تووتن بوو بەدیدە لێلاو
لە جاری جاران توندتر هاتە ناو

***

## بەندێکی مێژوویی

لەبارەی ئەم بەندە مێژووییەوە مامۆستا هاوار لە لاپەڕە ٣٤٣ی کتێبەکەیدا دەنووسێت: «پیرەمێرد لە دەستخەتێکدا ئەم سرووده‌ی خوارەوەی نووسیوە، بەر لەو سرووده ئەم چەند دێڕەشی

نووسیوە:

ئەڵێن لەساڵی ١٨٧٨ دا (موشیر عوسمان پادشا)ی تورک بەلەشکر و سوپایەکی زۆرەوە چووە بۆ سەر بەدرخان پاشای میری جزیر و بۆتان. لەشکری تورکەکان لە مەڵبەندی بەدرخان پاشادا خێوەت و بارەگای خۆیان هەڵدابوو و خۆیان ئامادە کردبوو کە سبەینێ کاتی شەبەیخوون بدەن بەسەر لەشکری بەدرخانیدا. یەکێک لە پیاوماقووڵ و زەبربەدەستەکانی بەدرخان پاشا کە ناوی (حەسەن هەویر) بووە شەو بەدزوییەوە جلی عەسکەری تورکی لەبەر کردووە و بەناو لەشکر و بارەگای عوسمانلییەکاندا تێ ئەپەڕێت. کاتێک کە موشیر عوسمان لە خەوا ئەبێ حەسەن هەویر ئەچێتە ناو خێوەتەکەیەوە و بەبێ دەنگی و لەسەرخۆ جلە سورمەییەکانی پاشا لەگەڵ هەموو نیشان و مەدالیاکانی هەڵئەگرێ و ئەیپێچێتەوە و خەنجەرە خۆراسانیەکەی لەسەر مێزەکەی دائەنێ و نامەیەک بۆ مشیر عوسمان ئەنووسێت کە بریتی بووە لەم چەند دێڕەی خوارەوە: «من حەسەن هەویرم، هاتمە سەرت بۆ کوشتنت بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە خەوا بووی وازم لە کوشتنت هێنا، چونکە پیاو ئەگەر دوژمنی خۆی لەخەوا بکوژێ زۆر نامەردە». بەم جۆرە حەسەن هەویر لە خەیمە و بارەگای موشیر عوسمان ئەچێتە دەرەوە و سواری ئەسپەکەی ئەبێ و دێتەوە لای بەدرخان پاشا. جلە سوورمەیی و کەلوپەل و مەدالیاکانی موشیر عوسمانی پێشکەش کردووە بەبەدرخان پاشا. بۆ ڕۆژی دوایی لەشکری بەدرخانییەکان ئەدەن بەسەر لەشکری عوسمانلییەکانا و تاروماریان ئەکەن. لە زەمانی کۆنا، کە کوردەواری بچوونایە بۆ شەڕ هەر تاقمە جۆرە گۆرانییەکی تایبەتی خۆی ئەوت. لە کاتی ئەو شەڕەشدا لەشکری بەدرخانییەکان چەند تاقمێک بوون. هەر تاقمەی بەناوی سەرکردەیەکەوە جۆرە گۆرانی و سروودێکی وتووە، کە چەند دێڕێکی هی تاقمی حەسەن هەویر بووە و ئەوانی تری هەر چەند دێڕێکی هی تاقمێکی تر بووە.

**دەستەی خەڵەف:**

من خەڵەفم، نەوەی کورد
کاتێک هاتم دەستوبرد
ئەبینی لەشکرم لەناو برد
عوسمان پاشا لە ترسا مرد
فەرمانی میری بۆتانە

**دەستەی میری شرناخ:**

جزیرێ خۆش جزیرێ
لێی دێ دەنگی نەفیرێ



زابت بەستن بەزنجیرێ
بگرین شازیان بەئەسیرێ
فەرمانی میری بۆتانە

**دەستەی ئاغای دیرگوڵ:**

ئەو شەڕ لە ملی خانە
خان ئەمری دایە کوردانە
هێز بەرنە ژ سەر تۆپخانە
بەخوێن سووربێ ئەم مەیدانە
فەرمانی میری بۆتانە
دیر گوڵە خۆش دیر گوڵە
بەدرخان بەگ سوور گوڵە
لە عوسمان پاشا بەکوڵە
جێی عوسمان پاشا ژێر گڵە
فەرمانی میری بۆتانە

**دەستەی حەسەن هەویر:**

بژی حەسەن هەویرێ
پەلاماردان وەک شێرێ
عەسکەر لە چیان هەڵدێرێ
ئوردوو شکا سەرەوژێرێ
فەرمانی میری بۆتانە

***

## بۆ شێخ قادری گۆپتەپەیی

١٩٣٥

ئەمڕۆ تاریکە بڵێین ماتەمە
قوبەی نیلگون پڕ تەم و خەمە
شێخ عبدالقادر کە یەکە پیاو بوو
بە هەموو ڕەنگێ پیاوی تەواو بوو
بۆ ڕۆژی نەبەرد گوللە نەبڕ بوو
گەیبووە حەفتا هێشتاکو کوڕ بوو

بەپەنجەیەکی ئەجەل تێک شکا
بێ دەست وەک منداڵ لەناو بێشکا
جەخاری مەرگی ڕۆڵەی نەواندی
قرچەی ئاگری جەرگی سووتاندی
هیچ کارێ ناکا، خەم و ڕوو گرژی
لەم دنیایەدا کێ تا سەر ئەژی

## بۆ عزەت ئەفەندی

١٩٣٥

چەند بەچاوشارکێ بەردەل بەردی دی
پیاو نەمرێ ئاخری هیوای دێتە دی
هاتەوە نەختێ بحەسێتەوە
زۆر بەخزمەتە بەخێربێتەوە

***

## پیرۆزبایی فرزەندی تازەی مەلیک

١٩٣٥

چاوڕوونی بۆ تۆ ئەی شاهی غازی
بە پێی پیرۆزی نەوەت بنازی
جێی باوکت بەتۆ ئەدرەوشێتەوە
«انشاالله» جێی تۆیش پڕ دەبێتەوە

١٩٣٧

«لە ئەستەموڵدا نووری باقییە
حەیف کە لای ئێمە جێگای خاڵییە»

١٩٣٦

کە بەخت و تالع هاتنە ئیمداد
بە ئەسپێ ونی دەبی بەداماد
دەوری داماوی لە برەودایە
ئەسپێ ونەکان کاریان ڕەوایە
لە قەدیمەوە، باوە ئەمانە
نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لە خوانە



## بۆ شێخ عومەری خانەقا

١٩٣٦

واوەیلا کەوتەوە ناو کورد
کە شێخ عومەر وەفاتی کرد
(ضیاع)ی دین و دنیایە
کەساسیی عیلم و تەقوایە
خانەقای مەولانای چۆڵ کرد
تەشریفی بۆ لای مەولای برد

***

## بەبۆنەی دەرچوونەوەی ڕۆژنامەی ژین

دڵخۆشی خۆم و پیرۆزانەی ژین[1]
خوا حەزکا ئیتر بەم جۆرە ئەژین
بریی گوناهت کەوت، کەوتییە ژیان
دڵ لە سفت و سۆیت بووبوو بەبریان
جگەر لەت لەت و چاو پڕ لە گریان
هەور داپۆشیبوو، ئەستێرەی بەیان
لە خوا بەزیاد بێ، کە ڕزگارت بوو
نەخۆشی ناکاو کە دووچارت بوو
سەرلەنوێ یەزدان تۆی ژیاندەوە
تەبیبی چاکی بۆت گەیاندەوە
هاوڕێی ژیانیش زۆر شکایەوە
بەڵام گۆی هونەر هەر برایەوە
گەر بیبێ مەردم حەوسەڵە و ئارام
تەنگانەی نابێ هەر ئەگا بەکام
جیاوازی نییە ژیان لەگەڵ ژین
وان اللە مع الصابرین

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## ناوێرین بڵێین

١٩٣٩

ناوێرین بڵێین، پەندی پێشینان[1]
لە ترسا ئەڵێین، چیرۆکەی ژنان
خاتوو زەمهەریر شینی چلەی کرد
ئەویش لەپاش ئەو، زوو تەشریفی برد
ئنجا کەوتینە، بورجی پیرێژن
مەکری پیرێژن ڕێوی کردە کون
بەفر و هەڵەکۆک، بەبای نهێنی
لەلای چەرخی پیر کەوتنە خوازبێنی
کەچی بەفرەکە زوو توایەوە
شایی ئەو جووتەیش هەر وا مایەوە
هەر چەند لە تاسەی دووری نەورۆزا
بە گڕی بێ گڕ دڵ هەڵپرووزا
بەڵام قەیناکا، خۆ هەر بارانە
نیسان سەیرانی گردی یارانە
(بواسان داوریل) ئەوا هاتەوە
خومی جوولەکەیش شێواوەتەوە
هەردووکیان ئێستا برەویان کەمە
وەک نەورۆزێکە، کەوتبێتە شەممە
پێش نیسان هێندە، درۆ کراوە
هەمانە تری وای تیا نەماوە
سێ شەش دوو لاقی قورسی شکاوە
شەشەکەی تری، بۆ خۆشی ماوە
کنگری دەشت و شاخ پێگەییوە
دنیا بۆ ئێمە ماستی مەییوە
دۆ هات برەوی ماستاو نەماوە
تەشی ڕستنیش، وەک ڕیسی خاوە
(بسم الله) مان کرد، بەدڵێکی ساف
جنۆکە هەموو، ڕوویان کردە قاف



هێشتا نەمردووم ئەیاننامە گۆڕ
پێم ئەڵێن، مردووی، بەشی زیندوو خۆر
تێنەگەیشتم، بەکێیان زانیم
ڕەنگە وا بزانن، کە کوڵە نانیم

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## دەستکردی کچان[1]

١٩٣٩

-بۆ مەعرەزی کچان-

دەستکردی جوانی، کوڕ و کچانمان
کارخانەی چینە، بۆ نیشتمانمان
گوڵزاری بەهار، پەست بوو لە تاوان
سەری خۆی هەڵگرت ڕووی کردە کێوان
گوڵی بەهاریی کەم عومرە ئەڕوا
(مەعرەز) تەرەقی قەومی وا لە دوا
شیعرەکەی (هۆگۆ) بۆ کۆرپەی نووستوو
بە دەستکردێکی، کچان کەوتە ڕوو
بە زەهرە و زوهرا و کەوکەبەی پەروین
ئەستێرەی ئاسمان هاتنە سەر زەمین
بەسنعەتی بەرز مەکتەبی گوێژە
گوڵزاری گوێژەی، خستە ژێر پەیژە
نموونەیە بۆ تەربیەی فرزەند
وەتەن بەمانە ئەبێ سەر بڵند

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## باوک و فرزەندی

١٩٤٧

دار و فەلاقەی باوکم لا خۆشە
بەلام غەرەزکار، بۆچ لێم بەجۆشە ؟
بۆ سەرداری خەڵک من ئەچمە سەر دار
کورسی، یەت، بۆ من، سەرەک بۆ سەرکار
باوک ئەولادی، بێ عاری دەبێ
بێزاری نابێ، ئازاری دەبێ
ئەولاد زینەتی، ژینی باوکە
بۆ ڕێی تەنگانە وەک چراوگە
بە فیتنەی بەدکار لێک نابنەوە
با دەریشی کا ، ئاشت ئەبنەوە

***

## بۆ عەلی کەمال ئەوڕەحمان

١٩٤٧

عەلی کەمال ئەوڕەحمان
ئەتسپێرین بەقورئان
یاری فەقێر و هەژار
تۆ بۆمان کەوتوویتە کار
دەسکە گوڵی کوردانی
بۆیە بۆنخۆش و جوانی
بۆچی نەبووی بەمەبعووس
کەوا ئێمەت کرد مەئیووس

***

## بەکرێ گیراو

١٩٤٧

سێ مەبعووس جارێک حەسەب حاڵیان بوو
لەسەر خیتابەت دەمەقاڵیان بوو



(دەم هەراش) وتی بۆچ وەک من جارێ
نایەیتە تەڵەب بۆ ئیش و کارێ
بێ دەم و پلیش بەجوابێکی خۆش
وتی نابینی کە هاتیتە جۆش
دەمی هەردووکمان تێکرا لە کاردان
من بەباوێشک و تۆ بەچەنەدان
هی ئێمەیش فەرمووی وەکو تۆ ڕیا
خۆم دەنگ نەکردم (نما)م نەبڕیا
یاریگە پەنای بێ دەنگی ناوە
هەرچی ئەبینی، بەکرێ گیراوە

***

## شاعیری پینەچی

«ئەم خاکە چەند بەفەیزە، پینەچیشمان شاعیرە
حەل و نەزم بەم ڕەنگە لە ولاتاندا نادرە»

١٩٤٨

دەنگێ دێ لە لای فەلەستینەوە
بەسۆز و ناڵە و ڕۆ ڕۆ و شینەوە
بانگ ئەکا هاوار موسوڵمانینە
فریامان کەون جیهادی دینە
جوولەکە ژنیان ڕاکێشاین بەدیل
ئیسلام گیرۆدە داماو و زەلیل

١٩٣٧

هەندێ لە دۆستان کارتیان ناردووە
جەژنیان بۆ من هەڵبژاردووە
سوپاسیان ئەکەم، خۆمن بێ جەژنم
کالای کاسەی ڕەش بڕا بەبەرگم

***

## بۆ شێخ نووری شێخ ساڵح و جەنابی کوڕی

١٩٣٤

### بۆ شێخ جەناب

ئافەرین زادەی نووری و دڵ نوورانی جەناب
تا بڵێی هەر دەگرێ، تێپەڕە چاکتر بەلباب
کچ حسابی فەلەکە باوکتی کردە فەردی
فەردی نوورییە بڵێن فەردە جەنابی نووری

***

### بۆ شێخ نووری

شوکری خوا ئەکەم، کە لە نووری کوژاوەوە
پرشنگی جوانی شیعر و ئەدەب کەوتە ناوەوە
نووری بەنووری ئێوەوە، زوڵمەت، لائەچێ
یاڕەب ئەم ضیابە، قەت بەچاوەوە

***

### بۆ شێخ نووری

١٩٣٨

خوا ئەو خوایەیە، کە لە نووری کوژاوەوە
پشکۆی بەسۆزی شیعر و ئەدەب کەوتە ناوەوە
نووری بەنووری ئێوەوە تاریکی لادەچێ
نەورۆزی ئێوە تازەیی دێنێتە ناوەوە

***

### دوایی هیتلەر

١٩٤٢

بۆ قوماندانی سوپای فیرقەی هەشت
(براوە)، دنیات گیرا بە بەهەشت
نازی فاشست بەپشتە پێ، پێ
تەراند و ڕەتاند، بەنازگ[1] هەرمێ



ئەو نازگ هەرمێ، هەرمێی وەڕازە
بۆ بەرداشی سەخت چەکوشی بیرازە
خۆتوو میللەتت هەر سەر ئەفراز بن
مەیەڵە وەحشی و خوێنخۆر دەرباز بن
هیتلەر دوایی هەر ڕەنجەڕۆیە

---

(١) بەنازگ هەرمێ: واتا بە شەق

***

١٩٣٤

پشتمان جەژن بوو، بەریشمان جەژنە
وا بوو بە سێ جەژن ئەمساڵ بەم جەژنە
(یسر) پاش (عسر)ە[1]، جەژنی دوای شینە
موشتەری لەگەڵ زوهرە قەرینە

---

(١) «إنَّ مَعَ العُسرِ یُسراً»

***

### بۆ وەصی عیراق[1]

١٩٤٥

جەژنی قوربانە و بەرە جەژنانە
قدومی وەصی بوو بەجەژنانە
کە (بەنو هاشم) بۆ عیراق هاتن
کورد پێشیان کەوتن بۆ بەخێرهاتن
ئەمجاری دواییش، بۆ مەلیک فەیسەڵ
دیسان کورد ڕۆحی خۆی کردە قەبەڵ
بەسەلابەتی دینەوە ئێرە
بۆ فیداکاری سەیبیدان فێرە
ئەخلاقمان وەکو جێگامان بەرزە
پەیمان وەک ئیمان لە لامان فەرزە

پیشــەی مــەردمیان بەجێ و بەجــێیــە
خوا خســتوینیە سەر ئەم خولق و ڕێیە

..........................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## خێوەتی دنیا[١]

١٩٤٤

سـەنگ و تەنافی خـێـوەتی دنیـا
هەڵکێـشـرا و خێـوەت بەجارێ ڕمـیـا
ئەسـتـێـرە هەمـوو ڕژانە زەوی
مـانگ و ڕۆژ تێکڕا کـەوتنە نەوی
واوەیلا کـەوتە ناو جـیـهـانەوە
بەکـەڕەنای سـوور، گـیـان لەرزانەوە
هیچ کـەسێ نەمـا لە زیندەوەران
تەنهـا تەنهـای تاک ئیـزدی یەزدان
بانگی کرد ئەمڕۆ، خاوەن موڵک کێیە
دەنگێ هات وتی هەر خـوا لە جـێـیـە
دووەم جـار سووری لێدا ئیـسـرافـیل
گـیـان چوونەوە ناو لەش بەدەنگی زیل
ئنجـا دیوانێ بۆ خـەڵک دانرا
زۆردار و فـێـڵـبـاز بۆ دیوان برا
بەڕووی ڕەشـەوە، هەمـوو ئەلەرزین
لە تاوا لەناو خـاکـا ئەگـەوزین
بووبووە ژیلەمـۆ شـەکـری دزیەتی
مـار و دووپشک بوو چیـتی شیـرکـەتی
ئەو خـۆڵ و زیخـەی کـرابووە گـەنم
ئەدرا لـە چاویان هەروەک نووکـە ڕم
خـۆزگـە ئەمـەمـان ئەهاتە پێش چاو
پێش ئەوەی سـەرمان بخـەنە ناو چـاو

..........................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.



سـەیرکـەن، مـەولەوی و ئەم نوکتـە وردە
نابێ بە(مـەعـدووم)[١] مـەردی نەمـردە
دوای سەد ساڵ پرسی (مەعدووم) لە کوێیە
هەر فـەردێک ئەڵێ، ها، وا لەوێـیـە

..........................................................

(١) مەعدووم: نازناوی شیعری مەولەوییە.

## توانجی میللەت[١]

بەچاوی جـوان و خـەت و خـاڵەوە
بەتـکە تکەی خـوێـنی ئاڵەوە
لە جـیـاتی کـفن بەبەرمـاڵەوە
فـڕێیـان دایە قـوڵکی چاڵەوە
بێ تەڵقین خـۆیان هاتنە مـاڵەوە
کێ بوو ئەو لاوە کـەوا مـردبوو؟!
لەوەتەن ناوی خـۆی دەرکـردبوو؟
لەگـەڵـمـا گـەلێ ڕایبـواردبوو
ئەم دواییـیـە باریان وا قـورس کـردبوو
نەیتـوانی بژی ئەو بەو حـاڵەوە
کـەلیـمـەی سـووکی هێند پێ بێـژرا
بەتورەکـەی تورک خـاکی بێـژرا
خـوێنی شـیـرینی ڕۆڵەی ڕێژرا
پیـاوی بەکـاری هەمـوو نێـژرا
قـینی هەڵنەسـا، ئەمـەندە سـاڵە
وتی بەهیـچـە، بۆ چ خـەفـەت بخـۆم
خـۆ هەرچۆنێ بێ من ئەژیم بۆ خـۆم
چیم لەوەی خـەڵکی ئەهاوێژنە گـۆم
تـازە داری وشـک نـاژیـەتـەوە بـۆم
بەشـە زەوی من بەکـشـتـوکـاڵە!
نە تـۆڵەی ڕۆڵە، نە ئەتکی چەپۆک
نە کـەچ کـولاهی و دادڕاویی بەرۆک

نەنوێڵی شەق و نە بۆمبای فڕۆک
ناێنێتە کار، پیاوی ترسنۆک
مەگەر بەزبان بکەوێتە ناڵە
نە بەخوا قەومێ، گیانی نەخۆش بێ
سەری تەزبێ و سڕ و بێ هۆش بێ
لە ڕاستی زۆردار حەلقە لە گۆش[٢] بێ
ناوی نەمێنێ، با فەرامۆش بێ
(............................)[٣]

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.
(٢) گۆش: گوێ. حەلقەلەگوێ. نۆکەر.
(٣) ئەم نیوە دێڕە لە ڕۆژنامەکەدا نەنوسرابوو. بڕوانە (ژین)ی ژمارە ١٦٥٠ ساڵی ١٩٦١.

***

## بۆ زێوەر[١]

١٩٤١

زێوەر هەر چەندە ئوستادی شیعری
حەزکەی پێبکەنە و ئەتەوێ بگری
شاعیری تازە تۆی خستە دواوە
کۆنە شاعیران باویان نەماوە
وەک (ضیا) پاشا، لە خۆی بوو بایی
چووەتە جەنگی ڕۆمی بەغدایی
وتوویە سەبا کە چوویتە بەغداد
بە سەلام ڕۆحی ڕۆمی بکە شاد
بڵێ لە ئەوجی شیعرا ئەتخوڕی
شاعیرێکی ڕۆم لە تۆ تێپەڕی
لێرەیش شاعری تازە ئەخوڕن
بۆ کلاشیش بێ کۆنە ناکڕن
وا شاعیرێکی بسارا بیایی
ڕوباعیەکەی تۆی خستە خوڕایی



وا شاعیرێکی یوڵداشی ڕەفعەت
جوابی دایتەوە بەقەدر و حورمەت

***

## بۆ زێوەر[٢]

١٩٤١

زێوەر مەڵێ زەمانە شتی نارەوا ئەکا
ئەهلی هونەرە لە چەوتی ئەو بەرد بە با ئەکا
شێن هەڵگەڕاوە سوورە دزەی شاعیران
سوورەی خەتا نەماوە، کەوا سوور خەتا ئەکا

(٢،١)ئەو دوو شیعرەی کە پیرەمێرد بۆ زێوەری نووسیوە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

سمایل بەگێ بوو ڕەئیسی ئەملاک
سۆفی مەشرەب بوو، پیاوێکی دڵپاک
وتیان قۆڵچییەکەت بەبێ پرسی تۆ
غوسل ئەکا لەسەر ئاوی بەکرەجۆ
ئەو لەش پیسی خۆی تێ دەڕژێنێ
مەرەزەکەمان پیتی نامێنێ
هەزار فێڵی وا، لێرە بەنانێ
مەگەر هەر شەیتان بەمە بزانێ

***

## بەندی پیریی[١]

١٩٤٠

خەم و ئاه دووکەڵی خەستی بوایە
ئەبوا ڕووی ئاسمان ڕووناک نەمایە
ئەمەندەم وت، زبانم وەختە بسوێ
کە یار عەکسی مەرامە و بۆیشی ئەلوێ

دەڵێی بەختی ئەوم من وا کە نانووم
لە بەختی من وەکو بەختم، ئەو ئەنوێ
بەوە زاڵی بەسەر نەفسا کە زاڵی
ئەگەر ڕەخنە لە کەس بگری مناڵی
لەناو بۆتەی زەماندا بتکوڵێنن
ئەگەر قوڵپت نەدا، ئەوسایە کاڵی
بەپیریش عەینی سیحرە (عەین)ە دەرسم
هەواڵی دڵ لە چاومەستان ئەپرسم
هەموو عالەم لە چاوی بەد ئەترسن
کەچی هەر من لە چاوی جوان ئەترسم
بەرێکەوت یار لەلام میوانە ئەمشەو
لە خەودایە شوکور وا مۆتەکەی خەو
هەڵێ و قەت هەڵمەیە هاوارە ئەی ڕۆژ
ئەگەر بێت و بڕۆی ڕووڕەش بێ ئەی شەو
ئەوی سەربەست ئەژی و ئازادە مەردە
سەری خۆی دەر دەکا لەم دوودو دەردە
بەقەرز ناوبرێ گەر وەعدەی حەشر بێ
ژنی ناوێ، کچی شای بێتە پەردە

(١) ئەم شیعرانەی کە پیرەمێرد ناوی ناوە (بەندی پیری) و لەتەمەنی ٧٣ ساڵیدا نووسیونی لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

## فەریادی دووری

١٩٣٣

### بۆ ڕەشید نەجیب

«بەڵام گوڵشەنم، چونکە پەشێوە
کەڵکی بولبولیم، نەماوە پێوە
ئەو ئاتەشکەدەی، زێدەوانی بووی
دیم، ڕووخابوو، تۆیش، دڵبریانی بووی»

***



## وردە زیو

١٩٤٠

شیعرێکی کۆنی کوردیم چاو پێکەوت(١)
لە مەعناکەیدا، مەراقم ڕێکەوت
مەعنای شیعرەکەم لێ بوو بەمەتەڵ
نەمزانی (قازان) پێی ئەڵێن مەنجەڵ
«قازان قەتار بەست قوڵنگان هەوایی
حەیفە قیبلەکەم شەو وەتەنهایی»
دەفەرموو، قاز و قەتار و دراج
ئەمانەم بۆ بکە بەقوڵنگ و پاچ
قازان قوڵنگان پۆلی باڵداران
پێکەوە ئەژین، وەک دەستەی یاران
یەعنی کە ئەوان، قەتار ئەبەستن
حەیفە تۆ، تەنها، بەبێ من، نووستن
یاخو کە مەنجەل، لە ڕیز بەقەتار
ئاو گەرم ئەکەن بۆ مردووی نازدار
(قاز) کە جەمعت کرد، ئەبێ بەقازان
مەنجەڵی گەورەیش پێی ئەڵێن قازان
ئنجا (قوڵنگان) قوڵنگی باڵدار
ئەکەونە هەوا ئەڕۆن بەقەتار
(پاچ)یش، قوڵنگە، جەمعی قوڵنگان
بەرز ئەبنەوە، وەختی پاچ لێدان
یەعنی پاچ بەدەست قەبرەڵکەنەوە
لە کاردا سەری بەرز ئەکەنەوە
بەم شیعرە مردن ئەخەنەوە بیر
های شیعری مەتەڵ، های تەدبیری ژیر
هەندێ مردنیان، ناوە بەلاوە
عومریان دیسان لە نوێ نووسراوە
تریاک ئەکێشین، لە مار ناترسین
لە ناوی مردن، بردن، ئەترسین

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

## پەندی ڕۆژگار[١]

١٩٣٦

مایینێکی بۆرەم بوو، سواری ئەبووم
ڕۆژێ بەئیشێک بۆ دێیەک ئەچووم
لە نزیک ئاوێ ژنێکی نازدار
بانگی کردە من، وتی بۆرە سوار
سێ بەڕۆ دارم، ئارامم نییە
لە تۆ دەپرسم، دەرمانی چییە
وتم لەم دەردە ڕسکارت دەبێ
ئەگەر بێ و دڵی من بێنیتە جێ
وتی ناچارم دڵت بێنمە جێ
بەڵام یاخوا تۆش ئەمەت بێتە ڕێ

..............................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەبۆتەوە.

***

## هار و مار[١]

هار و مار دەمی باوە شابان بوو
هەرچی هار دەیگرت بۆ ئەوێ ئەچوو
لەگەڵ پەنچکێ نانیان بۆ ئەچوو
تووتکی دەهاوێشت ڕسکاری ئەبوو
ئەمەندە هار و ماریان چاک ئەکرد
کەچی شاپیاویان بەگورگی هار مرد
حەکیم لە دەردی کەسی خۆی کوڵە
بۆیە خزمانی دەکەونە بۆڵە

..............................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاونەبۆوەتەوە.

***



## بۆ ڕەشید نەجیب[١]

لە وەڵامی شیعری (شاری بەدبەخت)دا

١٩٣٢

«دوورکەوتەی وڵات، فیداکاری ئێڵ
دڵ شکستەی دەرد، ئەم سەیل و ئەو سێڵ
لاواندنەوەی، بەدەنگی وا خۆش
دڵی دڵسۆزان، ئەهێنێتە جۆش
من نائومێدم بۆ (ژیان) ئەژیم
بەسەر کاولەکەی، وەتەنا ئەگریم»

..............................

(١) دەربارەی ژیان و بەرهەمی شیعر و ئەدەبی ڕەشید نەجیب، بڕوانە گۆڤاری بەیان ژمارە ١٢١ ساڵی ١٩٨٦ نووسینی، ئومێد ئاشنا.

***

## بۆ مەرگی حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم

تشرینی یەکەمی ١٩٣٤

دەک فەلەک کۆستت کەوێ وا کۆست لەسەر کۆستمان ئەخەی
هەفتەیە ناڕوا، کەوا دووبارە، شینمان بەردەخەی
داخی (قالە)[١]، کەم بوو؟!، وا حاجی ئەحمەدیشی هاتە سەر
دیارە هیچمان نایەڵی، ئەمساڵ خراپت دایەبەر
جێی ئەمانە چۆڵە، جێی باوەڕ نییە پڕ بێتەوە
زامی کۆن و تازە تێکڕا هاتە سوێ، دەکولێتەوە
ئەستەموڵ و میسر و شام و مەککە و ئێران هەموو
هەرچی بهاتایە ئەم شارە، لەوێ میوان ئەبوو
خوێنی پیاوی وا ئەگەر گوم بێ ئیتر چی ناکرێ
با وجوود پاش ئەو قیامەت هەڵسێ کەڵکی ناگرێ

..............................

(١) قالە: مەبەست لە (قالەی ئایشە خان)ە کە ماوەیەکی زۆرکەم لە پێش کۆچی (حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم) دا جوانە مەرگ بووبوو. هەروەها ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاونەکراوەتەوە.

***

## هەڵمەت[1]

١٩٤٥

بۆ جەژن و شایییە، جلی سووریان ئەوێ منداڵ
ئەم جەژنە، خوێنی کوردە، فەلەک کردیە بەرگی ئاڵ
قەیناکا، ئەو لە پێشەوە خوێنی (عەلی) ڕژان
دیسان بەخوێنی ئێمە، ڕۆژووەکەی شکان
دڵۆپێکی خوێن، لە لەشی، شێری شەرزەوە
وەک تەرزە، دێتە خوارەوە، لەو شوێنە بەرزەوە
چەن بەرزییە، لە بەندەنی بەرزی نزارەوە
هەڵمەت بەری، بەلاوکی کوردی و قەتارەوە

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی بەموناسەبەتی شەڕی دووهەمی (بارزان)ەوە نووسیوە. هەروەها ئەم شیعرەمان لە مامۆستای شاعیر (محەمەد صالح دیلان)ەوە دەستکەوت و تا ئێستا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## بەیتێک بۆ شێخ سەلامی شاعیر

سەلام گوناهت خوێندەوارییە
لێرە خوێندەوار، دەردی کارییە

## دڵسۆزی[1]

١٩٣٣

دە ساڵ لەمەوپێش لە بورجی بطحا
ڕۆژهەڵات ضیای خۆی دایە، بەغدا
من وتم یاران، ئاخر زەمان هات
کە دەبینین ڕۆژ، لە مەغریب هەڵات
وتیان، خێر، ئەمە، سێ جارە وایە
عیراق بەنەسلی، نەبی، ئاوایە
تەکرورێکە، تەئریخ ئەینووسێ
کاری بوو بە دوو، هەر دەبێ بە سێ
لە پاش مرتضی نەسلی عەباسی
مەوجوودو (بانی)ی عیراق دەناسی



ئەمجارەیش هەر ئەو فەیزەیە وا هات
دەوری (مەهدی)یە، لە عیراقدا هات
ڕۆژی، ڕۆژی هات، ڕۆژی ڕۆژئاوا
بورجی بەغدای گرت، کردی بەماوا
بێ ئەبو مسلم، ئەبو مسلم بوو
حکومەتێکی وای دامەزراند زوو
هونەر ئەوە بوو، کە ئەم بەغدایە
جێی باوکی نەبوو پێی بێتەکایە
بەجەوهەری خۆی، وای لە ئێمە کرد
ئەم خەڵکە هەموو، لەبەری ئەمرد
بەحیلم و عەقڵ و دڵسۆزی و ئیشفاق
نیفاقی عیراق، بوو بە ئیتیفاق
بەعەزم و تەدبیر، کارێکی نواند
لە پەنجەی پڵنگ، سەر ئازادی ساند
لام وایە تا ڕۆژ ئەگەڕێتەوە
مەدح و ماتەمی نابڕێتەوە
تازە عیراقی کۆن ژیایەوە
دریغا، خۆی، تیا، نەحەسایەوە
ناگا، کۆچی کرد، ئەولادی حسەین
تا دەمرین ئەبێ، یادی خێری کەین
خۆی حۆری بەهەشت، هاونشینی بێ
ڕۆحی نیگەهبان، جێنشینی بێ
یەکە تەئریخە و هیوام پێیەتی
مەلیسک وەک مەلەک بەهەشت جێیەتی

(١) بۆکۆچی دوایی مەلیکی عێراق، ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## بۆ مەعرەزی کچان

تاکو بڕوانی، بەهەشتێکە بەگوڵ خەملیوە
دایکی ئێمە وەرە لێی پرسە ئەمەی کەی دیوە

## بۆ ڕۆژنامەی ژیان

ژیانمان هەندێ، لە ڕێ لایدابوو
لالووت بووین، لامان، باوی نەمابوو
ئەمجارە هەموو، بۆی تێئەکۆشین
کەم و لاسەنگی بۆ دائەپۆشین

***

## دێوانەی ناشاد[1]

دێوانەی ناشاد، دێوانەی ناشاد
جێ نوشینی خاس، مەجنوون و فەرهاد
ژێرکەوتووی دەستی، چەرخی ستەمکار
خێر نەدیو لە ژین لە دڵدار و یار
بەئاهو ناڵە و بەڕۆ ڕۆ و گریان
چەن شەم و شەمت بوو، تاوەکو بەیان
چەن ڕۆژی بەهار، چەن شەوی پایز
چاوەڕوانیت کرد، بۆ کۆچی ئازیز
ڕازی دڵی تۆ، هەڵبەستی جوان جوان
گفتوگۆی خۆشی گەرمیان و کوێستان
بەڵام داخەکەم، کۆمەڵی نەزان
ئەخاتە ژێر پێ، ئاواتی ئینسان
ئێستاش لەژێر خاک لەو شوێنە تەنگە
لەژێر ئەو بەردە ساردە بێ دەنگە
کێڵی مەزارت وەکو باڵای شەم
لەژووری سەرتە، بۆ کەم بوونی خەم
جواب و سوئال و پرس و تەڵقینت
بیروباوەڕ و دڵ و یەقینت
جومگەی ئێسقان و ئەو خۆڵی سەرە
هەمووی خەریکی زیکری دولبەرە
بەڵام بەیادی شێت و شەیداییت
بەکۆڵ نەدان و گیانی فیداییت



بەپایەی بەرزی دنیای عاشقان
شیعری بەنرخی مەجلیسی کوردان
هاتمە خزمەتت چوون تۆ سەرداری
بۆ دڵسووتاوان جێگای هاواری
منیش وەکو تۆ فیدایی و شەیدام
بۆ یارەکەی خۆم دڵ پڕ لە سەودام
یاری من جیایە[2] بیر و بڕوایە
ڕێ پیشاندەری عەزم و توانایە
کۆن ئەڕووخێنێ، نوێ دروست ئەکا
خەم ئەڕەوێنێ، زوڵم لائەبا

چەند سەرنجێک دەربارەی ئەم شیعرە:

١- ئەم شیعرەمان لە بەڕێز (محەمەد سەعید سەلیم جاف) وەرگرت و پێشتریش هەر خۆی دوو جار بڵاوی کردۆتەوە. جارێ لە پاشکۆی (عیراق)ی ژمارە ٤٩ی ساڵی ١٩٨٣دا جارێکیش لە گۆڤاری بەیانی ژمارە ٨٣ی ساڵی ١٩٨٢دا. هەردوو جار پێشەکی کورتی بۆ نووسیون.

٢- پێشەکییەکان جیاوازی هەیە و مرۆڤ دەخاتە گومان و دوودڵییەوە سەبارەت بەم شیعرە کە هی پیرەمێرد بێت.

٣- گەلێ وشە و واتا و گوزارەی تیایە کە هی پیرەمێرد نین.

٤- ئەگەر ئەم شیعرە دەقەکەی هەورامی بێت و پیرەمێرد گۆڕیبێتی بۆ شێوەی سلێمانی ئەوا وەک لە کۆتایی شیعرەکەوە دیارە ئوسلوبی پیرەمێردی تیا دیارە و دەستکاری دەقەکەی کردووە. ئەگەریش شیعرەکە هی پیرەمێرد خۆی بێ ئەوا لە دوای خۆی دەستکاری کراوە و هەندێ ئاڵوگۆڕی زەقی تیادا دیارە.

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە. هەروەها سەبارەت بەهەندێ تێبینی بڕوانە کۆتایی شیعرەکە.

(٢) بەلای منەوە (جیا)یە نەک (چیا) چونکە پیرەمێرد هەرگیز وشەی چیای بەکار نەهێناوە و هەمیشە شاخی نووسیوە.

***

## بۆ کۆچی عبدالقادری کوڕی سەید ئەحمەدی خانەقا

١٩٣٢

ئاه عبدالقادر چیت لێ هات، کوێ چووی[1]
بەڵێ تۆ پیاوی، ئەم دەورە نەبووی

دنیـــا خـــراپ بوو، تا هات ئەگـــۆڕڕا
ئاســـایش نەبوو، مـــەگـــەر لە گـــۆڕا
بەڵام بـەزەیت بەبـاوكـــــتـــــا نـەهات
پشـــتت وا شكاند، وەختـە بێـتـە لات
تۆ چاك بووی كـــەچی خـــراپت نواند
خـــانەقـــای دڵی، چاكـــانت ڕووخـــاند
بەرگی ئەم جـــەژنە، شـــینە مـــاتەمـــە
هەور هێشـتـا ئەگری، هێشـتـاكو كەمە
ئەم بـانگ كـردنە مـژدەی عـەفـوە بۆی
قـادر عـەبدی بانگ كـردەوە لای خـۆی

..............................................

(١) ئەم شـیعـرە لە دیوانی پیرەمـێردی م. هـ دا بڵاونەكراوەتەوە. هەروەها لەو كەشكۆڵەی نەجـمـەددین مـەلا. بۆ (حەمە صالح ئاغای قزلجی) نووسیوە لە لاپەڕە ٢٢١-٢٢٢ دا ئەم شیعرە نووسراوەتەوە. بەڵام لەهەندێ جێگا دا جیاوازیان هەیە لە دانانی وشەكاندا بەڵام مانا و مەبەست هەر یەكێكە. لەدوای بەیتی پێنجەمەوە دوو بەیت هەیە و دوا بەیتیش كەمێ جیاوازە. ئەو دوو بەیتەی لای نەجمەددین مەلا و دوا بەیتی شیعرەكە دەنووسین:

تـازە نـەمـــــامـان وا لـەگـــــولایـە
تـازە نـەمـــــامـان وا لـەگـــــلایـە
فـەلەك هیچ ناڵێم، پیشـەت بەدییـە
خـوایە هیچ ناڵێم، خۆت كـوڕت نییـە
تەئریخی كۆچە، نیـوە شـیـعـری دوای
قـادر عـەبدی خـۆی بانگ كـردەوە لای
(١٣٥١ كۆچی)

***

## شیعری نوخشەی تازە شاعیر(١)

١٩٤٠

شـــاڵ و قـــاشـــاو بۆ یەخـــتـــەی ڕەش
دیزەی ڕەش لەســـــەر ئاگـــری گـــەش
گـــیـــپـــە و كـــەشكەك بەڕۆنی لەش
دەســـتـــدار ئەیبـــا و بێ دەست بێ بەش
مـــــــاندوو نـەبـیـت پـووره وەنـەوش
تـــۆش بـــەنـــدێـــك بـــڵـــێ تـــەواوە



بووكـــە خـــازێی گـــۆرانیـــبـــێـــژ
هەمـــوو ســـەری مـــانگێك بێ نوێژ
هـــەڵـــدەپـــەێـــت وەك داراوێـــژ
گـــۆشـــتی مـــێی گـــێـــژ، درەوی لێـــژ
لەســــــەر گـــــردی توورەكــــــە ڕێژ
نـازانین چی لێ قـــــــەومـــــــاوە
دەمـت ژوورە و لـووتـت كــــــــوورە
ملت گـــــێـــــزەر مـــــەمكت توورە
چەند دۆست ئەگــــری لەبەر بوورە
ئەو چاوەت كـــــە وەك كلتــــوورە
بۆیـە وا خـــــــــەڵكـت لێ دوورە
زۆر كــــــــەس لێت بەبەند و باوە
كــــــورتە بالای گـــــوێلك چاوە
دەم و زوڵـفـت هەردووك خـــــــاوە
كـــەس نەمـــا، هەر منت مـــاوە
ڕوویەكـــــمـــــان لێ بكە بەمــــلاوە
وای لەچی و وای لە دۆشـــــــــاوە
چرا هەڵكە، چی تیـــا مـــاوە؟!
دنیـــام پێـــوا، قـــوژبن و ســـووچ
ڕەتـــانـــدمـــت بـــەپـــڕ و پـــووچ
چڕنووك، نوقـــورچ بۆ مـــاچ و مـــووچ
ڕەتێكت برد، كـــەوتیـــتـــە نووچ
ئۆخـەی تۆی كـەوتووی لنگە و قـووچ
جـــــێـگای شـــــارراوەت دیارە
لـەپـاش چـەنـدان بـووی بـەیـارم
وەك تێـــمگەیشـــتـــووی بەكـــارم
یارۆكـــــەی خـــــۆزگـــــە بەپارم
جـــوانیت مـــژیم لێت بەكـــارم

سمینم سموٚرەی دارم
نەماوە، هێلم بڕاوە
برژانگ کەر دڕ، زوڵفت وەک داس
لەبیرتە سەر جوٚگای قورتاس
لێی ڕاکشابووی بێ ئاوەڵ کراس
ئەتوت ئاخ بوٚ تلێ ڕێواس
ماندووت کردم هەی خوا نەناس
خوٚزگە بەپارت پێ ماوە
ئاوی چەقان گەرم و گوڕە
چیبکەم لەو خوێن سارد و سڕە
خوٚی کورتە و درێژ دادڕە
زوٚر بەگێچەڵە و دەمشڕە
ئەمگەزێ وەک مەشکەدڕە
ژەهری کوللەم بوٚ داناوە

---

(١) پیرەمێرد سێ شیعری بوٚ پلار و گاڵتە پێکردنی ئەو تازە شاعیرانەی سالآنی چڵ داناوە. وا لێرەدا دەیاننوسین. بەڵام سەبارەت بەبیروڕا و سەرنجی ئێمە لەم بارەیەوە بڕوانە پیرەمێرد و شیعری نوێی سەردەمەکەی.

***

## شیعری نوخشەی تازە شاعیر

خوٚ هەڵبەستی ئەم دەورە
لەجێی خوێندن و دەورە
جنوٚکەمان لە دەورە
بسم الله کەین بەدەورە
دەوریە پلاوی چەورە
وەک کوٚتر کەوتە دەورە
ئەچێ بوٚ پیاوی گەورە
ئاسمانی ئێمە هەورە



یەکێ بوو یەکێ نەبوو
لەو دووانە ئەوەی نەچوو
کەرێکی بێ گوێچکە بوو
بوٚ خوٚی بوٚ کێشە ئەچوو
کەرە لە دەست خوٚی دەرچوو
ئیتر لە ناوا گوم بوو
کەچی ئەوەی کە نەبوو
کەرەکەی فروٚشتبوو
کەری خستبووە هەڕاج
فروٚشتی بێ خەرج و باج
تفەنگێکی بێ گوللە
دیزەکەیەکی دانوولە
گونیە شڕێکی بێ ناو
چەقوٚیەکی دەم شکاو
هەمووی کڕی چوو بوٚ ڕاو
لەسەر سەرچاوەی سەراو
هەروا ئەیڕوانیە ناو ئاو
بەسیحری مەلا خنکاو
وەک ئاوێنەی ئەسکەندەر
ڕوانی لەودیو تاریدەر
وا (چێر)گێ نیشتوٚتەوە
ڕوو بەڕووی ملەکەوە
فیشەکی نایە تفەنگ
هاویشتی بێ ناڵە و دەنگ
نەیگەیشتێ و چێرگی کوشت
خوٚی کەوت لەسەر گازی پشت
گونیە شڕی هەڵسووڕان
چێرگی شل شل تێ چەسپان
بردیە ماڵەوە لێی نا
لەناو دیزەی بێ بنا

لە کۆڵانێکی کەما
گۆشتی ڕۆی ئاوی ما
هێندە سوێر و چەور بوو
هەرچی خواردی زگی چوو[1]
ئەوەی کە نەیخواردبوو
چەوری لێوی بەستبوو
ئەوەی کە نەیچەشتبوو
بەڕیشییەوە مەیی بوو
سەگ هات ڕیشی لستەوە
سەگی گرت بەدەستەوە
کە کێشای بەزەویا
سەد تۆپ بلووری ڕیا
خاوەن سەگ و سمێڵ چەور
لە یەک کەوتنە شەڕە تەور
هەریەکە بۆ خۆی ئەبرد
ئەوان بەشیان نە ئەکرد
لەولاوە قۆڵچی تەموین
هات و تێی خوڕین بەقین
وتی ئەمە قاچاغە
لە قاچاغ جەرگمان داغە
لە دەست ئەوانی وەرگرت
بەبێ قڕە بەشیان کرد
بۆیە پرسین نەماوە
کەوا بەشکردن باوە
ئەم هەرایە و گەردشە
هی ئەوەیە بێ بەشە

(١) لای م. هـ نووسراوە بەڕیشیەوەی مەیی بوو.

***



## پێڕەوی شاعیرێکی بێ ناو

١٩٣٩

باڵا وەک کەنووی بێ گەرد و ناسک
کەللە وەک دەهۆڵ مل وەکو داسک
تفەنگ لە شان و بەسواری لاسک
چەند خۆشە باز و هەڵمەت بۆ باسک
غەرقی عەرەق بێ، کەللە هەتا سک
بگری بەقەتار، شادبە بەڕۆ ڕۆ
نەنکت نەمردووە، هەڵپەڕە ئەمڕۆ
گێلاس و شفتە، هەی تووڕە و تڕۆ
نەکەی بێ بەش بی، هەستە زوو بڕۆ
بە فیدای باڵات بم ئەگریجە پەڕۆ
سووتووی نێرگەلە گفتوگۆی قومری
چەپڵە بەلاقی شەست و نۆی هیجری
سەماوەری زەرد خەڵووزی بەفری
فەرتەنەی بەهار، سوڕ سوڕەی بەحری
وریابە گیانە، نەکەی قەت بمری
گوڵاڵەی هەتاو، سێبەری چەتری
ئاوێنە و شانە و کێلی سەر قەبری
کل و کلتوور و دەستاڕ و تەوری
سینی بەمەنجەڵ، سێپا بەدەوری
چێشتی هەرشتە و خۆرشتی چەوری
سەمای مریشک و قووقووی کەڵەشێر
بە دەستی شکاو بەدوو چاوی کوێر
بێ با بنۆشین دوو جام ئاوی سوێر
چووینە سەر لووتکەی شاخی شارباژێڕ
بۆ ڕاوە ماسی بن بەرد و تاوێر

***

## بەزەیی

۱۹۳۲

بابە سەیری ئەم بەرخە کە چەند جوانە
ڕۆڵە، ئەوە بەرخی مەڕی خۆمانە
بابە، توخوا، با ئەم بەرخە هی من بێ
وای لێ ئەکەم، قۆچ لێ نەدا، هێمن بێ
ڕۆڵە تۆ ئەم بەرخەت بۆچی خۆش ئەوێ
وا دام بەتۆ، بەخێویکە، ئەیزانی؟![1]
بیشۆ، پاکی ڕاگرە، هەتا ئەتوانی
ئەم بەرخە گەر بەخێو بکرێ و بێت بەمەڕ
لە سێو و مێو چاکتر بۆمان دێتە بەر
شیری ئەبێ ئەیخۆینەوە سبەینان
سەرتوێژی ماستەکەی ئەخۆین لەگەڵ نان
کەشک و سیرێژ و سوێرەکە و پەنیری
ئەیخۆیت و بۆ کەس و کاری ئەنێری
خوری ئەکەین بەجاجم و پۆپەشمین
بە بەرماڵ و جەواڵ و شاڵ و سەرزین
بەزاوزێ، پەرە ئەگرن، زۆر ئەبن
ڕانێکی لێ دێتە بەر، نایە، لەبن
کەمیوان هات، سەری ئەبڕین گۆشتەکەی،
نەء، نەء، تو خوا بابە، ئەوە قەت نەکەی
بەستەزمانە، خانەزایە، شیر مژە
وەک ئێمە ژینی خۆش ئەوێ، مەیکوژە
بەرخێ کە ئەوەندە، چاکەی بێ بۆمان
سەری نەبڕین، گوناه نەکەین، بۆ خۆمان

................................................

[1] ئەو نیوە دێڕە لە چاپی م. هـ دا دوو بڕگەی زیاد بوو، واتە دەبوە سیانزە بڕگە. لە نوسخەی ئێمەدا وەک سەراپای شیعرەکە هەر یانزە بڕگە بوو.

***



«زینهار لەتکا[1] مەچۆ بۆ تکا[2]
کە کەوتیە تکا، ئابڕووت تکا»

................................................

[1] واتە: گریانی بەکوڵ. کە مرۆڤ زۆر گریا بەتکا ئەچێ. م. هـ.
[2] تکا: پاڕانەوە. م. هـ.

***

## پەنا بەخوا

### «بۆ سەید عەلی بسم الله»

کە چوویتە پاڵ ژن بسم الله بکەی
منالی چاکی لێ دروست ئەکەی
ئەوی لەناوی بسم الله ڕاکا
دیارە ئەو دەمەش بسم الله ناکا
کەوابوو نەوەی بەبێ بسم الله
ئەبێ پێی بڵێی (أعوذ بالله)
ئەوەی کە درەنگ بووبێ بەزاوا
بەم گرانییە، چۆن نەوەی زاوە
تەنها سوورەتێک، بێ بسم اللەیە
دووی تر یەکی دوو بسم اللەی تیایە
شارەکەی ئێمە سلیمانییە
بسم اللەی ئێمە کە قورئانییە
بۆچی لە ترسا، بسم الله نەکەین
بۆچی جنۆکە، لەناو دەرنەکەین
ئێستە جنۆکە، ناچنە کێوی قاف
ئەکەونە غابات بەلاف و گەزاف

***

# ناوەڕۆک

## ئومێد ئاشنا

* لە بنەماڵەیەکی ڕۆشنبیر و ئایینپەروەر لە سلێمانی ساڵی ١٩٥٥ لە دایک بووە.

* ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩ پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی لە هەولێر تەواو کردووە و لە ناوچەکانی قەرەداغ و دوکان و دەربەندیخان و پاشان سلێمانی مامۆستا بووە.

* لە ساڵی ١٩٧٨وە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد بووە.

* لە ساڵی ١٩٩٤ خانەنشین کراوە لەسەر داوای خۆی. بۆ ئەوەی دەرفەتی تەواوی هەبێ بۆ خزمەت کردن لە بواری ساغ کردنەوە و کۆکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی و ڕۆشنبیری نەتەوەکەمان.



* پرۆژەیەکی ئەدەبی بەدەستەوە بوو بەناوی (پرۆژەی سەد کتێبی کوردی) کە توانی نزیکەی (٧٠) حەفتا کتێب و نامیلکەی لێ چاپ بکات بەڵام بەژمارەی کەم بەهۆی بێ توانایی مادی.

* سامانێکی ئەدەبی زۆری بەجێ هێشتووە بەڵام زۆربەیان هەر دەستنووسن.

* لە ٢٠٠٠/١/١٦ لە تەمەنی ٤٥ ساڵی و لە هەڕەتی بەرهەمهێناندا کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان نێژراوە.

* ژمارەیەکی زۆر دەستنووس و سێ جگەر گۆشەی بەناوی «سیامەند و سایە و شاد» لەپاش بەجێ ماوە.

ئەم سێ بەرهەمەی لە دەزگای ئاراس بڵاو بوونەتەوە:

- ڕەشید نەجیب: ژیان و بەرهەمی.
- ئەشکی باوان: بەرهەمە بڵاونەکراوەکانی کامەران موکری.
- پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان و بەرهەمەکانی: دوو بەرگ لە ٩٠٠ لاپەڕەدا.
- و چەندان بەرهەمی تریشی بەڕێوەن.

# پیرەمێرد

# و

## پێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان و بەرهەمەکانی



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی ڕاپەڕین، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١

# پیرەمێرد

# و

# پێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان و بەرهەمەکانی

کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی

**ئومێد ئاشنا**

بەرگی دووەم



ناوی کتێب: پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان و بەرهەمەکانی
کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی: ئومێد ئاشنا
بەرگی: دووەم
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٨٧
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
وێنەی بەرگ: هێلکاریی یووسف عەبدولقادر
نووسینی سەر بەرگ: خۆشنووس محەممەد زادە
پیت لێدان: ئەمیر داود - ئاراس ئەکرەم - رەهێڵ رەشید
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل- ئەمیر داود - رەهێڵ رەشید
سەرپەشتی: دلاوەر صادق ئەمین
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاورەحمان مەحمود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣١٤)ی ساڵی ٢٠٠١ی دراوەتێ

## گیپە

مامۆستا محەممەد ڕەسول هاوار دەربارەی ئەم شیعرە نووسیویە: جارێکیان ئەحمەدی عەزیز ئاغا گیپەیان ئەبێت، چەند هاوڕێیەکی خۆی بانگ ئەکا بۆ گیپە خواردن. پیرەمێرد لە بانگ کراوەکان نابێت، لە پاش چەند ڕۆژێک پیرەمێرد بەو گیپەیەی ئەحمەدی عەزیز ئاغا ئەزانێت، وەکو وتمان پیرەمێرد زۆر نەوسن بووە، بۆ هیچ شتێک گلەیی نەکردایە لەسەر خواردن گلەیی ئەکرد. لەبەر ئەوە بەم چەند دێڕەی خوارەوە گلەیی خۆی بۆ ئەحمەدی عەزیز ئاغا ناردووە:

ئەحمەد با گیپەت بۆ ئەو تیپە بێ
گیپەت خوارد بێ من، گووپت گیپەبێ
خۆ من ئەو ساتە، هاتبوومە لات
تەفرە بۆ من بوو، شفرە بۆ جامات
وتیان کەللەکەت هێشتا دەیباڕان
ورگتان برنجی، کالّی ئەخووسان
ئەگەر وەک کەللە مێشکت داتەکێ
ئەبی بەوەزیر، فریشکت ئەتەکێ
وەک (کلّاو قازی) بێ دروومانی
ئاگری بن دیزەی، زۆر بێ ئامانی
ڕیخۆڵە چەورەی، لە خۆت ئالّاوی
پێچکەی خۆت بەستووە، لە جێدا ماوی
هەر وەک شیلاوگ، هەوێنی شیری
لە نوکتەی وردا، پەیکانی تیری
دەستی (عزەت)ت دائم لەسەر بێ
هەرمێی بەهەشتت[1] ئاودار و تەڕبێ
کردەی تۆ و بردەی (نادی مەزڵووم) بێ[2]
خراپەت دیار بێ، چاکەت بن گۆم بێ
منیش کەشکەکەم ئەمڕۆ خوارد بێ تۆ
بەرد هاویشتنە، پاداشی کلّۆ

........................................

(١) هەرمێی بەهەشت: واتە شەقی بەهەشت، چونکە زۆر جار ئەڵێن هەرمێییەکی تێ هەڵدا.

(٢) نادی مەزڵووم: نیازی لە ماڵی حوسێن مەزڵوومە کە کابرایەکی زۆر ساویلکە و خۆشبوو، زۆر کەس وەکو نادی بۆ ڕابواردن ئەچوونە ئەوێ.





ئەحمەدی عەزیز ئاغاش کە بەنوکتەبێژ و قسەخۆش و بەنەستەق بەناوبانگە، بەم سێ دێڕە خوارەوە وەرامی پیرەمێردی داوەتەوە، وەرامەکەی لەسەر نامەکەی پیرەمێرد نووسیوە:

خاڵە گیان یا خوا ڕووی بزن[1] ڕەش بێ
منی ڕووڕەش کرد، هەر ئەوەی بەش بێ
بەخوا ئەو ساتەی تۆ تەشریفت هات
من زۆر مەشغوڵ بووم، بەبیرما نەهات
لە جیاتی گیپەی ئاوساوی نەکولّاو
پێشکەشت ئەکەم، دوو پەردە پلّاو

........................................

(١) بزن: ئەحمەدی عەزیز ئاغا نیازی لە بزن پووری بووە، کە ناوی پوورە بەهێ بووە، وەهەم خەسووی ئەحمەدی عەزیز ئاغاش بووە کە ئەو گیپەکەی لێ ناوە.

***

## شەڕی خەراجیان(١)

«ساڵی ١٩٢٤ کە شێخ مەحموودی نەمر لەشکری دوژمنی لە شارەزوور شکاند، پیرەمێرد ساڵی ١٩٢٦ بۆ یادی ئەو نەبەردە ئەم شیعرەی نووسیوە». هەروەها وەڵامی ڕۆژنامەی (العراق)ی ئەو کاتەی داوەتەوە .

العراق[2]ئەڵێ، ئێوە ئەرمەنین
دەعواتان شوومە، بۆ هیچ لایق نین
خۆیان ناناسن، بەتورک نابن
خوا نەیداونێ، وەک کورد، ئازابن
کورد ئەو کوردانەن کە بەغدایان گرت
(أبو جاسم)ەکان، کەوتنە جرت و فرت
دوو ساڵ لەمەوپێش، خۆیان و فەوجیان
لەسەر کانیەکەی، بەردی خەراجیان
بە کەش و فشی بۆ کۆزە ڕەقە
دوو سواری کوردیان لێ کەوتە تەقە
بە ئاخ (یا یوممە) کەوتنە هاوار
بە پاڵەپەستۆ ڕایان کردە شار

ئەو ڕەمەزانەی لە دێی ڕەمەزان
بەجەژنیان زانی لە تەنوور خزان
نەبوایە بەهۆی بەریتانیاوە
ئەخنکان بەدەس کوللە و خورماوە
ساچی بکەم، نەبێ، وڕەی تەیارە
حیزی و ئازادی ئەوسا دیارە

........................................

(١) ئەم شیعرەمان لە لاپەڕە ٢١٩ی ئەو کەشکۆڵەوە وەرگرت کە نەجمەددین مەلا ساڵی ١٩٣٧ بۆ (محەممەد ئەمین حەمە صالح ئاغای قزلجی) نووسیوە. نەجمەددین مەلا لە سەرەتای شیعرەکەوە نووسیویە «لە ساڵانی ١٣٤٣ی هـ کە شێخ مەحموود جەیشی عەرەبی لە شارەزوور شکاند، حاجی تۆفیق بەگ ئەمەی فەرمووە» ئنجا بۆیە من نووسیومە کە پیرەمێرد بەیادی ئەو شەڕەوە شیعرەکەی نووسیوە چونکە ساڵی ١٩٢٢ یاخود ١٩٢٤ پیرەمێرد لە تورکیا بووە. وە لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٥ دا گەڕاوەتەوە.

(٢) ڕۆژنامەی (العراق)ی: ئەو سەردەمە هێزی کۆنەپەرستی عەرەب و بەریتانیای داگیرکەر دەیبرد بەڕێوە نووسیبووی کە کورد ئەرمەنییە!!

***

## دەنگی وەتەن[1]

١٩٢٤

لە ئەستەمولەوە هەڵسام، لە خەودا بووم، هەتا ئێرە
لەسەیری (في المنام) دابووم، کە چاوم کردەوە لێرە
حەیاتێکی ترم دی، خزم و خوێشان دەورەیان دابووم
سەرلەنوێ هاتمەوە دنیا، بەڕۆح وەک تولفی[2] ساوابووم
ئەمە دوو ڕۆژە جەژنی ڕۆحمە، دەنگی وەتەن دەبیەم
خودا دیداری ئێوەشم نسیب کا، زۆر ئەبینێ پێم
هەواڵی ئێوە چۆنە؟! بێمەوە؟ یا ئێوە دێنە لام
نسیب ئەیزانێ، چەند ڕۆژێکی تر، مەعلوم ئەبێ ئەنجام

........................................

(١) مامۆستا محەممەد ڕەسول هاوار: لە بارەی ئەم شیعرەوە لە لاپەڕە ١٧ی دیوانی پیرەمێرد نووسیویە:- «شێخ مەحموودی مەزن ئاڵای شۆڕشگێری و داواکردنی مافی گەلەکەی هەڵکردبوو، پیرەمێرد لە پرسینی حاڵ و ئەحواڵی ئەو سەردەمەی کوردستان ئەم چەند دێڕەی بۆ یەکێک لە خزمەکانی لە شاری سلێمانی کە «مستەفا سائیبی» خوشکەزای بووە ناردووە. ئەو هەڵبەستەم لە دەستخەتێکی خۆیەوە وەرگرتووە، لەژێریەوە نووسراوە «خاڵی باکماڵی بێ حاڵت» هەرچەندە مستەفا سائیب ئەڵێ ئەم هەڵبەستەی لە تورکیاوە ناردووە بەڵام من لێی





دوودڵم، چونکە لە مەعنای هەڵبەستەکەیەوە لەوە ئەچێت کە لە جێگەیەکی نزیک کوردستانەوە ناردبێتی و لا من وایە لە تورکیاوە گەڕاوەتەوە بەسەر شام و حەڵەبدا هاتبێتە بەغداد و چەند ڕۆژێک لە بەغدا ماوەتەوە و لەوێوە ئەو هەڵبەستەی ناردووە بۆ مستەفا سائیب».

(٢) لە کوردیدا باوە دەڵێن -تولف- واتە منداڵی ساوا کە لە ڕاستیدا لە -طفل-ی عەرەبییەوە وەرگیراوە.

«ڕۆحم فڕی، لەسەراوردی بەرزی نیشتمانەوە، بێدەنگ و سەنگ[1]
وام زانی کە ئەم کۆنە مەڵبەندە ئەکاتەوە بەشوێنی دەنگ
بووبوون بەیەک، لەش و ڕۆحم، بۆ دیدەنی دۆستایەتی کۆن
ناڵە و نەوای دڵم بوو، داخم، لانەی بەڕۆحەکە هێنایە تەنگ
١٣١٧ی ڕۆمی/١٩٠١ی زاینی

........................................

(١) ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٨ی دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بەتورکی بەخەتی پیرەمێرد لەژێر وێنەیەکی سەردەمی لاوێتی خۆیدا لە تورکیا نووسراوە. بەڵام ڕوون نییە کە ئایا پیرەمێرد خۆی کردوویە بەکوردی یاخود کەسێکی تر.

## بەبۆنەی دەرچوونەوەی گۆڤاری گەلاوێژەوە

ئۆخەی گەلاوێژ[1] وا دەرکەوتیەوە
وەک چرای بەختی، کورد سەرکەوتیەوە
یانەی سەرکەوتن[2] بەتۆ ڕووناکە
کوردستان بەڕووی، تۆ فەرەحناکە
شەوقی دیدارت ڕووناکی چاوە
ئیتر تەوژمی گەرما نەماوە
گوزەرگات بورجی (دار السلام)ە[3]
دیاری ژین بۆ تۆ، دوعا و سەلامە

........................................

(١) گۆڤاری گەلاوێژ تەمەنی دە ساڵ بوو ١٩٣٩-١٩٤٩ لەو ماوەیەدا گەلێ جار تووشی گیروگرفتی داخستن و بێ پارەیی بووە. ئەم شیعرەی پیرەمێرد بۆ دەرچوونەوەی سەر لەنوێی گۆڤارەکەیە دوای داخستنی. دیارە ئەمە لە ساڵانی پێش ١٩٤٩ دا بووە چونکە لەو ساڵەدا بۆ هێجگاری داخرا. هەروەها گەلاوێژ ئەستێرەیەکە دوای چلەی هاوین دەردەکەوێت.

(٢) یانەی سەرکەوتن: ڕۆشنبیرانی کورد لە بەغدا پێکیان هێنا.

(٣) دار السلام: واتە شاری بەغداد.

***

## بەستن

لە کۆمەڵی کۆنی دواکەوتووی کوردەواریدا پڕوپووچێک هەبوو، پێیان دەگوت (بەستن) واتە لە کاتی ژن هێناندا کە بووک و زاوا دەچوونە پەروەردە، کابرا نەدەبوو بە زاوا و کارەکە هەندێک دوا دەکەوت. هەندێ پڕ و پیرێژن بەپارە گوایە ئەو گیروگرفتەیان چارەسەر دەکرد. بەڵام لە مێژە زانست هۆی ئەمەی دۆزیوەتەوە و شتەکە یا هۆی دەروونیە یاخود ناتەواوییەکی لەشە. وە موفتی پێنجوینی شاعیر لە یەکێ لە شیعرە کۆمەڵایەتیەکانیدا باسی ئەو دەردی دواکەوتنەی کردووە پیرەمێرد لە ڕۆژنامەکەیدا شیعرەکەی بۆ بڵاو کردۆتەوە و هەروا بۆ تام و قسەی خۆش چەند بەیتێکی خۆی وەک جۆرە وەڵامێک بۆ شیعرەکەی موفتی نووسیوە، وە باسی ئەو پیرەژنەی کردووە کە لە سلێمانی ئەو بەستنەی دەکردەوە و ناوی دادە عاسم بووە:

«تا دادە عاسم، لە دنیا مابێ
ڕووی قەدی سپی، خوای لێ ڕەزا بێ
سلێمانیشمان، لەگەڵ ئەترافی
عائدی ئەوە خۆی و ئینسافی
چۆنی ئەبەستێ، یا ئەیجەڕێنێ
هەر کار دروست بێ و زوو بیپەڕێنێ
خۆ ئەو شێخ نەبوو بەحوکمی دوعا
جن و دێوەکان موسەخخەر بکا
کەوابوو مەعلووم حیکمەتی تیایە
خۆت لادە ئیتر تۆ لەم بەلایە!

***

## دە، شت

دە، شتم هێند لاگرانە، ڕاستی پێی سەختم تەواو
ناری عاشق، نوێژی فاسق، کیبر و خۆ بادانی پیاو
دەردی بەرتیل، ڕووی بەخیل، گاڵتەی ڕەزیل، ئەرکی دەلیل
دەنگی ناسازی موئەزین، برسێتی و هەوراز، بەدیل
دەردی سەر ئەم نۆیە، دەردی سەریە بۆ ئەم عالەمە[1]
لێرە نازی[2] نازیکەر[3] پێیان بڵێی هیتلەر کەمە

........................................

(۱) لە نوسخەی لای ئێمە دا ئەم بەیتە بەم جۆرەیە:



«نازونووزی تازە پیاکەوتوو لەگەڵ ئەم عالەمە
لێرە نازی نازییەکان پێیان بڵێی هیتلەر کەمە»

(۳,۲) نازی یەکەم واتا نازکردن. نازی کەر: ئەوانەی سەر بەنازییەکانن، کە خۆیان بەگەورە دەزانن و لە هیتلەر یان گەورەتر پێ بڵێی هێشتا بەلایانەوە کەمە.

***

## چاو[1]

۱۹٤۹

چەند تاکە بەیتێکی پیرەمێرد کە بەشێوەی وردەکاری سەبارەت بەچاو نووسیونی:

«قەدم کەوانە، دڵ بە(قەد)ی تۆیە چاوەڕوان[2]
میوانی (تیر)ی خۆشتر ئەوێ، خانەخۆی، کەوان»

«ئەگەر چاوم بەتۆزی ڕێت بڕێژم
بە فرمێسک، داری توبای تیا ئەنێژم»

«لە دڵما، تا خەیاڵی چاوی کاڵە
هەموو عالەم لە پێش چاوم خەیاڵە»

«تەلی چرایەک لە چاوی تۆوە، بۆ کونجی دڵم ڕاکێشراوە
ئەو دەمەی تۆ ئەڕوانیتە من، تەلی کارەبای دڵم پچڕاوە»

«شیعری بڵند کە تەعلیقی ئیلهامی پێوەیە
ئیلهامی شیعری من، لە نیگای چاوی تۆوەیە»

«چاو کە دەردی دووری تێکەوت، ئارەزووی گریان ئەکا
نیوە موویەکیش کە کەوتە چاوەوە، هەر ژان ئەکا»

«تۆ لە پێش چاوم نەمای، گیانیش لە لەشما دەرچووە
هەروەکو ئاوێنە سوورەت لاچوو، عەکسیش لاچووە»

«بە چاوی مەستی هۆشی لێ فڕاندم، عەشرەت هاوارە
نەخۆش ساغ ڕووت ئەکا، بێ حاکمە شێواوە ئەم شارە»

«کاغەزێکی سپیە، ناردم، تێبگە مەعنای چیە
چاوی من بەدڕەنگە سپیە، چونکو چاوی لێت نیە»

«چاوت دووکەڵی لێ دێ، بڕۆ لە دوورەوە مەمێنە
چونکە ئەو دووکەڵە، قرچەی دڵمە، ئاگری لەشوێنە»

(١) ئەم شیعرانە لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە ٢ی ساڵی ١٩٤٩دا بڵاوکراوەتەوە کە پیرەمێرد خۆی ناردویێتی. وەکێشی هەر بەیتێک لەوی تر جیاوازە.
(٢) ئەم بەیتە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## لای لایە بۆ مناڵ

لە پێشەکی ئەم شیعری لای لایەی مناڵەی پیرەمێرددا مامۆستا محەممەد ڕەسول هاوار نووسیویە:- «لای لایە بۆ مناڵ شتێکی زۆر کۆنە هەموو گەلێک جۆرە لای لایەیەکی هەیە بۆ ئەوەی مناڵەکانیان خەو لێ بخەن.

لە کوردستانی خۆشمانا، لای لایە زۆر کۆنە و لە دێرزەمانەوە کە مناڵی کورد خراوەتە ناو جۆلانەوە، کە لە بەینی دوو لقی دارا بۆی هەڵخراوە یاخود نراوەتە ناو بێشکەوە و بەدەسرازەی بەنی ڕەنگاوڕەنگ پێچراوەتەوە هەندێک خرخاڵ و شتی سەوز و سووریان بەکەمەی بێشکەکەدا شۆڕ کردۆتەوە لەگەڵ هەندێک حەتحەتۆکە، کە هەریەکەیان شتێکی بۆنخۆشیان تێ کردووە بەتایبەتی سمڵ و مێخەک. مناڵی ئەوسا وەکو ئێستە نەبووە، وەکو چۆن هێشتا لەناو زۆربەی دێهاتەکانی ناو خۆشمانا ماوە، کە مناڵ نەخۆش کەوت دایک و باوکی بیباتە لای دکتۆر و دەرمانی بۆ بکرێت، بەڵکو دەرمان هەر دەرمانی پرۆپیرێژنان بوو. مناڵی سک یەشاو گوڵە بەیبوونیان بۆ کوڵاندووە و داویانەتێ، مناڵی سکچوو سملیان کوتاوە و دەرخواردیان داوە. گوێ یەشاو دووکەڵیان کردووە بەگوێچکەدا یاخود ڕۆنیان داغ کردوە و کردوویانەتە گوێی بۆ ئەوەی ژانی بشکێ. مناڵی لەرزوتا لێ هاتوویان بردۆتە سەر شەخس و تاوە بەنێکیان کردۆتە دەستی. شەوانی دوور و درێژی پایز و زستان، مناڵی گڕوز و برسی، هەتاکو بەیانی گریاوە و کڕووزاوەتەوە. دایکیش بەدەم وەنەوزی خەوەوە بەناچاری دەستی کردووە بەلای لایە بۆ ئەوەی





مناڵەکەی خەو لێ بخات. بەتایبەتی کە تەمەنی ئەو مناڵە ئەگەیشتە یەک ساڵی و لە هەند قسە ئەگەیشت، ئیتر دایکی هەڕەشە و ترسی تێکەڵ ئەکرد بەلای لایە بۆ ئەوەی مناڵەکەی بترسێ و بێدەنگ بێت، بۆ ئەمە باسی گورگانە شەوێ و ئایشە گوێدرێژی بۆ ئەکرد. هەندێک لە شاعیرانی کورد بەدەم دایکانەوە لای لایەیان کردووە بەهەڵبەست وەکو قانع و بێکەس، پیرەمێردیش بەدەم یەکێک لەو دایکانەوە ئەم لای لایەی خوارەوەی کردووە:

گورگانە شەوێ، گورگانە شەوێ
بەرخە بچکۆلەکەم خەوی لێ بکەوێ
لوورەی تۆی ناوێ، لای لایەی ئەوێ
ئەڵێ لە ماڵی ئێمە دوور کەوێ
بچۆرە ماڵی (ئەبوو یابوو)
حوشترەکەی، بکە بەتێشوو
یابوەکەی بخەرە، ناو چاڵی گوو
خۆی لێرە دەرکە زوو بەزوو
پیاو خۆرە زلە، پیاو خۆرە زلە[1]
کۆرپەکەم لەگەڵ دایکیا دەست لەملە
مڕەی تۆی ناوێ، هۆگری بولبولە
هیچت بەلووتەوە نابێ، لەم گەرد و خولە
دوورەوەکەوە، تا نەیان داویتە بەر گوللە
ڕووبکەرە ماڵی (ئەبو جاسم)ەکان
یەکێکیان بکە بەکوچکی گوێ ئاگردان
ئەوی تریان بخەرە شیوی کۆڵان
بەڵکو دەست بەردەن لە یەخەمان
کەمتیاری سم پان، کەمتیاری سم پان
ڕۆڵە شیرینەکەم، نووستوە لە هەیوان
سپاردوومە بەپێغەمبەر و یەزدان
سپاردوومە بە ئایەتی قورئان
با حەچەی تۆ ببڕێت لە گوێمان
بچۆرە ماڵی کوللە خۆرەکان
زمانی بەدیان ببڕە بەددان
چاوی ژنەکەی کوێر کە بەبێڵەکان

بەشکو بەجاریٚ ببنەوە لەکۆڵمان
بۆ خۆمان بیٚ گیچەڵ بین لە وڵاتی خۆمان

(١) شیعرەکانی ئەم لای لایەیە لە بارەی کیٚشەوە وەک یەک نییە. تەنانەت لە زۆر جیٚگادا نیوە دیٚڕەکان لەگەڵ یەکتر کیٚشیان جیایە.

***

## کەشتی، پاپۆڕ

لە دار و ئاسن و ئاگر، شتیٚکم دی لەناو ئاوا
سرەوتی نابیٚ ڕۆژ و شەو، چە خۆر کەوتن، چە خۆر ئاوا
لەیەک بین ڕادەکا بەو ئاوەدا، وەک ئەسپی پڕتاوە
لە ئاوایە و ئەمەندە تینووە، ناو جەرگی سووتاوە
لەسەر ئەو تینوەتیەشدا، ئاو گەیشتە قوڕگی خنکاوە
سەر و پیٚ و دەست و چاو گوێی نییە، بیٚ ڕۆحیشە و ئەڕوا
بە جاریٚ شاریٚ هەڵدەگریٚ، کەچی هیٚشتاکو جیٚ ماوە
نەڕەی وەک شیٚرە، سەد شیٚر و نەهەنگی بەحر ئەترسیٚنیٚ
بە چالاکی وەکو بازە، کەچی بیٚ بازوو و هەنگاوە
بەسەر پشتا تەرات ئەکریٚ، ئەمەندە سەختە نالەخشیٚ
لەپیٚشدا کاروانی بۆ دەهیٚناین لەو پەڕی دنیاوە
لەژیٚر بەحرا، بەگوللە ئەیکوژن، ڕیٚی ڕاستی گیراوە

***

## دنیا، دەستکەوتن

جاریٚک لەکویٚستان لەدەم کەلی خان
سەرخەوم شکان هەندیٚک لەپاش نان
ژیٚر ڕاخەر نەبوو، بنووم لە سەری
یەک دوو کەلەرمم، لەبن دار بڕی
ڕام خست بەیادی لەش و لاری یار
وەک کلووی سپی نازک و نازدار
کە ئەبزووتمەوە، ئەو جیڕەی ئەهات
بەو جیڕە جیڕە، کەوتمەوە ئاوات



خۆزگە لەشیٚکی ناسکی وام ئەدی
بەڵام خەویٚک بوو بۆم نەهاتەدی
ئەمڕۆ یەکیٚکی لەش سپی و نازک
گۆمەتەی ئەدا ویٚنەی کار ئاسک
بە دەورما ئەهات، ها بگرە و بیٚنە
وەک چۆلەکەکەی شوان خەڵەتیٚنە
ئەچووم بەشویٚنیا، ئەو قونەی ئەکرد
ها لیٚرە و لەویٚ دەستم بۆ ئەبرد
جرتیٚکی کیٚشا و وتی من دنیام
کاتیٚکم زانی لە چۆڵ و تەنیام
دنیا دەستکەوتن خەیاڵی خامە
ژنیٚکە وەسڵی هەر ئیحتلامە!

***



## کیژۆڵەی خویٚندەوار[١]

کچیٚک بوو، ناوی جەمیلە
جوان و ناسک و نەشمیلە
عومری یا نۆ، یا دە ساڵ بوو
زۆر زیرەک و بەکەماڵ بوو
لە کاری ناو ماڵ زانا بوو
هەتاکو بڵیٚی وریا بوو
ڕۆژیٚ لە ماڵ هاتە دەریٚ
نەختیٚ بەتەنیا بگەڕیٚ
هەڵسا چووە دەرکی سەرا
نەرم و نیان و بەحەیا
سەیری ئەترافی نەئەکرد
نەخیٚرا ئەڕۆیشت و نەورد
لە ڕیٚ تووشی پۆلیٚ کچ بوو
هەر ڕۆی تا لیٚیان نزیک بوو

گوێی گرت لەباس و قسەیان
هیچ تێنەئەگەیشت لێیان
یەکیان ئەیوت (ئیستیوا)
خەتێکە ئەرز دوو کەرت ئەکا
ئەوی تر ئەیوت خەتی تووڵ
سێ سەد و شەستە بەئوسوڵ
یەکێ ئەیوت عەسری ئەقتاع
پاپای ئەوروپا، بۆ تەماع
هەزار ئیشی گەندی ئەکرد
هیچ کەسێ مەنعی نەئەکرد
جەمیلە کە ئەمانەی بیست
عیلم و زانستی ئەویست
زۆر بەزەیی هات بەخۆیا
کە بێ بەش بوو لە خوێندنا
ئەویش گەر خوێندەوار بوایە
دەبوو گشتی بزانیایە
چووە ماڵێ بەغەمگینی
بە پەشێوی و بێ شیرینی
دایکی وتی نازەنینم
بۆ چ وا پەشێوت ئەبینم؟
چی قەوماوە، چی ڕوویداوە؟
دڵت لەسەر چی شکاوە؟
پێمان بڵێ لە چیت کەمە؟
چیت گەرەکە، بۆ چیت غەمە؟!
گوارە و کرمەک و لاگیرە
(صباح الخیر) و پێنج لیرە
گەردنلغ و بازن و گۆ
قاپ قورئانت[۲] هەیە تۆ
لە بەرگیشا خۆ تەواوی
ئیتر بۆچی پەشۆکاوی؟!



وتی: دایکی خۆشەویستم
لە هەموو شت کار دروستم
بەڵام هەر خوێندنم کەمە
کە زۆر ئیحتیاجم بەمە
عەیبە بۆ من کە جاهیل بم
لە ژیانا بێ حاسڵ بم
وتی: کچی نازپەروەرم
بەسەر ڕۆح و بەسەر سەرم
باوک بێتەوە ئێوارە
لەم ڕووەوە ئەیکەم چارە
بەڵکو بتنێرێتە مەکتەب
فێر بی عەقڵ و عیلم و ئەدەب
ئێوارە باوکی هاتەوە
دایکی زوو چوو بەلایەوە
قسەی جەمیلەی تێگەیان
وتی بەسەر ڕۆح و بەگیان
هەرچی جەمیلە ئەیەوێ
منیش ڕازیمە و ئەمەوێ
کچیان خستە مەکتەبەوە
بە دڵێکی فەرەحەوە
کچە ئەوەندە سەعی کرد
هەتا یێکەمێنی وەرگرت
هەموو ساڵ بەسەعی و هونەر
بە یەکەمی ئەهاتە دەر
هەتا هەشت نۆ ساڵی پێچوو
کچ لە مەکتەب تەواو دەرچوو
کرا بەدختۆری ژنان
ناوی دەرچوو لە گشت جیهان
بە مەدحەوە باسیان ئەکرد
بە بڵندی ناویان ئەبرد

هەرچی لە مەکتەب تێکۆشی
بەرگی شەرەفی ئەپۆشی
هەرچی نەزان و تەمەڵە
خوار و بێ قەدر و دەفەڵە

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بلاونەکراوەتەوە.
(٢) قاپ قورئان: ملوانکەیەکە لە ئاڵتون. قوتوویەکی بچووکی پێوەیە کە قورئانی تیایە.

***

## عیزرائیلی بەهەشتی[1]

عیزرائیلی بەهەشتی
کوڵی نایە سەر پشتی
پیاوێ بوو زۆر فەقیر بوو
سەرڕای فەقیری، پیر بوو
خاوەنی ماڵ و منداڵ
نەیبوو نانێ، لەناو ماڵ
بە ئارەقی ناوچەوان
بە قووەتی پاڵەوان
دەچوو چیلکەی ئەهانی
بۆ نانی، منداڵانی
هەموو ڕۆژێ بەیانیان
ئەچوو بۆ کێو و شاخان
ئەوەندەی خۆی ئەیتوانی
داری ئەنا لە شانی
داری ئەدا بەپارە
ئەیدا بەنان بێچارە
ڕۆژێ لەژێر کوڵەدار
لە گیانی خۆی بوو بێزار
لەشی پڕ بوو لە عەرەق
هەردوو چاوی بوو ئەبڵەق




داری دا بەسەر بەردا
بەردی دا بەسەر ئەردا
کوڵەکەی کەوتە ئەردی
زاهیر بوو ئاهی سەردی
بانگی کرد یا عیزرائیل
تۆ بێرە لام بەتەعجیل
ڕۆحم ناوێ بەم حاڵە
چیبکەم، لەم عومرە تاڵە
قسەی لەناو دەما بوو
عیزرائیل لێی پەیدا بوو
وتی منت بۆ چییە ؟
ئەم هاوارەت لە چییە ؟
پیرە لە ترسی گیانی
جوابی قسەی نەزانی
واقی وڕما مامەی پیر
وتی هەر تۆی دەستگیر
لەژێر کوڵی گرانام
لەگەڵ داد و فوغانام
بۆیە هاواری تۆم کرد
فریام کەوی دەستوبرد
عیزرائیلی بەهەشتی
کوڵێ نایە سەرپشتی
ئەمجا پیرە بەیەک غار
کوڵەی فڕاندە ناو شار

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بلاونەکراوەتەوە.

***

## بالۆڕێ[1]

١٩٤٤

(مەلای مەزبوورە) چووبووە سەر دارێ
لقێکی ئەبڕی بیکا بەبارێ
ئەیویست ئەو لقەی خۆی وا لەسەری
لە بندا بیبڕێ عەقڵی وای بڕی
ڕێبوارێ پێی گوت، مەلای سەردارێ
ئەو لقە ببڕی ئەکەویە خوارێ
مەلا لێی نەبیست، سا ئەو بەڕێ بوو
ئەم لەگەڵ لقدا سەرەنگرێ بوو
کە کەوتە خوارێ، وتی ئەم پیاوە
لە غەیب ئەزانێ و وەلی تەواوە
وای کرد، چوو پێی گوت کەرامەتداری
تۆ کە زانیت من ئەکەومە خواری
ئەڵبەت ئەیشزانی کە من کەی ئەمرم
تو خوا پێم بڵێ، لە بەرت مرم
وتی، عومری تۆ، پێت بڵێم چەندە
بەسێ بای سکی، ئەو کەرە بەندە
منیش بەوانەی کە (قوپون) ئەکرن
ئەڵێم، لقی ژێر خۆتان ئەبڕن
میللەت دارێکە، کە سێبەردارە
چۆن لق و پۆپی، ئەشکێ ئەو دارە
دەستی داد زۆریان ئەخاتە خوارێ
کەچی عار نانێن، بەکەوتن جارێ
وا چاکە بەداخ نیشانەیان کەین
کە عاریان نەنا، ڕەوانەیان کەین

..........................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***



## قافیەی بەجرت

١٩٣٩

دوێنێ لە بازاڕ لەناو گوزەردا
جاڕی دوو خانی شەرقیان ئەدا
کوڕێک بەسیما و چاکەت و پانتۆڵ
سەرێکی ڕووتی، بەزوڵف و کاکۆڵ
بە عارەبیی ساف، بەدەنگێکی ڕەق
ئەیوت (ادخنوا من دخان الشرق)
لەگەڵ وتی شەرق، شرق، شرق لە دواوە
یەکێک جرتێکی وای بۆ بەر داوە
ئەفەندی ئاوڕی دایەوە و منداڵ
ڕای کرد و کابراش لە دووی کەوتە باڵ
ئەم خەڵکە هەموو کردیانە هەرا
پێچە بەدەورەی کرد لە گوزەرا
قوڕ گیرابوەوە بۆ سواغی دوکان
کەوتبووە سووچێ، نەیاندی هیچیان
منالّی پێخاوس، هیچ باکی نەبوو
نەچەقیە ناو قوڕ سووکێ بۆی دەرچوو
بەڵام ئەفەندی بەقۆندەرەوە
چەقی و نەیتوانی بێتە دەرەوە
تەکانی خۆی دا، لەپەو ڕوو بۆی کەوت
هاتە دەرەوە، وەک دەعبای ئەشکەوت
هەموو دوکاندار، ئاویان پیا ئەکرد
هەر چەندێکیان کرد قوڕیان لانەبرد
ئافەرین منالّ لەگەڵ قافیەت
هەر بژین لەگەڵ عومر و عافیەت

***

## گاڵتەی بەڕاست[1]

**١٩٣٩**

(خدر) بوو پیاوی، (حەسەن ئەفەندی)
کەس پێی نەئەگوت کەرت بەچەندی
کوێخای دەرگابوو، جێی خواجانشین
فەرەنجی پۆش بوو، زستان و هاوین
ڕەنجبەری ماڵێک ڕۆژێ نەخۆش کەوت
ناچار ئەو ڕۆژە بێگاری بەرکەوت
پێنج کەری ئەبرد بۆ دێی (کەڵەکن)[2]
کە لەسەر خەرمان، کای بۆ دابگرن[3]
لە ڕێ خۆی سواری کەرێکیان بووبوو[4]
کە ئەیژماردن، هەر چواریان مابوو
وتی، ئای خۆم، پێنج کەرم پێبوو
وا چواریان دیارە، ئەوی تر کوێ چوو؟!
دابەزی و ڕای کرد یەکسەر بۆ دواوە[5]
وایزانی، کەرە، لە دواوە ماوە
بۆ دواوە ڕوانی، هیچ دیار نەبوو
گەڕایەوە لای کەران زوو بەزوو
کە تەماشای کرد، پێنج کەر تەواوە
لەم فەن و فێڵە، سەری سووڕماوە
زۆر ماندوو بووبوو، دیسان سواربوەوە
لە بەرەو ژێرە سەرەوخوار بوەوە
دیسان کە ڕوانی کەر چواریان ماوە
گریا، وتی: من چیم لێ قەوماوە؟!
خۆی خستە خوارێ بەدوعا و نزا
ئەپاڕایەوە، لە بارەگای خوا
دوعای گیرا بوو، ڕوانی کەر پێنجە
ڕزگاری بووبوو، لەم دەرد و ڕەنجە



ئیتر نەیتوانی بڕوات بەپێیان
خۆی هەڵدایە سەر کەرێکی تریان
دووبارە بەزمی لێ هاتەوە دی
وتی ئەمجارە کەرە گورگ خواردی
هەروا لێی خوڕی گەییە نیوەی ڕێ
بەرەو پیری هات، خلەی کوێخای دێ
بانگی کرد کوێخا، لە دەورت گەڕێم
لە کوێوە خوا تۆی، گەیاندە سەر ڕێم
ئەمڕۆ جنۆکە، گاڵتەم پێ ئەکەن
جاری کەرێکم ئەدزن و ئەیبەن
وتی خدر ئاغا چەند کەرت پێ بوو؟
چەندیان ماون، چەندت لەکیس چوو؟
وتی، پێنج کەرم هێنابوو لە شار
کە ئەیژمێرم، هاتۆتە سەر چوار
کوێخا تێگەیشت کە گونی و گێزەر
لێک ناکاتەوە کابرای قوڕبەسەر
ئەو کەرەی کەوا خۆی سواری بووە
چونکە نایبینێ، لەبیری چووە
وتی دابەزە، هەی بەندەی بێ غەش
پێنجی بۆ ژمارد، خۆیشی کرد بەشەش

........................................

(١) ئەم شیعرە لە چیرۆکێکی مەلای مەزیوورەوە وەرگیراوە.
(٢) کەڵەکن: دێیەکە لای ژوورووی سلێمانییەوە.
(٣) کای بۆ دابگرن: واتە کا لە ڕەشکەدا بپەستنەوە بۆ بار کردنی.
(٤) لای م. هـ نووسراوە لە ڕێ خۆی سواری یەکێکیان بووبوو.
(٥) ئەم بەیتە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## دەرسی مەلای هەیاسی[1]

قل أعوذ، تۆ بێژە
شەو کورتە و ڕۆژ درێژە

بۆیە پیاو گێژ و وێژە
هەرچی ئەکرێت بیچێژە
شیر کە ترشا بیرێژە
ژن کە پیر بوو بینێژە
بێ دراو[2] کوشتەی نوێژە
پارەدار زەینی تیژە[3]
درەو درەوی لێژە[4]
گۆشت گۆشتی مەڕی گێژە
تام لەلای ژنی درێژە
باوی بێ ڕۆژوو و نوێژە

(١) مامۆستا م. هـ دەربارەی ئەم شیعرە لەلاپەڕە ٣٩٤ی دیوانی پیرەمێرد دا نووسیویە: (مەلاکان) بەتایبەتی مەلای کۆن هەموو نوکتەبازبوون و حەزیان لەم جۆرە هەڵبەستانە کردووە، لەبیرم دێ کە منداڵ بووم، ئێواران مەلاکان لەسەر سەکۆی مزگەوتی (شێخ بابا عەلی) لە گەڕەکی (سەر چیمەن)ی سلێمانی کۆ ئەبوونەوە و (شێخ بابا عەلی)یش کە بەنوکتەبێژ بەناوبانگ بوو، هەموو دەستیان ئەکرد بەدەمەتەقێ و نوکتە پیرەمێرد ئەو هەڵبەستەی بەدەم یەکێک لەو جۆرە مەلایانە وتووە.

(٢) بێ دراو: بێ پارە، واتە کە پیاو لات بوو سەر ئەکاتە سەر نوێژ کردن.

(٣) زەینی تیژ: واتە زیرەک.

(٤) درەوی شوێنی لێژ: ئەوانەی کە درەو ئەکەن شوێنی لێژیان زۆر پێ خۆشە. چونکە سەر بەرەوخوار درەو ئەکەن و زۆرماندوو نابن.

***

## دوێنێ شەو شەیتان

١٩٤٣

دوێنێ شەو، شەیتان، هات بەپێکەنین
وتی، ئیعلانم هێناوە بۆ ژین
خۆت کەڵکت نییە، پێت پێناکەنم
نایەم بەلاتا، وەک خاڵۆژنم
ئیعلانی دانا و سووکێ بۆی دەرچوو
ڕوانیم مەئالی، ئیعلان ئەمە بوو
تاقمی (زەبانیە)ی جەهەننەم بیستن
ئێستا نۆزدەیان هەیە بەبیستن



قورئان فەرموویە: تسعة عشر
یەکێکیان کەمە کار ناچێتە سەر
مانگانەی ئەوان هەزار دینارە
کێیە تالیبی چوونە لەم شارە
هەر مانگی هەزار دینار کەم نییە!
بۆ ئەربابی خۆی خراپی چییە؟
وا ئێمە بەژین ئیعلانی ئەکەین
چوار شەرتی هەیە، بەیانی ئەکەین
شەرتی یەکەمیان ئەبێ بەدکار بێ
نابێ بەکردەی چاک لە کەداربێ
دووەم بەلەشی پیس ڕاببواردبێ
نەخەڵەتابێ، نوێژی کردبێ
سێهەم هەرچی پێی ئەڵێن موسکرات[1]
قەت بواری نەبێ، بیست و چوار سەعات
چوارەمیان نامووس، لای مێشوولە بێ
سوێندی بەشەرەف وەک پەپوولە بێ
ئەمجا هەر کەسێک ئەیەوێ بچێ
ڕاکا بۆ ئەوەی لەکیسی نەچێ

(١) موسکرات، مسکرات: هەموو جۆرە خواردنەوەیەک کە ئەو کەسە مەست بکات.

## مەلا سێ پارە[1]

١٩٣٩

پیاوێک بوو ناوی مەلا سێ پارە بوو
دەستەپاچە و مانگر و پەتیارە بوو
خەڵک وتی بادانەنیشێ وا بەتاڵ
هێنایان کردیان بەمامۆستای منداڵ
ئافرەتێکی بوو، کەتەی چل شووکەرە
دەم شڕ و تەڕپیر و پەردە لابەرە
چۆپی کێشی ڕەشبەڵەک، بەربووکی بووک
دڵ بەجێ هێنەر، بەمەکر و نووکە نووک

چل قرانی بوو، بەمامانی و خەڵات
بۆ مەلا ئەیدا بەکەر کاروان بکات
پارەکەی وەرگرت مەلا ڕووی کردە شار
دای بەگوێدرێژێکی ڕەختەی خەرجی بار
هاتەوە هەوساری بەستە قۆڵی خۆی
سێ کەسی چوختی بەپیلان کەوتنە دوی
هات یەکێکیان کەوتە لنگە و چەند و چۆ
تا مەلا یەکجاری غافڵ بێ لەخۆ
دووهەمین ڕەشمەی لەسەر کەر کردەوە
خستیە سەر خۆی، لەنگەری بۆ گرتەوە
هەر بەپێودانی کەرە هەنگاوی نا
تا ئەوی تر هات کەری بردە پەنا
سێهەمین گوێدرێژەکەی دوور خستەوە
کەر برا هێشتا مەلا ئەیپرستەوە
پیاوەکەی بووبوو بەکەر خۆی ڕاتەکان
ڕەشمەکەی خۆی گرت و هەوساری پسان
کاک مەلا ئەو سایە ئاوڕی دایەوە
چاوی کەوت بەو پیاوە هەڵوێستایەوە
بانگی کرد من تۆم کڕی کەر بووی کەچی
ئێستا وا دوو پێت هەیە و لە پیاو ئەچی
پێی وت ئینسانم بەڵام زۆر توند خووم
شێت و نادان بووم بەگژ دایکما ئەچووم
ڕۆژێک لێم دابوو، دوعای کرد بووم بەکەر
چەند لەژێر باری گرانا، بردمە سەر
ئێستە چاوی کەوت بەمن ڕەحمی بزووت
وا دوعای کرد بووم بەپیاو لووت و بزووت
باوەڕی پێ کرد وتی: لاچۆ بڕۆ
قەت بەعەقڵی خۆت مەبە ئیتر خەڕۆ
خۆیشی چوو بۆ دێ قسەی گێڕایەوە
کەوتە دەم خەڵکی، کە دەنگی دایەوە



خەڵک لەلایان خۆش بوو، باربووی بۆ کرا
پارەیەکی زۆرتری بۆ ڕێکخرا
هاتەوە بازاڕ کە کەر بکڕێتەوە
تێفکری عەینی کەرە بۆی دێتەوە
چوو بەگوێیا وت بەسرپە و لۆمەوە
ئەو گوەی خواردووتە من نایخۆمەوە!

..........................................................

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی لەسەر چیرۆکێکی مەلای مەزبوورە ڕێکخستووە.

***

## بەیتی مشک و پشیلە

لەبیرمە جارێ، باوکم بۆ ئێران
بە سەفەر چووبوو، سەفەری خێران
هەندێ کتێبی بۆ من هێنابوو
بەیتی پشیلە و مشکیشی تیابوو
نووسیبووی ڕۆڵەی خاوەن ئەقڵ و هۆش
بیخوێنەرەوە بەیتی گوربە و موش[1]
پشیلە مشکی توخن نە ئەکەوت
بەفێڵ خۆی خستە کونجێکی مزگەوت
مشکان بەشایی و بەتلی لی لی
دیاریان بۆ برد بەقلی و بلی
مژدەیان ئەدا پشیلە عابیدە
نەزەر لە مێچکە، ناکا، زاهیدە
بەدڵێکی ساف لێی گردبوونەوە
بەدەست لەملان لێی وردبوونەوە
ئەیانوت ئۆخەی ئەو سمێڵ جوانە
چۆتە کلیلە، ئەم دەم و دانە
زۆریان پێ خۆش بوو کە نایانگرێ
پەلاماری دان، کەچی لەپڕێ



چوار و پێنجی گرت، بەڕاست و بەچەپ
سێ و چوارێکیشی هاوێشتە ژێر لەپ
تۆڵەی ئەو بەینەی پێشووی لێ سەندن
بەزیکە و جووکە، سەری هەڵکەندن
هەر چەندە سۆفی بەکەوڵ و پۆست بێ
چۆن باوەڕ ئەکەی جانەوەر دۆست بێ
خوویەک سروشتی ئەزەل بیبەخشێ
بەهیچ ناگۆڕێ، بەهیچ نابەخشێ
ئاین و ئۆینیش، زوو دەردەکەوێ
درۆزن زەحمەتە، ناشتای بەرکەوێ

........................................

(١) گوربە و موش: واتا پشیلە و مشک، ئەم بەیتە لە فارسییەوە وەرگیراوە.

***

## گوێ ئاگردان

پوورە تلێخان بزنێکی بوو
سبەینان بۆ بێرە ئەچوو
کێتەڵەی ئەبرد ئەیدۆشی
لەماڵەوە دائەپۆشی
ڕۆژێ مام ڕێوی دۆزیەوە
سەری لادا بەدزیەوە
مڵچە مڵچ شیری هەڵقوڕان
پوور تلێخان کلکی پەڕان
ڕێوی ڕای کرد بۆ ناو ڕێویان
لێیان کرد بەچەپڵە ڕێزان
هەی ڕێوی کلکی بڕاوە
ئێجگاری ئابڕووی تکاوە
ڕێوی هاتە لای تلێخان
لێی پاڕایەوە بەگریان



وتی کلکە قولێم وێدە
داپیر وتی شیرم پێدە
ڕێوی وتی شیرم نییە!
داپیر وتی، ئەی بز چییە؟
ڕێوی ڕۆیشت سەری کز کرد
خوازبێنی شیری لەبز کرد
وتی: بز شیر وەداپیردا
داپیر کلکە قولێم وێدا
بز وتی با دار گەڵا دا
گوانی بز لە شیر قەڵا دا
ئەمجا بز شیردا بۆ داپیر
کلکە قولێت بێتەوە گیر
ڕێوی هەڵسا چوو بۆ لای دار
گریا و دەستی کرد بەهاوار
دار وتی با کانی، ئاو دا
لقی من سەوز بێ و گەڵا دا
ڕێوی ڕووی کردە لای کانی
مشووری بەر ئەویش هانی
کانی وتی کیژ چۆپی کا
ئارەقی خۆی لە کانی کا
کانی ئەوسا ئاو بۆ دار دا
دار سەوز بێ و گەڵا بەبار دا
گەڵا بۆ بز بێ و بز شیر دا
لە تۆڵەی شیری داپیر دا
داپیر شیری دی لەجێدا
ئەوسا کلکە قولێی وێدا
هاواری بۆ لای کیژ هانی
کیژان بێنێ بۆ سەرکانی
کیژان کەوشی سووریان نەبوو
پەنایان بردە بەر کەوشدروو

کەوش دروو ناردیە لای مامر
هێلکەی بۆ بکا بەقڕە قڕ
مامر دانی لێ داوا کرد
هاواری بۆ بەر جوتیار برد
جوتیار دانی دا بەمامر
مامر چیکڵدانی بوو پڕ
بە گارەگار هێلکەی بۆ کرد
بۆ وەستای کەوش فرۆشی برد
وەستا کەوشی بۆ کیژ دروو
کردیانە پێیان زوو بەزوو
چۆپی لەسەر کانی کرا
لە کانی ئاو بۆ دار برا
دار گەڵای دا و بز شیری دا
ڕێوی شیری داپیری دا
داپیر کلکە قوڵێی دایەوە
بە بنێشتە تاڵ گیرسایەوە
ڕێوی چووە ناو ڕێویان
لێیان کرد بەگاڵتە کێشان
وتیان بۆنی بنێشتە تاڵ دێ
دەریان کرد هاتەوە بۆ دێ
دەستێ جلی جوانی دزی
کردیە بەر بەدەعیە و فیزی
هاتە ناو ڕێویان زوو بەزوو
وتیان هەی ئەمەت لە کوێ بوو ؟
وتی: لەبن گۆمێکایە
سەد ئەوەندەی تری تیایە
وەرن بچین نیشانتاندەم
وەک من دەری بێنن بەدەم
بردنیە سەر گۆمی سەر ئاو
یەکێکیان خۆی خستە بن ئاو



بە بڵقە بڵق ئەو دەخنکا
ئەم ئەیگوت وا بانگتان ئەکا
هەموو خۆیان تێ فڕێدا
بە جارێ خنکان لەوێدا
ڕێویش دنیای نەبردە سەر
کردەی بەدی خۆی هاتە بەر
ڕاوکەرێکی لێ پەیدا بوو
کوشتی و بازاڕیی کۆتا بوو
هەرچی وەک ڕێوی فێڵباز بێ
تووش ئەبێ، نابێ دەرباز بێ
خوا ڕاستە و ڕاستی لا خۆشە
چەوتی سەرەنجامی بۆشە

***

## مام چەوەندەر

١٩٢٦

مام چەوەندەر زێڕینۆکی
پیرێ بوو، دایم ئەکۆکی
شێفی دەبڕی لای ویڵەدەر[١]
بەردێکی گەورەی هاتە بەر
نووکی گاسنەکەی تێ گیران
بەردەکەی لەجێی خۆی جوڵان
کونێکی زلی لێ دەرکەوت
تاریک و قووڵ بوو وەک ئەشکەوت
بەپێ پیلکە چووە خوارێ
هەر ڕۆیی تا گەییە غارێ[٢]
حەوت کوپەی ئەڵماس و گەوهەر
کەڵەشێری ئاڵتون لەسەر
سەری کووپەکانی لادا
ئەڵماس شەوقی وەک چرادا

سەری کووپەکەی قایم کرد
دەستی بۆ ئەڵماسێ نەبرد
ئێوارە هاتەماڵەوە
بە خەپلەی هەرزنی تاڵەوە
ملی ڕاکێشا وەک گاجووت
جلەگای ڕاخست و لێی نووست
سبەینێ ڕۆژی لێ بوەوە
وەک ڕۆژان بۆ جووت چوەوە
جار جار سەری خەزنەی ئەدا
تا ساڵێ دەستی لێ نەدا
بەهار هات وەردی دایەوە
ماندوو بوو پاڵی دایەوە
ڕوانی گورگێ بەچەمەوە
وا هات، شتێ بەدەمەوە
لێی ڕاپەڕی بەپلارێ
شتەی لە دەم خستە خوارێ
کە دی منداڵێکی بچووکە
چاو داقڵیشاو بزبزۆکە
داینا و نەختێ بووژایەوە
ئەمجا کەچوو بەلایەوە
وتی: بەسووک تێم مەڕوانە
باوکم پاشای جنۆکانە
وادێ بەهەزار سوارەوە
جارێ منی لێ بشارەوە
کە وتی مژدەی چیت ئەوێ
تۆ مارەیی دایکمت بوێ
ڕوانی وا شای جنۆکان هات
بانگی کرد، کوڕم چی لێ هات؟
تاجی شاهیم بەسەرەوە



بۆ تۆ و کوڕەم بدەرەوە
جوتیار وتی لە تاج گەڕێ
مارەیی دایکیم بدەرێ
بانگی کرد هەردوو گوێچکەی گرت
بە سەریا خوێند، لە هۆش خۆی برد
مستەکۆڵەی دا لەسەری
لغاوی لە دەم دەرپەڕی
هەڵیگرت و گەڕایەوە
مام چەوەندەریش مایەوە
هاتە هۆش خۆی واقی وڕما
وتی یاران چیم لێ قەوما
بە شوێن کلکی گادا وێڵم
ئەم دەشتە بۆ کێ دەکێڵم
من گەنجی بێ ڕەنجم دەسکەوت
بۆچی بیکەم بەپاشەکەوت
چوو سەری خەزنەکەی لابرد(٣)
هەردوو گیرفانی لێ پڕ کرد
هاتە ناو شار بەدزیەوە
زەڕەنگەرێکی دۆزیەوە
ئەڵماسێکی پێ نیشان دا
(جوو)ە شێت بوو لە تاواندا
بە پێنج سەد لیرەی سەواکرد
دایێ و خانوویەکی پەیداکرد(٤)
ڕۆژ بەڕۆژ پارەی لێ زیاد کرد
تا لە شارا ناوی دەرکرد
هەرچی ڕوشدە و کەم ئیحسانە
لغاو کراوی شەیتانە
دەستی هاوجنسی خۆی نەگرێ
تێر لە ماڵی ناخوا، ئەمرێ

ماڵ دەست مێرد و ژن ئەکەوێ
بەزم و بەڕەزم ئەبێ هەر شەوێ

(١) وێڵەدەر: دێیەکە لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانییەوە.
(٢) غار: ئەشکەوت
(٣) ئەو بەیتە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا نەنووسرابوو.
(٤) لەنیوە دێری (ڕۆژ بەڕۆژ پارەی لێ زیاد کرد)ەوە تا کۆتایی لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بلاو نەکراوەتەوە.

***

## عەشقی پاک

١٩٤٤

دەروێشێ مەیلی دنیای نەمابوو
بە یادی خواوە ڕوو لە سەحرابوو
ڕۆژێ بۆ جومعە چووبووە ناو شار
کچێکی جوانی دی لە ڕاگوزار
نیگاهێک هات وەک تیر دای لە جەرگی
گەیاندییە کاتی ئاکامی مەرگی
لاڵ و پاڵ لێی کەوت بێ هۆش، بێ زبان
بەزەییان پیاهات خەڵکی بۆی گریان
تومەز ئەو کچە، کچی وەزیر بوو
جوان و دلێر و ئاقڵ و ژیر بوو
ئەم ئەفسانەیە کەوتە شارەوە
باوکی بەدایکی وت بیشارەوە
ژن وتی ئەمە ئەفسانەی عەشقە
شۆرەتی شێتی مەجنوون سەرمەشقە
یا ئەبێ دەروێش لەناو دەربرێ
ئەو ساتەش خوێنی ناهەق ئەتگرێ
چار هەر ئەمەیە کە دەروێش بێنی
بەهەڕە و گوڕە وای بترسێنی
کە ڕوو بکاتەوە سەحراکەی جاران
جارێکی تر خۆی نەخاتە مەیدان



یا بارێکی وای لێ نێ هەڵنەسێ
کە باری قورس بێ ئیتر ئەوەستێ
وەزیر دەروێشی بانگ کرد بەخەڵوەت
پێی وت ژن هێنان ناکرێ بەهیمەت
سەد گەوهەری وای دانەی شەو چراغ
بدرەوشێتەوە بەشەو لەناو باغ
لەگەڵ سەد گورزی دانەی مرواری
هەر دانەیەکی بەهای خەرواری
ئەمانە بێنە، کچت ئەدەمێ
گیرۆدەت ناکەم ساتێک و دەمێ
دەروێش کە ئەمەی بیست لە خۆشیا
کەشکۆڵی هەڵگرت، ڕووی کردە دەریا
بە جۆش و خرۆش، یاهو یا من هوو
مەلیکەی دەریای هێنایە بەر ڕوو
وتی بەو خوایەی عەشقی خستە سەر
ئێستە دەریاتان لێ دەکەم بەبەڕ[1]
ئەم کەشکۆڵەتان لێ ئەخەمە کار
دەریا وشک ئەکەم نەمێنێ دیار
بانگ کە بەکۆمەڵ، گەوهەر دەربێنن
لە گوێ ئەم بەحرە هەڵی ڕژێنن
مەلیکەی دەریا جاڕی دا جارێ
گەوهەر دەرهێنن هەر یەکەی بارێ
ئیتر بەجارێک گەوهەر دەباری
بۆی بوو بەخەرمان دانەی مرواری
دەروێش هاتەوە، چووە لای وەزیر
وتی ئەی مەردی بەهۆش و تەدبیر
ئەگەر تۆ ئەوسا بتکوشتمایە
ئەبوو تۆش بەزوڵم کەست نەمایە
ئێستا خوا ویستی لە پەردەی پەنهان
سڕی عەشقی پاک بخاتە مەیدان

ئەمرم ڕەوا بوو بەسەر دەریادا
ئیتر لە عەشقی مەجازیم لادا
کچ و گەوهەر و مرواری بۆ تۆ
ڕوو بکەمەوە خوا نەبم ڕەنجەڕۆ
چونکە ئەمانە، نامێنێ بۆ کەس
هەر مەیلی خوایە باقی و فریاد ڕەس
قودرەتی خوایە هیممەتی مەردان
دای بەمێروولە حوکمی سلێمان
ئەمانە پەندی پێشوونیانە
کە بەزمانی، مەل وتوویانە
هەر سێ پەندەکە زۆر بەهادارن
لە جێی خۆیانا گەلێک بەکارن
خۆ ئەگەر بێت و خۆشەویستی خوا
دەستکەوێ عاشق تێری پێ ئەخوا
مەستی مەیلی خوا زەوقێکی تیایە
ناگاتە پایەی ئەو ئەم دنیایە

..............................................................................

(١) بەڕ: وشکایی، خاک، زەوی.

***

## پەندی باڵندە

١٩٣٥

باخەوانێک بوو، لە دێی کۆستەی چەم
باخێکی جوانی، هێنابووە بەرهەم
هەرچی میوەیەک ناوی بیستبوو
ناشتبووی بەڕیز ڕێکی خستبوو
گوڵی هێنابوو لە پۆپەی چنار
لێی دابوو چنار گوڵ بوو بە بەهار
بیست و چوار چەشنی ترێ لێدابوو
ڕەونەقێکی وای بەو باغە دابوو



ئەیانوت ئەمە باغی ئیرەمە
بڵێی بەهەشتە هێشتا هەر کەمە
دەوری باغەکەی هەموو هەنجیر بوو
چەشنی هەنجیری شاری ئیزمیر بوو
قەلەباچکەیەک وای پێ فێر بووبوو
بەیانیان ئەیخوارد هێند لێی تێر بووبوو
لەدوای تێر خواردن هەڵی ئەوەران
میوەی تریشی تێکڕا ئەژاکان
ڕۆژێک باخەوان تەڵەی بۆ دانا
پێوە بوو، قیڕەی کرد لە تاوانا
باخەوان هێندەی داخ لە دڵابوو
چەقۆی دەرهێنا سەری ببڕێ زوو
قەلەباچکەکە لێی هاتە زبان
وتی مەمکوژە لالۆی باخەوان
بەو شەرتە جارێک کە تا دەمێنم
ئیتر دیداری باغت نەبینم
سێ ئامۆژگاری واشت بۆ ئەکەم
یەکی گەنجێ بێت بەبێ زیاد و کەم
یەکەم ئەو شتەی کەوا مەحاڵە
شوێنی مەکەوە ڕەنجت بەتاڵە
دووەم غەم مەخۆ کەماڵ لە کیس چوو
عومریشت ئەڕوا، غەم ئەبێ بەدوو
سێیەم بەدرۆی کەس تەفرە مەخۆ
بە شوێن کردەوەی حەرامدا مەچۆ
باخەوان ئەمەی وا چوو بەدڵا
چوو بەرەڵلای کرد لە دوای چڵا
قەل فڕی و چووە سەر لقی دارێ
کە کەس نەتوانێ بیخاتە خوارێ
ڕووی کردە کابرای باخەوان وتی
داخەکەم بۆ تۆ کە بێ قسمەتی

من گەوهەرێکم لەناو زگا بوو
بتفرۆشتایە، بەملیۆن ئەچوو
باغەوان وتی: وەرە ئاشنابە
لەم باغەی مندا سەر بەرەلابە
قەل بەپێکەنین وتی من ئێستا
پەندم دای کەچی لەلات نەوەستا
من نەموت بەشوێن مەحالا مەچۆ
جارێکی تر من چۆن دێمە لای تۆ
وتم: غەم مەخۆ کە مالّ لە کیس چوو
ئەبینم ڕەنگت هەلّبزرکا زوو
وتم بەدرۆ باوەڕت نەبێ
لە زکی قەلدا گەوهەر چۆن ئەبێ؟!

***

## هارون الرشيد

١٩٣٤

هارون الرشید ڕۆژێ دلّگیر بوو
ئەو ڕۆژە ڕۆژی مەرگی لەبیر بوو
ئەیویست تێ بگا، ڕۆژێ پێش مردن
بۆ تێگەیشتوو چی چاکە کردن
وتی: بۆم بانگ کەن جەعفەری وەزیر
جەعفەر پیاوێ بوو بەڕاو و تەدبیر
هات و کرنۆشی بۆ خەلیفە برد
خەلیفە فەرمووی، جەعفەر دەستوبرد
بنێرە، سێ کەس، یەکێکیان تجار
دووەم فەللاح بێ، سێیەم مۆسیقار
ئەم سیانە بێنن، خۆشت ڕاوەستە
بزانم کامیان تەدبیریان ڕاستە
هەرسێکیان هێنان بەهەلّەداوان
بە شپرزەیی گەینە بەر دیوان



خەلیفە توند بوو، بیانووی پێ گرتن
هەموو بەئیعدام مەحکوومی کردن
بەلام ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە
مۆلەتی دانێ، پاشتر سێدارە
ئەوان ڕۆینەوە، ئێوارە داهات
خەلیفە ناردی، دیسان جەعفەر هات
جلیان لێ گۆڕی مالّ بەمالّ گەڕان
ڕووی کردە مالّی تجار لە پێشان
ڕوانیان تجار بێ هۆش لەپەوڕوو
لێی ڕاکشاوە وەک نیوە مردوو
وتیان تۆ هەلّسە، ئێمە دەروێشین
جلەوی قەزات بۆ ڕائەکێشین
وتی: لێم لادەن، من وا ڕابووردووم
سەلەمم ماوە، بۆ ئەوە مردووم
لەوێوە چوونە مالّی گۆیندە
ڕوانیان بەزمە و قاقایە و خەندە
چوون لێیان پرسی: ئەم بەزمە چییە؟
بۆچ بنیادەم نیت؟ وا غەمت نییە؟
وتی لێم گەڕێن، ساتێکم ماوە
سەعاتێکی تر عومرم تەواوە
دنیا خۆشییە و چاک بەسەربردن
لنگ بزاوتنی پێ ناوێ مردن
ئەمجا چوونە لای جوتیاری هەژار
ڕوانیان بیست جووت گای خستۆتە کار
وا بەپەلە پەل تۆو دادەچێنێ
وەک ئەم دنیایە تا سەر بمێنێ
پرسیان خۆ تۆ ئێوارە ئەمری
ئەم شێو و وەردە، تازە بۆ چ ئەبری؟
وتی پێشینان بۆ ئێمەیان کرد
ئێمە بۆچ نەیکەین بۆ منالّی ورد؟

ئەگەر ئەمڕۆ بێ و من تۆو نەچێنم
میللەتەکەمان بەچی بژێنم؟
من خۆم ئەتوانم بەدوو نان بژیم
بەڵام خزمەتی وڵات نەکەم چیم؟
ئەوەی کە خێری بۆ وەتەن نییە
بەچی ئەیزانی کە دوژمن نییە؟

***

## گوڕنەتەڵە

هەشت نۆ مناڵی لاسار
هەستان دەستیان دایە دار
وتیان بۆ کەشافە ئەچین
وا چاکە لە ئێستاوە فێر بین
هەر ڕۆیشتن جووتە جووتە
تا سەرکەوتن لە هەڕووتە
لەوێ ڕۆژیان لێ ئاوابوو
گوڕنەتەڵەیەکیان تیا بوو
وتی تاریکمان بەسەر هات
مار و مێروو لە کون دەرهات
وەرن بچینە کوڕە شیوێ
خۆمان مات کەین لە نەدیوێ
ئەم پیلانەیان تەواو کرد
تروسکە ئاگرێکیان چاو کرد
وتیان ئەم ئاگرە دێیە
نان و پێخەفیشی لێیە
هەستن خۆمان گورج کەین بچین
بۆ ئەمشەو میوانیان ئەبین
هەر ڕۆیشتن و شاخ و کێو بوو
تێفکرین دێ نەبوو دێو بوو
دەڵە دێو لە گوێ ئاگردان
خەریک بوو نانی ئەبرژان



داینان لە گوێ ئاگردانێ
سەر و نانی گەرمی دانێ
وتی منداڵ گەورە نەبوون
فێری گەڕانی وا نەبوون
دێو وتی وا خوا ناردی بۆم
ئەمشەو یەکێکیان لێ ئەخۆم
مناڵی ماندوو هەموو لێی خەفت
تەنها گوڕنەتەڵە نەخەفت
دەڵە دێو، ئەیپرسی بەجەخت
مناڵینە کێتان نەخەفت
گوڕنەتەڵە پاڕایەوە
ئەترسا بیانخوا دێوە
دێو پێی ئەوت تۆ بۆ نانوی
برسیتە و لێمان بەبیانووی؟
گوڕنەتەڵەی سەر پەڕە خەڕەک
ئەگەر نەنووی ئەتکوژم بەکوتەک
وتی، بڵێم بۆچی نانووم؟
دایکم فێری برێشکەی کردووم
دێوەی لەجێی خۆی ڕاپەڕان
ساجێک برێشکەی پێ برژان
خواردی، وتی ترێ خۆشە
ترێی لەسەر نەخۆیت بۆشە
هەستا ڕۆیشت ترێی هێنا
لەبەر گوڕنەتەڵەی دانا
وتی ئیتر بیانووت ماوە
هەر چیت ویست هەمووم هێناوە
وتی هەموو شت تەواوە
هەر ئاوی بێژنگمان ماوە
تۆ ئاو لە بێژنگا بێنە
ئەگەر نەنووم بمخنکێنە

دەڵە دێوی عەقڵ ناتەواو
بێژنگی هەڵگرت چوو بۆ ئاو
بێژنگ ئاوی ڕانەئەگرت
لە داخانا شەقی ئەبرد
چوو بنێشتە تاڵ بێنێ
بەبێژنگیا بنووسێنێ
دەڵە دێوە بەرەو ماڵ هات
تەماشای کرد وا ڕۆژهەڵات
سەیری کرد وێرانەی بەتاڵ
نە ماڵی ماوە نە مناڵ
سەری خۆی دا بەبەردێکا
یەکجاری دەمی پێکادا
مناڵیش بۆ ناو شار چوونەوە
بە دایک و باوک شاد بوونەوە

***

## تۆڵە

١٩٤١

شاکە ملۆزم تەمەڵ و بێکار
ئەسووڕایەوە، لە کۆڵانی شار
ئەولای عەیزاغا ڕۆژێ تووشی هات
وتی مەگەڕێ بچۆ بەر سنعات
وتی ئاغا من سنعات نازانم
ئەگەر کەرم بێ کاروان ئەتوانم
ئاغا ئەمری کرد کەرێکیان دایە
دارکێشی ئەکرد کەوتە سەرمایە
کورتانی تازەی بۆ کەری کڕی
بارەدارێکی لێ ناو لێی خوڕی
گەییە دوکانی ساماغای دەڵاک
ئەم ساماغایە پیاوێ بوو بێ باک



بەسەرتاشێنی، لە شای ئەخوڕی
دەستی غەشیم و ناشی ئەبڕی
دەڵاک بانگی کرد خاوەن بارەدار
بیفرۆشە بەمن مەیبەرە بازاڕ
کەرەکەت هەرچی پێوەیە بەچەند
مەرامی وابوو بیکا بەگۆبەند
شاکە وەیزانی تەنها دار ئەکڕێ
نەیزانی بەفێڵ هەناوی ئەبڕێ
وتی بارەکەم ئەدەم بەقڕانێ
وتی قبووڵمە پارەکەت هانێ
کە دارەکەی خست تەمای بوو بڕوا
ملی کەری گرت گێڕایەوە دوا
وتی من وتم هەرچی پێوەیە
دیارە کورتانیش بەکەرەوەیە
کورتانی لێ سەند شاکە بەهەرا
ڕای کرد بۆ شکات گەیشتە سەرا
سەرتاپای گرتە قوڕ و بەگریان
هاواری بردە لای پاشای بابان
دەڵاکیان بانگ کرد بۆ خزمەت پاشا
وتی ئەم پیاوە کەوتۆتە حاشا
کەر چی پێوەیە هەمووم کڕیوە
لەگەڵ کورتانا نرخم بڕیوە
بەو ڕەنگە شاکە بەبێ بەش دەرچوو
ئەویش کەوتە فێڵ بەیانیەک زوو
کەرەکەی بردوو چووە لای دەڵاک
وتی پارەیان داومێ بەپیتاک
خۆم و ڕەفیقم سەرمان بتاشە
وتی هەردووکتان سێ شایی باشە؟
سێ شایی دایە و خۆی لێ بوەوە
کەرەکەی هێنا کردیە ژوورەوە

وتی رەفــــیـــــقم ئەمـــــەیە یاڵڵا
بیـــتـــاشـــە، دەلاک، کـــردی بەهەڵڵا
چوونە لای پاشـــا دیســـان بۆ شکات
پاشـا ئەمـەی بیـست پێکەنینی هات
ئەمـــری کـــرد دەلاک بەســـابوون و ئاو
ســـەرتاپای گـــوێدرێژ بتـــاشێ تەواو
دەلاک کــــورتانی کــــەری لێ کـــــرا
شـــاکـــەش خـــەلاتی قـــورسی پێ درا
***

## قولە ڕەش

١٩٤٢

قــــولە ڕەشــــێک بوو بەپاڵەوانی
کـەس نەی ئەوێرا شـانبـات لەشـانی
لە ڕۆژی شـــەڕا بچـــوایە مـــەیدان
تیـپـێک لەشکری ئەخست بەبێ گـیان
بەســـەر ڕۆســـتـــەمی زالا زاڵ ئەبوو
دوشـــمن بەنەعـــرەی ژینی تاڵ ئەبوو
بەڵام خـــوویەکی زۆر بێ مـــەعنای بوو
لێـــیـــان نەدایە بۆ شـــەڕ نەدەچوو
ئەبوایە چل کـــەس لێی دایە ئەوســـا
لە پاش چل کـەسـە قـینی هەڵئـەسـا
ڕۆژێک قـەومـەکـەی دوشـمن دەوری دا
هیچ کـەسی سـاغـیـان نەمـا لە دێدا
هاواریان بۆ برد، کـــەوتبـــوو بەدەمـــا
وتیـان هەی نامـەرد، وا کەسمـان نەما
وتی: بێ کـەڵکە، نەکـەوتوومـە قین
مـەگـەر چل دارم پیـاکـێـشن بەتین
پیــرەمــێــردێکی لێ چووە پێــشێ
پێی وت جـــێی چلەی پارت ئەیەشێ



کـەوتەوە بیـری، پار چیـان لێ کـرد
خۆی گـیڤ کردەوە هەستـا دەستـوبرد
دەستی دایە شـیـر ڕووی کـردە دوشـمن
ڕەگی زیندەگی دەرکـــێـــشـــان لەبن
قـول قـینی هەستێ دوشمن پەست ئەکا
بەڵام کەی بۆکەی گۆبەنگ خەست ئەکا[١]

.............................................

(١) مامۆستا م.هـ دەربارەی ئەم بەیتە نووسیویە: بەڕاستی ئەوەی پیرەمێرد وتبووی، وا هاتە دی، قولە ڕەشەکانی ئەمەریکا و گەلێ شوێنی تر وا خەریکن گۆبەنگ خەست ئەکەن. بەر لەوانیش ماو ماو لە ئەفەریقادا گاڵەی کرد و دوشمنانی ولاتی دەربەدەر کرد. بەڵام من وابزانم پیرەمێرد لێرەدا لەجیاتی قول نیازی لە کورد بووە و ئەوسا نەیویستوە دەری ببڕێ.

***

# ئەو چیرۆکە شیعریانەی کە پیرەمێرد کردوونیە کوردی

## چاو برسی

لەعەرەبییەوە وەرگیراوە

١٩٣٥

ڕۆژێک عـــــارەبێکی جـــــبـــــوور
ئـــەهـــاتـــەوە لـــەرێــــگـــەی دوور
گـەیشـتـە لای قـەسـری شـیـرین
لە مـــێـــرغـــوزارێکی شـــیـــرین
دابەزی قـــــــاوەڵـتی ئـەکــــــرد
هەگـبـەی لەسـەر حـوشـتـر داگـرت
نان و هێلکە و گـــۆشـــتی تیـــابوو
کــــە ڕوانی کــــورێک پەیدا بوو
ســــلاوی کـــرد لەلای دانیـــشت
کـــابرا گـــرژ بوو لچی داهێـــشت
ســـەری شـــۆڕکـــرد نانی ئەخـــوارد
کــــورەش هەر پارووی ئەژمــــارد
عــــارەب پرسی تۆ کـــــوێندەریت؟
وا لە شـــــەرم و حــــــەیا بەریت!

وتی بێگانە نیم یارم
ئەمساڵ لای ئێوە جوتیارم
ئەمجا وتی: أشلون الحال
چۆن چاکن ماڵ و مناڵ
کوڕە وتی: بەکەیفی تۆن
شوکور هەموو بەڕەنگ و بۆن
وتی: خومەییسی کوڕم
دەشت و کێو بۆ ئەو ئەبڕم
وتی: الحمد للە تەواوە
پێگەیشتوە و بەشەرت پیاوە
وتی: دایکی چۆنە، ساغە
وتی: چاکە و بەدەماغە
وتی: ماینێکی چاکم بوو
وتی: جوانوو ماینێکی بوو
وتی: تانجیە زەردم ماوە
وتی: هەمیشە لە ڕاوە
کابرا لە خۆشیانا وەک هار
دەمی بۆ پاروو کرد بەچوار
تیکەی زلی بەیەکدا دا
هیچ بەشی کوڕەی لێ نەدا
ئەوی لەبەری مایەوە
نایە هەگبە و پێچایەوە
کوڕە هێجگاری حەپەسا
دڵی تێکەڵ هات لە برسا
لەو کاتەدا ئاسکێک ڕابوورد
کابرای عارەب سەیری ئەکرد
کوڕ وتی تف لەم دنیایە
ئێستا تانجیە زەرد بمایە
نەی ئەهێشت ئەم ئاسکە بڕوا



عارەب پرسی چی لێ قەوما
کوڕە وتی: ڕۆحی سپارد
گۆشتی ماینەکەتی زۆر خوارد
وتی: ئەی ماینەکەم چی بوو؟
وتی فێی لێ هات و شێت بوو
لەقەی لە کوڕەکەت دابوو
کوڕە گیانی تیا نەمابوو
پۆلیس هاتن ماینیان کوشت
خەبەری ڕاستیم نایە مشت
زاتەن ژنەکەت نەمابوو
خانووی بەسەردا ڕووخابوو
عارەب بەگریان بۆی دەرچوو
نان و هێلکەی هەموو بیر چوو
کوڕە میراتی پێ بڕا
ئەوەندەی خوارد هەتا بچڕا
ڕۆڵە ئامۆژگاریت وابێ
وەختی نان خەڵکت لە لا بێ
بەڕوو خۆشی بڵێ فەرموون
بەوە خەڵک لێت ئەبێ مەمنوون
چاویش مەبڕەرە نانی کەس
ئەوی خوا داویە بیخۆ و بەس
سەیری بەخیل چی لێ قەوما
بۆ کوڕەی چاوبرسیشی نەما

## خەیاڵ پڵاو

بیری چیرۆکەکە وەرگیراوە[1]

١٩٢٦

عابیدێ کونجی مزگەوتێکی گرت
بەشەو و بەڕۆژ عیبادەتی کرد
بەقاڵێکیش بوو دراوسێی مزگەوت
جار بەجار چاوی بەعابید ئەکەوت
وتی ئەم پیاوە کاسبی ناکا
چاوەڕێی خێرە بۆ من وا چاکە
بە خێری مردووم هەموو ئێواران
هەنگوینی بەمێ لەگەڵ دوو سێ نان
بەڵکو تێر بخوا و ببووژێتەوە
ئاگری برسێتی بکوژێتەوە
بە دڵێکی تێر بۆ شەونوێژ هەڵسێ
بە دوعای ئەو خەڵق لە خەم بڕەخسێ
بەو نیەتەوە لە ڕێی خوادا
نان و هەنگوینی بەعابد ئەدا
چەند ڕۆژێ عابد نەفسی خۆی تێرکرد
کووپەڵەی هێنا و پاشەکەوتی کرد
نانی وشکی خوارد هەنگوینی هەڵگرت
زۆری پێ نەچوو کووپەڵەی پڕ کرد
ڕۆژێ کە ڕوانی وا کاسەی پڕ بوو
نەفسی غالب بوو تەمای[2] لێ خڕ بوو
کوپە هەنگوینی لەتاقا دانا
بۆی کەوتە خەیاڵ چاوی خۆی لێک نا
وتی ئێستا ئەم هەنگوینە جوانە
دە ڕوپیەم بەنێ هێشتا هەرزانە
واچاکە ئەمڕۆ بیبەم بیفرۆشم
بیدەم بەمەڕێ شیری بدۆشم



ساڵی ئایندە مەڕ ئەبێ بە دوان
زاووزێ ئەکەن بۆم ئەبن بە ڕان
ڕۆن و خوریان ئەکەم بەپارە
ئەیدەم بەموڵکی خوڕگە و ئاوبارە
موڵک لە دەست ئاغا و بەگزادە ئەبڕم
موڵکی مەلیکی خەیاڵیش ئەکڕم
موهەندیس دێنم لە ئەورووپاوە
بە سەرگردەکەی لای کانی (با) وە
قەسرێ[3] ڕاکێشم خەوەر نەقداری
ناوی خۆم ئەنێم شای کوردەواری
خەیاڵ بێ و بۆر بێ، زۆر بێ باخام بێ
پیاوی خەیاڵباز ئەبێ ناکام بێ
بایدایەوە سەر خەیاڵی هەنگوین
خۆی بردە ڕێزەی شای ساحێب نگین[4]
ناردی کچی شای عەجەمی هێنا
نەدی و بدی بوو ئاخری نەهێنا
حازر و بزر کوڕێکی لێ بوو
بۆ جێنشینی ئومێدی پێی بوو
کوڕەکەی ڕۆژی لە ڕوویا وەستا
جنێوی پێدا، قینی لێ هەستا
دارێکی لێدا بەدەم دارەوە
هەنگوین بەڕیشیا هاتە خوارەوە
تومەز دارەکەی کەوت لە کووپەڵە
هەنگوینەکەی بوو بەدڵۆپەی پەڵە
بەقاڵبی سابوون، ڕیشی پابووەوە
هەنگوین و خەیاڵ، لێک جیابووەوە
ئێوارەی لێ هات بەسکی برسی
لە شەونوێژەکەی پێشووی نەپرسی
قەسر و ژنەکەی کەوتەوە فیکری[5]
ئەمجا نەیزانی بۆ کامیان بگری

بە نائومێدی لە نوێژی لادا
بە بەنگ و بادە خەمی بەبادا
بەشوێن خەیالا کەوتە بەنگ کێشی
شاهی لە دەست چوو کەوتە دەروێشی
پێ هەڵخزینە وەسوەسەی ئیبلیس
ڕیشی تەماعکار بەقنگی موفلیس

........................................

(١) لەکاتی خۆیدا کە پیرەمێرد ئەم شیعرەی بڵاو کردۆتەوە ئاماژەی بۆ سەرچاوەکەی نەکردووە!.
(٢) تەما: تەماع
(٣) لای م.هـ نووسراوە (کۆشکێک) بەڵام لە ئەسڵەکەی پیرەمێرد (قەسرێ) نووسراوە.
(٤) وشەی (ساحێب) بووە بە(خاوەن)!
(٥) وشەی: (فیکری) لای م.هـ بووە بە(بیری).

***

## بەردتاش(١)

١٩٤٢

بەردتاشێک عەشقی خوای کەوتە سەر
خوای خۆش ئەویست و لەڕا بێ خەبەر
بۆ خواپەرستی چوە کێوی (طور)
شاخەکەی تاشی بۆ خۆی کرد بەژوور
وای ئەزانی خوا وەک ئێمە وایە
دەربەستی نان و نوێژ و کەوایە
ئەیوت خوای خۆم بینایی چاوان
ڕۆژێک وەرە لام ببە بەمیوان
دەست و پێت ئەشۆم بەسابوون و ئاو
ناڵچەی پێلاوت ئەخەمە سەرچاو
ئەچم لە لای شوان شیرت بۆ دێنم
عوود و بخووردت بۆ ئەسووتێنم
ماندووی سەر خەوێک بشکێنە لە لام
ئێشکت ئەگرم، مەترسە ئازام



ئەپاڕایەوە و هەروا ئەیناڵان
بە سۆز و گریان جەرگی ئەسووتان
تا ڕۆژێ مووسا چووە کێوی طور
گوێی لە دەنگی بوو، ئەیناڵان لە دوور
چوو پێی وت کابرا: بۆچ تۆ نازانی
خوا بەشەر نییە بێت بەمیوانی
جارێک من وتم خۆتم نیشاندە
فەرمووی، نامبینی، خۆت ئەزیەت مەدە
سەنگ تەراش گریا بەدڵشکاوی
خوا فەرمووی مووسا تۆ ناتەواوی
خۆشەویستی من بۆچ ئەڕەنجێنی
ئەو دڵەی منی تیام ئەیشکێنی
ئەوی بەزبان زکری من ئەکا
هیچە، ئەم بۆ من، وا کێو کون ئەکا

........................................

(١) پیرەمێرد ئەم چیرۆکەی لە کتێبی (ئیسماعیل نامە)وە وەرگرتوە. کە چیرۆکێکی تیایە بەناوی (سەنگ تەراش)ەوە.

***

## پەند و ئامۆژگاری بۆ بازرگان(١)

پیاوێکی کورد چوو بۆ بەسرا
سبەینان شیری ئەگێڕا
یەکاو یەک ئاوی تێئەکرد
قازانجی زۆری لێ ئەکرد
سەرمایەی بوو بەسەد لیرە
هەستا بێتەوە بۆ ئێرە
سواری پاپۆڕ بوو بۆ بەغدا
شەوێک لەبەر مانگە شەودا
خەریک بوو پارە بژمێرێ
خوا خراپ بۆ خراپ ئەنێرێ

مەیموونی قەپتان پەیدابوو
ئەو کیسەی لیرەکەی تیابوو
فڕانی و بەدارا هەڵگەڕا
کوردە ئارامی لێ بڕا
ڕیشی ڕنیەوە بەگریان
هاواری بردە بەر قەپتان
قەپتان هەر چەند لێی توند ئەبوو
مەیموون بەرەو ژوورتر ئەچوو
تا گەییە تەوقە سەری دار
لیرەیەکی بۆ خستە خوار
یەکێکی هاویشتە ناو ئاو
تا سەد لیرەکەی کرد تەواو
یەکێک بۆ ئاو یەکێک بۆ کورد
ئا بەم پێیە بەشی ئەکرد
کوردە شێت بوو لە تاوانا
هەستا چوو بەگژ قەپتانا
قەپتان هەر وا واقی وڕما
لەم هەرایە سەری سوڕما
بە کوردەی وت: تو خوا بەدبەخت
ئەم پارەیەت لە کوێ دەستکەوت
وتی: شیر فرۆشیم ئەکرد
بە چەند ساڵم گردەوە کرد
وتی: تێگەیشتم چییە
سووچی مەیموونی تیا نییە
نیوەی هی ئاو بوو کەوتە ئاو
تۆش بەشی خۆت وەرگرت تەواو
کاسب خۆشەویستی خوایە
حەرام بۆ کەسب ئاگر و کایە

.........................................................

(١) مامۆستا م.هـ دەربارەی ئەم شیعرە لەلاپەڕە ٤٢٤ی دیوانی پیرەمێرددا نووسیویە: ئەم چیرۆکە لە بێگانەوە





وەرگیراوە، کابراش کورد نەبووە. بەڵام پیرەمێرد لە ڕێی ئەم چیرۆکە هۆنراوەوە ئامۆژگاری بازرگانەکانی خۆمان کردووە کە فڕوفێڵ نەکەن.

***

## مەیموون و دارتاش

«لەعەرەبییەوە وەرگیراوە»

١٩٣٧

پیاوێکی دارتاش مەیموونێکی بوو
بۆ هەموو ئیشێک لەگەڵیا ئەچوو
هۆگری بووبوو لای هەڵوەستابوو
مەیموون شاگرد بوو دارتاش وەستا بوو
کە ئەیوت تەشوێ، زوو بۆی ئەهێنا
شەقەی مشاری بۆ دائەهێنا
ڕۆژێک وەستاکەی داری ئەقلاشت
جار جارە بەپواز لەنگەری ئەداشت
بە تەور دارەکەی ئەقڵیشاندەوە
بە پواز لەیەکی ئەڕەواندەوە
وەختی نیوەڕۆ چوو بوو بۆ سەر ئاو
مەیمون هاتە جێی وەک وەستای تەواو
خۆی قیت کردەوە لە جێی ئەو دانیشت
کلکی خۆی بەشوێن قڵیشدا داهێشت
پوازی دەرهێنا و کلکی پێوەبوو
کەوتە قیژ و هووڕ ئاگری تێ بەربوو
قڵیشی جێی پواز یەکدگیر بووبوو
کلکی مەیموونی تونگ تێ چەسپیبوو
مەیموونی غەشیم بوو بەفاقەوە
ئەینالاّن بەدەم واقەواقەوە
لە واقەی مەیموون خەڵک گردبوونەوە
چوونە پێشەوە، لێی ورد بوونەوە
کلکی گیرابوو، لە قڵیشی دار
ڕێگەی نەدەبوو کەوتبووە هاوار

وەستا لە تاوا سەراوی نەکرد
هاتەوە پوازی لێدا دەستوبرد
مەیموون ڕزگار بوو بە کولەمەرگی
بەڵام ژانەکەی گەیشتبووە جەرگی
مەیموون چۆن ئەبێت بە وەستای دارتاش
بولبول و قاژو[١] نابن بەیۆڵداش
ناگاتە پایە مەردی ناحساب
نان بۆ نانەوا گۆشتیش بۆ قەساب
قەت ڕێک ناکەون حوشتر و قەزازی
هەورامی و سواری، مەلا و ڕمبازی

............................................................

(١) لای م.هـ نووسراوە (بولبول و لەقلەق).

***

## شیعرە ئاینییەکانی پیرەمێرد

### دڵێکم ئەوێ[١]

١

١٩٣٧

پەروەردگارا دڵێکم ئەوێ
کە ئاگری هەوا ڕێی تێ نەکەوێ
ئابڕوویەکی بێ زرق و ڕیا
تۆ، تۆ بناسێ و پادشا، گەدا
خوایە خواستی تۆ بە بەها نەیە
دەرکردنیشت بە بەهانەیە!
ئەگەر لێم پرسن، قارتێکم نییە[٢]
نایشزانم مایەی بەندەگیم چییە
ئنجا کەوابێ چۆن ئەگەمە تۆ
کەواتە بەخۆم بڵێیم ڕەنجەڕۆ
دیسان من لە تۆ ناهومێد نابم
بەخوام ناسیوی هەر دەبێ چابم



ئەگەر پێم بڵێی مەیکە و پێم بکەی
دەستەڵاتی من چۆن ژوور خۆت ئەخەی[٣]
کردەوەی منت خۆت قەرار داوە
ئیتر ئارەزووی من لە کوێ ماوە
ڕۆحم بەڕەزای تۆوە سروشتە
ئارەزووی نەفسم حۆری بەهەشتە
لیقای تۆ کە خۆی بەڕۆح ئەنوێنێ
ئیتر ئارەزووی نەفسم نامێنێ
لە جەهەنەمدا بەیادی تۆوە
کوڵی بەهەشتت ناکەم بەبۆوە
خەڵک وا دەزانن نور عبادەتە
نازانن دادت بەعینایەتە
زۆرمان بیست عابید بەگومڕا دەرچوو
ساف دڵپەسەندی لای بارەگات بوو

............................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاونەکراوەتەوە.
(٢) قارت: کارت. مەبەستی لەوەیە کە کردەوەی باشی ئەمەندە نییە بچێتە بەهەشت.
(٣) پیرەمێرد ئەم شیعرە ئاینییانەی خۆی ناو ناوە (ناڵەی پیری پیران).

***

### پەروەردگارا تەماشا ئەکەم[١]

٢

١٩٣٧

پەروەردگارا تەماشا ئەکەم
خۆم لە کردەوەی خۆم حاشا ئەکەم
دڵ و زبانێ تۆ داوتە بەمن
بەهەوا و هەوەس لێم بوون بەدوژمن
ئەمەوێ دڵم تەنها تۆی تیا بێ
لە یادی غەیری تۆ تەوەڵلا بێ

ئەوسا زبانم زیکری تۆ دەکا
ئەتوانم ببمە بەندەی بارەگا
ئەگینە هەروا بمێنمەوە
تۆوی بەدنامی ئەچێنمەوە
چەند خۆشە نەشئەی تۆم لە دڵا بێ
شەقم لە چەند و چوونی هەڵدابێ
ئازادە سەر وەک بەرزەکی بانان
بکەومە سەودای ئارەزووی جانان
تاجی ئەدهەمی بنێمە سەر سەر
فەرمانڕەوا بم لە بەحر و لە بەڕ
یاخو پەروانەی نووری لقات بم
ڕۆحم پەروانە و خۆیشم فیدات بم
زۆر کەس پەروانەن بۆ شەم جەماڵێ
با منیش ببمە سفتەی جەماڵێ

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بلاونەکراوەتەوە.

***

## ناڵەی پیری پیران

٣

١٩٣٧

پەروەردگارا وا بەرە بەرە[١]
سەودای ناسینی تۆم لەسەر سەرە
دڵم هەمیشە ڕەزای تۆی ئەوێ
گیان لەبەدەنما ساتێ ناسرەوێ
ئەگەر لە خاکم گیایە بڕوێ
بەزبانی حاڵ لە زیکرت ئەدوێ
هەر ماکینەیەک کە گوێی لێ دەگرم
ئاهەنگی زیکری تۆی لێ وەردەگرم



مەستێکم بادەی ئارەقم ناوێ
سارد نابێتەوە، دڵ بەهیچ ئاوێ
چەند خۆشە لەتوێی پەردەی نیهاندا
شەو نوور ئەبینم لە ئاسماندا
عەینی تەجەللا، ئاگری کۆی (طور)ە
ئەم نزیکترە و لە شارەزوورە
کەسێ نزیک بێ بەبەندەگی خۆی
تۆ نزیکتری لە جیسمی خۆی بۆی
خەڵکی بەعەشقی حسنی شێت ئەبن
لیقای تۆ وجود دەردێنێ لەبن
کە وجود نەما جا نۆبەی جانە[٢]
جان جێی تەجەللای جلوەی جانانە
هەرجێ کە قووتی ڕۆحی تیا نەبێ
بێ تام و کامە لایبە با نەبێ

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بلاونەکراوەتەوە.
(٢) جان: واتە گیان، ڕۆح.

***

## خودای بێ نیاز[١]

٤

١٩٣٧

خودای بێ نیاز بێ خوێش و هامڕاز
بە (دوو) خەڵکی چاک بمکە سەرفراز
یەکێکیان ئەمەی غەرەزم نەبێ
لە ڕاستی هیچ کەس (عوض)م نەبێ
کەس لە کردەوەم، زیان نەبینێ
دڵم ژەنگ نەگرێ بە بوغز و کینێ
هەرچی دەربارەی من بەد ئەندێش بێ
بەتیری قەهری تۆ دڵەی ڕێش بێ

دووەم قـــەناعـــەت لە ئاز ئازاد بم
هەر چیم بدەیتێ، بەوە دڵشـــاد بم
کـــە بێ نیـــاز بم لە ئەهلی دنیـــا
هەر تۆ دەناسم بەتاقی تەنیـــا
ئەوسا بۆ هیچ کەس نابمە تەشی ڕێس
لە هەمـــوو مـــاڵێ نابمە کـاسەلێس
لە تۆ ناسـیندا خـوایە زۆر کـاسم
هۆشـــێکم بەرێ تۆی پێ بناسم
هەر تۆ ڕەهبـەری لە کـاری چاکـا
(بەدی)ش خۆم نەیکەم هیچ کەس پێم ناکا
ئەگـــەر خـــراپەم بەئەمـــری تۆ بێ
چۆن ئەبێ جـــەزام دیســـان بەتۆ بێ
حـــاشـــا ئیـــسنادی زوڵم بەتۆ نادەم
نەفـــسم نایەڵێ لە گـــوناه لادەم
خـــوایە مـــەرتەبەی ڕەزام بدەرێ
لە دەوڵەمـــەندی و گـــەدایم گـەڕێ
«خـــوایە ئەم دڵەی کـــە تۆ داوتمێ
نامـــەوێ بۆش بێ لە یادت دەمێ
ئەمـــەوێ گـــوڵێ لەگـــڵم دەربێ
ڕەنگ و بۆی یادی ڕای تۆی لەسەربێ
کردگار فەرمووت بیکە نەتئەهێشت
فەرمووت مەیکە، شەیتانت تێ هێشت»

............................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## بۆ میعراج(١)

**٥**

**١٩٤٩**

سبەی شەو، شەوی، ئەسرای میعراجە
بەهیچ (نەبی) یەک، نەدرا ئەو تاجە



مەولەوی(٢) فەرمووی بەعلم الیقین
صـــار رحـــمـــةً، علی العـــالمین
من المســـجـــد الحـــرام الأنفس
الی المســـجـــد الأقـــصی المقـــدس
ئەمە (صریح)ی (نص)ی قورئانە
ئەوی ئینکاری، کـرد بێ ئیـمـانە
شـــەوە و خـــەڵوەتی، بەینی یارانە
جـــێی ڕاز و نیـــاز، دەردەدارانە
«شەوە و خەڵوەتە، ماڵ بێ ئەغیارە
گشت عالەم نووستوو، دۆست خەبەردارە»(٣)
-نەعتی- عصمتی بخاری- خۆشە
های های لەو عەشق و جۆش و خرۆشە

............................................................

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاونەکراوەتەوە.

(٢، ٣) بەسەرهاتی ئەم زیارەتەی مەولەوی بۆ لای سەید فەتاحی جەباری زۆر بڵاوە و بەچەند شێوەیەک باس کراوە. تەنانەت مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس لە دیوانی مەولەویدا، زیارەتی مەولەوی و خوێندنەوەی تاکە شیعرەکەی (بێسارانی) بۆ لای (شێخ عەبدولڕەحمان خالصی تاڵەبانی) زانیوە!!

بەڵام ڕاستی کارەسات بەو جۆرەیە کە لە دیوانی(*) (سەید فەتاحی جەباری)دا نووسراوە: مەولەوی دەچێت بۆ لای سەید فەتاحی جەباری لە ناوچەی جەباری، لەوێ پرسیار لە ماڵی سەید فەتاح دەکات، دەڵێن چووەتە دێی تاوێربەرز مەولەوی لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرلەئێوارە و ناوەخت ئەبێ لەوێوە ئەچێت بۆ ئەو دێیە، لەوێش دەڵێن خەڵکی ئاوایی هەموو لە (بەهارە هەوارن)، مەلایش لەگەڵیانە. مەولەوی کاتێ لە چیغ و جێگای سەید فەتاح نزیک دەبێتەوە دەبینێ بەو نیوە شەوە خەریکی خواپەرستییە، بۆیە ئەم شیعرەی بێسارانی دەخوێنێتەوە:

«شـــەوەن، خـــەڵوەتەن، مـــاڵ بێ ئەغـــیارەن
ئا لەم گـــرد وتەن، دوس خـــەبەردارەن»

مەلایش بەبێ وەستان وەڵامی دەداتەوە:

«ئیـــرادەم ئیـــدەن وەی کـــەلپـــوســـەوە
شـــەونالێن وەشـــەن وەلای دوســـەوە»

(*) دیوانی مەلای جەباری – عەبدولجەبار محەمەد جەباری ل١٩-٢٠ساڵی ١٩٦٨.

***

## ناڵەی پیری پیران(*)

٦

١٩٤٧

خوای گەورە و بزورگ پادشای ڕێی نیاز(١)
بێ هاوبەش، بێ کەس، بێ شوێن بێ هاوڕاز
تێگەیشتنت دامێ تێتبگەم
پێم لێنا هەر تۆی، بێ زیاد و کەم
چاوم هەڵبڕی، ئاسمانم دی
وتم بێ وەستا نەهاتۆتە دی
ئەگەر کردەوەی بێ (گا)(٢) نەبوایە
ئەشیا بێ ستوون ڕانەوەستایە
دیارە هەر چەرخێ پیاو دروستی کا
کاتێکت زانی سوا و تێکشکا
چەرخی ماکنەی ئەم ڕۆژ و شەوە
بێ هەڵم و بەنزین ئەخولێتەوە
چەوری پێ ناوێ، هیچ ژەنگ ناگرێ
لێک هەڵناوەشێ دەستی تێ نابرێ
هەر لەو ڕۆژەوە، کە تێکخراوە
هێشتا جەرێکی لێ نەگۆڕاوە
هەر بەو پێودانە، کە بۆت داناوە
وا دێت و دەچێ، هیچ نەوەستاوە
بێ گوڕە و بڕە بێ چرپە و بێ دەنگ
تێکرا لە کاران یەک ڕەنگ یەک ئاهەنگ
تۆ نەبوویتایە چۆن تێک ئەخرا
ئەمانە لە کوێ پێکەوە ئەنرا
چۆن چەرخی گەردوون بێ دەستی وەستا
لە کارا ئەبوو هەتاکو ئێستا
ئاش بێ ئاش وەستا نانرێتەوە
(گا) بێ (هۆ)ی جوتیار ناگەڕێتەوە
سەد هەزار ئەستێرەناسان



ئەو دیو خێوەتیان نەدی بەئاسان
منیش ئەگەڕێم کە تۆ بناسم
ناتدۆزمەوە کوێر و کەساسم
چاوێکم بەرێ تۆی پێ ببینم
(أرني)(٣) بێژ نیم، کردەوە بینم
دەستم پێ گرتووی شەرمندەم مەکە
بۆ بەخشین (گونای)(٤) زۆر و کەم یەکە
هەر کردەوەیەک لە من ڕووی داوە
لەپێش کردنا، لای تۆ نووسراوە
کە لەو تەختەیەی(٥) لای تۆ نووسرا بێ
کێ ڕێ دەکەوێ بڵێ وا نابێ

---

(*) لەلاپەڕە ٣٧٦ی دیوانی پیرەمێرددا پێش ئەم شیعرە بەیتێک هەیە ئەڵێ:
«ئەگەر خوات ناسی بپاڕێرەوە
بەزمانی خۆت بلاڵێرەوە»
(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا لە لاپەڕە ٣٧٦دا بڵاو کراوەتەوە.
(٢) گوایە ئەڵێن زەوی لەسەر پشتی گایە و گایەکەش لەسەر پشتی ماسیە. کە دیارە زانست لەم سەردەمەدا ئەو جۆرە خەیاڵە کۆنانەی پووچ کردۆتەوە.
(٣) أرني: ئاماژەیە بۆ واتای حەزرەتی مووسا کە داوای لە خوا کردووە خۆی نیشان بدات، خواش بەواتای «لن تراني» وەڵامی داوەتەوە.
(٤) گونا: گوناه، خەتا، تاوان.
(٥) خیام لە چوارینەیەکیدا بەیتێکی هەیە لەو واتایە دەچێ. بەیتەکە دەڵێ:
«چاکە و خراپە هەرچی کە ئەیکەم
یەک، یەک، تۆ نووسیت، من ئەکەی بەدناو»

***

## جەژنی مەولوود(١)

٧

١٩٤٢

ئەمڕۆ مەولودی پێغەمبەرمانە
ئەو پێغەمبەرەی کە ڕەهبەرمانە

خوا فەرمووی ئەگەر تۆم شک نەئەبرد
چەرخی ئەفلاکم دروست نەئەکرد
بۆیەکم ناردیە ئەم سەر زەمینە
بلّێن (رحمةً للعالمین)ە
دیارە ڕەحمەتی خوا هەر وا ئەبێ
ئەم دینە پاکەی لێ پەیدا ئەبێ
هەر لە ڕۆژهەلاّت، هەتا ڕۆژئاوا
چرای ئەم دینەی تیا هەلّکراوە
ئەگەر دینەکەی وا چاک نەبوایە
چۆن ئەم برەوەی ئەخستە کایە
تیفلێکی بێکەس[2] خۆی نەخوێندەوار
خودا بەو دینە، کردی بەسەردار
کاتێ موعجیزەی قورئانی نواند
ئاینی هەموو، میللەتی شێواند
ئاگر و ئاوی کرد بەهەرەمە
هەرچی بۆ بلّێن، هێشتا هەر کەمە
خوا ڕێی سروشتی لە دەست خۆی ناوە
هەرچۆنێ ویستی، هەروا خولّقاوە
بە ئایەی عەدلیی کەوا دێڕێکە
موشریکەکانی هێنایە ڕێگە
بۆچ فەخر نەکەین بەو پێغەمبەرە
کە بۆ ئەنبیا هەر ئەو سەرورەرە
موسلّمان ئەبێ، کردەوەی چاک بێ
موسلّمانەتی بەقسە نابێ
کە (وای) (متی)ی ئەو ئەهاتە بەر گوێم
لە شەرمەزاری نازانم لەکوێم
حەیفە دین ئەمە و خۆمان بەدکار بین
ڕۆژی شەفاعەت لای شەرمەزار بین



با لەم ڕۆژەدا بەچاوێکی تەڕ
ڕۆحی مەولەوی بکەین بەڕابەر

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بلاّو نەکراوەتەوە.
(٢) مەبەست لە پێغەمبەر (محەمەد)ە (ص).

***

## ئەگەر[1]

### ٨

١٩٤٧

ئەگەر گوناهکار بیبێ ئەو هۆشە
بزانێ عەفوم چەند لە لا خۆشە
گوناه و تۆبە ئەکا بەعەمدی
تا ئارەزووی من بهێنێتە دی
هەندێکیش ئەلّێن خوا لە هەقی خۆی
خۆش ئەبێ و نایبێ هەقی من و تۆی
مسقالّە زەڕڕە ( شراً) یەڕەیە
زۆر ورد دەنووسرا ئەم لاپەڕەیە
ڕاستەکەی وایە کە ئەم دوعایە
سزا و لێبووردن هەمووی بەخوایە
پێغەمبەری وا هەیە قاتلّە
لە (أولو العزم) کەچی داخلّە
تۆ خوا بنێرە دلّی وێرانە
مەڕوانە حیکمەت هەروا کوێرانە

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بلاّو نەکراوەتەوە.

## عەشقی تۆ(١)

٩

١٩٤٨

ڕۆژی ئەزەل بوو سەرەتای عەدەم
من و عەشقی تۆ هاتبووینە بەرهەم
ئێستا کە بەڕۆژ بێکەسم و پرغەم
بەڕۆژ یادی تۆم بۆ بووە بەهاودەم
خوایە لە قاپیت شتێکم ئەوێ
دەست پادشاه و ماڵدار ناکەوێ
ئەوان خواهیشتیان بەموڵک و ماڵە
منیش بەتەنها مەیلی تۆم خەیاڵە
من هەر چیم بوێ کە تۆ نەتەوێ
دیارە بیشەرم چنگم ناکەوێ
ئەوەندەم ئەوێ کەوا بمبەخشی
چاکەیە و زەرەر لە تۆ ناکەوی

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## بانگێک لە لاهووتەوە

١٠

نوورێک ئەبینم لە ڕووی جیهاندا(١)
بەڕووی زەمین و بەئاسماندا
گوێم لە بانگێکە لە لاهووتەوە
تێکرا ناسووتی پێ بزووتەوە
دوای «لا الە الا اللە» ئەڵێ
ڕەسول اللەیە محەممەد بەڵێ
ئەم محەممەدەی کە خودای گەورە
لەگەڵ فریشتەی ئاسمان بەدەورە



سەڵەواتیان دا، لە دیداری ئەو
ڕۆژی جەماڵی ئەو هەڵدێ ئەمشەو
هیلالی مەکە و بەدری مەدینە
لە مەغریب هاتە مەشرق ئەم دینە
خوا فەرمووی ئەگەر تۆم شک نەئەبرد
چەرخی ئەفلاکم دروست نەئەکرد
بۆیەکم ناردیە ئەو سەر زەمینە
بڵێن «رحمةً للعالمین»ە
دیارە ڕەحمەتی خوا هەروا ئەبێ
ئەم دینە پاکەی لێ پەیدا ئەبێ
لە ئادەمەوە دین قاڵ کراوە
ئالتونی تێزاب هەر بەو دراوە
تا ئەمە بوەتە دەلیل و ئیسپات
پێغەمبەری تر لە دوای ئەو نەهات
غلەی غایەی ئیجاد وا دەرکەوت
خاتەمی خەتمی ئەنبیای بەرکەوت
بێ باوک و دایک هەم نەخوێندەوار
خوا بەم ئاینە کردی بەسەردار
هەر موعجیزەیەک لە پێش ئەودا بوو
بە ئایەتێکی قورئان بەسەرچوو
بڕوانن ئایەی عەدلی دێرێکە
چۆن بتپەرستی هێنایە ڕێگە
ئای ئەوسایە دین چەن بەقووەت بوو
خەیبەریان ئەگرت بەیاهووی یاهوو
داخەکەم هەوڵ و قووەتمان تێکچوو
شێرە شەرزەکان ناوێرنە جوو
ئەوسایە بانگی (اللە اکبر)
(بەدر و حەنینی) ئەکرد موسەخەر
چونکو لامان دا لە خوا شوناسی
خوایش بۆیە ئێمەی خستە کەساسی

ئەگینا خوا خۆی، فەرمووی موسوڵمان
بیستیان دوو سەدە بۆ ڕۆژی مەیدان
دەوای ئەم دەردە پەشیمانییە
چارەی ڕسگاری ڕێی ڕەحمانییە
با لەم شەوەدا بەدیدەی نمناک
هانا بەرینە بەر شاهی لەولاک

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## خۆشەویستی خوا(١)

١١

١٩٤٩

پێغەمبەرەکەی خۆشەویستی خوا
فریامان کەوە توو بیت و خوا
سەرای (سبحان الذی اسرا)ی تۆ
ڕێی زیارەتی خزمەت خودای تۆ
ئێستا بەخوێنی ئیسلام گوڵگونە
(بیت المقدس) حەورای صەهیونە
قەومی نەجیبت کەوتە تەنگانە
جولەکە کوژیان ئەکەن ئامانە
(صلاح الدین)ی کورد بەو خزمەتە
ئێمەی ڕوو سوور کرد وا بەو خزمەتە
بەم ڕەنگە کورد و عەرەبی عیراق
بۆ فیداکاری کەوتنە ئیتیفاق
تۆش لە پشتیان بە بۆ ئەم جیهادە
بەم یەکیەتییە ڕۆحی تۆیش شادە
یا عەلی خۆ تۆی (فاتح)ی خەیبەر
(ذوالفقار) لە تۆی کالان بێنە دەر



ئاخ چیبکەم ئەگەر پشتیان ناگرن
بەرگەی شەقێکی کورگەل ناگرن
من بەپەژارەی هاو حاڵییەوە
بە عومری هەشتا و سێ ساڵییەوە
فرمێسکم بەسەر ڕیشی سپیدا
دادەڕژێنم لە ڕووی نەبیدا
گورزی گۆدرزیان لێ بکەوێتە کار
زاتەن هەر چل شەو ئەژی سەگی هار
(بخت النصر) یان (گیو)ی گودرزە
پەیرەوی گیوی کورد لامان فەرزە

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## خوا ئێمەی(١)

١٢

١٩٣٩

خوا ئێمەی ڕەنگ ڕەنگ سروشت پێداوە
ڕەنگی هیچ کەسی بەکەس نەداوە
ئەبینی دوو کەس بەیەک ئەشوبهێن
کەچی بەکردار لەیەکتری جوێن
یەکێ ئارەزووی بەشیرینییە
ئەوی تر مەیلی شیرینی نییە
یەکێ وەک بێزوکەر ترشی ئەوێ
نە، ناوی مەبە، ئامان نامەوێ
یەکێ سەودایی شیعری مەوزوونە
یەکێ بەتیری شیعر دڵخوونە
هیوامان هەیە بەکشە مرە
ئەڵێ پێت وتووم کشە تۆ بمرە

سا توخوا مرە و بمرە چەن دوورن
هەر چەند کولانە و گۆڕ هەر دوو ژوورن
کۆنە پیاوێکمان، بەتەقەی قەزوان
نەدینی لە لا، ماوە، نە ئیمان
مەلایەکمان بوو، ئەتوت سێ پارە
ئەهاتە وێزەت بەنیزەی یارە
ڕەحمەت لە سۆفی یارەی زرێپۆش
بۆی ڕام ئەکردین ئێستری چەموش
ئێستا دەستەیە (تۆڕی) کەم سرەوت
بە قەمچی یارەش نایبەنە سەر ڕەوت
یارە مرد لە لای نامەرد نەنێژرا
بۆ گردی یارە چەند شیعر بێژرا
خۆزگە ئەمزانی ئەم سڕە چییە
ناوی هیچ کەسی لەناوا نییە
کەچی تۆ ئەڵێی بامیەکەم ترشە
ئەم هەموو خەڵکە ڕووی لە تۆ گرژە
دە، باوکم ئێرە خۆکەرکوک نییە
(مەلا بامیە)ی بێ بەو تورەییە
یا ئەگەر ترشی و ترسی خراپە
ڕووی خۆت ترش مەکە شیرین بە چاکە
ئەگینە کە تۆ مۆن و ترش ڕووی
دەمی کەس کیسە نییە بیدرووی
هی وامان هەیە کە لەخوا ئەدوێ
ڕسگاری لە خوا بۆ کێ ئەبڕێ
بۆچ پێغەمبەریان لەشار بەدوور کرد
ئیمان ناهێنرێ بەکەس دەستوبرد

..........

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***



## ئەو کەسەی(١)

**١٣**

١٩٤٨

ئەو کەسەی کەوا فەقیر نەوازە
لەگەڵ فریشتەی عەرشا هامڕازە
وەک کوێر بەڕێدا مەڕۆ وریا بە
تا نەکەویە چاڵ، بانگ کەی ئەی بابە
لەژێر سەقفێکداین کۆڵەکەی نییە
ئەگەر بڕووخێ دەسەڵات چییە
ئەم سەقفە کەوا بێ کۆڵەکەیە
نازانێ بۆ تۆ سایەی تاکەیە
کاتێک ئەزانی ئەتهاوێژنە چاڵ
یا کفنت ئەبێ، یا بێ پەشتەماڵ
ماری گۆڕ ناری دۆزەخ لەبەرە
بۆ ئەم دوو دەردە چی چارەسەرە
ئەگەر ماجوونی خواپەرستیت برد
خۆت لەو دوو ئیشە پاراست و دەرکرد
زۆر خۆت مەخەرە گێژی دنیاوە
چەند مەلەوانی تێدا خنکاوە
نەفست مارێکە پێکوڕەی شەیتان
گەر فرسەتت دا ئەگەزێ بەددان
خوا پێمان ئەڵێ، ڕێی چاکە بگرین
بۆ ئێمەیەتی ئەزانێ ئەمرین
ئەگینە دیارە ئەو باکی نییە
ئیحتیاجێکی پیاوچاکی نییە
باری گوناهی قورسمان کەوتە سەر
ئەبین بەکەری شەلی بارنەبەر
سووچی خۆت لە پێش خەڵکا ببینە
حەسوود دەربارەی پیاوچاک بەقینە

به چاوبرسیەتی هەڵمەکوتەرە ناو
مورغ بۆ دانەیە ئەکەوێتە داو
کە لە کاروانا پارەت پێ نەبوو
هیچ ترست نەبێ بێ پشتێن بنوو
ئەگەر زیانت لە کەسێ دابێ
تۆش دێتەوە ڕێت ڕۆژێکت مابێ
ڕازی دەروونت مەڵێ لە لای کەس
دەم دڕاو مەبە خۆت بزانە و بەس
وریابە وەک کوێر بەڕێدا مەڕۆ
داوی شەیتان و چاڵ زۆرە بۆ تۆ
لەژێر سەقفێکدا کوڵەکەی نییە
کە ڕووخا ڕووگیری چییە
ئەم سەقفە کۆنە بێ کۆڵەکەیە
لەگەڵ کۆڵەکەی تۆدا تاکەیە
تێبگە ڕێگەی دوورت لەبەرە
چاکە بۆ ئەولا توێشووی سەفەرە
خوا فەرموویەتی ڕێی چاکە بگرین
بۆ ئێمەیەتی کە دوایی ئەمرین
ئەگینە لەبەر پێغەمبەر نەبێ
چ ئیحتیاجی بەئێمە ئەبێ
باری گوناهمان کە کەوتە سەرشان
ناچارین ئەبین بەکەری شەیتان

---

(١) پیرەمێرد چەند جارێک ئەم شیعرەی بڵاوکردۆتەوە: ساڵی ١٩٤٢ لە ژینی ژمارە ٦٨٢دا. ساڵی ١٩٤٦ نوسخەی دیوانی م. هـ. ساڵی ١٩٤٨ لە ژینی ژمارە ٩٢٦دا. لە نوسخەی م.هـ دا شیعرەکە ناتەواوە و بریتیە لە نۆ بەیت. بەڵام ئەوی ئێمە نووسیومانە حەڤدە بەیتە و لە زۆر جێگادا لەو جیاوازە. ئەوا لێرەدا نوسخە ناتەواوەکەی دیوانی پیرەمێردی م.هـ دەنووسینەوە کە لە لاپەڕەی ٣٨٤دا بڵاوی کردۆتەوە

«ئەو خوا پێداوەی برسی نەوازە
لەگەڵ فریشتەی عەرشا هامڕازە
بتەوێ لەگەڵ خوادا خەریک بی
ئەبێ لە پیاوی بەدکار تەریک بی





## شێخ و سۆفی[١]

### ١٤

١٩٤٧

شێخ چاو لە دەستی سۆفی نەفامە
ئەیشزانێ ئەوەی ئەیخوا حەرامە
وەکیلی خوایە، بەهەشت ئەفرۆشێ
وەک مانگای گەڵباخ مورید ئەدۆشێ
بەڵێ مەشهورە کە سواڵ کیمیایە
بە پارەی مورید خاوەن دنیایە
ئەگەر مەردی خوای سواڵت بۆچ ئەوێ
پارێز و ترشی چۆن ڕێک ئەکەوێ
تا ئەم حاڵەمان هەروا بمێنێ
ئاواتەخوازین بەوەزعی دوێنێ

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## خۆشەویستی خوا[١]

### ١٥

١٩٤٨

پێغەمبەرەکەی خۆشەویستی خوا
هیچ کەسی ترت نەهاتووە لە دوا
دیارە هەر کارێک خوا پێی سپاردی
وات کرد کەس نەیکرد بۆیەکی ناردی
فرمانی خوای خۆت وا هێنایە دی
ناردنی کەسی دی پێویست نەدی
هەر چۆنێ ویستی تۆ وات کرد دەرکەوت
بەوە خاتەمیی خاتەمیت بەرکەوت
تۆیش خۆت چۆنت ویست سروشتت وایە
ئەمە خاتیمەی لوتفی خودایە

خۆی و فریشتەی بەدیاری تۆ
سلاواتیان دا لە دیداری تۆ
وا ئێمەیش ئەمری خوا بەجێ دێنین
سەڵەوات ئەدەین مەولود ئەخوێنین
بەڵام تاریکە هەموو لایەکمان
وا (جوو)یش تەماعی کردۆتە لاکمان!

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## خوا کاتێ ویستی(١)

### ١٦

١٩٤٩

خوا کاتێ ویستی خوایی بنوێنێ
ئەمرۆی بۆ دانایین لە شوێنی دوێنێ
ویستی رووی زەمین بێ بەکارزار
نەوەی ئادەمی هێنایە رووی کار
دنیا بەیەکدا هاتووە و ئەژەنێ
خۆیشی لەسەردا پێی پێ ئەکەنێ
لەو میانەدا دانای هەڵبژارد
رێ پیشاندانی خۆی بەوان سپارد
ئنجا ئەوانەی کە خوا ئەناسن
دەستی ئەوانە ئەگرن کە کاسن
ئەیانبەن بۆ سەر رێی عیلم و زانین
بۆ توێشووی رێگای ئەولا پێک هانین
دوو رێیە هەردوو سەریەک ئەچنەوە
کوێرایی نەبێ لێک جوێ نابنەوە
یەکێ تەریقەت، یەکێ شەریعەت
ئاشکرا و پەنهان هەردوو حەقیقەت
حەقیقەت دەریا و شەریعەت گەمێ
تەریقەت غەرقە گەر لادا کەمێ



تەریقەت لەسەر سێ قوەت بەندە
بەو سێیە خوای خۆی ئەناسێ بەندە
یەکەمیان فەنا و دووەمیان وەفا
سێیەم لیقایە سەمەرەی جەفا
فەنا خۆ بەخۆ رسگار کردنە
بە کوشتنی نەفس گرەو بردنە
وەفا پەیمان و شەرت بەجێ هێنان
ئنجا ئەگەیتە لای لیقای یەزدان
کە لە خۆت برای دۆست لات حازرە
جاو شۆرا و کوترا ئنجا گازرە
ئەوی کە ئەهلە، گشت کاری سەهلە
خودبینی پیشەی شەیتانە جلە
کە نەفست فرۆشت زیوێکی قاڵی
خۆفرۆشیت کرد دیزەی بەتاڵی
نوێژت بەقەزا ئەگەڕێتەوە
دڵی دۆست رەنجا ئەبڕێتەوە
مایەی خۆشبەختی قەلەندەرییە
هەرچەند لە ریش و سمێڵ بەرییە
کە هاتە سەر رێی رەزا و قەناعەت
پادشاهێکە بێ رەنج و میحنەت
دنیا هەر چۆنێ، بیگری وا ئەڕوا
کە دووی نەکەوتی ئەوت دێ لە دوا

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## ناڵەی کۆن

### ١٧

١٩٤٥

خوایە زیندەگی بدە بەدڵم
هێندە دڵ مردووم بۆ خۆم خەجڵم

من خۆم نازانم داوای چیت لێ بکەم
هەر ئەوەم ئەوێ ڕێی لای تۆ دەرکەم
شێتی وا هەیە شەق ئەوەشێنێ
عاشقە و شێوەی شێتی ئەنوێنێ
من دێوانەی تۆم بەتاقی تەنیا
وا شەق هەڵئەدەم لە هەردوو دنیا
ئەو ڕۆژەی گڵی لەشت داڕشتم
تۆزێک لە لیقای خۆتت تێخستم
وا بەو مایەیە، گەیشتمە مەرام
تەنها تۆم ئەوێ بەهەشت پەشمە لام
ئەوەی بەماڵی دنیا باییە
چاوی لە گەنج و پادشاییە
پیشەی هەڵکردی من گەداییە
مەیلی تۆ بۆ من شادی و شاییە
ئەزانم منت بۆ خۆت دروست کرد
هەوڵ و حەسوودیت لە دڵم لابرد
تۆ بۆت دانابووم من بەشی خۆم برد
کەوابوو هیچمان زیانمان نەکرد
خۆت لە قورئانا وەهات فەرمووبوو[١]
«رضي الله عنهم ورضوا عنهُ»

........................................................

(١) لەلاپەڕە ٣٨٢ی دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا نووسراوە: (خۆت لە قورئاندا ئاوەهات فەرموو)

***

## سەرمەستی ڕووسوور

### ١٨

١٩٤٣

خوایە ئەم دڵەم هێزێکی بەرێ
کە غەم لەناو خۆی بکاتە دەرێ



من خۆم نازانم چی بۆ من چاکە
تۆ بەمەیلی خۆت دڵم ئاواکە
پایەی تۆ ناسین ئەگەر دەرکەوێ
ئیتر کێ دنیا و دیناری ئەوێ؟
من کە دێوانەی تۆبم بەتەنیا
شەقێک هەڵئەدەم لە هەردوو دنیا
دڵم هەمیشە یادی تۆ ئەکا
گیان لە ڕێی تۆدا جستوجۆ ئەکا
لەم خۆشیانەدا ئەگەر بێ و بمرم
بۆنی تۆی لێ دێ گیاکەی سەر قەبرم[١]
بەهەشت مەدح ئەکەن بەناو و داوێ
من لیقای خوام بێ بەهەشتم ناوێ
عاشق کە بەڕاست دەستی لە گیان شت
پەکی سەیران و گەڕانی خۆی خست
دیارە کە یاری ئەو وەفایەی دی
کامی ویساڵی بۆ دێنێتە دی
خوایە ئەیزانی کە من تۆم ئەوێ
مەعشوق چە ڕایەی بەتۆ ئەکەوێ
خوایە نامەوێ تاعەتم زۆر بێ
نەوەکا نەفسم بەوە مەغرور بێ
خۆم بەگوناهکار ئەدەمە قەڵەم
تۆ خۆت فەرمووتە حەز لە عەفوەکەم

........................................................

(١) ئەم بەیتە لە دیوانی م.هـ دا چاپ نەکرابوو.

***

## بۆ مەولود

### ١٩

١٩٤٥

پێغەمبەرەکەی خۆشەویستی خوا
هیچ کەسی ترت نەهاتووە لە دوا

زۆر پێغەمبەر هات بەرودوا تێکڕا
خاتەمی خاتەم، بەهیچ کەس نەبڕا
بەر لەوەی ئادەم کەوا «صفی» بوو
تۆ «مصطفی» بووی بەڵام خەفی بوو
مایەی خیلقەتی ئەفلاک «لولاک»ە
بە «الم نشرح» سەدری تۆ پاکە
«والضحی» سوێندی پڕ نووری ڕووتە
«واللیل» بۆ طوڕەی سەودای مووتە
نێرگز «مازاغ البصر» جوانی کرد
سوورمەی طوور چاوی تۆ هەرزانی کرد[1]
مانگ بەپەنجەی تۆ دوو کەرت و شەق بوو
پەروێز[2] بەنامەی تۆ جێی پێ لەق بوو
بوومەلەرزەی تۆ کەوتە دنیاوە
لەوساوە گوڵی «ساوە» هەستاوە
«سبحان الذی أسری» سەراتە
«قاب قوسی»نیش، (أدنی) جێگاتە
سوورەی «والنجم»ت ئەدرەوشێتەوە
گوڵی ئاینت ئەگەشێتەوە
«انا فتحنا»ت طورەی بەیداغە
ئایەی «مزمل» کەوای شیرداغە
خوا سڵاواتی لە دیدارت دا
ئەو نوورەی دیارە لە دیدارت دا
تۆ نەبوویتایە، بەئاگری نەمروود
نەسلی ئیبراهیم نەدەبوو مەوجوود
ئەو ئیبراهیمەی تۆ نەوەی ئەوی
لە کوردستاندا دەرکەوت برەوی[3]
باپیرە گەورەت فەخری کوردانە
مەڵبەندی ئەوە ئەم جێ و مەکانە
توخوا هەر لەبەر دڵی ئیبراهیم
دەردمان دەواکە، کە هەر تۆی حەکیم
تۆ و ئەم ڕۆژەی تۆی تیا هاتیە دنیا



چارمانکە هیوای بەتۆیە تەنیا
هەروەک (رحمة للعالمین)ی
دیارە تەنگانەی ئێمەش ئەبینی
تۆ خۆت ئەزانی کە کورد دیندارن
بە ئاینی تۆ سەلابەتدارن
خۆمان بەئەهلی ئیمان ئەناسین
کەچی کەچڕەوین بۆیە کەساسین
کە تۆ لە لای خوا خاترت ئەگیرێ
وا بکە نیفاقمان لەناو هەڵگیرێ
ئەوسا ئەبینی چە ئوممەتێکین
لە ڕێی خزمەتی ئایندە یەکین

..........

(١) کە تیشکی خوا لە چیای (طور)ی داوە لە سینا. چیاکە هەمووی سووتاوە و بووە بەکل. لەبەر ئەو هۆیە لە کۆنەوە لە کوردەواریدا کل بەشتێکی پیرۆز دانراوە.

(٢) پەروێز: مەبەست لەو نامەیەیە کە پێغەمبەر بۆ (خەسرەوی پەروێز)ی شای ئێرانی نارد، هەتا موسوڵمان ببێت شاعیری مەزنی کورد (خانای قوبادی) لە کتێبی (شیرین و خەسرەو)دا باسی ئەم ڕووداوە دەکات. بڕوانە ئەو کتێبە کە بەڕێز ئەدیبی قەڵەم ڕەنگین (محەممەدی مەلا کەریم) پێشەکی بۆ نووسیوە و ساغی کردۆتەوە و لە چاپی داوە.

(٣) لە قورئاندا هاتووە دەڵێت: ما کان ابراهیم یهودیاً، ئەمە بەلای پیرەمێردەوە وەها ساغ بۆتەوە کە ئیبراهیم کورد بووە.

***

## ناڵەی پیری پیران

### ٢٠

١٩٣٧

ئەی بەخشایندەی خاوەندی عەتا
ئەی خوداوەندی پۆشندەی خەتا
ئەی بێ نیازی تەواو نەناسراو
ئەی تەنهای ناودار هەزار و یەک ناو
ئەی دەسەڵاتدار، دەست ناگاتە تۆ
ئەی پەروەردگار، هانای گشت بەتۆ
نەشئەیەک بدە بەگیانی مردووم
ڕووناکی چاوی هەوا کوێر کردووم
خوایە نازانم چیم لە تۆ بوێ؟
هەر چیم بدەیتێ من ئەوەم ئەوێ

پەروەردگارا عوزرم پەسەندکە
لە ڕاستی گوناه جڵەوم توندکە
هەموو عومری خۆم خۆم دام بەبادا
هێشتاکو شەیتان یەخەم بەرنادا
بوون و نەبوونم لەلا یەکسان کە
لە وەختی غەمدا شادیم ئاسان کە
خوایە ئەترسم لە گوناهی خۆم
دەستم ڕاکێشە دەستەوسانی تۆم
خوایە خوماری تۆم وا لەسەردا
شیعری سوپاسی تۆم وا لەبەردا
سەر و زمانم بەفکر و سەنات
هەر وا بێڵەوە هەتا دێمە لات
نەنگی دنیایی لە لای من خۆشە
بە نەنگی لای خۆت من دامەپۆشە
سەرم بەسەودای عەشقی تۆ گێژە
خاکی ڕووزەردیم پیادا مەبێژە
خۆشەویستی تۆم هەڵبژارد بۆ خۆم
لە ڕێی ڕەزاتا هەروا بەڵاجۆم
(گەمێ)یەکی نووح، بڕەخسێنە بۆم
لە گێژ سەرکەوم ئەکەومە بن گۆم
پەروەردگارا هەر چیت هەڵبژارد
خەرمانی هەستی ئەوەت دا بەباد
بەوە موفلسن خەڵک کەنیانە
من بەبوونی زۆر ماڵم وێرانە
فەزڵت بێ گران شوکرت بێ زیان
غەیری تۆ کەسم نییە لە جیهان
خوایە ئەو کەسەی کە تۆ ئەناسێ
کەسی تر ناکڕێ بە لەتە داسێ
مەیلی تۆ وا بێ بچمە جەهەننەم
بەهەشتم ناوێ بەڕەزا بەندەم



خوایە دانام کە، نەک دانای بەدحاڵ
بیناییم بەرێ پێی نەکەومە چاڵ

***

## ناڵەی پیری پیران

**٢١**

١٩٣٧

پەروەردگارا ئەگەر هەر موویێ
زبانێکم بێ شوکرانە گۆیێ
شوکری نیعمەتی تۆ تەواو ناکەم
لە چیت سروشتدام من هەر ئەو خاکەم
ئەو زبانەی من شوکری پێ ئەکەم
تۆ پێت بەخشیوم بێ زیاد و کەم
خوایە سری خۆم لای هەرکەسێک وت
خۆمی پێ سووتام وەک سەرەبزووت
هەر تۆی مێروولەیش ڕازی بەتۆبە
سووتاوی شەوقت سازی بەتۆبە
دەرگای بزورگان شەو دائەخرێ
قاپی تۆ بەشەو هانای بۆ دەبرێ
گەورەی دنیایی دەستی بچووک ئەگرن
بەو چاکەیە خەڵک لەبەریان ئەمرن
تۆ خوداوەندی کە خەڵقت کردووین
شەیتان گەورەیی تۆی لەیاد بردووین
لەگەڵ ئەوەشدا هەر تۆ بەخشندەی
ناڵمان نابڕیت کەرەم کونندەی
خوایە پێم خۆشە، سەرم ببڕە
پەردەی نامووسم بەخەڵک مەدڕە
خۆت ئەزانی خەڵک چەند بێ مروەتن
هەلیان بۆ هەڵکەوت چەند کەم فرسەتن

بەسكی برسی دامنێ لەسەر بەرد
بەڵام مەمخەرە دەست پیاوی نامەرد

***

## نالەی پیری پیران

## ٢٢

١٩٣٧

خوایە هاوارم تەنها بەتۆیە
تۆ نەبی عالەم بەچڵ و چۆیە
دوو باڵم بەرێ کە پێی بفڕم
باڵی دوو تەیری نەحسی پێ ببڕم
یەکەم کۆلارەی تەماعی نەگبەت
دووهەم سیسارکەکەچەڵەی شەهوەت
ئەگەر ئەم دوانەم توانی باڵ شکاند
نێچیری مەردیم لە دنیا فڕاند
خۆ ئەگەر هەروا ئەم دووانەم سوار بێ
ئەبێ ناوی من کەری ژێر بار بێ
خوایە وا من خۆم تەماعم ناوێ
فەرموو ئەو وازم لێ بێنێ تاوێ
روو بکاتە شوێنێ کە ئەویان ئەوێ
شەو و ڕۆژ دڵیان بۆ ئەو نەسرەوێ
تەماع پارەیان پێ کۆ بکاتەوە
هەتا لە تۆیان دوور ئەخاتەوە
لەبەر مەرگ حاڵی دنیا ئەگۆڕێ
خۆ دیارە پارە ناچێتە گۆڕێ

***

## نالەی پیری پیران

## ٢٣

ڕەهنومای گوم بووی هەردەی هەوایی
ئەلەکتریکی تەلی بینایی



ڕێم لێ شێواوە و گەردەنشینم
بینایـیم لێڵە و تۆی پێ نابینم
ڕێگام نیشان دە پادشای بزورگ
گورگی بۆزت کرد بەدەلیل بۆ تورک
(یونس)ت لەناو زگی ماسیدا
ژیان و چرای لیقای خۆت پێدا
ئەو «لا اللە الا أنت»ەی گوت
بەزەییت پیا هات ڕەحمەت بۆی بزووت
من لە ئەزەلدا ئەمەم کردە بەر
بۆیە باوەڕم کرد بەپێغەمبەر
نامەوێ بیشبم بەفرستادەت
تەنها سەرخۆش بم بەنەشئەی بادەت
هۆشێکت داومێ کە دنیام نەوێ
خۆشەویستی تۆم ئەگەر بەرکەوێ
با وجوود میهرت پیاو ئەسووتێنێ
کەڵکی خواردنی خۆشی نامێنێ
قەیناکا ئیتر هیچی خۆش ناخۆم
تەنها مەیلێکی خۆت بنێرە بۆم

***

## نالەی پیری پیران

## ٢٤

تەنها خوایەکەی زەوی و ئاسمان
لە هەموو شوێنێ، پەیدایت و پەنهان
لە بەندەگیدا بەوە سەربەرزم
کە لە دیوانی تۆدا ئەلەرزم
ئامان چەند خۆشە کە ڕادەوەستم
جار جارە بۆ تۆ نوێژ دادەبەستم
الحمد ئەخوێنم، ڕوو لە تۆ ئەکەم
بەغائبانە حەمدت بۆ ئەکەم

کە گەیمە ئەوەی بڵێم -إیاک-ە
بەنەشئەی حزوور دڵم رووناکە
چونکە ئەو دەمە وام لە حزوورا
دڵم خۆی ئەشوا لە دەریای نوورا
ئەچمە لای پیاوێ کەوا گەورە بێ
بە فەیزی خوایی گەورەی دەورەبێ
خۆ ئەگەر وەک من جلی چڵکن بێ
بەریش و سمێڵ چارەی کوڵکن بێ
لە لای قاپیەوان هەر دەرکراوە
هەر قاپی تۆیە کە نەگیراوە
بە ئەندامێکی پڕ گوناهەوە
بۆ نوێژ ئەچینە ریزی شاهەوە
من کە لیقای تۆم هەرزان دەسکەوێ
لە بوردەبازی بەندەت چیم ئەوێ
خوایە وام لێ بکە ئاگام لە خۆم بێ
کە وتم (الله) هەر لەگەڵ تۆم بێ
نەوەک بەزبان دوعا بخوێنم
لە دڵدا رەگی خەڵکی دەربێنم
بە رەزامەندی دڵم پڕ جۆش بێ
هەرچی تۆ بیکەی ئەوەم لا خۆش بێ
کە هەر چیت کرد و بەچاکم زانی
دەستم ماچ ئەکات خۆشگوزەرانی
ئەگەر شێتی بێ شێتی تەواو شێت
خاک و خار و زیخ ئەکەونە بەر پێت

***



## ناڵەی پیری پیران

### ٢٥

١٩٣٧

خوایە بەعەقڵ رێم پێ نەبردی
پێرێژنانە بڕوام پێ کردی
دوای ئەوەی زانیم کەوا تۆ خوای
بۆ بێکەس کەسی و بۆ داماو پەنای
ئیتر زۆر وردی ناخوێنمەوە
گوریسی حیکمەت ناهۆنمەوە
چونکە پێغەمبەر عەقڵی کوللی بوو
لە تۆ ناسیندا عەقڵی کولی بوو
«قاب قوسین أو ادنی لدیک»
فەرمووی، « لا احصی ثناءً علیك»
نامەوێ کونهی زاتت بزانم
لە گەورەییتدا مات و حەیرانم
بەڵام ئەمەوێ بەسۆزێکی عەشق
خۆشەویستی تۆم ببێت بەسەرمەشق
سەرمەشقی عەشقی پەنهانی وابێ
کەس پێم نەزانێ و تۆم لە دڵا بێ
ئەو(سەنگ تەراشە)ی[1] لە کێوی طوور بوو
بە عەشقی تۆوە لە عالەم دوور بوو
ئەیگوت: تۆ وەرە لام بەمیوانی
ئەچوو لە لای شوان شیری ئەهانی
شوکور من ناڵێم وەک من نەوسنی
ئەیزانم دائم میوانی منی
یەعنی حازری هەمیشە لە لام
بەڵام من بۆ نەوس لە تۆ تەوەڵام
تو خوا تۆ هەرچەند کە، لامەکانی
کە بۆ خانەی دڵ تەشریفت هانی

فـەرمـوو هەچ کـەسی تیـایە با هەسـتێ
نەنگە لای ئاغـا نۆکـەر بوەسـتێ
(اذا جـاء الحق زهق البـاطل)
زاخـاوی دڵـی پێ ئەبێ حـاسڵ
ئەو زەوقـەی نووری مـەعـریفـەت ئەیدا
گـەنجی ڕووی زەمین پێی نابێ پەیدا
یاخـوا بەبادەی عـەشـقت سـەرخـۆش بم
تا ئەچمە ژێر خاک مەست و مەدهۆش بم
من کـە لە زەوقی دنیـا مـوسـتـەغنیم[١]
ئیـتـر بەلیـقـای مـەیلی تۆ ئەژیم
کـەس لە قـاپی تۆ، نائومـێـد نابێ
بـا ئـەم داوایـەی مـنـیـش ڕەوابـێ

........................................

(١) نیشانەیە بۆ ئەو چیرۆکە فارسییەی کە ناوی (سەنگ تەراش)ە. ئەو چیرۆکە هەڵبەستە و سەرەتاکەی ئەڵێ:

سەنگ تەراشێ بوود اندر کـۆهی طور
سەنگ تەراشی کرد گفتا یا غفور

کورتەی چیرۆکەکە ئەوەیە کابرایەکی دێوانە لە بەرد قاپ و قاچاغی داتاشیوە و لە شوانەکان شیری پەیدا کردووە و زیافـەتی بۆ خوا کـردووە کە ببێت بەمیـوانی و لەناو ئەو قـاپە بەردانەدا ئەو خۆرشـتـانەی بۆ پەیدا کـردووە کە بیخوات ئەم چیرۆکە بەشێکە لە چیرۆکەکانی ناو کتێبی (ئیسماعیل نامە) م.هـ.

(١) ئەم بەیتە لە نوسخەی م.هـ دا چاپ نەکراوە.

***

## ناڵەی پیری پیران

### ٢٦

خـوایە ئەوانەی کـە بێ باوەڕن
هیـچـیـان نەدیوە وا هەڵـەوەڕن
ئەگـینا سـەیری باغـێکی گـوڵ کـەن
تەمـاشـایەکی بەعـەقڵ و دڵ کـەن
ئەو ڕەنگە جوانەی پەڕەی (هەرجایی)[١]
بە زەڕەبینی تیـشکی بینـایی



لێی ورد بینەوە کـە ئەو سنعـەتە
کێ دەڵێ زادەی خـووی تەبیـعـەتە؟
گەڵای (گوڵ پەسەند)[٢] کام مەقەست بڕی
(پەردە عـروسی)[٣] کێ پەردەی دڕی
کـێ هـات (لاولاوی)[٤] بـەدارا ئـاڵان
کام دەست گەردەنی (وەنەوشە)ی شکان
ئەمـانە نەیسـا بڵـێین بێ گـیـانن
مـادەیەک ڕووی دا زۆر کـەس ئەیزانن
ئاغـای شـیـوەکـەڵ یەکـێکیـان تیـابوو
کـە ئاغـال ئاغـای قـادراغـای ناوبوو
پێی بریندار بوو، لێی کـرد بەخـۆرە
ئەهاتنە سـەری حـەکـیم بەنۆرە
ڕۆژێک (مـەولەوی) حـەکـیـمی بانە
پێی وت ڕەحـمـت بێ بەم منـاڵانە
ئەم دەردە پیـسـە ئەتەنێـتـەوە
پیـاو ئەبێ لێـیـان دوور کـەوێتـەوە
ئـاغـا لـە دوور دێ چووە بن دارێ
ڕاکـشـا و ڕوانی بۆی کـشـا مـارێ
ئەمـیش بێـزار بوو چاوی لێ قـووچان
تا هاتە سـەرپێی خـۆی هیچ نەجـووڵان
هەرچەند خەڵک و خوا لە دوور پەیدابوو
تا ئەوان هـاتن مـار پێـوەی دابوو
پێی چاک بـوەوە وەک دۆخی جـاردی
خـۆ ناڵێن ئەمـەش تەبیـعـەت ناردی
بەردە زلەکـەی ناو ئاوی دووکـان
کـە بۆ ئەندازەی ئاو بووە بەنیـشـان
شـارە مـێـروولەی لەناودا ئەژی
ئەویش تەبیـعـەت هێناویەتە دی؟
ئەم ئاسـمـانە کـە بێ سـتـوونە
بـۆ کـردەوەی تـۆ بـوو بـەنمـوونـە

چەرخی ماکینەی ئەم ڕۆژ و شەوە
بێ هەڵم و بەنزین ئەسووڕێتەوە
چەوری پێ ناوێ هیچ ژەنگ ناگرێ
لێک هەڵناوەشێ دەستی تێ نابڕێ
ئاش بێ ئاش وەستا ناسووڕێتەوە
گا جووت بێ جوتیار ناگەڕێتەوە

---

(١،٢،٣،٤) ئەوانە ناوی گوڵن.

***

## ناڵەی پیران

## ٢٧

١٩٣٧

خوایە فەرمووتە، خۆت لە قورئانا
لە پەرستشی جن و ئینسانا
خەلقی جن و ئینس، بۆ عیبادەتە
پەرستنی تۆ ڕێی سەعادەتە
حەدیسی قودسیش هەردوو یەک باسن
کەنزی پەنهان بووم ویستم بمناسن
ئەو بۆ عیبادەت، ئەم بۆ ناسینە
ئەم دوو ئایەتە بۆ یەک ئایینە
(خلقت الخلق لكي أعرفُ)
بۆ کێ دەست ئەدا هەروا زوو بەزوو
سا مەگەر ڕشتەی هیدایەتی تۆ
بۆ ئەو ڕایەڵە بێت بەتان و پۆ
«ئەگینا بێ تۆ ئەو ڕێی ڕەحمەتە
نوقتەی دێتە سەر دیارە زەحمەتە»[١]
تو خوا با ڕەحمەت نەبێ بەزەحمەت
(نبی)ت بەڕەحمەت ناردووە بۆ ئومەت



دیارە موحتاجی دوعای عەبدت نیت
ئەگەر نەتناسن تۆ دەربەستی چیت؟
ئەزانم بۆچی وا لوتف ئەنوێنی
دەستنیژی خۆتن نایانشکێنی
دیارە ئاو خەلقی پەروەردگارە
سنعەتێکی وای لێوە دیارە
«ئەو دارەی کە خۆی هێنابێتیە بەر
نوقومی ناکا ئەیخاتە سەر سەر»[٢]
دیسان فەرمووتە کە پەروەردگار
زۆر لە لای خۆشە عەفوی گوناهکار
بزانە زەوقی عەفوی من چەندە
گوناهکار ئەبێ بەعەبدی بەندە
خۆمن ناوێرم ئەمە بێنمە دی
ئەگینا منیش عەفوی تۆم ئەدی
بەڵام ئەویشە باسێکی جوێیە
ئەو پیاوەی لەوە بگات لە کوێیە؟!
من لە مانەم چی پیرێژنانە
ئەتناسم ناچمە سەر گوێسەوانە
من ئەمەم بەسە هەتاکو دەمرم
زەوقێک لە یادی عەشقت وەرگرم
خۆش گوزەرانی بەدڵخۆشییە
ئاڵاندنە دنیا فەرامۆشییە
دنیا داوێکە کەوتووینە ناوی
دینمان ئەخەینە بەها و پێناوی
حەدیسە دنیا و دین یەک ناگرن
هەر لایەی داوێک لە یەک دائەبڕن

---

(١) پیرەمێرد ئەو شیعرەی لە مەولەوییەوە وەرگرتووە و هەر خۆی لە شوێنێکی تردا ئەو شیعرەی لە هەورامییەوە گۆڕیوە بۆ شێوەی سلێمانی بەم جۆرە:

ڕەحمەت و زەحمەت نوقتەیان فەرق بوو
ئەو نوقتەیە بوو کە لەمن تەوق بوو

من لە (ز)ێی زەحمەت نوقتەم ئەکرِان
بە(ر)ی ڕەحمەتدا ئەو مێشی ئەڕیان

(٢) ئەو بەیتە بیرەکەی شیعرێکی فارسییە و وابزانم شیعری حەکیمانەی (سەعدی)یە و سەرەتای شیعرێکی کوردی خۆی دەست پێ کردوە. هەروەها (مەولانا خالدی نەقشبەندی) لە شیعرێکیدا بەفارسی دەڵێت:

«گویند چوب زاب بو دپرورش پذیر
اورا ازان خرونبرد آب خوشگوار»(*)

(*) یادی مەردان. مەلا عەبدولکەریمی مودەریس بەرگی یەکەم ل٥٢١.

***

## ناڵەی پیران

## ٢٨

١٩٣٨

خوایە من زۆرجار دێمە سەر ئەوە
ئەوەی ئەیبینم پێی بڵێم خەوە
هەموو کردەوەی تۆ عەدالەتە
هەموو دەورێکیش زاڵم، ئالەتە!
تا یەکێک نەدەی بەکوشت بەوی تر
کەس کورسی جاهی بۆ نابێ ئیتر
تا لەقە نەدات بەدارا یەکێ
تۆو بۆ ئەوانەی ژێر دار ناتەکێ
بە دیمەن ئەمە عەدالەت نییە
بەڵام بەمەعنا کەچ دیدەنییە
ئێمە تێناگەین لە ئەسراری غەیب
هەر خۆت ئەیزانی حاکمی بێ عەیب
غەیری تۆ حاکم کێیە دائم بێ
تا ئەبەد لە شوێن خۆیدا قایم بێ
هەموو حاکمێک تابعی ئەمرن[1]
یا عەزل ئەکرێن یاخو هەر ئەمرن
کەس لەتۆ ناکا و، تۆ لە کەس ناکەی
ئەو خوداوەندە، گەورە و بێ باکەی



ئەزەلییەتت سەرەتای نییە
ئەبەدییەتت مونتەهای نییە
شوێن ئەزەل کەوتین هەر سەربەرەوژوور
گەردی ڕێگەشمان نەئەدی لە دوور
گەڕاینەوە سەر ئەبەد سەرەوخوار
لەڕێدا گوم بووین کەوتینە هاوار
داد لە دەست سڕی عیلمی ئیبتیدا
بێداد لە ڕشتەی توولی ئینتیها[2]
کەوا بوو ئێمە ڕەخنەی چی بگرین
ئێمە نازانین خۆمان کەی ئەمرین
کە زیندەگیمان بەئەمری تۆ بێ
پیشەمان بۆچی هەر چڵ و چۆ بێ
لوتف دەربارەی خراپ بنوێنی
ماڵی هەژاری پێ بڕووخێنی
ئەگەر بێت کەسێک بڵێ: چی ئەکەی؟
بە زاڵم دەڵێی تێی هەڵدە سا دەی
ماڵ ماڵی خۆتە و بەندە بەندەی خۆت
چی دەکەی بیکە خۆ وا لواوە بۆت
(لایسأل) بووە بەقفڵی دەممان
هەڵدەکەین لەگەڵ شعووری کەممان
بەڵام خۆت سەرمان بشکێنە بەبەرد
مەمانخەرە دەست هەتیوچەی نامەرد[3]
پیرێژن ئەڵێت: خوا خەتا پۆشە
هەرچی لای خواوە، بێ پێمان خۆشە

............................................

(١) لەو بەیتەدا دووجار -هەموو- نووسرابوو واتە لە نوسخەی م.هـ دا
«هەموو حاکمێک تابعی ئەمرن
یا عەزل ئەکرێن یا هەموو ئەمرن»
بەڵام ئەوی ئێمە نووسیمان ڕاستیەکەیەتی لە ژینی ژمارە ٥٤٨ی ساڵی ١٩٣٨ دا.
(٢) قافیەی ئەو بەیتە لای م.هـ بریتی بوو لە (ئیبتیدا، مونتەها) بەڵام لە ڕۆژنامەکەدا نووسرابوو، ئیبتیدا، ئینتیها.
(٣) لای م.هـ ئەو بەیتە لە شیعرەکەدا نەبوو. بەڵام لە ڕۆژنامەکەدا پیرەمێرد خۆی بڵاوی کردبووەوە.

## مانگی ڕۆژوو

### ٢٩

مانگی ڕۆژووە بەچلەی هاوین
ئاگری جەهەننەم پێی ئەبێ، بێ تین[1]
ئەوی بەڕۆژوو ئەبووڕێتەوە
دەرگای بەهەشتی بۆ ئەکرێتەوە
لێوی ڕۆژەوان کە بەڵغ ئەگرێ
پەردەی قاپی خوای بۆ لا ئەبرێ
کە دەست و دەم و زمانت پاراست
ئەوسا ئەتوانی بڵێی ڕۆژووە و ڕاست
خۆت برسی بیت و هەژارت تێرکرد
ئەوسا بزانە ئیمانت دەربرد
ڕۆژوو پەیڕەوی ڕێی یەزدانییە
وەک نوێژ و ڕۆژوو ڕیایی تیا نییە

........................................

(١) لای م.هـ نووسرابوو ئاگری جەهەننەم پێی ئەبێ، بەتین کە دیارە ئەوە پێچەوانەی مەبەستەکەی پیرەمێردە و ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئێمە نووسیمان.

***

## ئەو عەشقە

### ٣٠

١٩٤٧

ئەو عەشقەی لەگەڵ جنسی بەشەرە
بە هەوای نەفسە، دوایی بەشەڕە
خۆشەویستی خوا، کە بەگیان بەندە
وەک شەراب هەتا کۆن بێ پەسەندە
ئەو سەرمەستییەی کە لە ڕۆحا بێ
دڵ ئاوا ئەکا، هەر چەند ڕووخابێ



کە یادی خودا، هاتە دڵەوە
بەسۆز و ناڵە و جۆش و کوڵەوە
ژەنگی دڵ لەگەڵ فرمێسکی چاوا
پاک ئەکاتەوە و ئەیدا بەئاوا
دڵ پاک بێتەوە و ژەنگی نەمێنێ
عەرشی کردگار یەکسەر ئەبینێ
های لەو خۆشیە و لەو لیقای خوایە
سەڵتەنەتێکی ئەوتۆی تێدایە
شا بەسەپانی خۆی ڕاناگرێ
ئەم ڕووی زەمینە بەفلسێ ناکرێ
ئنجا با خاوەن پایەی جیهانی
بتوانێ شانی بدا لە شانی
ئەوانەی کەوا بەمەسنەت بایین
لەگەڵ چەرخ[1]گۆڕڕا، گشت چەرخی[2]یابین
خوایە شوکرانەی تۆ تەواو ناکەم
لە سایەی تۆوە من ئەو بێ باکەم
کە ئەم فەلەکە پێی نەڵێم وەلەک
شەکری چاییشم بووە بە(بەلەک)[3]
هەر لە ژوورەوەم هاوین و زستان
هەرچی ئازایە بۆم بێتە مەیدان[4]
جلی هاوینەم گۆڕی زستانە
ئەویش هی خەڵکە وا پێنج ساڵانە[5]
زۆر جل و بەرگی تازە ئەبینی
لەشی لەش پیسی تێدا نهێنی
کە مەرگ ئەو بەرگەی لێ ئەکاتەوە
تاتەشۆر لەشی پاک ئەکاتەوە

........................................

(١)چەرخ: ڕۆژگار، سەردەم.
(٢) چەرخی: جۆرە پارەیەکی کاتی دەوڵەتی عوسمانی بووە بەرامبەری بیست فلس بووە. واتا کە ڕۆژگار گۆڕاو وەرچەرخا هیچ کامیان یەک چەرخی ناهێنن.

(٣) مامۆستا م.هـ دەربارەی (بەلەک) دەنووسێت! لە شەڕی جیهانی دووەمدا فریای ئەوە نەدەکەوتن کە لە شوێنی خۆیدا شەکر بپالێون و سپی بکەن، بەڵکو هەر بەزەردی ئەیاننارد و تامی لە شیرینیی ڕەگی بەلەک ئەچوو. لای خۆمان ئەو سەردەمە تەموین ئەو جۆرە شەکرەی دابەش ئەکرد.

(٤) پیرەمێرد وەک لە زۆر شوێنی شیعر و پەخشانەکانیدا ئاماژەی بۆکردووە هەمیشە و چوار وەرزە لە ژووری قەلەندەرخانەکەیدا بووە.

(٥) مامۆستا م.هـ لەم بارەیەوە نووسیویە: لام وایە ئەو قاتە جلەی کە پیرەمێرد لەو دێڕەدا باسی ئەکات ئەو چاکەت و پانتۆڵەیە (بەهائەددین نووری) کە متصرفی سلێمانی بوو لە ساڵانی ١٩٤٢-١٩٤٣ دا پێشکەشی کردووە بەپیرەمێرد و قاتێکیش بۆ (بێکەس) بۆ تەقدیریان.

***

## (ناسینەوەی شیعری چەند شاعیرێک لە شیعرەکانی پیرەمێرددا و ئەو شیعرانەی کە پیرەمێرد وەری گێڕاون»

«ئەم بەشە بریتییە لە دەستنیشان کردن و نووسینەوەی دەقی ئەو شیعرە فارسی و هەورامییانەی کە پیرەمێرد وەری گرتوون و وەری گێڕاون، لە کاتی خۆیدا پیرەمێرد ئاماژەی بۆ ناو و شیعری شاعیرەکە کردووە و مامۆستا محەممەد ڕەسول هاواریش پەیڕەوی ناوبردنەکانی پیرەمێردی کردووە. بەڵام بەداخەوە هەندێک لەو شیعرانە لە کاتی خۆیدا نە پیرەمێرد ئاماژەی بۆ ناوی شاعیر و شیعرەکە کردووە، واتە وەک شیعری خۆی بڵاوی کردوونەوە و نەمامۆستا هاواریش بۆیان گەڕاوە هەتا ناوی شاعیر و دەقەکان بدۆزێتەوە، بۆیەکا لە دیوانەکەیدا وەک بەرهەمی پیرەمێرد ناسراوە.

ئێمە پاش هەوڵ و بەشوێندا گەڕان و ماندووبوونێکی زۆر توانیمان ئەم کێشەیە ساغ بکەینەوە. هەروەها بەئەمانەتەوە ناوی ئەو بەڕێزانەمان هێناوە کە پێش ئێمە هەندێک لەو دەقانەیان دۆزیوەتەوە و لە جێگای خۆیدا دەقی کارەکانیانمان نووسیوە.

## (شیعرەکانی مەولەوی)(١)

یەکەم:

### هاودەمی فەرهاد(*)

١٩٣٩

هاودەمی فەرهاد، سەرکردەکەی خەم
ڕێنەکەوت خەمان، جەمکەین لەگەڵ خەم
«هیوایەکم بوو بۆم نەچووە سەر
ئەمویست بەبۆنەی بۆنکز بێ کەدەر»



«ئای بەو یادەوە ئێستەش سەرخۆشم
بەو شنۆی بایە، هێشتا مەدهۆشم»
کاتێک بەو گەردن زیوی سافەوە
وەک ئاسکی خوتەن بەبۆی نافەوە
«لەو توون بۆ ئەو توون گۆمەتەی ئەبەست
عەتر ئامێز بوو ڕووی کۆ و هەرد و دەشت»
ئەو بۆنە خۆشە، شەماڵ ئەیپەخشان
دەرمانی دەردی دووری ئەگەیان
پەردەی دڵتەنگی لا ئەبردەوە
هەردەم ژیانی نوێ ئەکردەوە
دەرەنگت پێ چوو، چەواشەی چەپگەرد
تەسەللایەک بوو، ئەویشی لابرد
ئێستا ئەو گەنجە، ئەو لار و لەنجە
بەسەر پەنجەی زۆر دڵت کرد ڕەنجە
ئای لەش پڕ برین، دڵ بەخەریکی
دیدار بەم دووری، مەرگ بەو نزیکی
ئەلای کێ بەرین، داخوازی تەدبیر؟
هەی داد لە تەدبیر، هەی ڕۆ لە تەقدیر
خۆ ئەم بەدبەختەی خۆشی نەدیوە
بەختی ڕەشی خۆی زۆرتر ناسیوە
لەم چارەنووسەی قوربانی دولبەر
نەک جارێک چوار جار (الله اکبر)
«لە گێژی دەریای ئاشووبی زەمان
بۆ کەشتی خەلاس ئەبووە بادبان»

---

(١) ئەم ناسینەوە و ساغ کردنەوانە پەیوەندی بەشیعرەکانی ناو دیوانی (پیرەمێردی م،هـ)وە هەیە نەک شیعرەکانی کتێبی -ڕۆحی مەولەوی- کە پیرەمێرد خۆی لە ساڵی ١٩٣٥دا چاپی کردوە.
هەروەها سەبارەت بەژیان و شیعری مەولەوی تەماشای ئەم دوو سەرچاوەیە بکە:
١- دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەریس ١٩٦١ی زاینی.
٢- یادی مەردان: مەلا عەبدولکەریمی مودەریس لاپەڕە ٣٦٢ (یادی مەولەوی).

(*) ئەم شیعرە وەک دەبینی چواردە بەیتە. چوار بەیتی شیعری پیرەمێردە کە تێکهەڵکێشی کردووە لەگەڵی و دەبینی گۆڕینی شیعرێکی مەولەوییە بەناوی (خاڵوی مەنزڵ چی، سەرکردەکەی دەرد) وە لەلاپەڕە ٢١٥ی دیوانی مەولەوی مەلا عەبدولکەریمی مودەریسدا بڵاوکراوەتەوە. لە لاپەڕە ١٨٨ی دیوانی پیرەمێردی نەمری محەممەد ڕەسول هاواردا ئەم شیعرە بەشیعری پیرەمێرد دانراوە و نووسەر تەنها ئاماژەی بۆ نیوە دێڕێک کردووە کە پیرەمێرد لە مەولەوی وەرگرتووە کە نیوە دێڕی نەک جارێک چوار جار (الله اکبر)ە مامۆستا (عوسمان هەورامی) لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ٩٥ی ساڵی ١٩٨٤ ل٣٢دا ئەوەی دیاری کردووە کە ئەوە شیعری مەولەوییە و دەستنیشانی دیوانی مەولەوی و لاپەڕەکەی کردووە، بەڵام دەقی شیعرەکان و بەیتەکانی مەولەوی و پیرەمێردی جوێ نەکردۆتەوە و نەینووسیونەوە ئنجا ئەو بەیتانەی لەم دیوانەدا خراونەتە کەوانەوە شیعری پیرەمێردە ئەمەش دەقی شیعرەکەی مەولەوییە:

خاڵۆی مەنزڵچی، سەرکردەکەی دەرد
تەمام بەتۆ بی، ئای یە چێشت کەرد
وەختێ بەو گەردەن، سیم صافەوە
چون وەش غەزاڵان، وە بۆی نافەوە
دەورم دا وە پێچ، ئەو کاو و بەردە
بۆ پەخشانیش بێ، ئەی هەرد بەو هەردە
ئەو بۆ جەو تەرەف صوب نەسیم ماوەرد
هەر جە دوورەوە، زام سارێش مەکەرد
خەیلێ دێرت کەرد، ئافەرین چەپگەرد
بەو بۆ دڵشاد بیم، ئەویشت لابەرد
ئیسە ئەو گەنجە، بەو لار و لەنجە
ڕەنجە کەرد پەنجە، شی پەرێ (پەنجە)
ئێسە تەن وەی زام، دڵ وەی خەریکی
دیدار وەی دووری، مەرگ وەی نزیکی
ئەو لا کێ بەروون ئەی ڕاو تەدبیرە
ئاخ جەی تەدبیرە، داخ جەی تەقدیرە
خەیر، مەینەت زەدەی، جە گیان هەراسان
بەختە سیاکەی وێش، زووتەر ناسان
پەی فەنای ئەوهەم، جە دووری دڵبەر
نەک جارێ، چوار جار، الله اکبر

دیوانی مەولەوی – مەلا عەبدولکەریمی مودەریس لاپەڕە ١٩٥

تکایە بۆ تێگەیشتن لە واتاکانی هەر بەیتێک لە شیعرەکە تەماشای دیوانەکەی مەولەوی بکە. بەڵام ئەوی پێویست بێت سەبارەت بەموناسەبەی وتنی ئەم شیعرە، مامۆستا لە دیوانەکەی مەولەویدا وەهای باس دەکات:

لەم قەسیدەیەوە وا دەردەکەوێ کە لە لاواندنەوەی لاوێک لە شێخەکانی (پەنجە) و (پاپالە)دا وترابێ. ئەو لاوە کەوتبێتە خوار و لەشی تێکشکابێ و برابێتەوە بۆ ماڵ و لەوێ مردبێ، وە وا دەرئەکەوێ لەسەفەرێکی ڕاوا ڕووی



دابێ، وە مەولەوی بەم قەسیدەیە گلەیی لە کابرای بنەی ڕاوچییەکان بکا کە بۆچی ئاگاداری ئەو کوڕە نەبوو تا وا بەسەر هات.

هەروەها پیرەمێرد ئەم شیعرەی جارێکی تریش گۆڕیوە و لە ژینی ژمارە ٨٣٤ی ساڵی ١٩٤٦دا بڵاوی کردۆتەوە. ئەم شیعرەی لەژێر ناوی (مەولەوی)دا بڵاو کردۆتەوە. ئەوا بۆ بەروارد ئەویش دەنووسینەوە:

«شۆخی دیدەبان، سەرکردەکەی دەرد
هیوام بەتۆ بوو، ئاخ هەناسەی سەرد
وەختێ بەو گەردن سیم سافەوە
وەک ئاسکی ختوتەن بەبۆی نافەوە
هەزارەت ئەکرد لەسەر شاخ و بەرد
پرچت پەخش ئەبوو لەم هەرد بۆ ئەو هەرد
ئەو بۆنە خۆشە شەماڵ ئەیهێنا
هێندە نەدەما دووری لەبەینا
چەپگەرد دەردێکی هێنا دەستوبرد
بەو بۆنە شاد بووم، ئەویشی لابرد
ئێستا ئەو گەنجە، ئەو لارولەنجە
پەنجەی ڕەنجە کرد بردی بۆ پەنجە
ئێستا لەش برین دڵ بەو خەریکی
دیدار بەو دووری مەرگ بەو نزیکی
هانا بەرمە کوێ بۆ ئەم تەدبیرە
ئاخ لەم تەدبیرە داخ لەم تەقدیرە
هەر چەندە لە کەس ڕام نەپرسیوە
بەڵام بەختی خۆم زۆرتر ناسیوە
مل کەچی تیغم لە دووری دلبەر
نەک جارێ چوار جار (الله اکبر)

***

## تێ چێن

لە دیوانی (ڕۆحی مەولەوی) پیرەمێرددا، دەقی هەورامی ئەم چوارینەیە نەنووسراوە و پیرەمێرد ناوی ناوە (تێ چێن) واتا شیعری خۆیەتی و لەگەڵ شیعری مەولەویدا تێ چێنی کردووە. بەڵام وەک ئەبینین چوارینەکە تەواو کاریگەری مەولەوی لەسەرە!

«وام زانی ئارەق خوێناوی دڵمە
زەدەی پەیکانی موژگانی دڵمە

وتم دڵ تامی زامی بردەوە
ئاخ بای باوەشێن ساردی کردەوە»
***

## بڵاوە کەوتە ناو هاوماڵانم

ئەم شیعرەی مەولەوی دەقەکەی لەلاپەڕە٥٤٠ی (دیوانی مەولەوی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس)دا نووسراوە. پیرەمێرد دووجار گۆڕیویەتی بۆ سەر شێوەی سلێمانی، جارێک لە لاپەڕە ٢٢٣ی دیوانی پیرەمێردی م.هـ دا بڵاوکراوەتەوە بەناوی (وا دوا بەدوا) و مامۆستا هاوار بەناوی پیرەمێردەوە بڵاوی کردۆتەوە. جارێکیش پیرەمێرد لە ژمارە ٩٥٧ی ڕۆژنامەکەیدا (ژین) لە ساڵی ١٩٤٩ دا بەجۆرێکی جیاوازتر بڵاوی کردۆتەوە. بۆ ساغ کردنەوەی لێرەدا هەرسێ دەقەکە دەنووسین هەتا خوێنەر بەراوردەکەی بۆ دەرکەوێ:

شیعرەکەی مەولەوی:

یاران بەرشیەن جەی زێد و زامن
گرد تەفرەقە بین چون خەیاڵی من
گەرد کۆچشان ئانا دیارەن
دەک لێلاویت بۆ چۆنت قەرارەن
سەنگی بارهۆش، پێش بار فامت
دەواری شادی چیخی ئارامت
لوان چەنی کۆچ، خاڵۆکەی هام فەرد
ئێستە بار وستەن نەهەوارگەی هەرد
تۆ چێش مەکەری کەم هۆشی کەم فام
پەرێ عەیب و عار مەندەنی جەلام
ساچەنی ئەرواح یاوە وەیاران
باتەن بۆ وەسەنگ مەندەی هەواران

دیوانی مەولەوی ل ٥٤٠

دەقی دیوانی پیرەمێردی م.هـ

### وا دوا بەدوا

وا دوا بەدوای یەک کۆچیان کرد ئاوەڵ
تەنها من ماوم پێم ڕۆچۆتە گڵ



یاران بەپەلی دەورانی دوژمن
بڵاوبوونەوە وەک خەیاڵی من
تۆزی دوای کۆچی ئەوان دیارە
بەو تۆزە چاوی دڵ بێ قەرارە
شوێن هەوارگەیان، کوچک و کەڵەکە
بەردی پڕ دەردی دەشتی فەلەکە
ئەو بەردە ڕەشەی کوچکی ئاگردان
هەم بەختی منە و یادی هام فەردان
بەوە تەسەللای دڵی خۆم ئەدەم
کەوتوومە دوایان بەماوەی زۆر کەم
ڕۆیین باشترە لە زویری و زاری
مەرگ لەگەڵ ئاوەڵ جەژنە و کەیفداری

لەو گۆڕینەی پێشوودا پیرەمێرد بیر و کەشی شیعرەکەی مەولەوی وەرگرتووە و خۆی دای ڕشتۆتەوە. بەڵام لەم گۆڕینەدا کە ساڵی ١٩٤٩ بڵاوی کردۆتەوە خۆی بەستۆتەوە بەدەقی شیعرەکەی مەولەوییەوە و (دە) بەیتی لەو دوانزە بەیتە گۆڕیوە وە لە دوای بەیتی دەیەمەوە هەتا بەیتی بیستەم واتە دە بەیتی دوایی ئەوە شیعری خۆیەتی و پەیوەندی بەدەقەکەی مەولەوییەوە نەماوە. پیرەمێرد ئەم جۆرە بۆ زیاد کردنی شیعرە گۆڕراوانەی زۆرجار پەیڕەو کردووە. دەقی گۆڕینەکەی شیعری مەولەوی و (دە) بەیتی دواییەکەی خۆی:

بڵاوە کەوتە ناو هاومالانم
تەفروتونا بوون وەک خەیالانم
کۆچیان کرد، ها، ها، تۆزیان دیارە
هاوار من جێمام لەم شوێن هەوارە
باری قورسی هۆش، پێش باری فامم
دەواری بەخت و چیغی ئارامم
هەمووم نارد لەگەڵ کۆچی خاڵۆما
مامەوە لە تەک تەنیایی خۆما
ئەگەر زوو نەگەم بەقافڵەی یاران
ئەبم بەکوچکی، مەندەی هەواران
دەردا کە مردم لە دووری ئەوان

دەرد بۆم ئەگـــەڕێ وەک مــــاڵ دزراوان
ســـــاقی بەجــــوانی من تۆم نەدیوە
بەپیـــریش (بیـــر)ی بیـــرم تەپیـــوە
کـەواتە ئێـــســـتـــا ، لەمــاوەی بەرزان
جـــــامــــێکم بەرێ، بەڵام بەهەرزان
تینـێ بخــــــەرە جــــەرگ و هەناوم
لە کـــاروان براو زۆر بەجــــێــــمـــاوم
های تاکـــەی نووستن هەڵســـە درەنگە
بەنووکی قـــەڵەم بۆ ئێل بجـــەنگە

***

## دوو بەیت لە شیعرێک

پیرەمێرد ئەم دوو بەیتەی دوایی شیعرێکی مەولەوی وەرگێڕاوە لە کاتی خۆیدا دەستنیشانی سەرچاوەکەی نەکردووە.

لێرەدا دەقی دوو شیعرەکە و گۆڕینەکە دەنووسین. وە تەواوی ئەم شیعرە لە دیوانی مەولەوی لاپەڕە ٣٣٠ بلاوکراوەتەوە.

«خەستەی خاری خەم، خەم خەیاڵە وێم
وەکـــزەی دەروون، تەن زووخـــاڵە وێم
بێ ئەبرۆی هیـــلال، ئەو نیـــهـــالە وێم
نیـــەت نادروست عـــیـــد بەتاڵە وێم

گۆڕینەکەی پیرەمێرد:

«خەستەی خاری خەم، دڵ مەلاڵە خۆم
بەکـزەی دەروون، لەش زووخـاڵە خـۆم
بێ ئەبرۆی هیـــلال، ئەو نەوهاڵە خـۆم
نیــەت نادروست، عـیـد بەتاڵە خـۆم»

***

## بەندی خاوکەر

ساڵی (١٩٣٥) کە پیرەمێرد دیوانی (ڕۆحی مەولەوی) چاپکرد لە لاپەڕە ٣١٨-٣١٩ دا دەقی هەورامی شیعرەکە و گۆڕینەکەی خۆی بلاوکردەوە. وە لەساڵی ١٩٤٦دا لە ژمارە ٨١٩ی (ژین)دا بەناوی بەندی خاوکەرەوە دوانزە دێری بلاوکردۆتەوە کە هەر هەمان شیعرە بەڵام



ئاڵوگۆڕێکی کەمی تیادا کردووە. وە لەکاتی خۆیدا هونەرمەندی دەنگخۆش (ڕەشۆڵ) ئ... شیعرەی بەمەقامێکی خۆش دەگوت. لێرەدا دەقی شیعرەکەی مەولەوی و هەردوو گۆڕینەکە دەنووسین.

مەولەوی:

خــــەرامــــان ئامـــا نەتۆی پەردەوە
نیـقـاب جەصەفحەی جەمین کەردەوە
چیـهـرەی دڵەی زار خـووی گەرمی پێدا
عــەکــــسش هوەیدا منمــانا تێـــدا
باوەشێن مەکەرد ئەو صەفحەی بێ گەرد
نازکـیش جەباد ئیـحـتـیـاط مـەکـەرد
نەتۆی ئاینەی جــەمـــینی چون گــوڵ
کەم مـەکەرد نم نم خـووی ڕوخسـاری دڵ

وەرگێڕانی یەکەم: ١٩٣٥

خـەرامــان دەرکــەوت لە توێی پەردەوە
نیــــقــــابی لەســــەر ڕووی لابردەوە
دڵەی من نیـشـتـە سەر ئارەق وەک ئاو
عــەکــسی ئەوی تیـــا دیاری دا تەواو
هێـنندە نـازک بوو بە بای باوەشــــێن
ســەر کـولّمی ئاڵی پڕ ئەبوو لە خــوێن
لە توێی ئاوێنەی ڕوخسـاری وەک گـوڵ
وشک ئەبووەوە ئارەقــــەکـــــەی دڵ

گۆڕینی دووەم: ١٩٤٦

بەرێکەوت دەرکەوت لە گۆشەی ڕەشماڵ
وەک مـانگ لە هەورا بنوێنێ جـەمـاڵ
کـاتێ نیـقـابی حـیـجـاب ئەپۆشێ
بە نیـگای خــەیاڵ گــۆنای ئەڕوشێ
هێـندە ناسک بـوو بەبای بـاوەشــــێن
ســەر کـولّمی ئاڵی پڕ ئەبوو لە خــوێن
ئارەقی دڵـم ئەمـــەندە ســـەرکـــەوت
ئەو شـێـوە جوانەی ئەوی تیـا دەرکـەوت

وتم: ئۆخەی، ئەم ئارەقی گوڵە
خوێناوی تیری موژگانی دڵە
وا دڵم تامی زامی بردەوە
ئاخ بای باوەشێن ساردی کردەوە!

***

## لەفەیزی مەولەوییەوە بۆ شێخ نووری شێخ ساڵح

م. نووری
«مامۆستای سەرئێل»

پیرەمێرد لە کاتی خۆیدا ئەم شیعرەی مەولەوی وەرگێڕاوە و لە (ڕۆحی مەولەوی)دا لە لاپەڕە ٣٣٧-٣٣٩ دا بلاوی کردۆتەوە. هەروەها لە ژمارە ٤٣١ی (ژین)ی ساڵی ١٩٣٥دا لەژێر ناوی (لە فەیزی مەولەوییەوە بۆ شێخ نووری) بلاوی کردۆتەوە. بەڵام ئەمجارە لەشەش بەیتەوە بووبەهەشت بەیت، واتە پیرەمێرد دوو بەیتی خۆی تێهەڵکێش کردووە و لە چەند جێیەکدا دەستکاری دەقەکەشی کردووە. بۆ بەراورد هەرسێ دەقەکە دەنووسین و دوو بەیتەکەی پیرەمێردیش دەستنیشان دەکەین: هەروەها لە نووسینەوەی هەموو دەقە هەورامیەکاندا پشتمان بەدیوانی مەولەوی (مەلا عەبدولکەریمی مودەریس) بەستووە.

مەولەوی:

مامۆستای سەرئێل، شیرین کەلامان
تەشریفی خەیرت، باوەر وەلامان
نە شنۆی بەدکار، نەبۆی بەدوازەن
وەحشیان هەم ڕاز، تەیران دەم سازەن
شەتاوان چوون سەیل دیدەمەن جاری
پێچ مەدان چەنی زامانی کاری
تۆ نە سەرگوزەشت سزای دەردی لەیل
من نە حیکایەت ئازیزی بێ مەیل
ساتێ پەی وێما بنیشمێ وەشاد
بەو ڕازانەوە خەم بدەین وەباد
تا فەڵەک دیسان نەی ڕاگوزەردا
بوینمێ چێششی هانە ژێر سەردا

(دیوانی مەولەوی مەلا - عەبدولکەریمی مودەریس) لاپەڕە ٣٩٧



گۆڕینی یەکەم:

مامۆستای سەرئێل شیرین کەلامان
تەشریفی خێرت بێنەرە لامان
نە شنۆی بەدکار نە ڕێی بەدخواهان
وەحشیان هەمڕاز تەیران هەمراهان
شەتاو وەک لافاو دیدەی من جاری
پێچ ئەدا لەگەڵ، برینی کاری
تۆ لەسەرگوزەشت، سزای دەردی لەیل
من لە گلەیی ئازیزی بێ مەیل
ساتێ بۆ خۆمان دانیشین بەشاد
بەو وردە ڕازە، خەم بدەین بەباد
تا فەلەک دیسان لەڕێ گوزەردا
ئاخۆ چی تری وا لەژێر سەردا؟!

گۆڕینی دووەم: ئەو دوو بەیتەی خراوەتە کەوانەوە شیعری پیرەمێردە
بۆ م. نووری شوباتی ١٩٣٥

مامۆستای سەرئێل شیرین کەلامان
دەمەو بەهارە، فەرمووە لامان
«وام بەگەردەکەی سۆفی یارەوە
دوورم لە یاری، دڵ ئەغیارەوە»
نەشنۆی بەدکار نەبۆی بەد خواهان
نە تانەی وەزیر، نە حوکمی شاهان
ئاوی ساف وەک سەیل دەدەی من جاری
ڕوو لە دجلەکەی، مەیل نادیاری
وەرە، هەردووکمان ببینە هام فەرد
تۆ، دڵ بەسزای لەیلت پڕ لەدەرد
«من بەئەفسانەی وەتەن خواگرتوو
بە ڕەنجەڕۆیی لە جیهان بووردوو»
ساتێ بۆ خۆمان، بنیشین بەشاد
بەهامڕازی یەک خەم بدەین بەباد

بزانین فــەلەک ئەمـــجـاره چیـــمــان
بۆ تەرتیپ ئەدا و دێنێـــتـــە ڕێمــان

***

## سەرداری زومرەی فەلاکەت کێشان
## بۆ مەحموود جەودەت

پیـرەمـێـرد دووجـار ئەم شـیـعـرەی مەولەوی وەرگـێڕاوە. جـارێـک لە سـاڵی ١٩٣٥ دا تەواوی شـیـعـرەکـەی لە (ڕۆحی مـەولەوی)دا بڵاوکـردەوە. وە لە سـاڵی ١٩٣٧ بەهۆی لە سـێـدارەدانی نیـشـتـمـانپـەروەر (مـەحـمـوود جەودەت)ـەوە جـارێکی تر بڵاوی کردەوە. بەڵام ئەمجـارەیان هەتا بەیتی چواردەهەم (جگە لە بەیتی ٦-٧) وەرگـێـڕاوی شـیـعـری مـەولەوییـە و لەوە بەدوا هەتا کـۆتایی شـیـعـرەکە شـیـعـری پیـرەمـێـرد خۆیەتی. وە بێ ئەوەی مـامـۆسـتـا م.هـ دیاری بکات لە دیوانەکـەدا بەناوی پیرەمـێردەوە دایناوە. هەروەها پیـرەمـێرد مـەبەست و مـانای شـیـعـرەکـەی لە لاواندنەوەوە گۆڕیوە بۆ بیری نیشتمانیی. بەم جۆرە سێ دەقی شیعرەکە دەبێت بخەینە پێش چاو. هەورامییەکەی مەولەوی و هەردوو گۆڕینەکەی پیرەمێرد. هەروەها لەپێش ئێمەدا لە ژمارە ٩٥ی گۆڤـاری (بەیان)ی ساڵی ١٩٨٤ دا مـامۆسـتا عـوسمان هەورامـی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەو شیعرەی لاپەڕە ٣١٤ی دیوانی پیرەمێرد بەشێکە لە شیعرێکی مەولەوی بەڵام مامۆستا دەقی شـیـعـرەکـان و دەسـتکاری و تەواوکـردنەکـەی پیـرەمـێـردی نووسـیـوە. ئێـمـە لێـرەدا بۆ بەراورد دەینووسین.

مەولەوی:

سـەردار زومـرەی، مـصـیـبـەت کـێـشـان
فەرمان فـەرمای مـوڵـک، دەروون پڕ ئێشان
بادەی خـەم وەردەی، مـەرگ ناکـامـان
زام ناسـۆر کـەفـتـەی، دەروون پڕ زامـان
پەردەی دڵ وەنێش، مـەودای خـەم پارە
چار نەبەردەی دەرد دڵەی بێـــچــــارە
وەخــتێ ســەیل چەم دەروون پڕ خــاران
تـاو مــەوست چوون تاو، ئەوەڵ بەهاران
بۆی کـزەی کـەواو، جـەرگم چوون جـاران
هەم، وەی، تەم مـەوست، ئەو ڕووی سـتـاران
بۆ پرووز جــەرگ، قــرچەی پارچەی دڵ
بۆی هوون جـۆشـیـای، دەروون پڕ چقڵ



ئێـد چون تۆف سـەخت تەم وست ئەو کـووان
ئـەو وێنـەی لافــــاو، باڵای تـۆ ڕەوان
هەناسـەی سـیـــای، سـەرد دڵسـۆزی
بەردم دا وەبەرد (بـرد العـــجـــوز)ی
یانێ نامـەکـەی، خـەم ئینشـا کـەردە
مـەرقـووم قـەڵەم، وە خـەم شـەق وەردە
شـــۆڵەدا وەگــــڕ شـــەرارەی نـارم
دەمـیـا و جـۆشـدا دڵەی خـەمـبـارم
من وەرجـە ئـامـای نامـەی زگـاریت
زووتەر جـــە خـــەبەر کـــۆس دیاریت
خـاترم چەند ڕۆ خەسـتـەی خـەمـان بی
چەمـانم چوون تاف، صـاف چەمـان بی
جـە ئـامـای نامـەت چەمـەریم بەرز بی
شـادیم شـێـویا شـینم سـەد تەرز بی
شـەمع شـام شـووم، مـاتەم هۆر گـرِیا
تای تەل سـەمـتـوور، شادی و زەوق بڕیا
شای شادیم شکیا، سوپای خەم جەم بی
بەیداخ دەمـــاخ، شـێـــوەی مـــاتەم بی
دەخیل بیم وە نـوتق، خەمان لاڵ کەردەم
لاڵام جـە خـەیاڵ، خـەم غـارەت بەردەم
نـامـــەرد، یەوادەی شین بێ شـــۆمـــەن
هیچ کــۆسم نیـــەن، یەکــۆس نۆمـــەن
سادەی، هەی پەی کەی هەریەک جەلایێ
باوەڕین ئەوســـاز شـیـــوەن صـــەدایێ
خەیاڵ غەمگین بی، نوطق ئاما وەدەنگ
ئێد مـوات وە سۆز زایڵەی صەد ڕەنگ
نـاکــــام ئـەیام کــــامــــەرانـیـم ڕۆ
بەر نەوەردەی بـاغ، نەوجـــــوانیم ڕۆ
...هتد...

سەرداری زومرەی، فەلاکەت کێشان
فەرمان، فەرمای موڵک، دەروون پڕ ئێشان
بادەی خەم خوردەی، مەرگی ناکامان
برینی ناسۆر، دەروون پڕ زامان
پەردەی دڵ بەئێش، دەروون خەمبارە
دەردی بێ دەوای، دڵەی سەد پارە
وەختێ لافاوی، چاوی پڕ باران
جۆشا وەک تاوی، ئەوەڵ بەهاران
قرچەی کەبابی، جەرگم تەمی کرد
بەری ئەستێرەی، ئاسمانی گرت
هەناسەی ڕەشی، ساردی دڵسۆزی
بەری دا لەبەرد (برد العجوز)ی
یەعنی نامەکەی، غەم ئینشا کردوو
زادەی قەڵەمی، بەغەم شەق بردوو
شوعلەی دایە گڕ، شەرارەی نارم
بە مووشەدەمەی، دڵەی غەمبارم
من لەپێش ئەوەی، کە نامەی تۆ بێ
بەر لەو خەبەرە، کە کۆستی نۆ بی
چەند ڕۆژێ دڵم، تەنگ و گیرا بوو
چاوم دەفڕی و گریانی تیابوو
کاغەزەکەت هات ئینجا بەیەقین
شایيم لێ گەڕا، بەچەمەری شین
چرای ئێوارەی، شادیم وەرگەڕا
تەلی سەمتووری، شەوق و زەوق بڕا
شای شادیم شکا، ڕووی کردە فیرار
بەیداخی شادیم، کەوتە نیوەی دار
دەخیل بووم بەنوتق، دەنگی لێ نەهات
هانام بردە بەر، خەیاڵ ئەویش مات



بە پڕووزی جەرگ قرچەی پارچەی دڵ
بەجۆشی خوێنی، دەروونی پڕ چڵ
ئەم وەک طەوفی سەخت، تەمی سەر کێوان
ئەو لافاو قوڕی، کرد بەقوڕ پێوان
نامرادان وادەی، شینی بێ شوومە
کەسم نەمردووە، وا کۆستی نۆمە
سا دەی شین بۆ کەی؟؟ هەریەک لەلایێ
بینێنە جونبوش، گریە و صەدایێ
خەیاڵ غەمگین بوو، نوتقم هاتە دەنگ
ئەیلاواندەوە، بەسۆزی سەد ڕەنگ
ناکامی ئەیام، کامەرانیم ڕۆ
بەر نەخواردووی باغ، زیندەگانیم ڕۆ
...هتد...

گۆڕینی سێیەم:

ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٣١٤ی (دیوانی پیرەمێردی محەممەد ڕەسول هاوار) دا بڵاوکراوەتەوە. بەڵام ئاماژەی ئەوە نەکراوە کە چواردە بەیتی جگە لەبەیتی ٦، ٧ گۆڕینی شیعرێکی مەولەوییە و هەر بەناوی شیعری پیرەمێردەوە بڵاوکراوەتەوە.

## بۆ مەرگی مەحموود جەوەدت

١٩٣٧

سەرداری زومرەی، فەلاکەت کێشان
فەرمان، فەرمای موڵک، دەروون پڕ ئێشان[1]
بادەی غەم خوردەی، مەرگی ناکامان
برینی ناسۆر، جەرگی پڕ زامان
پەردەی دڵ بەئێش، مەودای غەم پارە
دەرد لە بانی دەرد، دڵەی ئاوارە
وەختێ لافاوی، چاوم وەک باران
تەمی ئەبەستە، سەر ڕووی ستاران
هەناسەی سیام، لەبۆ کرووزدا
بەردی دا بەڕۆح (برد العجوز)دا

«دەرامەتیەکەی، ئازیزم دەرکەوت
بارانی گریەی، یارانم بەرکەوت»
«خۆ من دەمێک بوو، چاوم ئەفڕی
فرمێسکی خوێنم، لە چاو ئەسڕی»
خاترم چەند ڕۆژ، خەستەی خەمان بوو
چاوانی سەرم، وەک چاوان وابوو
ئەمجا واوەیلا و، چەمەرەم بەرز بوو
ژیانم شێوا، شینم لا فەرز بوو
چرای ڕووناکیم لێ کوژایەوە
دەرگای ژیانم داخرایەوە
شای شادیم شکا، ڕووی کردە فیرار
بەیداغی شادیم هاتە نیوەی دار
بێ پەروا نالام، بەلاوانەوە
کەوتمە شیوەنی ناو لاوانەوە
ئەم چەند شیعرانەی ئەخوێند بەگریان
دلّی دلّبەردی، ئەکرد بەگریان
ناکامی ئەیام، کامەرانیم ڕۆ
بەر نەخواردووی باغ، زیندەگانیم ڕۆ

لێرە بەدواوە دەبێت بەشیعری پیرەمیرد:

فیدای وەتەن و دلّسۆزی میللەت
نموونەی سەخا و ئازایی و غیرەت
سەر و مالّی خۆی، بۆ ئێمە دانا
بە، بەدنمەکی نەمانوت: دانا
ئۆف ئاگرێ لەناو جەرگا ئەگرێ
زوبانم سووتا و قسەم بۆ ناکرێ
نازانم پیشەی مەردی تەق و کەم
بەیادی چارەی جەرگی سووتاوکەم
وا من تای تاری شیعرم بڕاوە
شەوی تارم هات، نۆرەم تەواوە



دەردی مەرگمە، ڕۆینم دیارە
توخوا سا ڕەشۆلّ نۆرەی قەتارە
هەی ڕۆ ڕۆیەک بکە، بلاوێنەوە
سەنگی سەختی دلّ بتاوێنەوە
سەرسامی ماتەم، زمانی بەستووم
پەکی زایەلّەی مەرسیەی خستووم
لام ئاشکرایە، کە ئیتر ئەمرم
ئاگر بەربۆتە تۆماری شیعرم

............................................................

(١) لای م،هـ بەهەلّە نووسراوە: فرمانی ملک دەروون پڕ ئێشان.

***

## سۆزی پیرەمێرد

ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٦٤ی (دیوانی پیرەمێردی نەمری محەممەد ڕەسول هاوار)دا بەشیعری پیرەمێرد ناسراوە و هیچ شتێک لەبارەیەوە نەنووسراوە. بەلّام ئێمە ساغمان کردەوە کە لەو چواردە بەیتەی شیعرەکە هەشت بەیتی یەکەمی شیعری (ئەحمەد بەگی کۆماسی)یە. بەیتی نۆیەم شیعرێکی (مەولەوی)یە. ئەو پێنج بەیتەی دواییشی شیعری پیرەمێردە. واتا پیرەمێرد لە کاتی گۆڕینی شیعرەکەدا شیعری خۆی و مەولەوی تێکەلّ کردووە. بێ ئەوەی دەستنیشانیان بکات و بێ ئەوەی مامۆستا هاواریش لە دیوانەکەیدا ئەمەی ئاگا لێ بووبێ. ئێمە لێرەدا دەقی هەورامی شیعرەکەی کۆماسی و گۆڕینەکەی پیرەمێرد دەنووسین کە نەجمەددین مەلا لە کەشکۆلّی (حەمە سالّح ئاغای قزلجی)دا لە لاپەڕە ٩٦دا بۆی تۆمار کردووین.

لەلایەکی تریشەوە، شیعری دیوانەکەی م.هـ دەنووسینەوە و لە شوێنی خۆیدا ئاماژە بۆ شیعرەکانی کۆماسی و مەولەوی و پیرەمێرد دەکەین. هەروەها ئەم شیعرە (هەورامی)یەکەی لە دیوانی مەولەوی مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی مودەریس)دا لە تیپی (پ)دا بەشیعری مەولەوی ناسراوە و چاپکراوە. بەڕای من کە ئوسلوبی شیعرەکە و دەستپێکردنی لەهی مەولەوی ناچێت و بە بەلّگەی دەستنووسەکەی مامۆستا نەجمەددین مەلا بەشیعری کۆماسی دەزانم. هەروەها مامۆستا (عوسمان هەورامی) لە بەیانی ژمارە ٩٥ی سالّی ١٩٨٤دا ڕوونی کردۆتەوە کە ئەوە شیعری (کۆماسی)یە و دەقی هەورامییەکەی لەبەر دیوانی مەولەوی نووسیوەتەوە و گۆڕینەکەی پیرەمێردی نووسیوە. لە کەشکۆلّە دەستنووسەکەی (کۆماسی)دا لە لاپەڕە ٩٦دا نەجمەددین مەلا بەم شێوەیە هەردوو دەقە وەرگێڕاوەکەی نووسیوە کە دیارە گۆڕینەکە لە کاتی خۆیدا هەر پیرەمێرد خۆی بلاوی کردۆتەوە.

***

## ئەحمەد بەگی کۆماسی

ئەم شاعیرە لەتەک مەولەوی، هاو زەمانن، لەگەڵ یەک شەڕە شیعریان کردووە[1] حاجی قادری کۆیی، ئەڵێ:

دوو وەحیدن محەممەد[2] و ئەحمەد[3]
یەکی (کۆماسی)یە، یەکێ (دەربەند)

***

«پەژارەت شادیم جە بێخ ئاوەردەن[4]
دووریت ڕیشەی دڵ، خەیمە کەن کەردەن
فیراقت فەرقم، وە تووتیا کەرد
جیاییت ئازام جەهەم جیا کەرد
وەسواسەت وەی تەور، ئێش دان وە جەرگم
وە مەرگت قەسەم، ڕازیم وە مەرگم
وێت بدەر ئینساف نەو نەمام نۆ
مەردەن خاستەرەن، یاخۆ دووریی تۆ؟
مەردەن یەک ساتەن، ئەڕواحەکەی وێم
دووریت هەرساتێ سەد مەرگەن پەرێم
مەر جەستەی خەستەی من جە فۆلادەن
بەند دووریت وینۆ هێمان دڵشادەن
دەک ڕەحمەت ئەو قەبر گشت وەفاداران
خسوسەن ئەو کەس، شای وەفاداران

..........................................................

(١) ویستوویە بڵێ شیعری دۆستایەتی خۆشەویستیان بۆ یەک ناردووە.
(٢، ٣) مەبەست لە حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە و ئەحمەد بەگی کۆماسییە.
(٤) دیوانی مەولەوی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس ل١٠٨-١٠٩.

گۆڕینەکەی پیرەمێرد:

لەحەد دەرچووە،...
دووری تۆ هێجگار لەحەد دەرچووە
پەژارەت شادی لە دڵدا نەهێشت
ڕۆحم عەزابی جەهەننەمی چێشت
فیراقت فەرقی کرد بەتووتیا
ئەعزام بەعەزاب لێک بوونەوە جیا



تیرێکی وەهات داوە لە جەرگم
بەمەرگت قەسەم ڕازیم بەمەرگم
توخوا خۆت بڵێ نەونەمامی نۆ
مردن خۆشترە یاخود دووری تۆ
ساتێکە و جارێک ئاکامی مردن
دووریت ساتێکی مەرگێکە بۆ من
بۆچ جەستەی خەستەی من لە پۆڵایە؟!
بەگورزی هیجران هیچی لێ نایە
قەبرت پڕ نووربێ شای سینە سافان
میرزا یاقووبی ئەدیبی جافان
شیعری دڵسۆزیت حەسبی حاڵمە
وێردی زوبانی بەستە و لاڵمە
چەرخی چەپ بۆ من چنیویە کەڵەک
من بەردم داوە لە شووشەی فەلەک؟!
ڕەهەندەی کردم لە ڕووی بەهانە
گاهێ (ئەسفەهان) گاهێ بۆ (بانە)
فرسەتم نادا ساتێ بتبینم
تۆزی بەرپێکەت بەچاوما بێنم
یا شەرحی شەوی دووری دووبارە
عەرزکەم بۆ تەسکین، دڵەی ئاوارە!
دووریت ئاگری بەردایە ناو جەرگ
خوایە یا ویساڵ یا تاقەت یا مەرگ

گۆڕینی دووەمی پیرەمێرد:

«هاوار تێپەڕی، هاوار تێپەڕی
دووری باڵاکەت، لەحەد تێپەڕی
پەژارەت هێزی، لە ئەژنۆم بڕی
لە هێلانەی دڵ، شەوقی دڵ فڕی
فیراقت فەرقی، کرد بەکۆی مەفرەق
دڵ بەشەوقی غەم، وەک شەبەق بوو شەق

تۆ جویێ بوویتەوە و، گیان جیا بووەوە
ڕۆژی ڕووناکم، تاریک بووەوە
تیرێکی وەهات، داوە لە جەرگم
بێزارم لە ژین لام خۆشە مەرگم
تو خوا خۆت بیلێ نەونەمامی نۆ
مردن خۆشترە یاخود دووری تۆ
مردن جارێکە و زوو ئەبڕێتەوە
دووریت دەردێکە، ئەتەنێتەوە
«ڕەنگە جەستەی من، شووشەی پۆلاَ بێ
هێند بیرەنجێنن، هێشتا هەر مابێ»
«چەرخی چەپ کردار خستوومیە سەما
وەک بەردم دابێ لە شووشەی سەما»
«نایەلێ ساتێک بسرەوم بۆ خۆم
ئەمە سالێکە من چاوەڕێی تۆم
با شەوێک لەلات دەردم هەلڕێژم
تامی شەکەری ڕازت بچێژم
ئنجا بشمرم هیچ باکم نابێ
گەرمە گۆڕمە، نان و کەبابێ
ئێستا لە داخا، هیچم پێ ناخورێ
نەوسن چۆن بەرگەی برسێتی ئەگرێ
«دوو شتە ڕێگەی ڕزگاری من بێ
یا یار هی من بێ، یا یار هێمن بێ!»

مەولەوی:

وادەی سفیدی شکۆفەی پیرین
شکۆفەی باخچەی پیری دلگیرین
شکۆفەی باخچەی پیری سفیدەن
سەرمایەی میوەی عیرفان هەر ئێدەن
نە باخچەی سونبولّ تار مودی تاردا
سپی شکۆفەی پیریم دیاردا



باقەی زوێری و زاری و دلگیریم
پەی پەی زیاد کەرد پەژارەی پیریم
ئاخر ڕۆی وەهار نەوجوانیمەن
ئەوەلّ ڕۆی پایز زیندەگانیمەن
هەناسەم چون بای خەزان مەخێزۆ
پەی پەی بەرگ شاخ شادیم مەڕێزۆ
خەدەنگ بالاّم چەمان کەمان وەرد
ڕاست وە نیشانەی فەنا ڕوو ئاوەرد
کەم کەم پیری خەم، وەقامەت مدۆ
دەم دەم وەعدەی ڕۆی قیامەت مدۆ
پیری یەکسەر زۆر جەزانووم سەندەن
سەر وەگەردندا هەر وە زۆر مەندەن
ساقی پام بەستەی، زنجیر پیرین
دەسم دامانت وادەی دەسگیرین
چابووک بەو ڕەفتار بێ درەنگەوە
خەرامان بەو ناز بالاّی شەنگەوە
جامت جەم ئاسا لەبڕێز کەر جەمەی
پێم نۆش کەر وەیاد بەزم ئاراکەی
مەستی وە پیران، جوانی مدۆ
هێز دووبارەی زرانی مدۆ
پێم دەر تا پەی پێوە هەی کەروون
ڕای سەخت سارای مەحشەر طەی کەروون
هتد...

پیرەمێرد بەیتی هەشتەم و نۆیەمی ئەو شیعرەی وەرنەگێڕاوە و شیعرەکە خۆی بیست بەیتە، لەو بیست بەیتە پیرەمێرد دوانزەی وەرگێڕاوە. ئنجا شیعرە وەرگێڕاوەکە دەنووسین و سێ بەیتەکەی پیرەمێرد لەناو کەوانەدا دیاری دەکەین.

خەدەنگی بالاّم، وەک کەمان خەم بوو
ڕوو لە نیشانەی ئەو دنیایەم بوو
سامی وا پیری لێم بوو بەزنجیر
دەستم داوێنت تەنها تۆی دەستگیر

زووکە بەلەنجەی بێ درەنگەوە
بە ئاڵ و والآی باڵای شەنگەوە
بەجامی جەمی جەمسەری سەرجەم
ڕەگی ئەندامم تێک بەستە بەهەم
وام گورج کەرەوە بەمەستی جوانی
تازە کاتەوە ئەم پیرەی فانی
پێم بدە تا پێم هێزی پێ پەی کا
بێ وچان پلەی ڕێی مەحشەر تەی کا
«ئاخ ڕەشۆڵ ساتۆش بەقەتارەوە
تا دەمرم خۆتم لێ مەشارەوە»

***

## گیانە دڵەکەم

### ١٩٤٣

پیرەمێرد ئەم شیعرەی مەولەوی دووجار وەرگێڕاوە. گۆڕینی یەکەم زۆر لە دەقەوە نزیکە و ئەوەی دووەم هەندێ دەستکاری تێدا کردوە. لێرەدا هەردوو وەرگێڕانەکە و دەقی شیعرەکەی مەولەوی دەنووسین.

هەروەها مامۆستا محەممەد ڕەسول هاواریش لە لاپەڕە ١٩٧ی دیوانی پیرەمێرددا هەردوو وەرگێڕانەکە و دەقەکەی مەولەوی نووسیوە. بەڵام لەبەر ئەوەی لە دەقی هەورامییەکەدا هەندێ هەڵەی تێدا هەیە، بۆ ئەمەش پەنامان بردە بەر دیوانی (مەولەوی) مامۆستا (عەبدولکەریمی مودەڕیس) ل٥٤.

مەولەوی:

ئازیز وە مەرگت، دڵ نەخرۆشەن
ئارەزووی خەدەنگ، پەنجەکەی تۆشەن
خەیلێوەن ئامان نیرەکەت، ئامان
ئامان وەسەر وەخت، بیمار زامان
وەختەن ساکن بۆ، قوربان ساتیرێ
دەماخش بەرزن، دەخیل زنجیرێ
نەواجە حیکمەت بەر بشۆ وە بەر
جار جار وە تیرێ دڵ نەواییش کەر



وەش وەش تای توغرای وێت بنمانە پێش
با هەر ناسۆر بۆ، زوو نەبۆ سارێش

گۆڕینی یەکەمی پیرەمێرد:

ئازیز دڵەکەم کڵۆکۆبەتی
ئارەزووی تیری پەنجەی تۆبەتی
دەمێکە تیری تۆی لێ بڕاوە
برینی کۆن بوو، ئێشی نەماوە
لووتی زۆر بەرزە، سا قوربان تیرێ
پەل ئەبزێوێ ئامان زنجیرێ
بە تایەکی زوڵف زوو مەهارێکە
بەتیرێکی تر کۆڵەوارێکە
تا توڕەی زوڵفت بکە بەدامی
با سارێژ نەبێ، ناسۆر بێ زامی

گۆڕینی دووەم:

گیانە، دڵەکەم، کۆڵوکۆبەتی
ئارەزووی تیری پەنجەی تۆبەتی
دەمێکە گیڤەی تیرەکەت نایە
چیبکەم ژیر نابێ بەلایە لایە
بەستوومەتەوە بەهەوا بەنێ
بەملاو بەو لادا، هەروا مل ئەنێ
من وام ئەزانی کە دڵ پیر ئەبێ
ئەگەڕێتەوە، لای من ژیر ئەبێ
کەچی ناسرەوێ ساقوربان تیرێ
زۆر سەرەڕۆیە ئامان زنجیرێ
تاو تاو توڕەی تای پیشاندە تار تار
لووتی زۆر بەرزە بۆی بکە بەمەهار

***

## ئەپرسی چۆنن

ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٧٦، ١٧٧ی دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاواردا بڵاوکراوەتەوە

بەشیعری پیرەمێرد دانراوە.

شیعرەکە چوار بەیتە. بەڵام لە (کەشکۆڵی قزلجی مامۆستا نەجمەددین مەلا)دا لە لاپەڕە (٨٨)ی بەشی شیعرەکانی مەولەویدا، بەشیعری مەولەوی دانراوە. مامۆستا تەنها ڕۆحەکەی نووسیوە، واتە گۆڕینەکەی پیرەمێرد. هەورامییەکەی مەولەوی نەنووسیوە، دیارە شارەزایەکی وەک نەجمەددین مەلا هەروا لە خۆیەوە ئەم شیعرەی بەشیعری مەولەوی دانەناوە و ئێمەش کە تەماشای شێوە و ڕێبازی شیعرەکەمان کرد ڕاست بۆ ئەوە چووین کە شیعری مەولەوییە، ئێمە گۆڕینەکەی پیرەمێرد لە ڕۆشنایی دەستنووسەکەی مامۆستا نەجمەددین مەلادا دەنووسینەوە هەتا دەقەکەی مەولەویمان دەست دەکەوێت، وە چەند جیاوازیەک لە نێوان شیعرەکەی لای نەجمەددین مەلا و دیوانەکەی پیرەمێردی مامۆستا (هاوار)دا هەیە. هەردوو دەقەکە دەنووسین:-

## ئەپرسی چۆنن

مامۆستا (نەجمەددین مەلا) شیعرەکەی لەژێر ناوی (خەیاڵێکی ورد)دا نووسیوە:

«ئەپرسی، چۆنن، لەش و دیدە و دڵ
دڵ، ژێر برۆتی کردووە بەمەنزڵ
تو خوا لێی گەڕێن، لە سۆز و تابدا
زاری پەسەندە، لەژێر میحرابدا
فرمێسکی دیدەش، بەسەر بەدەندا
هاژەی کرد، لافاو، دەستی پێ بەردا
گڕ، هاژەی دڵت، داچڵەکێنێ
هەرەس، زۆر سەنگی، سەخت ئەجولێنێ

شیعرەکە -لەدیوانی پیرەمێردی م.هـ دا:

«ئەپرسی، چۆنن، لەش و دیدە و دڵ
دڵ، ژێر برۆتی کردووە بەمەنزڵ
تو خوا لێی گەڕێ، لە سۆز و تابدا
دوعا، گیرایە، لە ژێر میحرابدا
چاویش لافاوی، فرمێسک زۆری سەند
پێڵووی گلێنەی، لە ڕیشە هەڵکەند
هاژەی ئەو، دڵت، دائەلەرزێنێ
هەرەس زۆر بەردی، قورس ئەجولێنێ

***



## ناسینەوەی شیعرەکانی وەلی دێوانە لە شیعرەکانی پیرەمێرددا

### ١- هەی نائومێدی:

ئەم شیعرەی وەلی دێوانە و هەردوو گۆڕینەکەی پیرەمێردمان لەم دیوانەدا نووسیوە و بەراوردمان کردووە لەبەر ئەوە بەپێویستمان نەزانی دووبارە لێرەدا بینووسینەوە.

### ٢- بایەقوش ناڵان:

ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاوار دا لەلاپەڕە ٢٠٣، ٢٠٤ دا بڵاوکراوەتەوە تەواوی شیعرەکە بەشیعری پیرەمێرد دانراوە و بەناوی (تاق تاق کەرە)وە چاپکراوە. بەڵام لەڕاستیدا شیعرەکە دوانزە بەیتە و دوو بەشە. بەشێکیان شیعری پیرەمێردە و بەشێکی گۆڕینی چەند بەیتێکی شیعری (بایەقوش ناڵان)ی وەلی دێوانەیە.

بەیتی یەکەم و دووەم سێیەم و حەوتەم و نۆیەم و دەیەم و یانزە و دوانزە واتە هەشت بەیتی پیرەمێردە. بەیتی چوارەم و پێنجەم و شەشەم و هەشتەم شیعری وەلی دێوانەیە. واتە چوار بەیتی وەلی دێوانەیە.

لێرەدا ئەو چوار بەیتەی شیعرەکەی (وەلی) بەشێوەی خۆی دەنووسینەوە و تەواوی دوانزە بەیتەکەی شیعری دیوانەکەی پیرەمێردیش بەرانبەری دەنووسین هەتا خوێنەر وەرگرتنەکەی تەواو بۆ ساغ بێتەوە. پێویستە بڵێین ئەم دێڕانەمان لە دیوانی (وەلی - عوسمان هەورامی) وەرگرتووە و بەڕێزیان لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ٩٥ دا ئاماژەیان بۆ ئەم وەرگرتنە کردووە.

«من خێڵ شادیم شەخسێ کەرد تاڵان
تۆ چێش پێت ئامان، هامدەرد ساڵان!
من پەروانەی شەوق، شەم جەماڵێکم
کوشتەی نیگای ناز، سۆسەن خاڵێکم
ناڵەم جە سوکن، سەودای ئەو یارەن
دڵم جە دووری ئەو بێ قەرارەن
من سفتەی سۆزان شۆڵەی ئەو نوورم
بەڕۆ هەراسان بەشەو دەیجوورم»

ديوانى وەلى دێوانە ئامادەکردنى عوسمان هەورامى ل ٢٩ ساڵى ١٩٧٦

***

## تاق تاق کەرە

١٩٤٥

تاق تاق کەرەکەی، سەرداری کانی
بۆچ ئەناڵێنی، هەتا بەیانی
هیچ کەس ناتوانێ، تا ڕۆژ بناڵێ
مەگەر عاشقی، سەودایی خاڵێ
ئەوا من دیارە، بۆ یار ئەناڵم
تۆ پەیجۆری کێی، هاوار بەماڵم
«من گەنجی شادیم جەردەیەک بردی
تۆ چیت لێ قەوما ، کێ وای لێ کردی»
«من ڕوخسارێکی وێنەی شەمم دی
دەردی پەروانەم لێ هاتۆتە دی»
«ناڵەی من لە شەوق ئەو ڕوخسارەیە
ئاهم لە دووری ئەو دیدارەیە»
تۆ کێ دەروونی وا هەڵقرچاندووی
کام کافر[1] وا بەم دەردەی گەیاندووی
«من سووتاوی ئەو ، شوعلەو ئەو نوورەم
دێوانەی جەزبەی، ئەو کێوی (طوور)ەم»
موسا (أرنی)ی وت، کەوتە تکا
بە (لن ترانی) ئابڕووی تکا
منیش تەمەنای، دیدارم ئەکرد
لە جیاتی دیدار، ئەم عەشقەم وەرگرت
دیارە من و تۆ هەردوو هام فەردین
هەردووکمان وەک یەک، تووشی یەک دەردین
وەرە هەردووکمان، ناڵەمان یەک خەین
بەڵکو بەم عەشقە، نیشتمان سەرخەین

(١) لای م.ھ نووسرابوو (کام بەفر وا بەم دەردەی گەیاندووی) کەدیارە وشەی بەفر هەڵەیە و –کافر ڕاستە.

***

٣– هەروەها پیرەمێرد لە شیعرەکانیدا گەلێ جار بەیت یاخود نیوە بەیتی وەلی دێوانەی



بەکارهێناوە یاخود بیری عەشقی ڕۆحی لێ وەرگرتووە و لە شیعری خۆیدا وەستایا[illegible] تواندوویەتیەوە.

***

## شیرین ناوی شەم

پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە ڕۆژنامەی ژینی ژمارە (٦٠٧)ی ئابی ساڵی ١٩٤٠دا بەناوی (دەباشانیەوە) بڵاوکردۆتەوە. بەڵام لە ڕاستیدا بریتیە لە وەرگێڕانی شیعری (بارک الله شەم)ی وەلی دێوانە. هەندێ ئاڵوگۆڕی تێدا کردووە و لە دواییشدا چوار بەیتی خۆی لە کۆتایی شیعرەکەوە بۆ زیاد دەکات و لە ماناشدا ئەو بەیتانە لە ڕەوتی مانای شیعرەکەی وەلی دوور دەکەوێتەوە و لە دڵدارییەوە دەچێت بۆ نیشتمانی. دەقی شیعرە هەورامییەکەی (وەلی) و وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد دەنووسین. ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاواردا بڵاونەکراوەتەوە.

### بارک الله شەم[1]

بنازوون بەو زات، خوڵقنایش چون شەم
نەقاش قودرەت، کێشانیش ڕەقەم
جەی سەر زەمینە، وێنە و میسلت کەم
جە شەوق پێشان، نوور سوبحەدەم
قەوس ئاسمان، پێچ وەردەن چون خەم
ئەبرۆت چون کەمان، خالق ئەعزەم
خەدەنگ مەشانۆ، نە دڵەی پڕ خەم
دڵت چون ئاهو، مودبر ماس ڕەم
نیم نیگات ئەفسوون جادووی هاڕوت کەم
خەدەنگ موژگان چنگ پێکان جەستەم
بێ پەروا پێکۆ بەجەور و ستەم
زوڵفت پۆشنا ئافتاب چون تەم
وێنەی زێبایی مەسیحای مەریەم
ڕوخسار بەوێنەی مانگ چاردەهەم
دەهەن چون حوقە ، سەرچەشمەی زەمزەم
سی و دوو دندانت مرواری سەرجەم
لەب یاقوتت پیاڵەی عەجەم

خاڵت سولەیمان کەردش بە خاتەم
دوو قەندیل نوور پێش مەواچان چەم
دوو سیب سینەت، نەورەس گوڵ بەدەم
بیللا وێنەشان تاجە بەهەشت کەم
خوداوەند بەی تەور تۆش ئاردی فەرهەم
ساهەر بەی تەرزە نامش نیای شەم
بەنامت دنیا ڕەوشەنەن سەرجەم
نوتقت گیان بەخشەن، جە خواوە مەرهەم

............................................

(١) ئەم دەقە لە دیوانی وەلی دێوانەی عوسمان هەورامییەوە وەرگیراوە.

وەرگێرانەکەی پیرەمێرد ١٩٤٠

## شیرین ناوی شەم

چەند خۆشە دایکی، ناوی ناوە شەم
ناوی خۆش مولهەم، لە لەوح و قەڵەم
دەستی قودرەتی، خوا کردی بەشەم
تا خوا سورەتی خەڵک ئەکا ڕەقەم
لە نەقشی خودا، وێنەی ئەو زۆر کەم
شەوقی تەوێڵی، نووری سوبحەدەم
قەوس و قەزەحی جەمین خەم بەخەم
کەوانی برۆی سەریان داوە هەم
دڵێ سەوداکارتر لە ترس و خەم
چاو وەک ئەو ئاسکەی بەناز ئەکا ڕەم
برووسکەی ڕۆژی من ئەخاتە تەم
برژانگ وەک تیری ئاو دراو بەسەم
جەرگی عاشقان، ئەبڕن بەستەم
زوڵفی بەعەتری گەردنی پڕ نەم
لووتی دەستکردی پڕگار و قەڵەم
سەر گۆنای وێنەی مانگی چواردەهەم
قوتووی لەعلی ئاڵ، ناویان ناوە دەم



سی و دوو مرواری لەدەمدا سەرجەم
لە پووکی کاڵا چەسپیوە مەحکەم
واتەی گیان بەخش وەک عیسای مریەم
موعجیزەیەکە، خوا کردی کەرەم
فەرمانڕەوایە لای شاهی عەجەم
خاڵی لای لێوی نوقتەی ڕووی خاتەم
لەسینەی دوو سێو تازەی گوڵ بەدەم
(مەم)کوژە، بۆیە، ناویان ناوە مەم
شیرین و بێ شیر، شیرین بۆی، سەنەم
هێشتا هیچ کەسێ نەیناوەتە دەم
باڵا نەمامی نەو تووڵی ئیرەم
نەمامی عەرعەر لە سوجدەی داخەم
بەخەیاڵ ناف ئاو دەزێتە دەم
بەڵام بەشێوەی ئەدەب نامەحرەم
ئەم سەراپایە، مەدحێکە زۆر کەم
لەمە بەو لاوە، نەیتوانی قەڵەم

.......................................

«من وەسڵم ناوێ، عەشقم دەبێ کەم
ئەو ناوی شەمە، من دەورەی ئەدەم
جا وەک پەروانە بۆ بێتە بەرهەم
بسووتێکم بەگڕ گیانم فیداکەم
بوو بە بەدەخشان دەباشان سەرجەم
بردی، بوو بە لەعل شیعری مولهەم
بەڵام ئاخ قەدری نازانن چی بکەم
ئاخ وڵاتەکەم، داخ وڵاتەکەم»

***

## یاران نەو بەهار(*)

پیرەمێرد دووجار ئەم شیعرەی وەرگێڕاوە. جارێک لە ژینی ژمارە ٥٦٩ی حوزەیرانی ١٩٣٩ دا و جارێکیش لە ژمارە ٨٦٣ی مارتی ١٩٤٧ دا هەردوو جارەکە دەستنیشانی کردووە کە شیعری

(وەلی دێوانە)یە بەڵام لە گۆڕینەکەی ١٩٤٧ دا زۆری لە شیعرەکە لاداوە و گەلێ بەیت و مەبەستی شیعریی خۆی تێکەڵ کردووە. بۆ بەروارد هەر سێ دەقەکە دەنووسین:

«یاران نەو وەهار[١]،...
ئەمساڵ وە بەختم، بێ فەڕ نەو وەهار
ئاماوە دامان، کۆچ تەڵمیت بار
هەرچەند نیگام کەرد، نەدیم کۆچ یار
خێڵان گشت ئامان وە ڕیز دامان
پەخش بین وە دامان بارگەی ئیمامان
نە کۆچ یار بی، نە دەنگ یاران
وەهار وە نەم بی، وەژار ماران
هەر گوڵ بەڕەنگێ بەر ئامانە خاک
ئەوان گوڵخەندان، من دیدە نەمناک
هەر خونچێ وەنەم بی وە پەیکانێ
هەر گوڵێ وەنێش خار هیجرانێ
هەر لالێ داخین، وە سەد هەزار داخ
داخ منیان وە دڵ، حەسرەتکێشم ئاخ
سونبوڵ چون نیشتەر نێش مەدۆم نە دڵ
تێشتەرەن جەخار نە پام بەگ گوڵ
نەرگس مەوینۆ، ئەندووم بەرز مەبۆ
ئاهر وە جەستەم، قەقنەس تەرز مەبۆ
سۆسەنان زوان تانە کێشان لێم
جە داخ دووری دوور وەڵات وێم
سەیر چەمەن پێم چون ژار مارەن
هەر ئێد مەژنەون قاچان وەهارەن
پەی چیش! جەدووری شای (شەم) جەمینم
هاوەختەن بەرشو، گیان شیرینم
یاران، هامسەران، ساچۆن مەبۆ چوون
من(طەبەس)جامەن، شەم کۆت ئەو سەر توون

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی وەلی دێوانەی عوسمان هەورامییەوە وەرگیراوە.



* ئەم شیعر و وەرگێڕانە لە دیوانی پیرەمێردی م. هـ دا بلاونەکراوەتەوە.

وەرگێڕانی ١٩٤٧

یاران نەو بەهار
ئەمساڵ وە بەختم، بێ فەڕ نەوبەهار
زەوقی زیندەگیم بوو بەژاری مار
دنیا جەدیدەم چۆڵ و تەنگ و تار
هەر گوڵ بەڕەنگێ، سەرکێشا لە خاک
ئەوان گوڵ خەندان دیدەی من نمناک
هەر خونچە بۆ من، بوو بەپەیکانێ
پەڕەی هەر گوڵێ، خاری هیجرانێ
هەر لالە داخێ بەسەد هەزار داخ
داخی نا لە دڵ حەسرەتکێشم ئاخ
گوڵی نەورۆز و لالە و گەزیزە
سووریان بەخوێن جەرگی ئازیزە
من ئەمساڵ بەهار شادیم ناشادە
نەورۆزم ناوێ ڕەنجم بەبادە
ڕۆڵەی شیرین و گشت هاوەڵانم
تەفر و توونا بوون وەک خەیاڵانم
بەهاری وەی تەور ئێڵم لێ دووربێ
لەناو جەرگمدا گڕی تەندوور بێ
سەد خۆزگەم بەساڵ نەو بەهار پار
لەگەڵ گەل و خوێش سەیرانی گوڵزار
بەهاری ئەمساڵ جەستەم پەشێوە
چەوتە کارەکەم، نایێ لە ڕێوە

وەرگێڕانی ساڵی ١٩٣٩

یاران نەوبەهار،...
ئەمساڵ لە بەختم، بێ شەوقە بەهار
هاتنە خوارەوە، کۆچی بارگەدار
هەر چەندە ڕوانیم نەمدی کۆچی یار

خێڵان هاتنەوە گەیینە گەرمیان
بەزین لە دەوری دوانزە ئیمامان
نە کۆچی شەم بوو نە شێوەی ئەو یار
عەیشی بەهارم بوو بەژاری مار
گوڵ سەری کێشا لە توێی پەردەی خاک
گشت گوڵێ خەندان دیدەی من نمناک
هەر گوڵ خونچەیە بۆ من پەیکانێ
هەر پەڕەی گوڵێ دڕکی هیجرانێ
هەر گوڵاڵەیەک داخێ بۆ دڵم
هەر هەورێ بەرقێ لە ڕووی مەنزڵم
نەرگس ئەبینم چاوم کوێر ئەبێ
حەڵوای گوڵە زەرد لەلام سوێر ئەبێ
سەوسەن زبانی تانە ئەکێشێ
بەبۆنی سونبول سەرم دەئێشێ
سەیری چیمەن لێم وەک نەقسی مارە
هێندە ئەزانم ئەڵێن بەهارە
چونکو لە دووری شای شەم جەمینم
هەر وەختە دەرچێ گیانی شیرینم
وێنەی پەژارەی مەبعوسی مەئیوس
بەگریانەوە کەوتمە هەردەی طوس
هیوامان کەوتە بەهارێکی تر
زستان دەست ئەژنۆ، نیشتەی گوێ ئاگر
هەر ئەوەی چاکە بەئومێد ئەژین
ئومێد نەمێنێ ئێمەش وا نابین
***

## نازداری جافان

پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٤٧دا ئەم شیعرەی وەلی دێوانەی وەرگێڕاوە. چوار بەیتی دوایی شیعرەکە هی پیرەمێردە. هەندێ جیاوازیش لە نێوان شیعرەکە و وەرگێڕانەکەدا هەیە. جگە لەوەی کە پیرەمێرد ناوی وەلی دێوانەی نەنووسیوە و شیعرەکەی بەناوی (هەرِەمە)وە بڵاوکردۆتەوە.



ئەمەش دەقی شیعرەکە و وەرگێڕانەکەیەتی.

مەحبووب جافان[١]......

مەحبووب بێ عەیب، تایفەی جافان
سەر قەتار ڕەم، عەنبەر بۆ نافان
سەرکێش ڕەوێڵ، موشکین کڵافان
ناهووی مود برماس، مەکان نە هەردە
چووزەی سونبول چەر، نەسا سڵ کەردە
خاوێر و خاڵدار (خەتا و خوتەن) ماڵ
تەتار (تایف)، شۆخ شیرین خاڵ
وەتەن نەزامەن، سەر بەرز لەیلاخ
سەیر سەر کوان، سەیادان وە داخ
چەرخ و چەم سیا، جوست و چالاک پەڕ
شەیدای شکار دۆز، چنگ وە هوناو تەڕ
لاچین شەش دانگ سەحەر جەلات خێز
شەمقاڕ تیژ باڵ تەیر توند گورێز
شەمع شاپەسەند گشت سیا یانان
نام تۆن نەبەزم خوسرەوان، خانان
بە شەوق جەمین (شەم) ڕوخسارەوە
کێت نەدا وەدەم گرەی نارەوە
بەو قاش قەتران دڵ پێ ئێشاوە
ستوون یانەی کێت نەکێشاوە
بەو دیدەی سیای سورمەسای سێوەنگ
موژانت وەهوون کێ نەکەردەن ڕەنگ
بەو نیم نیگای ناز بەو لەنجەولارە
ئاخر جەرگ کێت، نەکەردەن پارە
بەو نیم نیگای ناز پێوار نە پەردە
ئاخر کێت نەکەرد وە ئازیز مەردە
بەو باڵای ئەو توول وە نەو ڕەستەوە
بەو کۆکۆی کڵاف دەستە دەستەوە

واچە دڵی کێت نەستانان وە زوور
ئاخر یانەی کێت نە کەردەن خاپوور
من دێوانە بیم، جە داخ تۆوە
داخ نیای وەبان دەماخ جە نۆوە

(١) دەقی ئەم شیعرە لە دیوانی وەلی دێوانەی عوسمان هەورامییەوە وەرگیراوە.

***

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد: ١٩٤٧

## نازداری جافان....

نەوەی نەو خاڵان، سەر ئێڵی جافان
سەر جەڵەی ڕەوەی عەنبەرین تافان
شەوقی پێشانی شیرین کلافان
بەو چاوە ڕەشەی دڵ پێی ئێشاوە
ستوونی ڕەشماڵ، کێت نەکێشاوە
بەنیم نیگای ئاز، قەدرت پەروەردە
ئازیز کێت نەکەرد بەئازیز مەردە
بە شێوەی شیرین شەم ڕوخسارەوە
کێت نەدا بەدەم، گڕەی نارەوە
بەو تیری دیدەی سورمەسای سیوەنگ
پەیکانت بەخوێن کێ نەکرد گوڵ ڕەنگ
بەو لارولەنجەی خەرامانەوە
کێت نەدایە خاک بەزامانەوە

.........

«من نەمزانیبوو، تۆ وا کوشندەی
ڕیشەی جەرگ و داو زوڵفان کەشندەی
بۆ خۆم ئەڕۆیم، بەڕێگای خۆما
لە پڕ تیشکێ هات، کێشای بەڕووما
بەدەم دەردەوە، دڵم ڕاچەنی
ئاوری دایەوە و تێر پێم پێکەنی



تومەز دەستی خۆی لێ وەشاندبووم
دڵی بەزامی تیر ئێشاندبووم»

***

## کوچکی هەواران

١٩٤٨

پیرەمێرد ساڵی ١٩٤٨ ئەم شیعرەی وەلی وەرگێڕاوە. بەڵام شەش بەیتی خۆی تێهەڵکێش کردووە و لە شوێنی خۆیدا خستوومانە کەوانەوە. پیرەمێرد لەم شیعرەدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە شیعری وەلی دێوانەیە و ئەم چەند دێڕەی لە پێشەکییەکەیدا نووسیوە:-

«ڕەنگە جارێکی تریش من ئەم ناڵەی بەسۆزەی وەلی دێوانەم نووسیبێتەوە، بەڵام چونکو خۆیشم وەک ئەو داخی پشێوی ئێلی جافم لە دڵدایە هەموو ساڵێ وادەی خێڵە و خواری ماڵە گەورە ئەم شیوەنە بۆ خۆم ئەنووسمەوە. هەر منیش ماوم بۆیان بگریم».

شیعرەکەی وەلی دەنووسین و ئنجا وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

سەنگ هەواران[1]، ...
سەنگ سیاسەنگ، سفتەی هەواران
مەلوول ماتەم، پەس مەندەی یاران
چون من هام شەریک، دەرد پەژاران
تۆ سەنگ، یەکام هەوارەن
یە پەی کێ ڕەنگت، ئازیەت بارەن؟!
سفتەی سەودای عەشق کامین نەو هاڵی
بێ دەنگ و بەدڕەنگ، مات و مەلاڵی
تۆ جەداخ کێ سفتە و سۆزانی؟
پەس مەندەی هەوار کامین هۆزانی؟
ڕاس واچە هجران، کێت نە دڵ داخەن؟
جە هجران کێ بەرکت قەڵاخەن!
سەنگ وات سیا، بەخت ستەمکێش خەم
پەروانەی پەشێو، دوور کەفتەی پای شەم
مەر نمەزانی، لێلاویت لێڵەن
یە ئەی جامەسکەن گوزەرگای خێڵەن
یۆرت و چراگای خێڵ جافانەن
جای عەیش و نیشات عەنبەر نافانەن

هەوارگەی ڕەوێڵ خێڵ موورادین
ماوای شەوق و زەوق زومرەی دڵشادین
من هەوار شەم شای پەروانانم
خان خاڵخاسان، سیا یانانم
پایز کۆچ خێڵ مەیان وە دامان
تەشریف ماوەران وەی زێد و زامان
من سفتەی ئەو شەوق شۆڵەی شەم چارەم
داخین ئەو نوور سەحەر ستارەم
ئێد کەواتش پێم، سەنگ هەواران
من جە ئەو بەتەر لاڵ بیم جە زوان
زانام سفتەی شەوق ئەو شەم ڕوخسارەن
داخدار داخمای دەست ئەو یارەن
منیچ نە هیجران شای شەم ڕوخساران
هابیم وە هامڕەنگ سەنگ هەواران
تەن چوون سیاسەنگ هەواران من
پادشای خەمکێش، خەمداران من

(١)دەقی ئەم شیعرە لە دیوانی وەلی دێوانەی عوسمان هەورامی وەرگیراوە.

***

وەرگێڕانەکە:

## کوچکی هەواران(١)

سەختی بەخت ڕەش، شوفتەی هەواران
مەلولی ماتەم دوور کەوتەی یاران
وەک من هام شەریک خەم و پەژاران
تو خوا کوچکی کێی، لە کام هەواری
وا بەدوودی ئاه، سیاه خەمباری
تۆ لە داخی کێ، سووتاوی سۆزی
جێماوی ماوای، کام خێڵ و هۆزی
ڕاست بڵێ داخی کێ لە دڵتایە
بۆ لەیلی کام ئێڵ بەرگت سیایە



وتی سیا بەخت، ستەمکێشی خەم
پەروانەی پەشێو، دوورکەوتووی ڕووی شەم
بۆچی نازانیت، لێلاییت لێڵە
ئەم شوێنە ماوا و گوزەرگای خێڵە
شوێن ماڵە گەورەی ئێڵی جافانە
هەوارگەی پەری زوڵف گوڵانە
پاز کەم کۆچیان دێتە دوو ئاوان
دێنە لەنجە و لار نازداری باوان
«شەوقی جەمالیان ئەدا لە ڕووی ئاو
پەری ئاسمان ئەکشێنە ژێر داو»
«کە سەر دەردێنن لە گۆشەی ڕەشماڵ
وەک مانگ لە هەورا ئەنوێنن جەماڵ(٢)»
«چەم و هەوارگە پڕ ئەکەن لە نوور
هەر چراخانە لە نزیک و دوور»
«هێشتا نەیدیوە دیدەی ئەم دەورە
زەمزەمەی عەیش و سەفا بەم (طەور)ە»
«ئەترسم (کەچ)یی چەرخی ڕۆژگار
چاوێکی پیسیان لێ بخاتە کار»
بە زبانی حاڵ بەردی بێ زبان
ئەمەی گوت منی هێنایە گریان
زانیم کە ئەویش یار و هاودەمە
وەک من پەروانەی دیداری شەمە
هەردوو بەردێکین سفتەی دڵ سەردین
هەردوو گرفتار ئێشی یەک دەردین
«پیرێکی تریش ماندەی ئەو دەورە
گشت ساڵێ ئەگری بۆ ماڵە گەورە

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.ه دا بڵاو نەکراوەتەوە.

(٢) پیرەمێرد ئەم بەیتەی لە شیعرێکی تریشدا بەکار هێناوە و سەرەتای شیعری (بەندی خاوکەری) بەو بەیتە دەست پێکردووە و دەچێتەوە سەر بەیتێکی مەولەوی.

## بێزاری هۆزان

پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە ساڵی ١٩٣٧دا وەرگێڕاوە.

دەقی شیعرە هەورامییەکەی (وەلی) بیست و دوو بەیتە. ئەم کردوویە بەشانزە بەیت و بەیت و نیوە بەیتی خۆشی تێکەڵ کردووە لێرەدا بۆ بەراورد دەقی شیعرەکە و گۆڕینەکە دەنووسین.

وەلی:

### بێزیای هۆزان[1]

ها بیم وە مەجنون، بێزیای هۆزان
ئەگەر وە دۆزام، بەیان دڵسۆزان
مەگەر نە هەردەی نەجدم بدۆزان
ئەریاران یەکێ ئەو یادم ئاران
یا هام جەهەردان یا جە کۆساران
هەر جایە مەقام ماوای مەجنون بۆ
مەنزڵگەی مەجنون، مات و مەحزوون بۆ
ئەو مەنزڵ مەقام، ئەو مەنزڵ جامەن
ئەو ماوا و مەکان یۆرت و ماوامەن
هەر جایە خاک زەمین پەڕنەم بۆ
جە هەر کۆکۆمای وەحشیان جەم بۆ
ئەوجا ، جای سەیلات گریان منەن
ئەو کۆ ماکۆ مای دیوان منەن
هەر سنگێ چەگیر دەس یارم بۆ
یاران هەر کەس یار خەم گوسارم بۆ
ئامانەت هەواڵ من بپەرسان چێش
مەر ئەو بواچۆ حاڵ وێڵیم پێش
ئەر بەی نیشانان نیشانەم نەبۆ
ئاسارێ جە یۆرت وێرانەم نەبۆ
تاقی بزانان بێ شەرت و شوونم
بێ سەودا جە فیکر سەودای مەجنوونم

..............

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی وەلی دێوانەی عوسمان هەورامییەوە وەرگیراوە.



وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

بێزاری هۆزان

وا بووم بەشێتی بێزاری هۆزان
بێنە پێ و شوێنم خوێش و دڵسۆزان
مەگەر لە هەردەی نەجدم بدۆزان
ئەگەر یادم کەن دۆست و خەمخواران
یاوام لە هەردان یا لە کۆساران
هەر جێیە خاکی زەمینی تەڕ بێ
هەر گردێ (کەڵی) وەحشی لەسەر بێ
ئەویان نمناکی گریانی منە
ئەمیان کۆمەڵی دیوانی منە
ئەگەر بەم ڕەنگە نیشانەم نەبێ
نموونەی یانەی وێرانەم نەبێ
ئنجا بزانن بێ سەر و شوێنم
گەردن ئازاد بێ شەمم لە خوێنم
هەر ئۆباڵی من بەئەستۆی ئەو بێ
بەختی من هەر شەو ئەو ماهی نەو بێ

***

## یاشا لە نوێوە

پیرەمێرد ئەم شیعرەی وەلی دێوانەی لە ساڵی ١٩٣٧دا وەرگێڕاوە. دەقەکەی ٢٤ بەیتە. گۆڕینەکەی پیرەمێردیش هەر بیست و چوار بەیتە. وەک شیعرەکانی پێشوو هەندێ جار لە بەیت و واتا و نیوە بەیتدا لە شیعرەکە دوور کەوتۆتەوە. دەقی هەورامی ئەم شیعرەم لە کەشکۆڵێ (مەحموود پاشای جاف)ەوە وەرگرت، کە بەڕێز (عەلی بەگی حسێن بەگی جاف) خستیە بەردەستمان و نەک هەر ئەم شیعرەی وەلی بەڵکە بۆ زۆر دەقی هەورامی ئەو شیعرانەی پیرەمێرد وەری گێڕاون سوودمان لێ وەرگرت. وەهەر دەقێک لە کەشکۆڵەکەی پاشای (لای عەلی بەگ)ەوە وەرمان گرتبێ ئاماژەی بۆ دەکەین و بەڕاستی ئەو جۆرە پیاوە دڵسۆزانەی وەک عەلی بەگ شایانی هەموو ڕێزێکن.

### یاشا جە نۆوە

یاشا جە نۆوە،...
یاشا نەو پایز باوەر جە نۆوە

طۆف تەڕ ئەنگێز پەیدا ببۆوە
نەو نم باران بۆ وەسارا و کۆوە
بوارۆ قەترەی نەونم نە سەردا
وەکۆ کۆی کڵاف پڕ نە عەنبەردا
بوارۆ سەردیی نەو پایز جەنۆ
سپی تەم پۆشۆ ساراو کەژ و کۆ
بشێونۆ زەوق شادی لیلاخان
نە بورج لەیلاخ ئێڵان بۆ داخان
وەرنە گشت ئێڵێ، ئێڵ مرادی
بەیان وەدامان وە زەوق و شادی
ڕەم ڕەم ڕەوێڵان تەڵمیت دار جاف
پۆل پۆل قەتاران کۆی کەوتوون کڵاف
بەیان وە دامان قیبڵەم جە نیشان
شادبان وە مەکان قەدیم جای وێشان
تا منیچ وەدین شای شەم جەمینم
ڕۆشن بۆ دیدەی دنیا پێ وینم
یاشا وەحاجەت شای دوڵدوڵ سوار
حاسڵ کەی مراد پەروانەی هەژار
زوو بەیۆ هەوای پایز جە نۆوە
تا دیدەم وە دین شەم شاد ببۆوە
ئەوان شاد وەزەوق، من شاد وەشەم بام
تا ساکن بەخەیر چەرخ هەفتەم بام

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

یاشا لە نوێوە،...

پایزێکی نوێ، بێنە لە نوێوە
بیکا بەتۆف و ڕەهێڵەی باران
لافاو هەڵسێنێ لە کۆهساران
باران بباریێ بەخوڕ لە سەردا
بە تۆی کڵافەی پڕ لە عەنبەردا



کەژ و کۆ و سارا، بیبەستێ سەهۆڵ
نازدار کۆڵوانە، ببەستێتە کۆڵ
بشێوێ شادی و خۆشی لیلاخان
شەم و باوانی بگرین لەداخان
ئێڵی مرادی خورپەی تێ کەوێ
لە تاوی سەرما هیچ کەس نەسرەوێ
بار و بارخانەی ڕەوێڵانی جاف
پۆلی پەری گەل، گشت سورمە کڵاف
بێنە خوارەوە لە هەموو سەردا
بکەونە شادی و قیبلەم لە تەکدا
سا بەڵکو منیش شای شەم جەبینم
بە دیدەی دنیای ڕەوشەن ببینم
یاشا بەحاجەت شای دوڵدوڵ سوار
ڕەواکەی نیاز پەروانەی هەژار
جا بەم ڕەنگە زوو پایز بنێرە
با دیسان شەمم ببینم لێرە
هەموو ئێڵی جاف شاد بێ هەر کەسە
من تەنها نووری شەمی خۆم بەسە

***

## قیبلەکەم هەی شەم

پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٤٩دا ئەم شیعرەی وەلی وەرگێڕاوە. دەقی شیعرەکەی وەلی ١٣ بەیتە. لای پیرەمێرد بووە بە ١٨ بەیت. واتە پێنج بەیت یاخود دە دێڕی لێ زیاد کردووە. هەردوو دەقەکە دەنووسین. هەروەها وەک پێشتر نووسیمان ساڵی ١٩٤٠ دیسان ئەم شیعرەی گۆڕیوە و ناوی ناوە (شیرین ناوی شەم). تکایە بڕوانە وەرگێڕانەکەی لاپەڕە(٩٠).

بارک الله شەم،...

بنازون بەو زات خولقنایش چون شەم
نەقاش قودرەت، کێشانیش ڕەقەم
جەی سەر زەمینە، وێنە و میسلت کەم
جە شەوق پێشان نوور سوبحەدەم
قەوس ئاسمان پێچ وەردەن چون خەم

ئەبرۆت چون کەمان خالق ئەعزەم
خەدەنگ مە شانۆ نە دڵەی پڕ خەم
دڵت چوون ئاهوو مودبر ماس ڕەم
نیم نیگات ئەفسوون جادووی هارووت کەم
خە دەنگ موژگان چنگ پێکان جەستەم
بێ پەروا پێکۆ بەجەور و ستەم
زوڵفت پۆشنا ئافتاب چوون تەم
وێنەی زێبایی مەسیحای مەریەم
ڕووخسار بەوێنەی مانگ چاردەهەم
دەهەن چون حوقە، سەر چەشمەی زەمزەم
سی و دوو دندانت مرواری سەرجەم
لەب یاقووتت پیاڵەی عەجەم
خاڵت سولەیمان کەردش بەخاتەم
دوو قەندیل نوور پێش مەواچان چەم
دوو سیب سینەت نەوڕەس گوڵ بەدەم
بیللا وێنەشان تاجە بەهەشت کەم
خوداوەند بەی تەور تۆش ئاردی فەرهەم
سا هەر بەی تەرزە نامش نیای شەم
بە نامت دنیا ڕەوشەنەن سەرجەم
نوتقت گیان بەخشەن جە خواوە مەرهەم

وەرگێڕانەکە:

قیبلەکەم هەی شەم
خۆت بەشێوەی شەم ناوەکەیشت شەم
نەقاشی سروشت تا کێشای ڕەقەم
نەقشی وا نییە بۆ بێ نێشی کەم
جەبینت فەجری سپی سوبحدەم
قەوس و قەزەحی لە سەردا بۆ خەم
برۆت دوو قەوسە هەردوو سەریەهەم
دڵ و دەروونم پڕ لەخەم و هەم



دیدەت دیدەی ئاسک سڵ کردووی بەڕەم
پێچی پرچەکەت بەپێچ وەک ئەرقەم
برژانگت وەک تیر ئاودراو بەسەم
لە ئەنگاوتندا پڕ زۆر و ستەم
ئەگریجەت زوڵمات بەحەیات پڕ تەم
لوتت بەپرگار درا لە قەڵەم
گۆنات دوو مانگن حەوت حەوت چواردەهەم
دەمت نوقتەی وەهم پڕ ئاوی زەمزەم
سی و دوو ددانت جەواهیری جەم
شاباشی جلوەی مولکی جەم سەرجەم
دەنگت ڕۆح ئەدا وەک عیسای مریەم
خوا ئەو موعجزەی پێ کردووی کەرەم
لێوت یاقووتی کانی سەر ئادەم
بۆ زامی دڵی عاشقان مەرهەم
لە ڕاستی ڕازت سەد سوبحان ئەبکەم
هەر چەند تەعریفی بکەم هێشتا کەم
خاڵت بۆ سەجعی سلێمان خاتەم
وا سلێمانت خستە ژێر قەدەم
دوو سێوی سەردەشت تازەی گوڵ بەدەم
لەسەر سنگتایە ناویان ناون مەم
سەرگەردی مەمت خاتوو زینی مەم
وەلی دێوانەت داگیر کرد لە شەم
بالآت بەئاڵ و والآ وەک عەلەم
گا لەرزان، گا لار، گا ڕاست و گا خەم
سەراپات شێوەی ڕۆژێکی بێ تەم
بە تەمی عالەم ئەخاتە ماتەم
بنازم بەسونع خەلاقی عالەم
شەمی هەڵگیرساند ناویشی نا (شەم)

***

له ڕێی گوزەرێک ڕۆژێ تووشی بووم
وەک برووسکەی هەور شەوقیدا له ڕووم
تیری برژانگی کێشایه ناو دەست
نایه کەوانی سەختی برۆی مەست
گۆشا و گۆش کێشای پەنجەی لێ بەردا
وەک گیڤەی شمقارِ کشا لەسەردا
دای له پەڕەی دڵ جێگاکەی خەتەر
له گازی پشتم نووکی چووه دەر
دەستی زەلیلیم گرت بەزامەوه
بەلنگه فرتێ بۆی تلامەوه
ئێستاش برینم کەوتۆته ناسۆر
له گیانەڵادام وا بەدەستی زۆر
دکتۆرێ نییه بێت بۆ دەوای زام
خەمخوارێ نییه دانیشێ له لام
بێ یار بێ ڕەفیق بێ ماوا و بێ دەر
وەک ماران گەستەی زامی پڕ خەتەر
«لێفه شڕەکەم ئەدەم بەسەردا
به خەیاڵ ئەویش دێنم له دەردا
چی بکەم جێگاکەم ڕێ بەو ناکەوێ
بیکەم بەمیوان بۆ تاقه شەوێ
توخوا لێی گەڕێ با هەر خەیاڵ بێ
نامەوێ عەشقم کزی ویساڵ بێ»

---

(١) بڕوانه ژین ژماره ٧٧٣ساڵی ١٩٤٥ .

***

## بەندی ئای ئای[١]

پیرەمێرد ئەم شیعرەی له شێوەی (گۆران)ەوه وەرگێڕاوه بۆ سەر شێوەی سلێمانی. بەڵام وەک خۆی نووسیویه خاوەنەکەی نەزانراوه کێیه. ئێمه دۆزیمانەوه که شیعری بێسارانییه[٢]. پیرەمێرد نووسیویه «بەکوڕێنی، بەندێکی ئای ئای-م، له ئای ئای بێژەکانی وەک، مچه نۆڕەیی، و باوه زەینەڵ، بیستبوو، ئێستایش نازانم هی کێیه؟! وا ئەوەندەی که له بەرم ماوه، بەشێوەی خۆمان



ئەینووسمەوه، خۆزگه یەکێک بۆی ئەدۆزیمەوه هی کێیه؟!».

ئەمشەو گڕێکی وام کەوته دەروون
بڵێسەی گەیییه تۆی سەقفی گەردوون
له کڵپەی ئاگر، که زۆری هانی
هاوارم ئەکرد هەی ئاوەدانی
ئای خێرەوەمەندێ ئەهلی ڕەحمەتێ
گۆزەیه ئاوم بگەیەنێتێ
به هاوارمەوه هات نەوهاڵەیی
شیرین ئەندامی چوارده ساڵەیی
چوست و چالاکی بەگورجی و بەتاو
پەلاماری برد بۆ گۆزەیی ئاو
گۆزەی هەڵبڕی و کردیه سەرما زوو
وەیزانی ئاوه، تومەز نەوت بوو
من له دوورەوه بۆنی نەوتم کرد
بەڵام ئەو ڕشتی پێما دەستوبرد
به دەست و زبان ئەلالامەوه
نەوتم پیا مەکه ئەپاڕامەوه
لەبەر بەختی من، نەهاتیی ئەجەل
هاوارمی نەبیست لەبەر پەلەپەل
که نەوت نزیکی ئاگر کەوتەوه
ئاگر سەرلەنوێ گڕی بەستەوه
ئێستاش سووتاوی ئەو ئاگری عەشقەم
له ڕاو و ڕەسما پوختەی ئەو مەشقەم
لافی عاشقی بێ سەرەنجامه
تا، وا نەسووتێ ناپوخته و خامه

---

(١) بڕوانه ژین ژماره ٨٨٥ ساڵی ١٩٤٧ .

(٢) ئەم شیعرەمان له دیوانی بێسارانی مامۆستا عوسمان هەورامی وەرگرتووه.

دەقی شیعرەکەی بێسارانی بریتیه له نۆ بەیت، وەک له دیوانی دەستنووسی مامۆستا عوسمان هەورامیدا نووسراوه، بەڵام لای پیرەمێرد بووه بەدوانزه بەیت. واتا سێ بەیتی لێ زیاد کردووه.

هەردوو دەقەکەمان خستە پێش چاوی خوێنەران.

ئەمــشــەو ئـایرێ گــڕ بەست نە دەروون
بڵــێــســەش یاوا وەســەقــفی گــەردوون
جـە کــورەی ئایر، جـە بڵــێـســەی نار
ستــێــزام چوون بەرق، ئاو کــەردم هاوار
جـــە هاوار هاوار شــفـــا و لاڵەی من
جـەهەی ئاو هەی ئاو شین و زاڵەی من
تەمز مـــــژ نەوۆ یەک خـــودا تـەرسێ
مـسڵـمان سـیفـەت ڕاگەی هەق پەرسێ
مـــاوەرۆ گـــۆزەی نەفت (بیت المال)
مە شانۆ وەڕووی گڕ بەستەی شەماڵ
پێـــســـە مـــەزانو یەگــۆزەی ئاوەن
تەمز یەخـــــۆ نەفت تەوەن پێ تاوەن
گــۆزەی نەفــتش کــەرد وەبڵــێـســەمـدا
قـرچەی گۆزەی نەفت یەند ستــێـزەمـدا
هەر تا سـەحـەر بی هەر سـۆزام بەسـۆز
سەحەر سفتەی کۆم باد بەردش چوون تۆز
هەر کەس وێنەی من ئیقبالش چەفتەن
مـەوا چوهەی ئاو نەسـیـسش نەفتـەن

***

## پیرەمێرد و شیعرێکی یوسف بەگی ئیمامی

پیرەمێرد لە ڕۆژنامەکەیدا لەژێر ناوی شاعیرێکی نەناسراودا شیعرێکی وەرگێڕاوە. شیعرەکە خۆی یانزە بەیتە، پیرەمێرد سیانزە بەیتی لێ زیاد کردووە و بۆتە بیست و چوار بەیت، ئێمە نیشانەمان لە نێوانیاندا داناوە.

دەقی شیعرە هەورامییەکەمان دەست نەکەوتووە، بەڵام لەهەر لایەک کە بڵاوکراوەتەوە بەشێوەی سلێمانی هەر یانزە بەیتە.

سەبارەت بەژیانی ئەم شاعیرە ئەوەندەمان دەست کەوت کە لێرەدا دەینووسین: «یوسف بەگی ئیمامی لە تیرەی ئیمامییە کە یەکێکە لە ئێڵی جاف لە دەوری محەممەد پاشای کوڕی کەیخوسرەو بەگدا ژیاوە پیاوێکی بەجەرگ بووە، جارێک برایەکی لە چیا دەبێ پڵنگ دەیکوژێ،





بۆ ڕۆژی دوایی یوسف بەگ ئەچێتە هەمان شوێن و لەوێ پڵنگەکە دەکوژێ و بەو بۆنەیەوە شیعرێ دەڵێ»[١].

.....................................

(١) بڕوانە هاوکاری ژمارە-٨٤٤- ١٩/٦/١٩٨٦ چەند سەرنجێک لە کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی - ئومێد کاکە ڕەش.

***

### کەوتە ئارایش[١]

کـــەوتـە ئـارایش، کـــەوتە ئـارایش
نـازداری جـــافـــان کـــەوتە ئارایش
لە پاش ئارایش هاتە فـــەرمـــایش
تەڵـمـــیـت بەندانە بۆ لای دیزیـایش
خـۆی خــسـتــە بەرگی سـەفـەرییـەوە
بە لارولەنجـــەی دلبـــەرییـــەوە
تـافــتــەی ئاڵ و تـاقــەی هندی زەرد
پۆشـای بەباڵای عـەرعـەری بێ گـەرد
تاجی لە سوورمەی کشمیری سەد ڕەنگ
لە وێنەی نەخـــشی بەهزادی ئەرژەنگ
شـەدە و سـرکـەیی کـێـشـا بەدەورا
ڕۆژ شــیـــرینتــر بوو لە هالەی هەورا
دەسمـاڵی شـیلەی عـەنکەبووتی ڕەنگ
کـێـشـای بەدووشـا شـاهانە ئەو ڕەنگ
بەو ئاڵ و واڵای شـۆخی شـیـرین تەرز
دڵـی شـــــێـــــردڵی ئەهێـنایە لـەرز
ڕیشـــەی جگەری ئەپســـاند بەپێـــوە
بـرژانگی گـــیـــانی ئەبرد لە جـــێـــوە
ئاسکی شـــیـــروانە چاو بـەنیگاوە
گـــاگـــا لە ڕووی ناز ئاوڕی ئەداوە
قەد و قامەتی بوو بەقەدقامەت:(قدقامت)
کـە هەسـتـا ، هەسـتـا شـۆڕی قـیـامـەت

................................

بەو گرشمەو ناز خەرامانەوە
کەوتە ڕێ لە ڕێی دواوانەوە
پێی نایە رکاب سوار بوو دەستوبرد
پەری ئاسمانی ئاوزەنگی بۆ گرت
خۆی خورشیدی بوو بارەیشی شیرێ
بوراقی میعراج، بەخوای ئەسپێرێ
شێر و خورشیدی شیعاری ئێران
لەو شێوەیەوە هاتۆتە مەیدان
کەلی شاکەلی پڕ کردبوو لە نوور
دەشتی گەرمیان بوو بەوادی (طور)
بەپێ خاوسی چووم بەرەو پیری
نەمتوانی ڕاکەم داد لە دەست پیری
ئەو بەسەیادی هەڵوەستایەوە
کەوانی برۆی توند کێشایەوە
تیری برژانگی هات دڵمی پێکا
دڵ و دەروونمی هەڵدرووپێکا
ئێستایش زامی تیر نا دیاریمە
یادی ئەو تیرەی یادگاریمە
ئاخ دەستی چەرخ و تیرە بارانی
نە ئەو ئێڵەی هێشت نە نازدارانی
شوێن ماڵە گەورەی کۆهگای چاومەستان
بوو بەمەکۆگای جەردە و خارستان
دەک فەلەک بەقین، کوێراییت دایە
بۆچ وا بەزەییت بەکەسا نایە
لە جێی بەگزادە و شیرین سواران
پڕ لە چەقەڵ و گورگە هەواران

..........

(١) لە کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغیدا ل ١١٩ ئەم شیعرە بەناوی عبدالله بەگی ئیسماعیل بەگەوە نووسراوەتەوە.

***



## یار شێوەی چۆنە؟!

پیرەمێرد دووجار ئەم شیعرەی لە ڕۆژنامەکەیدا بڵاو کردۆتەوە. لە جاری یەکەمدا کە بڵاوی کردۆتەوە ساڵی ١٩٤٣ ، ناوی شاعیرەکەی نەنووسیوە. جاری دووەم کە ساڵی ١٩٤٩ بڵاوی کردۆتەوە ناوی شاعیرەکەی نووسیوە وتوویە «شاعیری نەخوێندەوار حەسەن کەنۆش» لە ڕاستیدا بەوەرگێڕانەکەدا دیارە کە (حەسەن کەنۆش)ی خاوەنی ئەو شیعرە، هەر چەندە نەخوێندەوار بووە، بەڵام شیعرەکەی زۆر جوان و شاعیرانەیە. شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بەژیانی ئەم شاعیرە بەدەستەوە نییە. یاخود ڕەنگە هەبێ و ئێمە دەستمان پێدا نەگەیشتبێ. بەداخەوە دەقە هەورامییەکەی ئەم شیعرە جوانەمان دەست نەکەوت.

لە لایەکی تریشەوە مامۆستا محەممەد ڕەسول هاوار لە دیوانی پیرەمێردی نەمردا لاپەڕەی ١٧٣ ، شیعرەکەی بەهی پیرەمێرد داناوە و ئاگاداری ئەوە نەبووە کە ئەوە شیعری پیرەمێرد نییە. هەروەها پەراوێزی بۆ شیعرەکە کردووە و باسی ئەوەی کردووە کە پیرەمێرد نەیویستووە لە وەسفەکەیدا لەخوار سنگی ئافرەتەکەوە باس بکات!!.

***

## یار شێوەی چۆنە(*)

وەرگێڕانی یەکەمی ساڵی ١٩٤٣

یار شێوەی چۆنە، یار شێوەی چۆنە
بێ چاوێنی بێ، یار شێوەی چۆنە
برۆی ماڵی جیم، چاو خانەی نوونە
گوڵنکەی پووشین کلابتوونە
کارخانەی دەستی خودای سروشتە
لە بەشەر ناکا حۆری بەهەشتە
هەر چەند لە نەسلی دایکە حەوایە
بەڵام نموونەی نەقشی خوایە
ئافەریدە سونع، بێ هاوتای ئیزەد
دووربێ لە حوکمی چاوەزاری بەد
جلوەی جەدوەلی چاوی سوورمەڕێژ
چاوی ئاسکی کردووە گێژ و وێژ
برژانگ سیافام بەسوورمەی کۆی (طور)
بە تیری نیگای دڵ خانەی زەنبوور

ڕووی سفیدەی سوبح، بەشەفەق قرمز
شیرینتر لە ڕووی شیرینی هورمز
لووت تەڵای خسرەو قاڵی نەوجەڵا
زمڕووتبەند بووە لە گۆشەی تەڵا
هەناسەی دەوای دڵەی پڕ خەمە
بە ئەموستیلە ناوی مریەمە
دوو پەڕەی گوڵنار ناوی ناوە لێو
ماچێکی لێوی شێخ ئەخاتە کێو
سی و دوو ددانی دانەی مرواری
لە قوتووی لەعلا جلوەی دیاری
هەر چوار تەرەفی یاقووت تەنیوبە
یاقووت یاقووتی گیانە کێ دیویە
چەناگەی زیوی سپی قاڵ بێ خاڵ
کۆی غەبغەب میناى پاکتاوی زوڵاڵ
گەردن گەردنی ئاسکی خوتەن گێڵ
یا گەردنی قاز دەلیلەی ڕەوێڵ
سونعی شیرینی دەستی سروشتە
وێنەی جەمالی حۆری بەهەشتە
کێ ئەڵێ نەسلی جنسی حەوایە
ئافەریدەی دەست زاتی خوایە
های لەو وەستایەی چەند سنعەت سازە
سەیر کەن ئەو شێوە و گرشمە و نازە
سەیری جەدوەلی دیدەی سوورمەڕێژ
لە چاویا چاوی غەزال گێژ و وێژ
برژانگ ڕێژراوە بەکلی کۆی (طور)
دڵ کون کون ئەکەن وەک شانەی زەنبوور
سەر گۆنای سپی ئالوودەی قرمز
داخی نایە دڵ شیرینی هورمز
لووتی تەڵای قاڵ جەلادراوە
زومڕوتی لەسەر تەڵا داناوە



هەناسەی دەوای سەرعی و سەرسەری
سلێمان مۆری نایە سەر سەری
چاڵی تینوێتی ئاوی حەیاتە
قەترەی ئارەقی دەوای مەماتە
قۆڵ بەبازیبەند دانەی لاڵەوە
پەنجە بەڕەنگی خەنەی ئاڵەوە
سنگ تەختەی عاجی شەترەنجی شاهان
شاماتی شاهان ئەخاتە ئامان
دوو سێو لەو سنگە تەلیسم بەندە
کەس نەیزانیوە بەهای سێو چەندە
لەوە بەرەو خوار بۆ کەس نەبینرا
پەردەی ئەدەبی بەسەرا کێشرا

........................................

(*) پیرەمێرد جاری سێیەم لە ژمارە ٦٣١ی ژینی ساڵی ١٩٤١دا ئەم شیعرەی بڵاو کردۆتەوە.

وەرگێڕانی دووەمی ١٩٤٩

جەماڵی چۆنە، جەماڵی چۆنە
تبارک الله، جەماڵی چۆنە
برۆی سەری جیم چاو ماڵی نوونە
جن دەستی وەشاند، بەشم جنوونە
دوو پەڕەی گوڵنار ناوی ناوە لێو
پەری سەرقافی بۆ کەوتۆتە کێو
سی و دوو ددانی لولوی گەوهەرە
بەزەردەخەنە گیان و دڵبەرە
دەوری بەحەلقەی یاقووت تەنراوە
(طلسم)ە و لەدەو زەمزەم بەستراوە
چەناگەی گۆی زیو کەمێکی چاڵە
خاڵێکی تیایە هاوار لەو خاڵە
گەردن گەردوونەی ئاهوی خوتەن کێڵ
گەردنکەچیەتی سەد شیرین و لەیل

چاڵی تینویەتی چەشمەی حەیاتە
لە شیرینی دا ئاوی نەباتە
قۆڵ بەبازیبەند دانەی لاڵەوە
حەلقەی زولف بەسەر لیمۆی کاڵەوە
دەست دەستەوانەی زەردوویی تێدا
مریەم خۆی دەستی هێناوە پێدا
گوارەی گوێی کاتێ ئەلەرێتەوە
ڕەگی گیان بەناز ئەکێشێتەوە
سنگ بلووری ساف ئاوێنەی زیوە
مانگ عەکسی شێوەی خۆی تێدا دیوە
با شاعیریشی (حەسەن کەنۆش) بێ
لەوەلا، ئەشێ هەر پەردەپۆش بێ
خوایە سنعەتی خۆت بپارێزە
مەیدە بەنائەهل گیانی عەزیزە
ئەسپەردەت بارگەی دوانزە ئیمام بێ
تا قەرنی دوایی دنیای بەکام بێ

***

## لەسەر دیارێ

پیرەمێرد ئەم شیعرەی وەرگێڕاوە و لە ڕۆژنامەکەیدا[١] بڵاوی کردۆتەوە بەبێ ئەوەی ناوی شاعیرەکە بنووسێت، یاخود باسی ئەوە بکات کە شیعرەکە وەرگێڕڕاوە!. ئێمە لە ئەنجامی گەڕان و پشکنین دەقی هەورامی ئەو شیعرە و خاوەنەکەیمان دۆزیەوە کە شیعری شاعیر (ئەحمەد پریسی)یە و (پریس) دێیەکە لە نزیک هەڵەبجە. ئەم شاعیرە هاوچەرخی مەولەوی بووە. واتا (مەجذووب)ی شاعیرە.

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس دەفەرموێ «ئەحمەد پریسی کوڕی خەسرەو چاوەش و لەخێڵی میکایلی جافە و لە دێی پریس لەناو هۆزی نەوڕۆڵیدا دانیشتووە»[٢]. هەروەها مامۆستا لە کتێبە بەنرخەکەیدا (یادی مەردان) بەشی دووەم لاپەڕەی ٤٩١ هەتا ٤٩٧، شەش پارچە شیعری ئەم شاعیرەی بڵاو کردۆتەوە. لە دوا لاپەڕەیدا نووسیویە:

«ساڵی لە دایک بوون و مردنی ئەحمەد پریسی نازانم، ئەحمەد پریسی لە دێی پریس دانیشتووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. لە گۆڕستانەکەی (ملەی مزیار) لە ژوور دێی



پریسەوە لەلای ڕاستی ئەو ڕێگاوە کە لەپریسەوە ئەڕۆیت (بۆ نەوروڵی پارچە) بەخ... سپێرراوە».

نەسەر دیارێ، نەسەر دیارێ
ئارۆ شەخسێ دیم نەسەر دیارێ
چون چەشمەی حەیات خاڵ زەنەخ دارێ
چەرخ چەم چون باز کەوتوون مەی تارێ
شەونم نە ڕووی بەرگ گوڵ باغ بەهارێ
صەیادی صەیدان چون من هەزارێ
جە صەفحەی جەبین ساکار سامانێ
مەکتوب بی وە ئەمر شای لامەکانێ
سەرئێڵی ڕەوێڵ زوڵف کلافانێ
شەم شێوە شیرین نەسل جافانێ
دیم دەس وەسەرسەر کەمان گرت مەحکەم
کێشا تا سەر سەر کێش سەردان وەهەم
خەمیا و هەوادا عەلەم کەرد قامەت
شەصتی نەوکەمان پەی کەردەی زامەت
سەراسەر سارای تەن وە هووناو وەرد
پەڕە پەڕەی جەرگ پەڕان پەڕان کەرد
تا چەرخی چەپگەرد مدران وە پاوە
گل مەدەون وە زام ناسۆر نماوە
(مەجذووب)م جەزەڵ، هەر دوور نەشادیم
کوشتەی سەر ڕەوێڵ ئێڵ مرادیم

---

(١) بڕوانە ژین ژمارە ٩٦٦ ساڵی ١٩٤٩ .

(٢) بڕوانە یادی مەردان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بەشی دووەم لاپەڕەی ٤٨٨ .

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

لەسەر دیارێ،...
ئەمڕۆ یارم دی لەسەر دیارێ
دەم کانی حەیات گەردن خاڵدارێ
دیدەی دیدەی باز دڵان شکارێ

صیادی نێچیر وەک من هەژارێ
شێوەی لاهووتی تەرلان تەوارێ
سەر ڕەوێلّی ئێل زولّف کلاّفانێ
شەم شێوەی شیرین نەسلی جافانێ
دیم بەلەنجەولار لە ڕاگوزارێ
بۆ گیان کێشانی من هاتە خوارێ
کەوانی برۆی کێشا بەهەودا
تیری برژانگی هاویشت لەسەردا
گڤەی کرد و هات درا لە جەرگم
بەخوێناوی دلّ گولّگون بوو بەرگم
شەهیدی عەشقم کفنم پێ ناوێ
پایە بلّندم بەناو و داوێ

## پیرەمێرد و چەند شیعرێکی (حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە) و (ئەحمەد بەگی کۆماسی)

حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە (تالعی) ١٧٣٢ - ١٧٦٥ی زاینی. پیرەمێرد لەکاتی خۆیدا، چەند جارێک (گلّکۆی تازەی لەیل)ی بەناوی (حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە)وە وەرگێڕاوە.

یەکەم جار لە تورکیا لە ژمارە ١٢ی سالّی ١٣٣٥ی ڕۆمی کە دەکاتە سالّی ١٩١٩ی زاینی هەر بەشێوەی خۆی شیعرەکەی بلاّو کردۆتەوە و دێڕ بەدێڕ بەرانبەری کردوویە بەتورکی. وە پێشەکییەکی کورتی بۆ نووسیوە بەتورکی تیایدا باسی شاعیرە نەخوێندەوارەکانی کورد دەکات کە بەو حالّەشەوە زیرەک بوون و شیعری جوانیان داناوە. وەنووسیویە ئەو دەقە هەموو شیعرەکە نییە و ئەو هەر ئەوەندەی لە یادە. کە هاتوشەتەوە بۆ سلێمانی چەند جارێک هەر بەناوی حەمە ئاغاوە گلّکۆی تازەی لەیلی بلاّوکردۆتەوە. بەلاّم لەم دواییەدا چەند نووسەر و شاعیرێک کەوتنە سۆراغی خاوەنی ڕاستەقینەی و هەردوو دەقی (گلّکۆی تازەی لەیل)ی ئەحمەد بەگی کۆماسی و (گلّکۆی تازەی یار)ی حەمە ئاغایان بەشێوەی خۆیان بلاّو کردەوە. لەو مامۆستا بەڕێزانە (ئەبوبەکر هەوری) لە کتێبی (شیعری کۆن و نوێ)دا کە سالّی ١٩٧٥ دەرچووە باسی ژیان و بەسەرهاتی هەر یەک لەو دوو شاعیرەی کردووە، وە ئێمە سەرنجی خوێنەر بۆ ئەو کتێبە ڕادەکێشین و نامانەوێ لێرەدا دووبارەی بکەینەوە و تکایە بڕواننە لاپەڕەکانی ئەو کتێبە. تەنیا سەرنجێک کەمن سەبارەت بەو کارەی خوا لێخۆشبوو هەمە ئەوەیە کە مافی پیرەمێرد لە وەرگێڕانەکەدا خوراوە. چونکە هەموو ئەو دەقە وەرگێڕاوانەی شیعرەکە بۆ سەر شێوەی سلێمانی لە لایەن پیرەمێردەوە بووە.

هەروەها (س. ع شادمان) چەند جارێک لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکاندا ئەم باسەی



کردۆتەوە و بیروڕای نوێ و شیاوی قسە لەسەرکردنی دەربڕیوە لە گۆڤاری (بەیان)یشدا لە سالاّنەی دواییدا هەریەک لە مامۆستایان مستەفا نەریمان و مەحموود زامدار لێکۆلّینەوە و ساغ کردنەوەیان لەم بارەیەوە نووسیوە. بڕوانە ژمارەکانی ١٠١، ١٠٦، ١١١ی بەیان. هەروەها مامۆستا عوسمان هەورامی لە (ڕۆشنبیری نوێ)ی ژمارە ٤٥ی سالّی ١٩٧٥دا دەقی تەواوی شیعری (گلّکۆ)ی ئەحمەد بەگی کۆماسی بلاّو کردەوە. لەبەر دوور و درێژی شیعرەکە تەنها وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد بلاّو دەکەینەوە.

پیرەمێرد جگە لە پێشەکی و شیعرەکەی گۆڤاری (ژین)ی ئەستەموڵ کە نووسیویە و وەری گێڕاوە بۆ تورکی، لەم ژمارانەی ڕۆژنامەکەیدا ئەم باسەی هێناوەتە پێشێ.

١- ژیان ژمارە ٤٦٧ ی سالّی ١٩٣٦

٢- ژین ژمارە ٦١٣ ی سالّی ١٩٤٠

ئەوا ئێستا شیعرەکەی (ئەحمەد بەگی کۆماسی) کە پیرەمێرد بەشیعری (حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە)ی زانیوە و وەری گێڕاوەتە سەر شێوەی سلێمانی دەنووسین، لە نوسخەکەی (ژیان)ی سالّی ١٩٣٦دا شیعرەکەی بەناتەواوی وەرگێڕاوە، بەلاّم لە کتێبەکەی مامۆستا (هەوری)دا بەتەواوی بلاّو کراوەتەوە.

گلّکۆی تازەی لەیل،...
ڕۆژێک چوومە سەر گلّکۆی تازەی لەیل
چوومە سەر قەبری لەیلەکەی پڕ مەیل
لە دیدەم باری فرمێسک وێنەی سەیل
چوومە سەرینی بەدلّەی پڕ جۆش
کێلی مەزاریم ماچ کرد بەپەرۆش
وتم ئەی ئازیز ئەلّماسی ناو خۆلّ
موبارەکت بێ یانەی تەنیای چۆلّ
سەرێک هەلّبڕە سەولّی خەرامان
وا مەجنوونەکەت هات بەقوڕ پێوان
کۆچی بێ وادەت کارێکی وای کرد
دێوانەی کردم هۆشی لە دەس برد
بلّێسەی عەشق و دووری بالاّی تۆ
گڕی خستۆتە لاشە و تان و پۆ
وەختە وەک قەقنەس لەش بێ بەزوخالّ
شاد بێ بەتۆزی لاشەکەم شەمالّ

یا وەکو مەجنوون شێتی لۆنگ بەکۆڵ
لەش بێ بەخۆراک وەحشیانی چۆڵ
سوێند ئەخۆم ئەی لەیل بەیادی پیرۆز
بەو ئەگریجانەی ژاکاوی ئاڵۆز
بەو دانە خاڵەی پیرۆزە ڕەنگەت
بەو جێ تاریکەی کش و بێ دەنگەت
بە یادی جوانی لە دەس دەرچووم
بە جێگەی لەیلی تازە کۆچ کردووم
لەو ساوە چەرخی چەپی بێ ئامان
تۆوی جوانی تۆی لەخاکا ڕوان
لەو ساوە کە تۆی بەزۆر لێ سەندم
ڕەگ و ڕیشەی دڵ جەرگی هەڵکەندم
تۆی برد بۆ خانووی تازەی ناو مەزار
منی هێشتەوە بۆ جەوری ڕۆژگار
بە وێنەی مەجنوون دەروون لە غەم کەیل
هەر لەیل لەیلمە لە هەردەی دوجەیل
وێنەی بێ گەردت هامرازی ڕامە
لەگەڵ جەفا و جەور دایم سەودامە
دڵ پڕ لە خەم و دەروون زوخاڵم
کافر بەزەیی دێتو بەحاڵم
شەوان زاری و شین ڕۆژان ڕۆ ڕۆمە
یەکجار لە دووری باڵاکەی تۆمە
ماڵ وێرانیم و بەختی شێواوم
وەک ئاهوی سەحرا لە ڕەو جێماوم
جێی حەسانەوەم چیا و دەشت و هەرد
خۆراک و ئاوم چەرمەسەرێ و دەرد
حاڵی تۆ چۆنە شای وەفاداران
کێ هاوڕازتە سوێح و ئێواران
لەو جێ تاریکە تۆ بەپەنهانی
لەگەڵ کێ ئەکەیت ڕازی نیهانی



لەباتی قۆڵی قەیسی غەمگینت
کام بەردی ئەلحەد وا لەسەرینت
داخم ئەو داخە لەیلی خاتر نەنگ
بۆ زوڵفی ڕەشی شێواوی ژێر سەنگ
بە دەمی شانە کەدات ئەهێنا
ئەتکرد بەپەرژین بەڕووی جەبینا
ئەو چاوە ڕەشەی ئاهو بێزی تۆ
ئەو قەوسی ئەبرۆی شەو ئەنگێزی تۆ
ئێستە بەدەستی چەرخی نیلی ڕەنگ
بێ ڕەونەق بووە وەک نەقشی ڕووی سەنگ
ئیتر بۆ سۆمای دیدەم تار نەبێ
زیندەگی لەلام زەهری مار نەبێ
ئەو لاشە جوانەی نازکتر لە گوڵ
ببێ بەخۆراک مار و مێرووی گڵ
منیش سەرسام و هەڵۆ خواردوو بم
بەلاشە مردووی بەگیان زیندوو بم
تۆ بەو زامەوە مەزار جێگەت بێ
من بەم نازەوە کۆسار ڕێگەم بێ
خولاسە هەر چەند شین و زاریم کرد
خۆم تلانەوە و بێ قەراریم کرد
خۆڵی قەبرەکەم ئەکرد بەسەرما
بەنینۆک جلم ئەدڕی لە بەرما
نەجوابێکم بیست نەڕاز نە دەنگێ
نە خشەی پووشێ نە لەرەی سەنگێ
بەدەس ئەم ماڵی بەڕووی جەبینما
خۆڵم تێکەڵ کرد لەگەڵ ئەسرینما
هیچ کەڵکی نەبوو شین و گریە و ڕۆ
لێی پاڕامەوە دیسان سەرلەنۆ
وتم ئەی نازدار، لەیلەکەی دڵسۆز
حەکیمی دەرمان دەردی مەجنوون دۆز

لەبەر چی مەیلم لە لات سارد بووە؟!
پەیمانی پێشووت لەیاد دەرچووە؟!
من بەم دڵەی خاو بێ قەرارەوە
بە برینەکەی ئێستە و پارەوە
وا لە ژوور سەرت ئەگریم ئەناڵم
خاکی قەبرەکەت بەلێو ئەماڵم
تۆ هیچ دەربەست نیت بەبێ قەراریم
بە قورپێوان و شیوەن و زاریم
زۆر پاڕامەوە بەدڵەی مەحزوون
هەتا بڵێسەم گەیشتە گەردوون
دیم وا دەنگێ هات لەژێر خاکەوە
لەو قەبری تاریک حەسرەتناکەوە
وا هاتە بەرگویم وەک ڕازی جاران
وتی ئەی مەجنوون وێڵی کۆساران
سوێند بەو یەزدانە بێ هاوتا و تەنیا
کە باڵای منی لە تۆ کردووە جیا
ئەوەندە خاکم لە جەستە بارە
نەڕێگەی وەڵام نەڕێی گوفتارە
وام لەژێر خاک و هەوای ساردی سەنگ
ئیتر من چی بکەم کە نەتگاتێ دەنگ
لەناو خانووی خۆڵ ئەسیر کراوم
بەتای زوڵفی خۆم زنجیر کراوم
نازانم بۆچی وام لێ کراوە
مل و قاچ و دەس زنجیر کراوە
نازانم بۆچی ئێستە بەم ڕەنگە
لەش جنراوی ژێر تەرافەی سەنگە
گوناهم چی بوو لە دنیای فانی
غەیری دڵداری بەبێ پەنهانی
بۆچی ئەم دنیا وابێ وەفایە
لەجیاتی وەفا بەشی جەفایە



بەڵێ تۆ هەرچەند کە ئەکەی زاری
شاران ئەگەڕێی بەبێ قەراری
بەس کەڵکی چییە؟ سوودێ نادا پێت
بچۆ بگری بۆ بەختی ڕەشی خۆت
لەو دنیا هیچ کەس بەئاوات ناگا
لێرەشا هیچ کەس بەفریات ناگا
هەرکەس لە دایک ببێ یا بووبێت
بۆ شاری ئێمە ئاخری هەردێت
هەر چەند تۆ ئێستا زۆر بێ قەراری
لە گیانی خۆت و دنیا بێزاری
کاتی تۆش هەردێ ڕۆژێ لە ڕۆژان
لە شاری ئێمە ئەبی بەمیوان
ئیتر ئەی ئەحمەد بۆ کۆچی شاژن
ئەبێ شیوەن کەی تا ڕۆژی مردن

***

## پیرەمێرد و شیعرێکی طالعی

## (حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە)

پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٤٧دا ئەم شیعرەی بڵاو کردۆتەوە و نازناوی (طالع) یا (طالعی) لە کۆتایی شیعرەکەدا هاتووە کە دیارە شیعری حەمە ئاغای دەربەند فەقەرەیە. بەڵام پیرەمێرد لەم وەرگێڕانەدا زۆر لە دەقی شیعرەکە دوور کەوتۆتەوە!.

«قیبلەم ئیتیفاق،...
قیبلەم ئەر مەبۆت چەنیم ئیتیفاق
ئەر دەواکەری دەردانی فیراق
مەبوون وەسەرگەرد خاڵانی طاق طاق
بینایی دیدەم، گوزیدەی ئافاق
دڵ بەتۆن مایل هەم بەتۆن عوشاق
تایێ جە تاتای گێسووی پڕ نیفاق
یا بۆبێ نە عەکس خاڵان ئەرزاق
عەلاکەر وە حاڵ جەستەی ئینحیراق

باعیشەن پەی کەیف دڵ مدان مەذاق
تاکەی هەر دەنگت بەرز بۆ جە ئافاق
هەر طاق طاقمەن چوون طەیری طاق طاق
(طالیع) تا زیندەی دەوری ئافاقەن
چون طەیری طاق طاق ویردش هەر طاقەن

وەرگێڕانەکەی:

ئازیز موشتاقە،......
دڵ بۆ تەوافی کەعبەت موشتاقە
سەبرم نەماوە، تاقەتم تاقە
وەک تاق تاقکەرە وێردم تاق تاقە
لەشم سووتاوی ئاگری فیراقە
گیرۆدەی عەزاب دەوری ئافاقە
قوربان زانیومە بەئیتیفاقە
هەر چەند تەکلیفی (ما لایطاق)ە
لە دەستی زوڵفت هەر تایێ تاقە
هەودای بەقیەی زام دڵەی عوشاقە
بەتاقی برۆت کەتای سەرتاقە
سوجدەگای ڕاستی زومرەی عوشاقە
تا طالع[1] زیندووی جەور و موشاقە
موشتاقی زوڵفی بێگەردی تاقە

.................................................................

(١) طالع یاخود طالعی: نازناوی شیعری (حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە) بووە.

***

## دیسان، پیرەمێرد و شیعرێکی شەفیع

پیرەمێرد ساڵی ١٩٤٧ ئەم شیعرەی وەرگێڕاوە، بەڵام ناوی شاعیر و سەرچاوەکەی نەنووسیوە، ئێمە لە کەشکۆڵی (مەحموود پاشای جاف)دا دەقی شیعرەکەمان دۆزیەوە، کە شیعری (میرزا شەفیع)ە و پێشتریش هەر لەم دیوانەدا چەند شیعرێکی وەرگێڕاوی شەفیعمان لەلایەن پیرەمێردەوە نووسی.

«سووەیل جەختشەن،......
ڕوێ نەو سووەیل جەهد و جەختشەن



خڕید کالای زەڕڕین ڕەختشەن
ڕەزا ئینتزار وادەی وەختشەن
گڕەی یەراقش لوا وەشاران
پەی پۆشاکی بەرگ عەرعەر چناران
صوف جە شام ئاوەرد، بەکرەس جە (باکۆ)
تورمە جە کشمیر، تەخت هۆلاکۆ
موقەددەم جە میسر، لۆی جە لەنگاهوور
دێبا جە دەککەن، ئەکسون جە لاهوور
ئەطلەس جە فەڕەنگ، سووتی جە طەبەس
جەمەڵتان قەڵەم خەت زەدەی سەد ڕەس
خارا جە جواڕەرخ مەخمەڵ جە قزلەر
ئەو ڕەنگ باف جە ئەسڵ بەحرەین بەندەر
جە کاخت ماهوون، ئەڵماس نیلی
جە سماقی کەتوون، ئالای خەلیلی
جە کاشان زەڕباف، زەمین طەلایی
جە ئەسراب ئاوەرد نەقش دووتایی[1]

.................................................................

(١) شیعرەکە دوورو درێژە و تەنها ئەوەندەمان لێ نووسیوە.

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

سیوەیل وەختیەتی،...
سیوەیلی پایز، جەهد و جەختیەتی
فریدی پارچە زرین ڕەختیەتی
گەڵاڕێزانە وەریزان بەختیەتی
جاڕ درا قوماش بێنن لە شاران
بپۆشن بەرگی عەرعەر چناران
ئاوریشم لە شام نیللی لە باکۆ
تورمە لە کشمیر تەختی هۆلاکۆ
زربەفت لە میسر لونگ لە لنگاهوور
دیبا لە (دەکا) ئاسووت لە لاهوور

ئەتلەس لە فەرەنگ گەرمەسوت لەتەس
لە ملتان قەڵەم خەت زەدەی نەورەس
خارا لە خوارزم مەخمەل لە قزلەر
ئەورەنگ باف لە ئەسڵ بەحرەین بەندەر
لە کاخت ماهوت پو، ئەڵماسی فەیلی
لەشماخ کەتان ئاڵای خەلیلی
لە کاشان زەربەفت زەمین تەلایی
لە اسراباد جاو بەری دووشایی
لە شیروان پارچەی کوبەکچی ئابی
لە بەسرە جانفیس توحفەی عەننابی
لە تەورێز قوماش قوتنی وەزیری
لە موسڵ شاڵی ڕیسی جزیری
خەتایی لە موڵک خاقانی فەغفوور
لە بابل قەسەب شاهانە دەستوور
متبەق لە موور ئەحرامیش لەبەن
لە جیهان ئاباد پشت لیفی گوڵکەن
کیخوا لە مەعرەز بازاڕی سەردەشت
زنجیرەی زەریف لە کارخانەی ڕەشت
ئەسفەهان دیبای نیمچە مەداخڵ
لە کرمان شاڵی ئاڵای هەزار گوڵ

***

## بیدی مەجنوونی[١]

ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٢٩٤ی دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاواردا بڵاو کراوەتەوە و نووسراوە (بەناوی بێسارانییەوە وتوویە) واتا شیعری پیرەمێردە و بەناوی بێسارانییەوە بڵاوی کردۆتەوە. بەڵام ئێمە دەقی هەورامی شیعرەکەی (بێسارانی)مان[٢] دۆزییەوە و پیرەمێرد لەگەڵ هەندێ دەستکاریدا شیعرەکەی وەرگێڕاوە.

بیدی مەجنوونی، بیدی مەجنوونی
باڵا بەرز و نەرم، زار و زەبوونی
بە لارولەنجە، لەیلا نموونی
بەڵام لە داخی دڵ سەرنگوونی



ئاوارە و لەرزان بەگوێ تافەوە
پەخشان بەشنۆی هەوای سافەوە
عەنبەربار بەبۆی مسکی نافەوە
ڕەخشان بەپەلکی زەرکلافەوە
بە دەنگی تاڤگەی ساز و سەمتووری
ئەینۆشی بادەی ئاوی بلووری
سایە بانی بان تەختی گەنجووری
بەڵام تامت تاڵ بەدەردی دووری
وتم: شۆڕەبی، دەستنیشانی دۆست
سێبەر دەوای (تا)[٣] سەلفات و زینک[٤] پۆست
درەختان سەربەرز بەبێ قۆرت بێ سۆست
بۆچ سەرت شۆڕە وێنەی کەفتەکۆست[٥]
جوابی دایەوە بەزبانی حاڵ
بۆچ تۆ نازانی پیری کۆنەساڵ
من سەربەرزێک بووم شیرین پەڕ و باڵ
سوجدەم بردە بەر باڵای سۆسەن خاڵ[٦]

..........

(١) بیدی مەجنوونی: شۆڕەبی
(٢) ژین ژمارە ٨٤٧ ساڵی ١٩٤٦ .
(٣) وا بەناوبانگە کە سێبەری درەختی (بی) بۆ (تا دار) باشە و کە بچێتە ژێری (تا)کەی لە کۆڵ ئەکەوێ.
(٤) سەلفات و زینک: حەبێکی زەرد کە دەدرێت بە تا لێهاتوو.
(٥) کەفتە کۆست: کۆست کەوتوو.
(٦) شیعرەکە تەواو نەبووە و پیرەمێرد ئەوەندەی لێ وەرگێڕاوە.

شیعرەکەی بێسارانی:[١]

تەرز بید تار،...
تەرز بید چوون زوڵف، مەلەرز و بەتار
بە هەوای پرشنگ تاف بێ قەرار
نەپای بالوول کۆ سەخت وەرنسار
وەڵگ بید زایف، تەرز تووڵ زەبوون
زەبوونتەر جە تەرز تای گوڵاو توون

مەلەرز و بەباد سەرد سەبایی
نە ڕووی گوڵ سۆز ساق مینایی
پەرسام ئەرهەی بید دەسنیشان دەست
تەرک تەڕ ئەندام سای سەهەند پەیوەست
چێشەن درەختان ڕووشان نە باڵان
تۆ سەر سەراویز ڕووی زەمین ماڵان
بید ئاما جواب بەزوان لاڵ
چوون پەرسات حاڵم بوا چوون هەواڵ
منیچ نەو نەمام نازک نەو ئاو بیم
سەر تەرز لەرزان تاف سەراو بیم
ناگا پەی تەقدیر دیدە سیاوێ
خاو ئالوودێ سوب خێزا جە خاوێ
ئامانە سایەم مەخسەڵ دا خاڵان
کۆ کۆ، کۆی خەرمەن خەمان دا تاڵان
جەو ساوە جۆیای ئەو نازارەنان
پۆچی سەراوێز بێ قەرارەنان

(١) دیوانی بێسارانی، عوسمان هەورامی، دەسنووس.

***

## خودایە، بەهار

پیرەمێرد ئەم شیعرەی بەناوی (بێسارانی)یەوە وتووە، لەوەش دەچێ کە شیعری بێسارانی بێت، مامۆستا م.ه نووسیویە کە پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە بەهاری دوای شەشی ئەیلوولدا وتووە. لە کاتێکدا شیعرەکە ساڵی **١٩٣٩** بڵاو کراوەتەوە. تەنها بەڵگەش ئەوەیە کە سروشتی شیعرەکەی بێسارانی بۆ کۆست کەوتن و ماتەمە و نیوە دێڕی دواییشی کە دەڵێت «بەهار خەزانی حوزنی ئەیلوولە» لە واتای پیرەمێرد دەچێت.

خودایە بەهار، خودایە بەهار
بگەڕێتەوە بۆ زستان بەهار
وەک هەوری بەهار بۆ خۆی بگری زار
ڕۆژی ڕووناکی بێتە شەوی تار



وەنەوشەی شین پۆش مل کەچ نگوون سار
سۆسەن کون کون بێ، بەنینۆکی خار
دەنگی کەو ببڕێ لە دەوری کۆسار
سروەی با نەبێ لەسەر پەلکی دار
ئەستێرەی سیوەیل وێنەی تازێدار
ڕەشپۆش بێ شەوقی نەبینێ دیار
حەوتەوانە لێک ببڕێن، تارومار
لەیلا بەئاهی مەجنوونی هەژار
لە ئاسماندا بۆی نەبێ قەرار
زراوی زوهرە[1] بتۆقێ بەقار
دجلە کەف چێن و لێڵ دێوانەوار
پێ لە زنجیردا بناڵێنێ زار
قیبلەکەم ڕۆیی دڵم مەلوولە
بەهار خەزانی حوزنی ئەیلوولە

(١) زوهرە: مەبەست لە ئەستێرەی زوهرەیە.

***

## پیرەمێرد و شیعرەکەی مەحموود پاشای جاف

لە لاپەڕە **٣٣٨**ی دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاواردا، شیعرێک بڵاو کراوەتەوە بەناونیشانی (یادی مەحموود پاشای جاف) وە مامۆستا هاوار وەهای زانیوە کە شیعری پیرەمێردە و بۆ یادی مەحموود پاشای وتووە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو شیعرە شیعری مەحموود پاشا خۆیەتی و لە لاواندنەوە و شینی شەش برایدا وتوویە، کە مەحموود پاشا مەرگی هەر شەشیانی بینیوە، ئەو شەش برایەشی بریتین لە: وەسمان پاشا، حەسەن بەگ، حەمە عەلی بەگ، سلێمان بەگ، فەتاح بەگ، قادر بەگ، وە ئەم قادر بەگە ئەوە نییە کە مەولەوی شیعرێکی شین و لاواندنەوەی زۆر بەرزی لە کارەساتی کۆچ کردنیدا وتووە، بەڵکو ئەمیان برای مەحموود پاشا بووە و قادر بەگی، لای مەولەوی مامی مەحموود پاشا بووە. بەم پێیە دەبێت، مەحموود پاشا شیعری تریشی هەبێت، ئنجا یاخود ئێمە دەستمان نەکەوتوون، یاخود لە کاتی خۆیدا ون بوون!.

ئەوا لێرەدا دەقی شیعرەکەی مەحموود پاشا و وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد دەنووسین.

هەروەها دەقی هەورامی ئەم شیعرەمان لە کەشکۆڵەکەی (مەحموود پاشای جاف) خۆیەوە وەرگرت، کە مامۆستای دڵسۆز و بەڕێز (عەلی بەگی حسین بەگی جاف) خستیە بەردەستمان

هەتا سوودی لێ وەرگرین.

## وادەی خێڵە و خوار

وادەی خێڵە و خوار ئێلاخ بێزانەن
وادەی گەرمەسێر سەحرای شیروانەن
براکانم هیچ کەسیان نییەن دیار
وەک جاران سوار بن بۆ ڕاووشکار
هانا هاسێ بەور، سێ نامدارم ڕۆ
سێ پڵەنگ هیممەت شێر کردارم ڕۆ
سێ شاهێن، سێ باز، شیروان ماوام ڕۆ
سێ پڵەنگ نەهیب، وەقت داوام ڕۆ
سێ (سەعد وەقاص) سەر ئاوردەم ڕۆ
سێ ڕۆ نەزوڵفان داخان بەردەم ڕۆ
ئیللا (سولەیمان) ئەو بێ ئەندێشە
ئەو جەهد و غیرەت عەداوەت کێشە
ئەو شمقارِ شۆخ نەریمان شیمە
ئەو مەرد مەیدان بێ خەوف و بیمە
ئەو شۆڕە سوارە گورجی نەزینە
ئەو حاتەم هیممەت سەرحەد نشینە
هارەی یەدەکان نیهاش وە تاوبی
سەرزەمین بەعەشق هات هات ڕاوبی
ئیستە نادیار ڕووی سەر بیساتەن
تاڵعش نە گێچ نەرد ناهاتەن
نە نە فەتاح بەگ ئەو ڕوستەم ڕەنگە
ئەو پیلەتەن تەن بورز و نەهەنگە
ئەو هەڵۆ هیممەت قەهار قینە
ئەو دەست و بازووی شۆخ ڕەنگینە
سەرتاپا تەیار وێنەی فلامەرز
جە سەهمش ماتەن زەوارەی گۆدەرز
ئیستە نادیار دەشت شیروانەن



داخ ئەو سەرمەشق کول دەورانەن
نە نە حەسەن بەگ ئەو نەوجەوانە
ئەو شێوەی شیرین، ئەو میهرەبانە
ئەو میر مەزن ئەو تووڵ لاوە
ئەو باهوو بەدەن، ئەو چەرخ و چاوە
ئەو فەغفور نەژاد مەنشووری جەعام
دنیای پڕ مەینەت وەنەش نەدا کام
نە نە قادر بەگ ئەو تەیار شەختە
ئەو کەس بێکەس یانەش دەربەستە
خانمان خەریک نەهاتیی دەردەن
ئێش فەتاح بەگ عەلاوەی دەردەن
جە زوبان لاڵ بم کەچەن کارتان
مەندەن وە بێ سەر دەستەی سوارتان
فەڵەک هانە فیکر سەودای مەکر و فەن
خاک وەبێ زنجیر شێر مکەرۆ بەن[1]
دەی لێ بۆ جە ڕەنگ سایە نیشانتان
هۆردارۆ ماردم ئاتەش ئەفشانتان
وەڵڵا ئەر فەڵەک برایێش مەرد
یا چون تو، ئاه سەرد مکەرد
ئەویش سیفتەی جەرگ وێش مشنەفتەوە
تا ئەبەد جە مەرگ دوور مکەفتەوە
برا، چون فەڵەک کەسش نەمەردەن
مەرگ جەوانان وەعادەت کەردەن

(١) بەن: بەند، زنجیر.

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

وادەی خێڵە و خوار، ئێڵی جافانەن
دەمی گەرمەسێر دەشتی شیروانەن
لە براکانم کەسیان نیەن دیار
وەک جاران سوار بن بۆ ڕاو و شکار

هانا، برایان شوێن نادیارم ڕۆ
سێ پڵنگ هەیبەت شێر شکارم ڕۆ
سێ شاهێن سێ باز شێروانی ماوا
فەلەک لە زۆریان کەوتبووە داوا
ئای سلێمان بەگ عەدالەت پیشە
لە دێوی کێوی قاف بێ ئەندێشە
ئەو شۆڕە سوارە زینەتی زینە
ئەو حاتەم هیممەت سەرحەد نشینە
چابووک سواری بەناو و داو بوو
لە شێروانەدا هات هاتی ڕاو بوو
ئێستا نادیار سەر ڕووی بیساتە
لە دوای ئەو عەشرەت ڕووی لە نەهاتە
هێجگار فەتاح بەگ ئەو ڕۆستەم ڕەنگە
ئەو پیلەتەنەی شێوە نەهەنگە
ئەو شاباز هیممەت ئەو هەڵۆ قینە
ئەو شان و باهوو ئەو سەهم گینە
سەرتاپا بڵند وێنەی فەرامورز
ئەهاتە لەرزە لە نەعرەی ئەلبورز
ئەوی تیا نییە دەشتی شێروانە
بۆیە لە لای من چۆڵ و وێرانە
ئاخ بۆ قادر بەگ دۆستی مەولەوی
گەردن کەچی بوون شێری سەر زەوی
هەر ئەو زانیویە شینی بۆ بکا
هەر بەیتێک جامێ فرمێسک لە تەکا
خانمان خەریک شین و هاوارە
داخی فەتاح بەگ لەسەر گشت بارە
ئاخ لاڵ بم لە کوێن شۆڕەسوارانیان
بێدەنگ و ئاهەنگ گەلی یارانیان
بەو خوایە فەلەک گەر برای ئەمرد
بە ناڵە دنیای هەراسان ئەکرد



دەستی نە ئەچوو بەمەرگی جوانمان
وێران نە ئەبوو جێی خان و مانمان
خۆی کەسی نییە و جەرگی بێ ئێشە
مەرگی مەردانی کردووە بەپیشە

***

## پیرەمێرد و شیعرێکی مەلای جەباری

گەلێ جار لەو کتێبانەی کە چاپکراون و لە کەشکۆڵ و دەستنووسدا شیعری (مەلا ولدخان) و (مەلای جەباری) تێکەڵ بوون، وە شیعری ئەم کراوە بەهی ئەو و بەپێچەوانەشەوە.

هۆی ئەم تێکەڵییە ئەوەیە کە هەردوو شاعیر لە کۆتایی شیعرەکانیاندا نازناوی (مەلا)یان بەکار هێناوە. هەروەها ئوسلوبی شیعر دانان و سروشتی شیعرەکانیان کە زۆر ڕۆمانتیکییە نزیکن لە یەکەوە و بگرە هەر لە یەک دەچن. لەبەر ئەوە هەر لەم دیوانەدا کە شیعری (بادی لەیلا خان)ی مەلا ولدخان نووسرا، تەماشامان کرد لە لاپەڕە ٣٩ ی دیوانی (مەلای جەباری) دا دەقی شیعرەکە چاپکراوە. هەروەها شیعری (شیرین بەستەوە)، هەر بەهەمان شێوە.

لێرەشدا شیعرێکی مەلای جەباری بەشێوەی خۆی و وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد دەنووسین. ئەو وەرگێڕانەمان لە کەشکۆڵی (حەمە صالح ئاغای قزلجی)دا دۆزیەوە لاپەڕەی ٩٥ کە نەجمەددین مەلا بەخەتی خۆی ساڵی ١٩٣٧ بۆی نووسیوەتەوە. لەو کەشکۆڵەدا مامۆستا نەجمەددین مەلا شیعرەکەی بەشیعری مەلا ولدخان داناوە. ئەویش لە پیرەمێردیەوە وەرگرتووە بەڵام لە ڕاستیدا شیعرەکە هی (مەلای جەباری)یە و پیرەمێرد بەنازناوی (مەلا) کەدا لێی تێک چووە. وە دەقی شیعرەکە بەشێوەی خۆی لە لاپەڕە ٣٥ ی (دیوانی مەلای جەباری)دا[1] تۆمارکراوە. لەبەر ئەوەی مەلای جەباری شیعرەکانی ناسک و هەڵقوڵاوی سۆز و ئەندێشەیەکی خاوێن و قووڵ بووە، لە نێوان زۆر شیعردا دەناسرێنەوە. هەروەها مامۆستا (علاء الدین سجادی) لە (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا[2] لاپەڕە (٣٠٧ - ٣١٨)دا شیعری (میرزام یا وەعدەی نەو وەهارانەن) و شیعری (شیرین تاتا کرد)ی نووسیوە و گەلێ وەسفی شاعیرییەتی مەلای جەباری کردووە.

ئنجا بۆ ساغ کردنەوەی ئەم شیعرە کە شیعری مەلای جەبارییە و بۆ دەرخستنی چۆنیەتی وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد هەردوو دەقەکە دەنووسینەوە.

---

(١) بڕوانە (دیوانی مەلای جەباری) ئامادەکردنی عەبدولجەبار محەممەد جەباری.
(٢) مێژووی ئەدەبی کوردی - علاء الدین سجادی ل ٣٠٧ - ٣١٨ .

***

## بەهار

ساقی سادەی شی وەهار ئاماوە
گوڵان سەرکێشان نەتۆی سەحراوە
هەوای دڵگوشاد ئەرد بەهەشتەن
فەڕ وەڕووی سەحرای گەرمەسێر وەشتەن
وادەی بادەی ناب سەیر وەهارەن
سەر زەمین مەزهەر لقای دڵدارەن
زەمزەمەی مەزاق دڵ ئەفگارانەن
سەدای تەپڵ تیپ دەردەدارانەن
وەقت نوشاونوش سەبوی قەرقەفەن
دەنگ زەلەی زیل دائرە و دەفەن
درەختەن، سەوزەن، شنۆی شەتاوەن
نەورۆزەن سوزەن هەوای پای کاوەن
مەیەن، مەعشوقەن، موحبەتەن مەیلەن
خەمان لەبڕیزەن، پیاڵان کەیلەن
شەرەن شورشەن غەوغان غریوەن
مەر جلوەی جەمال دلان فریوەن
نە گشت دیارێ تەجەلای توورەن
فیتنەی گیرودار قەتڵ مەنسوورەن[1]
-فنا في الله- هان مەست دلەفگا
بێ باک مەواچان (أني أنا الله)
ڕەندان سەرمەست جان فیدای جانان
(أنا الحق) چون زکر زاهید مەوانان
بوتا بگیرین خەسرەوی بەزمێ
چەنی هەستییە بکەرین ڕەزمێ
بەزمی چون مەجلس بەهمەن وەکام بۆ
گاه حەدیس جەم، گاه باسی جام بۆ
گاگوش نە سەدای چەقانە و چەنگ بۆ
چەم نە تەماشای ساقی گوڵڕەنگ بۆ
ئەی ساقی دەخیل من وەی زامەوە



التفاتی کەر بو وەلامەوە
عیلاجی پیم دەر سوودمەندم بو
باعث حەیات قەیدبەندم بو
ڕستگارم کە لەی بەند و دامە
قەدەم ڕەنجان کەر وەعدەم تەمامە
تەشریف باوەرە وەو سەبووتەوە
وەو پیاڵەی گوڵڕەنگ چون یاقووتەوە
وەو سینەی سیمین زەرف زڕەوە
وەو جام گوڵ فام بۆی عەنبەرەوە
هەر کەس بگیلو جامی پەی کامی
دەرمان پەی ئیش هەر دەرد و زامی
موتریب تۆیش وە چنگ دڵنەوازەوە
وەو سوز سەمتوور سەدای سازەوە
وەو موزیقەی مەشق سەد قانوونەوە
دەم وە سەدای ساز ئەرغەنوونەوە
مەرباچان (مەلا)یش نەهەستی هویش ڕەست
بی وەکاسەلێس مەستان ئەلەست
مەیلێ کە بەناز بەسبووتەوە
بەو دەمی گوڵڕەنگ وەک یاقووتەوە

(١)مەبەست لە شەهید کردنی (مەنسووری حەللاج)ە.

***

## بەهار

ساقی سادەی وا بەهار هاتەوە
گوڵ سەریان کێشا لە بساتەوە[1]
لیقای دڵگوشای ئوردی بەهەشتە
تەجەللای جەلای دڵ جەلای گەشتە
شەونم خشڵی کرد بەسەر سونبوڵدا
بولبول بانگی دا بەگوێچکەی گوڵدا

وادەی بادەی ناب ســــەیری بەهارە
چیمەن فەرشی سەوز بەر پێی دڵدارە
دەمی نوشـانوش شنەی قـەرقـەفـە
فـەسـڵی زرەی زیل دائرە و دەفـە
زەمـزەمـەی جـۆشی دڵ ئەفگارانە
دەنگی تەپڵی تیپ دەردەدارانە
شـۆرە، شـۆڕشـە، داوایە شـەڕە
جلوەی جـەمـاڵی دڵفـرێنەرە
گـوڵە بولبـولە بەهارە سـەیرە
لە گوڵشەن دەنگی (صباح الخیر)ە
مەیە، مەعشووقە، نیگایە، مەیلە
مەستی چاوی مەست پیاڵەی کەیلە
درەختـان سـەوز و شنۆی شەتاوان
نەورۆزە، سـۆزە، هەوای پای کـاوان
لەهەر وادیە تەجـەللای (طور)ە
فیتنە، گیرودار، داری (منصور)ە
(فنا في الله)یە، مەستی دڵ ئەکـا
بێ پەروا دەڵێن (انی أنا اللە)
ڕەندانی سەرمەست جانفدای جانان
وەک زکری دەروێش (انا الحق) واتان
هەی ساقی دەخیل من بەم زامەوە
دامـانگیـرتم بێ بەلامـەوە
جـامێکم بەرێ بۆم سوودمەند بێ
مـایەی ڕەهاییم لە قـەید و بەند بێ
مـەیلێ کـە، بۆ ناز بەسـبووتەوە
بەو دەمی گـوڵڕەنگ وەک یاقـووتەوە
بەو سـینەی سـیمین زەرفی زەردەوە
بەو بادەی گـوڵناب بۆن عـەنبەرەوە
مـوتریب تۆش بەو چەنگ دڵخـوازەوە



بەو سۆزی سەمتوور سەدای سازەوە
بەو موسیقەی مەشق سەد قانوونەوە
بەو نەوای پڕ عەشق ساز ئەرغوونەوە
بەزمی وەک عەیشی بەهمەن بەکام بێ
گاه حەدیسی عەشق، گاه بەحسی جام بێ
گاه مەجلیس مەخموور، دیدەی ساقی بێ
گاه مەست و مەدهۆش بادەی باقی بێ
هەر کەس وەرگرێ جامێ بۆ کامێ
دەرمـانی دەرد و مـەرهەمی زامێ
ڕێی فەنا و مەستی سەرێکی لێدەین
عار و نامووسی هەستی فڕێدەین
خەڵک با هەر بڵێن (مەلا) چوو لە دەست
بوو بەکاسەلێس مەستانی ئەلەست

(١) بەلای منەوە گەر بینووسیایە – گوڵ سەریان کێشا لە توێی خاکەوە – جوانتر بوو.

***

## میرزا یاقووب

نەجمەددین مەلا لە کەشکۆڵی (قزلجی)دا لاپەڕەی **٩٧** نووسیویە: (هاوزەمانن لەگەڵ حاجی قادری کۆیی). لە شیعرێکیا (واتە حاجی) ئەڵێ:

حیکمەت و نەزمی میرزا یەعقووب
وەک فەلاتوونە شیعرەکان وەک

ئەم شیعرەی (میرزا) بریتییە لە سیانزە بەیت، دوو نیوە بەیتمان لەبەر نەمانی بەشێکی لاپەڕەکە دەست نەکەوت. دیارە کە شیعرەکەش (پیرەمێرد) وەری گێڕاوە[١].

دڵ مەستی یار بوو،...
ئەمشەو دڵ مەی نۆش، سەرمەستی یار بوو
بە بادەی گوڵڕەنگ، لێوم سڕ شاد بوو
دەمی دەمـا دەم، بۆسـە و کەنار بوو
دڵ گەیبوە گەنج وەسڵی حەبیبی
گـاهێ لە باڵا، گـاهێ نشـیبی!

گا دەستەی زوڵفان سیای چوون عەنبەر
وەک خەرمانەی مانگ لە دەوری ئەختەر
ئەیکرد بەدەستە یار بەدەستی خۆی
ئەیپێچایە زام سارێش ئەبوو بۆی
دولبەر وەک ساقی خۆی مەی دەگێڕا
منی وەک (سەنعان) لە دین وەرگێڕا
ئەو ساقی و ئەو جام ئەو بادەی گوڵنار
ئەدرەوشایەوە، عەکسی...[2]
ناگا، نەردی بەد، خاڵ حاڵی هێنا
بەیانیی کزەی شەماڵی هێنا
گوێم لێ بوو دەنگی سۆفی دەریا دڵ
بانگی کرد هەڵسە بنووسە بەدڵ
هەڵسام بەدڵەی لەتوپەتەوە
زوبان بەکفو...[3]
نە، مەی، نە مەینۆش، نە مەی پەرست بوو
شیشەی دڵ بەدەست دلبەر لەت لەت بوو
ڕاپەڕیم لەخەو سەرسام و مەدهۆش
نە لەیل، نە ساقی، نە سۆفی نە جۆش
منیش لە زێد[4] و وەتەن ئاوارە
وەک ئاسکەی تەنیا کەوتمە هەزارە

..............................................

(١) دەقی هەورامی ئەم شیعرەمان دەست نەکەوت

(٢، ٣) ئەم شوێنانە لە دەستنووسەکەی نەجمەددین مەلادا نەمابوون.

(٤) زێد: نیشتمان، شوێنی لە دایک بوون.

***

## شیعرێکی خانای قوبادی

لە کەشکۆڵی (نەجمەددین مەلا)دا کە بۆ (حەمە صالّح ئاغای قزلجی)، نووسیوە لە لاپەڕە ٩٦دا شیعرێکی (خانای قوبادی) نووسراوە، دیارە ئەویش لەگەڵ شیعرەکانی هاوشانی خۆیدا پیرەمێرد وەری گێڕاون و نەجمەددین مەلا لە ڕۆژنامەکانی (ژیان)ی وەرگرتوون، یاخود لە هەندێ دەستنووسی پیرەمێردەوە. هەروەها ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٤٠ی کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی



کوردی مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغیدا تۆمار کراوە. وە لە پەروێزدا نووسراوە: ئەم پارچە (نووسراوی پەرێشان) وەرگیراوە و دەسکاری شێوە هەورامییەکەی ئاشکرایە».

زلّێخای سانی،...
زلێخانی میسری دەوری جوانی
ڕیشووی پێی سەربەست دەوری پێشانی
ڕیزی بەست وێنەی سوپای ئێرانی
برۆ شێوەی قەوس ئوستادی مانی
پەڕیوەتە سەر دیدەی قەترانی
برژانگ وەک تیری چەرکەس کەمانی
پەڕەی جەگ سمی، لاهووت مەکانی
عەین عەینی وەک عەین، شابازی لانی
بە نێچیر ئەگرێ شەهلای شیروانی
ئەنف ئەلف نەقش ئوستادی مانی
عارەقی ڕەونەق عەتری ڕێحانی
دەم قەترەی نمای مای زیندەگانی
گیان ئەدا بەسەد سەدساڵەی فانی
لێو لەعلی یەمەن بەدەخشی کانی
وەک یاقیق لە دەور دانەی ڕومانی
گەردن وەک بلوور بادەی کەیانی
بە جووتە سێوەی باغی جینانی
همێلای ساحیر بابلستانی
خانات خستە دووی شێخی سەنعانی

***

## کەهانەت

لەبەشی شیعری (ئاینی) پیرەمێرددا ئەم شیعری (کەهانەت)ەمان لەیاد چووبوو. لێرەدا دەینووسینەوە. ئینجا پەیوەندی بابەت و ناوەڕۆکی ئەم شیعرە و شیعرەکەی (عێل بەگی جاف) و بیروڕاکانی مامۆستا محەممەد ڕەسول هاوار کە لە لاپەڕە ٢٥٦ی دیوانی پیرەمێردی نەمردا نووسیویە، وە باری سەرنج و تێبینی خۆمان، دەربارەی، لە پێشەکی ئەم دیوانەدا لە بەشی پیرەمێرد و شیعردا دەنووسین. ئەمەش دەقی شیعرەکەی پیرەمێرد کە تارمایی شیعری (هەروا

بووە و هەروا دەبێ)ی (عێل بەگی جاف)ی پێوە دیارە.

هەرچی پێغەمبەر خەبەری داوە
لە باسی کاری دنیا و عوقباوە
فەرمووی نیشانەی تێکچوونی جیهان
بێ باوەڕییە و زەعیفی ئیمان
زۆر کەم ئەمێنێ نوێژ و جەماعەت
لە ئەمانەتیش ئەکەن خیانەت
عزەت ئەچێتە لای پیاوی زاڵم
قەدر و ئیمانی نامێنێ عالم
برەو ئەستێنێ شەراب و قومار
ماڵ گران ئەبێ لە شار و بازاڕ
کوشتن و دزی و تالانی و درۆ
فەقیر و هەژار دەخاتە ڕۆ ڕۆ
دەوڵەمەند زەکات نادەن بەئیحسان
ڕاستی نامێنێ زۆر ئەبێ بوختان
گۆرانی سووک و قسەی ناڕەوا
پەسندتر ئەبێ لە زیکری خوا
پیاو بەئەمری ژن ئەچێت بەڕێوە
لە مەجلیسدا نان ئەخۆن بەپێوە
پیاو دائەنیشێ و ژنان ئەگەڕێن
شەرم نامێنێ ژن و پیاو هاوڕێن
دایک و باب قەدریان لای کوڕ نامێنێ
کەس لە مەکتەبدا قورئان ناخوێنێ
پیت و بەرەکەت ئەڕوا لە ئەرزی
کوڕ و کچ پێک دێن لە ڕووی بێ عەرزی
ئەمە نیشانەی ئاخر زەمانە
وادەی دەجال و فیتنەی شەیتانە
لە تەم و دووکەڵ دنیا پڕ ئەبێ
لە سێ جێگادا زەوی ڕۆ ئەچێ



کەس گوێ لە ئەمری چاکە ناگرێ
لە نەهی عالەم، نەهی ئەکرێ
ڕەحم و بەزەیی لای کەس نامێنێ
هەر کەسە بەشی خۆی ئەفڕێنێ
***

## دیسان - مەولەوی و چەند شیعرێک

نامەیەک و شیعرێک:

پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٤٩دا[1] بەسەرهاتێکی مەولەوی و نامەیەکی تۆمار دەکات، نامە و شیعرەکە بەفارسییە و پیرەمێرد وەری گێڕاوە و نووسیویە «داخەکەم ئەم کاغەزەیش فارسییە، هێشتا ئەوسایە مەولەوی نەکەوتۆتە کوردی نووسین، ناچار!، ئەبێ وەک ئاسارەکانی تری ئەمەیش بکەین بەکوردی»[2].

لێرەدا پیرەمێرد زانیارییەکی نوێ و خاڵێکی گرنگمان بۆ تۆمار دەکات کە مەولەوی لە سەرەتای تەمەنی ئەدەبی خۆیدا بەفارسی نووسیویە. «نامە فارسییەکانی لە یادی مەردانی مامۆستا (عەبدولکەریمی مدەرس)دا زۆربەی بلاوکراوەتەوە»[3]. پیرەمێرد نامە شیعریەکەمان بەم جۆرە بۆ وەردەگێڕێتە سەر شێوەی سلێمانی:

### مەولەوی

کاغەزێکی زۆر خۆش و سەیری مەولەوییە، کە لەوبەری (زەهاو)ەوە ئەگوێزرێتەوە دەوری هەڵەبجە، ئەوسایە شێخ عەلی ئەبابەیلێ قائمقامی هەڵەبجە ئەبێ، دەورووپشتی ساڵی ١٢٧٤-١٢٧٥ دوای ئەوە کە محەممەد بەگی کەیخوسرەو بەگ یەعنی (حەمە پاشای باوکی مەحموود پاشا)و ئەوانی تر ئەکەن بەقائمقام، خۆی سەرئێڵی بەجێ نایەڵێ وەسمانی خانە ئەکا بەکاربەدەست. وابزانم ئەم وەسمانی خانەیە یا برا یا باوکی دایکە پیرۆزەیە، شاوەیس برای بووە، کە مادەی عەزیزی شاوەیس و کوژرانی حەمە پاشا، تەئریخییە، ئەو عوسمانی خانەیە گەلێ بەدکردار و ناهەمواری بۆ خوێشانی مەولەوی ئەبێ. ئنجا مەولەوی و مەحموود پاشا ئەناسێ و مەحموود پاشایش دیارە چەند مەولەوی خۆش ویستووە، کاغەزێکی بۆ مەحموود پاشا نووسیوە دوو فەسڵە، یەکێکیان بەشیعرە کە ماجەرای ڕەزالەت و قرپ و جرپی عوسمانی خاڵە و شاوەیسی برای پەت و گوریس و جل و هۆڕ و هەمانە کۆکردنەوە و موڵکی خەڵکی داگیرکردنی ئەحمەدی کامەران و ڕەسوول و خلەماڵی تیا نووسیوە. فەسڵی دووەمیان (نثر و نظم)ە و نکتە و جناس و حکمت و فەلسەفەیە. داخەکەم ئەو کاغەزەیش فارسییە، هێشتا ئەوسایە مەولەوی نەکەوتۆتە کوردی نووسین، ناچار، ئەبێ وەک ئاسارەکانی تری ئەمیش بکەین بەکوردی:

موهاجیر بووین کە هاتین، خواستی خوا بوو
(عەلی)[٤]مان دی، خەلافەت بەو درابوو
لە تەئسیری (محەممەد)[٥]، میری گەورە
خەلافەت گەیییە، سەر (عوسمان)[٦] بەدەورە
دڵی ساداتی ئێمەی، هێندە ڕەنجاند
بەهەشتی سەر زەمینمان بوو بەزیندان
بە جاریێ پێکورەی خۆی خستە سەرکار
هەراجی خستە ناو، وەک قاڕی بازاڕ
هەموویشی کەوتە دەس شاوەیسی خانە
گوریس و پەت، جل و هۆڕ و هەمانە
موانە و چەورە سانە و بزنە دووخە
لەگەڵ سوورانە، خەرجی مەردە لەوخە
هەمووی تەسلیمی ئەحمەد کامەران بوو
خلەماڵی ڕەسوولیش ئاشەوان بوو
لەهەر شوێنێ بەراوێکیان ئەبینی
ئەیانگوت موڵکی باوکمانە یەقینی
بە ئیرس هی ئێمەیە ئەم شوێن هەوارە
مەڕی تیا سەربڕیوە خوێنی دیارە
کە باوکم، گای زیانی لێرەدا کوشت
لەسەر ئەم جۆگە، دایکم، ورگەکەی شوشت
نیشانمان وابێ، دایکم، ورگی تەر کرد
گەماڵە بازکیش ڕیخۆڵەکەی برد
غەریب و بێکەس و داماو لە ناوا
هەموو ڕەنج و هیوامان چوو بەئاوا
لە خوا پاڕاینەوە، کاتی دوعا بوو
دوعامان لای خودا، گیرا بوو چا بوو
ئیتر بەگزادە، نانوێنن لە لای ئەو
ستەمگەر ڕۆژی تاریک بوو وەکو شەو
ئەمە سەرپوتی ئەوزاعی غەریبیی
وەتەن ئاوارەی دەردی بێ نسیبی



ئەمە (مەعدوومی)یە عینوانی ئەسڵی
بە بەدبەختی هەمیشە دوور لە وەسڵی

..........

(١) بروانە ژین ژمارە ٩٥٥ شوباتی ١٩٤٩ .
(٢) هەمان سەرچاوە.
(٣) بروانە یادی مەردان مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس.
(٦) مەبەست لە (شێخ عەلی ئەبابەیلێ)یە.
(٥) محەممەد: مەبەست لە حەمە پاشای جافە. محەممەد بەگی کەیخوسرەو بەگ.
(٤) عوسمان: وەسمانی خانە.

***

## هاوین، ها وێنەم

مەولەوی لەم شیعرەیدا پەیوەندییەکی جوانی گەرمی و گڕەی هاوین و گڕە و سووتانی دڵ و دەروونی خۆی پێک دەهێنێ، ئەم شیعرە کار دەکاتە سەر پیرەمێرد و ئەیگۆڕێتە سەر شێوەی سلێمانی:

مەولەوی:

ها من، ها من وار، گەرمیش جۆش ئاوەرد[١]
فەزای نەزم، بەزم، نەو گوڵاڵان بەرد
بووڵ وە یانەی جەم، نەو گوڵاڵان شەند
چەمەن بێ نەوای ناڵەی بولبول مەند
تای بەڕەزای شەنگ نەسای مەغاران
شێویا چون زولف تەعزیەداران
ها ، کاوان، کاوان دڵ چون دڵڕێشان
هەردان وە سەردا هەردان پەیوێشان
دووریت ئایر وست وەیانەکەی من
یانێ یانەی دڵ وێرانەکەی من
هەوا ئایرین، سەر وەخت ئایرین
دڵە ئایرین، بەدبەخت ئایرین
وەی گشت ئایرەوە خەیاڵم خامەن
بەختم ناپوختەن فامم نەفامەن
وەی بڵێسەوە گەردێم باقییەن
وادەی ئایرین بادەی ساقییەن

بەشق پیاڵەی مەست چاوەکەت
بەو پەشێویی چین پای کلاوەکەت
با بەی مەی بەڵکم ئایر مەستی
سۆ چنۆ یەکسەر خاشاک هەستی

(١) دیوانی مەولەوی – مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس. ل ٥٢٢ .

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

هاوین، ها وێنەم، گەرمای تاوی سەند
نەشئەی جوانی لە دەست بەهار سەند
ژیلەمۆی خستە، سەر، سەرخونچەی گوڵ
چەمەن بێ نەوا، لە نەوای بولبول
بای بەڕەزای شەنگ لە سای مغاران
شێواوە وەک زولف تازیەداران
ئاسۆ کەساسە و سەری سوڕماوە
بەشینی سەوزەی قوڕی پێواوە
دووریش ئاگری بەردایە ماڵم
ماڵی دڵەکەی وێرانە ماڵم
هەوا ئاگرین، سەروەخت ئاگرین
دڵ و بەختی سەخت، تێکڕا ئەگرین
بەو گشت گڕەوە، وجوودم خامە
بەختم نابەختە فامم نەفامە
لە کورەی گڕدا گەردم باقییە
وادەی ئاگرین بادەی ساقییە
بە عەشقی پیاڵەی مەستی چاوەکەت
بەو پەشێوی چین بەر کلاوەکەت
با، بێ، مەی بەڵکم ئاگری مەستیی
ئاگر بەرداتە خاشاکی هەستیی

***





## ئارایشێکی بەڕووی جەبین دا[1]

ئارایشێکی بەڕووی جەبین دا
شەرمی بەمانگی دوو هەفتەمین دا
ئەگریجەی کۆرپەی، پەڕی تاوس تار
کەلافەی سەوزی وەک بەندی زننار
کە بای باوەشێن شنۆی بۆ دەبرد
لە خۆشیانا هەڵپەڕکێی ئەکرد
بەلەنجە ئەکەوت بەڕووی قەمەردا
گاه، ڕوو لە میحراب، گاه لە حەجەردا
ڕوومەت، گاه پەنهان، گاهێ ئەدرەوشی
گاه گیان ئەسێنێ، گاهێ ئەیبەخشی
لەژێر میحرابدا دڵەی پڕ لە دەرد
بەو زەننارەوە، تەوافی ئەکرد
هەر ئەو عەشقە بوو لە مەجازەوە
خستمیە پەنای بێ نیازەوە
چەن خۆشە ئینسان وا بێ نیاز بێ
لە قەید و بەندی چەرخ سەرفراز بێ
ئەو دڵەی کەوا نووری خوای تیا بێ
بە گەرد و باوی دەوران لێڵ نابێ

(١) پیرەمێرد نووسیویە (نازانم ئەم شیعرە هی کێیە) بڕوانە ژین ژمارە ٨٥٠ ساڵی ١٩٤٦، بەڵام ئێمە دۆزیمانەوە، شیعری (عەبدوڵڵا بەگی سمایل بەگی زەنگەنە)یە.

دەقی شیعرەکەی (عەبدوڵڵا بەگی سمایل بەگ) بەشێوەی زەنگەنە.
«شیرین ئارایش صفحەی جەبین دا
خەجڵەت وەڕوی ماه دوو هەفتەمین دا
کورپە ئەگریجان تووک طاوس تار
سەوزە کلافان چون ڕستەی زەننار
چون ڕەقاص وە سۆز صەدای سەنج ساز
وەبای باوەشین ماماوە پەرواز

مەشنیا وەبان قورسی قەمەردا
گا وە رووی محراب گا وە حەجەردا
گا پەنهان نە برج گا مەدرەخشاوە
گا حەیات مە سەند گا مە بەخشاوە
هەر لابی سەدجار دڵەی پڕ جە دەرد
بەو زەننارەوە تەوافش مەکەرد

## ئارەق وەک شەونم

پیرەمێرد لە ژمارە ۷۷٥ی ساڵی ۱۹٤٥ی ڕۆژنامەکەیدا، پێشەکییەکی کورتی بۆ ئەم شیعرە نووسیوە و بەشیعری (شێخ مستەفا) تێگەییوە، وە نەینووسیوە ئەو شێخ مستەفایە کێیە و نازناوی چییە؟! چونکە ئەو سەرچاوەیەی لێی وەرگرتووە تەنها ئەوەندەی وتووە کە شیعری شێخ مستەفایە. ئێمە کاتێ بەدیوانی مەولەوی (مەلا عەبدولکەریمی مدەرِس)دا گەڕاین لە لاپەڕە ۱۱ دا دەقی هەورامی ئەو شیعرەمان دۆزییەوە کە لە ناوەڕاستی شیعرێکی (مەولەوی) دایە و سەرەتای شیعرەکە دەڵێت.

«ئەم جار سەخت تەرەن زامم جە جاران»
چڵ مەدۆ دایم چون گەستەی ماران»
...هتد ل۹

هەروەها ئەم شیعرە بەشێوەکەی خۆی لە بەرگی ۲٦ی گۆڤاری دەنگی گێتی تازەدا لاپەڕەی ٤٤۷ دا مامۆستا (گیوی موکریانی) بلاوی کردۆتەوە، وە پێشەکییەکی کورتی بۆ نووسیوە، بەڵام لەبەر ئەوەی مامۆستا گیو هەورامی نەزانیوە شیعرەکە زۆر هەڵەی تێکەوتووە بەم پێیە ئێمە سێ دەقمان لەبەردەستدایە، دوو دەقی هەورامییەکە و دەقێکی وەرگێڕراوی پیرەمێرد. لێرەدا دەقی شیعرەکە وەک لە دیوانی مەولەوی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمدا نووسراوە، دەنووسینەوە و وەرگێڕانەکەی پیرەمێردیش دوا بەدوای دەنووسین.

عەرەق چون شەونم، نیشتەن نە رووی گوڵ
تەڕ کەردەن تاتای توغراکەی سونبوڵ
جە قازان خەم دڵ کەردەن وە ئاو
وە درۆ ماچۆ مەگێرو و گوڵاو
ئازیزم گوڵاو بۆی خۆی کوڵم تۆن
ئەر بۆی تۆ نەبۆ، بۆی گوڵاو جە کۆن؟!
زەڕەی بۆی زوڵفت کەفتەن نە بەرزان
بۆی گوڵان کەردەن جە بەرزان هەرزان



ئازیز وە مەرگت گەر ئینسافت بۆ
هەنی کافیەن بۆی زوڵفت پەی تۆ
ئیتر چ حاجەت وێت مەدەی عازاو
قەبووڵ کەری جەور مەگێڕی گوڵاو؟!

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد و پێشەکییەکەی، کە بەهۆی دەستنووسەکەی ناو کەشکۆڵی مەحموود پاشا وە، بەهەڵە بەشیعری شێخ مستەفا زانراوە!!.

«شاعیرێکمان بووە، شێخ مستەفا، کە مەحموود پاشا لە ئەستەموڵ دیوانەکەی ئەوی لە (موحسینی کوڕەزای شێخ قادر) دەست کەوتووە؟! لە کەناری کەشکۆڵەکەی، نووسیویەتییەوە! ئەمە، غەزەلێکیەتی»:

ئارەق وەک شەونم، نیشتۆتە رووی گوڵ
نمی کێشاوە، تای تورەی سونبوڵ
ئازیز، گوڵاو خۆی، بۆی کوڵمی تۆیە
ئەگینە بۆنی خۆشی لە کوێیە
تایەکی زوڵفت کەوتووەتە بەرزان
بۆنی گوڵاوی پێ بووە هەرزان
ئازیز بەمەرگت خۆت بۆنت خۆشە
بۆنخۆشی گوڵان لە لای تۆ بۆشە
چە ئیحتیاجت بەبۆی گوڵاوە
بۆنی تۆ لە رووی جیهاندا باوە

## دیسان پیرەمێرد و دوو بەیتی بێسارانی لە شیعرێکی (مەولەوی)دا

مەولەوی لەو شیعرەدا کە باسی پیریی و دڵگیری خۆی دەکات[١] لە کۆتایی شیعرەکەی خۆیدا دەیکات بەیەک، وە پێش سێ بەیتەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بێسارانی (ماوا – مەئوا) ئەمەی وتووە:

پیرەمێرد وەری گێڕاوەتە سەر شێوەی سلێمانی:
نەوات وێرانەی دڵ کەرۆ ئاوا
چەنی بەستەی فەرد، بێساران (ماوا)
«ئەمما گشت جە وەخت نادانیم بییەن
فەسڵ مەستیی و عەیش جوانیم بییەن

ئیسه، ها جه گشت پەشیمانیم بەرد
فەسڵ پیریمەن جوانیم ویەرد
وادەی پیریمەن یاوانم نۆبه
تۆبه مەن تۆبه، کەرەمدار تۆبە»[٢]
هەر چیم کرد کردەی نەو جوانیم بوو
دەمی سەرمەستی و ڕووی نادانیم بوو
ئێستا وا پیربووم کەوتوومە تۆبه
تۆبه، تۆبەمە، لێ بووردوو تۆبه

(١) دیوانی مەولەوی – مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ل ١٠٨ .
(٢) دیوانی بێسارانی – عوسمان هەورامی – دەستنووس.

***

## پیرەمێرد و شیعرێک لە بارەی (حەج)ەوە

ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٢٣٠ی کەشکۆڵی (قزلجی) نەجمەددین مەلادا نووسرابوو. لە دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاواردا بڵاو نەکراوەتەوە. شیعرەکە مانایەکی بەرزی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی هەیە، کە هەر چەند پیرەمێرد خۆی حاجی بووە و لە تەمەنی لاوێتیشدا حەجی کردووە، بەڵام لە پاش بەساڵا چوون و تاقی کردنەوەی ژیان و باری کۆمەڵایەتی نەتەوەکەی بەم جۆرە لەو مەسەلەیە گەیشتووە، کە دەنووسێت:

ئەلفی مرادت، فڕێ دا، مردی
شوێن مراد کەوتی، بۆ (درەم) مردی[١]
ڕۆژوو و نومازت کە بۆ نیاز بێ
وەک عاشقێکی کە پیشەی گاز بێ
نوێژی زۆر پیشەی پیرێژنانە
ڕۆژوویش ئەسڵەکەی بۆ ڕەمەزانە
کابە بناغەی برایی خەلیلە
دڵ نەزەرگاهی ڕەبی جەلیلە
سیاحەتی حەج سەیری جیهانە
ئەوی بەکار بێ بەخشینی نانە
دڵ دەشکێنی و دەچی بۆ کابە
مەچۆ، مەزاڵم، لەسەر خۆت لابە



من زیارەتی کابەم کرد بەڵام
زیارەتی دڵ پێشترە لەلام
لە دەشتی (مینا) قوربانی دەکەی
بۆ گورگ و چەقەڵ دیاری دەبەی
لێرە سەری بڕە و بیدە بە برسی
دەبێت بەقەڵای (آیة الکرسي)
دەزانی کەوا دنیا فانییە
وای دەگری تا سەر زیندەگانییە
ئەگەر تۆ تا سەر هەر بژیایتایە
ئەشیا بۆ دوای تۆ جێگا نەمایە
وەک پێش تۆ جێگای خۆی دابوو بەتۆ
تۆش جێی خۆت بدە بەیەکێ و بڕۆ
ئەگەر پێ داگری بڵێی من ناڕۆم
تۆش وەک یارۆکان ئەهاونە بن گۆم
کە لەسەر پشتی ماسی دانرێ
ترە کەڵەکێ دیارە سەرناگرێ

(١) درەم: درهەم – پارە.

***

## لە دەرگای ڕەحمەت

پیرەمێرد ئەم شیعرە ئاینییەی خۆی لە ژمارە ٨٣٩ی ساڵی ١٩٤٦ی ڕۆژنامەکەیدا بڵاو کردۆتەوە. بەڵام بەداخەوە شیعرەکە لە ڕووی کێشەوە ناتەواوە، یاخود، تێکچووە، کێشەکان لە نێوان ١٠، ١١، ١٢دا یاری دەکەن، نازانم پیرەمێرد چۆن هەستی بەمە نەکردووە؟! لەوەش ناچێ لە چاپی ڕۆژنامەکەدا تێکچووبێت، چونکە زیاتر لە جار و دووجار ئەو ناتەواویانە دووبارە بۆتەوە. ئێمە شیعرەکە دەنووسین و بەرانبەر هەر دێڕە شیعرێک کێشەکەی بەبڕگەی خۆمان دیاری دەکەین.

لە دەرگای ڕەحمەت ڕێگایە دەرخە: ١٠ بڕگە
لە ڕێی داماویا ئەم پیرە سەرخە: ١٠ بڕگە
لە تۆوە هەرچی دەستی کەوت نیگاهی: ١٢ بڕگە
سەفای هەردوو جیهان ناکرێ بەکاهی: ١٢بڕگە

له هەوری ڕەحمەت باران بەجارێ: ١٠ بڕگە
بەسەر ڕۆحی عەزیزانا بباریێ: ١١ بڕگە
تنۆکی دوای ئەوان بۆ من دەوایە: ١١ بڕگە
ئەگینا کەوتەم و کارم لە دوایە: ١١ بڕگە
ئەزانم چاکەیەکم نەبووە بۆ خۆم: ١١ بڕگە
بەڵام وا ئوممەتی پێغەمبەری تۆم: ١١ بڕگە
لە کردەوەی خۆم خەجاڵەت هات بەسەرما: ١٢ بڕگە
نە ڕێی عوزر و نە ڕووی پاڕانەوەم ما: ١١ بڕگە
ئەمەندە شەرمەزارم من لەم و لەم: ١١ بڕگە
کە کەس نەمبینێ بمنێرە جەهەننەم: ١١ بڕگە
بەڵام تۆ خۆت کە ببەخشی بەبێ پرس: ١٢بڕگە
بەوە ڕزگار ئەبم لەلام نامێنێ ترس: ١٢ بڕگە
لە لایەکیشەوە کردوومە بڕوا: ١١ بڕگە
کە مەئیوس نییە بۆ ڕەحمەتی خوا: ١٠بڕگە
ئەمەم بۆ مایەوە ئومێدەوارم: ١١ بڕگە
کە خۆت فەرمووتە من ئومورنەگارم: ١١ بڕگە

***

## قیبلەم نەکێشێ

پیرەمێرد ئەم شیعرەی لەساڵی ١٩٤٤[١]دا وەرگێڕاوە وە ناوی بێسارانی لەسەر شیعرەکە داناوە. ئێمە دەقی شیعرەکەمان لە کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردییەوە[٢] دەستکەوت. هەندێ جیاوازی لەنێوان دەقەکە و وەرگێڕانەکەدا هەیە. مامۆستا محەممەد علی قەرەداغی لە کەشکۆڵەکەیدا بەشیعری (مەلا میکایل) یاخود (پیر میکایل)ی داناوە. هەروەها دەستنیشانی ئەوەی کردووە کە لە تەنیشت ئەم شیعرەوە لە کەشکۆڵەکەی (مەلا عەزیزی ڕێشاوی)دا بەخەتێکی تازە نووسراوە بێسارانی لە دیوانی (بێسارانی) مامۆستا عوسمان هەورامیدا لە ڕیزی شیعرەکانی (بێسارانی)دا نووسراوە[٣].

قیبلەم نەکێشۆ،...
سەرێ کە سەودای خاڵت نەکێشۆ



خاطرێ بەغەم تۆ نەیەندێشۆ
بە زام ناواک صوب سەحەر ئێشۆ
سەرێ وەلای تۆ سەر نەدو شەوان
پایێ کە نەدیۆ وەلات وە دەوان
ئەو پاسەر سەرنگوون کلکۆی تازە بو
ئەو پاگەستەی مار بێ ئیجازە بو
دەستێو نە کەرۆ سەیران باخت
نەکەرۆ خذمەت بەرزیی دەماخت
ئەو دەستە بەستەی جەللاد گەور بۆ
هەر ڕۆ جە نۆوە سزاش بەی تەور بۆ
دێدێو نەوینۆ هەر سەحەر ڕەنگت
زبانیۆ نەبۆ شەو بەهامدەنگت
ئەو دیدە ئەسرش بێ مدارا بۆ
ئەو زوبان بەسەنگ سیای سارا بۆ
قیبلەم دووری تۆ یەکجار منش کوشت
بیللا بەیتەور بو بێزارم جە گشت

..........

(١) بڕوانە ژین ژمارە ٧٤٠ ساڵی ١٩٤٤.
(٢) کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، محەممەد عەلی قەرەداغی، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٢٢٥، ٢٣٤، ٢٣٥.
(٣) دیوانی بێسارانی – عوسمان هەورامی. دەسنووس.

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

قیبلەم نەکێشێ،...
سەرێ کە سەودای خاڵت نەکێشی
دڵێ بۆ مەیلت پێ ڕانەکێشێ
هەردووکیان بەدەرد کتوپڕ بێشێ
سەرێ کە سەرت لێ نەدا بەشەو
پێیە لە ڕێتا نەکەوێتە ڕەو
سەر سەرەنگرێی قوڵلەی خراپ بێ
پێ بەندی ژاری کوڵەوەیباب بێ

دەستێ دەست نەگرێ بەسنگەوە بۆت
لووتێ کە دایم پڕ نەبێ لە (بۆ)[1] ت
ئەو دەستە بەستەی ئێشی شکاو بێ
ئەو لووتە بەتیغ قەزابڕاو بێ

---
(١) بۆ: بۆن. بۆت: بۆنت.

***

## لە نێوان ئەحمەد بەگی کۆماسی و مەولەوی-دا

ئەحمەد بەگی کۆماسی ئەم شیعرە بۆ مەولەوی دەنووسێت:

ئەگەر بۆ سۆبێ بە مەلالەوە
بگاتە لای تۆ بە شەماڵەوە
ئەوە بۆکرۆزی سووتووی جەرگمە
(مەعدووم)[1] مەعلوومە وادەی مەرگمە

---
(١) مەعدووم: نازناوی شیعری مەولەوییە.

مەولەوی وەڵامی ئەداتەوە:

ئارەزووی مەرگی خۆتت کردووە[*]
گوایە ڕسکاریت وا دەربردووە
وەک من سەرسەختی وەک من ئەخوێنی
بۆسۆیشت لێ بێ هێشتا ئەمێنی

---
* پیرەمێرد ئەم شیعرانەی وەرگێڕاوە.

***

دوو پارچە شیعری (فخرالعلمای کوردستانی) و (مەجذووب) کە پیرەمێرد وەری گێڕاوە.

پارچە شیعری یەکەم، تەنها بەیتی یەکەمی نەبێت کە دەقی وەرگێڕانی بەیتێکی شیعرەکەی (فخرالعلما)یە، ئیتر بەیتەکانی دوایی زۆر لە دەقەکە دوورە.

«تا، برۆ و زوڵفی تۆ تەماشامە
میقاتی نوێژی سوبح و عیشامە
بەسە ئارایش دیدەکەی مەستت
دڵ هەریەکێ بوو وا کەوتە دەستت





بەهەر گەردشێ ئاشووبی دەکەی
ئیتر هیچی تر نەما کە بیبەی
دڵ شەو لە زوڵفی شەوەزەنگتدا
سوێندی خوارد دڵی بەهیچ کەس نەدا
بەیانی ڕۆژی ڕوخسار دای دیار
کلام اللیل یمحوه النهار»

***

## شیعرەکانی مەجذووب

ئەگەر ئەپرسی جەستەی من چۆنە
دەردم گرانە حاڵم زەبوونە
تا جەلای جەبهەی یار بەرکەماڵە
حەیاتی مەجنوون ڕوو لە زەواڵە
تا دڵ گرفتار مەیلی حەبیبە
من مەرگم میوان دەردم نسیبە

***

## میرزام قەڵای خاو

یەکێک لەو بەندە مێژووییانەی لایەنێکی ژیانی نەتەوەی کورد و بەسەرهاتێکی گرنگی بەنەمری هێشتۆتەوە، بەندی (میرزام قەڵای خاو)ە. ئەم بەندە کە بەشیعر هۆنراوەتەوە، باسی، شوێنەواری یەکێک لە قەڵاکانی (خان ئەحمەد خان) دەکات. وەک چۆن (جەمالەددینی زەنووری) لە بەیتەکەی خۆیدا کە هەر لەم دیوانە نووسیمان، باسی لایەنێکی ژیان و ئازایی خان ئەحمەد خان دەکات. پیرەمێرد گرنگییەکی زۆری بەم جۆرە بەند و بەیت و مێژینانە داوە و بۆ ئەوەی ون نەبن و ژمارەیەکی زیاتری ڕۆشنبیران ئاگاداری بن و سوودی لێ وەرگرن، وەری گێڕاوەتە سەر شێوەی سلێمانی.

سەبارەت بەخاوەنی بەیتی یاخود بەندی (میرزام قەڵای خاو) چەند بیروڕایەک هەیە، ئەویش لەوەوە سەری هەڵداوە کە نازناوی (فەقێ) کە شاعیرەکەیە لە کۆتایی شیعرەکەدا هاتووە، هەندێک بە (فەقێ قادری هەمەوەند)ی دەزانن و هەندێکیش بە (فەقێ ڕەشید) کە بە(فەقێ خەڵووزەیی)یش دەناسرێت.

لەمەڕ ئەم (فەقێ)یە، سێ بیروڕا هەیە کە دەیخەینە پێش چاوی خوێنەران، و ئێمەش بیروڕای خۆمان دیاری دەکەین.

مامۆستا (عەلی باپیر ئاغا) لە کتێبی (شاعیرە ناو ون بووەکانی کورد)دا نووسیویە:

## فەقێ خەڵووزەیی

«میرزا ڕەشید خەڵکی دێی خەڵووزەی ناوچەی مەریوانە، بەفەقێ خەڵووزەیی ناوی دەرکردووە. خوێندنی لە لای (مەلا ئەحمەد)ی باوکی (مەلا کاکە حەمەی ناری) تەواو کردووە. لە سەرەتای سەدەی چواردەهەمی کۆچیدا لە دنیا دەرچووە. ئەم هەڵبەستەی خوارەوەی باسی وێرانەی (خاو) ئەکا، کە یەکێک بوو لە قەڵا گرنگەکانی (خان ئەحمەد خان) کوڕی (هەڵۆ خان)، حوکمداری شارەزوور، ئەم قەڵایە لە سنووری پێنجویندا هەڵکەوتووە. ساڵی ۱۹۳۷ی زایینی فەرەج بەگی برای مەحموود خانی کانی سانان گەلێ بەردی نووسراوی لێ دەرهێناوە.

ئەمەش هەڵبەستەکەیە!».

هەروەها لە گۆڤاری بەیانی ژمارە ۷۰ی ساڵی ۱۹۸۱دا کاک (جەمال محەممەد) بیست و نۆ بەیتی لە دەقی ئەم بەندە بڵاوکردۆتەوە وە پێشەکییەکی کورتی بۆ نووسیوە کە بەشێکی دووبارەکردنەوەی نووسینەکەی (عەلی باپیر ئاغا)یە، بەبێ ئەوەی دەستنیشانی ناوی بەرێت یاخود دەستنیشانی سەرچاوەکەی بکات!!.

لە ساڵی ۱۹۸۰دا تەواوی شیعرەکانی (فەقێ قادری هەمەوەند) لە دیوانێکدا، لەلایەن مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس) و (فاتح عەبدولکەریم)دا چاپ و بڵاو کرایەوە. لەلاپەڕە ۷۳۹ی دیوانەکەدا ئەم بەندە بڵاو کراوەتەوە کە بریتییە لە ۳۵ بەیت وا دیارە تەواوی بەندەکەیە. لە پەراوێزی شیعرەکەدا نووسراوە «دۆستی بەڕێزمان کاک محەممەد عەلی قەرەداغی ئەم پارچە شیعرەی لەبەر دەستنووسێکی خوالێخۆشبوو نەجمەددین مەلا بۆ نووسینەوە کە لەلای کاک محەممەد مستەفا هۆشەنگ حەمە بۆر دیبووی. پاشان لە دەستنووسێکی کەشدا بەکەمێک جیاوازیەوە دیمان درابووە پاڵ (فەقێ خەڵووزی) یا (فەقێ قەڵەوزی) ناوێک. تێکڕا لامان وایە ڕاستە شیعرەکە هی فەقێ قادرە، بەڵام لە ئەم دەست و ئەو دەست کردنا هەندێ گۆڕان بەسەر چەند وشەیەکیدا هاتووە».

بەبڕوای ئێمە ئەم بەندە، شیعری (فەقێ قادری هەمەوەند)ە. بەهۆی نازناوی (فەقێ)کەوە لەگەڵ ناوی (فەقێ خەڵووزەیی) تێکەڵ بووە. شیعرەکان و توانای شاعیریەتی فەقێ قادر گەواهی دەدەن کە ئەم بەندە هی ئەو بێت، بەڵام سەبارەت بە(فەقێ خەڵووزەیی) من هیچ شیعر و بەرهەمێکیم نەدیوە، هەتا شتێکی لەبارەوە بڵێین.

## بەندی قەڵای خاو

میرزام قەڵای خاو، میرزام قەڵای خاو
ئارۆشیم وە سەیر بورج قەڵای خاو



دڵ زەدەی هیجران دەروون پڕ زووخاو
کەردم خەیاڵان دنیای ناتەواو
پەرسام جە سەنگێ بورج زەمانە
بێ زەوق و زینەت مەندەی وێرانە
تۆ وە عیشق حەق گەردوون پەڕ ذات
کێ ڕێژا ڕەنگت؟ کێ نیا بنیات؟!
کوانێ بەگلەران صاحێب سوپا و سان
کێ ئوستاد هاورد تۆش بنچینە نان
کام وەستای نادر نە سەروەختت بی؟!
چەند خان و بەگلەر لەسەر تەختت بی؟!
کوا ڕەفیق ڕاست دیدە قەطرانان؟
کوا سان مەجلیس پیر و جوانان؟
کوا خان و شاهان کەول سمووری؟
کوا قاوە و قلیان چینی و فەغفووری
کوا دار کوا دیوان فەرموودەی خانان؟
کوانێ بزورگان، کوا حوکمڕانان؟
کوانێ دەروێشان بەئەڵڵا ئەڵڵا؟
کوانێ سەیدان، کوا شێخ کوا مەڵلا؟
کوا تفەنگداران لە بورج قوللە؟
لە دەنگ باروت، لە شریخەی گوللە؟
کوا خواجە و غوڵام کەمەر زیوینان؟
کوا ترچەداران ماه جەبینان؟
کوا هۆ هۆی مەیدان چابوک سواران؟
کۆ ئەو شادی و زەوق جەبەر قەراران؟
کوا شانشینت ویەردەی زەمانە؟
کوا صاحێب تەخت قەڵای وێرانە؟
قەڵادا جواب قوللەی جاڕووساز
جاگەی تۆبخانە وا مەندەی بێ ناز
وات: پەی چێش پەرسی ئەبلەی دێوانە

ئەحواڵ پەرسی شەرح ویەردەی زەمانە؟
واتش: ئەی هەتیو لێوەی هەرزەی کاڵ
بێ عەقڵ و بێ فام دەروون پڕ زووخاڵ
یەقین تۆ لە خەوف خودا ناترسی
هەواڵ دەوران دنیا مە پرسی
دەوران دنیا پەی کەس نەمەندەن
بنچینەی شاهان نەبێخ هۆرکەندەن
عەرضم هەن خزمەت هەر چیت هەن نیاز
گۆش بدەر وە حەرف قەڵاچەی بێ ناز
ڕاستە من قەدیم جاگەی جانان بیم
شەریک و هەمڕاز شای کەیانان بیم
هەم سەراپەردەی حەرەمسەرا بیم
هەم شانشینگەی خان و دارا بیم
مەکان و مەئوای میر و سوڵتان بیم
قاپی حکومەت ڕۆم و ئێران بیم
هەم سەیرانگەی خاص پۆڵ ڕەندان بیم
دایم جەولانگای زوڵف کەمەندان بیم
دەستکار وەستای قەدیم ساڵان بیم
تەخت بەگلەران کەمەر لاڵان بیم
شاهان موخلیصان من سازان جەنۆ
نەقشاش کاری بی چەند ماهو چەند ڕۆ
بەو شایی و لۆغان پڕ شەوق و زینەت
تا من تەمام کەرد حاکم بەحیکمەت
لە دەنگ تۆپان تەقەی دوور ئەنداز
کەژو و کۆ و سەنگ ماما بەئاواز
لە بورج قوللە تۆپ مەدان ئاتەش
زەمین مەلەرزا تا ئەندام عەرش
لوطف خوداوەند وە نەم بوو ظاهیر
من هەم بەقەڵغان تۆپ و (جزایر)



نە قوللە ماگە و نە صاحێب تەخت
جە کۆن سەلم و توور؟ کوا صاحێب ڕەخت؟
هەرکەس بوینۆ من بەوێرانی
قەد دڵ شاد نەکا وەی دنیای فانی
یە فەقێ واتەن دەروون پڕ جەفا
پەی کەس نەمەندەن دنیای بێ وەفا
یە (فەقێ) واتەن، قەبرش پڕ نوور بۆ
ڕۆحش جە عەذاب قیامەت دوور بۆ
یە (فەقێ) واتەن دەروون پڕ جەخار
(رب نجني من عذاب النار)

پیرەمێرد بەشێکی وەرگێڕاوە:

میرزام قەڵای خاو، میرزام قەڵای خاو
ئەمڕۆ چوومە سەیر بورجی قەڵای خاو
من زەدەی هیجران دڵی پڕ زووخاو
کەوتمە خەیاڵ دنیای ناتەواو
رووم کردە بارەی بورجی کۆنە ساڵ
پرسیارم لێ کرد بەزوبانی حاڵ
وەرە پێم بڵێ تۆ بیت و خودات
کێ ڕەنگی ڕشتی؟ کێ ناویە بینات؟
کام وەستای نادر بەسەروەختت بوو؟
چەند خان و چەند بەگ لەسەر تەختت بوو؟
کوا، خان و شاهان کەوڵی سەمووری؟
کوا قاوە و قلیان چینی فەغفووری؟
کوا تفەنگداران لە بورجی قوللە؟
لە دەنگی باروت، لە شریخەی گوللە؟

***

## پیرەمێرد و شیعرەکانی (شێخ ئەبو وەفا)ی کوردی

کتێبی (یادی مەردان) بەشی دووەمی بەتایبەتی سەرچاوەیەکی گەلێ بەنرخ و پڕ بەها بوو بۆ ناسین و شارەزابوون لە شێخە نەقشبەندییەکانی هەورامان و ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیب و

شاعیرەکانی ئەو ناوچەیە، بەڕاستی مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس) و کوڕەکانی شایانی هەموو ڕێز و ستایش و پاداشتێکن، بۆ ئەو هەموو خزمەتەیان کە بەرامبەر بەنەتەوە و ئەدەبیاتی نەتەوەکەیان کردوویانە. ئێمە بۆ ناسین و دیاری کردنی شیعرەکانی (شێخ ئەبو وەفا) پشتمان بەو سەرچاوە بەنرخە بەستووە. مامۆستا دەفەرموێ:

«ئەم زاتە واتە (شێخ عەبدولڕەحمان ئەبو وەفای کوڕی شێخ عوسمان سیراجوددین)، لەناو چوار کوڕە ئیرشادکارەکەی شێخ عوسمان سیراجوددیندا کوڕی دووهەمیانە، لە وەرزی بەهار لە پێنجی موحەڕڕەمی ١٢٥٣ی هیجرەتدا لە دایک بووە و دایکی وا مەشهوورە، برازای مەولانا بووە»[١]. «حاجی شێخ عەبدولڕەحمان ئەدیبێکی ناسک و شاعیرێکی پایە بڵندی چەرخی خۆی بووە، دیوانێکی شیعری بەفارسی هەیە، بیستوومە لای کوڕەکانی شێخ صادقی برازایەتی کە جاران لە دێی (گوڵپ) دائەنیشتن»[٢] «سەد حەیف و داخ کە شیعری کوردییمان دەسگیر نەبووە، جا نازانم بەکوردی شیعری نەوتووە، یا وتوویەتی و دەستی ئێمە نەکەوتووە»[٣].

پیرەمێرد گەلێ شیعری (شێخ ئەبو وەفا)ی لە فارسییەوە کردووە بەکوردی، ڕەنگە ئەوەی کە پیرەمێردی بۆ ئەم کارە ڕاکێشابێت لایەنی پیرۆزی و پایەی ئاینی ئەم زاتە و تەڕ و پاراوی و ناسکی شیعرەکانی بووبێت. لەبەر ئەوە هەرچی ئەو شیعرانە هەیە کە پیرەمێرد بەناوی (شێخ ئەبو وەفا)وە بڵاوی کردۆتەوە شیعری فارسی (شێخ ئەبو وەفا)یە و پیرەمێرد کردوویە بەکوردی، بەڵام لەهەندێ جێگای ئەو شیعرانەدا بەیت و نیوە بەیت یاخود پارچە شیعری خۆی تێکەڵ کردووە!!.

مامۆستا محەممەد ڕەسول هاوار لە زۆر جێگای دیوانی پیرەمێردی نەمردا نووسیویە ئەم شیعرە شیعرەی پیرەمێرد خۆیەتی بەڵام بەناوی ئەبو وەفاوە بڵاوی کردۆتەوە. بەڵام بەداخەوە مامۆستا کەوتۆتە هەڵەوە و ئەو شیعرانە شیعری شێخ ئەبو وەفان. لە لایەکی کەشەوە دەبێت ئەوە بڵێین کە ئەو کاتەی مامۆستا هاوار ئەو دیوانەی پیرەمێردی لە چاپ دا، هیچ شوێنەوارێک لە کتێبخانەی کوریدا، لە شیعری شێخ ئەبو وەفا نەبوو. هەتا ئەم دوایییە واتە ساڵی ١٩٨٣ کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لە بەشی دووەمی (یادی مەردان)دا باسی ژیان و بەسەرهاتی ئەم شاعیرە و بەشێکی دیوانە فارسییەکەی بڵاو کردەوە. بەڵام بەداخەوە هەموو دیوانەکەی نییە و مامۆستای گەورەمان مەلا عەبدولکەریم هەر ئەوەندەی دەستکەوتبوو. لەبەر ئەم هۆیە دەقی چەند شیعرێکی وەرگێڕاوی ئەم شاعیرەمان واتە فارسییەکەی نەدۆزیەوە. تەنها وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد دەنووسین و ئەو پارچانەش کە فارسیەکەیمان بەدەستەوەیە ئەوا هەردوو دەقی فارسی و کوردیەکە دەنووسین.

(١) یادی مەردان: بەرگی دووهەم، ل٩٩.

(١) یادی مەردان، بەرگی دووهەم، ل١٠٥.

(٢) هەمان سەرچاوە ل ١٠٦.





## هێند، لە دووری تۆ

ئەم شیعرەی (شێخ ئەبو وەفا) بریتییە لە حەوت بەیت، پیرەمێرد شەش بەیتی کردووە بەکوردی. وە پێنج بەیتی خۆی بۆ زیادکردووە! لە دیوانی مامۆستا هاواردا دەستکاری شیعرەکە کراوە و دوا بەیتی پیرەمێردیش نەنووسراوە[١]. لێرەدا شیعرەکە وەک لە ڕۆژنامەکەدا[٢] پیرەمێرد خۆی نووسیوە، بڵاودەکەینەوە.

شێخ ئەبو وەفا:

از فراق تو چنان دیدەی خون بار گریست
کە دل سنگ بەحال دل من زار گریست
اشک سرخ شفق از دا من گردون بچیکید
برسیە روزی من بسکە شب تار گریست
شب هجران توام مرگ ببالین آمد
تا سحر بهر من خستەی بیمار گریست
بر سر مزرع بختم چو گذر کرد سحاب
خشک لب دید، دلش خون شد و بسیار گریست
عقد دندان، تو در خاطر زارم بگذشت
دیدەی من همەشب گوهر شهوار گریست
تیر مژگان ترا دید چو دل باز نمود
زخم خمیازە و برخندەی سوفار گریست
خطەء مصر محبت بەوفا معمور است
زانکە نیلی أست بەهر گوشە کەیکبار گریست[٣]

(١) دیوانی پیرەمێردی نەمر محەممەد ڕەسول هاوار ل٣٢٧

(٢) ژین ژمارە ٩٨٣ ساڵی ١٩٤٩.

(٣) یادی مەردان بەرگی دووهەم ل١٢١

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:[١]

شیعری (شێخ ئەبو وەفای کوردی).

هێند لە دووری تۆ، بەکوڵ، دیدەیی خوێنبار گریا[٢]
بەردی ڕەق هاتە زمان و بەنەوای زار گریا
ئاسمانیش، لە شەفەق گریەیی خوێنینی هەڵڕشت
هێند بەسەر ڕۆژی ڕەشمدا کە شەوی تار گریا

شەوی دووریت کە ئەجەلم هاتە سەر و نەیکوشتم
تا بەیانی لەگەڵم بوو، بۆ دڵی بیمار گریا
هەور بەسەر باغی گوڵی بەختی منا تێ ئەپەڕی
بەزەیی هاتەوە، وا وشکە، بەناچار گریا
ڕیزەدانی تۆ، شەوێک هاتە خەیاڵی من، بۆیە
چاو بەفرمێسکی وەکو گەوهەری شەهوار[3] گریا
خطەیی میسری موحبەت، کە بەوەفا ئاوایە
چاوی من چاوەیی (نیل)ە[4]، وەکو جۆبار گریا
دڵی بێچارە لەدەست جەور و جەفای مەهـ ڕووان[5]
قەبری دەروێشە وەکو گۆڵی زرێبار گریا
کە نەما نووری نەقشبەندی لە هەورامانا
پیری هاوار بوو، کەوا پیرێ لە هاوار[6] گریا
قەرەداغێکە تەمی دیدەی شینی قەرەداغ
کەوتە تیماری[7] برینداری لە تیمار گریا
ئەم هەموو دەردی گرانە کە لە دەست یار کێشام
ناڵەیێکم نەبوو بۆ مەینەتی من یار گریا
بە نەفامی کە ئەیان وت ئەمە کۆنە بڕمێ[8]
ئەو نەڕووخاوە، بەحاڵیان دڵی زامار گریا

..............................

(١) ژین ژمارە ٩٨٣ ساڵی ١٩٤٩ .
(٢) لای م.هـ نووسراوە بەناوی (شێخ ئەبو وەفا)وە وتوویەتی.
(٣) گەوهەری شەهوار: گەوهەری شاهانە
(٤) نیل: ڕووباری (نیل)ی میسر کە سەرچاوەکانی لە حەبەشەوە دێت.
(٥) لێرە دواوە شیعری پیرەمێردە.
(٦) هاوار: دێیەکی زۆر خۆشە لە هەوراماندا و دانیشتوانی (کاکەیی)ن لە هەڵەبجەوە بۆی دەڕۆیت.
(٧) تیمار: لە کوردستاندا چەند دێیەک هەیە ناویان (تیمار)ە. لێرەدا مەبەست لە دێی (تیمار)ی قەرەداغە.
(٨) بڕمێ: بەزمی خۆنیشاندانەکانی ساڵانی چل و پەنجاکان کە ئەیانوت بڕووخێ!. جارێکیان لەبەر نەزانی و دواکەوتوویی لەساڵی ١٩٤٨دا لە دەرگای ماڵ و چاپخانەکەی پیرەمێردیان نووسیبوو (بڕووخێ پیرەمێرد)! پیرەمێردیش لە ڕۆژنامەکەیدا بەنووسینی (برنادشۆ) وەڵامی ئەو هەرزەکارانەی دابووەوە، بڕوانە ڕۆژنامەی ژین.

***



## بە یادی کۆن

ئەم شیعرەی (شێخ ئەبو وەفا) لە لاپەڕەی (٣٠٢)ی دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاواردا، بەناوی پیرەمێردەوە بڵاوکراوەتەوە. بەڵام لە لاپەڕە ٣٣٠ی (یادی مەردان) بەرگی دووهەمدا، دەقی فارسی شیعرەکەی (شێخ أبو الوفا)مان دۆزیەوە:

کمند أفگندە بر رخ زلف را، لیل و نهار است این
فروزان کردە درشب آفتابی را، عذاراست این
بە تیر غمزە ام چشم سیە مستش ز دو گفتا
زما از گلشن ناز و تراکت یادگار است این
بخوابم روی زیبا نیز ننماید گهی، آری
کە مزد گریەهای دیدەی شب زندە دار است این
بە هنگام وداعت نالە درهر استخوان من
چو بهلول دل ازکف دادە گویی نی سوار است این
مرنج ازدل بەچین زلف بی هنگام اگر نالە
کە بس بیمار و بی تاب و پریشان روزگار است این

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

بەڕوویا زوڵفی پەخشان کردووە، لەیل و نەهارێکە
لەشەودا ڕۆژی پەنهان کردووە، شێوەی عوزارێکە
بە تیرێکی تیلەی چاوی دڵی لەت کرد و بانگی کرد
ئەمە بۆ تۆیە ئەم نازە لە دڵتا یادگارێکە
دوعاخوازیت کە کرد، ئێسکم بەجارێ کەوتە ناڵەناڵ
لەناو ئەو ناڵەدا بالۆڵی دڵخۆش نەی سوارێکە
خەیاڵم وابوو شەو بێیتە خەوم، چی بکەم خەوم نایە
خەتای گریان و سووچی دیدەی شەو زیندە دارێکە
ئەگەر بمتوانیایە، نەمدەهێشت دڵ هێند بناڵێنێ
بەڵام چی لێدەکەی بێ عار و شێت و کەوتەکارێکە
لەناو شاری دڵانا جارِ ئەدەن، کێ بێ کە هۆشیار بێ
لە هیچ لایە جواب نایە عەجەب خامۆش شارێکە

پیرەمێرد لە شیعرێکی خۆیدا لاسایی ئەو شێوەی شیعر دانانەی (شێخ ئەبو وەفا)ی کردۆتەوە،

شیعرەکەی (بۆ ملک الشعرا) (ڕەمزی مەلا مارف) وتووە.

دڵی دڵ ڕاگرە چونکو لەگەڵ تۆ، کۆنە یارێکە
دەمێ هاودەم بە، بەڵکو پێت نەڵێن ئازردە کارێکە

پیرەمێرد و شیعرێکی وەرگێڕاوی شێخ ئەبو وەفا کە ساڵی ١٩٤٥ بڵاوی کردۆتەوە. بەڵام دەقەکەیمان دەست نەکەوت.

بە ڕۆژ زوڵف بێنێتە سەر ڕوو، ئەڵێن هاوارە ڕۆژ گیرا
بەشەو ڕووی دەرکەوێ، مژدە ئەدەن، وا جەژنە مانگ گیرا
بە شەو ناڵەی نەخۆش، جێی ڕەحمە، من بێ تۆ بناڵێنم
ئەڵێ لاچۆ هەڵەوەڕ ، دەنگ مەکە، دز دێتە سەر شوێنم
وتم، تۆ دەرم ئەکەی، پێی من بەمووی ئەگریجە بەستراوە
وتی، سەیری درۆی کە، ئێستە ئەگریجە لە کوێ ماوە؟!
وتم، بێڵە بنووم، بێیتە خەوم، شایەد تەسەللام بێ
وتی، مەعشووقە دڵیان ساردە، بازاڕ گەرمی ئەنوێنن
وتم، تۆ وا بڵێ، ئێمەش بەجارێ لائەدەین لێتان
وتی، تا مفلس هەر وان، مەگەر ماڵ بێتە سەر ڕێتان
وتم، من ڕووی جیهانم بێ، بەساتێ وەسڵی تۆی نادەم
وتی، کەم دەسەڵاتییە، وا حەڵاڵ خۆری بەنی ئادەم

***

## وا، لە دووریت

پیرەمێرد ساڵی (١٩٤٥) ئەم شیعرەی لە ژمارە ٧٩٦ی ڕۆژنامەکەیدا بڵاو کردۆتەوە، بەبێ ئەوەی ناوی هیچ شاعیرێکی لەسەر دابنێت!!. ئێمە لە دیوانی (شێخ ئەبو وەفا)دا لەلاپەڕە ١٤٤ی یادی مەردانددا دەقی فارسی ئەم شیعرەمان دۆزییەوە، کە چواردە بەیتە، پیرەمێرد پێنج بەیتی لێ وەرگێڕاوە، بەیتی، یەکەم و دووهەم و سێهەم و چوارهەم و حەوتەم. بەیتی پێنجەمی وەرگێڕانەکە لە دەقەکەدا بەیتی چوارەمە.

لەبەر ئەوەی شیعرەکە زۆر بوو، تەنها ئەو بەیتانە دەنووسین کە پیرەمێرد وەری گێڕاوە!

از غم هجر بەجان آمدم، ای جان، مددی!
گل رخان، مغ بچەگان، بادە فروشان، مددی!
خالی از سجدەی روی تو نیابم سر موی!
پیچ و تاب خم گیسوی پریشان، مددی!
بەجنون دل کشدم چارە، زنجیر کنید
حلقەی سلسلەی طرەی پیچان مددی!
چو قنادیل حرم از تو مظاهر روشن
چشم مینا، نظری! دیدەء گریان، مددی

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

وا لە دووریت، هەڕەتی مەرگمە هاوار[1]
جوانەکان بێچوە موغان، بادە فرۆشان هاوار
جازیبەی عەشقی بەزۆر وادەسی گرتووم ئەمبا
ئەی (خضر) ڕاهبەرم بە، شەهی مەردان هاوار
دڵی دێوانە، کە فێی تووش بووە، زنجیری ئەوێ
حەلقەی سلسلەی طرەی پێچان هاوار
وەکو قەندیلی حەرەم، نوور لە هەموو لاوە دێ
چاوی تیژم، وەرە، بنوارە بەگریان هاوار

(١) کێشی ئەم شیعرە، هەر نیوە بەیتێک لەگەڵ نیوەکەی تری و لەچاو بەیتەکانی تردا لەنگ و ناتەواوە. نازانم هەر خۆی وەها بووە یاخود لە ڕۆژنامەکەدا تێکچووە؟!

## بەوەم زانی

پیرەمێرد ئەم شیعرەی (شێخ ابو الوفا)ی کردووە بەکوردی و لە لاپەڕەی ٢٩٠-٢٩١ی دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاوار دا بڵاو کراوەتەوە. لەبەر ئەوەی دیوانی تەواوی ئەم شاعیرەمان لە دەستا نییە فارسیەکەیمان نەدۆزیەوە:

بەوەم زانی، ئەوەی جوانە، دڵی وەک سەنگی خارایە
کە ئەڵماس دولبەرە و شووشە بڕینیشی لە بارایە
بە حەرفێ گیان ئەبەخشی، قووتی ئەحیات لەزارایە
فیدات بم، ئەی موسوڵمان، موعجیزەی عیسات لە کارایە
ئەوی بووک جوان ئەکات مەنعی تەماشایە، کە تارایە

***

## بە شەرابی کەرەمی خواوە

شیعری (شێخ ئەبو وەفا)ی کوردی و وەرگێرانی پیرەمێرد:[1]

بە شەرابی کەرەمی خواوە وەها مەخموورم
کە سەر ئازاد لە سەودایی بەهەشت و حوورم

مەست ئەگەر نەعرە دەکێشێ، لە(مەی)ە، نەک هی خۆی
مەستی سەودام و چە دەربەستی مەیی ئەنگوورم
ئاهی من ئاگرە بۆ عەرشی خوا، سەر دەکەوێ
چیمە لەوەی باڵی فریشتە دەسووتێ، مەعزوورم[2]
ڕۆژ و شەو لای منە، من بۆی دەگەڕێم سەرگەردان
ئەمە سڕڕێکە لە لامە، کەچی من لێی دوورم
(روح القدس)م بەکەمەندی بەشەرێ کەوتوومە داو
وەکو ڕۆژم کە لە عەشقا بەسووتاو مەشهوورم
ئەمەوێ پەردەیی سەر لادەم بمناسن کێم
ئاخ ئەترسم کە بسووتێنێ خەلایق نوورم[3]
دڵ لە (طوور)ی بەدەنا ویستی بەناڵەی (أرني)[4]
وەکو مووسا بەتەمەنناى نەبوو دەستوورم
ئەو دەمە بادەیی وەحدەت گەییە فریای من
سەرخۆشێکم کە نە (مووسا)م نە کێوی (طوور)م
چوومە ناو دێڕی (فەنا) لافی (أنا الحق)[5] لێ بدەم
عەشقی حەق جامی لیقای دامێ بەوە مەنصوورم
واتەیەکی لە لیقای سڕی (تجلی) دەرخەم
تێدەگەی چۆنە لەسەر لەوحی قەدەم مەسطوورم
من کە چاوێکم بەئاوێنەیی دڵما گێڕا
هاتە پێش چاوم کە هەم (ناظر) و هەم (منظورم)

---

(١) ئەم شیعرە لە دیوانی پیرەمێردی م.ه دا لەلاپەڕە ٣٨٢-٣٨٣دا بڵاو کراوەتەوە. هەروەها لە ژینی ژمارە ٧٩٦ی ساڵی ١٩٤٥دا.

(٢) لای م.ه لە بری (مەعزوورم) بەهەڵە نووسراوە (مەغدوورم)

(٣) لای (م.ه) نووسرابوو (طوورم).

(٤) مەبەست لە حەزرەتی مووسایە کە داوای لە خوا کرد خۆی نیشان بدا ئەویش تۆزێ لە نووری خۆی دەرخست کە شاخی (طوور)ی کرد بەکل و سووتاندی وە خۆی نیشان نەدا و ئەمە ئایەتێکی لەسەرە. وشەکانی (أرني ولن تراني وطور) لەو ئایەتە دایە.

(٥) واتاکانی -أنا الحق- و(منصور) و(تجلی) مەبەست لە مەنسووری حەللاجە کە لەسەر واتای (أنا الحق) شەهید کرا و سووتێنرا.

***





## خەوی بەخت

ئەمە شیعری شێخ ابو الوفای کوردییە و پیرەمێرد وەری گێڕاوە بەڵام مامۆستا هاوار لە لاپەڕە (١٨٢)ی کتێبەکەیدا نووسیویە «ئەم هەڵبەستەی خوارەوەی بەناوی (شێخ ابو الوفا)ی کوردییەوە بڵاوکردۆتەوە بەڵام هەڵبەستی خۆیەتی». شیعرەکە حەوت بەیتە سێ بەیتی یەکەم شێخ ابو الوفایە و چوار بەیتی دوایی پیرەمێردە:

هێند خەوی بەختم گرانە، سەر بکاتە کۆشی حەشر
چاوی هەڵنایە بەتینی ئاگر و تەئسیری بەفر
پێچ و تابی مەینەتی من دەستی چەرخی بەرکەوێ
تێکی دەشکێنێ بەڕەنگێک شەو لە ژانی نەسرەوێ
تۆزی ڕێگەکەت بەچاوما بێ، جەواهر، سوورمەیە
کاولەکەی خۆم لا بەهەشتە و گونیە، شاڵی توورمەیە
«ئاخ قەناعەت گەنجی باقی و دەوڵەتی بێ مننەتە
ئۆدەکەم توونی حەمامیش بێ لە لام جەننەتە
بۆیە بێزارم لەمەی ئەوەڵ قومی ژارقەندەیە
قەهقەهەی ئاوی سوراحی دڵکەش و پڕ خەندەیە
جاری جاران بوایە من عاشق ئەبووم و شێت و وێت
ماڵی سەربەستی کچان ئاوا کە شوکرانەی ئەوێت
ئێستە بۆ عاشق کەمەندی زوڵف نەماوە بیگرێ
خۆم لەبەر پێی جوانەکانا، ڕائەکێشم بێگرێ!

***

## پیرەمێرد و چەند شیعرێکی (شێخ عومەر ضیائەددین کوڕی شێخ عوسمان سیراجەددین)

مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس) سەبارەت بەم زاتە دەفەرمووێ:

«ئەم زاتە لەڕیزی چوار کوڕە گەورە مورشیدەکەی شێخ عوثمان سیراجوددیندا، کوڕی سێهەمیان و برای باوک و دایکی شێخ موحەممەد بەهائوددینە. لەشەوی دووشەممەی ٢٦ی جومادەلئوولای ١٢٥٥دا لە دێی (بیارە) لە دایک بووە و لە شەوی دووشەممەی ٢٢ی شەوالی ١٣١٨دا کۆچی دوایی کردووە و لە ژوورێکا لە نزیک خانەقاوە لە بیارە بەخاک سپێرراوە.»[1].

«شێخ عومەر ضیائوددین گەلێ شیعری ناسک و پەخشانی بەرزی هەیە. پەخشانەکانی هەموو لە شێوەی نامەدان کە بۆ ئەم و ئەوی نووسیوە. نازناوی شیعری (فەوزی) بووە، بەڵام جارجار

نازناوی تریشی داناوە. شیعری بەکوردی (گۆرانی و کرمانجی) و فارسی و عەرەبی هەیە»[2].

پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە ڕۆژنامەکەیدا ساڵی ١٩٤٩ بڵاو کردۆتەوە کە وەرگێڕانی شیعرێکی فارسی (شێخ عومەر)ە.

جذبه ء عشق مرا کشت، حریفان مددی[3]
شاهد فتنه ء فتان حبیبان مددی
من در این دامگهم نیست خلاصی اصلا
پیچ و تاب شکن زلف پریشان مددی
ناوک چشم کند قتل من خسته بیا
ای بهای دیه ء خون شهیدان مددی
نفسرا بازهوا کرد گرفتار هوس
قبله ء شام غریبان، شه گیلان مددی
روز بی مهر رخت همچو شب دیجور است
شمس رو، ماه جبین، مخزن عرفان مددی
برلب جوی سرشکم قد دل جوی توکو
سرد من، نخل چمن، گلشن مستان مددی
پرورش گر نکند شاه بخارا چکنم
شه گیلان مددی، حضرت عثمان مددی
معرفت گر نبود راه نهبر مقصود است
ای دلیل کرم و خضر غریبان مددی
(فوزی) أرنیست بهخود راست ولی هست بهتو
چشمه ء رحمت و أمید مریدان مددی

(١) یادی مەردان –مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس- بەرگی دووەم ل١٤٩
(٢) یادی مەردان مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس – بەرگی دووەم ل ١٦٥
(٣) هەمان سەرچاوە ل ١٩٤ .

پیرەمێرد نۆ بەیتی لەم شیعرەی (شێخ عومەر ضیائوددین) وەرگێڕاوەتە سەر کوردی، شیعرەکە خۆی شانزە بەیتە ئێمە تەنها دەقی ئەو بەیتانەمان نووسییەوە کە پیرەمێرد وەری گێڕاوە.
وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

جەزبەی عەشقە وا ئەمکوژێ یاران هاوار
شاهدم مەیلی شەهادەتیە حەبیبان هاوار



کەوتمە داوێکەوە ڕسگاری نییە تا مردن
وەرە ڕامکێشە بەزۆر زوڵفی پەرێشان هاوار
کوشتەی زامی دڵ و تیری تیلای چاوێکم
وەرە مایەی دیەی خوێنی شەهیدان هاوار
بە هەوای نەفسەوە گیرۆدەی داوی هەوەسم
ناڵەیی شاهی غەریبان شەهی گەیلان هاوار
ڕۆژی ڕووی تۆ نەبێ ڕۆژ شەوی دەیجوورە لە لام
شەمس ڕوو ماه جەبین شەمعی دەرەخشان هاوار
جوبیارێکە سروشکم قەدی تۆی تیا جوانە
نەخلی گیان، سەروی ڕەوان زیبیتی گوڵستان هاوار
ڕوخسەتی شاهی بوخارا، منی ناردە بەغدا
شاهی گەیلان مەدەدێ حەزرەتی عوسمان هاوار
ڕێی شوناست کە نەبێ ڕێگەی هەق دەرناکەی
ئەی دەلیلی سەرەتای ڕاهی غەریبان هاوار
(فەوزی) وا برسی و تینوو کە لە ڕێدا ماوە
خضری ڕێی چەشمەی پڕ ڕەحمەتی ڕەحمان هاوار

***

## نامەیەکی شێخ نەجمەددینی کوڕی شێخ عومەر و وەڵامەکەی شێخ عومەر[1]

پیرەمێرد دوو پارچە شیعری شێخ نەجمەددین و شێخ عومەری باوکی لە فارسییەوە کردووە بەکوردی. ئەو شیعرانە وەک نامەیەک و وەڵامەکەیەتی. بەڵام پیرەمێرد نەینووسیوە کە ئایا هەردوو نامەکە هەر ئەو دوو شیعرە چوار دێڕەیە یاخو بەشی پەخشانی لەگەڵدا بووە! هەروەها ئەم پێشەکییەی بۆ نووسیوە:

«من لە تافی جوانیدا جۆشی دەروونم، وەک تافی قەڵبەزەی سافی شووشەی مەی، یا وەک تاڤگەی زەڵم و بەڵخە و ئاشەبەرزە کەفی ئەچەند. ڕێم کەوتە بیارە خزمەت شێخ عومەر. نەزەری ئەو ئەو جۆش و خرۆشەی دێوانەییەی بۆ خستمە ناڵەی نەی، نەیجەی قەڵەمەوە. ڕۆیم، ساڵەها دوور کەوتمەوە بەڵام هەر نزیک بووم دوور و نزیکی یەکسانە بۆ گیان. هاتمەوە بەیازێکی خەتی شێخ نەجمەددینم چنگ کەوت لە خەتی من خۆشتر، شیعری خۆی و باوکی تیایە. ئاخ شیعرەکانی فارسین، ناچار کردمن بەکوردی. لە پێشەوە نەجمەددین بۆ باوکی نووسیوە، ئەڵێ:

ئەی بەتۆوە سەری بەرزە لق و پۆی ئیمانم
بێ نیگای پەروەرشت (حذف)ە، حرووفی گیانم

ئیرسی باوانە کە دەستم گەیییە داوێنت
گەر لە دەستی خۆمی بدەم مەرگ بێ لەجێی میوانم

شێخ عومەریش بۆی نووسیوەتەوە:

ئەی بەتۆ ڕاست بووەوە قەددی وەکو گۆچانم
دوور لەتۆ گرژم و شێواو وەکو موو پێچانم
ئەو حەلە بەرزە بەسەر چەرخی بەریندا نازم
کە لە (دەر) داوە لەپڕ بێیت و بلێی میوانم

........................................

(١) ژین ژمارە ٨٥٦ ساڵی ١٩٤٧

***

## پیرەمێرد و چەند لاپەڕەیەک لە شانامە

پیرەمێرد ئەم چەند لاپەڕەیەی لە شانامەی فیردەوسییەوە وەرگێڕاوە. لەوەش دەچێت هەندێ دەستکاری کردبێت و شیعری خۆی تیادا دانابێت. هەروەها ناوی تەواوی سەرچاوەکەی بەم جۆرە نووسیوە «جلد ٣، لاپەڕە ٣٦٧، ستوون ٦، دێڕ٢٤».

لەوێ ناودارێ هەبوو ناوی تباک
سپاداری لەشکر دەروونێکی پاک
بەسەر (جهرم)دا بوو، بووبووە پاشا
جهانداری پڕ هۆش و فەرمان ڕەوا
لەگەڵ حەوت کوڕی هەر یەکە شایێ بوون
لەسەر ئەمری (بەهمەن) بەلەشکر ئەچوون
کەوا ئەردەشێر بگرن و بۆی بەرن
بەڕێکی لەگەڵ ئەردەوان دەربەرن
تباک ئەردەشێری کە دی تێگەیی
لە ساسانییانە بەشێوەی کەیی
لە زین دابەزی و دەستی ماچ کرد بەقەدر
لە ڕێدا وەکو بەندە وەستا بەفەخر
بەڵام ئەردەشێر ترسی لێ نیشت لەوێ
کەوا لەشکرێکی لەپڕ هاتە ڕێ
تباکی جهان دیدە پیری بەبیر
کە زانی ئەترسێ لەوان ئەردەشێر



وتی سوێند ئەخۆم بۆت بە (وێسا و بەزەند)[١]
کە نابینی هەرگیز لە ئێمە گەزەند
ئیتر ئەردەشێر ترس و بیمی نەما
وتی باوکی من بە لە ڕووی عالەما
ئەویش هات و خۆی خستە باوەشیەوە
بە مزگێنی پارەی گەلی بەشیەوە
بە میوانی ڕووی کردە ماڵی تباک
شەوێ بەزم و ئاهەنگ بوو تا ڕۆژی پاک
بەیانی تباک بانگی کرد دەستوبرد
کە بۆ شەڕ دەچین بێنەوە سواری کورد؟
لەوێدا سپەهدار کەوتە ژمار
سوپای کورد گەیشتبووە پەنجا هەزار
تباک خۆی بۆ سەرلەشکری کوردەکان
ئەچوونە شەڕی بەهمەنی ئەردوان
نزیک کەوتنەوە هەردوو لەشکر بەتاو
لەوێدا لەشکرێکی وەها کەوتە ناو
هەموو شارەزوور بوو بەڕووباری خوێن
وەکوو ئاوی سوور، سوور بوو جۆگەی (دەڵێن)
تباک شێری بێ باک بوو حەملەی دەبرد
سوپای (ئەردوان)یان شکاند گوردی کورد
فڕاندیان گەیاندیاننە ئەستەخر
لە تەئریخی کوردا ئەمە بوو بەفەخر
کە کوژرا لەوێ بەهمەنی نەوجوان
دەمودەست خەبەر گەییە لای ئەردوان
هەموو لەشکری پارسی خستە ڕێ
هەتا هات سوپای نیشتە سەر یەک لە ڕێ
نزیک کەوتەوە گەییە سەر ئەردەشێر
دیسان قەومی کورد و تەباکی دلێر

به ئازایی ئەو لەشکرەیشیان شکاند
(سەر) و (تاجی) شای ئەردوانیان فڕاند
ئیتر ئەردوانیان لەوێدا کە کوشت
سوپاکەی ئەسیر بوون بەورد و درشت
لە پاداشی ئەو خزمەتە ئەردەشێر
لەوێ هاتەوە ماڵی تباکی پیر
لەبەر مەردی کوردی و فەڕ و نوور
کە (جهرم) بوو ئەو ناوی نا شەهرەزوور
لە گۆلی زرێبارەوە تا ئەوێ
وتی نەهرە ئاوێکی وای پێ ئەوێ
هەموو شارەزوور بێتە گوڵزار و باغ
لەوێوە لەغەم کەوتە ژێر ساغ و داغ
هەموو خەڵکی هێنایە زوڵم و ستەم
ئەوا ناوی ئەو جۆگەیە بوو بەزەڵم

(١) مەبەست لە کتێبی ئاوێستای زەردەشتە. هەروەها کتێبی زەند.

***

## پیرەمێرد و شیعرێکی ناصر خسرو

ئەم شیعرەی (ناصر خسرو) لە لاپەڕە ٢٥٤ی دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاواردا، بەشیعری پیرەمێرد دانراوە. وە مامۆستا هاوار پێشەکییەکی بۆ شیعرەکە نووسیوە. ئنجا ئێمە بۆ ساغ کردنەوەی ئەم شیعرە و ساڵەکانی بڵاوکردنەوە و شوێنەکانی، ئەم چەند خاڵە دەخەینە پێش چاوی خوێنەران و ئەو ڕۆشنبیرانەی کە سەبارەت بەبەرهەمی پیرەمێرد لە داهاتوودا هەوڵی لە مانەی ئێمە باشتر پێشکەش دەکەن.

یەکەم: ڕاست کردنەوەی چەند بیروڕایەک:

مامۆستا هاوار ئەم پێشەکییەی بۆ شیعرەکە نووسیوە:

«ئەم هەڵبەستەی خوارەوەی پیرەمێرد گوایا لە ساڵی ١٩٢٤ی ڕۆمیدا کە هێشتا لە تورکیا بووە، بەزبانی کوردی وتوویەتی و لە ڕۆژنامەیەکی ئەستەمولدا چاپی کردووە، بەڵام لەکام ڕۆژنامەدا چاپی کردووە؟ ئەمەیان هیچ دیار نییە و هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە!!.





بەڵام من لەو باوەڕەدام کە پیرەمێرد ئەو هەڵبەستەی بەکوردی نەوتووە لە تورکیا، خۆ ئەگەر لە تورکیا وتبێتی دوور نییە لە پێشدا بەتورکی وتبێتی و لە ڕۆژنامەیەک یا لە گۆڤارێکی ئەوێدا بەتورکی بڵاوی کردبێتەوە کە ساتێ گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان ئەو هەڵبەستەی گۆڕیوە بەکوردی و بڵاوی کردۆتەوە. ئەم هەڵبەستەم لە دەستخەتە کۆنەکانی پیرەمێرد چنگ کەوتووە و لە کاتی خۆیدا لە گۆڤاری گەلاوێژدا هەر بەو جۆرەش بڵاو کراوەتەوە»[١].

بۆ ڕاست کردنەوەی چەند هەڵەیەک و دەرخستنی بیروڕای نوێی ئێمە لەم بارەیەوە دەڵێین:

پیرەمێرد بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٠٨ی زاینی واتە ١٣٢٤ی ڕۆمی لە ڕۆژنامەی (کورد)دا[٢] (کورد تعاون وترقی غزەتەسی)، ئەم شیعرەی، وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و بڵاوی کردۆتەوە.

لای مامۆستا هاوار ١٣٢٤ی ڕۆمی بووە بە١٩٢٤؟! کە ڕەنگە هەڵەی چاپ بێت. چونکە پیرەمێرد کاتێک لە ژمارە (٦،٥)ی گۆڤاری گەلاوێژی ساڵی ١٩٤٢دا ئەم شیعرەی بڵاو کردۆتەوە نووسیویە، «لە ساڵی ١٣٢٤ی ڕۆمیدا کە هێشتا لە تورکیەدا زبانی کوردی ناو و باوی نەبوو، پیرەمێرد ئەم غەزەلەی لە غەزەتەی ئەستەمولدا لە چاپ داوە»[٣] لەمەدا دەردەکەوێت کە ١٣٢٤ ساڵی دەرچوونی ڕۆژنامەی (کورد)ە، بەکوردی و بەتورکی. کە دەڵێت (هێشتا لە تورکیەدا زبانی کوردی ناو و باوی نەبووە) واتا لەو کاتەدا ئەم دەستپێشکەری کردووە و بەکوردی شیعری بڵاوکردۆتەوە. ئنجا دە ساڵ دوای ئەوە واتە ساڵی ١٩١٨ گۆڤاری (ژین) بەکوردی و تورکی دەرچووە. بەم پێیە وەڵامی دوو پرسیاری مامۆستا هاوارمان دایەوە کە شیعرەکە لە ڕۆژنامەی (کورد)دا بووە و بەڵگەکانیش لەو لێکۆڵینەوەیە دایە کە ئێمە سەبارەت بەڕۆژنامەی کورد لە گۆڤاری بەیانی ژمارە ١١٩ی ساڵی ١٩٨٦ بڵاومان کردەوە. وە هەڵبەستەکەی بەکوردی بڵاوکردۆتەوە، واتا وەرگێڕانەکەی!.

وەهەر هەمان شیعرەکە لە (گەلاوێژ)دا بڵاوی کردۆتەوە. وە هیچ ناونیشانێکی بۆ شیعرەکە دانەناوە، لە کاتێکدا کە مامۆستا (دکتۆر ئەمین عەلی موتابچی) ئەم شیعرە و وەرگێڕانەکەی پیرەمێردی بەراورد کردووە، ناونیشانی (هەڵۆکەی پیرەمێرد)ی بۆ داناوە!! وە ئەم هەوڵەی دکتۆر ئەمین موتابچی شایانی ستایش و ئافەرینە. ئێمە پێش بڵاوبوونەوەی نووسینەکەی دکتۆر موتابچی پشتمان بەکەشکۆڵی (کەریم بەگی فەتاح بەگ) بەستبوو، بۆ بەراوردی دەقە فارسی و کوردییەکە. بەڵام دەقی شیعرەکەی دکتۆر کە لە دیوانی چاپکراوی ناصر خسرو[٤]دا خستوویە پێش چاو لە دەستنووسەکەی ناو کەشکۆڵەکە باشتر و بێ هەڵەتر بوو، وە پشتمان بەو بەست.

شیعرەکەی پیرەمێرد وەک لە دیوانی مامۆستا هاوار و گەلاوێژدا بڵاو کراوەتەوە یانزە بەیتە، نۆ بەیتی (ناصر خسرو)ە، کە بەیتی نۆیەمی دەچێتەوە سەر بەیتێکی (سەعدی) و ئێمە دەقەکەی دەنووسین. وە بەیتی دە و یانزە شیعری پیرەمێردە کە بۆ شیعرەکەی ناصری زیاد کردووە و مەبەستی خۆی تیا دەربڕیوە. لە کەشکۆڵەکەی لای ئێمەدا دە بەیتە، لە دیوانەکەی ناصردا یانزە

بەیتە وەرگێڕانەکەی پیرەمێردیش هەر یانزە بەیتە. و وەک وتمان دوو بەیتی خۆشی بۆ زیاد کردووە.

بۆ بەراورد و ساغ کردنەوەی دەقەکەی ناصر خسرو و وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد و دوو بەیتە زیادەکە و بەیتەکەی (سەعدی)یش دەنووسین.

ناصر خسرو:

روزی ز سرسنگ عقابی بەهوا خاست[٥]
بهر طلب طعمە پروبال بیاراست
بر راستی بال نظر کرد و چنین گفت
امروز همەملک جهان زیر پر ماست
گر اوج بگیرم، بپرم از نظر شید
می بینم اگر ذره ای اندرتک دریاست
گر برسر خاشاک یکی پشە بجنید
جنبیدن أن پشە عیان در نظر ماست
بسیار منی کرد و ز تقدیر نترسید
بنگر کە ازین چرخ جفا پیشە چە برخاست
ناگەز کمینگاە یکی سخت کمانی
تیری ز قضا و قدر، انداخت بروراست
بربال عقاب آمد آن تیر جگر سوز
واز ابر مراورا بەسوی خاک، فروکاست
بر خاک بیفتاد و بفلتید چو ماهی
وانگاه پر خویش کشید از چپ و از راست
گفتا، عجبی است این کە زچوب است و زآهن
این تیزی و تندی و پریدنش کجا خاست
زی تیر نگە کرد و پر خویش برو دید
گفتا، زکە نالیم، کە زا ماست کە برماست
خسرو تومنی راز سر خویش بدرکن
بنگر بەعقابی کەمنی کرد چەها خاست

(١) پیرەمێردی نەمر – محەممەد ڕەسول هاوار. ل٢٥٤
(٢) ڕۆژنامەی کورد – ئومێد ئاشنا – گۆڤاری بەیان ژمارە ١١٧ساڵی ١٩٨٦



(٣) گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (٦،٥) ساڵی ١٩٤٢
(٤) ناصر خسرو: لە شاعیرانی بەناوبانگی ئێرانی سەدەی پێنجەمە لە ساڵی ٣٩٤ی کۆچی لە بەلّخ لە دایک بووە. وە لە ٤٨١ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.
(٥) دیوانی( ناصر خسرو) چاپی طهران ١٣٣٩ی خورشیدی ل٤٤٩ .

بەیتەکەی (سەعدی)یش ئەمەیە:

«من از بیگانگان هرگز ننالم
کە با من هرچە کرد آن آشنا کرد»

ئەمەش وەرگێڕانەکەی پیرەمێردە:

لە سەر بەردێک هەڵۆیەک هەڵفڕی کەوتە هەوا بێ غەم
هەواییێکی غرووری کەوتە سەر، تا کەوتە سەر عالەم[١]
بە باییێکی خەڕۆ و بایی بوو، خۆی ئێجگار بڵند زانی
پەڕی گیڤ کرد و باڵی لێک ئەدا هەتاکو ئەیتوانی
کە کەوتە عالەمی خولیاوە، سەیری کرد هەموو دنیا
لەژێر باڵی ئەوایە، هەر ئەوە لەو ئەوجەدا تەنیا
وتی، ئەمڕۆ لەمن بەرزتر، لە ئەوجی عالەما کێیە
کورەی ئەرزم لەژێر پێدایە، کەس ناگاتە ئەو جێیە
ئەگەر مێشوولەیەک بێت و بجووڵێ، نابێ نەیبینم
لەسەر شەپقە و سەری ئەگرن پەڕێکی باڵی ڕەنگینم
خولاسە هێندە فەخری کرد و خۆی بینی لە نخوەتدا
کەمانێکی قەدەر تیرێکی هاویشتێ لە غەفڵەتدا
هێنایە خوارەوە خوار و زەلیل لەو بەرزییە لەرزی
سەفیل و دڵ بریندار کەوت لەو خاک و خوێنەدا گەوزی
کە سەیری کرد پەڕی خۆی بوو لەناو ئەو نووکە پەیکانە
وتی خۆمان بەخۆمانی ئەکەین، بێ سووچە بێگانە
بە ڕاستی ڕاست ئەکا سەعدی کە من هەرگیز لە بێگانە
گلە ناکەم، کە هەرچی پێم ئەکا خۆیە و لە خۆمانە
«دەڵێین دڵمان لەیەک پاکە، برای دینین، لەیەک نەسلین
کەچی چاومان بەخێری یەکتری هەڵنایە کەچ بینین»[٢]

«هەتا کەی چاوی عیبرەتمان لە گڵدا بێ خوا چارێ
حەکیم هەر تۆی، بەخێر چاومان هەڵێنە بێینە ناو جارێ»[3]

........................................

(١) لای م. ه نووسرابوو: بەبابێکی غرووری بایی بوو، تاکەوتە سەر عالەم.
(٢ ، ٣) ئەم دوو بەیتە شیعری پیرەمێردە.

***

## پیرەمێرد و شیعرێکی مەخفی[1]

لە کەشکۆڵی نەجمەددین مەلادا کە بۆ (محەممەد ئەمین کوڕی حەمە ساڵح ئاغای قزلجی) نووسیوە، لە لاپەڕەی ٢٢٥دا دەقی شیعرەکەی (مەخفی) و وەرگێڕانەکەی پیرەمێردی نووسیوە. هەروەها لە لاپەڕەی ٢٢٤دا لەم بارەیەوە نووسیویە «حاجی تۆفیق بگ زیاتر لە ترجمەی شعردا وریایی هەیە، شیعری، عربی، تورکی، فارسی ئەگۆڕێتە سەر کوردی عەینەن بەشیعر مەعناکەی تێک نادا، بەرگی کوردی ئەکا بەبەرا»

مەخفی:

کنعانیان اگر گلی روی تو بو کنند
کمتر هوای گلشنی مصر آرەزوو کنند
پامال پشت پای توشد روی آفتاب
آنانکە منکرند بگو رووبەروو کنند
خیلی ملائک از پی نظارە صف کشند
آنجا شهید عشق توراشستو شو کنند
عشقم چنان گداخت کە موران تر بتم
عضونە یا فتند کە ناخن در و کنند
طاعت منکران محبت قبول نیست
صدبار اگر بەچشمەی کوثر وضو کنند
چاک درونی سینەی من بەنمیشود
گیرم اگر بەروشتەی مریم رفو کنند
جان آرەزوو کند کە تولب برلبش نهی
بعد از هزار سال کە خاکش سبو کنند
این تشنەگی بەجام قدح طی نمیشود
با ساقیان بگو کەمی دەر سبو کنند



غمهای دوست بردر دل حلقە می زنند
(مەخفی) بگو کە خانەی دل رفت و روکنند

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

کەنعانیان گوڵی ڕووی تۆیان بەدەست کەوێ
باوەڕ مەکە کە گوڵشەنی میسریان ئیتر بوێ
ڕووی ڕۆژ بەپشتی پێت شەقی خوارد ئابڕووی تکا
با، ڕووبەڕووی بکا ئەوی باوەڕ بەمن نەکا
جێیە شەهیدی عەشقی تیا بشۆن هەموو
دەستەی فریشتە کۆمەڵ ئەبەستن بەئارەزوو
عەشق وای تواندوومەوە بەشی مێروولەکانی گۆڕ
ئێسکێ نەمابوو چنگێکی لێ گیر بکەن بەزۆر
نوێژی بەبێ مەحەبەت ئەبێ، لا بەلا بە بێ
دەستنوێژی، با، بەکەوسەر و مزگەوتی (کابە) بێ
زامی دڵم، بەروشتەی مریەم کە دێتە سوێ
برژانگی چاوی جوان تەقەڵی لێ بدا ئەبێ
گیان وای دەوێ ببی بەگڵ و پیا بڕۆی و بێی
لەو خاکە گۆزەیێ بگری و لێوی پێوە نێی
من تینوویەتیم بەجام و قەدەح ناشکێ بڵێن
ساقی بەکوپە بێنێ شەرابی خومار شکێن
دەرگای دڵی منە غەمی دۆست هاتووە لێی ئەدا
(مەخفی) بڵێ کە پاکیەوەکەن بێ قڕە و سەدا

........................................

(١) کەشکۆڵی نەجمەددین مەلا کە بۆ محەممەد ئەمین کوڕی حەمە ساڵح ئاغای قزلجی نووسیوە. هەروەها ئەم شیعرانە لە دیوانی پیرەمێردی (م. ه) بڵاو نەکراوەتەوە.

***

## پیرەمێرد و شیعرێکی ظهیر

زانبوە غمت در سینە ام راه فغان گم شد
ز بیداد تو ام حرف شکایت در زبان گم شد
نمیدانم چەنا شایستەگی ازمن پدید آمد
کە تسبیح ازکفم افتاد و زنار ازمیان گم شد

چنان برهم زدی هنگامەی روزی قیامترا
کە یک سر نامەی اعمال مردوم درمیانه گم شد
زجستجوی تو غوغا چنان افتاد در محشر
کە طومار شفاعت در کف پیغمبران گم شد
نمیدانم کد امین خنجر مژگان هلاکم کرد
دو صف بریک دیگر خور وند و قاتل درمیان گم شد
بیابانی است مالا مالال دل تاخیمەی لیلی
دوصد مجنون سرگشته دران ریگ روان گم شد
چه بیخود خفتەیی مجنون بهوش آی و سراغی کن
کە ام شب ناقەی لیلی میان کاروان گم شد
بەرویی قبر مجنون بلبل و پروانه میگفتند
کە فرد قابل واهل محبت در میان گم شد
ز احوال (ظهیر)ی گر کسی پر سد بگو بیدەش
بدان افتاد آن مرغی کە شب در آشیان گم شد

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

لە سینەمدا غەمت هێند نیشتە سەریەک رێ نەما هاوار
زبانیشم لە دەس جەورت سوا دادی نەما ناچار
سەرم سوڕماوە تێناگەم کە ناشایستەییم چی بوو
کە تەسبیحم لە دەس دەرچوو دڵی زنناریشم لێ بوو
قیامەت قامەتت هنگامەییێکی وای بەسەر هێنا
سەراسەر نامەی ئەعمالی تیا ون بوو سەری تێنا
کە ناوت کەوتە ناو ناو، شۆڕشێکت خستە ناو مەحشەر
کە تۆماری شفاعەت ون بوو لای پێغەمبەران یەکسەر
لەلام مەعلووم نییە کام خەنجەری برژانگی کوشتوومی
دوو سەف دایان بەیەکدا قاتلم ون بوو بەمەوهوومی
بیابانێکە سەرتاسەر دڵە تا خێوەتی لەیلا
دوو سەد مەجنوونی تیا ون بوو لمی دوجەیلیان شێلا
چە بێ هۆش لێرە نوستووی هەڵسە مەجنوون پرسیارێکە
کەژاوەی لەیلا ئەمشەو ون بووە نامەرد زووکە



کە بۆ مەجنوون ئەیان لاواندەوە پەروانە و بولبول
ئەیانوت پادشای ئەهلی مەحەبەت گواستیەوە ژێر گڵ
ئەگەر بێت و کەسێ پرسی (ظهیری) کوا لەکوێدایە
بڵێن مورغێ کە شەو ون بوو لە هێلانەی، لەداو دایە

***

## پیرەمێرد و شیعرێکی (وەحشی) شاعیر

لەم بارەیەوە نەجمەددین مەلا نووسیویە «حاجی تۆفیق بەگ تەرجەمەی شیعری فارسی وەحشی کردووە. وەحشی شاعیرێکی فارسە، بەشیعر لەگەڵ برا گەورەکەی میراتی باوکی بەش کردووە. گوایا هەرچی چاکە داویەتی بەبرا گەورەکەی و خراپەکەی بۆ خۆی هەڵگرتووە کەچی ئەوی خراپە لە هەمووی چاکترە!! بەڕاستی ئەم غەزەلەی خوارەوە فکرێکی وردە»[1].

گیانی برا بەخۆشی وەرە ئیرسی باوکمان
بەش کەین ئەوی کە چاکە هەمووی بۆ تۆ کاکە گیان
من ئەو برایە نیم کە دزیت لێ بکەم وەرە
من دای دەنێم بەخۆشی بەشی خۆتی لێ بەرە
ئەو جامە خاڵییە بۆ من و گۆزەیش ئەدەم بەتۆ
مانگای قسر بەشی من و نۆ مەشکە پڕ لە دۆ
ئەو ماینە پازدە ساڵە ئەوە تۆ هەڵی گرە
چونکو نەزۆکە با بەشی من بێ ئەو ئێسترە
فەرشی زەمینی خانوو هەتا بان هی منە
تا ئاسمان لە بانەوە بۆ تۆ کە بێ بنە
ئەو یابو[2]وە پەت پسێنە ڕەزام با بەرم کەوێ
ئەو پشیلەیە کە هۆگری باوکم بوو تۆی ئەوێ
بۆمن بەرانەکان و لەسەر تۆ بێ کا و جۆ
سەیری شەڕە بەران کە حەزی لێ ئەکەی کە تۆ
ئەو قەرزی زۆری باوکمە بۆ تۆ کە بەرهەمە
تەنها کرێ دوکانەکە بۆ من کە زۆر کەمە
فەخری نەوەی خانەدانیەکەم دا بەتۆ بەڵام
من بۆرە پیاوی کاسب ئەبم کەس نەیەتە لام

(١) کەشکۆڵی نەجمەددین مەلا کە بۆ محەممەد ئەمین حەمە صاڵح ئاغای قزلجی نووسیوە ل٢٣١

(٢) یابوو: ئەسپی بارکێش کە یەختە کرابێ

***

## شێت و ژیر[١]

شیعری سەعدی و وەرگێڕانی پیرەمێرد:

شێتێک ئەڕۆیی بەگۆشەی شارا
دی سەلکی کەریان کردووە بەدارا
وتی یاران من هۆشم بەستراوە
لەو سەلکە کەرەی هەڵاوسراوە
وتیان ئەو ئێسکە بۆ چاوە زارە
ئەمە پارێزی چاوی بەدکارە
پێکەنی وتی ئەو سەلکە کەرە
لەچاو ئێوەدا پڕ مەغزترە
ئەو بەزیندوویی کە بار ئەکرا
نەقیزەی لەخۆی پێ مەنع نەکرا
ئێستا چۆن بەڵا دوور ئەخاتەوە
بۆیە قوڕ درا بەوڵاتەوە

..............................................

(١) کەشکۆڵی نەجمەددین مەلا بۆ قزلجی ل٢٢٩.

***

## دووبارە سەعدی و وەرگێڕانی پیرەمێرد

فەیلەسوفێکی دەریا دڵ فەرمووی[١]
هەر چیت بدەنێ منەتە لەدوی
تەنها جنێوە کە بێ منەتە
هەزم کردنی ئەویش زەحمەتە
باڵووڵە شێتە پرسی لە هاروون
گوناهت ئەوێ یا زیو و ئاڵتوون
هارون الرشید فەرمووی کاکە گیان
چۆن ئاڵتوون ئەدا بەگوناە ئینسان
باڵووڵ وتی ماڵ، وەختێ کە مردی
میرات خۆر ئەیبا بەدەستوبردی



بەڵام گوناهت بەوەفاترە
لە قەبر و حەشرا لەلات حازرە

..............................................

(١) کەشکۆڵی نەجمەددین مەلا بۆ قزلجی. ل٢٢٩

***

## پیرەمێرد و دوو شیعری شێخ ڕەزا

ئەم شیعرە لە دیوانی (شێخ ڕەزای تاڵەبانی)دا لە لاپەڕەی ١١٤دا چاپ کراوە، لە دەقی فارسیەکەیدا حەوت بەیتە، لای پیرەمێرد بووە بەشەش بەیت، بەڵام لە ماناکەی نەگۆڕیوە.

ماه رمضان چون گذرد نوبت عید است
پیش از رمضان آمدن عید که دید است
کرکوک چرا بر همه آفاق ننازد
امروز که آرامگه این سه حفیداست
از عید غرض صحبت آن قدوهء سادات
سردار گروه شرفا (شیخ سعید) است
صد شکر که بامقدم آن یار عزیزان
هرسال دوعید آمد و امسال سەعید است
أز سعدیی آن (شیخ سعید) است که امسال
مقراض حوادث سرمویی نبرید است
با آل نبی پینجه ز دن پیشهء مانیست
این واقعه، تقدیر خداوند مجید است
نسبت نەکنو نست بدین درد (رضا) را
در روز ازل، عاشق و درویش و مرید است

کاتێ شێخ سەعیدی حەفید و براکانی چوونە کەرکووک شێخ ڕەزا خۆش ئامەدی لێ کردوون»[١]

مانگی ڕەمەزان تێپەڕی ئەوسا دەمی عیدە
هێشتا ڕەمەزانە کەچی عیدێکی سەعیدە
مەقسەد لەمە من وا کە دڵێم جەژنە لەلامان
تەشریفی حەفیدێکی سەعید شێخ سەعیدە
کەرکووک بەمە نازی هەیە ئەمڕۆ لە جیهانا
ئارامگەهی پڕ شەرەفی چوار[٢] حەفیدە

سەد شوکور لە ڕۆژی دەوڵەتی دیداری عەزیزان
ساڵان دوو جەژنمان ئەبوو ئەمساڵ سێ عیدە
جەبهە و جبەیان نوور و سەعادەت ئەنوێنێ
نوورێکی سەعادەت لە سیادەتدا بەدیدە
ئێمە هەموومان خادمی ئەولادی نەبی بووین
چی بکەین ئەمە تەقدیری خوداوەندی مەجیدە

---

(١) ژین ژمارە٨٣٤ ساڵی ١٩٤٦
(٢) لە دەقی شیعرەکەی شێخ ڕەزادا نووسراوە (سێ حەفید)ە.

***

## شیعرێک لەنێوان شێخ ڕەزا و پیرەمێردا

لە یەکێک لە لاپەڕەکانی کەشکۆڵەکەی مەحموود پاشای جافدا، بەڕێز حەسەن فەهمی بەگی خوالێخۆشبوو، بەخەتی خۆی چوار بەیت شیعری فارسی شێخ ڕەزای تاڵەبانی نووسیوە و لە ژێریا وەڵامێکی پیرەمێردی بەهەمان شێوەی چوار بەیتی، بۆ شێخ ڕەزا، نووسیوە. لێرەدا هەردوو پارچەکە و لێکدانەوەکەی دەنووسین. شایانی باسە مامۆستای فارسی زانی شارەزا، عەبدولقادری دەباغی شیعرەکانی بۆ ساغ کردینەوە و مانای لێکدایەوە. شێخ ڕەزا بۆ (وەسمان پاشا)ی جافی نووسیوە:

کجا شد آن عنایت های پیشین
کجا شد آن کرامت های دیرین
نەگاهی پرسدم خانم نە پاشا
نە یادم میکند خسرو نە شیرین
و زین جانب نمیدانم سبب چیست
وزان جانب مگر ملاّی بیدین
نترسد از زبان آتشینم
-جعلناها رجوماً للشیاطین-

وەڵامی پیرەمێرد:

رضای تلخ کامت خواند شیرین
دهانش ریش باد ان مرد کج بین
کە کیخسرو بەکیخسرو شبیە است
کجا شیرین بود چون حوری عین



تو ان حوری کە از پاداش خیرات
زجنت امدی با فرو تمکین
ملا محمل کش و نادر ندیمت
رضا بنود کە خوانندش شیاطین

مانای شیعرەکان:

شێخ ڕەزا نامەیەک بۆ وەسمان پاشای جاف دەنووسێ و گلەیی لێ دەکا کە نە خۆی و نە خانم واتا (خانمی وەسمان پاشا)، هەواڵیان نەپرسیوە و پاشا و خانم بەشیرین و خوسرەو دادەنێ و دەڵێ من هیچ لەخۆمدا شک نابەم ڕەنگە مەلای بێ دین سۆفاری کردبێ و ئێوەی دەرهەق بەمن بێ لوتف کردبێ، مەگەر مەلا ناترسێ لە زمانی ئاگرینم کە وەک برووسکەی ئاسمان ڕەجمی شەیاتین دەکا ؟!

شیعرەکانی زۆر ڕەوان و پڕ مەعنایە و دەسەڵاتی شاعیر بەسەر زمانی فارسیدا بەباشی دەگەیەنێ. بەڵام پیرەمێرد دوای کۆچی دوایی شێخ ڕەزا وەڵامی دەداتەوە!. خانمی وەسمان پاشا هەڵدەکێشێ و دەڵێ:

ڕەزا کە دەمی تاڵ بووە، لەبەر نەناردنی دیاری، تۆی لە جێگەی شیرین داناوە، کە دەم بریندار بێ چونکە کەیخوسرەو بەکەیخوسرەو دەشوبهێ بەڵام کەی شیرین دەبێتە حۆری بەهەشت؟! تۆ ئەو فریشتەی کە لە جەزای کردەوەی پڕ خێرت کە لە بەهەشتەوە کەوتوویتە سەر زەوی مەلا کەژاوەت ڕادەکێشێ و نادر لەبەر دەستتدایە و ڕازی نابێ کە پێیان بێژن شەیتان و بەشەیاتینی ناویان لێ بنێن.

پیرەمێرد هەڵەیەکی کردووە کە لە باری مێژووییەوە جێگای سەرنجە چونکە مەبەستی شێخ ڕەزا لە خەسرەو، خەسرەوی پەروێزی بەناوبانگە بەڵام کەیخوسرەو لە مێژووی ئێراندا کەیخوسرەوی پێشدادیە کە دوای کەیکاوس بووە بە شای ئێران. بەداخەوە شێخ ڕەزا نەمابوو دەنا وەڵامی دەدایەوە»

عەبدولقادری دەباغی ١٩٨٧

## پیرەمێرد و چەند شیعرێکی موحتەشەمی کاشانی

پیرەمێرد لە ژمارە ٤٦٥ی (ژیان)ی ساڵی ١٩٣٦دا، بۆ مەبەستی بەراوردکاری چوار شاعیر، کە هەر چواریان، چوار شیعریان بۆ یەک مەبەست وتووە، ئەویش کۆچکردنی خۆشەویستەکانیان بووە. شاعیرەکان بریتی بوون لە:

١- عەبدولحەق حامدی (تورک).
٢- موحتەشەمی کاشانی (فارس).
٣- حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە (گڵکۆی تازەی لەیل).
٤- شیعرێکی عەرەبی کە ناوی شاعیرەکەی نەنووسیوە.

شیعرەکەی موحتەشەم لە لایەنی بەند و کێشەوە پێنج بەشە. بەیتی یەکەم و دووەم بەندێکە، سێیەم و چوارەم و پێنجەم بەندێکە، شەشەم بەندێکە، حەوتەم بەندێکە.

شیعرەکەی موحتەشەم و وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد بەم جۆرەیە:

«اهل حرم دریده گریبان گشاده مود
فریاد بر در حرم کبریا شود
روح الأمين نهاده بزانو سر حجاب
تاریک شد زدیدن او چشم آفتاب
چون خون زحلق تشنهء او بر زمین رسید
جوش از زمین بەذروهء عرش برین رسید
نخل بلند اوجو خسان بر زمین زدند
طوفان بەآسمان زغبار زمین رسید
باد آن غبار را بمزار نبی رساند
گرد از مدینه فلک هفتمین رسید
هست از ملال گر چه بر ذات ذو الجلال
او در دل است و هیچ دلی نیست بی ملال
ترسم جزای قاتل اوچون رقم زنند
یکباره بر جریدهء رحمت قلم زنند

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

ئەهلی حەرەم بەپرچی بڕاو و یەخەی دڕاو
شینیان گەیشتە عەرش و ئەویش سۆڕی کەوتە ناو
(روح الأمين) سەری لەسەر ئەژنۆ بوو شەرمی کرد
تاریک و لێڵ بوو ڕۆژ کە تەماشای ئەوی کرد
ئەو گەرووە وشکە خوێنی ڕژا، کەوتە سەر زەمین
جۆش و خرۆشی خاک گەییبە بارەگای بەرین
ئەو نەو نەمامەیان کە بەسەر خاکدا ڕماند
گەردی غەمی بەحەو تەبەقەی ئاسمان گەیاند
ئەو گەردەلوولە با سەری خست گەییبە پێغەمبەر
یەکسەر لەوێوە گونبەدی ئەفلاکی گرتە بەر
هەرچەندە خوا لە غەم بەرییە و غەم دوورە لەو
جێی ئەو دڵە و دڵیش غەمی تیایە دەگاتە ئەو



ڕەنگە لە کردەوەی بەدی قاتل بخوێننەوە
تۆماری ڕەحمەتی هەموو عالەم بپێچنەوە[1]

(١) پیرەمێرد ئەگەرچی ئەم شیعرەی موحتەشەمی بۆ شیوەن هێناوەتەوە بەڵام موحتەشەم لێرەدا شیوەنی هاوسەر، یاخود خۆشەویستەکەی ناکات بەڵکو شیعرەکەی بۆ شەهید بوونی کارەساتی کەربەلا و شەهید بوونی (حسين) وتووە. وە لە مەبەستی پیرەمێرد دوور دەکەوێتەوە. بەڵام پیرەمێرد دیارە هەر نیازی لە بابەتی شیعرەکە بووە کە (شین)ە.

***

## وەرگێڕانی شیعری دووەمی موحتەشەم[1]

پیرەمێرد لە پێشەکی ئەم شیعرەدا نووسیویە:

«مندااڵ بووم، لای مەلا حسێنە گۆجە ئەم خوێند، باوکم ساڵێکیان لە کەربەلاوە دوازدە بەندی شیوەنی (محتشمی کاشانی) بۆ ناردبووم، ئەوەندە بەسۆزە ئێستایش لە بەرمە تەنانەت پار کردبووم بەکوردی».

خوایە، چە شۆڕشێکە؟ کە بۆ جملە عالەمە!!
دیسان چە نەوحەیەک و تەمێک و چە ماتەمە؟
دیسان چە شیوەنێکە؟ چە مەحشەرێکە؟ ڕووی زمین
بێ دەنگی صور هەرای لە سەرای عەرشی ئەعزەمە
گوایە کە خۆر لە خاوەری خوارو هەڵات کەوا
ئاشووبی شیوەنێکە، قیامەت بڵێی مە
ناوی بنێم، قیامەتی دنیا، ئەڵێن بەڵێ
ئەم مانگی شینە، وا ڕەشە، ناوی موحەڕڕەمە
دیوانی خوا کە جێی خەفەت و خەم نییە لەوێیش
پۆلی فریشتە، سەر لەسەر ئەژنۆی عەزا و خەمە
جن و مەلەک، بەشیوەنی ئێمە لە گریەدان
بۆ ماتەمێکی ئەشرەفی ئەولادی ئادەمە
ڕووناکی ئاسمان و زەوی ڕۆژی مشرقین
باوەش نشین و ڕیشەی جەرگی (بنی) حسین

(١) ژین ژمارە -٨٤٩- ساڵی ١٩٤٦ .

پیرەمێرد دوای ئەم شیعرە وەرگێڕراوە، شیعرێکی فارسی خۆی دەنووسێت، ئێمە شیعرەکە

دەنووسین و مانای لێک ئەدەینەوە:

پیرەمێرد، بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

«خۆیشم لە قەسیدەیەکی فارسیدا کە تەسویری سینەمای دەورانم کردووە، هەموو پێغەمبەرەکان، لە سەحنەدا حاڵەتی دنیای خۆیان پێنیشان داوە، تا هاتۆتە سەر زەمانی پێغەمبەر لەوێدا لە شەرەفی ئەوەوە سەحنەی سینەما هەڵگیراوە و وتوومە:

انگە زمین منزلت اشرف رسول
بر خورد صحنه لیک نهان گریه ء بتول
هوشم ربود ولرزه در آفتاد بریدن
از بانگ وا حسین فلک گشت نوحه زن
آن ماجرا کە رفت بر اولاد مجتبی
چون گویم آن گروه بود از قوم مصطفی؟
صد آخرین به محتشم، محتشم کە گفت
شد سبحه ء کف ملک آن گوهری کەسفت
ترسم جزای قاتل اوچون رقم زنند
یکباره بر جریدەی رحمت قلم زنند

مانای شیعرەکان:

لە شیعری هەوەڵ هەروەک پیرەمێرد خۆی دەڵێ، سەحنەی شینەکەی گۆڕیوە و بەبەرەکەتی هاتنە سەر دنیای پێغەمبەری مەزنی ئیسلام، شێوەی شین بەخۆشی و پێکەنین دەگۆڕێ، بەڵام لە هەمان کاتدا (بەتوول) واتا حەزرەتی فاتمەی کچی پێغەمبەری مەزن بەنهێنی دەگری و فرمێسک دەبارێنێ. لە شیعری دووەمدا: چاوپێکەوتنی ئەو سەحنە واتا ئەسرینی حەزرەتی فاتمە، پیرەمێرد سەرسام دەکا و هۆشی لێ دەستێنێ و (چوارچێوەی) لەشی دەخاتە لەرزین و بەگوێی دڵ هاواری (حسین ڕۆ) لە هەموو سروشتدا دەبیستێ. لە شیعری سێیەمدا دەڵێ: ئەو کارەساتە دڵتەزێنە کە بەسەر ئەولادی (حەزرەتی عەلی)دا هات، من چۆن ئەو قاتڵانە (دارودەستەی یەزید) بەخزم و نزیکی پێغەمبەر بزانم؟!

لە شیعری چوارەمدا: پیرەمێرد ئافەرین لە (محتشمی کاشانی) شاعیری تازەبێژی دەرباری سەفەوییەکان دەکا و دەڵێ: ئەو شیعرەی (محتشم)ە، بووە بەزیکری مەلایەکە و تەسبیحاتی پێدەکەن، کە وتوویەتی:

شیعری پێنجەم: هەر شیعرەکەی (محتشم)ە، کە پیرەمێردیش دووپاتی دەکاتەوە و دەڵێ: دەترسم لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێ کە سزای قاتڵەکانی حەزرەتی حوسەین دەنووسن و ڕای





دەگەیەنن، غەزەبی خوا وا بێتە جۆش کە ئیدی دەفتەری بەخشین و ڕەحمەت بپێچنەوە و کەس نەبەخشن».

ئنجا مامۆستای فارسی زانی شارەزا (عەبدولقادری دەباغی) سەبارەت بەشیعرەکانی، پیرەمێرد، دەنووسێت «شیعرەکانی پیرەمێرد لە باری شیعرییەوە بەرزن، بەڵام شەقڵی کوردییەکەی پێوە دیارە و ناگاتە ڕادەی شیعری سەعدی یا حافز بەتایبەتی کە ئەدەبیاتی فارسی سەد ساڵ لەمەوپێش هێشتا لەژێر دەسەڵاتی ئاخوندەکاندا دەیناڵاند، چونکە لە سەرەتای دەسەڵاتی سەفەوییەکانەوە تا سەرەتای دەوری مەشرووتیەت نزیکەی چوارسەد ساڵ لە ئەدەبیاتی فارسیدا بەدەورەی (فترەت) ناسراوە و لەو ماوە دوور و درێژەدا شاعیر یا زانایەکی نوێ نەهاتە مەیدان و تەواوی شیعر و ئەدەبیات بۆ نەوحە بێژی و تازیەباری و لە سینگ کوتان تەرخان کرابوو. پیرەمێردیش دیارە لەژێر تیشکی ئەو سەردەمەی ئەدەبیاتی فارسیدا ژیاوە. بەڵام لەم ئاخریەدا کە دیوانی شاعیرانی وەک، میرزادەی عەشقی، ئیرەج میرزا و بەهار و عارف و فەڕوخی دیوە. ئەگەر شیعری فارسی وەرگێڕابێ شەقڵی نوێخوازی و نوێبێژی پێوە دیارە».

پیرەمێرد، گەلێ شیعری بەفارسی وتووە و بەڵام زۆر کەمی لێ بڵاوکردۆتەوە و لە کاتێکدا کە لە تورکیا بووە، شیعر و نووسینی ناردووە بۆ هەر یەک لەم ڕۆژنامە و گۆڤارە فارسییانەی کە لە ئێران دەرچووە. وەک: ڕۆژنامەی (شمس) و (شەفەق سرخ) و گۆڤاری (فەرهەنگ). پیرەمێرد خۆی لەم بارەیەوە دەنووسێت «غەزەتەی کوهستان کە لە تارانی پایتەختی ئێران دەردەچێ، تا ئێستا نەمدیبوو، ئەم چەندانە، چاوم پێ کەوت، با بڵێم چاوم پێ ڕوون بووەوە، چونکو من مەفتوونی زبانی فارسیم و کاتێ لە ئەستەموڵ بووم گەلێ خزمەتی غەزەتەی (شمس)م ئەکرد، کە (سید حسینی ئێرانی) خاوەندی بوو. ئەو سەردەمە کە ڕۆژنامەی (شەفەق سرخ) و مجلەی (فەرهەنگ) لەتاران دەردەچوو، هەمیشە من لە ئەستەموڵەوە مەقالە و شیعرم بۆ ئەناردن. بەئیمزای (سلێمانی تۆفیق) یاخود (س.ت). هنگامی، هنگامەی تبریز و مەشرووتیەت و ڕەحیم خان چوە سەر (ستارخان) من لە (شەفەق سورخ)دا نووسیبووم:

هر خنجری کە برتن تبریزیان زنند
تبریز جان ماست کەبس بی امان زنند

ئێستا خوا بەرخورداری کا دکتۆر (اسماعیل ئەردەڵانی) کوهستانی سەربڵند دەردێنێ (البرزیکە) ئینشائەڵڵا ژینی (ژین)ی ئەبێ. کە بیست و یەک ساڵە و خۆیشی پیری پیرەمێردی ئاخر خێر دەبێ»[1]

هر خنجری کە برتن تبریزیان زنند
تبریز جان ماست کەبس بی امان زنند
سردار رحم کن جگر خویش میدری
باهوش باش بر سرداری و می بری

نامت رحيم و رحم نداری بهانه چيست
اين نام و نطفه ات بگمانم زمزس نيست

(١) ژين – ژمارە –٨٥٥– ساڵی ١٩٤٧ .

***

مانای شيعرەکان و چەند وشەيەکی پێشەکی:

پيرەمێرد لەگەڵ ڕۆژنامەی بەناوبانگی (شفق سرخ) واتا (ئاسۆی سوور) هاوکاری کردووە و تەنانەت لەکاتێکدا (ڕەحيم خان) کـە سـەرداری عـەشـرەتێکی ئازەربايـجانيـيـە لەلايەن شـای ئێرانەوە ئيجازەی پێ دەدرێ کە بچێتە سەر ئازاديخوازانی ئێران لە شاری تەورێز کە (ستارخان) سـەرداريان بوو و هەمـوويان بکوژێ، پيـرەمـێـرد لايەنگری خـۆی لە مـەشـرووتەخـوازانی ئێـران دەردەبڕێ و بەدڵسـۆزييـەوە دەڵێ: تەورێز گـيـانی ئێـمـەيە، واتا ڕۆحی ئازاديخـوازانە و هەر خەنجەرێکی لێ بدەن وەک لە گيانی گشت ئازاديخوازێکی بدەن وايە کە بەبێ بەزەيی دەيوەشێنن. لە بەيتی دووەمدا، دەڵێت: سـەردار ڕەحم بکە و بەزەييت بەخەڵکدا بێت، تۆ بەنەفامی جـەرگی خۆيشت دەدڕی، هۆشت هەبێ کە بەسەر دارەوەيت و لقی ژێر پێی خۆت دەبڕيتەوە. کـە خـۆيشت دەکەويتە خوارەوە و ملت دەشکێ. لێرەدا پيرەمێرد مامۆستايانە و دڵسۆزانە ئامۆژگاری دەکات و ئيشارە بەشيعرەکەی شێخی سەعدی دەکات.

بەڵام لە شيعری سێيەمدا تووڕە دەبێ و دەڵێ: ناوت ڕەحيمـە، بەڵام ڕەحمت نييە، بيانووت چييە؟! وابزانم ئەم ناوە و ئەم توخمە هی فارس نييە، لە توخمێکی بێگانە بووی.

لەڕووی شـيـعـرەوە ئەم سێ شـيـعـرەی بەرزترە لەوانی ديکەی و ئەوە دەگـەيەنێ کە پيـرەمـێـرد ئينسـانێکی ئازاديخـواز و ديموکـرات و دژی ملهـوڕی و هەر چەشنە ديکتـاتۆرييـەک بووە. سەرکەوتنی مەشرووتەخوازانی چ لە ڕۆم و چ لە عـەجەم بەلاوە بەسەرکەوتنی ئازادی و مرۆڤايەتی و فەوتانی زوڵم و زۆر و چەوسانەوە زانيوە و پێی شادمان بووە. ئەو هەستە پيرۆزە شيعرەکانی وەبەر دڵان خستووە. ئەينا لەباری شيعرييەوە ئەو چەن شيعرەی سەرکەوتوو نييە بەڵام دڵنيام کە شيعری فارسی پيرەمێرد زۆر و بەداخەوە فەوتاون، چونکە ئەو چوار دێڕەی کە سەبارەت بەشێنی دەشـتی کـەربەلا هۆنيـوەتەوە ئەوە دەردەخـا و ديارە کـە غـەزەلەکـە ناتەواوە و لە پێـشـدا چەن شيعرێکی ديکە هەبووە چونکە دەڵێ (انگە زمين) واتا ئەو وەختە بەپيرۆزی و فەڕی... لام وايە کە شيعرە پاشبەندەکەی (محتشم کاشانی) کردبێتە پاشبەندێکی خۆی و ويستوويەتی لاسايی يا پەيڕەوی شـێخ ڕەزای تاڵەبانی بکاتەوە. بەڵام زانيـويەتی کـە هاوتايی و بەرانبـەرکێ لەگـەڵ شۆڕەسوارێکی وەک شێخ ڕەزا کاری شاعيرە فارسييەکانيش نييە. بۆ وێنە غەزەلەکەی شێخ ڕەزا لەژێر سـەردێڕی «عـشق حـضرت حسين» لە لاپەڕەی (١١٢)ی ديوانەکەی، کـە لەلايەن (عـەلی تاڵەبانی) و بەچاودێری (فەتحـوڵڵا ئەسعـەد) چاپ کراوە، گەرچی پڕ هەڵەی چاپييە بەڵام گەر



بێت و بۆ بەرانبەرکێ لەگەڵ ئەو چوار شيعرەی پيرەمێرد هەڵی سەنگێنی، دەبێ پيرەمێرد وتەنی بێژين، کوجا مەرحەبا و يا بەفەرموودەی نالی پەتک و هەودايە.

عبدالقادری دەباغی ١٩٨٧ زايينی ١٣٦٦ هەتاوی

***

## پيرەمێرد و شيعرێکی مەستوورە (ماە شەرەف خانمی ئەردەڵانی)

لە سـاڵی ١٩٤٦دا پيـرەمـێـرد، لە يەکـێک لە نووسـينەکـانيـدا باسی ئەو ديوانە جـوانەی (مـەسـتـوورە) دەکات، کـە مـەسـتـوورە بەچە جـۆرە خـەتێکی جـوان نووسـيويەتيـيـەوە. هەروەها کـورتەيەکی ژيانی تايبـەتی و شـاعـيـرييـەتی. (مـاە شـەرەفـخـان) دەنووسـێت، لە کـۆتايی نووسينەکەيدا چەند شيعرێکی ئەو شاعيرەمان پێشکەش دەکات کە پەيوەندی بەخۆشەويستی نێوان مەستوورە و (خەسرەو خانی والی سنە)وە هەيە. بەداخەوە ئەو ديوانە ناياباەی کە بەو خەتە جوانە لای پيرەمێرد بووە و باسی دەکات، نازانين کەوتۆتە کوێ و لای کێيە؟! بەڵام وەک باسی دەکەن ئەو ديوانە و گەلێ دەستنووسی نايابی کتێبخانە چکۆلەکەی پيرەمێرد کەوتۆتە لای (شێخ محەمەدی خاڵ)، جگە لەو هەموو کتێب و دەستنووسە ناياباەنەی (نەجمەدين مەلا)، کە هەمووی گوێزرايەوە ماڵی شێخ محەممەدی خاڵ و وەک دەڵێن کتێبخانەکەی شێخ محەممەدی خاڵ دەريايە هەرچی تێکەوت دەرهاتنەوەی نييە!!

ئەوا ئەو کـورتە باسـە گـرنگەی پيـرەمـێـرد پێـشکەش دەکـەين و مـانای ئەو شـيـعـرانەی (مەستوورە)ش لێکدەدەينەوە کە بەفارسی نووسراوە.

## جەوهەری کوردی[1]

کـورد، کـە تازە ئەتوانين، ناو و ئاسـاری ئەدەبيـاتيـان بنووسين، سـەردەفـتـەری خـوێندەوارە بەرزەکـان و سـەرمـايەی فـەخـر و سـتـايشی کـوردان (ئەمين زەکی بەگ) ياخـوا مـەرگی نەبينم لەبەرەوە، بەرە بەرە، خۆمانی پێ ناسـيوين، وە مەرحـوومی جەننەت مـەکان (مەحـموود پاشای جاف)يش، هەر لە ساڵی (١٢٧٠)ەوە تا وەفاتی کردووە، هەرچی شاعيری کورد هەيە بەخەتی خۆی لە چەند کەشکۆڵێکدا کۆی کردۆتەوە. نيشان بەو نيشان ئەمڕۆ کەشکۆڵە گەورەکەی لای منە و بچکۆلەکەی لای حەسەن بەگی کوڕەزای.

هێشتا زۆری وامان هەيە بۆمان نەهاتۆتە نووسين. لە ميـانەی ئەوانەدا کچە کـوردێکی وەک تيشکی ڕۆژ لە ئاسمانی کوردستاندا بدرەوشێتەوە بەشيعر و، لە شيعرەکانی زياتر بەخەتی شکسـتی فـارسی، کـە ئەتوانم بڵـێم لە هەمـوو ئێـراندا وێنەی ئەو خـەتە جـوانە نەبينراوە. گەوهەرێکی شەوچراغی کوردستـانە، مەستوورەی ناوە، بەش بەحاڵی خۆم کە خەتی فـارسی تعليق و شکسـتـەی و خـەتی ديوانی و (ثلث) و تورکی و چی و چی باش ئەنووسم و لە

جوانیەکەی زیاتر شارەزای قاعدە و سەبک و شێوەیانم ناگەمە پایەی نووسینی مەستوورە و شیعرەکانیشی زۆر باڵایە. چەندێک بەرە بەرە لە (ژین)دا کردوومە بەکوردی بۆ ئەمەی دوای من یەکێک لە (ژین)دا کۆیان بکاتەوە، لە چاپی بدا. ئەم مەستوورەیە بەپرسیار کەمێکی شارەزا بووم، ناوی (ماه شەرەف خانم)ە و ئەسڵیان لە نەوەی (سلێمانی ئەلیاس ئاغای گەورەن) و لە سلێمانییەوە چوونەتە (سنە) و لە شیعرەکانیا وا دەرئەکەوێ کە مەربوتیەتی یا عەشق و عیلاقەی بەخەسرەو خانی والی (سنە)وە هەبووە بەڕیوایەتێک سکرتێری والی بووە. بەماڵی شیعرەکانی ژنی بووە. لە بەیازەکەدا لە پێشەوە بیست و پێنج غەزەلی لە بەحری (ئەلف)ەوە تا بەحری (سین) لە ئەشعاری خەسرەو خان نووسیوە، دوای ئەو لەژێر سەرلەوحەی (من افکار مذینە الراقمە)دا دیوانی خۆی بەو خەتە جوانە نووسیوەتەوە. ئەگەر بمێنم ئەو خەتە بەفتۆگراف ئەکەم بەکلێشە و چاپی ئەکەم بۆ ئەوەی فێری مەشقی ئەو خەتە بێن.

ئەو خەتە لە ئەوەڵ دێڕیەوە تا دوایی دێڕی یەک نەسەق و یەک ڕەنگ کەلیمەیەک و حەرفێکی ناڕێک و غەڵەتی تیا نییە. دوایی شیعری دەربارەی خەسرەو خان ئەڵێ:

کی رەد هندم در بزم خسرو
خاصان حضرت خدام درگاه

لەجێیەکی تردا ئەڵێ:

«گر خسروم از مهر دهد بار بەمشکو
خندە بەبساط جم و کی میکنم امشب»

یەکێکی تر:

گرم خسرو چو شیرین از وفا پاپست ننمودی
بە عالم خویش را رسواتر از فرهاد میکردم
گرم زان خسرو خوبان پیامی باد آوردی
بە مژدە جان شیرین را نثار باد میکردم

مانای شیعرەکان:

لە شیعری هەوەڵەوە وا دەردەکەوێ کە مەستوورە حەزی لە خەسرەو خانی والی کردووە و ڕەنگە دڵداری یەکتر بووبن و وا دەردەکەوێ کە ئەم شیعرە سەرەتای غەزەل یا قەسیدەیەک بێ کە ئارەزووی دڵی خۆی بۆچوونە لای خەسرەو خانی تێدا دەربڕیوە و سکاڵای لە هاونشینەکان و دەرگاوانەکانی خەسرەو خان کردووە کە دەڵێ: کەی ڕێگەی من دەدەن بچمە نێو بەزمی خەسرەو، هاونشینەکانی تایبەتی و پیاوە دەرگاوانەکانی.

لە شیعری دووەمدا دەڵێ: ئەگەر خەسرەو لە ڕووی خۆشەویستییەوە ڕێگام بدا بۆ کۆشکی



تایبەتی خۆی، ئیدی ئەمشەو لە خۆشیاندا بەبەزمی جەمشیدی جەم و کەیکاوس پێدەکەنم.

لە دوو شیعری غەزەلی سێهەمدا دەڵێ:

ئەگەر خەسرەو چەشنی شیرین پێی نەدەبەستمەوە، لە دنیادا خۆم لە فەرهاد ڕیسواتر دەکرد. لێرەدا ئیشارە بەهەقایەتی شیرین و فەرهاد دەکات. لە شیعری ئاخردا تامەزرۆیی خۆی بۆ وەڵامێکی خەسرەو خان دەردەبڕێ و دەڵێ: ئەگەر (با) لەلایەن ئەو خەسرەوی چاکانەوە پەیامێکم بۆ بێنێ، گیانی شیرینم لە مزگێنیدا، وەک قوربانیی پێشکەشی با ئەکرد. وشەکانی شیرین و خەسرەو و فەرهاد جیناسێکی جوانە کە بەوەستاییەکی بێ وێنەوە بەیانی کردووە.

---

(١) ژین ژمارە٨٣٣ ساڵی ١٩٤٦

***

## شەوقی چرا

پیرەمێرد لە ساڵی (١٩٤٩)دا ئەم شیعرەی بڵاو کردۆتەوە. وە لە دیوانی پیرەمێردی نەمری، مامۆستا هاواردا (لە لاپەڕەی ٢٢٣)دا چاپکراوە، وە بەشیعری پیرەمێرد دانراوە. بەڵام ئەگەر بەوردی تەماشای شیعرەکە بکەین ئەبینین وشە و سەبک و شێوەی شیعرەکە و تەنانەت بابەتەکەی زۆر نزیکە لە شیعرێکی فارسییەوە. بۆ ئەم مەبەستە کەوتینە پرسیار بۆ دۆزینەوەی دەقە فارسییەکە، بەڵام بەداخەوە لەبەر نەزانینی ناوی شاعیرەکە نەماندۆزیەوە. پیرەمێرد شیعرەکەی لە ژمارە ٩٧٩ی (ژین)ی ساڵی ١٩٤٩دا بەناوی (ئەحەی جاو)ەوە بڵاو کردۆتەوە. هیواداریین لە داهاتوودا بەهۆی دڵسۆزی ئەدەب دۆستانەوە دەقەکەمان دەست کەوێت:

فەزڵ و هونەر لەناو تەم و غەمدا دیار ئەبێ
شەوقی چرا لەگەڵ شەوی تارا بەکار ئەبێ
پووشینی ڕەش بەدەوری سەری قیبلەما گەڕا
بەختی ڕەشم لە قینی ئەوە داغدار ئەبێ
میحراب لە ڕاستی تاقی بڕۆی ئەو چەمایەوە
پشتی شکاو و کۆم بەدیوار ئیستوار ئەبێ
چاوم لە دانە نەبووە، بەدانەی ئەزەل قەسەم
پێم بۆچ بەدوای دانە گرفتار و خوار ئەبێ؟
میوە کە کاڵ و ڕەق بێ، لقی بەرزە تەختگای
دەردی تەکاملە، کە گەیی خاکسار ئەبێ

مانگ تا هەموو شەوێ هەڵێ، بێ قەدرە لای عەوام
کە کەوتە پەناوە بۆی ئەگەڕێن تا دیار ئەبێ
نان لای خوا براوەتەوە ڕوو لە کەس مەنێ
هەرچی کە نانی منەتی خوارد شەرمەزار ئەبێ

***

## پەچەت لادە

پیرەمێرد لە ژمارە ٩٩٥ی ساڵی ١٩٥٠ی ڕۆژنامەکەیدا، ئەم شیعرەی بڵاو کردۆتەوە. بەبێ ئەوەی هیچی لە بارەوە بڵێ، وەک ناوی شاعیر، سەرچاوەی شیعرەکە! ئێمە ئەم شیعرە بەوەرگێڕاوی شیعرێکی فارسی دەزانین، هەتا دەقە فارسییەکەیمان دەست دەکەوێت، ئەوا وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد دەنووسین:

پەچەت لادە، لەڕوو، بنوارە ڕۆژی حەشری حەسرەتکار
لە حەشرا ترسی ئاگر، لێرە شەوقی ئاگری ڕوخسار
کە بێیتە باخەوە ئاگر دەخەیتە جەرگی گوڵ ئەوسا
پەڕەی گوڵ دەبنە پەروانە بەدەورتدا وەکو پرگار
کە دەنگی تۆم لە گوێ بێ وەک غەرامەوفەون ڕەگی ڕۆحم
وەری ئەگرێ و شەوی تەنهایی دیسان بۆ ئەکا تکرار
کە شانەم دا لە ڕیشم بۆنی عەتری لێ دەهات زانیم
کە شانەیش وەک خەیاڵم ڕێی کەوتبووە زوڵفی یار
بەبێ حسی جەمال ئاوێنە عەکسی ناگرێ هەر من
ئەوا ئاوێنەی دڵ عەکسی تۆ ئەنوێنی جاروبار
کە من تۆم بێ ئیتر بەسمە هەموو دنیا لەلام پەشمە
لە هەشت باخچەی بەهەشتم چی، من و ژوورێکی چوار دیوار
هەوام ناوێ، هەوام دێنێ، کە تەنها دوورم و تەنها
مەبە مونس بەتەنها ئینس و (تصحیف) تاتەشە زینهار

***

## نەعتێکی سەنایی

پیرەمێرد وەرگێڕانی ئەم نەعتەی (سەنایی) شاعیری گەورەی سۆفی، لە ژمارە ٩٩٣ی ساڵی ١٩٤٩ی ڕۆژنامەکەیدا بڵاو کردۆتەوە، دەقی فارسییەکەی نەنووسیبوو، هەروەها سەرچاوەکەیشی دیاری نەکردبوو هەتا وەدەستی بخەین.



ئەی تاج بەخشی ئەنبیا، ئەی نووری دیدەی ئەصفیا
ئەو ڕۆژەی تیا ئەدرێ جەزا، بۆ عاسیان هەر تۆی پەنا
ئەحکامی تۆ، (حبل المتین)، ئاینی تۆ، ڕێگای یەقین
تۆی (رحمة للعالمین)، هەر تۆی ئیمامی ئەنبیا
خوا کە فەرموویەتی (لولاک) دیارە کە تۆی مایەی ئەفلاک
بە (الم نشرح)، سینەت پاک، گیانی منت ببێ فیدا
نووری چاوی ئادەم هەرتۆی، ژەنگی دڵی ئومەت ئەشۆی
لە گوڵ جوانتر بەڕەنگ و بۆی، هەڵبژاردەی سنفی خودا
کردگاری جان ئافەرین، خۆی بەتۆی فەرموو ئافەرین
بەهیوای ڕجای تۆ ئەژین، بۆ دەردی دڵمان تۆی دەوا

***

## پیرەمێرد و شیعرێکی شامەزهەر

ئەم شیعرە وەرگێڕراوە دووجار بڵاوکراوەتەوە، جاری یەکەم لە ژمارە ٣٨٠ی ڕۆژنامەی (ژیان)دا لە ساڵی ١٩٣٣، جاری دووهەم لە دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاواردا لاپەڕەی ٢١٨.

پیرەمێرد لەسەردێڕی شیعرەکەدا نووسیویە (پەیڕەوی شامەزهەر) بەڵام وەک ئێمە پرس و ڕامان لە بارەیەوە کرد بۆمان دەرکەوت کە پیرەمێرد دەقاودەق وەری گێڕاوە. وە شیعرەکەش یەکێکە لە شیعرە بەناوبانگەکان و شاعیرەکەش هەروەها.

بە ڕووپۆشینی تۆ، ڕۆژم شەوەزەنگێکە تیرەوتار
وەکو تاوس کە هەوری دی، ئەناڵێنێ، بەگریە و زار
پەچەت ڕوخساری داپۆشیت و من دەردم گرانتر بوو
بەڵێ دیارە کە ڕۆژئاوا بوو، دەردی قورس ئەبێ بیمار
ڕەگی ڕۆحم بەدیدەی تۆوە پەیوەستە و بەسەرمەستی
بە سەد لادا تەراندت، ناپسێ سەختە وەکو بزمار
لە دەوری بێستووندا، شەو کە دەنگێکی بەسۆز ئەبیەی
ئەوە گیانی منە، بۆ بێکەسی فەرهاد ئەکا هاوار
لە دوجەیلا کە ناقەی مەحمەلێکم دی ئەڵێم لەیلە
بەرەو پیری دەچم، ئەشعاری قەیسی بۆ دەکەم تیکرار
لە جێی قەید خرەی زنجیری شێتیم هێند لەلا خۆشە
لەگەڵ جولام زرەی زنجیرەکەم، پڕ دەکا دەر و دیوار

ئەگەر شێتی تەواو شێت بی، لەلایان هێندە ماقوولی
بەری پێت ماچ ئەکەن دڕکی بیابان و سوپاهی خار
بە پەنجەی نازکی دولبەر، تەلی بێ گیان ئەناڵێنێ
منی زیندوو بەدەنگی چۆن نەکەم سۆری جنون (اظهار)
ئەمانە شیعری مۆدەی کۆنە، وەک من پیر بووە ئێستا
نە شیدەت بۆ وەتەن بێ باشە، بەڵکو پێی ببێ ڕزگار
هەموو عالەم لە دووی ئازادی وێڵە بۆچی من وەک شێت
کەمەندی زوڵف لە ئەستۆی خۆم خەم، ببمە کەری ژێر بار

***

## عەشقی ڕاست

پیرەمێرد دووجار ئەم شیعرەی وەرگێڕاوە و بڵاوی کردۆتەوە. جاری یەکەم حوزەیرانی ١٩٣٥ . جاری دووەم، حوزەیرانی ١٩٤٤ .

جاری یەکەم ناوی ناوە (عەشقی ڕاست) و نووسیویە کە (شیعری مەولانا خالد)ە و سێ بەیتی فارسی دەقی شیعرەکەی مەولانای لە تەکدا نووسیوە. جاری دووەم ناوی ناوە (فەلسەفە) و ناوی شاعیرەکەی نەنووسیوە. جاری یەکەم شەش بەیتە و جاری دووەم هەشت بەیتە، لە دیوانی مەولانا خالدی نەقشبەندی (مەلا عەبدولکەریمی مدەڕس)دا، ئەم شیعرەمان بەرچاو نەکەوت.

**عەشقی ڕاست**

چو مجنون شد بەخلوتخانەء خاک
ندا آمد براو از ایزد پاک
کە ای مجنون چە آوردی بدرگاه
بر آمد ازدل مجنون یکی آه
کە چندان شوری لیلی درسرم بود
کجا پروای روز محشرم بود

وەرگێڕانی ١٩٤١:

کە مەجنوون کەوتە خەڵوەتخانەیی خاک
نیدایە هات لە قوببەی بارەگای پاک
وتی شێتەکە دیاری کردەوەت کوا؟
سەرێکی هەڵبڕی ڕووی کردە لای خوا



وتی تۆ خۆت ئەزانی شۆری لەیلا
سەری وا گێژ و بژ کردم لە مەیلا
نە بیری ڕووی جیهانم بوو نەمەحشەر
خەیاڵم عەشقی لەیلا بوو سەرانسەر
لە لای خوا خۆش بوو ئەم جوابە ڕەوانە
بووە ئەستێرە بۆ ئەم ئاسمانە
چە خۆشە شۆڕشی ئەم عەشقە پاکە
بەڵێ عەشقێ کە پاک بێ دیارە چاکە

وەرگێڕانی ساڵی ١٩٤٤

کە مەجنوون، دوایی هات و کەوتە توێی خاک
لێیان پرسی فریشتەی یەزدانی پاک
ئەرێ شێتەکە، دیاری کردەوەت کوا
سەرێکی هەڵبڕی، ڕووی کردە لای خوا
وتی تۆ خۆت بەشۆری عەشقی لەیلا
سەرت واگێژ و وێر کردم لە مەیلا
نەبیری خۆم و دنیام بوو نە مەحشەر
سەر و دڵ پڕ لە لەیلا بوو سەرانسەر
لەلای خوا خۆش بوو ئەم واتەی ڕەوانە
بووە ئەستێرەیەک لەم ئاسمانە

لەوە دەچێ شیعرەکە لێرەوە شیعری پیرەمێرد بێت:

منیش خۆزگە لە عەشقی نیشتمانا
بە کردەوەی خۆم نەزانیایە لە مانا
بەڵێ، مەجنوون کە ئەستێرەی سەمایە
جیایە، وێڵی، لەیلێی بەهایە
هونەر وایە کەسێ کە مەرد گوزین بێ
بە چاکە و خزمەت ئەستێرەی زەمین بێ

***

## نەعتی فارسی بەکوردی[1]

ئەی پادشاهی خاوەری ژێر بورجی تەجەللا
قەسرت فەلەکە پاڵ ئەدەیە عەرشی موعەللا

خەتمی هەموو پێغەمبەر و ڕێ دۆزەرەوەی خوا
شابازی (دنیّ) کەوتیە ئەوجی (فتدلیّ)
هەندێ لەبەیانی شەوی میعراجی تۆ (والنجم)
بادت بووە (بس) و بەیداخی (فتحنا)
سوێندێکە بەمووی ڕیش و سەرت ئایەتی (والليل)
(والشمس)ی بەڕۆی تۆ وتووە باری (تعالی)
تاجی سەرە (حاميم) و کەوات نوری (مزمل)
شەرحت بە(الم نشرح)، ئەلقابتە (طه)
قەد سەروی ڕەوانی لەبی ڕووباری (مدثر)
میحرابی برۆیشت، بووە (قوسين أو ادنی)
شایانی بەرت خەلعەتی (لولاک ولعمرک)
دەربانی دەرت (يوشع وذوالكفل ومسيحا)
نەختێکی لە جەمالت گەیبیە (تەلعەتی یوسف)
ئەو ئاگرە بوو خستیە ناو گیانی زلیخا
کرنۆشی فریشتە کە ئەیانبردە بەر ئادەم
بۆ گەوهەرەکەی تۆ بوو لەناو جەبهەی ئەودا
(یونس) لە شەتی موسڵدا نەخنکا بەهەوای تۆ
ڕسگار بوو لە تەنگانە کەوا ماسی فریو دا
موسا بەعەسای هیممەتی تۆ نیلی دوو لەت کرد
بەو هیممەتەوە سیحری بەتاڵ کرد (یدی بیضا)

................................

(١) ژین ژمارە (٩٥٢) ساڵی ١٩٤٩

***

## پیرەمێرد و شەش چوارینی بابا تاهیری هەمەدانی (عوریان)[١]

پیرەمێرد شەش چوارینەی بابا تاهیری وەرگێڕاوە و پێشەکییەکی کورتی بۆ نووسیوە، پێشەکییەکەی لە کتێبی دیوانی بابا تاهیری (ڕەزا تۆفیق)ەوە وەرگرتووە، کە بەتورکی چوارینەکانی بابا تاهیر و خەیامی لە بەرگێکدا لە چاپداوە.

پیرەمێرد نووسیویە «ڕەزا تۆفیقی فەیلەسوف و زۆر شاعیر، دیوانی بابا تاهیری تەرجەمە کردووە بەتورکی، لە ئەستەموڵ تەبع کراوە، لەگەڵ چوار خشتەکی خەیام پێکەوە لە بەرگێکدان. ئەبێ ئەمین زەکی بەگ ئەوەی بەرچاو نەکەوتبێ. ڕەزا تۆفیق زۆرجوانی تەرجەمە کردووە، جا



نازانم شێوەی کوردییەکەی بەهۆی کوردێکی سلێمانییەوە حەل کردووە یا هەر خۆی شارەزا هەموو زمانێکە. ئەسڵی شێوەکەی (ڕاجی)یە. ڕەزا تۆفیقیش بەزبانی (ڕاجی) داناوە و (ئازەری) خاوەنی ئاتەشکەدەکەیش هەر بەڕاجی داناوە و بەهەمەدانی ئەناسێ و تەخلوسی شیعری (عوریان) بووە.

ئازەر ئەڵێ: بابا طاهر دێوانەیەکی فرزانە و هەمەدانییەکی هەمەدانە. بەعاشقی شەیدا ناوبراوە. لکی تەئریخی پیشەی من نییە، ئەوە خوا بەئەمین زەکی بەگی داوە. تەنها ئەمەندە ئەزانم کە بابا تاهیر برای (شێخ عەلییە کۆسەی دۆڵپەموو)ە و کەراماتی زۆر بووە!. ئیتر بەشی من لە شیعرەکانیایە، وا ئەیگێڕمە سەر شێوەی خۆمان:

١

چە خۆشە، خۆشەویستی، هەردوو سەر بێ
بە یەکسەر خۆشەویستی دەردی سەر بێ
ئەگەر مەجنوون دڵی شۆڕێکی تیا بوو
دڵی لەیلا لەوە شۆڕیدەتر بێ

٢

نەسیمێ لەو پەرێشان کاکۆڵە دێت
گەلێ خۆشتر لە بۆنی سونبوڵە دێت
خەیاڵی تۆیە شەو دەیگرمە باوەش
لە دۆشەکما، بەڕۆژ، بینی، گوڵە دێت

٣

من و عەشق و دڵێکی گێژ و وێژێ
کە برژانگ لێم ئەنێم، لافاو ئەڕێژێ
دڵی عاشق بەداری تەڕ ئەشوبهێ
سەرێ سووتا، سەرێ خوێناو ئەڕێژێ

٤

گوڵاڵەی کۆهساران هەفتەیەکە
وەنەوشەی جۆبیاران هەفتەیەکە
لەناو شاری دڵاندا جاڕ دراوە
وەفای سیمین غەداران هەفتەیەکە

٥

بەلایە دڵ، بەلایە، دڵ بەلایە
گوناهی چاوە، دڵ وا مویتەلایە
ئەگەر چاو ڕوومەتی شیرین نەبینێ
لە کوێ دڵ تووش ئەبوو بەو هەڵوەلایە

٦

کە زوڵفی تۆ لەگەڵ ڕووت بوو بەهاوەڵ
بەسەر گوڵدا پەرێشان ماوە سونبول
ئەزانم بۆچ لەسەر ڕووتدا بڵاوە
کە هەر داوێکی، داوێ دانێ بۆ دڵ

(١) ژین ژمارە ٦٠٣ی ساڵی ١٩٤٠

***

## پیرەمێرد و نۆ چوارینەی خواجا عبیداللەی ئەنصار[1]

ساڵی ١٩٤٧پیرەمێرد نۆ چوارینەی خواجای وەرگێڕاوە، بەڵام دەقەکانی لە تەکدا تۆمار نەکردوون، هەتا ئێمەش بیاننووسینەوە و بەراوردیان بکەین:

١

خوایە ئەوی من لە تۆم ئەوێ ئەیزانی
لام داوە لە زینەتی جیهانی فانی
بێ قەدرە لەلام دەبدەبەی شاهانی
خانەی دڵم چاوەڕێیە بۆ میوانی

٢

هەر چەندە کە تەنگەتاوی ژێر باری جەفام
بەم بارەوە سابر و ڕەزامەندی خودام
هەر چۆنی بێ بەس نییە لە نامەردان دوورم
نائەهلم ئەگەر لەلا بێ، مەرگ خۆشە لەلام



٣

کەوتوومە کەمەندی گەردشی دنیاوە
دوو حەلقەیە دەست و پێمی پێ بەستراوە
شەو کەوتوومە ناو کۆڕی قومار و مەستی
ئەم عومرە عەزیزە سەیری چۆن دۆڕاوە

٤

ڕێی بێ ئەدەبی ونە، بەجایی ناگا
دوورڕێکە ئەدەب بەدەس گەدایی ناگا
پێ پلیکەی تەختی پادشاهی ئەدەبە
تاجێکە بەغەیری پادشاهی ناگا

٥

یادت بوو بەهامدەمی دڵی غەمگینم
تۆی تیا نەبێ هەرچی کە هەیە نایبینم
فریادمە یادی تۆ بگاتە فریام
شەمعی غەمی تۆیە شەو لەسەر باڵینم

٦

لای من سەرو سەودای کە، کەسی تر نابێ
ڕێی عەشقە کە پەروای کە کەسی تر نابێ
ڕێت کەوتۆتە ناو دڵم ئیتر من بەسمە
دڵ پڕ لە سەفایە جای کەسی تر نابێ

٧

تێکەڵ مەبە بەم خەڵکە نەوەک مەغروور بی
گیرۆدەی خەڵکی ببی، ئەبێ لەو دوور بی
ڕازی دڵت بەکەس مەڵێ، بێ هوودەیە
هیچیش لەکەس مەخوازە نەوەک مەغفوور بی

**٨**

دەنكێ گەنمی کەست کە لە گەردندا بێ
قەسرت لە بەهەشتا کە لەکردندا بێ
ئەو قەسرە ئەڕووخێ بەپەلێ (حق الناس)
زۆردار ئەبێ بەختی لە سەر و بندا بێ

**٩**

بە فەقر و بەلا کە هاونشینت کردم
بێ خزم و کەس وکار و قەرینت کردم
فەرمووت ئەمە جێی ئەوەیە خۆشم ئەوێی
چاکەم چییە؟! وا گردەنشینت کردم

(١) ژین ژمارە ٨٧٨ی ساڵی ١٩٤٧

***

## چوارینەیەک لە فارسییەوە

پیرەمێرد ئەم چوارینە و گەلێ شیعری لەو بابەتەی ناو ناوە (شیعری کۆنی عاشقانە)، سەرچاوەی ئەم چوارینەیە و ناوی شاعیرەکەی نەنووسیوە، تەنها وەری گێڕاوەتە سەر کوردی:

«ئەگەر بێ ئاهێ هەڵکێشم وەکو بەرگی گەلاڕێزان[1]
لە سینەم دەردەهێنێ پارچە پارچەی جەرگی سووتاوم
ئەوەند پڕ ترس و بیمە تەهلەکەی وای تیایە کووچەی عەشق
کە مەرگیش ناوێرێ ڕوو بکاتە عاشق، بۆیە وا ماوم!»

(١) ژین ژمارە ٨٩٥ - ساڵی ١٩٤٧

***

## پیرەمێرد و چوارینەکانی (شێخ سەعید ئەبولخەیر)

پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٤٨دا، شەست و پێنج چوارینەی شاعیری سۆفی (شێخ سەعید ئەبولخەیر)ی لە فارسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر کوردی. هەر چوارینێک، دەقەکەی و بەرامبەری وەرگێڕانەکەی، نووسیوە. هەروەها پێشەکییەکی جوانی بۆ ناسین و بەرهەمی ئەم شاعیرە سۆفییە نووسیوە. لەم دیوانەدا ئەو پێشەکییە و دەقی شیعرەکان و وەرگێڕانەکانی پیرەمێرد دەخەینە پێش چاوی خوێنەران:



«زۆر دەمێک بوو ڕوباعیاتی شێخ سەعیدی ابوالخیرم لەم لاو لەولا ئەبیست، یا لە هەند گۆشەی بەیاز و کەشکۆڵدا بەرچاوم ئەکەوت. لە دوو سێ جیهەتەوە، تەئسیری ئەکردە دڵمەوە، جارێ لە نوقتەی ئەدەبیاتەوە، هەندێ نوقتەی وای تیایە من لە هیچ شاعیرێکی ترم نەبیستووە. دوای ئەوە هەندێ موناجاتی هەیە، سەرانسەر مەعنەویات و ئیلاهیاتە، کە ئەگەر کەسێ بەدڵ و دەروونێکی پاک بیخوێنێتەوە لە بارەگای خوادا، دەنگ ئەداتەوە و فریشتەکانی عالەمی باڵا ئەبنە هاوناڵە و هاودەنگ، لەبەر ئەوەیە کە دەستەیەک لە ئەهلی ئیمان بۆ هەر مەرامێکی دنیا بێ، ڕوباعییەکی ئەویان داناوە کە ئەگەر ئەوەندە جارە بیخوێننەوە خواستیان دێتە دی، ئەم نەوعە زاتانە کەوا لە پەردەی پەنهانیدا زوهد و تەقوا و لە دواییدا ئیرشاد ئەکەن.

مەسلەک و ڕا و تەریقەتی موختەلیفەیان هەیە کە هەریەکە بەناوێک ناو ئەبرێن مەزهەبی ئەبو سەعید سۆفی بووە کە لە ئەبی ئەلفەضلی کوڕی حەسەنی شاگردی ئەبی نەصری سەراجی وەرگرتووە.

ئەویش ئەچێتەوە سەر (جنید)ی بەغدادی. بەڵێ ئەم نەوعە پرستشە چونکە پەنهانییە و ڕێی ڕاستی شەریعەتی ئیسلامیش ئاشکرایە، خەڵک لەو مەعنەویاتەی (تصوف)ە ناگەن. نەشارەزان، زۆرتر بە(زندیق)یان ئەژمێرن. تەنانەت شێخ ئەبو سەعیدیشیان بەوە ئیتهام کرد و لای (مەحموودی غەزنەوی) شکاتیان لێ کرد، کە ئەمە لەسەر ڕێگای شەرع ناڕوا و ئەمیش گوایە بەئەبو عەلی ئیبن سینای وتووە کافرە و ئیبن سیناش بەو ڕوباعییە مەشهوورە جوابی داوەتەوە، کە لە ئەدەبیاتی فرسدا شێوەی (رباعی) چوار خشتەکی زۆر پەسەندە، لە رباعیاتیشدا دوو زات لە پێش هەموو شاعیرەکانەوەن. شێخ ئەبو سەعید و عومەر خەیام. ئەورووپاییی زۆرتریان ئەدیبەکانی ئینگلیز روباعیاتی خەیامیان لەلا پەسەندترە. کە بەهەموو زبانێ تەرجەمە کراوە، بەڵام لە عالەمی ئیسلامدا دیارە شێخ ئەبو سەعید پێشترە و قیاسی لەگەڵ خەیامدا ناکرێ. ئەم بەهەموو مەعنایەکەوە پیاوی خوا و پیری تەریقەت بووە. چواردە ساڵ بەجەزبەی (فنا في الله)وە لە دەشت و بیابانی خاوراندا بەناڵەی مەحەبەتی ئیلاهییەوە سەحرانەوەرد بووە و بەگژوگیا ژیاوە. ڕوباعیاتەکانی هەموو فیوضاتی عەشقی خوای تیایە و والحاصل ئەم نەوعە اعاظمە وەک (فارابی) و (ابن سینا) و (شێخ ئەبو سەعید) فەلسەفە و تصوفیان لە شەرقدا هێناوەتە مەیدان. کە عەوام لە کەنهی ناگا و حەزرەتی مەولانا خالیدی خۆمان کە (مجدد)ی تەریقەتی نەقشبەندییە، ئەفەرموێ،: هەر تەریقەیە تار و پۆکەی نەچێتەوە سەر شەریعەت ئیلحادە. بۆیە ئێمە کە خوا و هیممەتی مشایخان فرسەتی داین دیوانی مەولەوی و مەولانا خالیدمان کردووە بەکوردی ئەمانەوێ ڕوباعیاتی شێخ سەعیدی ئەبولخەیریش بکەین بەکوردی. ڕوباعیاتی خەیام زۆر کەس بەهەموو زبانێ تەرجەمەیان کردووە. تەنانەت شێخ ئەحمەدی شێخ سەلام لە پێشدا و شێخ سەلام لە پاشدا کردوویانە بەکوردی بەڵام ئەم روباعیاتی شێخ ئەبو سەعیدە نەکراوە.

١

شب خیز، که عاشقان بەشب راز کنند
گـــــرد دروبام دوست پرواز کنند
هر جا که دری هست بەشب در بندند
الاّ در دوست را کـــــەشب باز کنند

١

شەو هەستە، کە شەو نیازی عاشق ڕازە
ڕۆحی لەدەری دۆست بەهەوای پەروازە
شەو، دادەخرێ دەرکی هەموو جێگایێ
دەروازەی دۆستـــە وا بەشـەو دەروازە

٢

هنگام سپیده دم فروس سحری
دانی که چرا همی کند نوحه گری
یعنی که نمایاند در آیینەئی صبح
کز عومەر شپی گذشت و تو بی خبری

٢

ڕووناکی بەیانی کەڵەشێری سەحەری!
زانیوتە کە بۆچ ئەکا نوحە کەری!
یەعنی کە لە ئاوێنەی ڕۆژا دیویە
عومرت شەوێکی تێپەڕی تۆ بێ خەبەری!

٣

ای آنکه براندەئی حاجات توئی
هم قاضی و هم کان مهمات توئی
من راز دل خویش چه گویم باتو
چون عالم سرّ والخفیات توئی



٣

ئەی خوایە، بەجێهێنەری حاجات هەر تۆی
هەم قازی و ڕێکخەری مهمات هەر تۆی
پێی ناوێ، من ڕازی دڵی خۆم لای تۆ بڵێم
هیچ کارێکی شارراوە نییە لات، هەر تۆی

٤

ای جملەئی بیکسان عالم راکس
یک جو کرمت تمام عالم را بس
من بیکسم و تو بیکسانرا یاری
یارب تو بەفریاد من بیکس رس

٤

ئەی بۆ هەموو بێکەسانی عالەم تۆی کەس
کەمتر کەرەمت بۆ هەموو مەخلوقت بەس
من بێکەسم و کەسی هەموو بێکەس تۆی
مەم نێرەوە لای کەسی تر ئەی فریاد ڕەس

٥

ما بامی و مستی سر تقوی داریم
دنیا طلبیم و میل عقبی داریم
کی دنیا و دین هردو بەهم جمع شوند
این است که نەدین و نەدنیا داریم

٥

ئێمە کە بەمەستی مەیلی تەقوامانە
دنیا ئەگەرین و هەوڵی عوقبامانە
چۆن پێکەوە؟! دێنە دەس دنیا و دین
بەو دوو دڵییە، نەدین، نەدنیامانە

### ٦

ای در صفت و ذات تو حیران کەومە
از هردو جهان خدمت درگاه توبە
علت توستانی شفاهم تو دهی
یارب تو بەلطف خویش یستان و بدە

### ٦

حەیرانی سیفات و زاتی تۆن ورد و درشت
لام خۆشترە خزمەتت لە دنیا و لە بەهەشت
تۆ دەرد ئەدەی و دەوا و شفایش لای تۆیە
دەرد لابە بدە شفا و زهنی بەبڕشت

### ٧

ای خالق ذوالجلال و ای بارخدای
تا چند روم دربەدر و جای بەجای
یا خانەئی امید مرا در ربند
یا قفل مهمات مرا در بگشای

### ٧

ئەی خوایە کە کردگار و فرمانداری
تاکەی بگەڕێم بەنانی خزمەتکاری
یا دەرکی ئەم ئومێدە لەسەر من داخە
یا بۆم بکەرەوە قاپیەکەی رسگاری

### ٨

مازار دلی راکە تو جانش باشی
معشوقەی پەیدا و نهانش باشی
زان من ترسم کە از دل آزاری تو
دل خون شود و تو در میانش باشی



### ٨

ئازاری مەدە، ئەو دڵە تۆ، گیانی بی
مەعشووقەی ئاشکرا و پەنهانی بی
ترسم لەوەیە ئەو دڵە ئازاری ئەدەی
خوێناو بێ نەزیبی کە تۆ میوانی بی

### ٩

سیما بی شد هوا و زنکاری دشت
ایدوست بیاو بگذر از هرچە گذشت
گر میل و وفاداری اینک دل و جان
ور عزم جفاداری اینک سر و طشت

### ٩

زیوینە هەوا و ڕەنگی زەنگارە دەشت
دۆستم وەرە با بڵێین گوزەشتە کە گوزەشت
گەر بێت و وەفادار بی ئەوە گیان و دڵ
خۆ بێت و جەفاکار بی ئەوەیشە سەر و تەشت

### ١٠

راه تو بهر قدم کە پویند خوش است
وصل تو بهر سبب کە خویند خوش است
روی تو بهر دیدە کە بینند خوش است
نام تو بهر زبانی کە گویند خوش است

### ١٠

ڕێی تۆ چە بەسەر بێ، چە بەپێ بێ خۆشە
وەسڵت سەبەبی بێ و بەجێ بێ خۆشە
ڕووت دەرکەوێ هەر چۆنی بێ نووری چاوە
ناوت ببرێت و گوێتی لێ بێ خۆشە

١١

غمناکم و از کوی تو باغم نروم
جز شاد و امیدوار و خرزم نروم
در درگه هەم چو تو کریمی هرگز
نومید کس نرفت و من هم نروم

١١

دڵتەنگم و هاتووم بەدڵتەنگ نارۆم
لای تۆوە دڵم خۆش نەبێ بێ دەنگ نارۆم
دەرگای کەرەمت کە ناهومێدی نابێ
دڵخۆش نەبم و نەیکەمە ئاهەنگ نارۆم

١٢

با من بك حاجتي و روحي بيديك
اعرضت من الخلق واقبلت اليك
مالي عمل صالح استظهر به
قد جئتك واجباً توكلت عليك

١٢

ئەی ئەو کەسەی کاروبار و گیانمت بەدەسە
لام داوە لە خەڵک و ڕووم لە تۆ کردووە بەسە
هیچ کردەوەیەکم نییە پشت ئەستوور بم
هاتوومەتەوە کولم فەریاد ڕەسە

١٣

من بی تو قرار نتوانم کرد
از درگه تو فرار نتوانم کرد
گر برتن من زبان شود هر موئی
یک شکر تو از هزار نتوانم کرد



١٣

بێ ڕاز و نیازی تۆ دڵم ناگرێ قەرار
سەبرم نییە بێ سوودیشە تۆران و فرار
ئەگەر بێت و هەموو مووی بەدەنم بێ بەزبان
ناژمێررێ سوپاس یەکێکی لە هەزار

١٤

ای انکە بحال دل نالان دانی
ازار و غم شکستە بالان دانی
گر خوانمت از سینەئی سوزان شنوی
در دم نزنم زبان لالان دانی

١٤

ئەی خوایە خەبەر دەری دڵی ناڵانی
تەسکینی خەمی دەروونی کەم حاڵانی
بانگت بکەمێ بەسۆزەوە گوێت لێیە
دەنگیش نەکەم ئاشنای زبان لاڵانی

١٥

سرتا سردشت خاوران سنگی نیست
کز خون دل و دیدەبران رنگی نیست
در هیچ زمین و هیچ فرسنگی نیست
کز دست غمت نشستە دلتنگی نیست

١٥

نابینی لە دەشتی خاوەردا بەردێ
بێ خوێنی دڵ و هەناسە سەردێ
هەر بستە زەمینێ کە گیای لێ دەردێ
تیا کەوتووە لە داخی تۆ دەروون پڕ دەردێ

١٦

جانم بەلب از لب خموش تورسید
وز لعل خموش بادە نوش تورسید
گوش تو شنیدە ام کە دردی دارد
درد دل من مگر بەگوش تورسید

١٦

گیان گەیوەتە سەر لێو لە لەبی خامۆشت
ئەو لەعلی خەمۆشی مەستی صەهبا نۆشت
بیستوومە کە خوا نەخواستە گوێت ئێشاوە
دەردی دڵی من مەگەر گەیشتە گۆشت

١٧

ای سرّ تو در سینەئی هر محرم راز
پیوبستە در رحمت تو بربرهمە باز
هرکس کە بدرگاه تو آید بەنیاز
محروم زدرگاه توکی گردد باز

١٧

سرِت لە دەروونی مەحرەمانی ڕازە
دەروازەی ڕەحمەت شەو و ڕۆژ وازە
هەرچی کە لە دەرگات بەنیاز و نازە
وا دیارە کە نائومێد نییە مومتازە

١٨

گر من گنە جملە جهان کردستم
لطف تو امید است کە گیرد دستم
گفتی کە بوقت عجر دستت گیرم
عاجز تراز این مخواه کاکنون هستم



١٨

من، هەرچی گوناه هەیە لە ئەستۆم بارە
هیوام بەوەیە مەرحەمەتی تۆم یارە
فەرمووتە لە تەنگانەدا دەست ئەگرم
زیاتر لەمە مەمهێڵەوە دوایی کارە

١٩

افعال بدم زخلق پنهان میکن
دشواری دهر پیشم اسان میکن
امروز خوشم بدار فردا انجا
انچە از کرم تو اید احسان میکن

١٩

ئەخلاقی بەدم لە چاوی خەڵک پەنهان کە
کارێ کە گران و سەختە بۆم ئاسان کە
ئەمڕۆ لە جیهان با بەخۆشی بیبەمە سەر
باقی کەرەمم سبەینێ پێ ئیحسان کە

٢٠

ای آنکە بەکنهت ترسد ادراکی
کونین بەپیش کرمت خاشاکی
از روی کرم اگر ببخشی همە را
بخشندە بود لطف تو مشتی خاکی

٢٠

ئەی خوایە کە تێت نەگەییوە هیچ ئیدراکێ
نیسبەت بەسەخات هەردوو جهان پیتاکێ
گەر بێت و هەمووی ببەخشی بەکەرەم
بێ قەدرە لات هەروەکو مستی خاکێ

٢١

یارب بەکـــــرم برمن درویش نگر
برحال من خستەئی دلریش نگر
هرچند نیم لایق بخشایش تو
بر من منگر برکرم خویش نگر

٢١

خوایە بەکەرەم سەیری منی دەروێش کە
رەحمێ بەمنی نارەحەتی دڵڕێش کە
هەر چەندە کە شایستەی بەخشینت نیم
مەڕوانە من گەورەیی خۆت دەرپێش کە

٢٢

غازی زپی شهادت اندر تک و پوست
غافل کە شهید عشق فاضلتر از دوست
در روز قیامت این باوکی ماند
این کشتەئی دشمن است و کشتەئی دوست

٢٢

غازی بەهیوای شەهیدی کەوتەک و دەو
نازانێ شەهیدی عەشق گەلێ پێشترە لەو
ئەو کوشتەی دوژمنە، برینی دیارە
خۆشبەختە، بەدەستی دۆستی کوژراوە ئەو

٢٣

ای انکە دوای درد مندان دانی
درمان و علاج مستمندان دانی
من شرح دل خویش چە اظهار کنم
نا گفتە دوصد هزار چندان دانی



٢٣

ئەی تۆ کە دەوای دەردەداران زانی
دەرمان و عیلاجی بێ قەراران زانی
پێی ناوێ کە من ڕازی دڵم ئیزهارکەم
من نەیشیڵێم تۆ دەردی هەژاران زانی

٢٤

من کیستم آتش بدل افروختەئی
برخر من عشق چشم خود دوختەئی
در راه وفا چو سنگ و اتش گزدم
شاید کە رسم بەصحبت سوختەئی

٢٤

من کێم لەدڵا، ئاگری هەڵگیرساوێ
بۆ خزمەتی عەشق چاو لە ڕێدا ماوێ
بۆ ئاگری وەفا خۆم ئەکەمە ئەستێ و بەرد
بەڵکو بگەمە سوحبەتی دڵسووتاوێ

٢٥

یارب ز دوکون بی نیازم گردان
از افسر فقر سرفرازم گردان
در راه طلب محرم رازم گردان
راهی کە نەسوی توست بازم گردان

٢٥

خوایە لە دوو لاوە بێ نیازیم بدەرێ
تاجێکی لەفقری سەرفرازیم بدەرێ
لای تۆ بەهیوام مەحرەمی ڕازیم بدەرێ
ڕێی ڕاستی نزیک و چارەسازیم بدەرێ



٢٦

دارم گنهی ز قطرهٔی باران بیش
از شرم گنهفکنده ام سر در پیش
آواز آمد غم مخور ای درویش
تو در خور خود کنی و مادر خور خویش

٢٦

بارانی گوناه، شەستە ڕەهێڵەی بوو بۆم
لەش تەڕ، سڕی سەرما و لە شەر مامل کۆم
دەنگێکی لە غەیبەوە وتی ئەی دەروێش
تۆ قابیلی خۆت ئەکەیت و من لایەقی خۆم

٢٧

یارب زگناه زشت خود منفعلم
وز فعل بدو خوی بد خود خجلم
فیضی بدلم ز عالم قدس رسان
تا محو شود خیال باطل ز دلم

٢٧

یاڕەبی لە کردەوەی بەد شەرمەندەم
بەم باری گوناهە قورسەوە دەرمەندەم
فەیزێ بخەرە دڵم لە قودسیەتی خۆت
دەرکا لە دڵم خەیاڵی چوون و چەندم

٢٨

یارب زقناعتم تو انگر گردان
وز نور یقین دلم هنور گردان
احوال من سوخته‌ئی سرگردان
بی منت مخلوق میسر گردان



٢٨

خوایە بەقەناعەت لە فەقیریم دەرکە
نوورێکی یەقینم لە دڵا ڕەهبەر کە
تا دەست لەم و لەو نەگرمەوە بۆ نانێ
بێ منەتی خەڵکی کاری من مەیسەر کە

٢٩

این گنبد گبراز کجا پیداشد
وین صورت قبر ازکجا پیداشد
خورشید مراز چشم من کرد نهان
این لکه‌ئی ابر ازکجا پیداشد

٢٩

ئەم گومەزی گاورە لە کوێ هاتە ظهور
ئەم صورەتی قەبرە دڵمی وا خستە فتوور
ڕۆژی منیان لە چاوی من پەنهان کرد
ئەو هەورە ڕەشە لە کوێوە پەیدا بوو لە دوور

٣٠

یارب بگشا گره زکار من زار
رحمی که زخلق عاجزم در همه کار
جز درگه تونیست مرا درگاهی
محروم از این درم مکن یا غفار

٣٠

تۆ بۆم کەرەوە خوایە گرێکەی کارم
کەس کەڵکی کەس ناگرێ، لە خەڵک بێزارم
هەرتۆم هەی و دەرگای کەرەمی تۆ شک ئەبەم
ڕووم کردووەتە قاپیت بگەرە هاوارم

٣١

مــردان خـــدا زخـــاكـــدان دگـــرند
مــرغـــان هوا ز آشــيـــان دگـــرند
منگر تو از اين چشم برايشـان كـايشـان
فـــارغ ز دوكـــون و درمكان دگـــرند

٣١

پيـاوانی خـودا له سـەر زەمـينێكی ترن
مــورغـــای هەوا لەلانەی بەرز ئەفـــڕن
مەڕوانە وان بەچاوی خەڵك چونكو ئەوان
باكـيـان لە دنيـا نيـە، جـێی تر دەگـرن

٣٢

گـــر دست تضــــرع بەدعـــا بردارم
بيـخ و بـن كـــــوه را زجـــــا بـردارم
لكن ز تفـضـــلات مــعـــبـــود احــد
(فـاصـبـر صـبـراً جـمـيـلاً) از بردارم

٣٢

گەر دەستی تەمەننا بەدوعا بەرز كەمەوە
ڕەنگە ڕەگی كێوی بەرز لەسەر ئەرز كەمەوە
ئەمما كـە خـودا دەسـتی ويقـاری دامێ
(فاصبر صبراً جميلاً) با بەرز كەمەوە

٣٣

ای ذات رفـــيـع تـو نـەجـــوهر نـەعـــرض
فـضل و كـرمت نيـست مـعلل بەغـرض
هركس كـە نبـاشـد تو عـوض باشی ازو
وانرا كە نباشی تو كسی نيست عـوض



٣٣

ئەی زاتی بڵندی تۆ نەجەوهەر نەعـرض
چاكە و ڕەوشت پاكە لە كین و لە غرض
تۆ هەی لە بری ئەوەی ئەڵێ من هیچ نیم
گەر تۆی نەبێ بیشبێ، كەس نابێ بەعـوض

٣٤

آمـد سـحـری ندا ز مـيـخـانەی مـا
كـــای رند خـــراباتی ديوانەی مـــا
خــيـــز كـــە پر كنيم پيـــمـــانەی می
زان پيش كـە پر كنند پيـــمـانەی مـا

٣٤

دەنگێكم ئەبيست بەيانی لای مەيخانە
ئەيگوت وەرە ئەی قـــەلەندەری دێوانە
با بەر لەوەی پەيمانەی ئێـمـە پڕكـەن
پڕكـەين لە مـەی مـوحـيـبـەتا پەيمانە

٣٥

ای فـــضلی تـو خلق را هدايت كـــرده
مــارا بەلقــای خــود حــمــايت كـــرده
انعــام تو عـــام است و سـزا و كـرمت
با مــؤمن و گـــبـــر صـــدعنايت كـــرده

٣٥

ئەی فەزڵی تۆ ڕێی هیدایەتە بۆ گشت كەس
(حفظت) كـە پەنای حیـمـایەتە بۆ من بەس
ڕزق و نيـعـمـەت عـامـە بەسەر دنيـادا
بۆ مـسلم و گـاور كـەرەمت فـرياد ڕەس

٣٦

ای لطف تو روزو شب کند چارەی من
احسان تو بیحد است دربارەی من
آندم که زند آتش شهوت شغله
فریاد ز نفس شوم امارەی من

٣٦

ئەی لوتفی تۆ ڕۆژ و شەو دەکا چارەی من
بەخشندەیی تۆ بێ حەددە دەربارەی من
زۆر تیژە گڕی ئاگری حرص و شەهوەت
هاوار مەکە نەفسی شوومی ئیمارەی من

٣٧

یارب، یارب کریمی و غفّاری
رحمان و رحیم، راحم و ستّاری
خواهم که ز رحمت خداوندی خود
سر گشتەئی خویش رامز و نگذاری

٣٧

ئەی خوایە خوایە، خوایەکی لێبوردووی
ڕەحمی دوو جیهان بەبەندەی خۆ کردووی
رووم کردۆتە تۆ بەگەورەیی خۆت خوایە
مژدەم بدەرێ بڵێ ئیمان دەربردووی

٣٨

سبحان الله بەهر غمی یار توئی
سبحان الله گشایش کار توئی
سبحانە الله بەعزت (کن فیکون)
سبحان الله غفور و غفار توئی



٣٨

ئەی پاک و مونەزەه لە غەما تۆم یاری
سبحان الله گرێ گوشای زۆرکاری
سبحانە الله عەیبت ئەبینی و ستاری
سبحان الله لە گوناهی ئێمە تۆ غەفاری

٣٩

یک موغم ایام نداریم خوشیم
گر چاشت بود شام نداریم خوشیم
چون پختە بەما میرسد از مطبخ غیب
ازکسی طمع نداریم خوشیم

٣٩

باکمان لە خەمی جیهان نییە دڵخۆشین
قاوەڵتی ئەخۆین بۆ شەوێ دایناپۆشین
هەرچی بمەوێ لە مەتبەخی غەیبەوە دێت
ئازادەی منەتی دەسندەی خوێشین

٤٠

در ملکت وجود فرمان از تست
آرام دل بیسر و سامان از تست
مارا بەدوای درد دل کاری نیست
درد از تو دل از تو درمان ازتست

٤٠

لەم عالەمەدا ڕەوایە فەرمانی تۆ
هەرچی هەیە دڵخۆشە بەسامانی تۆ
کارم بەدەوا نییە نگهبانی تۆ
دڵ، دەردی لە تۆوە دێت دەرمانی تۆ

٤١

گر لاف زنم که یار خویش خوا نمت نەئی
با مـن بەوەفـا و مـهـر نیـکو است نەئی
وین طرفـــه تر آنکه از برای تو بەمن
خلقی همـه دشـمنند و تو دوست نەئی

٤١

گەر بێم و بڵێم کە دۆستی دڵداری نیت
یاخـو کـە لەگـەڵ منا وەفـا کـاری نیت
داخی ئەوە کوشتوومی لە ڕووی تۆوە خەڵک
لێم دوژمنن بەتۆیش بڵـــێم یاری نیت

٤٢

در سـینه توئی و گـرنه پر خـون کنمش
در دیده تـوئی و گـرنه جـیـمـون کنمش
امــیـــد وصـــال تست جـــانرا ورنه
ازتـن بەهزار حـــیـلـه بیـــرون کنـمش

٤٢

تۆم وای لە دڵا ئەگـینە پڕ خـوێنی ئەکـەم
چاو تۆ نەبینێ، کـوێر و بێ سـەروشـوێنی ئەکـەم
گیـان بێت و بەدەوری سەری تۆدا نەگەڕێ
نایگرمەوە خۆم و پڕ شەق و جوێنی ئەکەم

٤٣

اســــــرار ازل را نـەتـو دانـی و نـه مـن
این حـرف مـعـمـا نەتو دانی و نەمن
هست این همه حرف، گفتگوی من و تو
چون پرده بر افـتــد نەتو دانی و نه من



٤٣

ســــڕی ئەزەلی نەتۆ ئەزانـیت و نەمن
حەرفێکە ئەمەند قووڵە نە سەری دیارە نەبن
واتەی من و تۆ ئەمـەندە پێی دێتـە وتن
تا پەردە هەڵئەگرن نە قسەی تۆیە نەمن

٤٤

زاهـد بووم، تـرانـه گــــویم کــــردی
ســـردفــــتـــر بزم هرزه گـــویم کـــردی
ســــجـــــاده نشـین یـار قـــابـل بـودم
بـازیـچـــەی کـــودکـــان کـــریم کـــردی

٤٤

زاهیـد بووم و تۆ گـۆرانی بێـژت کـردم
کـەوتبـوومـە بەزم و گـێـژ و وێژت کـردم
یاری بەویقـار و پیـری سـەر بەمـاڵ بووم
منداڵت ورووژاند و لـە نوێژت کــــردم

٤٥

در کـعـبـه اگـر دل سـوی غـیـراست نزا
طاعـت همـه فـسق، کـعـبـه دیراست نزا
ور دل بـەخــدا و ســـاکن مــیـکده ای
خـوش بـاش کـه عـاقـبت بەخـیـراست نزا

٤٥

دڵ بێت و لە کەعبەی یادی غەیری خوا بێ
نوێژی وەکـو کـفـری دەیرە گـیـرا نابێ
خۆ بێت و لەمەیخانە لەگەڵ خوای خۆی بێ
تا کاتی دەرفەت و خێر خوای خۆی لابێ

٤٦

چون دایره مـــا زپوست پوشـــان تویم
در دایرەئی حلقـــه بەگـــوشـــان تویم
گـــر بنوازی هم از خـــروشـــان تویم
ور ننوازی هم از خـــمـــوشـــان تویم

٤٦

ئێمـه وەکو دەف لە پۆست پۆشانی تۆین
لەو دائرەدا حـەلقـە بەگـۆشـانی تۆین
پەنجـە کە لە دڵ کـەوێ، خرۆشانی تۆین
لاواندنەوەت نەبێ خـەمـۆشـانی تۆین

٤٧

ای از قلم وجـــــود برلوح عـــــدم
تصـــویر کـــمـــونات راکـــرده رقم
از رحـمت خـود نامـه سـیـاهی چومـرا
نومـــیـــد مکن بەحـــرمت لوح و قلم

٤٧

ئەی خامەی ئیجادی لە سەد لەوحی عەدەم
هەرچی لە جیهانا هەیە کردوویە ڕەقەم
لەو خیلقەتەدا خوایە ئەگەر نامە، سیا-م
بمکە بەسپی، بەحورمەتی لەوح و قەڵەم

٤٨

دیری است کـه زخم دل مـانا سـور است
از پای فـــتـــاده ایم و منزل دور است
احـــوال خـــود ازکـــسی چەپنهـــان دارم
چون زلف پریشـانی مـا مـشـهـور است



٤٨

چەنـدێکـە بریـنی دڵـی من نـاســـــۆرە
بێ هێـزم و پێم خسـتووە مـەنزڵی دوورە
نایشـارمـەوە حاڵـی خۆم کـەوا مـەنزوورە
وەک ئەگریجە شێـواویی من مـەشهـوورە

٤٩

این یار کـه عـهـد دوسـتـداری بشکست
مـیـرفت و منش گـرفـتـه دا من در دست
مـیگفت کـه بعـد از این بەخـوا بمبـینی
پنداشت کە بعد از این مرا خوا بی هست

٤٩

یار عـەهدی شکاند و وتم دڵم ئەشکێنی
داوێنم ئەگـرت و کـەوتبـوومـە شـوێنی
لێم توند بوو، وتی مەگەر بەخەو بم بینی
پێم گـوت، من و خەو، ئەوە خەوە ئەیبینی

٥٠

مـــارا خـــواهی همـــه حـــدیث مـــاکن
خـــو، با مـــاکن، و زدگـــران، خـــو واکن
مـــا زیبـــائیم و یادمـــا زیبـــا کن
بامـــا، دو دله مـــبـــاش و دل یکتـــاکن

٥٠

گـەر ڕاست ئەکـەی و منت ئەوێ من یادکـە
خووی خۆت بدەرە من و دڵی خۆت شادکە
من جـوانم و کـاشـانەی جـوان بنیـادکـە
یەک دڵ بە دڵت لە دوودڵی ئازادکـــە

٥١

مشهور و خفی چو گنج دقیانوسم
پیداونهان چو شعله درفانوسم
القصه دربن چمن چوبید مجنون
بنالم و در ترقی معکوسم

٥١

پەنهان و عەیان لە گەنجی تەقیانووسم
بێ ناڵە ئەسووتێم گڕی ناو فانۆسم
لەم باخی جنوونە بەیدە مەجنوونێکم
سەر شۆڕی غەمی تەرەقیی مەعکووسم

٥٢

باستر توهر سوخته رازی دارد
باراز تو هر بنده نیازی دارد
ای رازق بخشنده تو نومید مکن
انرا که بەدرگهت نیازی دارد

٥٢

سووتاوی لیقات هەر یەکە ڕازێکی هەیە
هەر بەندەیە بەو ڕازە نیازێکی هەیە
بەخشندە کە تۆ بی ناهومێدی ناکەی
چونکو بەهەوات سۆز و گودازێکی هەیە

٥٣

باکوی تو هر کرا سروکار افتد
از مسجد و دیر و کعبه بیزار افتد
گر زلف تو در کعبه فشاند دا من
اسلام بەدست و پای زنار افتد





٥٣

هەرچی کە لەگەڵ نگاهی تۆ هاوچەشمە
دەیرە و حەرەم و ماڵی خودای لا پەشمە
داوێن کە لە کەعبە هەڵتەکێنێ ئیسلام
ڕوو ناکەنە، کەعبەوە، ئەزانن خەشمە

٥٤

بیگانەئی بیگانە تو گرد ماگرد
برگرد زخلق و آشنای ماگرد
طول امل دنیای دون کوتەکن
این کوچە دری ندارد ازوی واگرد

٥٤

بێگانە لە بێگانە بەدەورما بگەڕێ
بۆ من بەرە ئاشنا لە خەڵکی بگەڕێ
تووڵی ئەمەلی جیهانی دون کورت کەرەوە
کۆڵانێکە دەرناچێ، وەرە لێی وەرگەڕێ

٥٥

مائیم کە فیل برنتا بدلت ما
برعدش برین برند هرشب کت ما
گر مورچە در اید انور خط ما
ان مورچە شیر گردد از هیبت ما

٥٥

فیل هێزی نییە هەڵگرێ کەرت و لەتی من
شەو عەرشی بەرینە شوێن و ماواو ڕەتی من
مێروولە کەکەوتە ژێر پەناهو خەتی من
ئەو مێروولە شێرە لەگەڵ هەیبەتی من

**٥٦**

بی یاد سران دشت خون اشامی
مردند بحسرت غم و ناکامی
محنت زدگان وادی عشق نزا
هجران کشد واجل برد بدنامی

**٥٦**

بێ پێ و سەرەکانی دەشتی بێ ئارامی
مردن بەسزای دووریەوە و ناکامی
محەبەت زەدەکانی وێڵی دەشتی عەشقت
کوشتەی غەمی تۆن و بۆ ئەجەل بەدناوی

**٥٧**

ای بر امدیت تو شاهد همه ذات
تشکیک مشکک نکند نعت صفات
ذات تو در اندمی که اید به صفت
هم ذات ترا ذات تو باشد مرآت

**٥٧**

تەنهاییەکەت بەزاتت باوەڕ دێنێ
شوبهەی ئەوی نەتناسێ ئەسەر نانوێنێ
بۆ ئەو کەسە وا لە دووی سفاتت ئەگەڕێ
ئاوێنەی زاتی خۆتە زات ئەنوێنێ

**٥٨**

انروز که آتش محبت افروخت
عاشق روش عشق ز محبوب آسوخت
از جانب دوست سر زد این سوزوگداز
تا، در نگرفت شمع، پروانه نسوخت



**٥٨**

ئەو ڕۆژە کە ئاگری مەحەبەت دەرکەوت
عاشق بەنیگای دلبەری عەشقی بەرکەوت
جلوەی ڕوخی دۆستە ئەم ئاگرەی وا ڕێکەوت
پەروانە چرای دی، تا نەسووتا نەسرەوت

**٥٩**

ای نیکی نکرده و بدیها کرده
وانگاه خلاص خود تمنا کرده
بر عفو من توبەکه هرگز بنود
ناکرده چو کرده، کرده چون ناکرده

**٥٩**

ئەی پیاوی خراپ لە چاکە هیچ نادانی
هەروا بەنیازی بەخششی یەزدانی
باوەڕ مەکە، عەفویەکە تۆ نایزانی
خوا هەر هەقی خۆی ئەبەخشێ نەک ئینسانی

**٦٠**

یارب بەمحمد و علی و زهرا
یارب بەحسین و حسن و آل عبا
از لطف برار حاجتم در دو سرا
بی منّت خلق یا علی الاعلی

**٦٠**

خوایە بەمحمد و علی و زەهرا
یارەب بەحسین و حسن و ئالی عەبا
بۆم سووک و ڕەواکە کاروباری دوسرا
بێ منەت بێگانە خودای عوقدە گوشا

٦١

گــرهر ســـحـــری باتو همـــیگویم راز
در حـضـرت تو همین کنم عـرض نیـاز
بـی مـنت بـنـدگـــــانـت ای بنـده نـواز
کـار من سـرگـشـتـهئی بیـچـاره بسـاز

٦١

بۆم بلویێ بەیانیـــــان لە تەک تۆدا ڕاز
تەنها ئەمەیە کە لەخزمەتا عەرزی نیاز
بێ منەتی بەندەکـانت ئەی بەندە نەواز
بێ چارەم و کارم بەکەرەم خۆت بدە ساز

٦٢

ســربست زسنـگ خـــاوران دانەیی لال
چون دانەیی اشک عـاشقان درمه و سال
بنمـــود جـــلال دوست ازپرده جـــمـــال
چون صورت حال من شدش صورت حال

٦٢

سـرێکه کـه بەدری خـاوەران لەعلی ئاڵ
ئەنوێنێ لەڕەنگی ئەشکی عەشق مانگ و ساڵ
کاتێ کە جەماڵی دۆست لە ڕووپۆشی جەلال
دەرکـەوت بووە حـاڵی من سـوورەتی جـەمـاڵ

٦٣

ای آنـکـه مـنـزهـی و بـی هـم تـائـی
کــــســـــرا بنود ملک بدین زیبـــائی
خلقـان همـه خـفـتـه اند و در رابسـتـه
یـارب تـو در رزق بەمـن بـگـشــــــائی



٦٣

ئەی داوەری تەنهـــایی و بێ هاوتایی
بۆ کــەس نەلواوە مــوڵکی وا تا دوایی
خەڵکی هەموو نووستوون بەخەبەر تۆ ماوی
لێم ببیـسـه دوعـا بەخـەڵوەتی تەنهـایی

٦٤

رفــتم بەکلیـــســـەهای ترسـا و یهـــود
ترسا و یهـود را همـه رو بەسـوی تو بود
اندرپی عــشق تو بەمـــیـــخــانه شــدم
تســبـیـح ملک زمـزمـەی عـشق تو بود

٦٤

ڕێم کەوتە کەنیشتە و کڵێسەی گاور و جوو
تەسبیح و سجوودی هەردوو لا بۆ تۆ بوو
بۆ تۆ دەگـەڕام کـە چوومـە ناو مـەیخـانە
نەعـرەی دڵی مەست لەلام بووە (الا هو)

٦٥

روزی کــه چراغ عــشق خــامــوش شـــود
در بســـتـــر مـــرگ عـــقل مـدهوش شـــود
با بیـــدر دان مکن خـــدایا حـــشـــرم
ترسم کـــه مـــحـــبـــتـم فـــرامــوش شـــود

٦٥

ئەو ڕۆژە چرای ژیانم ئەکـــوژێنیـــەوە
دووبارە بەعـومـری نوێوە ئەمـژیەنیـەوە
بۆ حەشر و حساب مەمخەرە ناو بێ دەردان
نەک تۆم بەفەرامۆشیـەوە لێ بسێنیەوە
***

## چەند تێبینیەک لەسەر ئەم چوارینانە

١- چوارینەی (٣٣) سەبک و دارِشتنی لە هی شێخ سعید ناکات.

٢- چوارینەی (٥٧،٥٤) لەوە ناچێ شیعری شێخ سعید ابوالخیر بێت هەروەها چوارینەی (٥٩).

٣- چوارینەی (٦٠) لە شیعری شاعیرێکی شیعە دەچێت.

٤- چوارینەی (٣٤) یەکێکە لە چوارینەکانی خەیام و تێکەڵ بەچوارینەی شێخ بووە.

***

## پێنج خشتەکی سالم لەسەر شیعری مەولانا خالد و وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد

پیرەمێرد سێ جار ئەم شیعرەی وەرگێڕاوە و بڵاوی کردۆتەوە و هەر سێ جارەکە لە دەقەکەی گۆڕیوە. یا بەیتی لابردووە یا لێی زیاد کردووە!

جاری یەکەم دەقی شیعرەکەی وەرگێڕاوە و یەک بەیتی خۆی بۆ زیاد کردووە. لە شەش بەیتەوە کردوویە بەحەوت. بەڵام پێشەکییەکی کورتی بۆ نووسیوە و باسی ئەو بەیتەی خۆی دەکات. بەم جۆرە: «ئێمە فەیز و بەهرەیەکی وامان لە ڕوحی مەولەوی وەرگرت، توانیمان پایەیەک زۆرتر سەر بکەوینە ئاسۆی پرشنگی ڕوحی مەولانا خالید. خوا یار بێ دیوانەکەی ئەویش وەرگێڕمە سەر کوردی. ئەم ئارەزووی منە لە مەعنەویاتی ئەم ڕۆحە خالیدەیە، وا ئەمجارە غەزەلێکی مەشهووری کە سۆز و تاسەی سەرچنار و بەکرەجۆ و یادی نیشتمانە، نووسیمانەوە تەنها یەک شیعری تازەیە کە ئەویش لە ڕابیتەی کەراماتی خۆیەوە یا تەوفیق، تەوفیقی لەخواوەیە».

جاری دووەم پێنج خشتەکییەکەی سالمی لەسەر شیعرەکەی مەولانا بڵاو کردۆتەوە بەڵام ئەمجارە لە شەش پارچەی پێنج خشتەکییەکەوە بووە پێنج. واتا پیرەمێرد پێنج خشتەکی شەشەمی نەنووسیوە، یاخود بڵێین وەرنەگێڕاوە کە نازناوی سالم و هەم مەولاناشی تیادایە. جگە لەوەی دەستکاری شێوە و نووسینی کوردیەکەی سالمی کردووە. لە نووسینی کوردی (شیعری کوردی ئەو سەردەمەی سالم)ەوە هێناویەتە سەر کوردی ساڵانی چلەکانی ئەم چەرخە!!.

جاری سێیەم بەو دەستکاریانەشەوە، لە شیعرەکە نەگەڕاوە و پێنج خشتەکییەکی خۆی هاویشتۆتە ناو پێنج خشتەکییەکەی (سالم)ەوە. وە بۆتە حەوت بەند!!.

لێرەدا هەر سێ وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد بڵاو دەکەینەوە، هەروەها دەقی پێنج خشتەکییەکی سالم (وەک خۆی بێ دەستکاری) دەخەینە پێش چاوی خوێنەران لەتەک دەقی شیعرەکەی مەولانادا هەتا پێنج دەقمان لەبەر دەستتا هەبێت و بتوانین بەراوردیان بکەین و جیاوازیەکانمان بۆ دەرکەوێت.

دەقی شیعرەکەی مەولانا:



موسم عید است وها نومید از دیدار یار
عالمی در عیش و نوش و مادو چشم اشکبار
هرکسی با یار درگشت و گلستان است و من
ز اشک سرخم شدکنار ازداغ هجران لاله زار
جان نثار مقدم جانان نکرده دم بدم
چیست بهره ازتفرجهای تخت جان نثار[1]
بی نوا و دل پر از خار و غریب و درد مند
دست بردل، سر بزانو، چشم درره، دل فگار
سینه، سوزان، دل فروزان، کوچه کوچه، دربدر
کس مبادا همچو من آواره از یار و دیار
(بکرەجویی) شد زهر چشمم روان از خون دل
عاقبت کردم دوا، داغ فراق سرچنار
(خالدا) گر نیستی دیوانه و صحرا نورد
تو کجا و کابل و غزنین و خاک قندهار

(١) ئەم بەیتە لە تەخمیسەکەی (سالم)دا نەنووسرابوو. بەڵام لە دیوانی مەولانا خالدی یادی مەردانی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسدا نووسرابوو. مامۆستا عبدالقادری دەباغی دەڵێت ئەو بەیتە بەشیعری مەولانا نازانم!

وەرگێڕانی یەکەمی پیرەمێرد:

جەژنە من وا ناهومێد و بێ بەشی دیداری یار
خەڵکی خوڕڕەم، من بەخوڕڕەم ، ئاو لە چاوم دێتە خوار
گشت لە گەشتی دەشتە داوێن پڕ گوڵاڵەی ئاڵ و من
ئەشکی سووری داخی دووری دەوری کردمە لالەزار
بێ نەواو و دڵ لە خەم کەیل و غەریب و بێ نسیب
دەست لەسەر دڵ سەر لە ئەژنۆ چاو لە ڕێگا پرسیار
دڵ سووتاو و جەرگ بڕاو، کۆڵان بەکۆڵان دەربەدەر
کەس بەدەردی من نەچێ دوورکەوتە بێ یار و دیار
خوێنی دڵ واهات بەچاوما بوو بەجۆگەی بەکرەجۆ
هەردوو سەرچاوەی چەمێکن کردمە تاسەی سەرچنار
باوە مردەی (باوە مردە)م ئاڵ بوو لاغی چاوەکەم
خۆزگە ئەمدی پێم بڵێن وا (باوە گێڵدی) گەییە شار[1]

پیم بلّێ خـالیـد، ئەگـەر تۆ وا ڕەهەندە و شـێت نەبی
تۆ لە کوێ و غەزنەین و کابول، خاکی هیند و قەندەهار

(١) ئەم بەیتە لە شیعرەکەدا شیعری پیرەمێردە.

***

## دەقی پێنج خشتەکی سالم لەسەر شیعرەکەی مەولانا خالد(١)

١

دڵ لە میحنەت کەیلە ڕێم کەن، با لە غەم دەرچم لەشار
ئەمـڕۆ ڕۆژێکە لە جـەمـعی مـەردومـان بگرم کـەنار
دەسـتـەئەژنۆ دانیـشم بێـچـارەو و زار و نزار
«مـوسم عـیـد است و مـانومـیـد از دیدار یار
عـالمی در عـیش و نوش و مـا دوچشم اشکبـار»

٢

ئەی ڕەفـیـقـان، بێن بەمـەردی چاری ئەم بێـچـارەکـەن
غـەرقی لوجـجـەی ژەرفی دەردم لەو دەمـە سەر تا بەدەن
نەونیـهـالی شـادمـانیم بۆ نەبێ سـا ڕیشـەکـەن؟
«هرکـسی با یار درگـشت و گلسـتـان است و من
ز اشک سـرخم شـدکنار از داغ هجـران لالە زار»

٣

ئەم جـیـهـانە خـولدە بۆ مـەردوم، وەلی بۆ من سـەقـەر
عـومـری شـیـرینم بەتەڵخی چوو لەبەر طولی سـەفـەر
قەط لە موددەی عومری خۆمدا هەفتەیێ نەمدی حەضەر
«سـینە سـوزان، دلفـروزان، کـوچە کـوچە، دربدر
کس مـبـادا همـچـو من، آوارە از دار و دیار»

٤

لەو دەمـە تا حـاڵ لە داوی دووریا کـەوتوومـە بەند
نەبووە فـارغ بم بەئانێ قـەط لە ئافـات و گـەزەند



ڕۆژ و شـەو مـەشـغـولی ئەم ذکـرەم بەئاوازی بلەند
بی نـوا و دل پـر از خـار و غـریب و درد مـند
دست بـردل سـربزانـو چشـم در رە دلـفـگـار

٥

دێتـە گـوێم دایم بەزاری ناڵەیی مـەحـزوونی دڵ
بێ قـەرار و ئیـضطرابە سـاڵ و مـەهـ قـانوونی دڵ
داتەپی کـاخی مـراد و تێکشکا ئەسـتـوونی دڵ
«بکرەجـوی شـد زهر چشـم روان ازخـون دل
عـاقـبت کـردم دوا داغ فـراق سـرچنار»

٦

کـەس نەبێ (سـالم) لە دونیـادا وەکـو من تووشی دەرد
بێ نەوا کـەوتوومـە غـوربەت ناتەوان و ڕەنگ زەرد
شیـعـری (مـەولانا) دەخـوێنم، هەڵدەکێـشم ئاهی سەرد
(خـالدا) گـرنیـسـتی دیوانە و صـحـرا نورد
توکـجـا و کـابل و غـزنین و خـاک قندهار

(١) ئەنجوومەنی ئەدیبان – ئەمین فەیزی. چاپی نوێی ١٩٨٣ .

***

وەرگێڕانی دووەمی تەخمیسەکە بەدەستکارییەوە لە لایەن پیرەمێردەوە

١

دڵ لە میحنەت کەیلە ڕێم کەن بەڵکو زوو دەرچم لە شار
ئەمـڕۆ ڕۆژێکە لە جـەنبـەی مـەردومـان بگرم کـەنار
دەسـتـەئەژنۆ دانیـشم بۆ حـاڵی خـۆم بگریم بەزار
ڕۆژی جـەژنە من تەریک و بێ بەشی دیداری یار
خـەڵکی خـوڕڕەم، من بەخـوڕڕەم ئاو لەچاوم دێتە خـوار

٢

ئەی ڕەفـیـقـان بێنە فـریام چاری ئەم بێـچـارەکـەن
غـەرقی لیـتـەی دەردی مـەحـرومی بووە سـەر تا بەدەن

نەو نیـهـالی شـادمـانیم با، نەکـا (با) ڕیشـەکـەن
گشت لە گەشتی دەشتە داوێن پڕ گوڵاڵەی ئاڵ و من
ئەشکی سـووری داخی دووری دەوری کـردمـە لالەزار

٣

لەو دەمـەی دەوران لە داوی دووریا خسـتوومیـە بەند
نەبووە ئارامم بەئانێ قـەت لە ئافـات و گـەزەند
ڕۆژ و شـەو کـەوتوومـە واوەیلا بەئاوازی بوڵەند
بێ نەوا و دڵ پڕ لە غـەم کـەیل و غـەریب و دەردمەند
دەست لەسـەر دڵ سـەرلەئەژنۆ چاو لە ڕێگەی پرسـیـار

٤

ئەم جیـهـانـە جەننەتە بۆ هەر کەسێ و بۆ من سەقەر
عـومـری شـیرینم بەتاڵی چوو لەبەر ئەرکی سەفەر
قەت لە موددەی عومری خۆمدا هەفتەیە نەمدی حەزەر
دڵ سـووتاو و جـەرگ بڕاو کـۆڵان بەکـۆڵان دەربەدەر
کـەس بەدەردی من نەچێ دوورکـەوتەیی یار و دیار

٥

چەند بەسـۆزە ئەی دڵەی سـووتاو کـزە و هاواری تۆ
دیدە! ئەی تۆ ئەم هەمـوو ئاوەی کـە کـردووتە بەجـۆ
ئـاوی زەڵم و تـانجـەڕۆ وشـکن لـە چاوتا بێ درۆ
خـوێنی دڵ واهات بەچاوما بوو بەجـۆگـەی بەکـرەجـۆ
هەردوو سەرچاوەی چەمێکن!! کردمە تاسەی سەرچنار

وەرگێڕانی سێیەمی پیرەمێرد بەدەستکارییەوە:[1]

دڵ لە میحنەت کەیلە، ڕێم کەن بەڵکو، زوو دەرچم، لەشار
ئەمـڕۆ ڕۆژێکە لە جـەمـعی مـەردومـان بگرم کـەنار
دەسـتـەئەژنۆ دانیـشم، بۆ حـاڵی خـۆم بگریم بەزار
ڕۆژی جـەژنە و من کـەسـاس و بێ بەشی دیداری یار
خەڵکی خـوڕڕەم، من بەخوڕڕەم ئاو لە چاوم دێتە خوار

..............................



ئەی ڕەفیـقـان، بێنە فـریام، چاری ئەم بێـچارە کەن
نوقمی لیتەی دەردی دووریم، تێی چەقیم سەر تا بەدەن
نەو نهـالی شـادمـانیم با نەکـا، با، ڕیشـەکـەن
گشت لە گەشتی دەشتە، داوێن پڕ گوڵاڵەی ئاڵ و من
ئەشکی سـووری داخی دووری، دەوری کـردمـە لالەزار

..............................

لەو دەمـەی دەوران لە داوی مـیحنەتا خسـتوویە بەند
نەبووە ئارام و سـەرەوتم هیچ لە ئافـات و گـەزەند
ڕۆژ و شـەو کـەوتوومـە واوەیلا بەئاوازی بڵـەند
بێ نەوا و دڵ لە غەم کەیل و غەریب و موستەمەند
دەست لەسـەر دڵ، سـەرلەئەژنۆ چاو لە ڕێگەی پرسـیـار

..............................

ئەم جیـهـانە، جەننەتە، بۆ هەر کەس و بۆ من سـەقەر
عـومـری شـیرینم بەتاڵی چوو، لەبەر ئەرکی سـەفـەر
قەت لە مودەی عومری خۆما، هەفتەیەک نەمدی (حضر)
دڵ سـووتاو و جـەرگ بڕاو، کـۆڵان بەکـۆڵان دەربەدەر
کـەس بەدەردی من نەچێ، دوورکـەوتە بێ یار و دیار

..............................

چەند بەسـۆزە، ئەی دڵەی سـووتاو، کـزە و هاواری تۆ
دیدە! ئەی تۆ؟! ئەم هەمـوو ئاوە، کـە کـردووتە بە جۆ[2]
ئـاوی زەڵم و تـانجـەڕۆ، وشـکن لـە چاوتا بێ درۆ
خـوێنی دڵ واهات بەچاوما بوو بەجـۆگـەی بەکـرەجـۆ
هەردوو سـەرچاوەی چەمێکن، کـردمـە تاسـەی سـەرچنار

..............................

(شـیـوە سـوور)ە ئەشکی دیدەم، پەیڕەوی لافـاو ئەکـەم
شـەو بڵێسـەم بەرزە وێنەی، باوەگـوڕگـوڕ ناو ئەکـەم
دەست شکستـەم بۆیە مەیلی (مومیا)ی دی خاو ئەکەم
باوەمـەردەی باوەمـردەم (ئالبـولاخ)ە چاوەکـەم
خۆزگە ئەمبیست پێم بڵێن (وا باوە گلدی) گەیبە شار

..............................

کەس نەبێ (سالم) لە دنیادا، وەکو من تووشی دەرد
دوو ڕەفیقی غوربەتن، ڕۆژی سیاه و ڕەنگی زەرد
شیعری مەولانا دەخوێنم، هەڵدەکێشم ئاهی سەرد
پێم بڵێ (خالد) ئەگەر تۆ، شێت نەبی و سەحرانەوەرد
تۆ لە کوێ و غەزنەین و کابل، خاکی هیند و قەندەهار؟!

---

(١) دەنگی گێتی تازە بەرگی ٢٦ لاپەڕەی ١٨٣.
(٢) بە جۆ: بەجۆگەلە، بەچەم.

***

## بە زوڵفم وت

لە فارسییەوە(١):

بەزوڵفم وت لەبەرچی ڕوو ڕەشی؟! گرژ بوو وتی چیبکەم
هەمیشە وام لەبەر ڕۆژا، بەئاهی خەڵکی گیراوم
بە دەوری دیدەما پەرژینی برژانگ پاسەوانێکە
ئیتر ئەو ڕێی نییە ڕاو کا و خەویش نایێتە ناو چاوم

---

(١) پیرەمێرد ناوی شاعیرەکەی نەنووسیوە و مامۆستا هاواریش لە کتێبەکەیدا تەنها ئەوەندەی نووسیوە) ئەم دوو دێڕەی لە شیعرێکی فارسییەوە وەرگرتووە).

***

## پیرەمێرد و وەڵامێک بۆ شێخ مەحموودی نەمر

لە سەرەتای ئەم دیوانەدا شیعری (لە گوێم دێ دەنگی لای لایەی وەتەن)مان نووسی، کە لە کاتی خۆیدا پیرەمێرد سەبارەت بەهەندێ ڕەخنە و گلەیی خۆی بۆ شێخی مەزنی نووسیبوو. دواییش بۆ دڵدانەوەی شێخ و ڕوونکردنەوەی هەقیقەتی مەبەست و خواستی شیعرەکەی، ئەم شیعرەی (ئەبێ بەخشندە) بۆ شێخ دەنووسێت. شیعری گلەییەکە زادەی بیر و قەڵەمی پیرەمێرد خۆیەتی، بەڵام داوای بەخشین و ڕاست کردنەوەکە، کە بەیەکێک لە شیعرە پڕ لە وردەکاری و حیکمەتەکانی پیرەمێرد دادەنرێت لە ڕاستیدا وەرگێڕاوی شیعرێکی فارسییە و پیرەمێرد وەک زۆر شیعری وەرگێڕاوی کە، هەندێ بەیت یاخود واتای خۆی تیادا بەکار هێناوە، شیعرە فارسییەکەمان نەدۆزیەوە، گەلێ هەوڵمان دا، هەندێ کەس دەیانتوانی ئەو دەقەمان وەدەست بخەن، بەڵام نازانم بۆ بەدەنگمانەوە نەهاتن!! سەبارەت بەو شیعرە دوو بەیتی فارسیمان بەدەستەوەیە. یەکێکیان بەیتی ناو دەقی ئەو شیعرە فارسییەیە کە پیرەمێرد شیعرە کوردیەکەی



لێ وەرگرتووە، بەیتەکە ئەمەیە:

«چوب را آب فرو نمی برد دانی چیست؟!
شرم دارد کەفرو برد پرور دەئی خویش!»

هەروەها (مەولانا خالدی نەقشبەندی) بەیتێکی هەیە، لەو بابەتی پەند و حیکمەتە کە دەڵێت:

«گویند چوب زاب بود پرورش پذیر
اورا ازان فرو نبرد آب خوشگوار»(١)
«ئاو دار لەسەر سەر ئەگرێ نوقوم نابی بۆ ئەوەی
پەروەردەیەتی، نوقمی بکا، بۆی دەبێ بەعار»(٢)

لێرەدا شیعرە وەرگێڕراوەکە دەنووسین، هەتا لە داهاتوودا، لەلایەکەوە، دەقە فارسییەکە سەرهەڵدەدات!!

نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێت کە مامۆستا محەممەد ڕەسول هاوار لە لاپەڕەی (٧٣)ی دیوانی پیرەمێرددا ئاماژەی بۆ ئەم دەقی فارسی شیعرە و وەرگرتنەی پیرەمێرد کردووە و نووسیویە «ئەم هەڵبەستە زۆر بەرزەی پیرەمێرد بیروباوەڕی هەندێ لە دێڕەکانی لە هەڵبەستێکی فارسییەوە وەرگرتووە».

«ئەبێ بەخشندە مل کەچ کا، لەڕاستی مووچەخۆری خۆی
سوراحی، بۆ پیاڵە، سەر فرۆ دێنێ، کە تێکا بۆی(٣)
کە ئاوداری لەسەر سەر، گرتووە، ئەزانێ چی تیایە(٤)
لەلای نەنگە کە پەروەردەی نقوم کا گەورەیی وایە
لقی شۆڕی درەخت میوەی ئەخۆن بێ ئەرکی بەرد و دار
پەڵی بەرد بۆ پەلی بەرزە، لەقەیشە بۆ لقی بەردار(٥)
لە دەردی دووریا، بێزار و بێزراوم، ئەمەند زارم(٦)
ئەجەل دێ بمکوژێ، نامناسێ، چی بکەم، نامرم ماوم
لەبەر ئاشووبی خێڵم، هیچ شەوێ خەو نایەتە چاوم
خەوی ناخۆش ئەبینم، بەم پەرێشانی خاویە، خاوم
ئومێدی سەر لەسەر دەرکەن، ئەوانەی ڕاست و ڕووناکن
قەڵەم، هەر سەر قەڵەم، مۆم بۆ مقەست، هەر بۆ ئەویش چاکن
ئەڵێن مورغی سلیمان ئاو لەژێر خاکا ئەبینێ ئەو
منیش حەوت ساڵە ڕێ دوور بێ، بەچاوی دڵ ئەبینم ئەو

چرا ڕووناکی بۆ ژێر خـۆی نیـــیـه ڕەحـمـەت لە بابی با
ئەوی ڕووناکی کـەچ بینایە، گـۆڕە ڕەنجی با بیـبـا
بە جـووت پەروانەو و مـاسی کـە دڵدادەی چرا و گـوڵن
نزیـکی ئـەم سـووتـینـێ، لە دووری ئاو ئەوان حـوڵن

........................................

(١) یادی مەردان – مەلا عەبدولکەریمی مدەڕس، بەشی یەکەم ل ٥٢١
(٢) ژین ژمارە٨٤٠- ساڵی ١٩٤٦
(٣) لای م.ھ ئەم نیوە بەیتە بەم جۆرە نووسرابوو:
سوراحی سەر فروو دێنێ لە بۆ پیاڵە، کە تێکا بۆی
(٤، ٥، ٦) ئەم نیوە بەیتانە لە لاپەڕەی -٧٣-ی دیوانی پیرەمێردی (م.ھ)دا جۆرێکی جیاوازن.

***

## ئەمشەو

ئەم شیـعـرە یەکـێکە لە شیـعـرە بەناوبانگەکـانی ناو ئەدەبیـاتی فـارسی، پیـرەمـێـرد کـردوویە بەکـوردی و لە ژمـارە ٦٠٥ی سـاڵـی١٩٤٠دا بڵاوی کـردۆتەوە. وە پێـشـکەشی (نەجـمـەددینی مەلا)ی کردووە.

مـامۆسـتـا هاوار لە دیوانی پیرەمێردی نەمردا نووسیویە: «لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٥دا ئەم شیـعـرەی بڵاوکردۆتەوە!. نازانین مـامـۆسـتـا هاوار ئەو مـێـژووەی لە کـام سـەرچاوە وەرگـرتووە. هەروەها لە پەراوێزی شیعـرەکەدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە پیرەمێرد ئەو شیعرەی لە فـارسییەوە وەرگرتـووە!. بەڵام ناوی شاعیر و سەرچاوەی ئەم شیعرە هەتا ئێستـا ئاشکرا نییە!. جگە لەوەی گەلێ جـیـاوازی هەیە لەنێوان ئەم نوسخـەیەی ئێمـە و ئەوی مـامـۆسـتـا هاوار بۆ بەراورد خـوێنەر دەتوانی تەماشای لاپەڕە (٢٠٦)ی دیوانی پیرەمێردی مامۆستا هاوار بکات.

خەیاڵی وا لە باخەڵما، لە توێی (پیراهن)ە[١] ئەمشەو
بەوەسڵێکی خەیاڵ دەورەم، سەرانسەر گوڵشـەنە ئەمشەو
هەمـوو مـوویەکی ئەندامم، لە خـۆشیـانا خـەدەنگێکە[٢]
ئەگـەر ئازایە خـۆی دەرخـا، ئەوی وا دوژمنە ئەمـشـەو
شکـسـتـی زوڵـفی تۆبەی پێ شکـاندم، تـۆبە لەو تـۆبە
دڵی شێخ و ملی (مل)[٣] تێک شکا، هەر بشکەنە ئەمشەو
بەسەرمەستی کە دەستم کەوت لەناری نار و نوور دەرکەوت
(یدی بیـضـا)یە، دەسـتم، بۆیە دنیـا ڕەوشـەنە ئەمـشـەو



تەجەلیی(نووری)(طور)[٤]بەم طەورە[٥]طوڕڕەی عەشقی پیشاندام
بە پەروازی جنوون، جلوەم لە (وادی أیمن)ە[٦] ئەمـشـەو
لە دەوری بێـسـتـوون دەنگی قـوڵـنگی ڕۆحی فـەرهاد دێ
قەوانێـکی غـەرامەفـونی (شۆخی ئەرمەن)ە[٧] ئەمشـەو
کە گوێم زرنگایەوە، وا دەنگی زەنگی ناقەی لەیل هات
ئەوا لەو لایشـەوە، مـەجنوونە ئەگـری، شـیـوەنە ئەمشـەو
بەسـەر شـاخی ئاراراتدا، بەلاوک پیـرەمـێـرد سـەرکـەوت
ئەڵێ شـوێنم کـەون کـوڕگـەل، شـەوی سـەرکـەوتنە ئەمشـەو

........................................

(١)پیراهن: کراس
(٢) خەدەنگ: تیر
(٣) مل، مول: شووشەی شەراب
(٤) طور: شاخی سینا
(٥) طەور: شێوە. جۆرە
(٦) وادی أیمن: واتا ئەو دۆڵە پیرۆزەی لە شاخی سینادایە.
(٧) شۆخی ئەرمەن: شیرینی ئەرمەن.

***

## بەیادی کۆن[١]

دڵ برینداربێ نەوەک ناسـۆری تیـری تانەبێ
سـینەچاکی چاکـە، بۆ برژانگی ئەو نیـشـانە بێ
عەشق کە کەوتە کەللەوە، هەر ڕێیەک بگرێ ڕێی ئەوە
یەک سیاقە هەق پەرستی، کەعبە یا بتخانە بێ
خـواپەرسـتـی باتنێـکی پاک و بێ گـەردی ئەوێ
(سبحە) تەوقی زاهدە سەد جار ئەگەر سەددا نەبێ
بۆ سەوادی تاری تووڕەی زوڵفی جوانان کاشکی
یەک لەسەر یەک زامی دڵ توێ توێ بێ وێنەی شانە بێ
پێکەنینی دولبەران میقداری عیسمەت کەم ئەکا
لێـوی خـونچـە هەر ئەوەندە نازکـە تاوا نەبێ
خـاڵەکـانت دانە دانەن، چاوەکـەم چاوی منیش
با بلێین چاو لەو ئەکا فرمێسکەکەی بادانە بێ

خوا ڕەقیب ئاوارەکا، تۆزێ لە چاوما، تۆز، نەبێ
بێ غەمم، ئەو تا، نەبێ، تاکەی لە چاوما، تانە، بێ

(١) پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە فارسییەوە وەرگرتووە. بەڵام ناوی شاعیرەکەی نەنووسیوە . لە لاپەڕە ٢٠٨ی پیرەمێردی (م.ه)دا نووسراوە ساڵی ١٩٤٨، بەڵام ئەم شیعرە لە ژمارە ٨٩٦ی (ژین)ی ساڵی ١٩٤٧دا بلاوکراوەتەوە.

***

## شەوی یەڵدای سالم

پیرەمێرد چوار بەیت لە شیعری شەوی یەڵدا (شب یلدا)ی (سالم)ی لە کۆتایی پەخشانی (شیعر و فەن)دا نووسیوە و باسی ئەو ڕێکەوتە دەکات کە بۆ یەکەمجار ئەو شیعرەی گوێ لێ بووە، بەم جۆرە لە «خانەقاوە ئەچوومە ئەستەمول لە (باطوم) سواری پاپۆڕ بووین ئێوارە لە سەربانی پاپۆڕەکە پیاسەم ئەکرد، زاتێکی بەشکۆ و سیما بەکزیەوە شیعری فارسی دەگوت، لام خۆش هات، نزیکی کەوتمەوە، ئاشنایی. فەرمووی، کوێندەریت؟! وتم سلێمانی، وتی، دوو شاعیر، یەکێ ساحێب قەسیدەی شاهو ماهی شێخ ڕەزا و دووەم غەزەلی (شب یلدا)ی سالم. من قەسیدەی شاهو ماهی شێخ ڕەزام بیستبوو بەڵام (شب یلدا)م نەئەزانی، بۆی خوێندمەوە:

بر سر مصحف رو زلف چلیپا داری
تو پریچهره مگر دین مسیما داری
زده ای طرەئی شبرنگ بران صفحهء رخ
روز و شب مجلس کافر بەکلیسا داری
قصد قتلم نه بەتنها کند ان دیدهء مست
خون صد طایفه در گردن مینا داری
زلف یلدا بر رخ سال توان ریدشبی
این چه سریست بەیک ماده دو یلدا داری

لێکدانەوەی مانای شیعرەکان:

١- لەسەر ڕووی وەکو قورعان پاک و پیرۆزت، زولفی وەک سەلیبت داناوە، مەگەر تۆ کە وەک فریشتەی و ئیسلامیت ئایینی مەسیحیت هەیە؟

٢- لەسەر ڕوومای ڕوونی وەک ڕۆژت، توڕرەی وێنەی شەوت داناوە یا لێداوە، شەو و ڕۆژ، کۆبوونەوەی کافرانت لە کلیسا گرتووە.

٣- ئەو چاوە مەستانەت قەسدی کوشتنی تەنیا منیان نەکردووە، بەڵکو خوێنی سەد تایفە لە گەردنی وەکو مینای تۆدایە.





٤- لە ساڵێکدا تەنیا شەوێکی یەڵدای تێدایە کە وەک زولفی ڕەش بەسەر ڕوومای ساڵە، دیارە ئەمە چ ڕەمزێکە کە تۆ بەمانگێک دوو یەڵدات هەیە؟ شاعیری هونەرمەند ڕووی یارەکەی بەمانگ شوبهاندووە کە بەدوو لا زولفی لاداوە کە لە ڕەشی و درێژیدا وەک شەوی یەڵدان کە درێژترین شەوی ساڵە. لەم چوار دێڕەوە دەتوانم بڵێم کە سالم لەگەڵ گەورەترین شاعیری فارسی هاوچەرخی خۆیدا ئەگەر لە پێشتر نەبێ لەپاشتر نییە. ئەو چوار دێڕە پڕە لە جوانکاری و وردەکاری هونەرمەندانەی شاعیری کوردی فارسی بێژی کەم هاوتا».

***

## دوو چوارین لە فارسییەوە(١)

**١**

«بە زوڵفم گوت، لەبەرچی ڕوو ڕەشی؟ گرژ بوو، وتی چی بکەم
هەمیشە وام لەبەر ڕۆژا، بەئاهی خەڵکی گیراوم
بە دەوری دیدەما پەرژینی برژانگ پاسەوانێکە
ئیتر ئەو ڕێی نییە دەرچێ، خەویش نایەتە نێو چاوم»

**٢**

«ئەی تالیبی دنیا بەهەوا ڕەنجووری
ئەی تالیبی عوقبی لە هەقیقەت دووری
ئەی بەندەی خوا بەمەیلی ئەوە مەسروری
تۆ هەردوو جیهانت هەیە، تۆ مەنسووری»

(١) دەقی فارسی ئەم دوو چوارینەیەمان نەدۆزیەوە. پیرەمێرد کاتێ کردوویە بەکوردی نەینووسیوە ئەمانە شیعری کام شاعیرن!!

***

## پیرەمێرد و چەند بەیتێک لە شیعری فارسی

١- ابرو کمند رستم و گیو کمندی زال
مژگان سنان گیو و زنخ چاه بیژن است

برۆی وەک کەمەندی ڕۆستەم و زوڵف و گێسووی وەک کەمەندی زاڵ، مژۆڵی چەشنی ڕمی گیو و چاڵی چەناگەی وەک ئەو چاڵەیە کە بێژەنی کوڕی گیوی تێدا بەدیلیی گیرابوو. وا دێتە بیرم کە کەمەندی هەوەڵ هەڵەیە و کەمانە، واتا ئەو کەمانەی ڕۆستەم کە کەس نەیتوانیوە بیکێشێ.

٢- گرین تیر ترکش رستمی است
نەبر مردە بر زندە باید گریست

واتا: ئەگەر ئەم تیرە کە هاویشتی لە تیردانی ڕۆستەم بێ، دەبێ بۆ زیندووەکان بگرین نە بۆ مردووەکان. ئەو شیعرەی فیردەوسی هی کاتێکە کە ڕۆستەم لەبەر ماندوویی ڕەخش دڵی نەهات بیباتە شەڕ و بەپیادەیی ڕۆیشت. ئەشکەبووسی پاڵەوانی تورک پێی گوت، پیادەی کەس نەناس و بێ ئەسپ تۆ بۆ هاتوویتە مەیدان، ڕۆستەم لە وەڵامدا دەڵێ: تووسی نەوزەر بۆیە منی بەپیادە ناردووە کە تۆ بکوژم و ئەسپەکەت لێ بستێنم، جا، کە بەتیرێ کوشتی، سپاسالاری تورک گوتی: ئەگەر ئەم تیرهاوێژە ڕۆستەم بێ... هتد.

پیرەمێرد ئەو دوو بەیتەی لێرەدا بۆیە بەنموونە هێناوەتەوە کە نرخ و بایەخی شیعری نوێ دەربخات و بەراوردیان بکات لەگەڵ ئوسلوبی شیعری کۆندا کە تەشبیهی خۆشەویستەکەی خۆیان کردووە بەشتی وەها لەبری ئەوەی کە خوێنەر ئەو ئافرەتەی بەدڵا بچێت و بەجوانی بزانێ وەک دێو و درنج و کارەساتی جەنگ و کەلوپەلی جەنگی بێتە بەرچاو.

***

## بەیتێکی (کلیم)ی هەمەدانی

سپاه غمزه است اندر هزیمت فتح من یابد
شکست افتاد بر دلهی چوبر گردید مژگانت

واتا: لەشکری غەمزە و نازت کاتێ کە شکا، هێشتا گرتنی من دەبینێ چونکە ئەو کاتەی کە تۆ مژۆڵی چاوەکانت بۆ هەرلایەک وەرگێڕی دڵان دەکەونە لەرزین و دەشکێن.

آسمانرا حق بودگر خون ببارد برزمین
بر زوال ملک مستعصم امیر المؤمنین

شێخی سەعدی ئەم شیعرەی لە لاواندنەوەی (مستعصم)ی خەلیفەی عەباسی گوتووە و قەسیدەیەکە، واتا عاسمان حەقی خۆیەتی ئەگەر خوێن ببارێنێتە سەر زەوی بۆ لەناوچوونی وڵاتی مستعصم کە ئەمیری موسوڵمانانە کە بەدەست هۆلاکۆ کوژرا.

***

پیرەمێرد شیعرێکی (رشید وطواط)ی وەرگێڕاوە و بەنموونەی شیعری باش لە پەخشانی (گەلاوێژ پێنج ساڵانە)دا نووسیویە. ئاماژەی بۆ سەرچاوەکەی نەکردووە و دەقە فارسییەکەی نەنووسیوە.

دەوری بەدەبدەبەی شەهی مەحموودی غەزنەوی
پڕ بوو لە پاڵەوانی بڵندپایە ڕووی زەوی
ئەم شەهریار و ئەم هەموو ناودارە وەک بەهار
باویان نەما، توانەوە وەک بەفری ساڵی پار



ئێستا نەدەنگ و نەڕەنگ و نەشوێن و هەیکەلی
تەپڵ و نەقارە ماوەتەوە سەر قڕەی (قەل)ی
تەنیا بەشیعری عەسری یادیان ئەکەینەوە
زیندوون بەناو ئەگەرچی زەمان کەوتە بەینەوە
ناوی گوزەشتە شیعرەکە زیندووی ئەکاتەوە
پێویستە هۆشی، خۆشی شیعر بێ بەلاتەوە

***

## چوارینێکی سەدید(١)

پیرەمێرد ساڵی ١٩٣٦ ئەم چوارینەیە دەکاتە کوردی و ناوی شاعیرەکەش دەنووسێت کە (سەدید)ە. من لە بارەی ئەم شاعیرەوە، کە پیرەمێرد لە شیعرا بەهاوشانی (مەولانا خالید)ی داناوە، هیچم دەست نەکەوت، دیارە کە بەرهەمی هەیە و ئێمە ئاگاداری نین یاخود لە دەورووپشتی ئێمەدا نییە یا دەبێ فەوتابێت. بەواتای پیرەمێرد ئەم شاعیرە یەکێک بووە لەو شاعیرە باشانەی کە کورد بووە و بەفارسی شیعری زۆر جوانی نووسیوە، پیرەمێرد دەڵێت:

«لە شوعەرای زۆر کۆنی کورد لە ئاتشکدە، چەند کەسێکم دی، لەوانەن تاجی ئەدەبیاتی کورد بن، جەزبێکی شارەزووریمان بووە (مەبەستی لە مەولانا خالد)ە لە شجاعەت و شاعریدا زۆر ناودار بووە کەوتۆتە هندستان. سەدید ناوێکی ترمان بووە لە قەبیلەی کرمانج شیعری جوانی هەیە، روباعییەکی هەیە، دەڵێ:

«گویند کە برد میداز گل خارش
جرمیست کەمی تهند بر گلزارش
چون رخساریش همیشە در چشم من است
عکس مژدەی من است بر رخسارش

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

ئەڵێن لەسەر گوڵ چقڵ ڕواوە
خوا هەڵناگرێ ئەم بەند و باوە
چونکو ڕوخساری لەناو چاومایە
عەکسی برژانگی بن لە ئاومایە!

---

(١) ژیان (٤٦٣)ی ساڵی ١٩٣٦ .

***

## شیعرێکی شێخ عومەر ضیاءالدینی بیارە بۆ حاجی شێخ مستەفای شێخ عەبدولسەمەدی قازی

شێخ عومەر ئەم شیعرەی لەگەڵ نامەیەکدا بۆ شێخ مستەفا ناردووە. پیرەمێرد نامەکە و شیعرەکەی کردووە بەکوردی. لێرەدا تەنها شیعرەکە دەنووسین وە دەقە فارسییەکەیان نەدۆزیەوە.

ئەو بەیادی دۆست هێندە سەرخۆشە
هەرچی دروست کا، ئەوەی لا خۆشە
پرسیاری حاڵ، ئەگەر ئەفەرموون
هیچ کەس نابینێ، لە جیهان مەمنوون
بە گەرد و خولی چەرخی بێ وەفا
جەفا بوەتە سەر قافڵەی سەفا
سلام علی الذین اصطفی
خصوص بۆ زاتێک سمّی مصطفی

***

## دوو چوارینی خەیام

**١٩٣٩**

پیرەمێرد لەوەرگێڕانی ئەو دوو چوارینەیەدا هەندێ دەستکاری کردووە بەڵام مانای چوارینەکان وەک خۆیان ماونەتەوە. لێرەدا بۆ بەراورد دەقی فارسی چوارینەکان و وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد هەروەها (شێخ سەلام) دەنووسین:

١- خەیام:

دو شینە پی شراب میگر دیدم
افسردەگلی، کنا آتش دیدم
گفتم کە چەکردەی کەمی سوزندت؟
گفتا، نفسی درین چمن خندیدم

٢- پیرەمێرد:

گوڵم دی لەناو کوڵی مەنجەڵا
ئەیان کوڵاند و گڕی لە دڵا
وتم چیت کردووە وا ئەتسووتێنن
وتی پێکەنیم، لە عەرشی چڵا

٣- شێخ سەلام:

دوێ شەو بۆ شەراب من لە گەڕاندا
گوڵێکم بینی، بەئاگرداندا



هەڵقرچاو پێم وت، بۆ ئەتسووتێنن
وتی، پێکەنیم لەناو باخاندا

١- خەیام:

گل گفت: بەاز لقای من روئی نیست
چندین ستم گلا بگر باز ز چیست؟
بولبول بەزبان حال با او میگفت
یک روز کە خندید کە سالی نگریت؟

٢- پیرەمێرد:

بولبول بەگوڵی وت: بەلووت و پووت
ناز کەم کە گەلێ گوڵ وەک تۆ پشکووت
گوڵ وتی ڕاستە، ئەم تەعنەت بەڵام
کەی عاشق ئەمەی بەمەعشووقەی وت

٣- شێخ سەلام:

گوڵ وتی: سەیری ڕەنگم چەند جوانە
زوڵمی گوڵاوگەر لای من تاوانە
بلبلێ پێی وت، بەزبانی حاڵ
ڕۆژێ پێکەنین، ساڵێ گریانە

مامۆستا (عەبدولقادری دەباغی) سەبارەت بەم چوارینەیە دەڵێت: چوارینەکەی پیرەمێرد لەو چوارینەیەی (خەیام)ەوە دوورە و، ئەوە وەرگێڕانی چوارینەیەکی دیکەی خەیامە کە بەداخەوە فارسییەکەیان دەست نەکەوت.

***

## پیرەمێرد و مەتەڵ

مەتەڵ بەشێکە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی. ئەو کاتەی ژیانی کۆمەڵی کوردەواری وەک ئێستا نەبووە کە پڕە لە هەزاران گیروگرفت و مرۆڤ هەر بەوەدا ڕادەگات کە ژیانی ڕۆژانە و نان و بەرگی خۆی و خێزانی مسۆگەر بکات. ژیانی ئەو کاتەی کۆمەڵی کوردەواری سادە و ئاسان بووە کاتێکی باشیان بەدەستەوە بووە بۆ بیرکردنەوە و داهێنان، بۆ دروست کردنی مەتەڵ و ڕێکخستنی بەیت و گێڕانەوەی چیرۆکی پڕ لە پەند و ئامۆژگاری، خەڵکەکە دڵ و دەروونیان وەک ئێستای ئێمە پیس و ژەنگاوی نەبووە. یەکتریان خۆشویستوە، یارمەتی یەکتریان داوە. بەتەنگ لێقەومان و ناخۆشی یەکترەوە هاتوون. جگە لەمانەش هۆیەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و سینەما و

شانۆ و ڤیدیۆ و ڕیکۆردەر و...هتد، ئەمانە نەبووە هەتا کاتی دەستبەتاڵی خۆی پێوە بەسەر بەرێت. لەبەر ئەوە گرنگیان داوە بەداهێنانی مەتەڵ و گێڕانەوەی چیرۆکی هەمەجۆر بەتایبەتی لە شەوانی دوور و درێژی زستاندا کە لە گوێ ئاگردان و بەدیار قوتیلەوە هەتا دوای نیوەی شەو ماونەتەوە. پیرەمێردیش لە سەردەمی منداڵی خۆیدا لە دەوروبەر و جیهانێکی وەهادا چاوی کردۆتەوە و پێگەییوە. تەمەن و حاڵەتی پیریی بەهیچ چەشنێک کاری لە بیری تیژ و بیرەوەرییەکانی نەکردووە. زۆرجار لە ڕۆژنامەکەیدا ژیانی ئەو کاتەی کۆمەڵی کوردەواری و منداڵی خۆی بەپەخشانی زۆر ناسک و جوان نووسیوە. لە لایەکی کەشەوە پیرەمێرد لە ژیانی ئەدەبی خۆیدا گرنگییەکی زۆری داوە بەبووژاندنەوە و زیندووکردنەوەی فۆلکلۆری کوردی. چەندەها نووسین و هەزارەها پەندی پێشینان و ئەو هەموو چیرۆکە فۆلکلۆریانەی گەواهی ئەم ڕاستیەن.

ئنجا ئەوەندەی بۆی لوا بێ لە ڕۆژنامەکەیدا ئەو مەتەڵانەی کە بیرماون و هەندێکیش کە خۆی دروستی کردوون بڵاوکردۆتەوە. وە سەبارەت بەمەتەڵی کوردی، کورتە نووسین و بیروڕایەکی جوانی هەیە، کە لێرەدا دەینووسین و ئەو مەتەڵانەشی کە دەستمان کەوتوون بڵاویان دەکەینەوە. پیرەمێرد لەم بارەیەوە دەفەرموویێت: «کورد هەندێ سجیە و سەکتەر و نوکتەی خۆی هەیە، کە بەزبانی خۆی دایناوە، لە کەم میللەتی تردا بینراوە. چەندێک لەناو فورس و عەرەبدا (معما) و (لغز) باو بوو، ئەمەندە (مغلق) و گرفت و بێ تام و بۆ بوو، پیاو دڵی تێکەڵ ئەهات. یەکێ لە معما فارسییەکان ئەمە بوو (زلعل یار جستم ضد شرقی)، ئنجا گوێتان لێ بێ (ضد شرقی، غربی، غربی عربی، عربی ربیع، ربیع بەهار، بهار نهار، نهار ڕۆژ، ڕۆژ یوم، یوم موی، موی شەعر، شەعر شیعر، شیعر بەیت، بیت دار، دار راد، راد زاد، زاد توشە، توشە بوسە)، دە وەرنە سەیری ئەم گوریس کێشە! کێیە؟! ئێمە هەندێ مەتەڵمان هەیە زۆرجوان و ڕێکوپێک و بەوەزن و قافیە و پڕ مەعنا، لەپێشەوە کوتوپڕ لە مەرام و مەعناکەی ناگەی، دوایی کە زانیت بەچی ئەڵێن فەرەحێک ئەخاتە دڵتەوە، جا ئێمە ئەمانەوێ وەکو بەرگوزیدەکەی خۆم شێخ محمدی خاڵ، لە دووی ئەودالە، لەلایەکیشەوە ئێمە ئەو مەتەڵانەی کوردیە کۆبکەینەوە، بەرە بەرە لە (ژین)دا بیاننووسین ئێمە، کە پێچی مێزەرێکمان ماوە، بیکەن بەکتێبی وەک مێزەر، لەناو نەچێ، من خۆم هەرچیم لەبیرە ئەینووسم، بەڵام بەتەنیا پێک نایە، هەرچی شارەزایە و مەتەڵی لایە، بینێرێ بۆ ژین. وا لەم جارەوە بەیاریدەی خوا دەست پێدەکەین، چونکە لە نووسین ئەدواین با لە پێشەوە مەتەڵێکی کاغەز و مەرەکەب، قەڵەم نووسەکەی بڵێین»(١).

١

زەوی سپی، توێی سیا
ئاودێڕی پیاو، بێڵی گیا



تۆ تا دوی کەوی ئەو سەرەڕۆیە
ڕووی لێ وەرگێڕی ئەو لە دوی تۆیە(٢)

٢

ئەسووڕێتەوە بەدەورە وەک ئاش
فیشکە فیشکیەتی بەهەوڵ و تەڵاش
مارێکی ڕەشی لە مل ئاڵاوە
وا پیاوێکیش پێی بەپێیا ناوە
بلیمەتێکە هێند زۆری زۆرە
(زەنگی) پیاو ئەخوا، ئەو ئاسن خۆرە
سەر لە پۆڵای سەخت ناپێچێتەوە
لە قینا ئاگری لێ ئەبێتەوە(٣)

٣

وشک تەڕ دەبێ لەبەراوردێ
ئەو تەڕی تێخەی بەوشکی دەردێ(٤)

٤

دەمی هەیە دانی نییە
هەناسەی هەیە گیانی نییە
گوانی هەیە و بێ شیرە
ئەگری و بەئاگر ژیرە
پەنجەی لە قون توند ئەکەن
هەناسەی پێ بەند ئەکەن
سابرێنە زلەی توک و پوک کەمە
بێ سات و سەودا نابێتە گەمە(٥)

٥

زیندوویە مردووی بردە قەراغ شار
ئەوی ناشت و خۆی لێ گرتە کەنار



زیندوویەکی تر هات مردوو بەرێ
مردوو زیندووی گرت بەچەرمە سەرێ[٦]

.................................................................

(١) ژین ژمارە ٨١٥ ساڵی ١٩٤٦ .
(٢) ئەو مەتەڵە (سێبەرە).
(٣) چەرخی تیژکردن.
(٤) تەندووری نان.
(٥) مووشە دەمەی کوورە.
(٦) فاقە، تەڵە.

***

پیرەمێرد دوای ئەم چەند مەتەڵە بیروڕایەکی خۆی دەردەبڕێ و لەسەر نووسینی مەتەڵەکان بەردەوام دەبێت:

«ئێمە کە مەتەڵمان کۆ ئەکردەوە لە ژێریشەوە ئەو مەتەڵە بۆچی بێژراوە ئەماننووسی، کە لێکمان دایەوە ئەوە تامی نەبوو، مەتەڵ وا باشە کە بۆی بگەڕێن و خۆیان هەڵی بێنن و بۆمان بنووسن، تا ئێمەش لە غەزەتەدا بڵێین فلانەکەس زانیویە، لەبەر ئەمە لەمەودوا تەنها مەتەڵەکە ئەنووسین، هەر کەسێ زانی بۆمان بنووسێ:

٦

بزنێکیان سواری پشتی گامێش کرد
کەچی پیاوێکی زلی بەکێش کرد!

٧

تەپ لەسەر تەپی
دەستت بەڕەپی
دەستەکەی ترت
تێی ڕشت پڕ لەپی

٨

لە سەرما و با، بێ خەتەرە
زکی پڕە و بێ سێبەرە



٩

ئەسپێکم هەیە ئالیکی ناوێ
کاتێ سواری بووم ئەجمە سلاوێ
هیچی لە ئەسپی سواری تر ناکا
هیچ ناحیلێنێ بۆ ئاو و بۆ کا
لەبەرەو ژوورە قوشقونی توندە
لەبەرەو خوارە بە بەرە بەندە

١٠

خشتە کونێکە چل مەن باریە
بۆ خۆی بێ گیانە و گیانداریە

١١

ئەمە چییە لەم شارە
ئەیفرۆشن بەپارە
لە باخە یا لە دارە
بە مشار وەک مشارە
هەردوو سەری بەکارە
ئارایشی نگارە
شعرە شعری ئاودارە

١٢

هەلدم بەلدم
شەش پای دووسم
لەسەر پشتی ڕواوە دوم
بە حساب هیچی لێ نابێ گوم!

١٣

ئەم مەتەڵمان ماری شەش سەرە
کۆنە مەڵبەندی ڕاو و ڕووت کەرە
یەک و دووی باوکی عەلوی عنصرە
پێچەوانەی بۆ عارەبی بەرە



بەڵام باوکێکی فیشاڵ و بەدە
خەڵک لێی بێزارە و بۆ چاو ڕەمەدە
سیانیان باڵندەی پێ لە پێوەندە
بە کوشندەیی لامان پەسەندە
بۆ پەڕینەوەی جۆگاش بەکارە
وەریگێڕیەوە ناوی ڕووبارە
چواری سەرەتای گاڵتەی منالآن
چواری دواییشی خەسارە بۆمان
سیانی پێشەوە و یەکێکی دوایی
زینەتی دەستی کچە بۆ شایی
دوانی سەرەوە و یەکێکی پایین
نووستنی خۆشە بۆ شەوی هاوین
بە دوو خاڵی ڕەش تەسکی نامێنێ
برنجیی دەخوا هەرچی هەڵێنێ!

### ١٤

ئەم مەتەڵەمان دێیەکی کۆنە
کەم کەس ئەزانێ ناوبانگی چۆنە
حەرفی وەک ڕێگای هەر چەوت چارەکە
لەوێ شایییە و ژنێ مارەکە
یەک و دووی دائم لە ژێرەوەیە
بەسەر بێ سەری بەتیرەوەیە
سیانی وەستایە بڵند پایەیە
هەم دەستکردێکی ئەو وەستایەیە
چواری دارێکە خەرجی گۆچانە
کە سەری نەبێ خاسەی ئینسانە
شەشەم و حەوتەم ناوی میللەتە
جاران فەوتابوو ئێستا دەوڵەتە
ئەگەر ئەمانە دادت بۆ نادا
شوێن دارکەر کەوە پیشانت ئەدا



ئەوەی بێزانێ و جواب بداتەوە
تێر لە کانیەکەی ئاو ئەخواتەوە

### ١٥

ئەم مەتەڵەمان جێیەکی خۆشە
بەڵام ئەم دەمە ئەو سفید پۆشە
بە ئیملای کۆنە حەوتەوانەیە
تازەی هەشت بەهەشت جاودانەیە
یەک و دوو یەکە هەر یەک پەیکەرە
سیانیان سەرلەنوێ برین نوێ کەرە
چواریان کەوتە یەک ڕووی ئاسمانی گرت
٤ ، ٥ ، ٦ هێمن بەبێ جرت و فرت
ئەو سیانە ئەگەر هەڵگێڕیتەوە
وەزندی زۆرە ئەدا پێتەوە
بە چواری دوایی ئەکەویە هاوار
هاوارت دەچێ بۆ شاری هاوار
شەش و پێنج و یەک قەمەر تەلعەتە
شەش و حەوت و هەشت نەکرێ نەگبەتە
سیانەکەی دوایی وەرگێڕیتەوە
هیچ بۆی مەگەڕێ ئەدا پێتەوە
کە هەڵتان هێنا هاوینێ وەرن
ئەتانبەم سەفای ئەوێ دەربەرن

### ١٦

ئەم مەتەڵەمان شوێنێکە خواکرد
دوو شا شاعیری بەداخەوە مرد
ئیمامی عەلی لێی دابەزیوە
شەش پای بەحریشی لێ هەڵقولیوە
شیرین پیا ڕابوورد لەوێدا خۆی شت
مەم چوو بۆ لای زین لەوێ شێری کوشت

بەناو سەربەرزە و بەلەش شەش پایە
مەڵبەندی کۆنە و تازە ئاوایە
یەک و دوو پارچەی بەدەنی پیاوە
سەرەتا و دوایش دیسان ئەو ناوە
شەش و پێنج و یەک بەزبانێکی تر
هەر ئەوە و خەرە وەک هێلکەی مامر
سێ پیتی دوایی وەرگێڕیتەوە
دوو شتی تریش ئەدۆزیتەوە
یەکێکیان دیسان پارچەی بەدەنە
دووەم مەرگەلە بیکەرە بنە
ئەو سێ پیتە ڕاست بیخوێنیتەوە
بە زبانی بەغدا گەرم ئەبیتەوە
بە زبانی خۆمان میوەی بەهەشتە
دیزەی دانوولەی یەزدان سروشتە
یەک و دوو و پێنجی جێی پادشایە
سێ و پێنج و شەشی شاری ڕوسیایە
سێ و شەش و پێنجی ڕووناکی ماڵە
هەم لەوەڕ و هەم برسێتی حاڵە
هەرچی هەڵبێنێ، وتیان بەهارە
لەسەر خۆم لەوێ بادەگسارە(١)

## ١٧

ئەم مەتەڵەمان لەلام زۆر چاکە
مردوو زیندووکەر نۆکەری خاکە
شەش پێی وای هەیە خێرا پێی دەڕوا
کە توند بوو هەرچی هاتە پێش ئەیخوا
بە شێوەی کۆنە بیخوێنەرەوە
پێت مەخەرە جێی سەر و بۆرەوە



یەک و دووی بڵێی ئەبێ ڕاوەستی
یا نیوەی بارە چۆنی هەڵبەستی
یەک و دوان و سیان غەزەتەی پارسە
چواری نیشانەی پادشای پارسە
دوانەکەی دوایی ئاوازەی شینە
یاخود کە پەچەی لادا بیبینە
سێ پیتی دوایی وەرگێڕەرەوە
دوو داخی تری پیا بنێرەوە
هەڵپەڕێنە بەم ڕەمەزانە
پارە وەرگرە لە جێی جەژنانە
ئەگەر هەڵیەنی ئەڵێم زۆرزانە
بەخششی نییە چونکو ئاسانە(٢)

## ١٨

لەم قەراغ شارە، وەرە بنوارە
کوێت لێ دیارە، مەڵبەندی یارە
لە دوور دوور نیگای شیرین و بەرزە
نزیک کەوتیەوە ئەتخاتە لەرزە
ناوی گوێزێکە خانەی نێچیرە
باسەفا و پڕ غەم سەیرانگای زویرە
هەر هەفتەی ڕۆژێک کۆگای ژنانە
ئوپێرای ژنان، گۆرانی خانە
بە شەو پیاو خۆرە ڕۆژ ئاوی چاوە
ڕیشەی درەختی جەرگ و هەناوە
کێ هەڵبێنێ ئێوارەی جومعە
حەڵوای ئەدەمێ بیکا بەلوقمە(٣)

## ١٩

ئەم مەتەڵەمان نەختێک گرانە
لە قینی ئەوەی وتیان ئاسانە

زبان زەدێکی کوردی پەتییە
لەجێی پاساری ئەم پێنج پیتییە
هەرچی ئەنووسین کوردی پەتییە
با پێمان بڵێن پەتی و پەتییە
یەکەم و دووەم لەلەی ژمارە
لە خوار پێ پیلکە سەدا بنوارە
وەربگێرییەوە پارچەیی لەشتە
کە ئەوەت لێ برا گریان بەشتە
سێهەم بخەرە ناو دوو یەکەوە
بۆ جل و ڕاخەر نەنگە پێکەوە
کە سەری نەبێ کونی تێ ئەبێ
ریسی جۆلای پێ جێبەجێ دەبێ
یەک و سێ بڵێ عەزیز بەولاخ
کاتێکت زانی چوو بۆ ئابلاخ
یەک و دوو و پێنجی جەرگەی زستانە
لەگەڵ پەیدا بوو چلە بەندانە
دوو خاڵی نەبێت ئنجا دەعبایە
پیاوخۆری شەتیی خواری بەغدایە
کێ هەڵیبێنێ ئەمجارەر بەخوا
وینەی شیرینی سجوقێک ئەخوا[٤]

## ٢٠

سێ بەردە و بەرد نییە
بن ڕەقە و بۆ تەور نییە
گیا خۆریشە و کەر نییە
هێلکەکەرە و مەر نییە

## ٢١

بیرێکی جاوین، گوریسی دارین
دوو لچەکەی قورین سەر و مل ڕەنگین



ئێمە لە جێی ئاو ئاگری ئەدەین
ئەویش دووکەڵمان ئەدا لەبەر قین

## ٢٢(*)

پیاوێک مرد گەلێک موڵک و ماڵی بوو
بەشە میراتی کەوتبووە بەر دوو
یەکێک مامی بوو ئەویتریان خاڵ
خاڵ کوڕی مام بوو مامیش کوڕی خاڵ
ئەم خاڵ و مامە عەقل نایگرێ
بزانین ئیرسیان چۆن لێ بەش ئەکرێ

## ٢٣

ئەم مەتەڵمان نۆی تازە پیتە[٥]
هێند بەرزە نابیت بەقوڕ و لیتە
سیانی هیجایە دوانی گۆیایە[٦]
چواری ڕەنەنە، پێنجی پاکتایە
دووی پێش و دووی دوای کوشتەی جەلادە
بەبێ سێ و چواری ڕەنجمان بەبادە
سێ و چوار و پێنجی گەردی دڵانە
پاداشی زانەر نوسخەی ژیانە

---

(*) مامۆستا هاوار لە لاپەڕە ٤٤١ی دیوانی پیرەمێرددا لە بارەی مەتەڵی ژمارە ٢٢ نووسیویە: فەتاح تیرۆیی دایک و خوشکێکی هەبوو. پوور تلێخانی مەڵکەندیش دوو کوڕی هەبوو کوڕێکیان ناوی (پەتک) بوو، ئەویتریان ناوی (گەسک) بوو. خەڵکی گەڕەک هاتن تلێخانیان مارەکرد لە فەتاح تیرۆیی. فەتاح لە پوور تلیخانی کوڕێکی بوو ناوی نا (کتک). فەتاح دایکەکەی خۆی دا بە پەتک و خوشکەکەشی مارە کرد لە گەسک. ئەو دوو برایەش پەتک و گەسک هەردووکیان لە دایک و خوشکی فەتاح تیرۆیی هەریەکەی کوڕێکیان بوو. ئێستە ئەوی مردووە (گەسک)ە. کتکی کوڕی فەتاح لەلایەکەوە دایک برای پەتک و گەسکە وە مامی کوڕەکەی گەسکە کوڕەکەی گەسکیش خاڵی ئەوە لە خوشکی فەتاح بەم ڕەنگە خاڵ کوڕی مامە و مام کوڕی خاڵە.

## ٢٤

ڕەوڕەوەیەکم بینی لەو دەشتە
پێنج لەش و چوار گیان بەهەنگاو هەشتە

ئەگەر تۆ زانای هۆشت بەگیرە
لەناو مەلانا کام مەل بەگیرە

٢٥

گردێکی بەرزە دیارە لێتەوە
لەگەڵ جیهانا ئەسوورێتەوە
تەنها دیوێکی پێنج چاوی تیایە
ئەو سەرچاوانە ئاویان لێک جیایە
دوانی سوێر دوان تاڵ، یەکێکیان شیرین
قوللەی (ئیڤل)ە و رصدی دووربین
ماکینەی هەوا و خەڵووزی جوێیە
ئەو ئەسووتێنێ وەکو ڕادوێیە
گیای لێ ڕواوە ئەوەندە سەختە
ئەیدروونەوە بەیەک دوو هەفتە

٢٦

ئاشنای ئەسراری قەلبە بێگومان
دەرئەخات ماهیەتی سڕی نیهان
هەر کەسێ فەیزی ئەوی بۆ ڕێک کەوێ
پادشاهێکە بەگەردوون نانەوێ
بادەیەکی گەر بنۆشی بێگومان
پیاڵەیەک ئاو ناهێنێ مولکی جیهان
جەوهەری سێ حەرفە یەک حەفتا تەمام
ناوەڕاستی سێ سەد و دوانی بەنام
هەرکەس بیزانێ دیارە تێدەگا
بێگومان فەیزی ئەویشی پێئەگا

٢٧

ئەم مەتەڵەمان (ابن الوقتی) یە
سێ لاقی هەیە و خۆی چوار پیتیە
دوانی سەرەتای شین و واوەیلا



تێفکری دەبێ بەچهرەی زیبا
سیانیان ڕووناکی ئەدا بەدنیا
سێیەکی دوانزە کەلووی ڕووی سەما
وەربگێڕیەوە ئەبێ سکنا
حەزکەی پێی دەڵێی جێیەکی باڵا
چواریان لغاوە بەفەرموودەی خوا
لغاو داماڵە سەیرکە چۆن ئەخوا
هەڵیەنە و وەرە قەلەندەر ئاوا
شۆربای ئەشکەمەت بۆ دانراوا

٢٨

دوو ئاشقە و ماشقە دەست لەملانن
لەسەر سینە و مەم نەرم و شلانن
بەرۆژ پێکەوە دایم ئەڕازێن
کە شەویان لێ هات لەیەک ئەترازێن
ئەوەی ئەمانە لێک ئەکاتەوە
گرێی سینەی ساف لێک ئەکاتەوە

٢٩

وەک بەرداشی ئاش ئەسووڕێتەوە
پزیشکی ئاگری لێ دەبێتەوە
مارێکی ڕەشی لە مل ئالاوە
هەر دەفیشکێنێ بەملا و بەولاوە
ئاسن ئەکرۆژێ و ئەیدا لە هەسان
زۆر لەکارایە بەجەژنی قوربان

٣٠

زەوی سپییە و تۆوی سیایە
ئاودێری پیاوە و بێڵی گیایە
هەتا تێی نەخەی ناڵێی تەواوە
بۆ ئاو خواردنەوەی دڵ دانراوە

شەش پێ و دوو سمی دروستکراوە
کلکی لە بانی پشتی ڕواوە

(١) ئەو مەتەڵە (سەرچنار)ە (سرچنار).

(٢) ئەم مەتەڵە تانجەڕۆیە.

(٣) گردی (سەیوان)ە. دواییش نووسیویە:

«مەتەڵی پێشوو گردی سەیوان بوو
زۆر کەس هەڵیەنا و حەڵوای بۆ نەچوو»

(٤) چلوورەیە.

(٥) بێژنگ بەسەر، کە ناوی شاخێکە لە ناوچەی بازیان. لوتکەکەی تەخت و خڕە لە دوورەوە لە بێژنگ ئەچێ.

(٦) واتا سێ پیتیان هیجایە کە (ب، ی، ن)ە بەڵام (ژ، ک) لە پیتەکانی حەرفی هیجای عەرەبی نین.

***

## جارانی پێشوو

١٩٤١

جارانی پێشوو کە مەتەڵ باو بوو
موعەممای بەناو مەتەڵی ناو بوو
شیعرێکی مەتەڵ کە دەرک ئەکرا
چوار ناوی گەورەی لێ دەر ئەکرا
شیعرەکە واتە، فارسی زبانە
ئەیکەین بەکوردی بڵێین ئاسانە
«در بردە مار زلفت سر حلقە را بدندان
بی قرب کژدم آمد شد فرق ماە تابان»
سەر حەلقەی گرتە، ددان ماری مووت
دووپشک بێ (قرب)ی لەگەڵ مانگ بوو جووت
سەر حەلقە (ح)یە، ددانیش (سن)ە
(ح) کەوتە سەر (سن) دیارە (حسن)ە
(در)ی دز بردە، ماری[١] گرتە دەم
ئەویش (حیدر)ی لێ هاتە بەرهەم
(عقرب) بەبێ (قرب)، (ع)ی ئەمێنێ
(ماه)یش (قمر) قافی نەمێنێ



سەری (عقرب) و (قَمَر)ی بێ سەر
لەگەڵ تێکخزان ئەبێ بە(عُمَرْ)
حەسەن و حسەین عومەر و حەیدەر
ناوی چوار زاتی گەورە هاتەدەر
ئەم مەتەڵانەی، نازانرێ بۆشە
مەتەڵی سووکی خۆمانە خۆشە
یەکێکی من و یەکێکی خەرات
فرەفری دێ، لە دەوری گۆنات
خۆی تاڵە و شیرین ئەنوێنێ لەلات
لە خۆتی ئەبڕی و ئەینێیتە برات!

(١) -مار- بەعەرەبی ئەبێ بە(حي) و وشەکە دەبێتە (حیدر).

***

## پیرەمێرد و بەیتی مێژوویی زەنووری

بەیتی یاخود بەندی مێژوویی (جەمالەددینی زەنووری)، باسی خان ئەحمەد خان و دروستکردنی قەڵای سەرچاوەی زەڵم دەکات. پیرەمێرد دووجار[١] لە ڕۆژنامەکەیدا باسی ئەم شیعرەی زەنووری کردووە. جاری یەکەم کورتە باسێکی زەنووری و بەیتەکەی بڵاوکردۆتەوە. بەڵام شیعرەکەی نەنووسیوە. جاری دووەم پێشەکی بۆ بەیتەکە نووسیوە و چوار بەیت شیعری (فارسی) لە بارەوە نووسیوە کە دەستی کەوتووە. ئێمە لە شیعری (تاڤگەی زاڵم زەڵم)ی پیرەمێرددا لەم دیوانەدا نووسیومانەوە. لێرەدا پێشەکییەکەی پیرەمێرد دەنووسین کە لە کاتی بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەکەی لەم ڕووەوە نووسیویەتی: «تەعریفاتی زەنووری و هەندێ لە گوزارشاتی (خان ئەحمەد) ئەنووسین. تەئریخی راشد ئەڵێ:

کاتێ سوڵتان موڕادی چوارەم هاتە سەر بەغدا لەشکرەکەی لە بەردا لە شارەزوور هەڵیدا. خان ئەحمەد تالانی کردن و ڕایفڕاندن، بارگەی سەدری ئەعزەمی دەست کەوت»[٢].

لە بارەی زەنوورییەوە لە کتێبی (شاعیرە ناو ون بووەکانی کورد)ی شاعیر (علی کەمال باپیر)دا نووسراوە: «جەمالەددینی زەنووری ناوی شیعری (زەنووری)یە. وەکو فیردەوسی مێژوونووس بووە. بەپێی ئەم هەڵبەستە کە خۆی ئەڵێ:

«تەئریخی هیجری هەروا دەستوبرد
هەزار و سەد و شەست و یەک ڕابورد»

لە ساڵی ١١٦١ ی کۆچی هەڵبەستێکی دوور و درێژی زمانی کوردی هەورامی وتووە.

پیرەمێرد بوێژی کوردی نەمر کردوویەتی بەزمانی کوردی سۆرانی. ئەم هەڵبەستە باسی تاق و هەیوانێ ئەکا کە بەبەرزیەوە سەد گەز بەرز لەسەر شاخێ لە سەرچاوەی زەڵم دروست کراوە لەلایەن خان ئەحمەد خانەوە»[٣].

دوای ئەوە هەر لەو لاپەڕەیەدا نووسەر حەوت بەیتی زەنووری دەنووسێت کە دیارە بەشێکی کەمە لە شیعرەکە.

ئێمە لە کەشکۆڵی (مەحموود پاشای جاف)دا تەواوی دەقی شیعرەکەی زەنووریمان دەست کەوت، کە بریتییە لە ٤٦ بەیت. بەڵام وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد بریتیە لە ٢٢ بەیت. وەک ئەمانەتی ئەدەبی هەردوو دەقەکە پێشکەش دەکەین. هەروەها (مەحموود پاشای جاف) لە پەراوێزی ئەو شیعرەدا، لە کەشکۆڵەکەیدا نووسیویە:

«لە ١٢٧٩دا لە (کانی چەقەڵ) جەنابی (سەید فەتاحی جەباری) لەبەر ئەم شیعرانەی بۆ خوێندمەوە و منیش نووسیمەوە».

هامسەران ڕوێ،...
ڕوێ پەی تەقدیر نەڕوان ڕوێ
چەنی بەگلەران خوسرەوان خوێ
دیم غازێ نەچاک دامان کوێ
ئەوج غار نەطەرح قوللەی کۆه قاف
فەرقش چەنی فەوق قاف مدان گەزاف
ئیسم شەریفش (خورنەوەزان) بی
خۆر دەشت وەنۆشت کەیل ڕەزان بی
باغاتان دەور حاشیەی دەربەند
سەیوان مێوان سەیر ساتی سەهەند
بەڕەزا نەڕووی طاق دەرمە غار
سەراوێز چون زوڵف مەهوەش نە ڕوخسار
شەماڵ مشاناش تاتا نەڕووی تاش
عەطر وەرکەمەر نەتاش مکەرد فاش
ڕێزەی وەفراوان سەرتاف قەڵوەز
مەیۆنە قەڵوەز بەرز هەزار گەز
متکبۆ وەبەرگ بەڕەزای غاردا
مەر قەطرەی شەونم وەگێسووی یاردا



تەکیەگاهێ دیم نەپای ئەو غاردا
نەپای ئەو مەغار بەرزە دەماغدا
منیچ شەممەی شەرح دەوران مزانام
میحنەت زەدەی دەرد دڵ جەلاش دانام
واتم: جەننەت طەرز بێستوون میثال
ئافەریدەی صونع بەننای بێ زەوال
فەرهاد نەقش وەنام بێستوون کەندەن
کۆی نەجد نەمەجنوون یادگار مەندەن
میرزام بۆ بەوشا طەرحت نەواختەن
ئەی تەکیە و سەنگە کێ نەسات ساختەن
ئێد شنەفت ئەحواڵ ڕۆی ڕۆزگاران
ناڵاچەنی ئاه چون دەردەداران
وات: ئەی ڕاویار دەور ویەردە
خار غەم چون تەن جا نەجەرگ کەردە
ئەوڕۆ خوداوەند من ئافەریدەن
بەگلەران خەیلێ پەی سەیرم دیدەن
هەر کەس ذەڕڕەی ذەوق لە خاطر داشتەن
دەبێم سەیر کەردەن هەم وەجا ئاستەن
(ئەحمەد بەگ) نامێ، جە نەوەی (ئەلقاص)
ئمە بۆ چەنی کەسش کەری باس
خولاصەی یەک ڕەنگ خاس خەیاڵان بی
سەردار سوپای سیا ماڵان بی
فەصڵ بەزم و ڕەزم کەیان کەی بی
وە ئەلطاف داریش حاتەم طەی بی
چەنی سەودای عەشق قەیس و فەرهاد بی
مەرام وەی طەورە شکار دەیار بی
وەختێ مخێزا دەرنە شەفەق شەوق
چەنی هامسەران پەرێ شادی و زەوق
خاصە غوڵامان دێبای حەریر ڕەخت
چون پەروین نەدەور خان مەهتاو بەخت

هاتا هات دەنگ شکارەوانان
منیشت نەجەڵ کۆهـ و سەربانان
گەرد پای ناڵ سەیران میران میر
مەر تۆز سەمەند بەهرام گۆرگیر
پڕتاو مکەرد ڕەخش خوسرەو وەباهوو
پەی قەتارەی گەل دەلیلەی ئاهوو
باد پا تازان دەرجە لوولەی مەل
مپێکان جەیران سەر دەلیلەی گەل
طەیر جەللاد چەنگ طەوار تێژ پەڕ
سای باڵش مکەرد سەرسام ئاهووی بەڕ
قەطرەی قطمیران تازی ئەژدەرگاز
شریخەی شاهێنان چەرخ بەحری باز
بەحرییان چەنی باز باڵا دەست
مەبەردەن گورێز تێژ پەڕان جەبەست
شکار مەکەردەن تاو ئافتاب گەرم
مامان وەسای من پەی مەزاق و بەزم
صەدای موغەننی یان ساز نەوای نەی
یاد مەکەرد ئەییام کەیانان کەی
نۆشانۆش جام فنجان فەغفوور
ساقیان نەصەف مەجلیس مەبان دوور
گا بەحث بەیاض گا نەقڵ فراوان
گا ڕاز و نیاز چەنی هامدەردان
گا بەحث شکار ویەردە سالان
گا مەشق خەیاڵ خاڵ نەوهالان
وەختێ بکەرداش عەزم باز شکار
پەرێ سەر سەوزان قوڵەنگان شمقار
تاو ئافتاب پەڕ غەم مدا تالان
ئێوار فەڕ مەوست نەسیا مالان
تاکە دیارا ڕۆی ئەییامش بی



ڕۆژان و شەوان دەور بەکامش بی
وەختێ هۆر گێلا چەرخ چەپ ڕەوشت
میر و بەگلەران ساقی و موغەننی گشت
یەکا یەک غەڵتان خاک سارا کەرد
چون خەیاڵ و خەو ئاماو شی ویەرد
(زەنووری) بەو خودا بێ شوبهەن و شەک
جە سەنەی هەزار صەد و شەست و یەک
منیش هاوعومرم یاوا وە پەنجا
دنیام وەمیزان عەقڵ ویم سەنجا
جە ساڵ هیجرەت تاکە وەی دەورە
نەو یەک بەگلەرێ وەی طەرز و طەورە
یا چون لاف گۆیان من لافم واستەن
یا شەرط تەقریر واتەنیم واستەن
(زەنووری) ڕۆ ڕۆ پەرێ ئێمە و تۆ
پەرێ ئەو ڕووان خان حاتەم خۆ

..................................................

(١) جاری یەکەم (ژیان) ژمارە ٥١١ی ساڵی ١٩٣٧ . جاری دووەم (ژین) ژمارە ٧٦٣ی ساڵی ١٩٤٤
(٢) ژین (٧٦٣) ساڵی ١٩٤٤
(٣) شاعیرە ناو ون بووەکان -علی باپیر ئاغا. ل ٤٠

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:
بەهۆی داستانی سەرای (خان ئەحمەد خان)ەوە[1].

١٩٤٤

بەسەر زەمیندا،...
ڕۆژێک ئەگەڕام بەسەر زەمیندا
کێوێ لە ڕیزە چەرخی بەریندا
لەگەڵ قوللەی قاف لە هاونشیندا
غارێ لە سینەی ئەو کێوە بەرزە
دڵی سەیرکەری ئەخستە لەرزە
ئەوجی غار وێنەی کێوی قاف بەسام
هیچ کەس ناتوانێ تیا بگرێ ئارام

ئیسمی شەریفی (خۆرنەوەزان) بوو
دەورەی بەڕیزە باغی ڕەزان بوو
ئەو باخە و باخچەی حاشیەی دەربەند
هێند جوان بوو هۆشی لە ڕێبوار ئەسەند
بەڕەزا لە ڕووی تاقچەی موغارا
سەراوێز وەک زولف یار بەڕوخسارا
ڕیزەی ئاوی ساف لە تاقەی قەڵبەز
بووبوە شەلالەی بەرزی هەزار گەز
تەکیە گاهێ بووە لە پای مغاردا
لەسای ئەو مغار بەرزە دەماغدا
پرسیم ئەی تەختی بەهەشتیی میسال
ئافەریدەی دەست (بەنا )ی بێ زەوال
توو ئەو وەستایەی کە خودای ناوە
ئەم سەرا بەرزە کێ وا دایناوە؟!
وتی ئەی ڕێبوار پیری سەرگەشتە
بۆت ئەگێڕمەوە ئەم سەرگوزەشتە
(خان ئەحمەد) ناوی لە نەوەی کوردان
لە شوێنی (تەباک) پادشای گوردان
هەڵبژاردەی تیپ خاس خەیاڵان بوو
سەرداری سوپای سیامالان بوو
دابووی لە سەری چقەی سوڵتانی
ڕۆم و عەجەمی بەهیچ ئەزانی
شکاری ئەکرد ڕۆژ تا ئێوارە
ئەگەڕایەوە سای ئەم دیوارە
گۆرانیبێژ و ساز و نەوای نەی
ئەیخستەوە یاد بەزمی جەم و کەی
کاتێ وەرگەڕا چەرخی چەپ ڕەوشت
میر و بەگلەر و شاهی و شایی گشت
یەکا یەک بەشوێن یەکدا دڵ غەمناک
لەو گردەی ئەوبەر خستنیە ژێر خاک



لە سالّی هیجرەت تاکو ئەم دەورە
خان و بەگلەران نەبوون بەم جەورە
تەئریخی هیجری هەروا دەستوبرد
هەزار و سەد و شەست و یەک ڕابورد
زەنووری دادیە لە دەست ئەم ئیشە
بۆ (ئەحمەد خان)ی شای حاتەم پیشە

(١) پیرەمێرد ئەو ناونیشانەی بۆ بەندەکە داناوە.

***

## پیرەمێرد و شیعری (میرزام تەوارێ)ی ئاغای دەربەندفەقەرە

پیرەمێرد چەند جارێک لە ڕۆژنامەکەیدا[1] باسی کارەساتی ئەو شیعرەی حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە و ئەحمەد پاشای بابانی کردووە. بەشێکی لە دەقی شیعرەکە نووسیوە و وەری گێڕاوەتە سەر شێوەی سلێمانی.

بەڵام ئێمە دەقی شیعرەکەمان لە کەشکۆڵی (مەحموود پاشای جاف)ەوە دەست کەوت کە بریتییە لە ٣٤ بەیت. وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد وەک لە کەشکۆڵی (نموونەی ئەدەبیات کوردی)[2] مامۆستا نەجمەددین مەلادا نووسراوە ٣١ بەیتە و هەروەها پێشەکییەکی کورت سەبارەت بەکارەساتی شیعرەکە نووسراوە.

لە (کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی) مامۆستا (محەممەد عەلی قەرەداغی)دا لاپەڕە ٩٧ هەتا ٩٩ بیست و یەک بەیت لە دەقی شیعرەکە نووسراوە. ئێمە دەقی تەواوی شیعرەکە وەک لە کەشکۆڵەکەی مەحموود پاشادا نووسراوە دەخەینە بەرچاوی خوێنەران. هەروەها هەردوو پێشەکییەکەی پیرەمێرد و نەجمەددین مەلا و وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد.

(١) ئەدەبیات (ژین) ژمارە ٦١٣ ساڵی ١٩٤٠ .
(٢) حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە لە نموونەی ئەدەبیاتی کوردیدا - مصطفی نەریمان. (گۆڤاری بەیان)ی ژمارە ١٠٦ی ساڵی ١٩٨٥ .

***

### ئەدەبیات[1]

حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە کە نەخوێندەوار بووە، دەسگیرانێکی ئەبێ، ڕۆژێ ئەحمەد پاشا ئەچێ بۆ ڕاوە باز، کە ئەگەنە بەر دەربەندفەقەرە تێنوویان ئەبێ، لە ئاواییەوە ئاو و دۆیان بۆ ئەهێنن. کچە کوردێکی باڵا بەرزی شیرین خەت و خاڵ بەشێوەی مەهمان نەوازیەوە کاسەیەک ئاو

و دۆ دێنێ، نازانێ ئەمە ئەحمەد پاشایە، کە پاشا ئەیڕوانێتێ لەپڕ مەحەبەتی ئەپەڕێتە دڵ، کوێخا بانگ ئەکا ئەڵێ خوازبێنی ئەم کچەم بۆ بکە و بەخەزنەداریش ئەڵێ پارەیەکی زۆری بۆ جل و تەدارەک بدەنێ. کچە کە ئەزانێ ئەمە ئەحمەد پاشایە ئەترسێ، خورپە ئەدا لە بەندی جەرگی، لەو لایشەوە دڵخواز و دەسگیرانی حەمە ئاغایە، حەمە ئاغا کە ئەمە ئەبیەت فریاد نامەیەک ئەڵێ، بۆی ئەنووسنەوە ئەینێرێ بۆ ئەحمەد پاشا، کە پاشا ئەیخوێنێتەوە ئەمەندەی لەلا پەسەند ئەبێ دەستبەجێ ئەمر ئەکا بەجل و بەرگی بوکێنیەوە دەستگیرانەکەی بدەنەوە، دوایی ئەو دەسگیرانەی ئەمرێ.

حەمە ئاغا مەیلی ئەدەبیاتی زۆر بووە. جارجاریش شیعری بەقووەتی وتووە، بێجگە لەوەیش دیارە سەرەتای شیعرەکە بە باز دەست پێ ئەکا ئەڵێ:

میرزام تەوارێ،...
شیروانی بازێ، تەڕلان تەوارێ
چوست و تیژ پەرواز شیر شکارێ
یاوا وە دەستم نەپای کۆسارێ»

..............................

(١) نموونەی ئەدەبیاتی کوردی ١٩٣٨ی زاینی ١٣٥٧ی کۆچی - نەجمەددین مەلا ل ٣٢-٣٨.
«ئەم شاعیرە لە تەک ئەحمەد پاشای بابان ئاخر حاکم هاو زەمانن، وا مەشهورە لە ساڵانی ١٢٧٠ی هیجریدا جارێک ئەحمەد پاشای بابان خۆی و سوپاهییەکانی ڕێی ئەکەوێتە دەربەندفەقەرە، حەمە ئاغا لە ماڵ نابێ، ئەحمەد پاشا بەسەر سوارییەوە لە ماڵێک داوای کاسەیەک دۆ ئەکات. کچێکی زۆر جوان و نازەنین کاسە دۆیەکی بۆ دێنێ، تومەز ئەم کچە دەسگیرانی حەمە ئاغا ئەبێ، ئەحمەد پاشا کە چاوی بەکچەکە ئەکەوێ بۆی شێت ئەبێ دەرحاڵ ئەمر ئەکا کچەکەی لێ مارە بکەن و ڕەوانەی سلێمانی ئەکا. وەختێ حەمە ئاغا دێتەوە ئەم خەبەرە ئەزانێ (منظومەیەک) ڕێک ئەخا ڕەوانەی ئەکا بۆ ئەحمەد پاشای بابان کە شمقارِ بازەکەی فڕاندووە. ئەویش لەگەڵ (منظوم)ەکە ئەبینێ، ئانا کچەکە ڕەوانەی دەربەندفەقەرە ئەکاتەوە بەڵام کچەکە زۆر ناژی ئەمرێ لە خەفەتا».

دەقی شیعرەکە لە کەشکۆڵی (مەحموود پاشای جاف)دا

میرزام تەوارێ،...
شـــیـــروانی بازێ، تـەڕلان تـەوارێ
چوست تیـز پەرواز شـیـرین شکارێ
یاوا وەدەسـتم نـەپای کـۆسـارێ
دڵ بێ ئیـخـتـیـار مـوبتـەلای باز بی
عـەقڵ و هۆش و فـام گشت نەپەروازبی
نەصـوبح تا وەشـام، نە شـام تا سـەحەر
بـازدام چەنـی باز وێنـەی بـازی گـــەر



وەصـــەد نەزاکـــەت تەرتیب بازدام
ئەسبـابش نەجورم ئەعظای وێم سازدام
ئەووەڵ جە عـەینەین عـەیان کەردم جاش
مـەقـام عـەینەین کـەردم وە مـاواش
دەورانش پەی حیـفظ وەمـوژگـان تەندم
پەی نشـــینگەی باز شـۆخ دڵبـــەندم
تایێ جە تۆمار هەستیی جەستەم سەند
دســتم نەپای باز نەجـای پارچە بەند
کـــڵاوش نە پۆست فـــەرقم قـــەرار دام
تاکـە جـە فـەرقـەین فـەرق بۆ مـودام
پارچەی ئیسـتـخوان گەردەن کەردم واز
کـــــەردم وە ئوتراخ بـاز نـاز پەرواز
بەند ڕیشـەی دڵ کـەردم وە جلفـووش
سازدام طەعمەی جەرگ پەی بانگ قووقووش
وەحش بێ تەوار بێ هێـمـای نەزڕیا
زەنگ مـــیـــرشکار وە پاش مـــەزڕیا
هێـــمـــای وەڵەد بی نەبی وە جـەیران
پەوچی وەبێ خـۆف مـەکـردش سـەیران
بازم شـیــرین بی شـۆخ شـیــروانی
نەکـەفـتـەن وەدەس جـەمـشـیـد ثانی
شـاد بیم چەنی باز شـاهانە دەسـتـوور
نەخـــو بەو زانام نـە بەهرام گـــوور
بێ خەبەر جە مـەکر چەرخ ئەفلاک بیم
لاقـەید جـە شـۆڕش دائیـرەی خـاک بیم
نـاگـاه شـمــقــاڕێک شـووم بێ ئارام
ئاشــووب دەوران ظوڵم کـەردی بێ رام
هوجـوم کـەرد نە چەرخ وەیەک پڕ تابش
ڕفـــانـا بازم چەنـی ئەســــبـــابش
من کـە جـەو دەمـدا سـەراسـیـمـەوار
غـەڵطان بیم نەخاک پەی بانگ هاوار

بەعەدزان خێزام وەزاری و مەلال
کەفتم نەدەمای شمقارِ قەتتال
هەرچەند قوو قووم کەرد هیچ نەداشت ئەثەر
عەدەم بی جەعەین باز نازپەروەر
بازم بەرشییەن وەتەنافەوە
صەییاد کەڵ گرتەن وەکۆی قافەوە
کەفیمە شۆنش وە یاران یاران
پاشا پارچە پەند گیر بۆ جەداران
کەوتمە شۆنش وە مەچۆ مەچۆ
پاشا پارچە بەند گیر بخوا نەچۆ
کەوتە شۆنش وە یاری و خەندە
پاشا پارچە بەند گیر بۆ جەو بەندە
ویارا و ویەرد یانەم بی خراب
گوم بی نەدیدەم چون سەنگ تۆی ئاب
ئاخر بێ عیلاج نەجای وێم بێ دەنگ
مات و مەدهۆش بیم چون تەصویر سەنگ
نە خەڵقان واتەن بازش ڕەمیدەن
دەروون مەوج هوون دیدەش تەمیدەن
ئەو بازە کە خۆم کەفتەنم نەگیر
نە هیچ قوشخانێک نە کەردەن نەخچیر
بازم تەوارەن سینە پڕ خاڵەن
پێ و شۆنش نییەن حاڵم بەدحاڵەن
هەر کەس بازەکەم بەدخود کەردە بۆ
نەسەرد پایز ئازیز مەردە بۆ
خوداوەند بازم بەرد، بۆ وڵاتێ
تارۆی قیامەت دەسم نایگاتێ
مەریەد قودرەت مالک الأعجاز
بە ئەلطاف وێش باز باوەرۆ باز
وەرنە (طالیعی) چێش مەیۆ نەدەست
خەستەو خەم نەدۆش ضایف و دەسبەست



وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

میرزام تەوارێ، میرزام تەوارێ
شیروانی بازێ، تەرلان تەوارێ
چابووک جستوخێز شیرین شکارێ
دەستم کەوت لە شوێن پێچی کۆسارێ
دڵ بێ ئیختیار موبتەلای باز بوو
عەقڵ و هۆش و فام لەلام پەرواز بوو
لەشەو و ڕۆژ و دەمی سەحەردا
بە بازی لەگەڵ باز بازم ئەدا
عەشق و علاقەم هەموو بەباز دا
ئەسبابم لە چەرم ئەعزای خۆم ساز دا
چاوگە خانویەکم لەچاوم بۆ کرد
چرام لە نووری دیدەی خۆم بۆ برد
دەوری ئەو چاوگەم بەبرژانگ تەنی
لە ترسی تیری نێچیر ئەفگەنی
کڵاوم لە پێست فەرقم قەرار دا
تالە فەرقەدین کەس فەرقی نەکا
پارچەی ئێسقانی گەردنی خۆم برد
لەچاوگەی چاوا ئۆتراخم بۆ کرد
بەندی جگەرم برد، کردم بەجلفۆی
جەرگیشم لەت کرد بۆ بانگی قوقوی
وەحشی و تەوار بوو بەجستجۆیدا
زەنگۆڵەی میرشکار ئەزڕا لە پێیدا
بازم شیرین بوو شۆخی شیروانی
نەکەوتبووە دەست جەمشیدی سانی
بە شاباز شاد بووم شاهانە دەستوور
نەشام ئەناسی، نەبارامی گوور
بێ خەبەر لە مەکر چەرخی ئەفلاک بووم
لاقەید لە شۆڕش دائرەی خاک بووم

ناگا شمقارێک شوومی بێ ئارام
ئاشووبی دەوران بەدکاری بایام
هجوومی هێنا و بازی فڕاندم
بە ئەسبابیەوە لەدەستی ساندم
ئیتر من شێت بووم سەراسیمەوار
غەڵتانی خوێن بووم بەبانگ و هاوار
بە کولەمەرگی و بەزاری و مەلال
کەوتبوومە دوای شمقاری تیژباڵ
هەرچەند قووقووم کرد نەبوو دەنگی باز
گوم بوو لە چاوم بازی ناز پەرواز
بازم دەرچووە بەتەنافەوە
هێلانەی کردووە بەکوێ قافەوە
خوا خوام بوو دوعای من بە تەئسیر بێ
پارچەی بەندەکەی لەچڵێ گیر بێ
هیچ فایدەی نەبوو ناڵەی جەرگ سووتاو
گوم بوو لە چاوم وەک نەقشی ڕووی ئاو
دوایی ناعیلاج لەجێی خۆم بێ دەنگ
بێ هۆش لێی کەوتم وەک هەیکەلی سەنگ
لەخەڵکی وایە بازم تۆراوە
هەر بەو داخەوە هۆشم نەماوە
ئەو بازەی کەوا دەس من کەوتبوو
عالەم لە داخی ئەو نەسرەوتبوو
بازم تۆراوە سینە پڕ خاڵە
پێ و شوێنی نییە حاڵم بەدحاڵە
ئەو کەسەی بازی دەرکردم لەڕێ
بەسەرمای پایز ئازیزی مرێ
شەفەق لە چاویا وێنەی دەیجوور بێ
کاسەی بینایی جێی مار و مووربێ





ئاردی ناو دڕک کەس و کاری بێ
هەرگیز ساغ نەبێ هەر ئازاری بێ
خواوەند بازمی بردە ولاتێ
تا ڕۆژی مەحشەر دەنگمی ناگاتێ
مەگەر تەقدیری خوای بێکەسان
بۆم بێنێتەوە بەمژدە ڕەسان

***

## پیرەمێرد و شیعرێکی عەرەبی

پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٣٦دا بۆ پێکهێنانی جۆرە بەراوردکارییەک لە نێوان چوار پارچە شیعردا بەچوار زمان، ئەم شیعرە عەرەبییەی کردووە بەکوردی، بەڵام ناوی شاعیرەکە و سەرچاوەکەی نەنووسیوە.

اخذنا نراقب بين الدجى
تنفسها الخافت المضطرب
بحيث الحياة لها موجة
تروح وتغدو بصدر نخب
تخاطبنا وكأن لامجيب
وتدفعنا وكأن لاحراك
مددنا لو انا بذلنا القوى
وزاكى الدماء لدرء الهلاك
رجونا مخاب هناك الرجا
وقد قطع اليأس حبل الأمل
وتحسبها حين نامت رفاتا
ونائمه حين هم الأجل
وعند انبثاق السنا غمضت
مآقبها بسكون بروع
وقد لفظت نفساً واحداً
وخلت مآقيها للدموع
واشرق الشمس راء الضحى
فخلنا اشعتها من سواد

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

ئێشکمان دەگرت شەوانی تاریک
هەناسەی بەترس پەشێو و باریک
ڕۆحی گەیبوە قەفەزەی سنگی
دەهات و دەچوو زۆر بەبێ دەنگی
بانگمان کرد جوابی نەئەدایەوە
بەهات و چۆیشمان نەجوولایەوە
دەمانویست خوێن و قوتمان خەرج کەین
لەو هیلاکەتە ئەوی پێ دەرکەین
بۆی پاڕاینەوە ڕجا نەگیرا
ناهومێد ڕشتەی ئەمەلمان بڕا
نووستبوو وتمان ئێسکی مردووە
مردبوو وامان زانی نووستووە
سفیدەی بەیان چاوی کردەوە
ئەو چاوەی لێک ناو هێجگار بوردەوە
ئاخر نەفەسی دەرچوو کش و مات
فرمێسکی چاوی ئێمەیش بەخوڕ هات
ڕۆژهەلات زەردەی ڕەشی دەنواند
بولبول دەگریا و کۆتر دەینالاند

***

## دوو شیعر لە تورکییەوە

بۆ هەمان مەبەستی شیعری شیوەن و بەراوردی شیعری چوار نەتەوە، پیرەمێرد شیعرێکی شاعیری گەورە (عەبدولحەق حامد)ی کردووە بەکوردی. لە ڕاستیدا شیعرەکە قەسیدەیەکی درێژە و یەکێکە لە بەرهەمە نەمرەکانی ئەو شاعیرە کە بۆ مەرگی (فاتمە)ی خێزانی خۆی نووسیوە.

قەسیدەکە لە کتێبێکی سەربەخۆدایە کە ناوی (مقبر)ە. بریا پیرەمێرد هەمووی وەرگێڕایەتە سەر زمانی شیرینی کوردی و لە گەورەیی شاعیرەکەش بگەیشتینایە!. ئەو کتێبە ساڵی ١٣٠٣ی ڕۆمی لە ئەستانبوڵ چاپکراوە. پیرەمێرد لاپەڕە ٤٤-٤٥ی کردووە بەکوردی. وە دوابەیتی ئەو وەرگێڕانەی خۆی لەلاپەڕە ٥٩ی ئەو کتێبە وەرگێڕاوە.

عەبدولحەق حامد:



«اوچدی جان او مدن اول پریزاد
بن صدمەی رفرفیلە برباد
عالمی خراب بنمی ویران
بیلم صانیزم یقلدی دوران
شمد نگری باغ اولور می آباد
طاغلار بکا هیچ قیلارمی امداد
فریادمە کلمە ای هنرمند
بندن طلیک هنرسە فریاد
ای یار کور نمیور نشانەک
کرچک بومی شمدی آشیانەک
هیچ بریرە المەدن خیر بن
سن کیتمز ایدک نە کج نە ارکن
کوگدن کلیور بوگون نزانەک
اولمازمی براز بکا اعانەک
«عمەر گدە بنی سور ایدک سن
عمرگ گبی باق وفا سزم بن»

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

لە هێلانەی ڕۆح پەریزاد فڕی
بای باڵی هۆشی لە کەللەم بڕی
دنیا ڕووخا، یا، حاڵی من شێوا؟
وە بزانم شێتم ئەدەم بەکێوا!!
لەمەو دوا باغم چۆن ئاوا دەبێ؟
شاخ و داخ بۆ من چۆن ماوا دەبێ؟
نامەوێ بێیتە فریام هونەرمەند
هونەرم نییە تا بڵێیی بەچەند
ئەی یار نابینم شێوە و نیشانەت
ڕاستە، ئەمەیە ئێستا هێلانەت
تۆ بێ پرسی من هیچ کوێ نەدەچووی
لە پێش چاوی من قەت ون نەدەبووی

ئێستا وا دەنگت لە ئاسمان دێ!
نابێ بەزەییت بەحالّما بێ؟!
بە هەموو عومرت خۆشەویستت بووم
کەچی وەک عومرت بێ وەفا دەرچووم

***

## بەیتێک لە تورکییەوە

«بۆ خۆم سەر ئازاد ئەبووم لەم خەفەت و هەڵڵایە
یا نەهاتمایە دنیا، یا لە هیچ نەگەمایە»
«شاعیر و ڕۆژنامەنووس-معلم ناجی»

***

## بۆ گۆڤاری بانگی کورد[1]

کاتێ گۆڤاری (بانگی کورد) لە ساڵی ١٩١٤دا لە بەغدا دەرچوو پیرەمێرد لە تورکیا بوو، بەڵام لەوێ نوسخەی ئەو گۆڤارەی بینیبوو. کاتێ هاتەوە سلێمانی لە ساڵی ١٩٤٤ دا یەکێ لە ژمارەکانی ئەو گۆڤارەی بەهۆی (جەمیل صائب)ی خوشکەزایەوە دەست دەکەوێت. لەبەشی تورکی گۆڤارەکەدا نووسین و شیعرێکی (بەهائەددین شێخ نوری شیروانی)[2] تێدا بووە. پیرەمێرد زۆر لە تورکی نووسینەکەی ڕازی بووە و لە هەمان کاتیشدا لەبەر ناوەڕۆکەکەی کردوویە بەکوردی. ئێمە لە لێکۆڵینەوەکەماندا سەبارەت بەبانگی کورد نووسین و شیعرەکەمان بڵاو کردەوە، لێرەدا تەنها ئەو شیعرە بڵاو دەکەینەوە کە پیرەمێرد زۆر جوانی کردووە بەکوردی:

«ئەی بانگی کورد، ئەی سەدای بەرزی کوردان
گوێمان لێتە توخوا مەبڕێ لە گوێمان
ئەی ڕۆژی کورد، نوورت دەرخە، بینوێنە
هەوری نەزانی لادە، بیڕەوێنە
گوێی کورد بزرنگێنەرەوە بەدەنگت
گیانیان تازە بێتەوە بەئاهەنگت
چە؟ ڕەوایە پەست بێ و بمرێ ئەو کوردە؟!
بازووی پۆڵا مەردی ڕۆژی نەبەردە
ئەی مەردی کورد زووکە هەڵسە درەنگە
خەڵک پێشکەوێ و تۆ دواکەوی زۆر نەنگە
تەمەڵی وەجاخی کوێر کردووینەوە
ڕۆژمانە، ڕۆژ هەوری لابردووینە



ئەی ڕۆڵەی کورد ڕامەوەستە تێکۆشە
ئەوی کەڵکی قەومی نەگرێ بێ هۆشە
بڕوانە چۆن گەدایی دەوری داوین
ئێڵ و خێڵ و کەسوکار پێ بەداوین
ترسنۆک بین زوو لە هەوار بار ئەکەین
تانەی دوشمن لەسەر خۆمان بار ئەکەین
چە ڕەوایە پەست بێ و بمرێ ئەو کوردە؟!
بازووی پۆڵا مەردی ڕۆژی نەبەردە»

---

(١)بڕوانە سەرەتای ئەم دیوانە پیرەمێرد و بانگی کورد.
(٢) یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی گۆڤارەکە و ماوەیەک موتەسەریفی سلێمانی بوو.

***

## بەندی پەخشان یا واتای سەربەست[1]

١٩٣٣

لەزبانی (تازی)یەوە وەرگیراوە

برووسکەیە، کە، لە پڕ: دێ لە چاوتەوە، تیشکێ
ئەداتە: چاوم و ئەو نوورە دیدەمە چاوم

................................

گیانە، نەغمەی نەشیدەکەی ڕۆحت
بەندی لایلایەکە، بۆ ڕۆحم

................................

لەگەڵ شتێ بەدڵتا ڕادەبوورێ
دەمودەست، وا لە دڵما: بووینە یەک دڵ
کە دڵ تەنگ بێ. دڵەکوتێم دەگاتێ
لەبەینی دوو دڵا، ڕاستە کە ڕێیە

................................

تەلی چرایەک لە شەوقی تۆوە
بۆ جەرگ و دڵم ڕاکێشراوە
ئەو دەمەی کە تۆ بێ شەوق و کز بی
چرای دڵی من ئەکوژێتەوە

لەتاریکیدا ڕەنجەڕۆ و بێ کەس
لەگوێ ئاگردان سەرم کز ئەکەم

................................

تۆ بۆ من، تۆ تەنها بۆ من، هەموو شتێکی تۆ، بۆ من
خۆشەویستی و خۆشویستنم، زۆر پێخۆشە، بەڵام چیبکەم؟!
ئاخ هیچ کەسی تر ناناسم، کەوابوو تەنها بۆ من تۆی!.

................................

بنواڕە مانگ بەشەوقەوە شەو ڕووناک ئەکاتەوە
بنواڕە شەو، بەیانی نزیک خۆی ئەخاتەوە
سەیر کە، بەیانی باوەشی بۆ ڕۆژ ئەکاتەوە
بنواڕە ڕۆژ، کە تیشکی ئەڕێژێتە سەر زەمین
هەنگوین و شیر و ژین و غرامی ئەخاتە ناو!

................................

ئەی تۆ، کە، وتم، تۆ هەموو شتێکی منی تۆ
تۆ مانگی منی، سا، وەرە، ڕێ ڕوون کەرەوە بۆم
تۆ شەو بە، گوناهم بخە ژێر پەردەی زوڵفت
ڕووناکی بەیانی بە، جڵەوکێشی هەتاو بە
ڕۆژم بە، وەرە پاکمەوەکە، ببمەوە منداڵ
بەو عصمەتەوە لایق عەشقی ئەبەدیەت بم

................................

(١) پیرەمێرد هەر بەو ناونیشانە پەخشانە شیعرییەکەی وەرگێڕاوە. بڕوانە (ژیان) ٣٦١ساڵی ١٩٣٣.

***

## پیرەمێرد و دوو شیعری شێخ مستەفای تەختەیی

پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٤٩[١]دا ئەم شیعرەی وەرگێڕاوە و تەنها نووسیویە (شێخ مستەفا)، ئیتر هیچی لەبارەوە، نەنووسیوە. ئێمە ژمارەیەکی زۆری شیعری ئەم شاعیرەمان لە کەشکۆڵەکەی مەحموود پاشای جافدا دۆزیەوە کە لە چل پارچە شیعر زیاترە.

لەناو ئەو شیعرانەدا ئەم شیعرەشی تیادا بوو کە پیرەمێرد وەری گێڕاوە. شیعرەکە هەشت بەیتە، پیرەمێرد پێنج بەیتی لێ وەرگێڕاوە. دەقی شیعرەکە و وەرگێڕانەکە دەنووسین:

پیریی سوپای غەم جەم کەرد و ئاوەرد
مەتای جوانی گرد وە تاراج بەرد



بێ تینی تیندا وەتینی مەدا
ئەجەل بۆی فەنا وەبینی مەدا
قووەت جە ئەعضای بەدەن گورێزان
گوڵاڵەی شادیم باڵ و پەڕ ڕێزان
مەویەڕۆ جەلام ساتێ وە ساڵێ
تامووت جەستەم بییەن وەتاڵێ
مەسافەی میلێ بڕوو وە ماهێ
وەکۆهێن جەلام یەک بەرگ کاهێ
ئەساسەی فەنا یەکسەر ئامادەن
حەیفێ وێم سوار، ئیمان پیادەن
یاڕەب بۆ بەحەق پادشای لەولاک
بەعەشق شەهید صەدر سینە چاک
حوسن خاتیمەم ئارایش بکەر
خەجاڵەت نەبوون جەبەزم مەحشەر

وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد:

پیری لەشکری خۆی کێشا و هێنا
قەڵای جوانی هەڵگرت لە بەینا
بێ تینیی، بەتین وا درا بەسەرما
ڕووتی کردمەوە و خستمیە بەر سەرما
هەموو ئەساسەی مردن دیارە
من وا پیادەم، ئیمان سوارە
چۆنی دەگەمێ بەهێزی کەمی
ناتوانم دەریا ببڕم بەگەمی
سا خوایە لوتفت با نا خودام بێ
چونکو بەندەی تۆم مەیلت لەلام بێ

................................

(١)ژین ژمارە(٩٦٦) ساڵی ١٩٤٩.

***

## شیعری دووەمی شێخ مستەفا

پێش ئەوەی ئەم شیعرە بنووسین، ئەوەندی کە دەستمان کەوتووە سەبارەت بەژیان و شیعری ئەم شاعیرە دەخەینە پێش چاوی خوێنەران. مامۆستا (علی باپیر ئاغا) لە لاپەڕەی ٢١ی کتێبەکەیدا (شاعیرە ناو ون بووەکانی کورد) لەم بارەیەوە لەژێر ناونیشانی (فیراقی)دا کورتەباسێکی ئەم شیعرەی نووسیوە، کە گوایە شێخ مستەفا نازناوەکەی (فیراقی) بووە، بەڵام لەو شیعرانەدا کە ئێمە دیومانن تەنها ناوی مستەفا (مصطفی)ی نووسیوە. دیارە مامۆستا علی باپیر ئاغا هەر لە خۆوە ئەم نازناوەی بۆ نەنووسیوە و ڕەنگە وەختی خۆی بەو نازناوە ناسرابێت.

مامۆستا دەڵێت: «فیراقی، ناوی (شێخ مستەفا)یە، لە بنەماڵەی (چۆڕی) کوردستانی خۆرهەڵات لە ناوەڕاستی سەدەی دوانزەهەمی کۆچیدا ژیاوە، کاتێ خوێندنی تەواو کردووە، عاشق و سەودای (شێخ عوسمان سراج الدین) بووە، چووە بۆ تەوێڵە، ماوەیەکی زۆر لەوێ ماوەتەوە تا ساڵی (١٢٨٤) لەوێ تەمەنی دوایی پێ هێناوە. لە زانست و وێژەدا بێ وێنە بووە لە دەوری خۆیدا. ئەوەندە هەیە زۆرتری هەڵبەستەکانی فارسییە. تەنیا ئەم هەڵبەستەی کوردییە. لە کەشکۆڵی دەسنووسی محمود پاشای جاف وەرگیراوە، کە بۆ شێخ عوسمانی وتووە».

لێرەدا دوو تێبینی سەبارەت بەو نووسینە لای ئێمە دروست بوو:

١- زۆربەی هەڵبەستەکانی شێخ مستەفا کوردییە نەک فارسی، تەنها لەو بەشەی کەشکۆڵەکەی محمود پاشادا کە لای ئێمەیە زیاتر لە چل پارچە شیعری کوردی تیایە. نەک وەک مامۆستا نووسیویە، تەنها ئەو شیعرەی بەکوردی وتبێ.

٢- مەبەستی مامۆستا لە کوردی واتە شێوەی هەورامی (گۆران)ە. کە ئەو تەنیا شیعرەی ئەو لە کتێبەکەیدا نووسیویە، خۆی بەشێوەی هەورامییە و پیرەمێرد کردوویە بەشێوەی سلێمانی. نەک هەر خۆی وەها بووبێ کە ئەو نووسیویەتییەوە.

پیرەمێرد ئەو شیعرەی لە ژمارە ٩٢٥ی (ژین)ی ساڵی ١٩٤٨دا وەرگێڕاوە و بڵاوی کردۆتەوە.پێشەکییەکی کورتی بەم جۆرە بۆ نووسیوە «لە شاعیراندا شێخ مصطفی ناوێکمان هەبووە من نایناسم، محمود پاشا بەخەتی خۆی دیوانەکەی لە کەشکۆڵەکەیا، نووسیوەتەوە، ئەمە غەزەلێکی ئەوە»[1] ئنجا ئەو شیعرەی لای مامۆستا علی باپیر ئاغا و ئەمەی پیرەمێرد وەری گێڕاوە و بڵاوی کردۆتەوە هەر یەک پارچە شیعرە. لەوە دەچێت ئەوی کتێبەکە لە ڕۆژنامەکەوە وەرگیرابێت.

«نەقدی خەزێنەی تەجەللای زاتی
نامەی پڕ مەعنای شانی و سیفاتی
شەپۆلێکی دا نووری هەق تێدا
هەر ڕەگێ شەوقی ئەگەرا پێدا



زوبان هەمیشە خەریکی ذکرە
ئەعزام سەراسەر مەربوتی فکرە
سەروبەدەن و مێشک و ڕەگو پۆست
کەوتوونە ناڵە و زایەڵەی یادۆست
تەن وا بەجارێ خاڵی لە غەیرە
تەنیا تینی یار تێیدا لەسەیرە
هەستیی ونیستم لە دەست چوو یەک ڕەنگ
نەیچمی هاوارە بۆ کزەی ئاهەنگ
لێدە نەی تا، بێ ناڵەی لە گۆشم
بەڵکو بشێوێ پەشێوی هۆشم
بەسۆزی ناڵەی نەی بنوێمەوە
بە نەفخەی نەغمەی بیووژێمەوە
زیوی قەڵبی قەلب لە ناو بۆتەی حاڵ
جۆش دا و پاکتاو کا بێتە زیوی قاڵ

(١) ژین (٩٢٥) ساڵی ١٩٤٨

***

## چەند زانیارییەک سەبارەت بە (مەحموود پاشای جاف) لەسەرچاوەیەکی ڕوونەوە

لەم دیوانەی پیرەمێردا گەلێ جار ناوی مەحموود پاشا و کەشکۆڵەکانی هاتووە، خوێنەری وریا هەست دەکات، ئەم کارەی مەحموود پاشا کە ناو و بەرهەمی ئەو هەموو شاعیرەی بۆ تۆمار کردووین و لە فەوتاندن و کەمی و ناتەواوی ڕزگاری کردوون چەندە خزمەتێکی گەورەیە بەئەدەبی کوردی و چۆن بۆ هەموو سەردەمێک دەبێتە گەنجینەیەکی مێژینەی ڕۆژگارێکی ئەم ئەدەبە بەرز و جوانە. ئنجا بۆ ئەوەی لە نزیکترەوە و باشتر لە مەحموود پاشا و گەورەیی کارەکەی ئاگادار بین، ڕوومان نا لە بەڕێز (عەلی بەگی حسین بەگی جاف) و چەند پرسیارێکمان لەم بارەیەوە خستە پێش چاوی و ئەویش بەقەڵەمی جوان و هەستی بەرزی خۆی وەڵامەکانی بۆ نووسین، ئێمەش وەک خۆی نووسیمانەوە.

پرسیاری یەکەم:

ئایا مەحموود پاشای جاف چۆن خولیای ئەدەب و کۆکردنەوەی شیعری کوردی کەوتۆتە سەر؟

وەڵام: مەحموود پاشای جاف کوڕە گەورەی حەمە پاشای جاف بووە. حەوت برا بوون بەپێی ناوچە و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و دیمەنی جوان و ڕەنگینی کوردستان و بەتایبەتی ئەو هێڵ و

ناوچەیەی هۆزی جاف تیادا ئەژین و لە کاتی خۆیا تاکو ئەم ساڵانەی دواییەش گەرمیان و کوێستانیان تیا ئەکرد، لە ناوچەی قزرەبات و کفری لای خوارووی و ناوچەی مەریوان و دامێنی هەرێمی سنە بەجوانترین ناوچە ئەژمێردرێت لە وەرزەکانی ساڵدا، چونکە چ کاتێ ئەم ناوچانە جوان و ڕەنگین و دڵگیر بوون ئەمان لەو کاتانەدا تیا بوون و هاتوچۆیان تیاکردووە. بەوێنە گەرمیان لە زستانا جوان و خۆشە تیابوون. شارەزوور لە بەهار و پایزدا ڕەنگین و کانی خێر و پیت و بەرەکەت بووە. کوێستانیش لەهاوینا ڕەنگین و دڵفڕێن و دڵگیر بووە. کاتیان تیا بەسەر بردووە و هەر لە کۆنیشەوە لە پێش ئەوەی بەگزادەی جاف و هۆزەکەیان بێنە بەشی عوسمانی لە کوردستانی عیراق لە ناوچەی جوانڕۆ و باوەجانی و قوبادیا «کە لە بنەچەدا یەک پشتن» ئەو ناوچانەشی بەبەهەشتی سەر زەمین دائەنرێن ئیتر چ لە کۆن و کەلەپوور و بنەڕەتەوە و چ لە شێوەی تازەیشا لە ناوچەیەکدا ژیاون هەڵخەری بیری ناسک و هەستی بەجۆش و خولیای ئەدەب و ئەدەب دۆستی لەناخی دەروونیانا و لەناو ڕەگ و هەست و دەماریانا گەشەدار و جێگیر بووە. لەلایەکی تریشەوە بەپێی دەستڕۆیشتوویی و دۆخی ئەو سەردەمە و بەپێی پلەی کۆمەڵایەتیان کە پەیوەندیان هەبووە بەبابان و ئەردەڵانەوە لە کۆن و بەئێران و عوسمانییەوە لەو سەردەمەدا و باری خوێندن و خوێندەواری ئەو سەردەمەیش، لەسەرەتاوە مناڵ گۆش کراوە بەئامۆژگاری و شیعرەکانی حافظ و سەعدی و کلیم و شاعیرانی ناوداری ئەوسا و ئێستایش و ئەو مامۆستایانەی کە کوڕە بەگزادەکان لایان خوێندوویانە بەهەڵکەوتوو و بلیمەتی سەردەمی خۆیان ژمێردراون لەبەر ئەوەبوو کە مناڵێک بەو جۆرە و لەم ناوچانەدا و لەو چوارچێوەدا پەروەردە دەبێت، چۆن خولیای ئەم جۆرە شتانە ناکەوێتە سەری و ئەبێت بۆچی خۆی پێوە خەریک نەکات؟! من لە باوکم بیستووە ئەیوت: کاتێ بەگزادەی جاف گەرمیان و کوێستانمان ئەکرد لەگەڵ جافدا کوڕە بەگزادە شەوانی هەوار و ڕێ کۆچ کاتی خۆمان بەشەڕە شیعر و قسەی خۆش و نەستەقەوە بەسەر ئەبرد و کتێبە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەی وەکو شاهنامەی فیردەوسی و ئەسکەندەرنامە و ئەمانەمان ئەخوێندەوە. ئەبووین بەدوو دەستە شەڕە شیعرمان ئەکرد، کاتی وابوو هەوارە و هەوار بەردەوام بوو هیچ لایەک لاکەی تری بۆڕ نەئەدا، ئەوەندە شیعریان لەبەربوو. هەروەها بێجگە لەمانەش بەبیری من پەیوەندی بەگزادەی جاف لەگەڵ زانایانی ئەو سەردەمەی کوردستان و تێکەڵی و کارتێکردنی ئەدەبی فارسی و بوونی کەشکۆڵی کۆن وای لێ کردوون نەک هەر تەنیا مەحموود پاشای جاف کەشکۆڵی بێت بەڵکو ئەوانەی من بزانم، کەریم بەگی فەتاح بەگ و عبدالقادر بەگی سلێمان بەگ و ڕەزابەگی فەتاح بەگ کە هەرسێکیان برازای مەحموود پاشان کەشکۆڵیان هەیە و من دیومن. نەک هەر ئەمانە بەڵکو بارودۆخی لەباری ئەو سەردەمە تایبەتیە وای لە دەورووپشتی بەگزادەی جاف کردووە هەتا یەکێکی وەکو حاجی مەحموود یار وەیس پیاوماقوڵی مەحموود پاشا ئەویش کەشکۆڵی هەیە، من دیومە کە حەتتا شیعری (سالم)ی صاحبقرانی لە ساڵەکانی ١٢٩٠ بەم لاوە تیا نووسیوەتەوە. ئەوەتا مەحموود پاشا ئەوەندە هەستیار و بیرتیژ بووە سەردەم و ڕۆژ و





کاتەکانیشی نووسیوە، بۆ وێنە ئەڵێت: لە شارەزوور لە کاتی مەرەزە داچاندندا بەهار کاکە ئەحمەدی خەسرەو چاوەش هاتووە بۆ لام ئەو شیعرانەی بۆ خوێندمەوە و نووسیومەتەوە کە تەمەنی ئەو کاتەی لە بیست ساڵ تێپەڕی نەکردووە. هەروەها ئەڵێت! لە زمناکۆ فیرار بووم لە ساڵی ١٣١١ی کۆچیدا مەلا یوسف یاخود سەید فەتاحی جەباری ئەم شیعرانەی وەلی دێوانەی بۆ وتم و من نووسیمەوە جا پیاو بیری لێ بکاتەوە مەحموود پاشا ئەو کاتە تەمەنی چل و نۆ ساڵ بووە بەگۆرانی شیعری بۆ بڵێن و ئەم دوایی بینووسێتەوە وەیان لەکاتی دەستبەسەریا لە ئەستەموڵ ئەڵێت لە کەشکۆڵی فلانەوە ئەم شیعرانەم لەم کاتەدا نووسیوە.

پرسیاری دووەم:

ئایا ئەو کەشکۆڵە تا ئێستا لەم هەموو سەردەمانەدا چۆن پارێزراوە و کەوتۆتە لای چەند کەس؟.

وەڵام: وەکو لەسەرەوە باسمان کرد چۆنیەتی پارێزگاری کەشکۆڵەکە تاکو سەردەمی ژیانی خۆی هەمیشە لای خۆی بووە و هەتا لە کاتی دەستبەسەری و دوای فیراریا هەرپێی بووە و ئەو شیعر و باس و خوازانەی تیا نووسیوەتەوە. بۆ وێنە کە لە ئەستەموڵ فیرار ئەکات ئەچێتە خاکی ڕووس و لەوێوە بۆ ئێران و ئنجا ئەگەڕێتەوە بۆ کوردستان، لە (باکۆ) لە بەرگی سیاحەت و گەشتا و حەتتا مەلا محەممەدی سنەیی پیاوی بووە ئەو جلی باشی لەبەرکردووە و خۆی خراپ وەکو نۆکەری ئەو تاکو نەیناسن. لە باکۆ وێنەی خۆی ئەگرێ و لەژێریا ئەم شیعرەی مەولەوی ئەنووسێ:

داخـۆ چەرخ چەپ چەواشـەی چەپگەرد
پەی کـام دەردی سـەر نگەهداریم کـەرد

دوای خۆیشی، وەک لە خوالێخۆشبوو (حەسەن فەهمی بەگی جاف)ی کوڕەزایم بیستووە کە عەلی بەگی باوکی حەسەن بەگ کۆچی دوایی ئەکات کەشکۆڵەکە ئەکەوێتە دەستی حسێن بەگی مامی ئەویش لەبەرئەوەی کەمتر تاقەتی ئەو جۆرە شتانەی بووە، پیرەمێرد بەئەمانەت لێی وەرئەگرێت، دوایی حەسەن بەگ وتی: ئەو کاتە کە باوکم وەفاتی کرد تەمەنم (١٦-١٧) ساڵ بوو بەڵام وانەبووم کە زۆر خۆم بەمانەوە خەریک بکەم، هەرچەند کەشکۆڵەکەم ئەخوێندەوە لە کاتی خۆیا خووم لەگەڵیا بوو بەڵام لەبەر مامم ئەوەندە لەسەری نەڕۆییم تاکو لە سەرەتای سییەکانا هەستم کرد، چوومە لای پیرەمێرد داوایم کردەوە ئەویش ئەم ڕۆژ بۆ ئەو ڕۆژ و ئەم کات بۆ ئەو کات کاتی بەسەرئەبرد و منیش گەییمە سنووری وەڕسی و یەئس. ناچار هادی ئەفەندی خوشکەزای پیرەمێردم ڕاسپارد و لەگەڵیا ڕێککەوتم بۆم بدزێتەوە بەبیست دیناری سەرەتای سییەکان! بەو جۆرە دەستم کەوتەوە. لەوکاتیشەوە هەر لای حەسەن فەهمی بەگە و ئەویش هەمووومان ئەزانین یەکێک بوو لە هەرە ئەدەب دۆست و ئەدیبە ناسکەکانی کورد و هەتا لەشەوق و تەوژمی ئەدەب و ئەدەب دۆستیا شیعریشی هەیە کە کەم کەم بەفارسی و کوردی ئێستاش دوای مەرحوومی حەسەن بەگ لای هۆشمەندی کوڕیەتی کە تەمەنی درێژ و بەختەوەربێت زۆر لە

ڕەوشتی پاراستنی ئەو جۆرە شتانەی لە باوکی و باپیریەوە بۆ ماوەتەوە و پاراستوونی بەتایبەتی کتێبخانە گەورەکەی باوکی کە ئێستاش لایەتی و خەڵک زۆر کەڵکی لێ وەرئەگرێت.

پرسیاری سێیەم:

تکایە باسی بەسەرهاتی کەشکۆڵەکەمان بۆ بکە لە هەردوو جێگای ئەستەموڵ و زمناکۆدا:

وەڵام: کەشکۆڵەکەی مەحموود پاشا تەنها لە دوو جێگا نەنووسراوەتەوە، لە ئەستەموڵ و لەزمناکۆ چونکە پاشا بۆ هەرکوێ چووبێت کەشکۆڵەکەی لەگەڵ خۆیا بردووە. ئەستەموڵ و زمناکۆ، جێگەی هەمیشەیی پاشا نەبووە. بەڵکو لە ئەستەموڵ دەستبەسەر بووە، دوایی لەوێ فیراری کردووە و وەکو باسمان کرد بەڕێگای باکۆدا هاتۆتەوە کوردستان و ئەو ماوەیەشی تاکو حکومەتی عوسمانی بەخشیویەتی لە زمناکۆ بووە هەندێ شیعری لەوێ تیا تۆمار کردووە بۆ وێنە لە ڕووسیا بەئەرمەنستاندا تێئەپەڕن مەلا محەممەدی سنەیی پیاوی شاعیر بووە و کچە ئەرمەنی جوانیان زۆر دیوە، هەندێ شیعری جوانی وتووە بەشۆخ و شەنگی کچە ئەرمەنیا من سێ چوار بەیتێکی کە مەرحوومی باوکم لەبەری مابوو نووسیوەتەوە هەر لەلامە. بەم بۆنەیەوە حەز ئەکەم شتێکی تر بدرکێنم، ئەگەر سوودی نەبێت زیانی نییە. ئەویش: مەحموود پاشا بەخۆیەوە حەوت برا بوون خۆی براگەورە بووە و براکانیشی ئەمانەن: وەسمان پاشا، حەسەن بەگ، سلێمان بەگ، حەمە عەلی بەگ، قادر بەگ، فەتاح بەگ، لە ئەنجاما مەرگی هەر شەشیانی دیوە و کەوتووەتە دوای ئەوان و سۆز و پەرۆشی کۆچکردنی ئەوان وای لێ کردووە بەشیعر شتێکیان بۆ بکات کە بیست و چوار بەیتە و لە کەشکۆڵەکەیدا هەیە و منیش لەلام هەیە وەکو سەرچاوەیەک بەخەتی حەسەن بەگ خۆی. پیرەمێرد هاتووە ئەم بیست و چوار شیعرەی کردووە بەنۆزدە شیعر و پێنجی لێ لابردووە و دواییش لە نۆزدەکەی تر حەوتی لابردووە خۆی حەوتی بۆ زیاد کردووە واتە لە تێکڕای بیست و چوار بەیت دوانزەی لێ لابردووە و خۆی حەوتی بۆ زیاد کردووە و لە دیوانی پیرەمێردی نەمری محەممەد ڕەسوڵ هاوار دا بەناوی (یادی مەحموود پاشای جاف)ەوە بەشیعری پیرەمێرد دانراوە. هەتا پیرەمێرد قادر بەگی مامی بەقادر بەگی برای مەحموود پاشا ئەزانێت ئەو قادر بەگەی مامی کە مەولەوی شیعری شیوەنە بەناوبانگەکەی بۆ وتووە.

پرسیاری چوارەم:

ئایا ڕێگای گەرمیان و کوێستانی جاف لە کوێوە بۆ کوێ بووە؟

وەڵام: هۆزێکی گەورە و فراوانن و دوای ئەوەی لەسەردەمی سوڵتان مورادی عوسمانیا لە ناوچەی جوانڕۆوە هاتوونەتە کوردستانی ئەو سەردەمە کە بەش کرابوو لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێراندا لەسەر هەندێ هۆی تایبەتی ئەو سەردەمە لە ناوچەی (دزیایش) – دەربەندیخانی ئێستا – دا نیشتەجێ بوون دوایی پەرەیان سەند، وردە وردە دەستیان گرتووە بەسەر شارەزوور و گەرمیاندا، گەرمیان و کوێستانیان کردووە. دوای پەرەسەندن و گەشەکردن و زۆر بوونیان و هاتنی دەستە دەستەی تیرەکانی جاف لە ئێرانەوە بۆ ئەم ناوچەیە و دەوری (زاهیر



بەگ)ی سەرۆکی جافی ئەو سەردەمە و دامەزرێنەری جامی مورادی و باپیرە گەورەی بەگزادە جافی مورادی، کە جاف بەم پێیە دوو بەشن، جافی جوانڕۆ لە ئێران و جافی مورادی لە عیراق. جافی ئێمە لە دوای ئەوەی لەسەردەمی مەدحەد پاشای والی عوسمانی بەغدادا کە زەوی و زاریان ئەفرۆشت بەنیازی نیشتەجێی هۆزە گەرمیان و کوێستانکارەکانی ئەو سەردەمە حەمە پاشا و مەحموود پاشای کوڕی کەوتنە کڕینی هەرچی زەوی و زاری قەڵەمڕەوی جاف هەیە و ئێستایش لەسەنەدەکانی زەمانی عوسمانیا بەناو و سنوور و نرخی کڕینیانەوە هەمووی تیایە و زۆری لەلایەن نەوەی خاوەنەکانیانەوە پارێزراوە. ئیتر جاف لە سنووری (جبل حمرین)ەوە تاکو شلێر و (ناوخوان) هەمووی بوو بەموڵکی تاپۆی بەگزادەی جاف. بێجگە لە هەندێ جێگای تایبەتی کەم نەبێت یان بەدەست میرییەوە مایەوە یان کەسانی تر خاوەن تەکیە و پیاوماقوڵانی ئەو سەردەمە کڕیان یاخود میری پێی بەخشیون. ئیتر جاف لە (قزرەبات)ەوە کەوا دامێنی کوردستانە تاکو شلێر و ناوخوان بەشی کوردستانی عیراق و لەو دیو سنووریشەوە هەتا ناوچەی مەریوان و گۆلی زرێبار و لای خوارووی ناوچەی سنە، لە زستانا لە ناوچەی گەرمیانەوە لای خوارووی قزرەبات و شیروانە و کەلار و پێباز و شارەزوور و پێنجوێن و ئەو دیو سنووریش ئەوانەی سەرەوە بەزستان و بەهار و هاوین و پایز هاتوچۆیان تیا کردووە. بۆ چەسپاندنی ئەوەش جاف چۆتە ناو ئێرانیشەوە هەتا موڵک و زەوی و زاریشیان لەوێ کڕیوە و هەیانە. بەتایبەتی ئاغاکانی گەلاڵی ئەوەی (کلودیوس ریچ) لە گەشتنامەکەیدا ئەڵێت: «کە چوومە ماڵی کەیخوسرەو بەگی سەرۆکی هۆزی جاف هاوینی ١٨٢٠، لە کاتێکا ئەچووم بۆ سنە بۆ دیدەنی ئەمانوڵڵا خانی والی ئەردەڵان، لە سنە ماڵی کەیخوسرەو بەگ لە نزیک گۆمی زرێبارەوە بوو، ئەو میوانداریییەم هەتا مردن لە بیر ناچێتەوە». بەم بۆنەیەوە جاف بەشێکیان پەڕیونەتەوە ناوچەی دوکان لە پارێزگای سلێمانی کە ئەوانیش سمایل عوزەیری بوو، جافە ڕەشکەن، ئەوان لەو ناوچەیەوە لە کاتی خۆیا گەرمیان و کوێستانیان کردووە و ئێستاش خۆیان بەجاف ئەزانن.

گەرمیان و کوێستانی کردنی جاف ئەوەندە جێگر و چەسپاوە لە ناخیانا چونکە زۆربەی کە وتت جاف واتە ئاژەڵدار و مەڕوماڵات بەخێوکەر، هەتا ئەم ساڵانەی دواییش گەرمیان و کوێستانیان ئەکرد. هەر نەشبوایە تاکو ناوچەی پێنجوێن ئەچوون بۆ لەوەڕخۆری هەرچەند ماڵ و لەگەرمیان جێگیر بوو بوو بەڵام هاوینان ئاژەڵەکانیان، شوان کەژاوکەژ ئەیانبردن و خۆشیان بە(بنە) واتە (ماڵی سووک و کەم) بەلۆری یان عەرەبانەی تراکتۆر لە گەرمیانەوە ئەهاتنە شارەزوور یان چاوەڕوانی ئاژەڵەکەیان ئەکرد یان لەوێ لایان ئەبوون بەو نیازەی بەڵکو ئەگەر میری عیراق و ئێرانیش وەکو جاران ڕێگەیان نەدەن بۆ لەوەڕخۆری بچنە ئێران بەڵکو بچنە ناوچەی پێنجوێن جا بەو بۆنەیەوە ئەم شیعرەی مەولەوی کەوا ئەزانم یان لە شینەکەی (ئەمنە خانی ژنی بارام بەگ)دایە، یان لە شینەکەی (قادر بەگی کەیخوسرەو بەگ)دایە کە ئەڵێت:

زیرەی تەڵـــمـیـت بار کـــۆچ نەو هاڵان
تەئسـیـرش نیـەن ئەم سـاڵ چون سـاڵان

داخ و حەسرەت بۆ کز بوون و ئاڵۆزاوی ڕێ کۆچی ئەو ساڵە ئەخوازێت!.

پرسیاری پێنجەم: ئایا چ زانیارییەکتان لەبارەی کەشکۆڵی کەریم بەگی فەتاح بەگ و ڕەزا بەگی فەتاح بەگی برایەوە لەلایە؟

وەڵام: ئەدەب دۆستی و گۆش کراویی بەگزادەی جاف بەئەدەب و شیعر و فۆلکلۆری کورد بووە. شتێکی ئاشکرا و لەبەردەستایە (بەپێچەوانەی برادەرێکی مامۆستای هەستیار)ەوە کە لە نەدوەیەکی تەلەفزیۆنیا لە سەردەمێکی تایبەتیا ئەیوت بەهەموو تەنگاویەکەوە دەرەبەگەکان شیعر و ئەدەبی کوردیان کوشت و لەناویان برد... هتد.

حەز ئەکەم ئەو برادەرە هەندێ لەو کەشکۆڵانەمان پیشان بدات کە ڕاو بیرەکانی ئەو هەڵیان گرتووە بۆ میللەتی بەدبەختی کورد. بۆیە کەشکۆڵەکەی کەریم بەگ و ڕەزا بەگی برای هەر لە هەمان سەرچاوە و هەستەوە هاتووە. کەشکۆڵەکەی کەریم بەگ زیاتر لە هەزار لاپەڕەیە هەمە جۆر شیعر و باس و قسەی نەستەق و بەسەرهات و شین و مەرسیەی تیایە و هەندێکیان کۆن نووسراونەتەوە و هەندێکیشیان لەم سەردەمەی دواییدا نووسراونەتەوە. کەشکۆڵ واتا ئەوەی هەموو جۆرێک شتی تیا بنووسرێت، مەرج نییە تەنیا شیعر بێت هەتا هەندێ (خاطرات) و شت بەبیرا هاتن و مێژووی لەدایک بوون و بەسەرهاتی گرنگی ئەو سەردەمە یاخود بۆ کۆنیش ئەگەڕێتەوە. کەشکۆڵەکەی کەریم بەگی ڕەحمەتی شتی پێکەنین و خۆشی تیایە کە کەریم بەگ خۆی دروستی کردووە و دەستی تیا هەیە بەوێنە ئەنووسێت بۆ باوکم کە لێرە لە سلێمانی بەشێخ سەلامی عازەبانی شاعیر بڵێت هەجوی شێخ وەسمانی قەڵاگە لە گەرمیان بکات بۆ بزوانی شێخ محەممەد. شێخ سەلامیش پارچەیەک شیعری هەجو ئەنووسێت بۆ شێخ محەممەد ئنجا کێچ ئەچێتە کەوڵی شێخ محەممەد و هاوار ئەباتە بەر حەمە ئەمین بەگی کوڕی کەریم بەگ «شاعیرە و دیوانی چاپ نەکراوی هەیە» ئەویش لە زمانی شێخ محەممەدەوە وەڵامی شێخ سەلام ئەداتەوە و دوو پارچە شیعری گاڵتەی ئەتوانم بڵێم کراوە و پیسن بەڵام هەتا ئەمانەی تیایە و شیعرەکەی شێخ سەلامیش کە بەشێخدا وتوویەتی ئەو شێخانەی ئیرشاد ئەکەن و دەروێشیان هەیە و کاک بەهائەددین شێخ نووری بابە عەلی تەکیەی لە کاتی فەقێیەتیا لەسەر شێخ و تەکیە هاتۆتە جواب ئەویشی تیایە و خەتخۆشیان هێناوە و شتیان پێ نووسیونەتەوە. بەڵام کەشکۆڵەکەی ڕەزا بەگ ئەگەر هەمووی خەتی خۆی نەبێت زۆربەی زۆری خەتی خۆیەتی چونکە خۆی زۆر خەتی خۆش بووە زۆر ڕێکوپێک و ڕازاوەی نووسراوەتەوە. هەر بەم بۆنەیەوە کەشکۆڵەکەی عەبدولقادر بەگی سلێمان بەگی حەمە پاشای جافیش کە لەدەوری بیستەکانا عەبدولقادر بەگ دەستی بەنووسینەوەی کردووە زۆر شیعر و دوعا و پارچەی پەخشانی تیادایە و هەتا ئەم دواییەش لای محەممەد بەگی کوڕی بوو کە ئەو وەفاتی کرد نازانم کەوتە لای کێ هەتا من موناجاتەکەی مەولانا



خالید کە بەشێوەی گۆران (هەورامی) نووسیویەتی سەد و چوار بەیتە لەو کەشکۆڵەم دەرهێنا. ئەنجاما زۆر سوپاسی مامۆستا ئومێد ئاشنا ئەکەم کە ئەم هەلەی بۆ گونجاندم ئەم لایەنانە ڕوون بکەمەوە بەم کورتییە، هیوادارم لە دەرفەتێکا بتوانم ڕووناکی بخەمە سەر هەندێ شتی تر لەم بارەیەوە هەر کەس لە شوێن و توانا و بۆگونجان و بۆلوانی خۆیەوە دەستی یارمەتی بۆ کەلەپووری نەتەوە بەدبەختەکەمان ڕاکێشێ.

***

## پیرەمێردو دە پارچە شیعری مەستوورە

لەلاپەڕە(٢٨١)ی ئەم دیوانەدا نووسینێکی پیرەمێردمان بڵاوکردەوە سەبارەت بەمەستوورە و دیوانەکەی. وە لە ساڵی ١٩٤٥دا پیرەمێرد دە پارچە شیعری مەستوورەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لەڕۆژنامەکەیدا بڵاوی کردۆتەوە.

ئەو دیوانە بەنرخەی کە بەو خەتە جوانەی مەستوورە نووسراوەتەوە و ئەو دیوانە شیعریەش کە هەر مەستوورە خۆی نووسیویەتیەوە و دیوانی شیعری خەسرەو خانی والی سنەیە، بەداخەوە هەتا ئێستا لە هیچ لایەکەوە هەواڵ و شوێنەواری نییە. ئەوەی بۆ ئێمە ماوەتەوە ئەو دە شیعر و ئەو نووسینە کورتەی پیرەمێردە، کە چەند زانیارییەکی لەبارەی شێوەی خەتی مەستوورە و دیوانەکەیەوە بڵاو کردۆتەوە. ئنجا بۆ زیاتر شارەزا بوون لە مەستوورە و شیعرەکانی ئێمەش لای خۆمانەوە ئەو زانیاریانەی بەدەستمان هێناوە بڵاودەکەینەوە:

دکتۆر مارف خەزنەدار لە کتێبی (دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی)دا نووسیویە «مەستوورە، ناوی ماه شەرەف خانمی ئەردەڵانی کوردستانییە، کچی ئەبولحەسەن بەگی کوڕی محەممەد ئاغایە، خێزانی خوسرەو خانی والیی کوردستانی ئێران بووە. لە ساڵی ١٨٠٥ی زایینی لە شاری سنە لە دایک بووە ژنێکی یەکجار جوان و شۆخ و شەنگ بووە. شیعری بەکوردی و فارسی هەیە، زۆربەی ئەو شیعرانە لە بابەت دڵدارییەوەن، بەتایبەتی شیعرە کوردییەکانی (بە شێوەی گۆرانی – هەورامی) یەکجار بەسۆزن.

خوێندەوار و ڕۆشنبیرێکی چاک بووە. شارەزایی لە زانستەکانی ئایینیدا بووە و دەستێکی درێژیشی لە زانستی مێژوودا بووە. شیعرە فارسییەکانی لە ساڵی ١٩٢٥دا لە تاران لە چاپ دراوە. (دیوان ماه شرفخانم کردستانی، لناشره آقای حاجی شێخ یحیی معرفت، تهران، ١٣٠٤ ه.ش)، شیعرە کوردییەکانی لە دەسنووسێکدایە لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠٠دا نووسراوەتەوە. ئێستاکە لە ئێرانە و هێشتا چاپ نەکراوە. لە بارەی مێژووی بنەماڵەی ئەردەڵانەوە کتێبێکی داناوە لە ساڵی ١٩٤٧ لە سنە لە چاپ دراوە (تأریخ أردلان، لناشره ناصر ئازادپور–سنندج (١٣٢٦) ه.ش).

مەستوورە هاوچەرخی سوڵتان خانمی ئەردەلانی بووە. کە خوشکی خوسرەو خانی والییە.

ئەمەش شاعیر بووە و دەستە خوشکێکی نزیکی مەستوورە بووە. ساڵێک پێش کۆچی دوایی مەستوورە هاتووە بۆ سلێمانی. لە ١٨٤٧دا کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان نێژراوە. دەبێ جۆرە پێوەندییەکی لەگەڵ نالیدا بووبێ»[١].

هەروەها لە (دیوانی نالی) مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕانیدا نووسراوە «مەستوورە، ناوی ماه شەرەف خانم و کچی ئەبولحەسەن بەگ ناوی لەلەی شازادەکانی ئەردەڵانە و لە ١٢٤٤ی کۆچی ١٨٢٨-١٨٢٩ی زایینیدا خوسرەوخان بەنیازی دڵدانەوەی ئەبولحەسەن بەگی باوکی مارەی کردووە. ئافرەتێکی شاعیر و ئەدەب پەروەر بووە»[٢].

لەکتێبی ئافرەتە ناودارەکانی کورددا نووسراوە: «رضا قولی خان هیدایەت لەبەرگی دووی کتێبی (مجمع الفصحاء)دا لەلاپەڕەی ٤٥٦ لە بارەی بەسەرهاتی مەستوورەوە نووسیویەتی و ئەڵێ:

مەستوورەی کوردستانی لە ئافرەتە خانەدانە بەناوبانگەکانی کوردستانە، کچی ئەبولحەسەن بەگ و ژنی خەسرەوخانی والی سنەیە. نووسینی دەستی زۆرجوان و خۆش بووە. شاعیرێکی گەورەیە، ژنێکی ئابڕوو جوان و ڕەوشت بەرز بووە. ناوی (ماه شەرەف خانم) بووە. لە ساڵی ١٢٦٣ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە». میرزا عەلی اکبری صادق الملک لە کتێبەکەیدا (حدیقەی ناصری) کە مێژووی کوردستانە ئەڵێ: «ماه شەرەف خانم کە ناوبانگی لە هەڵبەستا (مەستوورە)یە وە ئامۆزای منە و بەڕاستی هەڵئەگرێ لەبەر زیرەکی و وریایی و هۆنراوە بێ هاوتاکانی و دەسنووسە جوانەکەی، گفتوگۆ شیرینەکەی، ڕاست نووسین و دەربڕینە نایابەکەی مێژوونووسانی جیهان بۆ یادگار بەئاوی زێڕ ناوی تۆمار بکەن. نزیکەی بیست هەزار هۆنراوەی بەنرخی هەیە وە چل و چوار ساڵ ژیاوە»[٣].

هەروەها لە گۆڤاری (ئۆتۆنۆمی) ژمارە ٣ ساڵی ١٩٨٤دا، کاک ئیسماعیل تەنیا نووسیویە «لەساڵی ١٢٦٢ی کۆچیدا بەهاوڕێیی حسەین قولی خانی ئەردەڵانی پورزای خۆی هەڵدێت بۆ سلێمانی بۆ لای عبدالله پاشای بابان و، لە ساڵی ١٢٦٣ی کۆچی لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا هەر لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی دەکات و لە گردی سەیوان دەنێژرێت»[٤].

ئەم بیروڕایانەی کاک ئیسماعیل لە هەندێ جێگەدا لەوتارەکەیدا جێگای سەرنجە، ئەگەرچی ئەویش، زۆربەی نووسینەکەی لەو سەرچاوانەوە وەرگرتووە کە خۆی لەپەراوێزدا نووسیونی. بەتایبەتی ساڵی مردنی مەستوورە، کە ١٢٦٣ بێت و لە ساڵی ١٢٢٠دا لەدایک بووبێ، چۆن ٢٢ ساڵ ژیاوە. دیارە بەو حسابە ٤٣ ساڵ ژیاوە، ڕەنگە ئەو ژمارەی (٢٢)ە هەڵەی چاپ بێت. بەهەرحاڵ لێرەدا تەنیا بیروڕاکانی لەمەڕ مەستوورەمان خستە پێش چاوی خوێنەران و ئەگەر دیوان و نووسینەکانی مەستوورە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەرکەون ئەوا گەلێ زانیاری هەڵە لەبارەیەوە ڕاست دەبێتەوە و ژیان و بەسەرهات و بەرهەمەکانی لە نزیکترەوە دەناسرێن.

پیرەمێرد ئەوەندەی ئێمە ئاگاداربین هەر دە (١٠) پارچە شیعری مەستوورەی وەرگێڕاوە. بەڵام



دیوانی ئەو و خەسرەوخانی بەختی مەستوورە لەلا هەبووە.

.........................................................

(١)دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی د. مارف خەزنەدار. ل٣٦١

(٢) دیوانی نالی مەلا عەبدولکەریمی مدرِس و کوڕانی ل ٦٠٤، کە ئەوانیش ئەو زانیارییانەیان لە مێژووەکەی ئایت الله مەردۆخ وەرگرتووە. بەشی دووەم لاپەڕەی ١٦١.

(٣)«ئافرەتە ناودارەکانی کورد» عەبدولجەبار محەمەد جەباری ل٥١

(٤) گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ژمارە ٣ ساڵی ١٩٨٤ ئیسماعیل تەنیا ل٧٢

***

## شیعرەکانی مەستوورە

### ١

ئەمڕۆ کە هەوا ساردە، کزەی بادی خەزانە
گەرمم کەرەوە ساقی، دەمی تێکخزانە
گوێ مەگرە لە زاهد مەڵێ مانگی ڕەمەزان
جەژنی منە، فتوایشی لەلای پیری موغانە
ئەی ڕۆحی ڕەوان ڕاحی ڕەوانم بدەرێ تۆ
ئەمە ڕاحە قومێکی لە بری ڕۆحی ڕەوانە
ئاوی حەیوان بادەیە، با، دەی بی لە (دەی)دا
هەرچی نەیەوێ پیاو نییە تۆوی حەیوانە
من مولْکی جیهانم ئەدەمە مەی لە جیهانا
چونکو ڕوتبە و قەدری جیهان بەرقی جەهانە
سەرمەستی من وا نییە تەنها بە شەراب بێ
مەخمووری و نەشئەم لە نیگای دیدەیی جوانە
زولفت کە لەسەر شانە، پەرێشانە بەشانە
بەو بۆنەوەیە بادی سەبا مشک فشانە
لەرزەی دڵم ئەی گوڵ بەکزەی بارِەشی دووری
وەک شاخی سنەوبەر کە زەبوونی جەولانە
(مەستوورە) تیلای چاوی ئەوێ بۆیە لە دنیا
چاو ناترووکێنێ وەکو نەرگس نگرانە

## ٢

ئەی خاکی بەری پێت کە لەسەر سەرمە وەکو تاج
بەو تاجە ئەسێنم لە مەهـ و مێهر و فەلەک باج
دەرگاکەتە شاهانی زەمان ئەیکەنە مێعراج
برژانگ کە وەکو تیرە لە قەوسەینی برۆتا
گەر تێمگری گیان حازرە بۆی ئەیکەمە ئاماج
من کوشتەی دووریتم و لای تۆ دەمی عیسا
من کافری عەشقم کە برۆی تۆ دەکەمە خاج
قوربانی تیلای چاوتم ئەی چاو ڕەشی بەختم
دنیا بەچرای تەلعەتی رووت روون ئەبێ وەک رۆژ
لادە پەچەکەت رۆژ هەڵێ تا کەس نەبێ محتاج
کووتاڵی جوانیت کە بەدنیادا بلاوە
بەش جوێ کەرەوەی گرە (مەستوورە) دیباج

## ٣

رووتە کە رووتە یا شەبەنگی مانگی ئاسمان
قەدی خرامی تۆیە وەیا سەروی بوستان
نەمدیوە مانگ کلاوی لەسەرا بێ تۆ نەبی
سەرویش کە بێ رەوانە وەکو تۆ نییە رەوان
فەسڵی بەهار لە دەوڵەتی تاسەر عەزیز ترە
مەعشووقی جوان و بادە و ناوباغ و گوڵستان
یاشێخ ئەوەندە ناوی بەهەشتم لەلا مەبە
من رووی نیگاری تۆم، بەسە، وا دام بەتۆ جنان
گیانە لەوانە نیم کە بۆ گیانێ لەلات برۆم
گەر تیر ببارێ حازرە دڵ، ئەیکەمە نشان
رێگەم بدەی بەخاکی بەری پێت کە ماچی کەم
پێی خۆم بەفەخرەوە ئەخەمە فەرقی فەرقەدان
(مەستوورە) لێو و روو و دەمی یار پێم کەرەم بکا
شەهدی حەیات و ئاوی بەقا و عومری جاویدان



## ٤

غەمی تۆ بۆیە وێرانەی دڵ ئەکاتە مەسکەن
عادەتە گەنجی جیهان ئەگرێ لە وێرانە وەتەن
داروپەردووی جگەر و سینەمی سووتاند گڕی عەشق
ناو سکم پڕ لە چەرەدووکەڵە وێنەی گلخەن
چاو کە رووی تۆی نەدی ئەیزانی چییە؟ چاوگەی خوێن
دڵ کە تۆی تیا نەبی، ئەیزانێ چییە بەیتی حەزەن
دڵ گرفتارە لەناو چاڵی چەناگەی تۆدا
هەر دەڵێی کەوتۆتە ناو چاڵی هیلاکەت بێژەن
با بەهاریش بێ بەمن چی گوڵ و بای نەورۆزی
تا گوڵی رووی تۆ بێ چییمە لە سەیری گوڵشەن
تۆ کە رووی خۆت بنوێنی کەسی تر نانوێنێ
مانگ و ئەستێرە ئەشارێتەوە رۆژی رەوشەن
خەڵوەتێکم ئەوێ خاڵی لە کەس و بێگانە
خاڵ و مام دەرنەکەون، دەرکەوێ خاڵی گەردەن
رۆژی من هێند رەشە نایێتە خەیاڵم رۆژێ
خۆی بشارێتەوە تەنها لە پەنای دار و دەوەن
دەمی (روح القدس)ی پێ ئەوێ (مەستوورە) لە خوا
شیعری بیکری وەکو مریەم بێ لە (اعجاز سخن)

## ٥

دڵی بێچارە دیسان دەستبەسەری زنجیرە
چیم لەدەست دێ کە ئەمە لازمەی تەقدیرە
شەوی تەنهایی کە یادت بەدڵمدا دێنم
باعیسی ناڵەی شەبگیرە کە بێ تەئسیرە
کاتبی لەوحی ئەزەل ناوی بە (غەمبار) نووسیم
سەرنووشتێکە، نەرێی دادە، نەجێی تەدبیرە
وەرە تو خوا کەرەتێ پێ بنێرە سەر چاوم
ماڵی وێرانە بەئاو چاوی لەرێی تەعمیرە
بای سەبا هات و وتم بۆنی ئەوت لێ نایە

وتی چی بکەم؟! بەهەوایش ڕەحمی نییە بێ پیرە
چاوی مەستت کە گەلێی تێکەوە پێچا و بردی
کەس خەلاس ناکا دڵێی قورعەییێکی ڕەشگیرە
بە دڵم وت کە منت ناوێ بڕۆ لای ئەو بە
وتی چووم و دەری کردم، لەوەوە لێت زویرە
تیری برژانگت ئەمەندە زۆرە گلم داوەتەوە
جەرگی (مەستوورە) ئەڵێی ئۆدەی وەستای تیرە

٦

دڵی بێچارە کە بێ تاب و توان لەرزانە
وەک گەڵای دارە لەدەست بادی خەزان لەرزانە
باسی جوانیت کە کرا چارە نییە من دەگریم
تۆیش بەوە پێدەکەنی چاو و دەهات لەرزانە
باری قورسی غەمی دووری تۆ لەسەر ئەستۆمە
هێزی ئەندامم لەبەر باری گران لەرزانە
ئاورت دایەوە، شۆرێکی وەهات خستە سەرم
شەو بەناڵەی منە وا ئەهلی جیهان لەرزانە
هاتمە دەرگاکەت و شەو شینی جوانی خۆم کرد
وەکو حەلقە بەفغانم لاشیپان لەرزانە
گیانی خۆم کردە نیشانە بەهیوا بۆ تیرت
تێر لەتیر نابم و دڵ وەک ژێ کەوان لەرزانە
تیغی ئەبرۆت کە دەبینم گوڵە جۆیەکە دڵم
دەورەی پێ دەوێ بۆ داسی سەپان لەرزانە

٧

وا گەییم بەتۆ لە دوای ناڵە و ئاه
ڕسگار بووم لە خەم الحمدلله
ئیتر بەسیەتی ڕوو وەرمەگێرە
هێزم نەماوە بۆ دووریت وەاللە
وەک گوڵخونچەی باخ جەرگم پڕ خوێنە
بەیادی لێوی لەعل ئاسای دڵخواه



کەی سەروو ئەتوانێ بڵێ بالای تۆم
کەی لە ڕووی تۆدا خۆی ئەنوێنێ ماه
واعیز بەسیەتی ئەفسانەی تۆبە
تۆبە لە تۆبە استغفر الله
لە دیری مغان زننارم دەسکەوت
تەسبیحم ناوێ ئەی شێخی گومراه
کەی ڕێم ئەدەنێ بۆ بەزمی خەسرەو
پیاوماقوڵان و ئێشکچی دەرگاه
شوکور وا زاهد مەستە (مەستوورە)
وازمان لێ دێنێ ئیتر الا الله

٨

ئارەقی گۆناتە یا دانەی گولاب
یا لەسەر گوڵ ڕەونەقی شەونم بەتاب
لای بنا گوێتە ئەوە یا مانگی بەدر
لێوی ئاڵی تۆبە، یا لەعلی مذاب
چاوی مەستت تووشی سەرخۆشیم ئەکا
من ئەگینە نەمدەکرد مەیلی شەراب
چەند بەجۆش و خرۆشە نەورۆز و گوڵان
بادە و یار، قەتار، دەنگی ڕوباب
زیندەگی تا سەری دنیا چییە؟
یاری دڵدار و گوڕەی دەورەی شەباب
بێ هیوا و مردووی بەسەر زیندوو چییە؟
پیری و دووری و ئەوالی ناحساب
بولبول و گوڵ ڕۆیین و (مەستوورە) وا
دەرکی دڕک گرێ و نەوای بانگی غراب

٩

بە دوو چاوی مەی پەرستت کە دەکەویە تیرە باران
دەمێ چاوم ناترووکێ وەکو نەرگس بەباران

کە گەیشتمە بەندەیی تۆ ئەوە پادشایی منە
کە بکەومە داوی تۆوە شاهبازی شای تەواران
کە دەسم بەدامەنت گرت، بیبڕن، بەدەستەکەی تر
کەمەرت ئەگرمە باوەش وەکو خێرکەر و هەژاران
کە بەئێشە زامی جەرگم نامەوێ دەوای تەبیبان
چاری دەردی خۆم ئەزانم بەویسالی یارە باران
سەبەبێکی سەبری عاشق کە دەڵێن وەفایە وایە
لە گوڵی سروشتی مندا هەوەس و وەفا لە کاران
شەوی غەم کە دەچمە سەر جێ هەر ناوی تۆ دەخوێنم
وەکو ئایەتێکی (حفظە) بەشەو ئاهی ناڵەکاران
وەرە سەیری ناوی دڵ کە لەوێ شوێنی خۆت ببینە
(مەستوورە) پێت ئەخاتە سەری تاجی شەهریاران

١٠

ئاهی دڵی من هاودەمی ناڵەی نەیە ئەمشەو
باری خەفەتم قورسە عیلاجی مەیە ئەمشەو
توخوا بەسە لێم لادەن و کەس پێم نەڵێ مەگری
من شینی جەوانیم بەسەدای (هەی هەی)ە ئەمشەو
ئاگر ئەخەیە سنگم و جەرگم ئەسووتێنی
هاواری بریندار بەکزەی وەی وەیە ئەمشەو
خوسرەو کە لە رووی میهرەوە رێم باتێ بەشکو
(دارا)یە کە دەربانمە بەندەم کەیە ئەمشەو
میحرابی برۆی ئەو دەکەمە قبلەی حاجات
ئەنواری تەجەلای ئەوە پەی دەرپەیە ئەمشەو

***

## پیرەمێرد و شیعرێکی نازێ حەسەن

پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٤٧دا ئەم شیعرەی کردووە بەکوردی، لە ڕاستیدا کەم شیعر هەیە وەک ئەو شیعرەی (نازێ خانم) کە ئافرەت ئەوەندە بەڕاستگۆیی باسی خۆی بکات و ئەوەندەش شانازی بەجوانی خۆی بکات و ئەوەندەش شاعیرانە دایڕیشتبێ. پیرەمێرد لەوەرگێڕانەکەدا هەقی



خۆی داوەتێ و نەیهێشتووە بژاکێ!. هەروەها ئەم پێشەکییە کورتەی بۆ شیعرەکە نووسیوە.

«ئێمە فەلسەفەی عەشقمان نووسی، لە بەرامبەری عەشقا (نازی)ی حەسەنیش پێویستە. ئەمە ژنی (فەتح عەلی شا) بووە. ئەوەندەی جوان بووە ئەمەندەیش شاعیرەیەکی بەناز بووە. چەند شیعرێکی نازداری وتووە. لە زەمانی کوڕێنی و زەوقی شیعر و عەشقەوە لەبەرمە، زۆرم لاخۆشە، وا ئەمجارە کردم بەکوردی».

بەبۆنی ئەگریجەی عەنبەرم کە ئەیبا، با
ئەخاتە داوەوە هەر موویە ئاسکێکی سەحرا
بەڕەنگی (کل) ڕەش ئەبێ ڕۆژگاری ئەهلی جیهان
ئەگەر بەسوورمە برێژم دوو نەرگسی شەهلا
بە ئاوری نازەوە من ڕۆح ئەدەم بەمردووی عەشق
کە دەوری تێپەڕی پێ ناوێ بێتەوە عیسا
لە کۆڕی زکر و دوعا بچمە ناو کلێساوە
بەدینێ دێنمە سەر دینی خۆم هەموو تەرسا
هەوای ئەوەم لەسەرایە پەچەم لەڕوو لادەم
توخوا ئیتر بەسە، مەحروومی عاشقی شەیدا
ئەگەر بەڕاگوزەری بچمە بێستوون ئەوسا
ئەشێوێ سوورەتی شیرین و تۆزی (با) ئەیبا
بەناو کە کەبکی خەرامم[١] بەکردە شابازم
بەگیرە پەنجەی نازم لە جەرگی شاهەنشا

---

(١)کەبکی خەرام: کەوی بەلەنجەولار.

***

## پیرەمێرد و شیعرێکی سەیدی هەورامی[١]

پیرەمێرد دەستپێشکەرییەکی باشی کردووە، لە ناساندن و خستنە بەرچاوی شیعری شاعیرانی هەورامان و زەنگەنە. بەتایبەتی کە ناوچەکانی دوور لە هەورامان و گەرمیان لەو کاتەدا زۆر کەم ئاگاداری ئەم بەرهەمە بەرز و جوانانە بوون. لەم دیوانەدا ژمارەیەکی زۆری دەقی ئەو شیعرانە و وەرگێڕانەکانی پیرەمێردمان بڵاو کردەوە. ئەمەش شیعرێکی جوانی سەیدیی هەورامی کە پیرەمێردی نەمر بەقەڵەمی ڕەنگین و بەپێزی خۆی هێناویەتییە سەر شێوەی سلێمانی.

ئازیزی بێ مەیل، ئازیزی بێ مەیل
شۆخی بێ وەفا، ئازیزی بێ مەیل

عەشقت لە دڵما وا بووە جێگیر
هەرگیز دەرناچێ بەمەکر و تەزویر
تۆی مایەی خۆشی و کەیف و ژیانم
یادتە هاوڕازی نیوە شەوانم؟!
ئارامی گیان و سایەی حەیاتم
دووریت نیشانەی مەرگ و مەماتم
مەینەتی دووری تۆ هێندە سەختە
وام لە گیاندانا مردنم وەختە
هێندە زووخاوی دووری تۆم من خوارد
قیبلەم تۆ خۆش بی وا ڕۆحم سپارد
ئەوا من ئەڕۆم تۆ سەلامەت بی
خاوەنی عیشوە و بەژن و قامەت بی
بەدڵی پڕ سۆز بەچاوی نمناک
گیانە وا ئەچمە ئەلحەد سەرای خاک
ئەزانی خۆ من حەسرەتمەندی تۆم
سا لەپاش مەرگم وەرە سەر گڵکۆم
قەت خەیاڵ نەکەی شۆخی جەبین گوڵ
مەیلت سارد ناکا لەژێر خاکا دڵ
گوێ بگرە لە دەنگ سەنگی مەزارم
ئەڵێم ئەی ئازیز هێشتا داغدارم
هێشتا لە عەشقت ئەسووتێ جەستەم
لە داخی زوڵفت وەک ماران گەستەم
بەتیغی ئەبرۆت لەت لەتە جەرگم
ماندەی شەهید خوێندنە بەرگم
ئێستەیش بەتەمای چاوی مەستی تۆم
قەدەم ڕەنجەکە وەرە سەر گڵکۆم
با لە فرمێسکی دوو دیدەی دولبەر
لە خاکم نێرگس سەر بێنێتە دەر



هەر کەسێ کە بێت ئەوسا دیارە
قەبری (سەیدی)یە، کوژراوی یارە

...............................................................

(١) ژین ژمارە ٧٢٨ ساڵی ١٩٤٣

***

# فەرهەنگی پیرەمێرد

ئاڵک و پیرئاڵک: ئاڵک دێیەکە. پیرئاڵک: شەخسێکە دەکەوێتە پشتی چوارتاوە.
ئەستێرەی سیوەیل: گەلاوێژ.
ئۆخەی پشتێنەیە: بەفر گەیشتۆتە پشتێن، ناو قەدێ باریوە.
ئێل: تیرە، خێڵ، عەشیرەت.
ئەغیار: بێگانە.
ئاوێنەی ژێر و سەر: واتە کە تیشکی مانگ ئەیدا لە کانیەکە، بووبووە ئاوێنە، کانیەکە ئاوێنەی ژێرە و بووە وێنەی مانگی سەر، سەرەوە.
ئایندە: داهاتوو، پاشەڕۆژ، دوارۆژ.
ئەسکەندەرنامە: یەکێ بووە لەو کتێبانەی، کە لە چایخانەکانی سلێمانیدا حیکایەتخوان هەر شەوە بەشێکی لێ ئەخوێندەوە.
ئیسماعیل نامە: کتێبێک بوو جاران لە حوجرەدا دەخوێنرا و بەفارسی نووسرابوو. باسی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی دەکرد.
ئیبراهیم ئاغای خوبیلە: یەکێک بووە لە پیاوە ناسراوەکانی کاکەیی لە سلێمانی. زۆر دەستگیرۆیی هەژاران و داماوانی کردووە.
ئەربابی فکر: ڕۆشنبیر، هاوبیر.
ئاسوودە: بەختیار، شادمان.
ئۆردوو: سوپا، لەشکر.
ئاردی ناو دڕک: بڵاوبوونەوە، دەگوترێت: بوونە ئاردی ناو دڕک، پەرش و پەڕاگەندە بوون، هەریەک کەوتە شوێنێک.
ئەولیا: أولیاء، پیاوچاکان، پلەی بەرزی ئایینیان هەیە.
ئاڵیاوا: دێیەک بووە لە ناوچەی قەرەداغ.
ئاگری یارە: ئاگری نەورۆز کە لە گردی مامەیارەی سلێمانی دەکرایەوە.
ئەهرەمەن: هێزی شەڕ، بەرەو شەڕ لە ئایینی زەردەشتیدا، خوای شەڕ.
ئەمین زەکی بەگ: بڕوانە لاپەڕە (٣٣)ی ئەم دیوانە.
ئاوی سەر: ئاوێسەر، هاوینەهەوارێکی خۆشە لە سەرووی تەوێڵەوە.
ئەسانسۆر: مصعد.
ئەستانە: ئەستەمۆڵ، استانبول.
ئەحمەد ڕاسم: ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووسێکی تورک بووە. یەکێک بووە لە هاوڕێ خۆشەویستەکانی پیرەمێرد لە تورکیا لە ساڵانی ١٩٠٠-١٩٢٤.
ئاسمانی باڵا پەرواز: ئاسمانی باڵا و بڵند.
ئەبابەیلێ: عەبابەیلێ، دێیەکی خۆشە لە سەرووی هەڵەبجەوە. ئارامگای تایەر بەگی جاف و ئەحمەد موختار بەگی جافی لێیە، لە پێشدا ناوێکی تری هەبووە. لە کاتی هێرشی لەشکری ئیسلامدا بۆ ئەو ناوچانە، سەرکردەی سوپا (اباعبیدە) بەدەستی کوردەکان کوژراوە و هەر لەوێ نێژراوە. دوایی مەزارەکەی کراوە بەزیارەتگاه و گومەزی هەیە و چوارشەممۆان زیارەتی دەکرێ.
ئەحمەد بەگ: ئەحمەد موختار بەگی جاف، شاعیر و نیشتمانپەروەر.
ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ: چەند جارێک متصرفی هەولێر و سلێمانی بووە پیاوێکی خزمەتگوزار و کوردێکی دڵسۆز بووە. هاوڕێی نزیکی پیرەمێرد بووە.



ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ: ئەحمەد حەمدی بەگی صاحبقران، حەمدی شاعیر و دڵسۆزی نیشتمان نەتەوەکەی. هاوڕێی خۆشەویستی پیرەمێرد. بڕوانە لاپەڕە ( ٢٩ )ی ئەم دیوانە.
ئیدریسی بتلیسی: مەلا ئیدریس.
ئەردەشێری بابەکان: ئاوێستای گۆڕیوەتە سەر زمانی پەهلەوی و ناوی ناوە (زەند)، بژاریان کردووە و ناویان ناوە (پازەند).
ئاگری مەرگ: خۆشەویستی دایک و باوک بۆ منداڵەکانیان.
ئاهووتەرز: شێوە ئاسک، شێوە مامز، وەک ئاسک.
ئەم دیارەم لێ دیارە: ئەم جێگەیەم لێ دیارە.
ئەستێ و بەرد: بەرد و ئەستێ، پێش دۆزینەوەی بارووت و غاز و نەوت و بەنزین، لەو سەردەمە کۆنانەدا مرۆڤ بەهۆی لەیەکدانی بەرد و ئەستێوە: پڕیشکی ئاگری بۆ پەیدا ئەبوو، بەو پڕیشکە ئاگری ئەکردەوە.
ئێستری تۆڕ: ئێستری چەمووش.
ئاتەش: ئاگر.
ئارەزووی نا بەدید: ئارەزووی نادیار، نەبینراو، پەنهان.
ئال: لە سەردەمی کۆنی کوردەواریدا، بەهۆی دواکەوتوویی و نەبوونی زانستی پزیشکییەوە کە منداڵی ساوا دەمرد دەیانگوت «ئال و شەوە گرتوویەتی».
ئاشە بەتەنوورە: یارییەکی کۆنی کوردەواری بوو.
ئاش وەستا: ئەو کەسەیە کە بیرازی بەرداشی ئاش ئەکات.
ئافەرۆز: حەرام، تحریم.
ئەگەرێ بەخەو: دەبێت بەخەو.
ئورام شالوم: جوولەکەیەکی زۆرزان بوو لە سلێمانی، دەمڕاستی جووەکان بوو.
ئافەریدەی کردووە: دروستی کردووە.
ئاشپەزخانە: چێشتخانە.
ئێلجاڕی: جاڕدانی ئێڵ بۆ مەبەستی شەڕ یاخود ئاشتی.
ئاکار: نزیک.
ئەڕەقسێ: سەما ئەکا.
ئەسرینی نەسرین: فرمێسکی گوڵە نەسرین.
ئاهووی خوتەن: جۆرە ئاسکێکە، خووتەن: ناوچەیەکە.
ئێزەد: خوا، یەزدان، ئێزدان.
ئازەردەکار: منالٚ کردار، کرداری منالانە.
ئازمایی: ئاسایی.
ئاتەشین: ئاگراوی.
ئەسپی پڕتاو: ئەسپی خێز، ئەسپی گورج و خێرا.
ئاگرێکیان چاوکرد: ئاگرێکیان بینی.
ئامانی نەدا: ماوەی نەدا، مۆڵەتی نەدا.

## (ب)

بەنەفش: ڕەنگی وەنەوشەیی، بنەفش.
بەرانان: چیایەکە دەکەوێتە ڕۆژئاوای سلێمانییەوە.

بەیبوون: جۆرە گوڵێکە، بۆنێکی خۆشی هەیە.
بەشەخەت: خەتی ورد.
ببیەم: ببیستم.
بەکێش: بەهێز.
بەحری سیا: دەریای ڕەش، بحر الأسود.
بارخانەی ڕۆژ: کە ڕۆژ هەڵدێت بەخۆی و گزنگیەوە، باروبارخانەی دنیا ڕۆشن دەکاتەوە.
بەسەڵەف: بەکۆمەڵ.
بای دایەوە: گەڕایەوە.
بەیاز: دیوان کە نووسرایەوە.
باڵپێچان: لە عەربەتەوە کە دەچی بۆ (پووشێن) ئەو دۆڵە پێی دەڵێن دۆڵی باڵپێچان.
بەردی مووچەی مەڵۆ: ئەو بەردەی لەسەر مووچەی مەڵۆ دادەنرێت هەتا با نەیبات.
بنەچە: پشت، باپیران، ڕیشە، ڕەچەڵەک.
بازووبەند: دوعایەک بووە لە چەرم گیراوە و کراوەتە قۆڵ.
بەدەمەوە لێی کەوتم: لەپەوڕوو، دەمەوڕوو لێی کەوتم.
بەتووبی کۆن: بەیاسای کۆن.
بە شکۆ: بەڕێز و دەسەڵات.
باڵا دەست: دەسەڵاتدار، دەستڕۆیشتوو.
بەم پێ و دانە: بەم شێوەیە.
بای وەشت: ئەو بایەی کە بارانی بەدەمەوە بێت.
بەور: بەفر.
بەدنمەک: نمەک بەحەرام، بێ وەفا.
بۆرەپیاو: ڕەشوڕووت.
بەیتاڵخانە: ئەو شوێنەی ئاژەڵی نەخۆشی لێ چارەسەر دەکرێت (بیطرية).
بێشە: جێگای چڕ و لانەی شێر.
بتوینم: بتبینم.
بز: بزن.
بەبڕشتە: باشی ئەبڕێ.
بەردەپشکە: بەردێکە بۆ یاری بەکاردێت دیوێکی تەڕ ئەکرێ و دیوێکی وشک. هەڵئەدرێت، ئەگەر یەکێ لەو دوو کەسە یا دوو تیپە ئەو دیوەیان بەرکەوت کە خۆیان ویستوویانە ئەوە سەرەتای یاری کردن بۆ ئەوانە.
بڕنگ: مقەستی مەڕو ماڵات بڕینەوە.
بەعەیبی ئەگری: بەعەیبی ئەزانی.
بۆرەسوار: دوو مەبەستی هەیە. یەکێکیان بەکەسێ دەوترێت کە سواری ئەسپی بۆر دەبێت، ئەویتریان بەکەسێکی هیچ و پووچ و بێ وەفا دەوترێت.
بابی بابی: یارییەکی مناڵانە بوو. یارییەکی کۆنی کوردەواری بوو.
بسم الله: مەبەست (سەید عەلی بسم الله)یە کە بە بسم الله تووڕە دەبوو، کرا بەقۆڵچی غابات.
بێچو: جۆرە پارەیەکی کۆن بوو.
بەگچی: حەسحەس، پاسەوانی شەو.



بێ پشت: بێ کەس.
باد: با، هەوا.
بێزراو: وەڕس، دڵ تۆراو.
بەیدەستی کرد: گرتی.
بۆرەقنە: بۆرەکەڵە.
بێ حیجاب: بێ پەچە، سفوور.
بەرگوزیدە: بەرخوردار.
بەرگوزار: بەرهەم.
بێزار: بێدەم، وەڕس.
بورجی پیرێژن: یەکێکە لە بورجەکانی سێ شەش.
بەرزەکی بانان: بەو کەسانە دەگوترێت کە لە تەنگانەدا زووخۆیان دەرباز ئەکەن.
بەگیر: باش و تیژ.
بەسەرپشتیا تەرات ئەکرێ: تەراتێن، ڕاکردن ئەکرێ.
بەپواز لەنگەری ئەداشت: پوازی تێئەخست.
بەلاجۆ: بەلا هێنەر.
بەهمەنیی: سوور.
بابۆڵە: پاروو.
بڕستی بڕا: پەکی کەوت.
بەخت ڕەف: بێ بەخت.
بەدایەخیەوە هاتووە: دەرهەقی هاتووە.
بەسەر منەوە چوو: بەهۆی هاتنە دنیای منەوە مرد.

## (پ)

پەناگاه: شوێنی خۆشاردنەوە.
پەنهان: شارراوە.
پاشەبەرە: دوا منداڵی خێزان.
پشتەسەر: جۆرە خشڵێک بووە لەزیو دروست کراوە لە پشتەوە دراوە لە فێست و شەدەی ئافرەت.
پابەند: بەستراو.
پێ خاوس: پێ پەتی.
پەیکان: نووکی نێزە.
پێچە کلو: بارینی بەفر بە باوە.
پێتا: کاڵە و پێڵاو.
پزیسک: پڕیشک.
پایە: پلە، منصب.
پۆپنە تەورزینی: پۆپنەی کەڵەشێر کە وەک تەورزین بێت.
پەڵە: لەکە، بارانی پەڵە، پەڵەی داوە.
پەڵپ: بیانوو.
پرنگە: پڕیشکی ئاو.
پڵنگی گوستاخ: پڵنگی چالاک و گورج.

پەرستش: پەرستن.
پرۆزە: پەرۆش.
پەرواز: فڕین، ڕفین، باڵگرتن.
پەروازی شاعیرانەی کردووە: بۆتە شاعیرێکی باش، کۆچێکی شاعیرانەی کردووە.
پیرە زوبەیر: ناوی پیاوچاکێکە لە ناوچەی شارباژێڕ.
پووشووی ناوداران: پووشوو کە وشکە و زۆر زوو گڕ دەگرێت.
پێچاڵ: جێگای پێی جۆلا.
پارە: کەرت، لەت، پارە پارە بوو، لەت لەت بووە، دراو، خەرجی.
پەڵ: بەردی گەورە کە بهاوێژرێ.
پێچی مێزەر: بۆ هیچ و پووچی دنیا و زوو تێپەڕینی تەمەن دەگوترێت.
پاشەرۆک: ئەو کاوکۆتەڵەی لە ئاخوڕدا ئەمێنێتەوە ئاژەڵ نایخوا پێی دەڵێن پاشەرۆک.
پەری سەرقاف: پەری سەر کێوی قاف. کچە جوانەکانی قەفقاسیا.
پووزەوانەی خانم خاس: گۆڕەوی پوزەوانە بوو خانمان بەتایبەت دروستیان ئەکرد بۆ ئەو کەسانەی کە خۆشیان بویستایە.
پیرۆزانە: موبارەک بایی.
پێکورە: پێ خەسوو، بەربووک.
پێشانی زیو، سەرپەرچەمی زیو.
پرتەو: خێرا.
پەی جۆری ڕاز: ئەگەڕێ بەدوای ڕاز و نیازا.
پاسوخ: وەڵام.
پەتیارە: بەرەڵڵا.
پیشەمان چلۆچێو بێ: چڵ و چێو کۆ بکەینەوە.
پڵنگی ئەنگێونراو: پڵنگی بریندار کراو، زامدار کراو.

## (ت)

تیف تیفە: بەشەق، ساف و لووس
تەگەوسابرێن: تەکە، دەورەی شەبەقی بزن، سابرێن نێرەی بزنە کە ئەپەڕێنرێ.
تا وا نەبێ: هەتا والا نەبێ.
تار: تاریک، ناوی ئامێرێکی مۆسیقایە.
تەلا: ئاڵتوون، زێڕ.
تابین: پردێکە لەڕێی دوکان پێش ئەوەی بگەیتە سورداش.
تووەقوت: ناوی دێیەکە لە شارەزوور، شوێنێکە.
تەرزی تەرزە: بەشێوەی تەرزە.
تاوێر: بەردی گەورەی لاپاڵی چیا، کە دەخرێنە خوارەوە.
تارمی لاجوەردی: ئاسمانی شینی بێ گەرد.
تەتەر: پەیامبەر و پەیام هێنەر (مراسل، مبعوث، رسول).
تاب و توان: گوڕ و هێز.
تەریک: کەنار، گۆشەگیر، دوور و پەنا.
تاڵ و پۆ: بەو تاڵە بەنانە دەوترێت کە لە تەونا دێنە خوارەوە، پۆ: ئەو تاڵە دەزووانەیە کە لە تاڵە بەنەکە



هەڵدەکێشرێت.
تەدارەک: جیازی ئامادەکراو.
تەڕەن تەوەن: دێیەکە، زیارەتگای شێخێکی لێیە.
تەگەرە: قۆرت، گیروگرفت.
تەیمان: بەو هەژگانە دەوترێ کە کۆزی کارگەل و بەرخ گەلی لێ دروست دەکرێ.
تەندوورە زەنان: بەگرمە گرم وناڵە ناڵ.
تەونمان لێ مەگرنە دار: بەند و باومان لێ دامەهێنن، پەڵپمان لێ مەگرن.
تۆکمە: پتەو، قایم و باش.
تیر ئەنداز: تیرهاوێژ.
تەی کرد: بڕی، پیایدا تێپەڕی، (طی) کرد.
تەڵەڕیحانە: چلە ڕیحانە.
تەم و دوو: تەم و دووکەڵ، تەم و مژ.
تابلۆ: وێنە.
توانکار: بەتوانا.
تێوەی بژەنێ: لێی بخوڕێ.
تەلەسمێکی نیهانە: سیحرێکی شارراوەیە.
تاڵەوەکەرە و خۆشەوەکەرە: تاڵ بەخش و خۆش بەخش.
ترێمان ئەکرد بەرەنگاڵ: ترێمان ئەکرد بەدۆشاو.
تەراندی: پەڕەوازەی کرد.
توڕک: تووتڕک، دڕکەزی.
تەپڵی بازگەشت: تەپڵی سەرکەوتن.

## (ج)

جرپ و جۆپ: هەڵەشەیی.
جیهان گەڕیدە: دنیا دیو، خاوەن تاقی کردنەوەی ژیان.
جووت: جووت کردن، زەوی کێلان، دووان.
جەور: زۆرداری، زوڵم.
جریوەی لەرزانە: بریسکەی ئەو پوولەکە زیوانەی کە ئافرەت لەسەر و پێچی خۆی ئەدات.
جەوان مەردی: پیاوەتی، ئازایی.
جۆشی جوانی: تافی لاوی.
جوابی دا: ڕازی نەبوو.
جادوو: سیحر.
جۆزەردان: ناوی یەکێ لە مانگە کوردییەکانە.
جووت گرتن: ڕابواردن.
جەخت: پەلە.
جامبازخانەی ئەسپ: شوێنی کڕین و فرۆشتنی ئەسپ
جوانوو: بەچکەی ماین.
جەوت: بەری دار مازوو.
جۆلانگاه: شوێنی ڕاکەڕاکەی ئاسک و کەڵە کێوی.

## (چ)

چەشمەسار: سەرچاوە.
چەشک: بۆ چێژ لێ وەرگرتنی کاتیی، بۆ چێشکە، دەگمەن.
چۆنت سروشت دام: چۆنت دروست کردم.
چەمەرەداران: تازیەداران، پرسەداران.
چرووک: ڕەزیل، دەست تەنگ.
چەشم ئەنداز: دیمەن، بەرجەوەند.
چەشم: چاو.
چروستان: ناوی دێیەکە.
چاوی ئەرشتین: کلی ئەدا لە چاومان.
چەکەوکەوان: چەک، هەلاج بەکاری هێناوە بۆ شی کردنەوەی لۆکە. کەوان: بەو ژێیە وتراوە کە هەللاج لەسەر لۆکەکە دایناوە و بەچەکەکە لێی ئەدا.
چاوشارکێ: یاریەکی منداڵانە.
چایەکێ لێ بکەی: چایەک لێ بنێی، چایەک دەم بکەی.
چقڵ: درک.
چاڵاخ: ناوی دێیەکە لەسەر ڕێی دوکان و سلێمانی.
چەمی مامە سنجان: چەمێکە لە شارباژێر.
چاوەزار: جۆرە نوشتە و دوعایەکە بۆ بەچاوەوە نەبوون.
چوار مێخەی کێشا: چوار پەلی بەست بەمێخەوە.
چاتووڵ: دارێکی گەورەیە لە ناوەڕاستی خێوەتدا داچەقێنراوە.
چارشێو: پەچە، ڕووبەند.
چێرک: باڵندەیەکە وەک قەلەموون وایە، کێوییە.
چەکمەڕەق: بەپیاوانی عوسمانیان وتووە کەچەکمەی ڕەقەوەبوویان لەپێدا بووە.

## (ح)

حوشتر و قەزازی: دوو شتی پێچەوانە و نارێک. ئەو دوانەیان نەوتووە.
حەوتەوانە: حەوت ئەستێرەن لە ئاسمان.
حەوتەی چوو: منداڵ کە لە هەفتە تێئەپەڕێ ئەڵێن حەوتەی چوو.
حاجی مامەند: دێیەکە دەکەوێتە ژووروویی بەرزنجەوە.
حەبەزبوز: ڕۆژنامەیەکی عەرەبی پڕ لە گاڵتەوگەپ بوو ساڵی **١٩٣٥** لەلایەن (نوری ثابت)ەوە دەرچووە.

## (خ)

خەم ئالوودە: خەمبار، بووە بەهاودەمی خەم.
خوومی خەم: ڕەنگی شینی خومخانە کە نیشانەی شوومی و نەهامەتی بوو.
خەپلە: کولێرەی گاڵ.
خورج: دوو (تا)ییەک بوو، وەک بەڕە لەبەن دروست دەکرا.
خار: درک، زەلیل.
خەیاڵ کار: دیمەنێک بەخەیاڵ دروست بکرێت.



خەرامان خەرامان: ڕۆیشتنێکی خانمانە و هێدی هێدی.
خەندان: ناوی ئافرەتێک بووە، دەم بەپێکەنین. ڕووخۆش.
خاشاک: وردە درک.
خۆش ئامەدی: بەخێرهاتنەوە، خۆش هاتن.
خودادا: خودا بەخش.
خۆ خۆر: میللەتێک کە خۆیان ببڕیننەوە و دوژمنی گەورەی خۆیان بن.
خوا ڕەوای بینی: خواکردی.
خەشم:: قین.
خودگیر: بیچەسپێنێ، (ظبط)ی بکا.
خانەخوێ: خاوەن ماڵ
خولیا: هەوەس، کەڵکەڵە. ئارەزوو
خانەویران: ماڵ و یران
خەرەلامۆز: چێشت دروستکەر بوو لە چێشتخانەیەکی سلێمانی.
خاکیی: سادە و قەلەندەر.
خەمشەی برێ: دوای برێ.
خەرامە: خەرمانەی مانگە شەو.
خۆرشتی گیان: پێخۆری گیان.
خەتێکی گوندە و خۆشخوێن: خەتێکی خۆش و جوان.
خودای بانی سەر: خوای سەرەوە. خوای گەورە.
خانەبگیر: ئاشبگیر، کە لە ماڵەوە ئەدەن بەسەر خەڵکدا.
خوبان: جوانان.
خانەزا: ماڵی.
خەلەساین: ڕزگارمان بوو.
خوا ئێمەی ڕەنگ ڕەنگ سروشت پێداوە: خوا ئێمەی جۆراوجۆر دروست کردووە.
خەنەبەندان: کاتێ کچ دەبرێ بەبووکی دەست و پێی لە خەنە دەگیرێ.

## (د)

دڵکەش: دڵگیر، دڵنشین.
درەخشان: ڕووناک.
دووباد: منداڵی خرپن.
دەهقانی: ژیانی دێهاتی.
دڵنەواز: حەزی دڵ.
داودی: دەنگی زۆر خۆش.
دەهکەدە: دێی بچووک.
دەستەی مەردم گریز: گۆشەگیرەکان.
داش دەلان: سەرچاوەیەکە لە ئەستەمولّ، سەیرانگاهێکی خۆشە.
دیباجە: پەراوێز.
دڵبەستە: ئەو کەسەی کە پەیمانی دڵداری داوە.
دێبەر: بەو باخانە دەڵێن کە دەکەونە بەردەمی دێ.

دەشتی کەوشەک: ئەو دەشتانەن کە کەوشەکی تیا ئەکرێت.
دڵبەری: دڵداری.
دانش وەران: زانایان.
دورجەنەق: دەنکی بارانی نیسان.
دانە: تاک.
دەمهەراش: دەمەوەر، دەمشڕ.
دۆمەژن: ژنی دۆم.
دەمەسوێ: کولکردن، کولی ئەکەن و لەکار ئەکەوێ، بۆ تەشوێ بەکاردێت.
دەرخۆنە: وەکو سەری مەنجەڵی فافۆنی ئێستا وابوو لە قوڕ دروست ئەکرا و سوور ئەکرایەوە، ئەخرایە سەر مەنجەڵ لەکاتی چێشت لێناندا. وتراوە: دیزە بەدەرخۆنەی کە: واتا سەری بنێنەرە و باسی مەکە با کۆتا بێ.
دونبەی چەور: دووگی چەور.
دگلدانە: ئەم واتایە بۆ بەشەڕدانی دوو کەڵەشێر ئەوترا.
دیاردی: کاتێ ڕاوکەر بەدوای کەروێشکا دەگەڕێت، ئەگەر کەروێشکەکە ببینێ هاوار دەکات: دیاردی خولامی سەری ڕاوکەران بم.
داپەڕی: ڕاپەڕی.
دوو زەلەی لووت: بڕبڕاگەی لووت.
دۆکولێو: چێشتێکی، خواردنێکی کۆنی ناو کوردەوارییە.
دانگێکی ماوە: کەمێک ماوە.
دەشتی زەڵێ: کە ئەچی بۆ بەرزنجە، لە (وەرستە) سەرکەوتیت دەشتێکی پان و بەرین ئەبینیت ئەم دەشتە پێی دەوترێت دەشتی زەڵێ. زوراتە سوورەی زۆر ناسکی لێ دەکرێت. ئێستاش باخی میوەی زۆرە.
دەستگیریی: فریاد ڕەسی، یارمەتی دان.
دڵم لە خۆی نامێنێ: خۆم بەمەغدوور نازانم.
دڵی ڕێش بێ: دڵی بریندار بێ.
دەمی بۆس و کەناری جۆیبارە: کاتی ماچ و مووچی گوێ رووبارە.
دەروازە: دەرگا، کراوەتەوە.
دەستەپاچە: بێ دەسەڵات.
دێوانە وار: دێوانە ئاسا.

## (ڕ)

ڕۆ: ڕۆژ.
ڕیبۆلێکی بێگانە: دەستوورێکی بێگانە.
ڕەنگە وا بزانن کولەنانیم: بەو کەسە دەگوترا کە نەبوایە بەزاوا ئەچوون کولەنانیان بۆ بانگ ئەکرد، ئەم کارێکی ئەکرد کە ببێ بەزاوا.
ڕایە: حەدی ئەوەیە، ڕایەی ناکەوێ.
ڕموزن: شتێکی ئەفسانەییە وەک ئال و شەوە وایە.
ڕۆمەڵ غەزا: شەڕی زۆر خوێناوی.
ڕەخشان: بۆنی خۆش کرد.



ڕشێنەی فرمێسک: نم نمی فرمێسک.
ڕشتەی بەخت: داڕشتنی ژیان.
ڕۆژی قڕان: ڕۆژی قڕ تێخستن.
ڕامشگری: لاروڵەنجە.
ڕێ بڕان: کاتێ بەفر ڕێ دەباتە بەست.
ڕۆحێکی سەمەندەری: گیانێکی ئەفسانەیی: سەمەندەر: گیانلەبەرێکی ئەفسانەییە.
ڕەهبەر: ڕێبەر، ڕابەر، پێشەنگ.
ڕێباز: ڕێگا.
ڕۆمی: تورکەکان.
ڕەنجشگاه: ئەو شوێنانەی ڕەنجی تیا دەدرێ یاخود کاری لێ ئەکرێ وەک کارگە و ناو دوکان و کێڵگە و... هتد.
ڕۆح پەرواز: گیانی دەرچوو.
ڕژد: ڕەزیل.
ڕەش هەر ڕەش: پیشەی کۆنی جافییە.

## (ز)

زاخیر: بەشوێنێک دەگوترێت کە لە سەرەوە زیخی گەورە گەورەی هاتبێتە خوارەوە. کە دێتە خوارەوە زیخەکان لەبەر پێدا هاڕە دەکەن.
زەرئەفشان: گزنگی بەیانیان کە وەک ئاڵتوون لووتکەی چیاکان زەرد ئەکات.
زەردیاوا: لەبنەڕەتدا زەردین ئاوا بووە. واتا زەردەشتییەکان ئاوەدانیان کردۆتەوە. دوایی لە سەردەمی تورکدا ناوەکەیان کرد بە(قەرەداغ).
زەمهەریر شینی چلەی کرد: خاتوو زەمهەریر خوشکی چلەی زستانە دوای ئەوەی کە چلەی برای نامێنێ ئەم بە بارانی خوڕڕەم شینی بۆ دەکات.
زەمزەمە: هەراوهۆریا، ڕازاندنەوە.
زربافت: لەزێڕ دروست کراو
زمرووت: جۆرە بەردێکی بەنرخە
زەنگین: دەوڵەمەند
زادەی سروشتی ئێزدی: خودایی
زیندە بەچاڵ: بەزیندوێتی لە چاڵ نان. خستنە گۆڕەوە بەزیندوویێتی.
زەبوون: کەساس، ژێردەستە.
زووڕەزووڕ ئەگریا: بەکوڵ ئەگریا.
زەورا: باخچەی (زوراء) باخێکی گەورە و بەناوبانگە لە بەغدا.
زۆرخانە: شوێنی یاری و پاڵەوانبازی و زۆرانبازی.
زیان کاریان کردبوو: زیانیان لێدابوو.
زمانی چۆتە کلیلە: هیچی بۆ ناوترێ.
زەروو: جۆرە کرمێکە کە خوێنی پێست ئەمژێ.

## (س)

سایە: سێبەر.

سەرفراز: سەربەرز.
سەر ئامەرد: لە ژوور هەمووانەوە.
سوورمەی تور: کل، سوورمەی طور، کلی چیای طور.
سیاپۆش: ڕەشپۆش.
سیرەی سەماوەر: دەنگی کوڵانی ئاو لە سەماوەردا.
سەرئازاد: سەرئافراز.
سەرحەد: سنوور.
سەگرمە: بەشێکە لە ڕیزە چیای قوپی قەرەداغ.
سفیدە: سپیدە.
سەڵا: خوێندنەوەی شیعری ئایینی لەبەرەبەیاندا.
سەهەندە: بەکانیەک دەوترێ کە دەوری سەوزایی بێ و ئاوێکی ساردی ببێ و درەخت سێبەری لەسەر کردبێ.
سەر ئاورد: نەریت، کەلەپوور.
سەبک: دارشتن.
سەحەرخێز: بەیانی زوو لە خەو هەڵسان.
سەنگ پۆش: خرایە ژێر بەردەوە.
سەرەهەودایەک: سەری تاڵە دەزوو.
سەرئەنێتەوە: دەنوێ، دەمرێ.
سەقا: سەرکاری ئاو.
سادەپەرست: ئاسایی دەژیا.
سەنگین: قورس.
سەروسەنەمە: پێ و قەدەم.
سەرەنوێک: جێگایەکی پشتگوێ خراو کە خۆڵ و زبڵی تێبکرێ.
سپڵی لاورگ: شتی بێ کەڵک.
سەگ مەرگ: مردنێکی وەک سەگ. بەئاسانی ڕۆح نەدا بەدەستەوە.
سەرەنگرێ: بەتەوقی سەرا کەوتن.
سەودا زەدە: تووشی خولیایەک بووە.
سەرفرو: سەردانەواندن.
سەرڕێز: پڕ، لێوان لێو، لەبرێز.
سەوڵی خەرامان: شۆخ و شەنگ.
ستەم کێشی خەم: بەرگەگری خەم.
سەنگەسار: بەردە باران.
سافیلکە: ساویلکە.
سفتەی جەمال: شەیدای جوانی.
سازندە: چەنەباز.
سەردەفتەری شوعەرا: کەڵەشاعیر، شاعیرێکی بەرز.
سەویە: تای سەبەتەی ترێ.
سۆنە: باڵندەیەکە لە مراوی بچووکترە.
ستوون: کۆڵەکە، دیرەک.



سەبوون: کزەی با.
سەحرا نەوەرد: سەحراگەڕ، ڕەوەند.
ساڵانە ساڵانە: وردە وردە.
سەرنویشت: چارەنووس.
ساتمە ئەکا: نووچ ئەدا.
سەیوسێنان: دێیەکە لە قەرەداغ.
سوورمەڕێژ: بەکل ڕێژراوە.
ساز: ئالەتێکی مۆسیقایە
سوورکێو: ڕیزە چیایەکە لەسەر سنوور، ئەکەوێتە پشت (بارێ)ی گەورە و بارێی بچووکەوە. دیوی ئەو دیوە لە کوردستانی ئێران.
سجووق: دۆشاوی خەست تاڵە دەزووی تێ هەڵئەکێشرا و گوێز و بادەم تێکەڵ بەدۆشاوە خەستەکە دەکرا.
سەرپاچ: سەرتاش

## (ش)

شاڵ: جۆرە قوماشێکی دەستکردە تاڵەکانی لە مەرەز دەڕێسرێ.
شاتەرە: جۆرە گیایەکە، ئاوەکەی ئەگرن و بۆ بیرۆ باشە.
شارچی: ئەوانەی لەدێوە دێن بۆ شار
شایی بێ شالیار نابێ: کار بێ سەرپەرشت نابێ
شیوی زێرینۆک: شیوێک بووە لە سلێمانی
شەوارە: دانیشتن بەشەو بەدیار مناڵەوە
شەوچەرە: ئەو خواردنانەی بەشەو بۆ میوان دادەنرێن.
شاناخسێ: دێیەکە دەکەوێتە شانی مەروێ
شیت: کوڕی ئادەمە
شار گڕ ئەدا: کۆتایی یاری چاوشارکێیە کە شار گڕ ئەدرێ
شەرمندە: شەرمەزار
شنروێ: شاخێکە لە سەرووی هەڵەبجەوە. دێی عەبابەیلێ کەوتۆتە دامێنی
شیری جەوهەردار: شمشێری تیژ
وشترمورغ: نەعامە.
شەرا ئەیبا: گرە ئەیبا.
شەیپوور: مۆسیقای سوپاهییە، بۆ ئامادەبوون بۆ شەڕ.
شەبەیخوون: لە شەوا هەڵمەت بردن بۆ سەر دوژمن.
شینی خاتوو زەمهەریر: بارانی خوڕی دوای چلە.
شاهی لەولاک: پێغەمبەرە، محەممەد (دروودی خوای لێ بێت).
شیعری سەمەن بۆ: شیعرێکی بۆنخۆش وەک بۆنی سەمەن.
شای تەقیانوەس: پاشایەکی زۆردار بووە.
شێری شەرزە: شێری زۆر دڕ و چابووک.
شنوایی: بیستن.

## (ف)

فەلەک لەگەڵما سەرگرانی ئەکا: فەلەک لەگەڵما خراپە دەکات.
فریشک: ئاڵوو.
فەرەنجی: جۆرە بەرگێکی دەستکردە لە کورکی بەرخ دروست کراوە، وەک پاڵتۆ لەبەر دەکرێت. ئاو دانادا، هاوینانیش شوان و سەپان لەبەریان دەکرد هەتا گەرمایان نەبێ.
فابریقە: کارگە.
فامیلیا: خێزان، بنەچە، بنەماڵە.
فەرزەند: منداڵ، کوڕ و کچ.
فەریادڕەس: کەسێ کە فریای تەنگانە بکەوێ.
فەڕ: بەرەکەت.
فەرمایشت: ئامۆژگاری.
فەئل: ماڵ، بەخت گرتنەوە.
فەهمیدە: تێگەیشتوو، فەمیدە.
فەریک: تازەپێگەییوو، نەگەیوو.

## (ق)

قڕگە: دێیەکە لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانی، لە دامێنی چیای گۆیژەدا. هەموو ئاوی وێڵەدەر بەناو دێی قڕگەدا بەخوڕ دێت. زۆر جار لافاو زیانیان پێ دەگەیەنێت، وشەی قڕگە لە (خووڕگە)وە هاتووە.
قەتار: جۆرە مەقامێکی کوردییە، بەڕێز، یەک لەدوای یەک.
قەلەندەر: ڕەند، کەسێک کە دەربەست خۆشی دنیا نەبێت.
قۆپی: دوو ڕیزە شاخە لە دەربەند باسەڕەوە دەست پێدەکات هەتا شانی دەربەندیخان و هۆمەر قەڵا، لەمیانەی ئەم دوو ڕیزە شاخەدا دۆڵێکی زۆر چڕ و پڕ لە دارستان هەیە. سەیرانگای زۆری لێیە.
قار: قەهر، قین.
قرپ و جرپ: هەڵبەز و دابەز.
قەوقاز: چیای قەفقاس، قاف.
قەر و گوڵە زەرد: بەیتێکی کۆنی دڵداری و فۆلکلۆری کوردییە.
قەڵای توورەکە ڕێژ: ئەو قەڵایانەی کە بەتوورەکە داڕێژراون.
قەرەقاج: جۆرە دارێکە، بەتایبەتی قەفەزی کەوی لێ دروست دەکرێت.
قوماندە: سەرکردە.
قەڵەمڕەو: ناوچەی حوکمداری.
قانکل: ئەو کلافە دەزووە ئالۆسکاوانەی لە ئالۆسکان ڕزگاریان بووە.
قانگ: دووکەڵی کرد بەگڕیا، قانگی دا.
قائانی: شاعیرێکی بەناوبانگی ئێرانە.
قۆچکە: وەک کڵاو وابوو ئەکرا بەسەری منداڵدا و لەژێر چەناگەیدا بەتەڵێ دەزوو قایم ئەکرا. تاڵە دەزووەکەش گرێ قوڵفەی لێ ئەدرا.
قەڕاڵ: سەرکردە.
قاوەڵتی: نان خواردن.
قلیان: قەنگە.





بەرقلیان: خواردنێکی سووک، لە پێش قلیان کێشاندا.
قابینە: ئەنجومەنی وەزیران، کابینە.
قەزەرۆس: سەرتاشێکی ئەرمەنی بووە لە سلێمانی.
قەلەمرداریێ: یارییەکی کۆنی کوردەواری بووە.
قەمتەرکراو: دەمبەستراو.
قۆڕەی لێ کەوت: قۆڕە نەخۆشییەکە تووشی گا دەبێت.
قەباڵە شەجەرە.

## (ک)

کەمەربەستە: هۆگر.
کوچکی هەواران: کوچک ئەو سێ بەردە بوو کە خراوەتە ژێر مەنجەڵ بە دووکەڵ ڕەش دەبوو.
شوفتەی هەواران: دێوانەی هەواران.
کەچ: پێچەوانە، ئاوەژوو.
کشەمرە: بەو کەسانە ئەڵێن کە دڵیان زۆر ناسکە.
کەرەمکان: بەخشندە.
کاسەلێس: سیخوڕ، چڵکاوخۆر.
کۆ بەکۆ: شاخ بەشاخ.
کۆی یار: مەنزڵگای یار.
کەپەنگ: جۆرە فەرەنجییەکە ئاودامان شوان لەبەری ئەکات بۆ ئەمەی باران تەڕی نەکات.
کەڵەمێرد: پیاوی بەتوانا و بەسام.
کەردڕ: جۆرە گیایەکە.
کەمەی سەربێشکە: تاقی سەر بێشکە.
کەشاکەش: کێشمەکێش.
کناچەی پۆڕ: دەنگی خوێندنی پۆڕ.
کاکە حەمەیی: ڕیایی.
کڵاو کوڕە: جۆرە باڵندەیەکە، بچووکە وەک کۆتر، لەپەڕ کڵاوێک بەسەریەوەیەتی.
کەشکەک: بەگەنمە کوتاو لێدەنرێت، گۆشت و قاورمەی تێکەڵ دەکرێت، بەجۆرێک دەکوڵێت هەتا ناسک دەبێتەوە.
کاڵای شەمامەبەند: جۆرە کەوشێک ژێرەکەی پێستە بوو لە باتی دەزوو بەئاوریشم ئەچنراو نەخش و نیگاری زۆری تیا بوو.
کەمۆڵە: لە دار دروست دەکرا و ئاوی تیا دەخورایەوە.
کانی تەخت: یەکێکە لە ئاوکانییە خۆشەکانی قۆپی قەرەداغ.
کاخ و کاشان: کۆشک و کۆلیت. لەبەرخۆشی و جوانی ناونراوە کاخ.
کانی شەکراو: کانییەکە لە پشت پردەکەی هۆمەرە کوێرەوەیە.
کاڵەکی قەرەنی: قەرەنی، دێیەک بوو بەو کاڵەکە بەناوبانگ بوو.
کار ئەزموودە: کارامە.
کفت و کۆ: ئێش و ئازار.
کەڵەژن: ئافرەتی هەڵکەوتوو.
کاری قوت: کاری زیتەڵە و وریا.

کورەکاژاو: چیایەکی بەرزە لە پشت بەرزنجەوە.
کەنشتە: جێگای خواپەرستی جولەکەکان.
کلیم: شاعیرێکی ئێرانی بووە.
کەوتەگیر: دەستی کەوت.
کەوڵ و پۆست: خوری ئاژەڵ کە بەپێستەکەوە بێت.
کلیسا: جێگای خواپەرستی مەسیحییەکان.
کێس؟!: کێیە؟!
کورتانی کەری جەجاڵ: بەشەو ئەدوورێت و بەڕۆژ هەڵدەوەشێتەوە.
کتک: مشک.
کەوتەگەڕ: کەوتەکار.
کەچ بین: خراپ بین، بەدبین.
کونەبان: بەو کونە دەڵێن کە گەنم و کای لێ دەکەنە خوارەوە بۆ ناو کایەن یا بۆ عەمباری دەغڵودان.
کەرەتە: پاژنە هەڵکێش.
کرێوە: بەفر و باران بەرەشەباوە، زریان.
کەپرە شینە: جەژنێکی جوولەکەکان بووە لەسەرەتای پایزدا.
کەسیرە: سر.
کفت: ماندوو و شەکەت.
کەوتە تەلاشەوە: کەوتە هەوڵدان.
کەشکەک: واتایەکی کوردی دەڵێت: ئەڵێی کەشکەکی بۆ کولاوە. چونکە لە کۆندا بەیانیان زوو کەشکەک لێنراوە و خواردنێکی خۆش بووە.
کالا: جۆرە پێلاوێک بووە. لە پێستی گاوگۆتاڵ دروست دەکرا بۆ ڕۆژانی بەفر لەپێ دەکرا. ئەو تاڵە چەرمانەش کە پێی دەبەسترا پێیان دەگوترا پێتا یاخود پێتاڵ تاڵەکانیش هەر لە چەرم بوون. بەشەو ئەخرایە ناو ئاوی شلەتێنەوە بۆ ئەوەی بۆ بەیانیان شل بێتەوە و لەپێی بکەن.
کەشکیان ئەسووەوە: دۆی خەستیان بەپەنجە ئەگوشی لەبەر هەتاو دایان دەنا هەتا بەتەواوی ڕەق دەبوو. بۆ زستان لەناو سوێنەدا بەئاوی شلەتێن ئەیانخوساندەوە و ئەیانکرد بەکەشکەک ڕۆنی داخکراوی ئەکرا بەسەرا خواردنێکی زۆر بەلەزەت بوو.
مەنجەڵی زنجیردار: مەنجەڵی زۆر گەورە بوو دوو زنجیری پێوەبوو بۆ هەڵگرتن و داگرتن. بەو زنجیرانە بەدوو کەس لەسەر ئاگر دەیانهێنایە خوارەوە.
کەشکۆڵی شیعر: مەبەست لەو دەفتەرە گەورەیە بووە کە هەموو جۆرە شیعرێکی تیا نووسراوە. لەم بارەیەوە کەشکۆڵەکانی (مەحموود پاشای جاف) بەناوبانگ بووە.
کاخ: پایتەختی حەزرەتی سلێمان بووە.
کاشان: شارێکە لە ئێران.

## (گ)

گورگەدەر: دێیەکە لە ناوچەی شارباژێڕ مەزاری شێخێکی بەناوبانگی لێیە پێی دەڵێن (خەرقە ڕەش – خەرگە ڕەش.
گمۆ: چیایەکی بەرزە لای دەربەندیخان.
گەرد: تۆز.
گەردش: گەڕان.



گردەشین: گردێکە بەرانبەر ئاشی بارام لەسەرچەمی سیوەیل.
گوزەران: ژیان.
گەردن کەچ: مل کەچ.
گردی مامەیارە: گردێکە جاران ئاگری نەورۆزی لێ دەکرایەوە و گۆڕی مامەیارەی قارەمانی لێیە. ئێستا کەوتۆتە ناو شاری سلێمانییەوە. کارێزی وەستا شەریف لە دامێنیابوو، چەند ساڵ لەمەوبەر خەڵکی سلێمانی بەتایبەتی ڕۆژانی چوارشەممەوان و هەینی دەچوونە سەیران بۆ ئەوێ. پیرەمێرد لەسەر وەسیەتی خۆی لەوێ نێژراوە. هەروەها ئارامگای جەمیل صائب و ڕەحمەخانی کچی پیرەمێرد و عبدالرحمن بەگی نفوس (بابان)ی لێیە. بەڵام بەداخەوە گەردشی ڕۆژگار جێگا و شوێنی گۆڕەکەی مامە یارەی ون کردووە. لەسەر ئەو گردە بچووکەدا نازانرێ کامەیە گۆڕەکەی!!
گرۆه: کۆمەڵ، دەستە، تاقم.
گیسکە مەرەز: گیسکەمەرەز بەتایبەت لە ناوچەی سیوەیل و بەرکێودا زۆرە. بەناوی (موو)ەکەیەوە پێی دەگوترێ گیسکەمەرەز چونکە مووەکەی ئەم جیاوازە لە مووی گیسکی تر.
گوێزەبانە: کە مەولود دەکرا، گوێزەبانە بەسەر دانیشتواندا دەبەخشرایەوە. بریتی بوو لە گوێز و مێوژ و نۆک و هتد.
گلا: کەوت.
گرگاشە نازک: دێیەکە دراوسێی شاناخسێ و مەروێیە.
گوڵدەستەی گوڵان: شای گوڵان.
گەزیزە: ناوی گوڵێکە.
گەردوو خوول: سووڕانەوە و بەدەوردا هاتن.
گلۆڵە: کلافە.
گردکردنەوە: کۆکردنەوە.
گەنج: ئاڵتون، زێڕ، لاو.
گەردش: فەلەک.
گارەگار: دەنگی مریشک لە نزیکی هێلکەکردندا.
گەلحۆ: گێژ.
گەدا: هەژار، دەروازەگەڕ.
گۆبەند: بەزم و هەرا.
گورگەلۆقە: وەکو گورگ خێرا بەلۆقە دەڕوا.
گاه: جار.
گولڕەنگ: ڕازانەوە بەڕەنگی گوڵ، زیاتر مەبەست گوڵی سوورە واتا بەخوێن ڕەنگینە.
گابۆڕ: بۆڕەی گا. دەنگێکی ناخۆشە.
گریبان: یەخە.
گوڵگون: ڕەنگاو ڕەنگ.
گومڕا: بایی.
گەنجەفە: شانازی.
گرشمەوناز: عیشوە.
گەردانە: پارچە ئاڵتونێک بووە پلپڵەی بچووکی پێوە بووە لەملا و لەولای سەر و پێچی ئافرەت قایم کراوە هاتۆتەوە بۆ ژێر غەبغەبە و بەر گەردن.
گلەسپیەکەی گۆیژە: لەناو قەدی شاخی گۆیژەدایە لە دیوی شارباژێڕ. گلێکی سپی هەیە.

## (ل)

لەیەک بین ڕادەکات: بەبێ وەستان ڕادەکات.
لاجوەردی: شینی بێ گەرد.
لانە: شوێنی شێر، شوێن و ماڵ.
لەدەمی خۆرهەڵاتندا: لە کاتی، لەسەرەتای خۆرهەڵاتندا.
لەپاین پایە: لە نزمترین.
لاپوورە: غەریب.
لاوکی قەیغانی: لاوکێک بووە تایبەت بەتیرەی قەیغانی.
لەم هەیوەدا: لەم کاتەدا.

## (م)

مێرغوزار: باخ و مێرگی تەڕ.
میناتوز: کامێرا.
مەیکەدە: جێی مەی نۆشین، مەیخانە.
مەرام: مەبەست.
مێخەک بەند: بەبەری مێخەک ئەهۆنرایەوە و ناو بەناو شیلان و مووروو ئەخرایە گورزەکانیەوە.
مابەین: شارێکە لە تورکیا.
مەدهۆش: بێ ئاگا، بێ هۆش.
مشتاغ: ترێ نانەوە لەسەر ڕەز کە بکرێ بەمێوژ یاخود بەدۆشاو.
مەعدوومی: نازناوی شیعری مەولەوییە.
مشت و ماڵکردن: مشتوو هێنان بەسەر لێواری تەنەکەی دەغڵ و داندا.
مەیدانی سوخەن وەری: مەیدانی گفتوگۆ.
مەتالیک: جۆرە پارەیەک بووە.
مەجیدی: جۆرە پارەیەک بووە.
منەوەر: ڕۆشنبیر.
ماڵی خانم: ماڵی عادلە خانم، خانمی وەسمان پاشای جاف.
موتابخانە: بەو دوکانە دەوترا، کە موتابچی خەراری تیا دروست دەکرد. خەرار لە مووی بزن دروست دەکرا. تووتنی تێدەکرا.
مینا: ئاوێنە.
ماسک: مەیتەر، خزمەتچی ئەسپ.
مۆریان: ئەسپێ.
موور: جۆرە دارێکە دادەهێنرێتەوە و دەکرێ بەتەختە و سوودی لێ وەردەگیرێت.
مەرنەمووکە: لە «من ربُكَ»ی عەرەبییەوە وەرگیراوە. کە دەچێتە سەر مردوو لێی دەپرسێت «من ربُكَ»: خوای تۆ کێیە؟.
هەن: گەزۆ، بەتایبەتی لەسەرداری مازوو دەبارێ لە کوردستاندا.
میوەگەنان: کاتێکە لەوپەڕی گەرمادا میوەی تیا پێ دەگات.
مووشەدەمە: لە هەمانە دروست دەکرا. لەلایەکەوە هەوای تێدەچوو لەلایەکی تریشەوە شاگردێک دەستی پیادا ئەنا هەواکە ئەهاتە دەرەوە بۆ گەشانەوەی خەڵووز.





مزەی مەزە: تامی مەزەکەی، تاڵیی شیرین کردووە.
مەلا سیپارە: بەواتای (سیپارە) توورە دەبوو.
مل وەکو داسک: ملی زۆر باریک.
مەی ئەنگوور: مەی ترێ، شەرابی ترێ.
مێردەزمە: مرۆڤێکی خەیاڵییە لە شوێنی چۆڵەوانیدا سواری کۆڵی خەڵکی دەبێت.
ماش و برنج: ڕەش و سپی. بۆ کەسێکە بەرەو پیریی بچێت.

## (ن)

نۆدێ: دێیەکە لە شارباژێڕ لەپێش بابانەکاندا دروست کراوە. پێیان وتووە (نەودێ - دێی نوێ) شێخ مارفی نۆدێ خەڵکی ئەوێیە.
نەغمەی سەحەرگاه: جۆرە گۆرانییەکە، (سەحەری)یشی پێ دەگوترێت.
ناخواه: بەناهەق، خوا نەناس.
نەیجە: قامیش. هەروەها بەو دەزووە باریکە دەگوترێ کە لەناو نووکی قەڵەمدایە.
نموود: دەرکەت.
نیگەهبان: ئاگادار، پاسەوان، یاساوڵ.
ناتوریل: سروشتی (Natural)ی ئینگلیزیە، طبیعي.
نادان: نەزان.
نەریتمان بۆ دامەهێنن: قسەمان بۆ دروست مەکەن.
ناڵەکار: کەسێ بناڵێ، کاری ناڵین بێ.
نەقاڕە: ئامێرێکی مۆسیقایە.
نموونەنمایی: پێشانگای شتی نایاب. معرض، نوێینە.
نادروست: نارێک.
نەبزگیر: ئەو کەسەی نەبزی دەستی (مەچەکی) مرۆڤ دەگرێت.
نەنگی سەر، برایم ئاوا: دوو دێیە لەناوچەی قەرەداغ.
ناپەرموونەوە: سڵ ناکەنەوە.
نەلەخشیوە: نەڕووشاوە، تێک نەچووە.
نیمێ: نیوە.
نیوەنمەک: هەویرێکە دەخرێتە سەر برین.
ناڵەی شەوگیر: ئەو ناڵە و نزایەیە کە بەشەو گیرابێت.
ناگزیر: بەدگفتار.
نماکی گریان: چاو فرمێسکاوی.
نۆشدارو: دەرمانێکی خەیاڵی بووە بۆ هەموو جۆرە نەخۆشییەک.
نمایش: شانۆ.
ناف: ناوک.
نوشوست: شکست.
نامە تەشی ڕێس: نامە ڕیایی کار.
ناڵچەی پێڵاو: ناڵی پێڵاو.
نگوون سار: لە خاکا کەوتووە.

ناوجەژنان: ئەو دوو مانگەیە دەکەویتە نێوان جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانەوە.
نەیسە: بەهەرحاڵ.
نوێژە بارانە: ئەو نوێژەیە بۆ داواکاری باران بارین دەکرێت.
ناوەجاخ: ناچیزە.

## (و)

وەنەوز: خەوە نووچکی، لە نێوان خەو و بێداریا.
وزەی دیدەنی: توانای سەرلێدان، بەسەرکردنەوە.
ویرەویر: گریانی مناڵ.
وەنوس: ڤینوس.
وردیلە: بەچە، منداڵ.
ویق واژیان کرد: هاوار و هەرایان کرد.
وێڵە دەر: دێیەکە بەشانی گۆیژەوە و نزیکی سلێمانییە. وێڵەدەر لەوەوە هاتووە کە چەند ڕێگەیەک لە پێش چوونە ناو دێکەوە هەیە ڕەنگە ڕێبوار لەو دەرانەدا وێڵ بێ.
وەردیەوان: کارگوزاری بەندیخانە، وەردیان.
وەپەیجووری میوانەوە هاتبوو: بۆ هەواڵی میوان هاتبوو.
وەرەم: سیل.
وەختەبەڕێ بم: وەختە بمرم.
واوەیلا: شین و زاری.

## (هـ)

هامراز: هاودەم.
هەڵدا: هەڵلا، هاوار، هەراو هەڵلا.
هەرەوەز: هاوکاری.
هەینو: هەینی، جمعە.
هێدی هێدی: هێواش هێواش، ورد ورد، لەسەرخۆ.
هەڵناکا: دەرنابا، ناگونجێ.
هەڵگیراو: ڕەدووکەوتوو.
هەڵمەت: هێرش، شاڵاو.
هۆمەرە کوێر: کاتی خۆی دێیەک بووە لەو دیوی گردی سەیوانەوە.
هەزارکانیان: شوێنێکە لە پشتی کەناروێوە.
هونەروەر: هونەرمەند.
هەودا: تاڵە دەزوو.
هۆن هۆن: فرمێسکی بەردەوام لە کاتی گریاندا.
هەریسە: خواردنێکە هەموو خواردنێکی تێکەڵ ئەکرێ لە کوردیدا باوە دەڵێن «شینی هەریسەکە دەکات».
هاتە جونبوش: هاتە جۆش.
هەرزەگۆ: نەزاندوو، کەسێ نەزانێ جوان و لەبار بدوێ.
هەڵپاچراو: بڕاو.



هاونشین: هەم نشین. هاوەڵ، هاوڕێ.
هەگبەلی: هەگبەلی (آطه) (آطه بازاری)، دوورگەیەکی خۆشە لە تورکیا سەیرانگایەو وەکو قەزا و ناحیەی لای خۆمان وایە. چەند ساڵێک پیرەمێرد لەو جێگە خۆشەدا قائمقام بووە و نەژادی کوڕی لەوێ لەدایک بووە.
هەواخواهان: لایەنگران.
هەر لووشەی دێ: هێشتا تێری نەخواردووە.
هاوشاری: خۆ وڵاتی، خەڵکی یەک شار.
هەوسار: سەرکەللەی وڵاخ، لە خوری دروست دەکرێ.
هەڵدەئاژێ: پاڵدەکەوێ.
هەڕووتە: شاخێکە پێش ئەوەی بگەیتە ئەزمڕ و جاران کاروان بەوێدا ئەچوونەوە بۆ سیتەک. ئەم شوێنە دار و دەوەنی نییە واتە: هەر ڕووتە!
هوما: باڵدارێکی ئەفسانەییە.
هەمە چیزە: هەمە ڕەنگ.
هەوێنی نۆ قازان شیرە: ئەوەندە خراپە لە ناو هەر کۆمەڵێکدا بێت تێکی ئەدات.
هاوار: دێیەکی زۆر خۆشە لە هەورامان. لە هەڵەبجەوە بەشنرویدا بۆی دەڕۆی، دانیشتوانی (کاکەیی)ن.
هەوا ئەستێنین: لەخۆمان ئەگۆڕێین، بایی ئەبین.
هۆمان تێی کەوتووە: پێویستمان پێیەتی.
هەوڵ و تەلاش: هەوڵ و تێکۆشان.
هەرەمە: ئاگر و ئاوی کرد بەسەر یەکا.
هەق سز: بێ هەق، بێ ماف.
هامان: دوژمنێکی هەرە بەناوبانگی جوولەکەکان بووە. هەموو ساڵێک پەیکەرێکی هامانیان دروست دەکرد بەتێلا و دەمانجە ئەهاتنە وێزەی، ئەم جەژنەیان ناو نابوو جەژنی کوشتنی هامان.
هەڵەوەڕ: بەدگۆ، چەنەباز.
هێڵی ناو وەرد: ئەو هێڵەیە دوای ئەوەی گاسن لە زەویەکە دەدات دەردەکەوێت.
هەڵدەوەستنەوە: هەڵدەسڵەمێنەوە.
هەوا خواه: خەیاڵ بڵاو.

## (ی)

یاداشت: بیرەوەری.
یاداشتی دەکات: دەینووسێت.
یۆڵداش: (تورکییە) واتا هاوڕێ.
یاوز: سوڵتان سەلیمی عوسمانی.
یوشع: ناوی یەکێ لە پێغەمبەرەکان بووە.
یەکە پیاو: باشترین، بەناوبانگترین پیاو.
یەکێکیانت ئەکەمە قەبەڵ: دەرعوهدەی ئەوی دەکەم. یەکێکیانت دەکەمە بری ئەو.
یەک شەوە: مەبەست لە مەلا (عبداللەی کوڕی مەلا غەفوور)ـە، کە پیاوێکی هەژار بوو لە سلێمانی، بەڵام کە خاڵە وەجاخ کوێرەکەی مرد سامانێکی زۆری بۆ بەجێ هێشت لەمەوە ناونرا (مەلا عبدالله)ی یەک شەوە.

